# تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز

عەلی باپیر

بەرگی دووەم

سوورەتی (آل عمران)

دار المعرفة
بيروت - لبنان

ameer.maktab@yahoo.com


/AliBapir

/AliBapir

/MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

## پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

نووســـەر: عەلـی باپـیـر

نەخشەشازی ناوەوە: عزالدین محمد عمر

بـــەرگ : عزالدین محمد عمر

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٣ ك– ٢٠١٢ز

تـــیـراژ : ٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە



www.alibapir.net

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلامُ الله وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وشَرَّ الأُمُور مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةِ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد،

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد پێش هەر قسەیەکی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

بەباشترین جێگرتن جێگا دەگرێو خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەییو بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم‌و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم‌و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم‌و، سەرقاڵیی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان‌و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانیو، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب‌و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم‌و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان‌و چۆنیەتی جێبەجێکردن‌و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك‌و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم‌و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم‌و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرِّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون‌و دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل، واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار تاکو ئەوەی

بۆ خەڵكی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە، وە بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێكدانەوەیەكی وا بۆ قورئان پێشكەش بە مسوڵمانانی كوردستان بكەم، كە لە قورئان بوەشێتەوەو مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بە تایبەتیش كە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەكانیو كتێبەكانی سوننەتدا خەریكمو دەیان كتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەكانی زانستەكانی شەریعەتدا پێشكەش كردوون.

شایانی باسیشە كە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی كرانەم لەلایەن ئەمریكاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێكی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی كتێبی خوا تبارك و تعالى، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لە بارەی زۆرێك لە ئایەتەكانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە كتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر دەرەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێمو هیچكەسیش بۆی نیە بڵێ: كە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونكە وێڕای سنووردارbوونی تواناو بڕستم لە بەرانبەر كتێبی لە هەموو ڕوویێكەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە كە زۆر بەملاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەكارییەوە، كە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە كاتێكدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو بزانێ خوا تبارك وتعالى ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بكەم (حەزی نەكرد ناوی بهێنم)، كە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر كاغەزو، پاشان تایپكردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، كە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار

---

١) ئەو كتێبە كە ئێستا بەرگی یەكەمی چاپ كراوەو ئەوانی دیكەشی لە ئامادەكران دان بۆ چاپ، سەرجەم هەشت بەرگو نزیكەی چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵم داوە بە گشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەكانی ئیسلام بكەمو، تاكە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەكانی سوننەت، كە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

(محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخریج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بەم بەرگی یەکەمەوە - کە سەرجەم سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی — کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر ساڵحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕانو کچان لەنێو گەلەکەماندا زۆر بکات.

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئانو دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن‌و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین‌و بە گوێرەی سوورەتەکان بەرگەکانی دیاری دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس‌و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشکەییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلاَمٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتی (آل عمران)، سەرگەرمی سوورەتی (النِّساء)ەو عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ.

# پێشەکی ئەم بەرگە

الحَمد لله رَبّ العَالـمَين وَصَلاته و سلامه و بركاته على عبده مُحَمَّد وآلِهِ السائرين على دربه .

خوێنەرانی بەڕێز !

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای بەرزی مەزن، کە دوای هەردووك سووڕەتی بەپێزی فاتیحەو بەقەڕە، یارمەتیی داین سووڕەتی پڕ فەڕو بەرەکەتی ئالی عیمرانیش تەفسیر بکەین.

شایانی باسیشە کە ئێمە لە تەفسیرکردنی سووڕەتی (آل عمران)یش دا هەر لەسەر هەمان نەخشەو بەرنامەی کە لە سەرەتای ئەم تەفسیرەوە ڕامان گەیاندوە، بەردەوام بووین‌و هەوڵیشمان داوە لەم بەرگەدا لەو تێبینی و پێشنیارانەی خوێنەرانی سەنگین‌و شیرین کە لەسەر بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرە، خستبوویاننە ڕوو، بەهرەمەند بین‌و هیواداریشین خوێنەرە خۆشەویستەکان بەردەوام لە تێبینی‌و سەرنجەکانی خۆیان لە هەر ڕوویەکەوە بن، بێبەشمان نەکەن، چونکە فەرمایشتی بەرزو بەپێزی خوای بێوێنەو تاك، هەتا خزمەتی بکرێ هەر کەمەو، هەموو شتێکی باشی شایستەیە، ئەوەندەی لەتوانادا هەبێ‌و بلوێ.

هیواداریشم سەرجەم خوشك‌و برایانی مسوڵمانی بەهرەمەند لەم تەفسیرە، دوعامان بۆ بکەن بۆ هیدایەت‌و بەرچاو ڕوونیی زیاترو، بەردەوام بوونیش هەتا تەواوکردنی تەفسیرکردنی تێکڕای سووڕەتە موبارەکەکانی قورئانی بەرزو بەپێز.

سبحانك اللّهم وبحمدك أشهد أن لا اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك

١٤ ی رمضان ١٤٣٣ ك
٢ ی ئابی ٢٠١٢ ز
هەولێر

www.alibapir.net

# چۆنیەتی و نەخشەی تەفسیرکردنی سوورەت و ئایەتەکان

ئەو نەخشەیەی کە من دامناوە بۆ تەفسیرکردنی قورئان، بۆ حەوت قۆناغ دابەش بووە، بەمجۆرە:

١- پێناسەکردنی سوورەتەکە یان ئەو کۆمەڵە ئایەتە، کە دەرسەکە پێکدێنن، بە کورتیی ڕوونی دەکەینەوە، کە لە چ بابەتێك دەدوێن‌و تەوەرەکانیان چین؟!

٢- نووسین‌و خستنەڕووی ئەو کۆمەڵە ئایەتە کە دەویسترێ لەو دەرسەدا بتوێژرێنەوە.

٣- مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان بەکورتیی و پوختیی.

٤- شیکردنەوەی ئەو وشانەی حەوجێی شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی زیاترن‌و، ساغکردنەوەی مانا بنەڕەتییەکەیان.

٥- باسکردنی هۆی هاتنە خوارەوە (سبب النزول)، ئەگەر هەبێ.

٦- مانای گشتی ئایەتەکان، واتە تەفسیرکردن‌و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکان بەسەریەکەوەو بەگشتی.

٧- خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەکان، واتە هەر مەسەلەیەك کە نەگونجابێ وەك پێویست تیشکی بخرێتە سەر، لەم قۆناغی حەوتەمەدا دەیتوێژینەوەو بۆی قەرەبوو دەکەینەوە، جا چ پەیوەندی بە لایەنی فیکرو عەقیدەوە هەبێ، چ بە لایەنی حوکم‌و سیاسەتەوە، چ بەلایەنی سیرەو مێژووەوە، ... هتد.

# پێناسەی سوورەتی (آل عمران)

بسْم الله الرَّحمن الرَّحيم

الحَمـد لله رَبّ العَـالَمِين وَصَلَّى اللهُ تَعَـالَى وَسَلَّمَ وَبَـارَكَ عَلَـى سَيّدِ الْمرسَلين وَخَاتَم النّبيّين مُحَمَّدٍ وآلِهِ أَجْمَعِين مِنَ الصَّحْبِ والأَزْوَاجِ وَالقَرَابَةِ وَالتابعِينَ لَهُمْ بإحسَان إلى يَومِ الدّين.

بەڕێزان !

خوا پشتیوان بێ، لەمڕۆوە دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سوورەتی (آل عمران) لە زنجیرە دەرسی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، سوورەتی (آل عمران) بەپێی ڕیزبەندیی سوورەتەکانی قورئان سێیەمین سوورەتە، لە دوای سوورەتی (الفاتحة)و سوورەتی (البقرة)وەو، سوورەتێکی (مەدەنیی)یەو، ژمارەی ئایەتەکانی دوو سەد (٢٠٠) ئایەتە، بە سەرنجدانی ئایەتەکانو ئەو بابەتانەی گرتوویاننە نێو خۆیان، بۆمان دەردەکەوێ کە لە ساڵەکانی دووەمو سێیەمو چوارەمو دواتری کۆچی دا هاتۆتە خوار، دوای جەنگی (بەدر) و (ئوحود)، هەرچەندە بەپێی هۆی هاتنە خوارەوەی کە دواتر باسی دەکەین، دەبێ لە دوای ساڵی نۆیەمی کۆچی دا، کە (عام الوفود)ی پێ دەڵێن، یان تۆزێك پێش ئەوە، هاتبێتە خوار، بەڵام بە سەرنجدانی نێوەڕۆکی ئایەتەکان بۆمان دەردەکەوێ کە ناگونجێ دابەزینی ئەم سوورەتە هەمووی ئەوەندەی پێ چووبێ، یانی: گەیشتبێتە ساڵەکانی پێش فەتحی مەککەوە.

شایانی باسیشە ئەم سوورەتە موبارەکە لەگەڵ سوورەتی (البقرة)دا، فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ زۆرن لەبارەیانەوە، کە پێشتر لە سوورەتی (البقرة)دا باسمان کردن، بۆ وێنە:

فەرمایشتی یەکەم: {عَنْ النَّوَّاسَ بْنَ سَمْعَانَ الْكِلاَبِيَّ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: يُؤْتَى بِالْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَهْلِهِ الَّذِينَ كَانُوا يَعْمَلُونَ بِهِ تَقْدُمُهُ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَآلُ عِمْرَانَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٨٧٣)، واتە: نەوواسی کوڕی سەمعان خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: ڕۆژی دوایی قورئانو ئەهلی قورئان، ئەوانەی کە کاریان پێکردوە، دەهێنرێن سوورەتی بەقەرەو ئالی عیمران بە پێشیان دەکەون، (واتە: بەقەرەو ئالی عیمران لە پێش قورئان و ئەهلی قورئانەوە دێن).

فەرمایشتی دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إقرَأُوا القُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأتِي يَوْمَ القِيَامَةِ شَفِيعاً لأصحَابِهِ، إقرَأُوا الزَّهْرَاوَين: سُورةَ البَقَرَةَ و آلِ عِمرَانَ، فَإِنَّهُمَا تأتِيَانِ يَوْمَ القِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غمَامَتَانِ أو غيَايَتَانِ، أوكَأنَّهُمَا فِرقَانِ مِن طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا، إقرأُوا سُورَةَ البَقَرَةِ، فَإِنَّ أخْذَهَا بَرَكَةٌ، وتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلاَ تَستَطِيعُهَا البَطَلَةُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٨٧١)، عَنْ أَبي أُمَامَةَ ﷺ، واتە: قورئان بخوێنن، چونکە قورئان لە ڕۆژی دوایی دا دێت شەفاعەت دەکات بۆ ئەوانەی کە هەلگری قورئان بوون، وە دووچرایەکان ﴿(زهراوین)، واتە: دووچرای تیشکدەر، دوو ڕۆشنەکان﴾ بخوێننەوە سوورەتی (البقرة و آل عمران)، چونکە لە ڕۆژی دواییدا دێن، وەك دوو هەور سێبەر دەکەن لە خاوەنەکەیان، یاخود وەك دوو سەقف و سەربان، یان وەك دوو پۆلی باڵندە کە دێن بە ڕیز، باڵیان ڕادەگرن، ئاوا دێن سێبەر لە خاوەنەکانیان دەکەن، موناقەشە دەکەنو بەرگریی دەکەن لە خاوەنەکانیان، سوورەتی بەقەرە بخوێنن، چونکە سوورەتی بەقەرە وەرگرتنی (و لە بەرکردنیو تێگەیشتنی) بەرەکەتە، وە ئیهمالکردنی و وازلێهێنانی مایەی حەسرەتو پەشێمانییە، وە جادووگەران، هەرکەسێك سوورەتی بەقەرەی پێ بێ، ناتوانن کاریگەرییان لەسەر هەبێ. ئەوە مانایەکیەتی، مانایەکی دیکەی ئەوەیە کە: ئینسانی جادووگەر ناتوانێ سوورەتی بەقەرە لەبەر بکات.

ئەمەش شتێکی جەڕبێنراو (مُجَرَّب)ەو ئەوانەی کە (جن)یان دەچێتە نێو بەدەن، یان ئەوانەی کە سیحریان لێدەکرێ، سوورەتی بەقەرە کاریگەریی هەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی جادوو و دەرکردنی (جن) لە جەستەی ئەو کەسانەی کە جندار دەبن.

# خاڵە هاوبەشەکانی نێوان سوورەتی (البقرة) و (آل عمران)

سوورەتی ئالی عیمران لەگەڵ سوورەتی بەقەرەدا شەش خاڵی بە یەکگەیشتنیان هەن، کە رەنگە خاڵی دیکەشیان هەبن، بەڵام بە سەرنجدانی من ئەو شەش خاڵە بەروونی دەبینرێن:

**یەکەم**: لە سەرەتای سوورەتی (بەقەرە)دا بیست ئایەت بۆ پێناسەی پارێزکارانو بێبڕوایانو مونافیقان تەرخان کراون، لە سەرەتای سوورەتی (ئالی عیمران)یشدا چەند ئایەتێك (نۆ ئایەت) تەرخان کراون بۆ پێناسەی کەسانێك کە دڵیان نەخۆشی تێدایە، وە پێناسەی کەسانێك کە قووڵبوونەتەوە بە زانست دا.

**دووەم**: لە سوورەتی (بەقەرە)دا زیاتر لە سەد ئایەت تەرخان کراوە بۆ باسی جوولەکەکان، وە باسو خواس و هەڵوێستەکانیان، بۆ ئەوەی مسوڵمانان پەندیان لێوەربگرن، وە لە سوورەتی (ئالی عیمران)یشدا زیاتر لە هەشتا ئایەت{لە ئایەتی (٣٣) تا (١٢٠)} تەرخان کراوە بۆ باسی نەصرانی یەکان، وە وتوووێژکردن لەگەڵیان دا، وە بەرپەرچدانەوەی قسەکانیان.

**سێیەم**: لە هەر کام لە سوورەتی (بەقەرە)و سوورەتی (ئالی عیمران)دا لە چەند شوێنێك دا باسی تاقیکرانەوەی بڕواداران کراوە، واتە: ئەوە کە خوای پەروەردگار بڕواداران تاقی دەکاتەوە، لە سوورەتی (بەقەرە)دا لە چەند شوێنێکدا باسی کردوە، بۆ وێنە:

أ) ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ﴾البقرة .

ب) ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا ... ﴿٢١٤﴾ ﴾البقرة.

ج) ﴿ ... وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ ... ﴿٢١٧﴾ ﴾البقرة.

وە لە چەند شوێنێك لە سوورەتی (ئالی عیمران)ش دا باسی كردوە، وەك خوا فەرموویەتی:

أ/ ﴿ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾ آل عمران.

ب/ ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ... ﴿١٧٩﴾ ﴾آل عمران.

ج/ ﴿ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ ... ﴿١٨٦﴾ ﴾آل عمران.

**چوارەم**: هەم سوورەتی (بەقەرە)و هەم سوورەتی (ئالی عیمران)، یاسای شەرعیی زۆریان تێدا بەیان كراون، هەرچەندە بێگومان یاسا شەرعییەكانی سوورەتی بەقەرە زیاترن.

**پێنجەم**: لە هەر كام لە سوورەتی (ئالی عیمران)و (بەقەرە)دا، پانتاییەكی زۆر بۆ باسی جەنگو جیهاد تەرخانكراوە.

**شەشەم**: هەردووكیان، واتە: سوورەتی (بەقەرە)و (ئالی عیمران) بە دوعای بە كۆمەڵ لەلایەن بڕوادارانەوە كۆتایی یان پێهێنراوەو خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئیمانداران، پاڕانەوەی گەرمو گوڕو بەكوڵی كردۆتە كۆتاییو میسكی خیتامی هەركام لە سوورەتی (بەقەرە)و (ئالی عیمران).

# دەرسی یەکەم

## تەفسیری سوورەتی (آل عمران)

### پێناسەی ئەم دەرسە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەدا لە ئایەتی: (١ تاکو ٩) لە سوورەتی (ئالی عیمران) تەفسیر دەکەین، واتە: نۆ ئایەت، کە باسی ناردنە خوارەوەی قورئان دەکەن، هەروەها باسی ناردنە خوارەوەی تەورات‌و ئینجیل دەکەن، کە هەموویان جیاکەرەوەی هەق‌و ناهەقن، وە خوای بێوێنە باسی چەند سیفەتێکی خۆی دەکات، وە پێناسەی ئایەتەکانی قورئان دەکات‌و دابەشیان دەکات بۆ دوو جۆر: ئایەتی (مُحْكَم)، وە ئایەتی (مُتَشابە)، وە هەڵوێستی خەڵکی لە بەرانبەریاندا دەخاتەڕوو، کە دەیانکات بە دوو بەش، ئەوانەی کە بە زانیارییدا ڕۆچوون‌و قوڵبوونەتەوە، دەڵێن: بڕوامان هەیە بە کتێبی خواو هەرکام لە دوو جۆرە ئایەتەکانی، چ ئایەتی (مُحْكَم)بن، چ (مُتَشابە)، کە دوایی پێناسەیان دەکەین، بەڵام ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، لە جیاتی ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی ئایەتە موحکەمەکاندا تەماشای ئایەتە موتەشابیهەکان بکەن، بە پێچەوانەوە بە دوای ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەون، کە سەر لە خۆیان‌و لە خەڵکیش دەشێوێنن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ﴿١﴾ اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَٰبَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ
يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَىٰةَ وَالْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِـَٔايَٰتِ
اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ﴿٤﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي
السَّمَآءِ ﴿٥﴾ هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ
﴿٦﴾ هُوَ الَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ
فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ابْتِغَآءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ وَمَا يَعْلَمُ
تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّٰسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُوا
الْأَلْبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ
﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴿٩﴾﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، ئەلیف. لام. میم ﴿١﴾ خوا جگە لەو هیچ پەرستراو (ی بەهەق) نین، زیندووی مشوورخۆرە ﴿٢﴾ کتێبی بە هەق دابەزاندۆتە سەرت، بەڕاست دانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی، وە تەوڕاتو ئینجیلیشی پێشتر ناردوونە خوارێ ﴿٣﴾ بۆ ڕێڕوونیی خەڵکی، وە جیاکەرەوە (هەق و ناهەق)ی ناردۆتە خوار، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی خوا ئازارێکی توندیان بۆ هەیە، وە خوا زاڵی خاوەن تۆڵەیە ﴿٤﴾ بێگومان خوا هیچ شتێکی لێ‌شێرراوەنیە نە لە زەوی‌و نە لە ئاسماندا ﴿٥﴾ ئەو کەسێکە لە نێو

مندالّدانان دا چۆنی بویّ ویّنەتان دەكیّشیّ، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، زالّی كاربەجیّیە ﴿٦﴾ ئەو كەسیّكە كە كتیّبی ناردۆتە سەر تۆ، ئایەتانیّك لەو كتیّبە مانا ڕۆشنن، ئەوان بنەڕەتی كتیّبەكەن، وە هەندیّكیشیان مانای ویّكچوویان هەن، جا ئەوانەی كە لادان لە دلّیان هەیە، بە مەبەستی سەرلیّشیّواندنی خەلّكو لیّكدانەوەیان كتیّبەكە (بە جۆریّكی چەواشەكەرانە) شویّن ئەوەی دەكەون، كە مانای ویّكچووی هەیە، لە حالّیّك دا كە جگە لە خواو قوولّبووەوان لە زانیاریدا لیّكدانەوەكەی نازانیّ، (ئەوانەی كە) دەلّیّن: بڕوامان پیّی هیّناوە؛ هەمووی لە لایەن پەروەردگارمانەوەیە، وە بیّجگە لە خاوەن عەقلاّن كەس پەند وەرناگریّ ﴿٧﴾ پەروەردگارمان ! دوای ئەوە كە ڕیّنماییت كردووین دلّمان لامەدە، وە لەلایەن خۆتەوە بەزەییمان پیّ ببەخشە، بەڕاستی تۆ زۆر بەخشەری ﴿٨﴾ پەروەردگارمان ! تۆ كۆكەرەوەی خەلّكی لە ڕۆژیّكدا، كە هیچ گومانی تیّدا نیە، بیّگومان خوا بەلّیّنی پیّچەوانە ناكاتو ناڕاست دەرناچیّ ﴿٩﴾)).

## شیكردنەوەی هەندیّك لە وشەكان

(**ٱلْحَيُّ**): واتە: زیندوو، خاوەن ژیانی بەردەوام، كەسیّك كە ژیانەكەی لە خۆیەوەیە، كە ئەویش تەنیا خوای پەروەردگارە.

(**ٱلْقَيُّومُ**): (القَائِمُ: الحَافِظُ لِكُلِّ الشَّيءِ والـمُعطِي لَهُ مَا بِهِ قِوَامُهُ)، (قَائِم) ئەو كەسەیە، كە بەسەر هەموو شتیّك ڕا دەگاو مشووری دەخواو دەیپاریّزیّ، وە ئەوەی كە مایەی ڕاوەستانیەتی پیّی دەبەخشیّ، كە ئەویش تەنیا خوای پەروەردگارە، (قیوم) یش، واتە: زۆر مشوورخۆر، چونكە (قیوم)، (صیغة المبالغة)یە بۆ (قائم).

(**ٱلْفُرْقَانَ**): واتە: جیاكەرەوە، ئەویش لە (فَرْق)ەوە هاتوە، (الفَرْقُ یُقَارِبُ الفَلْقَ، والفُرْقَان: أَبلَغُ مِنَ الفَرْقِ لأنهُ یُستَعملُ فِي الفَرْق بَیْنَ الحَقِّ والبَاطِل)، واتە:

(فُرْقَان) لـە (فَـرْق)ەوە هـاتوە، ئـەویش وەك (فَلْـق) وایـە، بـەلاّم (فَلْـق) واتـە: قلّیـشاندنی شـتێكی ڕەق، یـاخود دوو پارچـە كردنـی، بـەلاّم (فُرْقَـان) زیّـدەیی زیاتری تیّدایە، چونكە بۆ لەیەك جیاكردنەوەی هەق و ناهەق بەكاردیّ.

(ٱلۡأَرۡحَامِ): (جَمْـعُ، رَحِـمْ: رَحِـمُ الـمَرْأَة واسـتَعيرَ لِلقَرَابَـة) واتـە: (أَرْحَـام) كـۆی (رَحِم)ە، (رَحِم) واتە: منداڵدان، وە بۆ خزمایەتیی خوازراوەتەوە.

(مُّحۡكَمَٰتٌ): كۆی (مُحْكَمة)یە، (مُحْكَم)، واتە: قایم و توند، وە دەگوترێ (الإِحكَامُ: الإتقَان) واتە: چاك دروستكردنی شتێك بە وردەكاریی و بـە ڕێكیـی، وە (حَكَمَ: مَنَـعَ مَنعاً لإصـلاحٍ، وَمِنْـهُ سُـميِّت اللِّجَـام: حَكَمَـةَ الدَّابـةً)، (حَكَم) واتـە: (مَنَـعَ) ڕێـی لێگـرت، بـۆ ئـەوەی چـاكی بكـات، وە بۆیـەش بـە لغـاوی ولاّخ دەگـوترێ: (حَكَمَة) چونكە ڕێی لێ دەگرێ لەوە كە لە كاتێكدا خاوەنەكەی نەیـەوێ بـڕوا، ئایەتەكانی (مُحْكَمَـات) دوایی ئێمـە پێناسـەیان دەكـەین، بـەلاّم ئێـستاش هــەر بە كورتی دەڵێـین: (الـمُحْكَم: مَا لاَ يَعْرِضُ فِيهِ شُبْهَةٌ مِنْ حَيثُ اللَّفْظِ وَلاَ مِنْ حَيْـثُ الْمَعنَـى (الوَاضِـح))، واتــە: ئــەو ئایەتانــەن كــە هــیچ شــوبهەیەكیان نایەتـەسـەر، نـە لـە ڕووی ڕواڵـەتی وشـەكەو، نـە لـە ڕووی ماناكــەیەوە، واتـە: یەك مانای ڕۆشـن هـەڵدەگرێ.

(أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ): وشـەی (أُمّ) واتـە: ئەسـڵو بناغـە، بۆیە دایك پێی دەگوترێ: (أُم) لـە زمـانی عـەرەبی دا، چـونكە ئەسڵی منداڵەكانیـەتی (كِتَـاب)یـش، واتـە: كتێـب، كەواتە: (أُم الكِتَاب) یانی: بناغەو بنەڕەتی كتێبەكە، (يُقَـالُ لِكُل مَـاكَـانَ أَصْلاً لِوجُود شَـيءٍ أَو تَربِيَتـهِ أَو إِصلاحهِ أَو مَبدَئـهِ: أُمٌّ) واتـە: هەرشـتێك كـە بناغـەی شتێك بێ، واتە: بناغەبێ بـۆ پەیـدابوونی، یـاخود بـۆ پـەروەردە بـوونی، یـان بـۆ چاكبوونی، یان بۆ سەرەتای دروستبوونی، پێی دەگوترێ: (أُمٌّ).

(مُتَشَٰبِهَٰتٌ): كۆی (مُتَشابِة)یە، واتە: لێكچووەكان، یانی: ئـەو ئایەتانـەی كـە چـەند مانایەك هەڵدەگرن، مانایەك زیاتر هەڵدەگرن، ماناكانیش وێـك دەچـن، ئەمـەش

پێناسەیەكە بۆ ئەو جۆرە ئایەتانە: (مَا أَشْكَلَ تَفْسِيرُهُ لِمُشَابِهَتِهِ لِغَيْرِهِ لَفْظاً أَوْ مَعنىً، قَالَ الفُقَهَاءُ: مَا لاَ يُنْبِيءُ ظَاهِرُهُ عَنْ مُرَادِهِ)، واتە: (مُتَشابه) ئەوەیە كە لێكدانەوەكەی ڕوون نەبێت، لەبەر ئەوە كە لە ڕووی بێژەیەوە، یاخود لە ڕووی واتایەوە، لە یەكی دیكی دەچێ، شەرعزانان دەڵێن: ئایەتی (مُتَشابە) ئەوانەن كە ڕواڵەتەكەیان دەلالەت لەسەر مەبەستو ئامانجەكەیان ناكات.

(زَيْغٌ): واتە: لادان، (الزَّيْغُ: الْمَيْلُ عَنِ الإِسْتِقَامَةِ...)، واتە: لادان لە ڕێی ڕاست بۆ ڕێی چەوت.

(ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ): واتە: بە مەبەستی ئاژاوەگێڕیی، یاخود بە مەبەستی سەر لێتێكدانی خەڵك، دەگوترێ: (أصْلُ الفَتْنِ: إدْخَالُ الذَّهَبِ النَّار لِتَظهَر جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَاءَتِهِ) واتە: ئەسڵی وشەی (فِتنَة) لە (فَتْن)ەوە هاتوە (فَتْن)یش ئەوەیە زێڕ بخەیە نێو ئاگر، بۆ ئەوەی چاك وخراپی لەیەك جیابێتەوە.

(تَأۡوِيلَهُۥ): (التَّأْوِيلُ: الرُجُوعُ إلى الأَصْل، ومِنهُ: الْمَوْئِلُ للموضعِ الَّذِي يُرْجَعُ إِلَيْهِ، وَهُوَ رَدُّ الشَّيءِ إلى الغَايَةِ المرادة مِنهُ، عِلْمَاً كَانَ أَوْ فِعْلاً، فَفِي العِلْم نحو: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ...﴿٧﴾﴾ آل عمران، وفي الفعْلِ نحو: ﴿... هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥ ... ﴿٥٣﴾﴾ الأعراف)، واتە: (تَأْويل) بریتیە لە گەڕانەوە بۆ سەر بنەڕەت، ئەو شوێنەی كە شتی بۆلا دەگێڕدرێتەوە، ئنجا دەڵێ: (تَأْويل) بریتیە لەوەی كە تۆ قسەیەك بگێڕیەوە بۆ ئەو مەبەستەی كە تێیدا ڕەچاو كراوە، جا چ لە ڕووی عیلمییەوە، چ لە ڕووی كردەییەوە، لە ڕووی عیلمییەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ...﴿٧﴾﴾ آل عمران، واتە: ئەو قسەیە ئەو فەرمایشتە تەنیا خواو ڕۆچووان لە زانیاری دا تێیدەگەن، وە مەبەستەكەی دەزانن، لە كردەوەش دا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿... هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥ ...﴿٥٣﴾﴾ الأعراف، واتە: ئایا چاوەڕێی چی دەكەن، جگە لەوەی كە قورئان هەواڵی پێداوە، بێتەدی بە كردەوە؟

(وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ): واتــە: قوڵبــووەوان لــە زانیــاریی دا، ئەوانــەی بــە زانیارییــدا ڕۆچوون (رُسُوخُ: الشَّيءِ ثَبَاتُهُ ثَبَاتَاً مُتَمَكِّنَاً) کە دەگوترێ: ئـەو شـتە ڕۆچـووە، یـانی: جـێگیرە بـە شـێوەیەك کـە نـاجووڵێ، (وَالرَّاسِخُ فِي العِلْمِ: الْمتَحَقِّقُ بِهِ الَّذِي لاَ يَعْرِضُ لَهُ شُبْهَةٌ)، وە ڕۆچوو بە زانیاریی دا، کەسێکە ئەوەنـدە زانیـاری هاتبێتــە دەســت، کــە لــەو ڕووەوە کــە زانیــاری تێــدا هەیــە، هــیچ دوودڵــیی و گومانێـکی بۆ دروست نەبێ.

(يَذَّكَّرُ ): واتــە: پەنــد وەردەگــرێ، ﴿ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، واتــە: جگــە لــە خـاوەن عەقڵان، پەند وەرناگـرن.

(أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ): (أَي أصْحَاب العقول...)، واتە: خاوەن عەقڵەکان، چونکە (ألبَـاب) کـۆی (لُب)ە، (لُـب)یش یانی: کاکڵ، بەڵام خوازراوەتەوە بـۆ عەقـڵ، لەبـەر ئـەوە کە ئینسـان بەبێ عـەقـڵ، وەك شتێك وایە کە کاکڵەکەی تێدا نەبێت.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئـایەتەکـان

هـۆی هاتنــە خــوارەوەی ســەرەتای ئــەم ســوورەتە، وەك (القُـرطُبي وَالطَّبَـرِي وَالشوكَـاني) هێناویانە بەم شێوەیە: دەڵێن: (صَدْرُ هَذِهِ السُّورة نَـزَلَ بِسَبَبِ وَفـدُ نَجْرَانَ، فِيمَا ذَكَرَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاق عَنْ مُحَمَّد بـن جَعْفَـر بـن الزُبير، وَكَـانُوا نَصَارَى وفدوا عَلَـى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَـةَ فِي سِتينَ رَاكِبـاً، فِيهِمْ مِـنْ أَشْرَافِهِم أَرْبَعـةَ عَشَرَ رَجُـلاً، فِي الأَرْبَعَـة عَشَرَ ثَلاثَـة نَفَـر إلَـيهم يرجـعُ أَمْـرُهُمْ: الْعَاقِبُ أَمِيرُ الْقَـوْمِ وَذُو آرَائِهِـم، وَاسْـمُهُ عَبْـدُ الْمَـسِيحِ، وَالـسَّيِّدُ ثِمَـالُهم وَصَـاحِب مُجْـتَمَعِهِمْ، وَاسْمُهُ الأَيْهَـمُ، وَأَبُـو حَارِثَـةَ بْـنُ عَلْقَمَـةَ أَخـو بَنِـي بَكْـرِ بْـنِ وَائِـلٍ، أُسْقُفُهُمْ وعـالِمهم؛ فَدَخَلُوا عَلَى رَسُولُ اللهِ ﷺ إثر صَلاة العَصْر، عَلَيهم ثياب الحِبَـرات جُبَـبٌ وأرْديـة، فَقَالَ: أَصْحَاب النَّبيّ ﷺ: مَـا رَأَينـا وَفـداً مِثلـهم جَمَـالاً وَجَلالـةً، وحَانَـت صلاتِهم فَقَامُوا فَصَلّوا فِي مَسْجِد النَّبيّ ﷺ إلى الْمَشْرِق، فَقَالَ النَّبيّ ﷺ: «دَعُوهُم»، ثُمَّ

أَقَامُوا بِهَا أَياماً يُناظرونَ رَسُول اللهِ ﷺ فِي عِيسى وَيَزْعَمُونَ أَنَّهُ ابْنُ الله، إلى غَيْرِ ذَلِكَ مِنْ أَقوَال شَنيعة مضطرية، وَرَسُول الله ﷺ يردّ عَلَيهم بالبراهِينَ الساطعة وَهُمْ لاَ يُبْصِرُون، وَنَزَلَ فِيهم صَدْرُ هَذِهِ السورة إلى نَيِّف وثَمانين آية، إلى أن آل أَمَرَهُم إلى أَن دَعَاهُم رَسُولُ الله ﷺ إلى المُبَاهَلَةَ، حَسبْمَا هُو مَذْكُور فِي سِيرة ابن إسحاق وَغَيْرِهِ)[١]، واتە: سەرەتای ئەم سوورەتە بە هۆی شاندی نەجرانیی یەكانەوە هاتە خوار، وەك موحەممەدی كوڕی ئیسحاق لە موحەممەدی كوڕی جەعفەری كوڕی زوبەیرەوە باسی كردوە، كە (نەجرانی یەكان) نەصرانیی بوون هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە شەست سوار بوون، لەوانەی كە خەڵكی بەرپرسو دیاربوون، چواردە پیاویان لەگەڵ بوون، لەو چواردانە سێیان قسە بەدەستی هەموویان بوون، یەكێكیان لەو سێیانە (العاقب) بوو كە فەرماندەیان بوو، وە لە ئەستۆدا ناوی (عبدالمسیح) بوو، یەكێكی دیكەیان ناوی (سَیِّد) بوو، كە ئەویش خاوەنی كۆكردنەوەو ڕاوێژپێكردنیان بوو، ئەوی دیكتەیان ناوی (أبو حارث بن عَلْقَمَة) بوو، كە ئەویش زاناكەیان بوو، ئەوانە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژی عەسر، بەرگی جوانیان لەبەر بوو (بەرگو پۆشاكی وا، كە خەڵك پێی سەرسام بێ) هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گوتیان: هیچ شاندێكمان وەك ئەوانە لە ڕووی جوانییو لە ڕووی شكۆوە نەبینیوە، لە بەرگو پۆشاك دا، كە كاتی نوێژی خۆیان هات، لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بەرەو ڕۆژهەڵات نوێژی خۆیان كرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێیان بگەڕێن با نوێژەكەیان بكەن، دوایی چەند ڕۆژێك لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ مانەوە، وتووێژیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، وە موناقەشەیان لەبارەی عیسا ﷺ وە كرد، كە پێیان وابوو: عیسا كوڕی خوایە، جگە لەوەش لەو قسە بێسەروبەرو نارێكانەی كە دەیانكرد، وە پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگەی ڕوون وتوووێژی لەگەڵدا دەكردن، بەڵام ئەوان دانیان پێدا نەدەهێنا،

١) الجامع لأحكام القُرآن للقُرطُبي، ج(٤)، ص(٧٠٥)، وتفسير الطَّبَري، ج(٣)، ص(١٨٤)، وفتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٤٠٦) .

ئیدی سەرەنجام لەم سوورەتە، تاكو هەشتاو ئەوەندە ئایەتە بەو بۆنەیەوە هاتنە خوار، هەتا سەرەنجام پێغەمبەر خوا ﷺ بانگی كردن بۆ موباهەلە، واتە: (مُلاعَنَة) وەك دەفەرموێ: ﴿ ... فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ ﴾ آل عمران ، واتە: بڵێ، وەرن من خۆمو منداڵمو خێزانمو ئێوەش وەرن، ئێمە دوعا دەكەین، ئێوەش دوعا بكەن، كە خوایە ! كێ درۆزنە نەفرینی لێ بێ، دەڵێ: سەرەتا ڕازی بوون دوایی، كە تەماشای پێغەمبەرو ﷺ فاطیمەی كچیو حەسەنو حوسەینی نەوەیو عەلی كوڕی (أبو طالب)یان كرد (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالى عَنْهُم)، یەكێكیان گوتی: وەڵڵاهی، كە تەماشای ئەو دەموچاوانە دەكەم دوعا لە هەركەسێك بكەن، خوا نەفرەتی لێ دەكاو، بەڵایەكی گەورەی بەسەردا دێنێ ! با ئەو مولاعەنەیە نەكەین، بۆیە پاشگەزبوونەوە گوتیان: هەر كەسە لەسەر دینی خۆی، وە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ لەم نۆ ئایەتەدا سەرەتا وەك هەموو سوورەتەكانی قورئان، جگە لە سوورەتی (التوبة) بەم ئایەتە بەرزو بەڕێزەوە دەست پێدەكات، (بسم الله الرَّحمن الرَّحيم) بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، پاشان وەك هەندێك لە سوورەتەكانی قورئان بە چەند پیتێكی پچرپچڕ دەست پێدەكات، كە بەیەكەوە ئاوێتە نەكراون، تاكو وشەیەكی ماناداریان لێ دروست بێت، بە چەند پیتێك (آلم) هەر بەو شێوەیە دەخوێنرێتەوە، ئەلیف. لام. میم، توێژەرەوانی قورئان وەك لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)دا باسمان كرد، لەبارەی ئەم پیتە پچرپچڕانەوە كە پێیان دەڵێن: (الحروف المقَطّعة) زۆر قسەیان كردوە، وە من زیاتر لە سی (٣٠) تەفسیرم تەماشا كردوە، بەڵام ئەوەی كە لە هەموویان زیاتر دێتە عەقڵەوە، وە بۆ هەموو كەسێكیش جێگەی تێگەیشتنە ئەوەیە: كە مەبەست لە بەكارهێنانی ئەو

پیتانە لە سەرەتای ئەو سوورەتانەی قورئاندا، كە بەو پیتانەوە دەست پێدەكەن، ئەوەیە كە خوای زاناو شارەزا دەیەوێ بەخەڵك بفەرموێ: ئەو قورئانە كە دوایین كتێبی منە، هەر لەو پیتانەو لەو دەنگانە پێكهاتوە كە ئێوە قسەیان پێدەكەنو شتیان پێدەنووسن، لە ئەلیفو لامو میمو صادو قافو نونو ... هتد، دەجا مادام ئێوەش ئەو كەرەستەیەتان لەبەر دەست دایە، كە قورئانی لێ پێكهاتوە كە پیتەكانن، ئێوەش ئەو بیستو هەشت (٢٨) پیتەتان لەبەر دەستدا هەن، دەفەرموون ئێوەش ئەگەر ڕاست دەكەن: قورئان فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ نیەو (موحەممەد ﷺ) دایناوە، قورئانێك بێنن، بەلام نەك ناتوانن قورئانێك بێنن، ناتوانن دە سوورەتیش بێنن، بەلكو نەتانتوانیوەو ناتوانن سوورەتێكی وەك (الكوثر)یش بێنن، كە كورتترین سوورەتە لە قورئان دا، كەواتە: بزانن كە بێژەری ئەم قورئانە خوای پەروەردگارەو، خوای بێوێنە ئەم قورئانەی فەرمووەو فەرمایشتی ئەوە، وە خوا ئەم فەرمایشتەی خۆی هەر لەو پیتانە پێكهێناوە كە ئێوە قسەیان پێدەكەن، بەلام ئێوە قسەی ئاساییان پێدەكەنو خوای كاربەجێ فەرمایشتێكی نائاسایی پێ فەرموو ون كە قورئانە، وە بێجگە لە خوا هیچ كەس لەتوانای دا نیە قورئانێكی وانا ! بەلكو دە سوورەت، وە بگرە سوورەتێكیش لەو جۆرە بفەرموێ، هەڵبەتە توێژەرەوانی قورئان زۆر شتیان گوتوە دەربارەی پیتەكان، بەلام لە هەموویان چاكتر ئەوەیە كە بەو شێوەیە مانایان لێبدرێتەوە، ئەگەرنا هەندێكیان گوتوویانە: ئەوانە ڕەمزو هێمان بۆ فلان شتو فلان شت، یان گوتوویانە: ئەوە ڕەمزێكە لەنێوان خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ، كە پێغەمبەری خوا بۆخۆی زانیویەتی بەلام بە ئێمەی نەگوتوە مەبەستی ئەو پیتانە چییە؟! بەلام ئەوە زۆر ناچێتە عەقڵەوە، هەرچەندە بە دڵنیایی ئەو پیتانە مانای دیكەو نهێنی دیكەیان لەژێردا هەیە، بەلام ناگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ خوای بەرز مانای ئەو پیتانەی پێ فەرموبێو، ئەویش بە ئۆممەتەكەی نەڵێ ! مەگەر نهێنییەكی تێدا هەبێ، كە تەنیا پێویست بێ پێغەمبەری خوا ﷺ بیزانێو، ئێمە پێویستییمان پێی نەبێ، بۆچی؟ چونكە خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی بە ڕۆشنكەر (مُبَيِّن)ی قورئان داناوە، وەك

دەفـــــــــــــــــەرموێ: ﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل، واتـە: وە بیـرخەرەوەمان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تـاکو ئـەوەی بۆ لای خـەڵـکی نێرراوەتـە خـوار بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، وە بـەڵکو خۆشیان بیـربکەنەوە.

کەواتـە: مـادام پێغەمبـەر ﷺ ڕوونکـەرەوەی کتێبـی خـواو فەرمایـشتی خوابـێ، هەرچی ناڕۆشـن بـێو ئـەو زانیبـێتی، دیارە بـۆ ئێمـەی ڕۆشـنکردۆتەوە، جا چ بـە قـسە، چ بـە کـردەوە کـە بـە زۆریـی بـە کـردەوە پێغەمبـەر ﷺ قورئـانی ڕۆشـنکردۆتەوە، چونکە ئـەوی دیکـە بۆخـۆی ڕۆشـنە، وە بـە دڵنیـایی یـەوە، هـیچ کەسێکیش ناتوانێ هەموو ئامانجو مەبەستەکانی کـە لـە فەرمایـشتی خـوای بـەرزو لـە ئایەتـەکانی خـوادا هـەن بزانـێ، وە بێگومـان پێغەمبـەری خـواش ﷺ کـە لـە هـەموو کـەس شـارەزاتر بـووە، ئـەویش هـەر بەقـەدەر خـۆی لـە فەرمایـشتی خـوا تێگـەیشتوە، ئەگەرنا هیچ کەس بە قەدەر خوا لـە فەرمایـشتی خـوا تێناگـات، واتـە: هیچ کەس هەموو ئەو ماناو مەبەستانەی کە لـە فەرمایـشتو کـەلامی خـوادا هـەن، نایانزانێ بێجگە لە خوا ﷻ جا خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، خوا بێجگە لـەو هـیچ پەرسـتراونین، خـــاوەنی ژیـــانی هەمیـــشەییە، وە سـەرپەرشتیکـــارو مـــشوورگێڕە، واتـــە: سەرپەرشتیکاری بوونـەوەرو مـشوورگێڕی بوونـەوەرو مرۆڤـ و فریـشتەکانو بـاقی دروسـتکراوەکانە، ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، کـتێبی بـە هـەق دابـەزاندوە بـۆ سەر تۆ، واتە: قورئان بە شێوەیەکی هـەق دابـەزێنراوە بـۆ سـەر تـۆ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ، وە هەقیـشی لەنێوخـۆدا هەڵـگرتوە، وە بـۆ هێنانـەدی هـەقیش دابـەزێنراوە، هـەر سـێ واتاکـەی دەگەیـەنێ: ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، قورئـان هەرچـی لـە پـێش خۆیـەوەیە لە کـتێبەکانـی خـوا، بـە ڕاسـتیان دەزانـێ، واتـە: وەك ئەسـڵەکەیـان بـە ڕاسـتیان دەزانـێ، هـەروەك پێغەمبـەریش ﷺ پێغەمبـەرانی پـێش خـۆی هەموویان بەڕاست دەزانێ، هەر لە ئـادەمـەوە هەتا عیسا (صەڵاتو سەلامی خـوا

لەسەر هەموویان بێ)، موحەممەد ﷺ هەموو پێغەمبەران بەڕاست دەزانێ، وە قورئانیش هەموو كتێبەكانی خوا بە ڕاست دەزانێ، وەك ئەسڵەكەیان، بەڵام نەك وەك واقیعەكەیان كە ئێستا هەن و دەستكاریی كراون و گۆڕدراون، بەڵكو وەك واقیعەكەیان كە ئێستا هەن، قورئان بەسەر هەموویانەوە چاودێرە، هەڵەكانیان ڕاست دەكاتەوە، لە كوێ لایانداوە، لە كوێ هەڵەو پەڵەیان تێخراوە، ئەوەی خوا بە پێویستی زانیبێ، ڕاستی كردۆتەوە وەك: لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٤٨)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ .... ﴾، واتە: وە كتێبمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، كتێبەكانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، وە بە سەریشیان چاودێرە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ ... ﴾، واتە: وە پێشتریش تەورات و ئینجیلی ناردوونە خوار، كە ڕێنمایین بۆ خەڵك، دیارە هەموو كتێبەكانی خوا ڕێ پێشاندەرن بۆ خەڵكو، هەموو كتێبەكانی خوا بۆیە هاتوون ڕێیەك پێشانی خەڵك بدەن، كە خوای پەروەردگار لێی ڕازیبێ، ژیانی تاكییان، ژیانی خێزانییان، ژیانی كۆمەڵایەتییان، ژیانی سیاسییان، بۆ خەڵك ڕۆشنكردۆتەوە، ئەو ژیانەی خوای پەروەردگار بەو شێوە ژیانە لە ئینسان ڕازی دەبێ، وە بەو شێوە ژیانەش ئینسان لە دنیادا بەختەوەر دەبێ، وە لە دواڕۆژیشدا سەرفراز دەبێ ﴿ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ ﴾، وە (خوا) لێك جیاكەرەوەی ناردۆتە خوار، لێك جیاكەرەوەی هەقو ناهەق، حەڵاڵو حەرام، ڕاستو چەوت، كە دەگونجێ لێرەدا مەبەست لە (فورقان) قورئان بێت بە تایبەت، وە دەشگونجێ مەبەستی هەموو كتێبەكانی خوابێ، چونكە هەموو كتێبەكانی خوا ئەوە ئەركیان بووە كە هەقەو ناهەق، ڕاستو چەوت، حەڵاڵو حەرام، بۆ خەڵكی لە یەك جیا بكەنەوە، ئنجا خوا باسی هەڵوێستی ئەوانە دەكات، كە بڕوا بە ئایەتەكانی خوا ناكەن، كە ئەمە زەمینە خۆشكەرە بۆ چوونە نێو باسی هەڵوێستی نەصرانیی یەكان، كە هاتوون وتووێژیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ كردوە، شتی ناهەقو بێجێیان باسكردوە، كە گوتوویانە:

عیسا کوڕی خوایە، یاخود خوای پاكو تاك لە سێ بەش پێکهاتوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ...﴿٧٣﴾﴾ المائدة، واتە: بێگومان ئەوانەی، کە گوتیان: خوا سێیەمی سێیەکانە بێبڕوان، دەڵێن: خوا لە سێ بەشان پێکهاتوە، واتە: خوا ﷻ بۆخۆی، عیسا، وە مەریەمی دایکی، وە هەندێکیش دەڵێن: خوا بۆخۆیو، عیساو جیبریل، کە دیارە ئەوە هەموو شتی بێجێو بێ مانایەو، خوا هەریەکە، بۆیە خوای پاكو تاك لە سەرەتاوە ئاوای دەست پێکرد ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾، خوا بێجگە لەو هیچ پەرستراونین، خاوەنی ژیانی هەمیشەییە، وە سەرپەرشتیکەری غەیری خۆیەتی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی خوا، سزایەکی توندو بە ئێشیان بۆ هەیە، وە خواش زاڵی خاوەن تۆڵەیە، دەسەڵاتی هەیە و بالاْ دەستە هەرکەسێك لابداتو سەرپێچیی بکات دەتوانێ بەسەریدا زاڵ بێ، خاوەن تۆڵەشە، تۆڵەی لێ دەستێنی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾، خوا هیچ شتێکی لێ ون نابێ، نە لە زەویو نە لە ئاسمان ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾، ئەو کەسێکە کە وێنەتان دەکێشێ لە نێو منداڵدانەکان دا (منداڵدانی ئافرەت) چۆنی بوێ، ئایا عیسا ﷺ وێنەی کێشراو نەبووە، وێنەو دیمەنێکی نەبووە؟! با، کێ وێنەی کێشاوە؟ خوا ﷻ کەواتە: ئەوە کە عیسا خاوەن وێنەو دیمەنێك بووە، مانای وایە کەسێك ئەو دیمەنەی بۆ کێشاوە، چونکە خۆ خۆی وێنەی خۆی نەکێشاوە، لە ڕەحمی دایکی دا، بەڵکو خوای پەروەردگار وێنەی کێشاوە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراونین زاڵەو کاربەجێیە، کەواتە: غەیری خوا مەپەرستن، چونکە بێجگە لە خوا هیچ کەسی دیکە شایستەی پەرستران نیە، کە لێرەدا، وە لە شوێنەکانی دی لە قورئاندا کە دەفەرموێ: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، واتە: هیچ

پەرستراوی بە هەق بێجگە لە خوا نین، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق زۆرن، نەصرانیی یەكان عیسا دەپەرستن، دایكی دەپەرستن، بتپەرستەكان بت دەپەرستن، ئارەزوو پەرستەكان ئارەزوو دەپەرستن، مانگو خۆر پەرستەكان مانگو خۆر دەپەرستن، كە دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، واتە: هیچ پەرستراوی بە هەق كە شایستەی پەرستران بێ، بوونی نیە، بێجگە لە خوا، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق زۆرن، كەواتە ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، واتە: هیچ پەرستراوی بەهەق نین بێجگە لە خوا، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق ئەوە دیارە دنیایان پڕكردووە، ئنجا خوای زاناو شارەزا دێتە سەر پێناسەكردنی قورئان لە ڕووی دابەشبوونی ئایەتەكانییەوە بۆ دوو جۆر:

١/ ئایەتی (مُحْكَم).

٢/ ئایەتی (مُتَشابه).

دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، خوا ئەو كەسەیە، كە كتێبی ناردۆتە سەر تۆ ﴿ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ ﴾، ژمارەیەكی زۆر لە ئایەتەكانی بەڵكو زۆربەی هەرە زۆری ئایەتەكانی (مُحْكَمات)ن، موحكەمیش واتە: ڕۆشن، چونكە (مُحْكَم) هەر شتێكە چاك دروست كرابێو قاییم بێو، هیچ كەلێنو درزی تێدا نەبێ، واتە: ئەو ئایەتانەش ئەگەر (إحتِمال)ی هیچ مانای دیكەیان نیە، غەیری ئەو مانایە كە زۆر ڕۆشنە، جا زۆربەی ئایەتەكانی قورئان مانایان ڕۆشنو ڕوونە، وە ئینسان بە ئاسانی لێیان تێدەگات ﴿ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئەو ئایەتانەی كە مانایان ڕۆشنە، بنەڕەتی قورئانن، ئەسڵی قورئان بریتیە لەو ئایەتانە، بەڵام وێڕای ئەو ئایەتانە كە زۆرینەی هەرە زۆری ئایەتەكانی قورئانن ﴿ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ﴾، چەند ئایەتێكیش لە قورئان دا هەن كە (مُتَشابِهات)ن، (مُتَشابِهات) كۆی (مُتَشابِهة)ە، وە (مُتَشابِهة) واتە: ئایەتێك كە چەند مانایەكی وێكچووی هەیە، ئەو مانایەی هەیەو ئەو مانایەشی هەیەو، ئەوەشی هەیە،

ئایەتی وا هەیە دە (١٠) مانای هەیە، ئایەتی وا هەیە حەوت (٧) مانا هەڵدەگرێ، بەپێی ئیعتیباراتی جیا جیا، بەپێی گۆشەنیگای جیا جیا، کە ئەوانەی شارەزای قورئان بن ئەوە دەزانن، زۆربەی هەرە زۆری ئایەتەکانی قورئان ماناکەیان ڕۆشنە، بەڵام هەندێك لە ئایەتەکان هەن ماناکەیان ناڕۆشنە، لەبەر ئەوەی زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن، ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ﴾، ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایەو لادانی تێدایە، بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە ئایەتی (مُتَشابِه)ن، واتە: ئەو ئایەتانەی کە مانای جۆراو جۆریان هەیە، مانایەك زیاتر هەڵدەگرن، ماناکەیان ڕۆشن نیە، بۆچی؟ ﴿ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ ﴾، بە مەبەستی ئاژاوە دروستکردن و سەر لە خەڵك شێواندن ﴿ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ ﴾، وە بە مەبەستی لێدانەوەی ماناو مەبەستێکی چەواشەکەرانە، واتە: ئەو دوو پاڵنەرەیان هەیە کە بە دوای ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەون، لە جیاتی بەدوای ئایەتە موحکەمەکان بکەون، زۆربەی هەرە زۆری ئایەتەکانی قورئان ئایەتی موحکەمن، وە ئەوانەش بنەڕەتی قورئانن، وە بەهۆی ئەوانیشەوە لە ئایەتە موتەشابیهەکان حاڵی دەبین، ئنجا نەك هەر فەرمایشتی خوا، قسەی ئینسانەکانیش هەر وایە، کەسێك قسەیەك دەکات ماناکەی زۆر ڕۆشنەو، یەك واتای هەیە، بەڵام جاری وایە قسەیەك دەکات ڕەنگە دوو واتا سێ واتا هەڵبگرێ، ئەگەر کەسێك مەبەستی چاك بێتو مەبەستی خراپی نەبێت، لەژێر ڕۆشنایی ئەو قسەیەی، کە ماناکەی ڕۆشنە، ئەو قسەیەش مانا دەکاو تەفسیر دەکاو لێکیدەداتەوە، کە ماناکەی ناڕۆشنە، بەڵام کەسێك کە مەبەستی خراپ بێت بەدوای ئیشکالو شوبهەدا بگەڕێ، لە جیاتی ئەوەی تەماشای قسە ڕۆشنەکە بکات، تەماشای ئەو قسەیە دەکات، کە مانای زیاتر هەڵدەگرێو، ناڕۆشنەو، دەبێتە هۆی سەر لەخۆ تێکدانیو سەر لە خەڵك تێکدانیشی، جا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴾، تەئویل، بەمانای گێڕانەوەی واتاکەی بۆ سەر ئەسڵەکەی خۆی، وە گێڕانەوەی مانای ئایەتەکان، واتا

ناڕۆشنەكان بۆ ئەو ئایەتانەی كە واتایان ڕۆشنە ئەوە تەنیا خوا ﷻ دەیزانێ، جا لێرەدا توێژەرەوانی قوڕئان هەندێكیان لێرەدا دەوەستن، دەڵێن: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ﴾، بە تەنیا خوای زاناو شارەزا تەئویلی ئەم ئایاتانە دەزانێ، هەندێكیشیان لێرەدا ناوەستن بەڵكو دەڵێن: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾، تەئویلی ئەو ئایەتانە تەنیا خوا وە ئەوانەی، كە بە زانیارییدا ڕۆچوون دەیزانن، كەواتە: زانایانی بەهێزیش، زانایانی ڕۆچوو و قوڵبووەوەش، تەئویلی ئایەتەكان دەزانن، من ئەو مانایەم پێ چاكترەو بەهێزترە، بۆیە پێم وایە نابێ لەسەر وشەی (الله) بوەستین، بەڵكو دەبێ ئاوا بیخوێنینەوە، ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾، واتە: كەس تەئویلەكەی نازانێ، بێجگە لە خواو زانایانی ڕۆچوو بە زانیاریی دا، بەڵام ئەوەی هەروا سەطحیی بێ تێناگات، هەڵبەتە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا ئەم بابەتە زیاتر دەتوێژینەوە، دوایی خوا لەسەر زمانی ئەوانەی بە زانیارییدا ڕۆچوون، دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا﴾، دەڵێن: ئیمانمان پێ هێنا، (واتە: ئیمانمان بە قورئان هێناوە)، هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە، چ ئایەتە مانا ڕۆشنەكان (مُحْكَمات)، چ ئایەتە مانا ناڕۆشنەكان (مُتَشابهات)، وە هەمووشی حیكمەتی خۆی تێدایە، كە دوایی باسی دەكەین، حیكمەتی چییە خوای كاربەجێ هەندێ لە ئایەتەكانی قورئانی بەو شێوە ناردوون، كە زیاتر لە واتایەك هەڵبگرن، یاخود واتاكەیان ڕۆشن نەبێ، وە پێویستی بە تەئویلو گێڕانەوە هەبێ، بۆ سەر ئەسڵو بنەڕەتەكەیان؟! ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾، وە تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن، تەنیا ئەوان ڕاستییەكانیان دێتەوە بیر، ئەوەی عەقڵی نەبێ پەند لە هیچ شتێك وەرناگرێ، لێرەدا بۆمان دەردەكەوێ كە بەڕاستی ئینسانی عاقڵ زیاتر لە قورئان تێدەگاتو، زیاتر دەتوانێ ئامانجەكانی قورئان بپێكێو، لە مەبەستەكانی تێبگات، ئنجا خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئەو زانایانە كە دەپاڕێنەوە، دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ

أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾، پەروەردگارمان ! دوای ئەوەی ڕێنماییت کردووین، دڵمان لامەدە، وە لەلایەن خۆتەوە بەزەییەکی گەورەو فراوانمان پێ ببەخشە، بێگومان تۆ بەخشەری، واتە: دوای ئەوەی هیدایەتت داوین بەهۆی ئایەتە موحکەمەکانەوە، دڵمان لامەدە بەهۆی لێ تێنەگەیشتنی ئایەتە موتەشابیهەکانەوە، بێگومان تۆ هەرە بەخشندەی، دەجا زیاتر بەزەیی خۆتمان پێ ببەخشە، کە زیاتر لە قورئان تێبگەین، وە زیاتر لە ئایەتەکانت بەهرەمەندبین ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٍ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴾، پەروەردگارمان ! بێگومان تۆ کۆکەرەوەی خەڵکی بۆ ڕۆژێك، کە هیچ گومانی تێدانیە، بێگومان خوا بەڵێنی خۆی پێچەوانە ناکات، بەڵێنێکی کەدا دەیهێنێتە جێ، کەواتە: ئەوە سیفەتەکانی ئەو زانایانەن کە دەتوانن ئەوانیش لەقەدەر خۆیان نەك بەقەدەر خوای بێوێنە، بەڵکو لەقەدەر خۆیان، لە ئایەتەکانی قورئان حاڵی بن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** دەربارەی هۆی هاتنە خواری سووڕەتی (آل عمران)، کە تاکو سەرووی هەشتا (٨٠) ئایەت، - وەك زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن - کاتێك بووە کە وەفدێکی نەصرانیی یەکان، کە لە نەجرانەوە هاتن موناقەشەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، دەربارەی عیسا ﷺ و مەریەمی دایکیو، ئەو قسە بێجێیانەی کە نەصرانیی یەکان دەیکەن، پێغەمبەریش ﷺ وتووێژی لەگەڵ دا کردن، ئیدی ئەو ئایەتانە بەو بۆنەیەوە هاتوونەتە خوار، جا ئەو بەسەرهاتانە، کە کتێبەکانی تەفسیر باسیان کردوون، لە ڕووی سەنەدەوە بەهێز نین، بەلام بە سەرنجدانی ئایەتەکانو سیاقی ئایەتەکان، وە ئەو بەسەرهاتەی کە لەوبارەوە گێڕدراوەتەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەگەری ڕاستبوونی بەهێزە، هەرچەندە لە ڕووی سەنەدو گێڕرانەوەوە ئێمە بە زنجیرەیەکی بەهێز دەستمان نەکەوێ، بەلام کە تەماشای ئایەتەکان دەکەین دەبینین وتووێژێکە لە نێوان ئیسلام لەلایەکو، فیکرەی نەصرانیی

لەلایــەکی دیکــەوە، وەك دوایــی لــە تەفــسیرکردنی ئایەتــەکان دا ئــەو حەقیقـەتەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە، دیارە ساڵی نۆیـەمی کۆچیی، بـە ساڵی وەفـدەکان (**عـام الوفـود**) بەناوبانگـە، بـەڵام وەك پێـشتـریش گوتمـانو ڕوونمـان کردەوە، ناگونجـێ سـووڕەتی (آل عمـران) هـەمووی لـە سـاڵی نۆیـەمی کۆچییدا، واتە: دوای ئـازادکردنی مەککە هاتبێتە خوارو، دەبـێ زۆربەی پێشتـر هـاتبـێتـە خـوارو، ناچارین بڵێین: بەشێکی ئەم سووڕەتە کە بەشی یەکەمو سەرەتایەتی، لــە دوای ئایــەتی (٣٣)ەوە هــەتا ئایــەتی (١٢٠)، بــە بۆنــەی هــاتنی وەفــدی نەصـرانییەکانی نەجرانـەوەو وتوێـژیان لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ دا هاتۆتـەخوار، بەڵام زۆربەی ئەم سووڕەتە کە (٣٣) ئایـەتی سـەرەتاو لـە ئایـەتی (١٢١)ەوە هـەتا کۆتایەتی، لە ساڵانی (٢ ، ٣ ، ٤ ،...)دا هاتۆتە خوار.

**مەســەلەی دووەم**: خـــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، وشــەی: (**بِـالحَقِّ**) واتـە: خـوا کــتێبی خـۆی بەهــەق نــاردۆتە ســەر تـۆ، جـا ئـەوە ســێ واتایان هەڵدەگرێ:

١/ دەگونجـێ مەبەست پێـی ئـەوەبێ، کـە ئامـانجی هاتنی قورئـان هەقـە، ئـەویش ئەوەیە کـە قورئان هاتوە ڕێنمایەی خەڵك بێ، بۆئەوەی فێری ژیانێکـیان بکات کـە خـوای پەروەردگـار لــێی ڕازی بــێ، ژیانێـك کـە ئینـسان لـە دنیـادا پێـی بەختەوەر دەبـێ، وە لە دوارۆژ پێی سەرفراز دەبێ.

٢/ وە دەگونجــێ مەبەســت پێــی ئەوەبــێ، کــە قورئــان دابەزیــوەو هــەقی لــەنێو خۆیــەوە گرتوە.

٣/وە دەشگونجێ مەبەست پێـی ئـەوەبێ، شـێوازو کـاتیو دابـەزینی قورئـان هەقـە، هەڵبەتـە لەیـەك کاتـدا هەرسـێکیـشیان مەبەســت بــێ هــەر دەبــێ، کەواتـــە: (بِالحَقِّ) هەموو ئەو واتایانە هەڵدەگرێ.

**مەسەلەی سـێیەم**: کە دەفـەرموێ: ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، قورئان ئەو کـتێبانەی کە لە پـێش خۆیـەوە بـوون بـە ڕاسـتیان دەزانـێ، ئـەویش مەبەستی ئەوەیـە کـە قورئان کتێبەکـانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانـێ لـەو ڕووەوە کە لەلایـەن خـواوە

هاتوون، وەك ئەسڵەکەیان، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەنییە کە قورئان تەوراتی ئێستاو ئینجیلی ئێستاو زەبووری ئێستا، یاخود هەر کتێبێکی دیکە، کە پاڵ بدرێتە لای پێغەمبەرێکی خوا، ئێستا بە ڕاستیان دەزانێ! چونکە جگە لە قورئان کە تاکە کتێبی خوای پەروەردگارە دەستکاریی نەکرابێ‌و پارێزراوبێ، هەموو ئەو کتێبانەی دیکەی خوای پەروەردگار، بە دڵنیایی دەستکاریی کراون‌و گۆڕدراون، کەواتە: قورئان‌و هەموو کتێبەکانی خوا وەك هاتنیان لەلایەن خواوە، بەڕاستیان دەزانێ، وەك حاڵەتی ئەسڵییان، نەك وەك واقیعی ئێستایان، کە قورئان بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿...يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ... ﴿٤٦﴾﴾ النساء، واتە: وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەن.. لە شوێنێکی دی دەفەرموێ: ﴿...يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ... ﴿١٣﴾﴾ المائدة، واتە: وشەکان پاش دانرانیان لەجێی خۆیاندا، دەگۆڕن.. لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿...وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ... ﴿١٣﴾﴾ المائدة ، واتە: بەشێك لەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون، لە بیریان کرد.

**مەسەلەی چوارەم:** دەربارەی وشەی تەورات‌و وشەی ئینجیل، زانایان زۆر خۆیان ماندوو کردوە، کە لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە ئیشتیقاقێکیان بۆ بکەن، کە لە زمانی عەرەبی وەرگیرابن، بەڵام لە ڕاستیدا خۆ ماندوو کردنەکە بێسوودە، چونکە وشەی تەورات وشەیەکی عیبریی یە، کە بە مانای شەریعەت‌و بەرنامە دێت، وشەی (ئینجیل)یش وشەیەکی یۆنانییە ئەویش بەمانای موژدە دێت، کەواتە: دوو وشەی غەیرە عەرەبین‌و مانای وایە لە زمانی عەرەبیدا گەڕان بۆ ڕیشەی وشەی تەورات، یان ئینجیل شتێکی بێ‌مانایە، چونکە لە ئەسڵدا عەرەبی نین، تاکو بۆ ڕیشەکەیان لە زمانی عەرەبیدا بگەڕێین.

**مەسەلەی پێنجەم:** خوای پەروەردگار کە باسی فورقان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ﴾، هەرچەندە لە هەندێ شوێندا وشەی: (فورقان) بۆ قورئان بەکارهاتوە، بۆ وێنە: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَـٰلَمِينَ نَذِيرًا

﴿١﴾ الفرقـان، وە پێشتر باسمان كرد، كە (فورقان) واتە: جیاكەرەوە، جیاكەرەوەی هەقو ناهەق، جیاكەرەوەی ڕاستو چەوت، جیاكەرەوەی چاكو خراپ، جیاكەرەوەی حەڵاڵو حەرام، جیاكەرەوەی پاكو پیس...هتد، بەڵام دەكرێ بڵێین: (فورقان) یەكێكە لە ناوەكانی دوایین كتێبی خوا كە قورئانە، هەرچەندە دوایین كتێبی خوا زیاتر بەناوی قورئان مەشهوور بووە، ئەگەرنا (فورقان)یشی پێ دەگوترێو كیتابیشی پێ دەگوترێ، زیكریشی پێ دەگوترێ، بەڵام وەك وەسف هەموو كتێبەكانی خوا فورقان بوون، هەموو كتێبەكانی خوا بۆ سەر ئۆممەتەكانی خۆیان، جیاكەرەوەی هەقو ناهەقو، ڕاستو چەوتو، چاكو خراپو، حەڵاڵو حەرامو... هتدن، چونكە بێگومان هەموو كتێبەكانی خوا فەرمایشتی خوانو لەو ڕووەوە، كە فەرمایشتی خوان، جیاوازییان لەنێواندا نیەو، هەموویان لەیەك ئاست دان، بەڵام خوا ﷻ لە ڕۆژگاری ئیبراهیمدا ئەو فەرمایشتانەی فەرموونی پڕ بە پێستی واقیعی ئەو كاتە بوونو، لە (صُحُف)دا بەرجەست بوون، كە دیارە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) (صُحُف)ی هەبووە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ١٩ ﴾ الأعلى، وە لە ڕۆژگاری مووسادا خوا ﷻ تەوراتی فەرمووە، وە لە ڕۆژگاری عیسادا ئینجیلی فەرمووە، وە لە ڕۆژگاری داوود دا زەبووری فەرمووە، یانی: خوا فەرمایشتێكی فەرمووە كە دوایی ناوی لێنراوە: صوحوفو تەوراتو زەبوورو ئینجیل، جا ئەوانە لەو ڕووەوە كە فەرمایشتی خوان، هەموو وەك یەكن، بەڵام دیارە كۆتا فەرمایشتی خوا قورئانە، كە بۆ قۆناغی كۆتایی بەشەری فەرمووە، وە بۆ پێغەمبەری كۆتایی ناردوە، كە موحەممەدە ﷺ .

**مەسەلەی شەشەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُ ﴾، خوا ئەو كەسەیە كە وێنەتان دەكێشێ لەنێو مندالّدانەكاندا چۆنی بوێ، ئەوە دیارە خوای پەروەردگار ڕوو لە هەموو ئەوانە دەكات كە دەیاندوێنێو ڕوو لە هەموو خەڵكی دەكات، بەڵام دەگونجێ بڵێین: وەڵامێكی

ددان شكێنی تێدایە بۆ نەصرانیی یەكان، ئەوانەی كە عیسا عليه السلام بە كوڕی خوا دەزانن، یاخود بە بەشێك لە خوای دەزانن، وەك پێشتر باسمان كرد نەصرانیی یەكان بڕوایان بە سێ (ئوقنووم)ەكان هەیە (الأقانیم الثلاثة) دەڵێن: خوا ﷻ سێ بەشە: خوا بۆخۆی، وە عیسا، وە (رُوحُ القُدُس)، هەندێكیان لە جیاتی (رُوحُ القُدُس) گوتوویانە: مەریەم، كە لە ڕاستی دا ئەوە جگە لە ئەفسانە هیچی دیكە نیە، خوا تەنیا یەكێكە ﷻ بۆیە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ ...﴿٧٣﴾﴾ المائدة، واتە: بێگومان بێبڕوان ئەوانەی، كە گوتیان: خوا سێیەمی سێیەكانە، وە سووڕەتی (الإخلاص) بە باشترین شێوە پێناسەی وەحدانیەتی خوا دەكات، وەك دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم، قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴿٣﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴿٤﴾﴾، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بڵێ خوا تاكە (واتە: وێنەی نیە)﴿١﴾ خوا بێ نیازەو جێی نیازە (الصمد: ئەوەیە كە خۆی پێویستی بە هیچ شتێك نەبێ‌و، بە هیچ كەسێك نەبێ، وە هەموو كەسێك‌و هەموو شتێك پێویستی بەو هەبێ)﴿٢﴾ كەسی لێ نەبووە، وە لە كەسیش نەبووە (واتە: نە ئەسڵی هەیە، نە فەرعی هەیە)﴿٣﴾ وە هیچ كەس هاوتای خوا نیە﴿٤﴾). جا وەڵامەكە بەو شێوەیە كە ئایا عیسا (علیه السلام) وێنەو دیمەنێكی هەبووە یان نا؟ بە دڵنیایی هەیبووە، وە پێغەمبەران هەموویان لە جوانترین وێنەدا خوا دروستی كردوون‌و وێنەی كێشاون، ئنجا هەموو وێنەیەك وێنەكێشێكی دەبێ، ئایا كێ وێنەی عیسای كێشا لە منداڵدانی دایكی دا، لە منداڵدانی مەریەمدا (سەلامی خوای لێبێ)؟ بەدڵنیایی خوای پەروەردگار، كەواتە: ناگونجێ وێنەكێشراو (مُصَوَّر) لەگەڵ وێنە كێش (مُصَوِّر)دا كە خوای تاكو بێ وێنەیە، بخرێتە تەرازوویەوە، وە یەكێك لە ناوەكانی خواش (جَلَّ شأْنهُ) بریتیە لە (المُصَوِّر) وەك دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ ...﴿٢٤﴾﴾ الحشر.

**مەسـەلەی حەوتـەم:** تویـژەرەوانی قورئـان لـەبارەی (مُحْكَمَـات)و (مُتَـشَابِهَات) قسەیان زۆر كـردوە، وە مـن لـەوبارەوە كـە پێـشتریش ئامـاژەم پێـدا، سـەرنجی زیـاتر لـە (٣٠) تەفسیـرم داوە، بـەلام ئـەوەی كـە دێتـە زەینـەوە، وە مانایـەكی رێكو روونە ئەوەیە كە (مُحْكَمَات)، واتـە: ئـەو ئایەتانـەی كـە مانایان رۆشنـەو (مُتَشَابِهَات) واتـە: ئـەو ئایەتانـەی كـە زیـاتر لـە واتایـەك هەڵـدەگرن، بۆیـە ماناكەیان رۆشـنو دیاریكراو نیـە، چونكە زیـاتر لـە واتایـەكیان هەیـە، بۆچـی وا دەڵێیـن؟ چـونكە وشـەی (مُحْكَمَات) كـۆی: موحكەمەیـەو (مُحْكَم)یـش، واتـە: قاییمـكراوو بـاش بنیـاتنراو، دەگـوترێ: (قَلْعَـة مُحْكَمَـة)، واتـە: قەلایـەكی مەحكەم، كـە كـەلێنی نـەبێ، وە شـوێنی درزی نەبـێ، وە وشـەی (مُتَشَابِه)یـش واتـە: وێكـچوو، وەك لـە قورئـان هـاتوە، كاتێـك مووسا عليه السلام بـە بـەنی ئیـسرائیل دەفەرموێ: مانگایەك سەرببـڕن، دەڵێن: ﴿ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا ... ﴿٧٠﴾ ﴾البقـرة، واتە: مانگاكان لای ئێمە هەموو وێكدەچن، نازانین كامیان سەربڕین، ئنجا هـەر لـە سـوورەتی بەقـەرەدا دەربـارەی میـوەی بەهەشـت، دەفـەرموێ: ﴿ ... وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ... ﴿٢٥﴾ ﴾البقـرة، واتـە: میـوەی بەهەشـتیان بـۆ هێنـرا بـە وێكـچوویی، (مُتَشَابِه) واتە: وێكدەچێ، جا چ لەنێوخـۆی دا میـوەی بەهەشـتێ هـەندێكی بـە هەنـدێكی دەچـێ، لـە تـاموچێژو خۆشـیی دا، یـاخود لـە رەنـگ دا لـە چـۆنیەتیی‌و وێنـەدا لەگـەڵ میـوەی دنیـادا وێكدەچـن، گـرنگ ئەوەیـە (آیات مُتَشَبَهَات) واتە: ئەو ئایەتانەی كە مانایـان وێكچوویان هەیـە، واتـە: هـەر یـەك مانای نیە، وە هەرشتێكیش هەندێكی لەگەڵ هەندێكی دیكەی وێكچوو، ئینسان لـێی تێكـەڵ دەبـێ، بۆیـە خـوا سبحانه وتعالى دەفـەرموێ: ئەوانـەی كـە دڵیـان گـومڕایی تێـدایـە بـە دوای موتەشـابیهاتەكان دەكـەون، ئـەو ئایەتانـەی كـە مانـای جـۆراو جۆریـان هـەیــە، مانـای وێكـچوویان هــەیە، سـەریان لــێ دەشـێوێ، چــونكە ئینسـان بەهـۆی ئایەتە موحكەمەكانەوە كە مانایەكی رۆشـنو رێـكو راسـتیان هـەیە، بـۆی دەردەكـەوێو لـە ئایەتـە موتەشـابیهەكان حـاڵی دەبـێ، جا لێـرەدا بۆمـان دەردەكـەوێ كـە (مُحْكَم) بـوونو (مُتَشَابه) بـوونی ئایەتـەكانی قورئـان،

شتێكی ڕێژەیی یە لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی دیكە دەگۆڕێ، ئەوەی شارەزایی زیاتر بێ ئایەتە موحكەمەكان زۆر دەبنو لەبەرچاوی زۆربەیان مانایەكی ڕۆشن هەڵدەگرن، وە ئایەتە موتەشابیهەكان كەم دەبنەوە، بەڵام ئەوەی شارەزایی كەم بێ، ئایەتە موتەشابیهەكان لەلای ئەو زۆر دەبن، وە ئایەتە موحكەمەكان كە مانایان ڕۆشنە، لەلای كەم دەبنەوە.

**مەسەلەی هەشتەم**: ئەوە كە گوترا دەربارەی مانای ئایەتەی موحكەمو موتەشابیهەكات، لە ڕووی لێ تێگەیشتنەوە بوو، واتە: لە ڕووی تێگەیشتنەوە ئایەتەكانی قورئان زۆربەیان - وەك پێشتر گوتمان - موحكەماتنو مانایان ڕۆشنو ڕوونە، وە كەمێكیشیان موتەشابیهاتن، واتە: مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرنو لە مانایەك زیاتر هەڵدەگرن، بەڵام لەڕووی پتەوییو بێ هەڵەو پەڵەییەوە، هەموو ئایەتەكانی وێكچوون، وە هەموو ئایەتەكانی قورئانیش موحكەمن، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (هود) لە ئایەتی ژمارە (١)دا هەموو ئایەتەكانی قورئانی بە موحكەم داناوە، دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ: الٓر كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەلیف. لام. ڕا، (ئەم قورئانە) كتێبێكە ئایەتەكانی موحكەم كراون، هەموو ئایەتەكانی موحكەمن، دوایی ڕوونكراونەتەوە لەلایەن كاربەجێی شارەزاوە، كە خوایە ﷻ، كەواتە: لەم ئایەتەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، كە هەموو ئایەتەكانی قورئان موحكەمنو ئەم موحكەمە لێرەدا، واتە: هەڵەی تێدانیەو كەموكووڕیی تێدانیەو هەمووی بەو شێوەیەی كە فەرمایشتی خوا دەیخوازێ، دانراون، هەروەها لە سوورەتی (الزمر) لە ئایەتی (٢٣)دا، خوای كاربەجێ هەموو ئایەتەكانی قورئانی بە (مُتَشَابه) وەسف كردوە، دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ...﴾، واتە: خوا ﷻ باشترین فەرمایشتی ناردۆتەوە خوار، وێكچوویە، دووبارە دەكرێنەوە ئەوانەی، كە لە پەروەردگاریان دەترسێن پێستیان وێكدێ بەهۆی (گوێ بیستبوونی، یان خوێندنەوەی)

ئایەتەکانەوە، کەواتە: لێرەدا هەموو ئایەتەکانی قورئان بە (**مُتَشَابه**) لەقەڵەم دراون، واتە: هەموو ئایەتەکان وێکدەچن لەڕووی ڕێك و پێکیی و موحکەمیی و لەو ڕووەوە، کە بە هیچ شێوەیەك کەموکووڕییان تێدا نیە.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئایەتە موحکەمەکان زیاترن لە ئایەتە موتەشابیهەکان، چونکە خوا ﷻ وایفەرمووە، وەك دەفەرموێ: ﴿مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾، ئەم تەعبیرە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە زۆربەی قورئان ئایەتەکانی موحکەمن و مانا ڕۆشنن، کەمێکیان مانای وێکچوو و جۆراوجۆر هەڵدەگرن.

**مەسەلەی دەیەم:** خوای کاربەجێ بە ڕاشکاویی فەرموویەتی: ئایەتە موحکەمەکان بناغەو بنەڕەتی قورئانن ﴿مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾، واتە: ئەو ئایەتە موحکەمانە بنەڕەت و بناغەی کتێب (قورئان)ن، کەواتە: پێویستە بۆ لێتێگەیشتنی ئایەتە موتەشابیهەکان، بگەڕێینەوە لای ئایەتە موحکەمەکان، چونکە ئەوان ئەسڵ و بناغەی قورئانن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** وازهێنان لە ئایەتە ڕۆشنەکان و گەڕانەوە بۆ ئایەتە مانا جیاواز هەڵگرەکان، نیشانەی نەخۆشیی و نیاز خراپییە، وە هۆی ڕێ لێتێکچوونە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ﴾، واتە: بەڵام ئەوانەی دڵیان لادانی تێدایە، بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون، کە مانای وێکچوویان هەیە، بە مەبەستی ئاژاوە گێڕیی، یاخود بە مەبەستی خراپەکاریی، یان ڕێ لە خەڵك تێکدان، مانایان لێدەدەنەوە، واتە: مانا لێدانەوەی ئایەتەکان، بە شێوەیەك کە ئەو بیروبڕواو بۆچوونە هەڵانەی خۆیانیان پێ پاساو بدەنەوە.

**مەسـەلەی دوازدەیـەم:** وشـەی: (فِتـنَة) لێـرەدا بـە مانـای ئـاژاوەگێڕیی یـاخود خراپەكاریی دێ، ئەگەرنا لە شوێنی دیكەی قورئاندا، ڕەنگە بـە مانـای شـیـرك بـێ، یـان بـە مانـای ئـازاردانی مـسوڵمانان بـێ، یـان بـە مانـای تاقیكـرانەوە بـێ، بـەڵام لـێرەدا ئـەو مانایـەی لـێ وەردەگیـرێ كـە گوتمـان، وە وشـەی (تأوِيـل)یـش لێـرەدا ڕەنگـە واچاكتــربێ لەبـەر سـیاقەكەی بڵـێین: یـانی: مانـا لێدانەوەیـەكی لادەرانــە (تفـسیر تحریفـي)، ئەگــەرنا وشــەی (تأوِيـل)یــش - هەرچــەندە دەشـگونجێ وشـەی: (تأوِيـل) لێرەشـدا هەر لەسەر ئەسڵی واتـای خـۆی بـێ - وەك دوایی باسـی دەكـەین، مانـای دیكەشـی هەیـە، بـەڵكو لـە ڕاسـتیدا لـە شـوێنەكانی دیكەدا (**تأوِيل**)، هـەر بـە یـەك مانـا لێكدراوەتـەوە، كـە بریتیـە لـە گەڕانـەوە بـۆ ئەسـڵ، یاخود دەركەوتنو سەرهەڵدانی شتێك.

**مەسەلەی سـێزدەیەم:** دەربارەی وشـەی (تأوِيـل) كە لـە (آلَ يَـؤْلُ، أَوْلاً)ەوە هــاتوە، واتــە: (رَجَـعَ، يَرْجِـعُ، رجُوعَـاً) واتــە: گەڕایــەوە، دەگەڕێتــەوە، گەڕانــەوە، وشـەی (تأوِيـل) لە ئەسڵدا بە مانـای خـودی مەبەسـتی قسەكە دێ، ئـەو مەبەسـتەی كـە بـۆی گـوتراوە (نَفسُ الْمُـرَادِ بـالكَلاَمِ) جـا ئەگـەر قـسەكە داواكـردن بـێ، ئــەوە تەئویلەكــەی خــودی كــردەوە داواكراوەكەیــە، وە ئەگــەر هــەواڵ بــێ، ئــەوە تەئویلەكەی خودی شتە هەواڵ لێدراوەكەیە، بەواتایـەكی دیكە ئەگەر ئـەو شـتە كـە (تأوِيـل) دەكـرێ، شـتێكی عیلمیـیو فیكریـی بـێ، بریتیـە لـە مەبەسـتو ئامانجەكـەی، وە ئەگــەر كــردەوە بــێ، ئــەوە مەبەســت هاتنەدییــەتی، وە لــە بـەكارهێنانی قورئانـدا، هەمیـشە ئـەم مانایـەی هەیـەو بـە سـەرنجدانی ئـەو ئایەتانـەی كـە وشـەی ناوبراویـان تێـدا هـاتوە، زۆر جـوان ڕوون دەبێتـەوە، بـۆ وێنـە: خوا لە سوورەتی (یوسف)دا كـە دەفەرموێ: ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ ... ﴿٣٧﴾ ﴾، واتــە: لەگـەڵ

یوسف دا دوو گەنج چوونە زیندانەوە، یەکێکیان گوتی: دەمبینی (لە خەونمدا ترێم دەگوشیو) شەراپم دروست دەکرد، ئەویدیکەش گوتی: دەمبینی (لە خەونمدا گۆشت یان) خواردنم لەسەر سەرم هەلگرتبوو باڵندە لێیان دەخوارد، ماناو تەئویلی ئەو دوو خەونەمان پێ بڵێ، بێگومان ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین، یوسوف عليه السلام گوتی: هیچ خواردنێکتان بۆ نایەت وەك بژیو، مەگەر مەن هەواڵتان پێ دەدەم بە تەئویلەکەی، پێش ئەوەی کە خواردنەکەتان بۆبێ، ئا ئەوەتان لەو زانستەیە کە پەروەردگارم فێری کردووم، لێرەدا مەبەستی دوو ڕەفیقەکەی (یوسف) لە وشەی (تأویلە)، واتە: سەرەنجامی ئەو شتەی بینیومانە، هەروەها مەبەست لە وشەی: (تأویلە) لە قسەکەی (یوسف)دا یانی سەرەنجامی ئەو شتەی ئێوە لە خەوندا بینیوتانە، من سەرەنجامەکەتان پێدەڵێم کە چییە؟

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١٠٠)ی سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ ... ﴾، واتە: یوسوف عليه السلام بابو دایکی بردە سەر عەرشەکەی (واتە: سەر کورسیو تەخت) وە ئەوانیش کڕنووشیان بۆ برد (واتە: چەمینەوە وەك ڕێزگرتنیان بۆی کە عادەتیان وابووە)، (یوسف) فەرمووی: ئەی بابە گیان! ئەوە تەئویلی خەونەکەی پێشتری منە، پەروەردگارم بەڕاستی گێڕاو هێنایە دی، کەواتە: ﴿ تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ ﴾، واتەك سەرەنجامو هاتنە دی خەونەکەی، یانی: لێرەدا تەئویل بەمانای هاتنەدیو سەرەنجامی شتێکە.

وە لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٥٩)دا خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿ ... فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾، واتە: جا ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە ناکۆکیی، بیگتێڕنەوە بۆ لای خواو بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە،

ئا ئەوە باشترەو سەرەنجامیشی چاكترە، ﴿ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾، یانی: (وَأَحْسَنُ عَاقِبَةً ومَصِيراً) كەواتە: (تأويل) واتە: عاقیبەتو سەرەنجام.

هەروەها لە سوورەتی (الكهف)دا ئایەتی (٧٨) خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾، واتە: گوتی: لێرەدا منو تۆ لێك جیادەبینەوە، لەمەودوا هەواڵت پێدەدەم لەوەی، كە سەرەنجام نەتتوانی خۆتی لەسەر ڕابگری، لێرەشدا وشەی (تأويل) بەمانای سەرەنجام دێت، چونكە دوایی شتەكانی بۆ ڕوونكردنەوە، واتە: مەبەستەكانی ئەو سێ كارەی كە كردوونی، كە خراپكردنی كەشتییەكەو، كوشتنی منداڵەكەو، چاككردنەوەی دیوارەكە بوون، ئامانجو حیكمەتی هەرسێكیانی بۆ ڕوونكردەوە.

هەروەها لە سوورەتی (یونس) لە ئایەتی (٣٩)دا دەفەرموێ: ﴿ بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ... ﴾، واتە: ئەوانە بڕوایان بە شتێك نەهێناوە، كە زانیارییان دەورەی نەداوەو نایزانن، وە جارێ تەئویلەكەشی (واتە: سەرەنجامەكەشی) نەهاتوە، واتە: سەرەنجامی هەواڵەكانی قورئان نەهاتوە بۆ وێنە: قورئان هەواڵی پێداوین، كە قیامەتو سزاو پاداشت هەیە، بەڵام جارێ نەهاتوە.

هەروەها لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (٥٣)دا فەرموویەتی: ﴿ ...هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ ۚ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ... ﴾، واتە: ئایا چاوەڕێی تەئویلی قورئان دەكەن (واتە: ئەو سەرەنجامەی، كە قورئان هەواڵی پێدەدا) ئەو ڕۆژەی كە ئەو سەرەنجامە دێتەدی، كە قورئان هەواڵی پێدەدا، ئەوانەی كە پێشتر لەبیریان چووە، دەڵێن: بەڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان هەقیان هێناوە، كەواتە: وشەی (تأويل)، واتە: سەرەنجام، هاتنە دی ئەو شتەی كە هەواڵی پێ دەدرێ، وە

هاتنە دی ئەو ئامانج و مەبەستانەی کە چاوەڕێ دەکرێن، بەڵام زانایان وشەی (تأویل)یان بە دوو مانای دیکەش بەکارهێناوە:

یەکەمیان: بە مانای تەفسیرو لێکدانەوە، وەك (الطَّبَري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هەمیشە دەڵێ: (القَول في تأويل قوله تعالى)، کەواتە: (تأویل)، واتە: تەفسیرو لێکدانەوەی فەرمایشتی خوا.

دووەمیان: بە مانای لادانی وشەیەکە لە مانایەکی کە بەهێزترە، بۆ مانایەکی دیکە کەم هێزترە، لەبەر بەڵگەیەك کە ئەو مانا بێهێزە (پێویست) دەکات، (صَرفُ اللفظ عَنِ الْمَعنى الراجح إلى الْمَعنى الْمرجُوح لدليل يقترن بهِ) ئنجا دیارە ئەگەر لێرەدا وشەی (تأویل) بە مانای یەکەم و ئەسڵەکەی بێ، کە پێمان وایە هەروایە، ئەوە دەگونجێ لەسەر وشەی (اللّه) بوەستین، لە کاتێکدا کە ئایەتەکە دەخوێنینەوە ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ﴾، بە بەڵگەی ئەوە کە تەنیا خوا ﷻ سەرەنجام و هاتنە دی ئەو هەواڵانەی کە قورئان هەواڵیان پێدەدا دەزانێ، وە دەشگونجێ نەوەستین و بەمجۆرە بیخوێنین: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾، چونکە وێڕای خوای پەروەردگار زانایانی ڕۆچووش لە زانیارییدا شتێك لە ئایەتە موتەشابیهەکان دەزانن و، ئەوانیش بەقەدەر خۆیان شتێك لە ئایەتەکان حاڵی دەبن، بەڵام نەك بەقەدەر خوای پاك و تاك، (راغب الأصفهاني)یش بەو شێوەیە وشەی: (تأویل) مانا دەکات: (التَّأْويلُ: الرجُوعُ إلى الأَصْل، ومِنهُ: الْمَوْئِلُ للموضعِ الَّذِي يُرْجَعُ إِلَيْهِ، وَهُوَ رَدُّ الشَّيءِ إلى الغَايَة المرادة مِنهُ عِلْمَاً كَانَ أَوْ فِعلاً، فَفي العِلْم نحو: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ...﴿٧﴾﴾ آل عمران، وفي الفعْلِ نحو: ﴿... هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥۚ ...﴿٥٣﴾﴾ الأعراف)، واتە: (تَأْويل) بریتیە لە گەڕانەوە بۆ سەر بنەڕەت، ئەو شوێنەی کە شتی بۆلا دەگێڕدرێتەوە، ئنجا دەڵێ: (تَأْويل) بریتیە لەوەی کە تۆ قسەیەك بگێڕیەوە بۆ ئەو مەبەستەی کە تێیدا ڕەچاو کراوە، جا چ لە

ڕووی زانیاریی یەوە، چ لە ڕووی کردەیی یەوە، جا لە ڕووی زانیاریی یەوە، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ...﴿٧﴾﴾ آل عمـران، واتـە: گێڕانـەوەی ئایەتـە موتەشـابیهەکان بـۆ ئایەتـە موحکەمـەکان تـەنیا خـواو ڕۆچـووان لـە زانیـاری دا تێیدەگـەنو دەزانـن، وە لـە کردەوەشـدا وەك خـوا دەفەرموێ:﴿... هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ...﴿٥٣﴾﴾ الأعراف، واتە: ئایا چاوەڕێی چـی دەکـەن؟! چـاوەڕێی ئـەوە ناکـەن کـە بـە کـردەوە ئـەوەی کـە قورئـان هـەواڵی پێداوە بێتەدی، هەڵبەتە هەنـدێك لـە زانایان گوتوویانـە: مەبەسـت لە ئایەتی (مُتَشَابە) ئەو ئایەتانەن، کە باسی ئـەو شـتانە دەکەن کـە عـەقڵی ئینـسان تێیـان ناگـات، وەك مانـای پیتـە پچرپـچرەکان، وە مانـای سـیفەتەکانی خـوا، وە حەقیقـەتی ڕووح چـییە؟ وە بەهەشـت چـۆنە؟ وە دۆزەخ چۆنە؟ قیامەتو ڕۆژی دوایی چۆنەو کەی دێت؟ کە ئەگەر وابێ، بـە دڵنیـایی بێجگـە لـە خـوا ﷻ کـەس ئـەو شـتانە نازانـێ، بـەڵام ئێمـە ئـەو مانایەمان پێ بێهێزە، بـەڵکو پێمان وایـە مەبەسـت لـە (تأویـل) وەك باسمان کـرد، بریتیـە لـە گێڕانـەوەی مانـای ئایەتـە موتەشـابیهەکان بـۆ سـەر ئەسـڵی قورئان، کە ئایەتە موحکەمەکانن، کە ئەوەش خوای پەروەردگار بە دڵنیـایی لـە هـەموو کـەس چاکتـر دەزانـێ، بـەڵام زانـایـانیـش بەشـی خۆیـان ئـەوە دەزانن‌و، بێگومان خـوا ﷻ هـەموو قورئـانی بۆیـە ناردۆتـە خـوارێ، تـا لێـی تێبگـەین، بۆیـە ناگونجـێ هەنـدێ ئایـەتی تێـدابن، کـە بـەس بۆخـۆی بیانزانێ‌و، تەنانەت زانایانیش لێیان تێنەگەن، ئـەوە پێچەوانەی حیکمـەتو ڕەحـمەتی خوای پەروەردگـارە.

<u>**مەسـەلەی چـواردەیەم**</u>: کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا﴾، ئەوانـەی، کـە بـە زانیارییـدا ڕۆچـوون دەڵـێن: بـڕوامـان پێـی هەیـە، هـەمووی لەلایـەن پەروەردگـارمانەوەیە، واتـە: چ ئـەو ئایـەتانە کـە مانایـان ڕۆشـنە، وە چ ئـەو ئایەتـانە کـە مانایـان ڕۆشـن نیـەو، پێویـستی بـە لـێوردبوونەوەی زیـاتر دەکـاتو، پێویـستییان بـەوە دەکـات کـە لەبـەر ڕۆشـنایی

ئایەتــە موحکەمەکانــدا ســەیریان بکــەین، هــەموو ئەوانــە، ئەوانــەی کــە سەرەنجـامیان دەزانـرێ، یـاخود سـەرەنجامیان نـازانرێ هـەتا نەیانگێڕینـەوە بـۆ سـەر ئەسـڵ، هـەموویان لەلایـەن پەروەردگارمانــەوەن، کەواتــە: ئــەو قــسەیەی هەنـدێك لـە توێـژەرەوانی قورئـان دەڵـێن: کـە زانایــانی ڕۆچــوو لـە زانیارییـدا بۆیـە دەڵـێن: ﴿ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ﴾، لەبـەر ئـەوە کـە ماناکـەی نـازانن! وە دەڵێن: ئەگـەر ئینـسان مانـای شـتێك بزانـێ، ئازایـەتیی نیـە ئیمـانی پـێ بێنـێ، بەڵـکو ئـەوە ئــازایەتیی یـە، مانـای نـەزانێ‌و ئیمـانی پـێ بێنــێ ! ئێمـە دەڵـێین: ئـەوە ڕاسـت نیــە، بەڵــکو ئایەتەکــە ئــەوە دەگــەیەنێ کــە زانـایــانی ڕۆچــوو لــە زانیـارییـدا، لەم ئایـەتە موتەشـابیهانە حـاڵی دەبـن، وە لـە ئـەنجامی ئـەوەدا کە لێیـان حاڵی دەبـن، ئیمــان دێـنن، چونکە لـە ڕاسـتییدا زانیـاریی‌و شارەزایی بـە پەیدابوونی بە شتێك، پاڵنەری ئینـسانە بـۆ ئـەوەی ئیمـانی پـێ بێنـێ، هەڵبەتـە ئینـسانی ئیمانـدار، هتەنـدێ شـتی خـوای زانــا ئەگــەر تێـشی نەگــات مـادام دڵنیــابێ کە خـوا فەرموویـەتی: هـەر ئیمـان پـێ دێنـێ، بـەڵام بـە دڵنیـایی یـەوە، زانیـاری زیـاتر هانـدەری ئینـسانە بـۆ ئـەوەی ئیمـانی باشـتـربێ، لـەو بارەشـەوە بەڵگەمان ئەوەیە، کە خوای بــەرزو زانــا لـە سـوورەتی (سـبأ) لـە ئایـەتی (٦)دا دەفــــــــــەرموێ: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، واتـە: ئەوانـەی زانیارییـان پێـدراوە، دەزانـن ئـەوەی کـە لەلایـەن پەروەردگـارتەوە بۆتـۆ هـاتوە هـەقە، وە ڕێنمــایی دەکـات بــەرەو ڕێبــازی خــوای زاڵــی ستایــشکراو، کەواتــە: لــە ئــەنجامی ئــەوەدا کــە زانیــارییان پێـدراوە دەزانــن، کـە قورئـان هەقـە، هـەروەها ئیبــڕاهیم عليه السلام کـە (خليـل الله)يـە، داوا لــە خــوای پەروەردگــار دەکـات، کـە پێـشانی بـدات چـۆن مـردووان زینـدوو دەکـاتەوە؟ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ...﴿٢٦٠﴾ ﴾البقــرة، واتــە: وە کاتێـك ئیبـڕاهیم گوتی: پـەروەردگارم پێـشانم بـدە چۆن مـردووان زینـدوو دەکەیـەوە؟ فەرمووی: ئیمـانت نیـە ! گوتی: بـا، بەڵام بۆ ئەوەی دڵـم ئـارام بگـرێ، کـەواتـە:

لە ئەنجامی زانیاریی زیاتردا دڵ زیاتر ئارام دەگرێ، دیارە ئیبراهیم عليه السلام (علم اليقين)ی هەبوو كە خوا دەتوانێ مردووان زیندوو بكاتەوە، بەڵام ویستی (عين اليقين)ی بۆ پەیدابێو، وێڕای ئەوەی كە بە عەقڵ دەیزانی خوا مردووان زیندوو دەكاتەوە، ویستی بە چاوی سەریشی ببینێ، بۆئەوەی زیاتر دڵی دابمەزرێ، كەواتە: ئەو قسەیە ڕاست نیە، كە دەڵێ: دەبێ ئینسان زانیاری بە شتێك نەبێ، ئنجا بڕوای پێی هەبێ، بە پێچەوانەوە تا زانیاری بە شتێك زیاتربێ، بڕواشی پێی پتەوتر دەبێ.

**مەسەلەی پازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴾، واتە: پەروەردگارمان! دڵمان لامەدە دوای ئەوەی ڕێنماییت كردووین، لەم ڕستە قورئانییە دەفامرێتەوە، كە ئایەتە مانا زۆر هەڵگرەكان، مەزەندەی سەرگەردانییو سەر لێشێوانن، بۆ كەسێك كە سەرنجی ئایەتە موحكەمەكان نەدا، واتە: هەركەسێك لەبەر ڕۆشنایی ئایەتە موحكەمو مانا ڕۆشنەكاندا سەرنجی ئایەتە موتەشابیهەكان نەدا، دەبێتە هۆی سەر لێتێكچوونو سەرلێشێوان، بەڵام دیارە زانایانی ڕۆچوو بە زانیارییدا، پێشێ ئایەتە موحكەمەكان كە بناغەو ئەسڵی قورئانن تێدەگەنو، لەبەر ڕۆشنایی ئەواندا تەماشای ئایەتە موتەشابیهەكان دەكەن، هەڵبەتە ئەوەی كە زانیاری زیاتربێ، بە دڵنیایی زیاتر تێدەگات، وەك زانایان گوتوویانە: دەریای زانست بە پێچەوانەی دەریاكانی دیكەوە خەڵك لە قووڵاییدا ڕزگاری دەبێ، وە لە قەراغو تەنكاوەكانی دا دەخنكێ.

**مەسەلەی شازدەیەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ چەند فەرموودەیەكی لەبارەی مامەڵەكردنەوە لەگەڵ ئایەتە موتەشابیهەكان فەرموو ون، چەند نموونەیەكیان لێ دێنینەوە:

١) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَلاَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ﴿ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ ... ﴾، إلى قَوْلِهِ: ﴿ أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴾، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {(إِذَا

رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِيهِ فَهُمُ الَّذِينَ عَنى فَاحْذَرُوهُمْ)، (وَفِي لَفْظِ البُخَارِي: (فَإِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللَّهُ، فَاحْذَرُوهُمْ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٤٧)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٦٧١٧)، وأبُو دَوُد بِرقم: (٤٥٩٨)، وَالتِّرمِذِيّ بِرقم: (٢٩٩٣)}، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ ... ﴾، تا دەگاتە: ﴿ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کاتێك ئەوانەتان دی کە دەربارەی ئایەتەکانی قورئان موجادەلەیان دەکرد، ئەوە ئەو کەسانەن کە خوا مەبەستنی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٌ ﴾، لەبەر ئەوە لێیان وریابن.

وە لە بێژە (لَفْظ)ی بوخاریی دا بەم شێوەیە هاتوە: هەرکاتێك ئەوانەتان بینی کە بەدوای ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەوتن، ئەوە ئەوانەن کە خوا ناوی هێناون لێیان وریابن، لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە زۆر لێکۆڵینەوەو زۆر بە دواکەوتنی ئایەتە موتەشابیهەکان بە پچڕاندنیان لە ئایەتە موحکەمەکان، واتە: لەبەر ڕۆشنایی ئایەتە موحکەماتەکاندا نەبێ، هەر تەماشای ئایەتە موتەشابیهەکان بکەی، لە ڕاستیدا ئەوە مایەی سەرگەردانییو سەرلێشێوانە، وە ئەگەر تەماشای ئەو دەستەو تاقمانە بکەین کە لەنێو ئۆممەتی پێغەمبەردا ﷺ پەیدابوون، ڕیشەی سەرگەردانییو سەرلێشێوانیان بە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە زیاتر خەریکی ئەو ئایەتە موتەشابیهانە بوو ون، بێ ئەوەی کە بگەڕێنەوە بۆ ئایەتە موحکەمەکان.

٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: {نَزَلَ الْقُرْآنُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ الْمِرَاءُ فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ فَمَا عَرَفْتُمْ مِنْهُ فَاعْمَلُوا بِهِ وَمَا جَهِلْتُمْ مِنْهُ فَرُدُّوهُ إِلَى عَالِمِهِ، رَوَاهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٧٩٧٦)، وابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكُبرى) بِرقم: (٨٠٩٣)، وابْنُ كثير في (تفسيره)، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَيْخَينِ}، واتە: ئەبو هوڕیرە خوا لێی ڕازی بێ

دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: قورئـان لەسـەر حـەوت پیتـان نێرراوەتـە خـوار، وە موناقەشـەو موجادەلـە كـردن لـە قورئانـدا كوفرە، (واتـە: خەڵك خستنە گومان، یان گومان تێدا پەیداكردنی كوفرە) ئـەوەی لـە قورئانـدا زانیتان كاری پێبكـەن، وە ئـەوەش كـە نەتـانزانی بیگـێڕنەوە بـۆ زانایەكـەی (كـە خـوای پـەروەردگارە یـاخود ئەوانـەی كـە لـێی شـارەزان)، یـانی: كـاتێك مانـای ئـەو ئایەتانـە نـازانن لەوان بپرسـن، بـەڵام مەچـن بـەبێ زانیـاری بـەنێو بكەون، دەنـا ئەوە دەبێتـە هـۆی سـەرگەردانییتان.

٣) عَنْ أُمُّ سَلَمَةَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: {يَا مُقَلِّبَ القُلُوب ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾}، رَوَاهُ ابْنُ أَبِي حَاتِم برقم: (٣٢٢٢)، وَالطَّبَرِي في (تفسيره) برقم: (٦٦٥٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٤٠)، وَالطَّبَرَانِيُّ في (الكَبِير) برقم: (٧٧٢)، وَ رَوَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا نَحوَهُ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسة الصحيحة) برقم: (٢٠٩١)، واتـە: ئوممو سـەلەمە دایكی مسوڵمانان خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆرجار دەیفەرموو: (يَا مُقَلِّبَ القُلُوب ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ)، واتە: ئـەی هەڵگێڕەوەی دڵان! دڵم لەسەر دینەكەت بچەسپێنە، دوایی ئەوەی دەخوێنـدەوە: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾، پـەروەردگارمان! دوای ئـەوەی ڕێنماییـت كـردووین دڵمـان لامـەدە، وە لـە ڕیوایەتێكـی دیكـەدا بـەم شـێوەیە هـاتوە: (عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَكثَرَ دُعَائِكَ بِهَذَا؟ قَالَ: {يَا أُمَّ سَلَمَةَ، إنَّهُ لَيْسَ آدَمِيٌّ إلاَّ وَقَلبُهُ بَيْنَ إصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ، فَمَنْ شَآءَ أَقَامَ، وَمَنْ شَآءَ أَزَاغَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٢٦٦١٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٢٢)، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٠٩١)، واتـە: ئوممو سـەلەمە – خـوا لـێی ڕازی بـێ – دەڵـێ، گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! بۆچـی ئـەم دوعـایە زۆر دەكـەی؟

فەرمووی: ئەی ئوممو سەلەمە هیچ ئادەمیزادێك نیە، مەگەر دڵی لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوا دایە، ئەگەر بیەوێ جێگیری دەکات، وە ئەگەر بیەوێ لایدەدات، کەواتە: ئینسان نابێ زۆر لەخۆی ئەمین و دڵنیا بێت، بەڵکو دەبێ هەمیشە دوعا بکات خوا دڵی بچەسپێنێ و بەولاو لادا دڵی لانەدا، بە تایبەت وەك گوتم: بە هۆی لێ تێنەگەیشتنی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان یان خراپ تێگەیشتنیانەوە.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا ﴾، واتە: قوڵبووەوان لە زانیارییدا، ئەوانەی کە بە زانیارییدا ڕۆچوون، خوای پەروەردگار بە حەوت سیفەت پێناسەی کردوون، کە بە ڕیز بەم شێوەیەن:

یەکەم: ڕۆچوون بە زانیاریی دا: ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ﴾.

دووەم: ئیمانیان هێناوە: ﴿ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا ﴾.

سێیەم: خاوەن عەقڵن: ﴿ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، (ألباب) بە (لُب) دەگوترێ، واتە: کاکڵ، عەقڵی ئینسان کاکڵی ئینسانە، وە ئینسان بەبێ عەقڵ، وەك گوێزێکی بێ کاکڵ وایە.

چوارەم: لە خوا دەپارێنەوەو دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا ﴾، واتە: پەروەردگارمان! دڵمان لامەدە، بەڵێ یەکی دیکە لە نیشانەکانی ئەوانەی، کە لە زانیارییدا قووڵبوونەتەوە، ئەوەیە کە لە خۆیان ئەمین نین و پێیان وانیە لە حەوت ئاوان پەڕیونەوە، بەڵکو هەمیشە مەترسییان هەیە کە دڵیان بەملاولادا لابدات، بۆیە داوا لە خوا دەکەن خوا دڵیان بچەسپێنێ.

پێنجەم: هیدایەت دراون: ﴿ بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا ﴾.

شەشەم: داوای بەزەیی زیاتر لە خوا دەکەن کە پێیان ببەخشێ: ﴿ وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴾.

حەوتەم: بڕوایان بەو ڕۆژە هەیە، کە هەموو خەڵکی تێدا کۆدەکرێتەوە: ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴾،

خوای پەروەردگار زانایانێکی، کە بڕوایان بە ئایەتەکانی قورئان هەیە، بە موحکەمو موتەشابیهەوە، بەم حەوت سیفەتە وەسفی کردوون، کە دەبێ هەوڵبدەین ئەو سیفەتانە لە خۆمان بێنینە دی، بۆ ئەوەی لەو جۆرە زانایانە بین، کە خوای کاربەجێ ئاوا مەدحیان دەکات.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** ئایا خوا ﷻ دڵی کەس لادەدا لە هیدایەت بۆ گومڕایی؟!

ئەگەر نا، چۆن؟ وە ئەگەر نا، ئەدی بۆچی ئەوانە دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾، واتە: پەروەردگارمان! دڵمان لامەدە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، خوای پەروەردگار هیدایەتی خەڵك دەدا، بەڵام ڕێ لە کەس تێك نادات، وە کەس گومڕا ناکات، ئنجا ئەو ئایەتانەش، کە مانایان وایە خوا خەڵك گومڕا دەکات، ئەگەر جوان سەرنجیان بدەین، بۆمان دەردەکەوێ، کە خوای دادگەر لەخۆوە خەڵك گومڕا ناکات، بۆیە کە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ...(٨)﴾فاطر، واتە: بێگومان خوا هەرکەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات، وە هەرکەسێکی بیەوێ ڕێنمایی دەکات، بەڵام ئەوە بە کورتیی (مُجْمَل)ە، جا ئایا لە کوێ بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە خوای بەرز چ جۆرە کەسانێك گومڕا دەکات، وە چ جۆرە کەسانێك ڕێنمایی دەکات؟ دیارە لە چەند شوێنێك ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ... وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ...(٢٧) ﴾ الرعد، واتە: بێگومان خوا ڕێنمایی ئەوانە دەکات کە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، ئەدی خوا کێ گومڕا دەکات؟ دەفەرموێ: ﴿ ... وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ...(٢٧) ﴾إبراهيم، واتە: خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، ئەوانەی کە زوڵم لە خۆیان دەکەن، وە ئەوانەی کە زوڵم لە دینی خوا دەکەن، ئەوانەی کە

کردەوەی خراپ دەکەن‌و نیازیان خراپە، خوای کاربەجێ ئەوانە گومڕا دەکات، کەواتە: لێرەدا مەبەست لەم دوعایە چییە؟ مەبەست لەم دوعایە ئەوەیە کە ئەوان بۆ سەرەنجامەکەی دوعا دەکەن، بەڵام مەبەستیان پێ سەرەتاکەیەتی یانی: پەروەردگارمان! تووشی ئەو سەرەنجامەمان مەکە بەهۆی ئەو پێشەکییانەوە کە ئەو سەرەنجامەیان لێ پەیدا دەبێ، کە بریتیە لەوەی کەسێك واز لە ئایەتە موحکەمەکان بێنێ‌و بە دوای ئایەتە موتەشابیهەکان بکەوێ، ئەوە مانای وایە ڕێی چەوتی گرتوە، سەرەنجام گومڕا دەبێ‌و دڵی لادەدرێت، وە ئەمە هەروەك ئەوەیە، کە خوا ﷻ دەربارەی ئالی فیرعەون دوای ئەوەی ئەو تابووتەی کە مووسای ﷺ تێدابوو، دەگرنەوە، دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ...﴿٨﴾﴾ القصص، واتە: بنەماڵەی فیرعەون (تابووتەکەیان) گرتەوە، تاوەکو بۆیان ببێ بە مایەی دوژمنایەتیی، ئایا بنەماڵەی فیرعەون مووسایان بۆیە پەروەردە کرد تاکو دوایی ببێتە دوژمن، یاخود ببێتە مایەی خەم‌و خەفەتیان؟ نەخێر، بەڵام یانی: سەرەنجامەکەی وای لێکرد، کەواتە: لێرەدا ئەو زانایانە دوعا دەکەن، دەڵێن: پەروەردگارمان! لەو پێشەکییانەمان بپارێزە کە دەمانگەیەننە ئەو سەرەنجامە، کە بریتیە لە دڵ لادان.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** ئایا حیکمەتی ئایەتە موتەشابیهەکان چییەو بۆچی خوای کاربەجێ ئایەتەکانی قورئانی هەموو نەدەکردنە ئایەتی موحکەم؟ بەو مانایەی کە مانا ڕۆشنن، ئەگەرنا وەکی دیکە هەموو ئایەتەکانی قورئان موحکەمن، زانایان چەند حیکمەتێکیان لەوبارەوە خستوونە ڕوو:

١- بوونی ئایەتە موتەشابیهەکان دەبێتە هۆی فراوان بوونی ماناکانی قورئان، چونکە وەك پێشتر گوتمان ڕاستترین‌و باشترین پێناسە بۆ (محكم و متشابه) بریتیە لە: مانا ڕوون‌و مانا جۆراوجۆر، جا بێگومان مانای زۆر جۆراوجۆر هەڵگرتنی ئەو جۆرە ئایەتانە، چەمك‌و مەبەستەکانی قورئان فراوانتر دەکات.

٢- قووڵبوونەوەی زیاتری زانایانو گەڕانی زیاتریان بۆ ماناکانی قورئان، بەوەش پاداشتی زیاتریان پێ دەبڕێ، وە لەوەشدا ئیسلام فراوانتر دەبێت.

٣- حیکمەتێکی دیکەی بریتییە لە تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان، خوای پەروەردگار تاقییان دەکاتەوە، کێ بە هۆی ئایەتە موحکەمەکانەوە خۆی دەپارێزێ لەوەی کە بەهۆی شوێنکەوتنی ئایەتە موتەشابیهەکانەوە سەری لێ تێکبچێ، چونکە خوای زانا ژیانی دنیای داناوە بۆ تاقیکردنەوە.

٤- حیکمەتێکی دیکەی ئەوەیە، کە عەقڵی ئینسان سنووردارە، وە ناگونجێ هەموو شتێکی لە قاڵبێکی تەعبیریی ڕووندا بۆ دابڕێژرێ، بەڵکو خوای کاربەجێ هەندێ شتی بە ئاماژە فەرمووە، واتە: خوای بەرزو بێوێنە تەعبیری کردوە لە هەندێ ڕاستی بە تەعبیرێکی ڕەمزییو هێمایی، چونکە لە عەقڵی ئینسانەوە ناچن تاکو لەبارەیانەوە نوختەی بۆ بخاتە سەر پیت، کە بێگومان ئەوەش یەکێکی دیکەیە لە ڕووەکانی موعجیزەبوونی قورئانی بەرزو بەپێز.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان دەرسـی دووەمـە لـە زنجیـرە دەرسـی تەفسـیری سـوورەتی (آل عمران)، ئەم دەرسەشمان لە نۆ (٩) ئایەت پێکدێ لە ئایەتی ژمارە (١٠ تاکو ١٨)ەی سوورەتی (آل عمران)، لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ باسی سەرەنجامی شوومی کافران دەکات، وە ئاماژە بە چارەنووسیی فیرعەونییەکانو، بە جەنگی بەدر دەکات، وە باسی ڕازێنرانەوەی ژیانی دنیاو زرقو برقی دنیا دەکات، وە پاشان سەرنجی بڕواداران ڕادەکێشێ بۆ نیعمەتەکانی بەهەشت، وە لەو میانەدا چەند سیفەتێکی گرنگی بڕواداران دەخاتە ڕوو، وە باسی یەکتایی خوا ﷻ دەکات بە شایەدیی دانی خۆیو فریشتەکانیو زانایان.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ ١٠ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ
بِذُنُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ١١ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغۡلَبُونَ وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ
وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٢ قَدۡ كَانَ لَكُمۡ ءَايَةٞ فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَاۖ فِئَةٞ تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَأُخۡرَىٰ كَافِرَةٞ يَرَوۡنَهُم مِّثۡلَيۡهِمۡ رَأۡيَ ٱلۡعَيۡنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُۚ
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ١٣ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ
وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ
وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ١٤ قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم

بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا
وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴿١٥﴾ الَّذِينَ يَقُولُونَ
رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿١٦﴾ الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ
وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا
هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((بێگومان ئەوانەی بێبڕوان، سامانو منداڵەكانیان هیچ سوودێكیان لە بەرانبەر (سزای) خوادا پێ ناگەیەنن، وە ئەوانە سووتەمەنی ئاگرن﴿١٠﴾ وەك نەریتی دارو دەستەی فیرعەونو ئەوانەی پێش وان، ئایەتەكانمانیان بەدرۆ دانا، خواش بەهۆی گوناهەكانیانەوە گرتنی، وە خوا سزای توندە﴿١١﴾ بەوانەی بێبڕوان بڵێ: لەمەو دوا شكست دێنن، وە بەرەو دۆزەخ كۆدەكرێنەوە، ئەوێش خراپترین شوێنی حەسانەوەیە !﴿١٢﴾ بە ڕاستی لە دوو كۆمەڵ دا كە بەرەنگاری یەكدی بوونەوە نیشانەیەك (ی گەورە) بۆ ئێوە هەیە، كۆمەڵێكیان لەڕێی خوادا دەجەنگیو یەكیشیان بێبڕوا بوو، كە بە دیتنی چاو دوو هێندەی خۆیانیان دەیانبینین، وە خواش بە یارمەتی خۆی هەركەس بیەوێ پشتگیریی دەكات، بێگومان لەوەدا پەندێكی گەورە بۆ خاوەن عەقڵان هەیە﴿١٣﴾ خۆشەویستی ئارەزووەكان بۆ خەڵكی جوان كراوە، لە ژنانو، كوڕانو، زێڕو زیوی پەزمەندە كراوو، ئەسپانی نیشانەدار كراوو، ئاژەڵو، كشتوكاڵ، ئەوە ڕابواردنی ژیانی دنیایە، خواش سەرەنجامی هەرە چاكی لەلایە ﴿١٤﴾ بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە باشتر لەوەتان؟ بۆ ئەوانەی پارێزیان كردوە، لەلای پەروەردگاریان چەند باغێك كە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، هەن، تێیاندا هەمیشەیین، وە هاوسەرانێكی

پاککراوە، وە ڕەزامەندییەکی گەورە لە خواوە، خواش بینەری بەندەکانیەتی ﴿١٥﴾ ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان! ئێمە ئیمانمان هێنا، دەجا لە گوناهەکانمان بمانبوورەو لە ئاگر چەپاڵەمان بدە ﴿١٦﴾ خۆڕاگرانو، ڕاستانو، گەردنکەچانو، بەخشەرانو، پێش بەرەبەیان داوای لێبوردنکەران (لە خوا) ﴿١٧﴾ خوا شایەدییدا کە بێجگە لەو هیچ پەرستراونین، هەروەها فریشتەکانو خاوەن زانیارییان، خوا بە دادگەریی هەڵدەستێ، جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نین، زاڵی کاربەجێیە ﴿١٨﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَقُودُ ٱلنَّارِ): واتە: سووتەمەنی ئاگر، (يُقَالُ لِلْحَطَبِ الْمَجْعُول الوَقُود) واتە: (وَقُود) بریتیە لەو دارەی کە ئامادە دەکرێ بۆ ئەوەی بسووتێنرێ.

(كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ): واتە: وەك عادەتی ئالی فیرعەون، (الدَأْبُ: إِدَامَةُ السَّيْرِ وَالعَادَةُ الْمُسْتَمِرَّةُ دَائِمَاً عَلَى حَالَةٍ)، واتە: (دَأْب) بریتیە لە بەردەوامبوون لەسەر ڕۆیشتن، وە هەر نەریتێکی بەردەوام کە لەسەر یەك شێوە بڕوا، دیارە کە وشەی (دَأب) بە عادەت، وە بە سوننەتیش تەفسیر کراوە.

(ءَالِ فِرْعَوْنَ): واتە: دارو دەستەی فیرعەون، یاخود شوێنکەوتووانی، یان نیزیکانی چونکە دەڵێ: (الآلُ: يُسْتَعْمَلُ فيمَنْ يُخْتَصُ بالإِنْسَان اختِصَاصَاً ذَاتِيَاً إِمَّا بِقَرَابةٍ قَرِيبةٍ أَو بِمَوالاَةٍ) واتە: (آل) بەکاردەهێنرێ بۆ کەسانێك کە تایبەتن بە ئینسانەوە، بە شێوەیەکی خودیی، یان بەهۆی خزمایەتییەکی نیزیکەوە، یاخود بەهۆی شوێنکەوتنەوە.

(ٱلْمِهَادُ): (الْمِهَادُ: الْمَكَانُ الْمُمَهَّدُ الموَطَّأ) واتە: (مِهَاد) شوێنێکە کە ئامادەکراوەو خۆشکراوە بۆ ئەوەی ئینسان ئیسراحەتی تێدا بکات.

(ٱلۡأَبۡصَـٰرِ): (جَمْـعُ بَـصَرْ وَهُـوَ اسـمٌ لِلجَارِحَـة، وَللقُـوَّةِ الَّتِـي فِيهَـا، وَيُقَـالُ لِقُـوَةِ القَلْبِ المُدْرِكَة) واتـە: وشـەی (أَبْصَار) كۆی (بَصَر)ە، كە نـاوە بـۆ ئەنـدامی زانراوی لەش، كە ئەویش هەم بە چاو دەگوترێ، هـەم بـە هـێزی دیـتن، كـە لە نێو چـاودا هـەیە، وە هـەم بـە هـێزی دڵ دەگـوترێ كـە شـتی پـێ دەزانـێ، واتـە: عـەقـڵ.

(وَٱلۡقَنَـٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ): (قَنَـاطِير) كـۆی (قِنْطَـار)ە، (قِنْطَـار) واتـە: ئەندازەیـەكی زۆر لـە پـارەی كـۆكراوە، یـاخود زێـڕو زیـوی كـۆكراوە، (الْمُقَنطَـرَة) واتـە: كـە پەزمەنـدە كرابـێ‌و كۆكرابێتـەوە سـەر یـەك، دەڵـێ: (هِـيَ مَجْمُوعَـة قِنطَـاراً، قِنطَـاراً مثـلُ: دَرَاهِـم مُـدرهمـةً ودَنَـانير مُـدَنَّرةَ والقِنْطَـار، والقَنْطَـرَةُ مِـنَ الـمال مَـا فيـهِ عُبـورُ الحيـاةِ تَـشبيهَاً بـالقَنْطَرَة، وذَلِـكَ غَيْـر مَحـدود القَـدْر فِي نفسـهِ وإنَّمـا هُـوَ بِحَـسَب الإضـافة كـالغِنَى)، (قَنَـاطِير) كـۆی (قنطـار)ە، یـان كـۆی (قَنطـرَة)یـە، كـە بریتیـە لـە ئەندازەیـەك لـە مـاڵ‌و سامان، كـە ئینـسان ژیـانی دنیـایی پـێ تێدەپـەڕێنێ‌و دەگوزەرێنـێ، وەك چـۆن ئینـسان بەسـەر پردێكـدا دەپەڕێتەوە، كە ئەویش لە خودی خۆی دا ئەندازەیەكی دیاریكراوی نیە بـەڵكو بە گوێرەی ئەو كەسـەیە كە پاڵ دەدرێـتە لای وەك دەوڵـەمەندیی.

(وَٱلۡخَيۡلِ): ولاخە بـەرزە، نـاوی كـۆیە، واتە: تـاكی نیە وەك: مـەڕ (غَـنَم).

(ٱلۡمُسَوَّمَةِ): واتـە: نیـشانەدار كـراو، (الـسيمَاءُ: العَلآمَـةُ وسـومتُهُ: أَعْلَمْتُـهُ...)، (سِيْمَاءُ) واتە: نیشانە، (سومتُهُ) واتە: نیشانەدارم كرد.

(مُّطَهَّـرَةٌ): واتـە: پـاككراوە، (أَي: مُطَهَّـرَاتٌ مِـنْ دَرَنِ الـدُّنْيَا وَأَنْجَاسِـهَا، وَقِيـلَ مِـنَ الآخْلاَقِ السَّيِّئَةِ...) واتە: ئافرەتـانێك كە پاككراونەوە لە چڵك‌و پیـسیی دنیـا، وە دەگوترێ: لە ڕەوشتی ناڕێك‌و خراپـی دنیـا، بـەڵكو لـە ڕاسـتی دا هـەردووكی دەگرێتـەوە، واتـە: ئافرەتانێـك كـە پـاكن، وە پـاككراوەن لـە پیـسی مـادديی‌و مەعنـەویی.

(**مَتَـٰعُ** ): (مَتَاع) هەر شتێکە کە سوودێکی لێ ببینرێ، دەگوترێ: (كُلُّ ما يُنْتَفعُ بهِ مِن وَجهٍ ما فَهُوَ مَتَاع ومُتْعةً)، (مَتَاع) بریتیە لە هەرشتێك کە بە شێوەیەك لە شێوەکان سوودی لێ ببینرێ.

(**بِٱلۡأَسۡحَارِ** ): (أَسْحَار) کۆی (سَحَر)ە، (سَحَر)، واتە: پێش بەرەبەیان، پێش ئەوەی (فَجْر) بدات، پێی دەگوترێ: (سَحَر)، (وَالسَّحَرُ وَالسُّحْرَةُ: اخْتِلاَطُ ظَلاَمِ آخرِ الليل بِضِيَاءِ النَّهَارِ وَجُعِلَ إسما لِذَلِكَ الوَقْتِ)، واتە: (سَحَر) کراوە بە ناو بۆ ئەو کاتەی کە تاریکیی کۆتایی شەو لەگەڵ ڕۆشنایی سەرەتای ڕۆژگار تێکەڵ دەبێ، هەر بۆیە بە خواردنی پارشێویش گوتراوە (سُحور)، (السُّحُورُ: أكلة السحر وتَسحَّر أكل السحور)، واتە: ئەو خواردنەی کە پارشێوان دەخورێ، پێش بەرەبەیان.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغۡلَبُونَ وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٢ ﴾، {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ، لَمَّا أَصَابَ رَسولُ اللهِ ﷺ قُرَيْشاً يَوْمَ بَدْرٍ فَقَدِمَ المَدِينَةَ، جَمَعَ اليَهُودَ في سوق بَنِي قَينُقَاعَ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ يَهُودَ أَسْلِمُوا قَبْلَ أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَ قُرَيْشاً»! فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ لاَ تَغُرَّنَكَ نَفْسُكَ أَنَّكَ قَتَلْتَ نَفَرًا مِنْ قُرَيْشٍ كَانُوا أَغْمَاراً لاَ يَعْرِفُونَ القِتَالَ، إِنَّكَ وَاللهِ لَوْ قَاتَلْتَنَا لَعَرَفْتُ أَنَّا نَحْنُ النَّاسُ، وَأَنَّكَ لَمْ تَلْقَ مِثْلَنَا! فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي ذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِمْ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغۡلَبُونَ وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴾ إلى قَوْلِهِ: ﴿ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾}، رَوَاهُ الطَّبَرِيُّ في (تفسيره) ج(٣)، ص(٦٥٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٠٠١)، وَضَعَّفَهُ الألباني في (سُنَن أَبِي دَاوُدَ)، واتە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (بەدر)دا، قورەیشییەکانی تێکشکاند (حەفتای لێ کوشتن، وە حەفتایان

لێ بە دیل گیرا)[1]، هاتەوە مەدینە جوولەکەکانی لە بازاڕی بەنو قەینوقاع (کە تیرەیەك بوون لە جوولەکەکان) کۆی کردنەوەو پێی فەرموون: ئەی کۆمەڵی جوولەکەکان! مسوڵمان بن بەر لەوەی ئەوەی کە تووشی قوڕەیش بوو، تووشی ئێوەش بێ، (واتە: لەسەر دژایەتیکردنو پەیمان شکاندنتان، ئەگەرنا دیارە پێغەمبەر ﷺ دیارە لەخۆوە لە کەسی هەڵنەپێچاوە) گوتیان: ئەی موحەممەد با نەفست فریووت نەدا کە چەند کەسێکت لە قوڕەیش کوشتوون، کە خەڵکێکی سادەو کەم ئەزموون بوونو جەنگیان نەزانیوە، (واتە: بەوە خۆت فریوو مەدە) سوێند بە خوا، ئەگەر لەگەڵ ئێمە بەشەڕ بێی، ئنجا تێدەگەی کە ئێمە خەڵکین (واتە: ئێمە خەڵکی شەڕکەرین)، وە تێدەگەی کە تاکو ئێستا خەڵکی وەك ئێمەت لە ڕاست ڕا نەهاتوە! جا خوای زاڵی پایەدار لەم بارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ ... ﴾.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی، کە ئەو ئایەتانەی لە دەرسی پێشوودا تەفسیرمان کردن باسی ناردنە خوارەوەی قورئان، وە کتێبەکانی خۆی بە گشتیو باسی ئایەتەکانی خۆی کرد، کە چەند جۆرێکن، وە باسی هەڵوێستی زانایانی ڕۆچوو لە زانیارییدا کرد سەبارەت بە ئایەتەکانی خۆی، وە باسی کەسانی دڵ نەخۆشو خەڵکی لادەری کرد، ئنجا دێتە سەر باسی بێبڕوایانو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، واتە: بێبڕوایان بە ئایەتەکانی خوا، بە خوای پەروەردگار، بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە بەرنامەی خوا ... هتد، هەمووی دەگرێتەوە، چونکە (كَفَرُواْ) واتە: بێبڕوان، بێبڕوان بەچی؟ بە خوا، بە پێغەمبەر، بە قورئان، بە هەرچی خوای پەروەردگار بە پێغەمبەردا ﷺ ناردوویەتی، ئا ئەوانە: ﴿ لَن

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کرد بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مانایەکەیو لە (السيرة النبـوية لابن هشام)، ج: (٢)، ص: (٣٨٧-٣٩٤).

﴿ تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَآ أَوْلَادُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، سامانەکانیان، وە منداڵەکانیان لە بەرانبەر خوادا، واتە: لە بەرانبەر سزی خوادا، کە خوا ویستی سزایان بداو تۆڵەیان لێ بستێنێ، هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ، واتە: سەروەتو سامانو کوڕو منداڵەکانیان نابنە بەڵا گێڕەوەو بەرگریکار، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴾، وە ئەوانە سووتەمەنی ئاگرن، واتە: سووتەمەنی ئاگری دۆزەخن، کە خۆیان دەسووتێنرێنو ئاگری دۆزەخیان پێ خۆش دەکرێ، ﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، وەك عادەتی فیرعەونو ئەوانەی لەگەڵ فیرعەون دا بوونو شوێنکەوتووی بوون، وە ئەوانەی پێش وانیش، واتە: عادەتی وان کە بریتی بوو لە بێبڕوایی، سەرەنجامیشیان ئەوە بوو، کە خوای تۆڵەستێن سزای دان، بە هەمان شێوە ئەگەر کافرەکانی ڕۆژگاری ئێوەش، وەك عادەتی فیرعەونو فیرعەونییەکانو ئەوانەی پێش ئەوان بکەن، بە دڵنیایی خوای زاڵی کاربەجێ، بەپێی ئەو یاسایەی کە مامەڵەی پێ لەگەڵ فیرعەونییەکانو ئەوانەی پێش ئەواندا کرد، بە هەمان یاساش مامەڵە لەگەڵ ئەواندا دەکات، ئەوان چییان کرد؟ ﴿ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆزانی، بەرانبەر بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوابوون، بەڕاستیان نەزانی ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ﴾، خوا بەهۆی گوناهەکانیانەوە گرتنی، خوای دادگەر کەس ناگرێ بە غەزەب، ئەگەر گوناهبار نەبێ، ئەگەر خراپەکار نەبێ، چونکە خوا ﷻ لە کەس لە بیانوو نیە، وەك لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ...﴿١٤٧﴾ ﴾، واتە: خوا چی دەکات بە سزادانی ئێوە، ئەگەر ئێوە شوکرانە بژێرن، وە ئیمانداربن، واتە: خوا پێویستی بەوە نیە بەندەکانی سزا بدات، بەڵام کاتێك ئەوان لەڕێ لادەدەن، خۆیان تووشی گوناحو تاوان دەکەن، دژایەتی خواو پێغەمبەرانو بەرنامەکانی دەکەن، ئەو کاتە یاسای خوایان بەسەردا دەچەسپێ، کە خوای کاربەجێ بیانگرێ ﴿ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾،

بێگومان خوا تۆڵەی توندە، ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، دیارە ئەوەی پێشێ وەك هەواڵێكی مێژوویی بوو، كە سوننەتی خوا لە مێژوودا بەو شێوەیە بووە لەگەڵ كافران، ئەمەیان فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەكات، كە بە كافرانی سەردەمی خۆی بڵێ، هەروەها فەرمان دەكات بە ئێمەش، كە قورئان دەخوێنین، بە بێبڕوایانی ڕۆژگاری خۆمان بڵێین: ﴿ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، بێگومان: ئێوە لەمەودوا تێك دەشكێن، وە بەرەو دۆزەخیش كۆدەكرێنەوە ﴿ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، وە خراپترین شوێنی خۆشكراو بۆ ئیسراحەت كردن دۆزەخە! ئەوان ئەگەر شوێنێك هەبێ ئیسراحەتی تێدا بكەن بۆیان ئامادە كرابێ، بریتیە لە دۆزەخ، هەڵبەتە لێرەدا خوای زاناو مەزن بە توانجەوە ئەوەیان پێ دەفەرموێ، واتە: هیچ شوێنێكی ئیسراحەت نیە بۆ ئەوان لە دوارۆژدا، جگە لە ئاگری دۆزەخ، بە دڵنیایی هیچ كەسیش لە ئاگری دۆزەخ دا ئیسراحەت ناكات، ئنجا خوا ﷻ بەڵگەیەك دەخاتەڕوو بۆ بێبڕوایان‌و دەفەرموێ: ﴿ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ﴾، نیشانەو بەڵگەیەك هەیە بۆ ئێوە لە دوو كۆمەڵدا كە بەرەنگاری یەك بوون ﴿ فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، كۆمەڵێكیان لە ڕێگای خوادا جەنگیان دەكرد ﴿ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ ﴾، كۆمەڵەكەی دیكەشیان بێبڕوا بوون ﴿ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ﴾، واتە: كۆمەڵە بڕوادارەكە بێبڕوایانیان دەبینی بە چاو دووهێندەی وانبوون، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ: ئەوانەی بێبڕوابوون كۆمەڵە بڕوادارەكەیان دەبینی بە دوو هێندەی خۆیانیان مەزەندە دەكردن، لە حاڵێكدا كە مسوڵمانەكان لە جەنگی (بەدر)دا (٣١٤) نەفەر بوون، وە كافرەكان نزیكەی هەزار (١٠٠٠) نەفەر بوون[١]، واتە: سێ هێندەی مسوڵمانان زیاتریش بوون، كەچی خوا ﷻ بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی كافرەكانەوە، مسوڵمانانی دوو هێندە پێشانی

١) بڕوانە: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ) لاپەڕە: ( ٤٥٢-٤٥٣).

كافرەكان دەدا، وە دەشگونجێ وەك گوتم: مسوڵمانەكان كافرەكانیان دوو هێندەی خۆیانیان ببینیبێ، واتە: كەمتر لە ژمارەی ڕاستەقینەیان، كە بریتین لە سێ هێندە زیاتر ﴿وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾، وە خوا بە یارمەتی خۆی پشتگیریی هەركەسێ دەكات كە بیەوێ، كەواتە: مەسەلە زۆریی و كەمیی نیە، بەڵكو مەسەلە ئەوەیە خوا لەگەڵ كێیەو پشتی كێ دەگرێ؟! چونكە هەر ئەو كەسە سەردەكەوێ، كە خوا پشتی دەگرێ، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾، بێگومان لەوەدا پەندێك هەیە بۆ خاوەن عەقلان، كە پەندی لێ وەربگرن، ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی جوانییەكانی ژیانی دنیا، وە پاشان باسی نازونیعمەتەكانی بەهەشت دەكات، چونكە ئەوانەی بێبڕوان بەهۆی دنیاوە هەڵدەخەڵەتێنو، بەهۆی نازو نیعمەتی دنیاوە فریو دەخۆن، وە خۆیان لە بیردەچێو دەكەونە شوێن ئارەزووەكانو شوێن شەیتان، وە دینەكەیان دەدۆڕێنن، بۆیە خوای پەروەردگار پێشێ باسی جوانییەكانی ژیانی دنیا دەكاتو دەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِ﴾، باسی شەش جۆرە شت دەكاتو دەفەرموێ: خۆشەویستی ئارەزووەكان بۆ خەڵكی ڕازێنراوەتەوە لە: ژنانو كوڕانو زێڕو زیوی زۆری پەزمەندەكراوو كەڵەكەكراوو وڵاخە بەرزەی نیشانەدار كراو، یاخود ڕاگیراوو ئاژەڵ[1] و كشتوكاڵ ﴿ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، واتە: ئەوە ڕابواردنی كەمی ژیانی دنیایە ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ﴾ خواش باشترین سەرەنجامو مەنزڵگای لەلایە، كە بەهەشتە، ئنجا باسی بەهەشت دەكاتو دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡ﴾، واتە: بڵێ: ئایا هەواڵتان پێبدەم بە چاكتر لەوەی باسكرا، كەواتە: لێرە خوا زاناو شارەزا نكوڵیی لەوە ناكات كە ژیانی دنیا جوانكراوە، نازو نیعمەتی تەواوو شتی خۆشی بەلەززەتی

---

١) (الأنْعَام) كۆی (نَعَم)ە، كە بە چوار جۆر ئاژەڵ دەگوترێ، ئەوانیش: وشترو مانگاو مەڕو بزن.

تێدایە، بەڵام سەرنجی ئیمانداران ڕادەکێشێ، وە سەرنجی مرۆڤەکان ڕادەکێشێ، بۆ چاکتر لەوە، واتە: دنیا وەك خۆی تەماشا بکەن، بەڵام مەیکەنە ئامانج، چونکە شتی زۆر چاکتر لە دنیا هەیە، کە بەهەشتە، دەفەرموێ: ﴿أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ﴾، ئایا هەواڵتان پێبدەم بە زۆر چاکتر لەو نازو نیعمەتەی دنیا ﴿لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ﴾، بۆ ئەوانەی پارێزیان کردوە لەلای پەروەردگاریان ﴿جَنَّاتٌ﴾، چەند باغێك هەن ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، ئەوەنیە وەك ژیانی دنیا کاتیی بێ، ژیانی دنیا یان بەجێی دێڵی، یان بەجێت دێڵێ، یان تۆ دەمری و دەبێتە میراتت، یان لە دەستت دەچێ و فەقیر دەکەویە گۆڕێ، وەك زۆر بینیومانە هەردوو حاڵەتە کە هەن، بەڵام نیعمەتەکانی بەهەشت نە بەجێیان دێڵی، نە بەجێت دێڵن! نە تۆ دەمری، نە ئەوانیش دەفەوتێن ﴿وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾، هاوسەرانێکی پاککراوە هاوسەرانێك کە خاوێن کراونەتەوە، لە هەرشتێك کە مایەی پیسییە، چ پیسیی ماددیی بێ، وەك: ئەو پاشەڕۆو شتانەی کە ئینسان هەینی (پیاوان و ئافرەتان) لە دنیادا، ئافرەتانی بەهەشت هاوسەرانی بەهەشت ئەوەیان نیە، وە چ پیسیی مەعنەوویی بێ، وەك ڕەوشتی ناڕێك، زمان درێژیی و، قسەو پرتەو بۆڵەو ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ﴾، وە ڕەزامەندییەکی گەورەش لە خواوە، کەواتە: لێرەدا خوا باسی سێ نیعمەت دەکات:

١- بەهەشت کە ڕووباری بەژێردا دەڕۆن، واتە: باغ و باغات.

٢- هاوسەرانی پاککراو.

٣- وە ڕەزامەندیی خوا ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾.

خواش بینەری بەندەکانییەتی، جا ئایا ئەو بەهەشتانە بۆ کێن و کێن ئەوانەی ئەهلی تەقوان؟ پێناسەیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا

﴿إِنَّنَآ ءَامَنَّا﴾، ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان ! بە دڵنیایی ئێمە ئیمانمان هێناوە، ئیمانیان بەچی هێناوە ؟ بە هەموو ئەو شتانەی، کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، ئیمانیان بە خوا ﷻ هێناوە، بە پێغەمبەر ﷺ، وە بە هەرچی، کە لە خواوە هێناویەتی ﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾، مادام ئیمانمان هێناوەو تۆش پەروەردگارمانی، لە هەڵەکانمان بمانبوورە، وە لە ئازاری ئاگر چەپاڵەمان بدەو بمانپارێزە، ئنجا باسی چەند سیفەتێکی دیکەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾، خۆڕاگرانو ڕاستانو گەردنکەچانو بەخشەرانو پێش بەرەبەیان داوای لێبوردن لە خواکەران (الأسْحَار) کۆی (سَحَرْ)ە، واتە: پێش بەرەبەیان، پێش ئەوەی بانگی بەیانی ببێ، ئنجا لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، خوا شایەدیی دا کە بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، خوا چۆنی شایەدیی دا؟ وای شایەدیی دا، کە بەڵگەکانی وەحدانیەتی خۆی بڵاوکردوونەوە لە نەفسی ئینسانو، لە ئاسۆیەکان دا، وە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوونو کتێبەکانی ناردوە، وە فیطرەتی بەشەری وا دروست کردوە کە بزانێت پەی بە وەحدانیەتیو یەکتایی خوای پەروەردگار ببات ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ﴾، هەروەها فریشتەکانو خاوەنانی زانیاریی، شایەدییان دا بە یەکتایی خوا لە پەرستنی دا، ﴿قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِ﴾، خوا بە دادگەریی ڕاوەستاوەو دادگەریی بەڕێوە دەبات، دادگەریی کە لە شەریعەتەکەیدا بەرجەستەیە، وە هاوسەنگییو دادگەرییەك کە لە بوونەوەرداو لە ژیانی ئینساندا بەرجەستەیە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراوی بە هەق نین، زاڵی کاربەجێیە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾، ئەوانەی بێبڕوان ماڵو سامانو منداڵەکەنیان هیچ سوودیان پێ ناگەیەنن، دیارە ماڵو سامانی کەسو، کوڕو ڕۆڵەی کەس، سوودی پێ ناگەیەنێ لە بەرانبەر سزای خوادا، بەڵام بۆچی لێرەدا خوا ﷻ باسی کافرەکان دەکات؟ لەبەر ئەوەی کافرەکان پشتیان بە ماڵو سامانی خۆیان بەستوە، پشتیان بە دەوروبەری خۆیان بەستوە، ئەوە لە لایەك، پاشان ماڵو سامانی بڕواداران سوودیان پێدەگەیەنێ لە ڕوویەکەوە، نەك وەك خودی ماڵو سامانەکە بەڵکو وەك ئەوەی کە کردوویانە بە هۆکارو وەسیلە بۆ لە خوا نیزیکبوونەوە، لەڕێی خوادا سەرفیان کردوەو، ڕەزامەندیی خوایان پێ وەدەست هێناوە لە ڕۆژی قیامەتدا، بە حەڵاڵیی پەیدایان کردوەو لە شوێنێك کە شەرع دەڵێ: سەرفیان کردوە، ئەوە دیارە سوودیان پێ دەگەیەنێ، هەروەها ماڵو منداڵو وەچەشیان مادام صاڵحو چاك بن، بە دڵنیایی ئەوانیش سوودیان پێدەگەیەنن، وە لێیان بەهرەمەند دەبن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ، إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ: إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٨٨٣١)، وَالبُخَارِيُّ في (الأدب المفرد) برقم: (٣٨)، وَمُسْلِم برقم: (٤١٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٨٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٧٦)، وابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٤٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٦٥١)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك ئینسان مرد، کردەوەکانی لێی دادەبڕێن جگە لە سێیان: (ئەوانیش:) خێرێکی بەردەوام، یان زانیارییەکی بە سوود، یان منداڵێکی صاڵح بۆی بپاڕێتەوە.

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان سووتەمەنی ئاگرن، واتە: دەسووتێنو تێیدا دەمێننەوە، وەك سووتەمەنی بن وایە، یاخود هەر دەبن بە سووتەمەنی، دەگونجیٚ خوا ﷻ ئاگری دۆزەخ بە كافرەكان خۆش بكات، وە دەشگونجیٚ مەبەست ئەوەبیٚ، كە هێندە تێیدا دەمێننەوە، وەك سووتەمەنی ئاگربن، وەك چۆن خەڵووزی بەرد یان هەرشتێكی دی كە دەبێتە سووتەمەنی، هەركات زۆر مایەوە لەنێو ئاگردا دەبێتە بەشێك لەو ئاگرە.

**مەسەلەی سێیەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، وەك عادەتی دارو دەستەی فیرعەونو ئەوانەی پێش وان، ئەمە ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ كە ئەوە یاسای خوایە ﷻ كە بە درۆ دانەرانی ئایەتەكانی خوای پاكو تاك، خوا سزایان دەدات، ئنجا (دأب) وەك گوتمان: بەمانای عادەت دیٚو بەمانای سوننەتیش دیٚ، دیارە خوای زاڵی دادگەر لە دنیاش دا سزایان دەدات، وە لە دوارِۆژیش دا، بەڵام بە دڵنیایی لە دنیادا ئەگەر بە دەستی بڕواداران بیٚ، بڕواداران دەبیٚ هۆكارەكانی هێزو دەسەڵات پەیدا بكەن، ئنجا خوا بە دەستی بڕواداران سزایان دەدات، ئەگەرنا هەر چۆن بیٚ لە سزاو تۆڵەی خوا دەرباز نابن، نە لە دنیاو نە لە دوارِۆژدا.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ ﴾، ئێمە بە داروودەستە، وە بە شوێنكەوتووان تەفسیرمان كردوە، هەرواشە، نەك ئەوە كە مەبەست خزمانی فیرعەون بیٚ! ئەگەرنا دەبیٚ خێزانی بگرێتەوەو ئەوانەی لە فیرعەون نیزیك بوون، مسوڵمان بن یان كافربن بیانگرێتەوە، بەڵام لەراستیدا وانیە، (آل) واتە: شوێنكەوتووان، كەسانێك كە لێی نزیكن لەگەڵی هاوڕاو هاورێبازن، بۆیە وشەی (آل إبراهیم)و (آل مُحَمَّد)یش بە هەمان شێوەیە، واتە: كەسانێك كە لە موحەممەد ﷺەوە، یان لە ئیبراهیمەوە ؑ نیزیكنو لەگەڵی هاو بڕواو هاو ڕێبازن، بۆیەش وا دەڵێین: چونكە هەندیٚ

خەڵكی سەیدو شێخ دەڵێن: ئێمە خزمانو ئەهلوبەیتی پێغەمبەرین ﷺو خراپیش بین، هەر لەوی نیزیكین، وە خراپیش بین هەر لەگەڵ وین لە بەهەشت !! كە لە ڕاستی دا ئەوە ئەسڵو ئەساسی نیە، ئنجا شاعیرێكیش لەوبارەوە زۆر جوانیی گوتوەو دەڵێ:

آلُ النَّبِيِّ هُمُ أَتْبَاعُ مِلَّتِهِ
مِنَ الأَعَاجِمِ وَالسودَانِ وَالْعَرَبِ
لَوْ لَمْ يَكُنْ آلُهُ إلاّ قَرَابَتَهُ
لصَلَّى الْمُصَلِّي عَلَى الطَّاغِي أَبِي لَهَبِ

واتە: ئالی پێغەمبەر، نیزیكانیو شوێنكەوتووانی ڕێبازەكەین.
لە عەجەمو ڕەش پێستەكانو لە عەرەب.
ئەگەر ئالی ئەو تەنیا خزمە نزیكەكانی بان (كە بە گۆشتو خوێن دەچنەوە سەری.
ئەوە بابای صەڵەواتدەر، صەڵەواتی بۆ ئەبو لەهەبی یاخیش دەنارد!
چونكە ئەبو لەهەب مامی پێغەمبەری خوایە ﷺ خزمی نیزیكیەتی.

<u>**مەسەلەی پێنجەم**</u>: سەرەنجامی ئەهلی كوفر تێكشكاندنی دنیاو خرانە دۆزەخی دوارۆژە، وەك دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ بە گشتی فەرموویەتی: بەوانەی بێبڕوان بڵێ: لەمەودوا تێكدەشكێنو دەشخرێنە دۆزەخەوە، هەڵبەتە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان، عادەتیان وایە هەر ئایەتێك هۆی هاتنە خوارەوەی هەبێت تایبەتی دەكەن بەو قەومەوە، بۆ نموونە: لێرە دەڵێن: مەبەست كافرەكانی قورەیشە! كە لە ڕاستیدا وانیە، چونكە بنچینەیەك هەیە وەك زانایانی (أُصُول الفِقه) گوتوویانە: (إنَّ خُصُوصَ السَبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُمُولِ الْمَعْنَى) واتە: ئەوە كە هۆیەكەی تایبەتە، ڕێگر نابێ لە بەردەم گشتگیریی

ماناکەیدا، خوای پەروەردگار وەك یاسایەکی گشتی دەفەرموێ: ئەوانەی بێبڕوان، پێیان بڵێ: کە تێکدەشکێن لە دنیادا، وە لە قیامەتیشدا بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوە، جا مەرج نیە ئەو جیلە کافرە ئێستا بشکێن، بەڵام بە دڵنیایی ئەهلی کوفر بێ سەرەنجامن لە دنیادا، وە سەرەنجامیان تێکشکانو ڕیسوا بوونە، وە دیارە پاشانیش لە دۆزەخ دا کۆدەکرێتەوە.

مەسەلەی شەشەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴾، واتە: خراپترین شوێنی خۆشکراو (مِهَاد)، واتە: بێشکە، لانکە، یان هەر جێیەك کە بۆ منداڵی کۆرپەی ساوا خۆش دەکرێ، وە (مِهَاد) هەر شوێنێکە، کە خۆشبکرێ بۆ ئینسان کە ئیسراحەتی تێدا بکات، جا لێرەدا کە خوا (سبحانەو تعالی) باسی دۆزەخ دەکاو دەفەرموێ: خراپترین شوێنی خۆشکراوە بۆ کافرەکان، ئەوە دوو شت دەگرێتەوە:

یەکەم: توانج تێگرتنە، واتە: ئەگەر شوێنێکیان هەبێ، بۆیان خۆشکرابێ ئیسراحەتی تێدا بکەن، بریتیە لە دۆزەخ.

دووەم: سەرنج ڕاکێشانە بۆ ئەوە کە ئەوانەی لە دنیادا بەتەمان هەر خەریکی ئیسراحەتو پاڵدانەوە بن، کە ئەهلی کوفرن، ئەوانە لە دوارۆژدا تووشی ئەشکەنجەو سزای خوای کاربەجێ دەبن، کەواتە: ئیمانداریـنە! ئێوەش دنیا بە شوێنی پاڵدانەوەو ئیسراحەت تەماشا مەکەن، بەڵکو بە شوێنی کارو کۆششی تەماشا بکەن.

مەسەلەی حەوتەم: کە دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ كَانَ لَكُمۡ ءَايَةٞ فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَا ﴾، واتە: بە ڕاستی نیشانەیەك هەیە بۆ ئێوە لە دوو کۆمەڵ دا، کە بەرەنگاری یەکبوونەوە، کە ئەوە ئاماژەیە بۆ جەنگی بەدر، چونکە لە جەنگی (بەدر)دا دوو کۆمەڵ لە ڕاست یەکراهاتن، کۆمەڵی بڕواداران بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺو ژمارەیان سێ سەد نەفەر زیاتر بوو (٣١٤) یان (٣١٥) یان (٣١٦) یان (٣١٧)، وە کافرەکانیش لە نێوانی (٩٠٠)و (١٠٠٠)دا بوون، جا ئایا بەڵگەو نیشانەکە بۆ

ئێمە چییە؟ ئەوەیە كە هەركەسێ خوای لەگەڵ دابێ سەردەكەوێو، هەركەسێ لەگەڵ خوا دابێ سەردەكەوێ، ئەوانە هەرچەند كەم بوون، چ لە ڕووی ژمارەیانەوەو، چ لە ڕووی چەكو جبەخانەیانەوە، بێهێزتر بوون لە هێزی ڕواڵەتی لە كافرەكان، بەڵام سەركەوتن، چونكە خوایان لەگەڵ دابوو، وە كە دەفەرموێ: ﴿ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ ﴾، دەگونجێ مەبەستی ئەوەبێ كە بڕواداران كافرەكانیان دوو هێندەی خۆیان دەبینی، لە حاڵێكدا كە كافرەكان سێ هێندەی وان بوون، واتە: خوا بە كەمتر دەیخستنە بەرچاوی ئیمانداران، چونكە پێشتر پێی فەرموو بوون، وەك لە سوورەتی (الأنفال)دا هاتوە: ﴿ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ ...﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: ئێستا خوا بۆی سووك كردن (پێشتر یەك بە دە بوو، ئێستاكە یەك بە دووە) خوا زانی كە لە ئێوەدا بێهێزیی هەیە، ئەگەر سەدی خوڕاگر لە ئێوە هەبن بەسەر دوو لە سەد كافرەكاندا زاڵ دەبن، خوای توانـاو زانا كافرەكان كە سێ هێندەی مسوڵمانان بوون، لەبەر چاویانی كردن بە دوو هێندە تاكو نەترسێن، وە دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ كە كافرەكان مسوڵمانانیان دوو هێندەی خۆیان بینیبێ، لە حاڵێكدا كە خۆیان سێ هێندەی مسوڵمانان بوون، بۆچی؟ بۆ ئەوە كە كافرەكان ترسیان بچێتە دڵەوە، وە پێیان وابێ كە مسوڵمانان دوو هێندەی وانن‌و، لە دەروونەوە تێكبشكێن، هەرچەندە بەپێی ئایەتی ژمارە (٤٤)ی سوورەتی (الأنفال) كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِيٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِيٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ... ﴾، واتە: وە كاتێك كە پێكگەیشتن كافرەكانی بە كەم پیشانی ئێوە دەداو، لە چاوتاندا كەم بوون، وە ئەوانیشی لەبەر چاوتان كەم دەكردەوە، بۆ ئەوەی كە ئەوە خوا بڕیاری داوە بێتەدی، واتە: خوا ژمارەی هەر كام لە مسوڵمانەكان‌و كافرەكانی كەم دەهێنایە بەرچاوی ئەویدیكە، بۆ ئەوەی هیچ كامێكیان لەوی دیكەیان

نەترسێ، وە سووربێ لەسەر بەرەنگاربوونەوە، بەڵام دەگونجێ ئەوە لە قۆناغێکدا بووبێ، واتە: لە قۆناغی سەرەتادا کافرەکان مسوڵمانەکانیان کەم ببینیبێ‌و، مسوڵمانەکانیش کافرەکانیان کەم ببینیبێ، بۆ ئەوەی هیچیان لەوی دیکەیان نەترسێ‌و بەرەو ڕووی یەکدی بچن، بەڵام لە قۆناغی پێکگەیشتنیاندا خوای باڵادەست وای هێنابێتە بەرچاوی کافرەکان، کە مسوڵمانان دوو هێندەی وانن، بۆ ئەوەی ترس‌و دڵە لەرزە بچێتە دڵ‌و دەروونیانەوە لە سەرەتاوە تێکبشکێن.

**مەسەلەی هەشتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾، واتە: خوا بە یارمەتی خۆی هەرکەسێ بیەوێ پشتی دەگرێ‌و بەهێزی دەکات، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە هۆکارە ماددییەکان دەور دەبینن، بەڵام ئەوەی کە وەرچەرخان دروست دەکات، ئەوەی کە شتەکان یەکلایی دەکاتەوە، تەنیا خوایە، کە یارمەتی خوا هات کەمیش بەسەر زۆردا زاڵ دەبێت، وە ئەگەر یارمەتی خوا نەبوو، زۆریش لە بەرانبەر کەمدا تێدەشکێ، لە جەنگی (بەدر)دا مسوڵمان کەمبوون، بەڵام بەسەر کافراندا زاڵبوون، هەرچەندە یەك لەسەر سێی (٣/١) وان بوون، بەڵام خوا لەبارەی جەنگی (حونەین)ەوە دەفەرموێ: ﴿...وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا ...﴿٢٥﴾﴾التوبة، واتە: وە لە جەنگی حونەیندا کە بە زۆرییەکەتان سەرسام بوون، بەڵام سوودی پێ نەگەیاندن، دیارە کە لە جەنگی حونەین دا مسوڵمانان (١٢٠٠٠) کەس بوون، کافرەکان کەمتربوون، یەکێ لە مسوڵمانان گوتی: جاران ئەگەر لەبەر کەمیی تێکشکابین، ئەمڕۆ زۆرین تێکناشکێین، کەچی تێکشکان، لە سەرەتای جەنگی حونەینەوە، کافرەکان لێیان چوونە بۆسەوەو بەیەك دەست تیر بارانیان کردن، وە مسوڵمانان شکان، پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوە مابۆوە، ئنجا دوایی وردە وردە گەڕانەوە بۆ لای‌و، لە جەولەی دووەمدا مسوڵمانان سەرکەوتن، کەواتە: مەسەلە ئەوەیە کە ئایا خوا لەگەڵ کێیە؟ هەڵبەتە خوا لەگەڵ بوون مانای وانیە کە بەتەمای خوا پشتێنی لێ بکەینەوەو هۆکارەکان ڕەچاو

نەکەین! چونکە هەر خوای کاربەجێ خۆی دەفەرموێ دەبێ هۆکارەکان ڕەچاو بکەن، دەفەرموێ: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ ...﴿٦٠﴾ ﴾الأنفال، واتە: هەرچی لە تواناتان دا هەیە لە هێز ئامادەی بکەن، بەڵام پشت بەهێزەکە مەبەستن پشت بەخوا ببەستن، دەستتان بە هۆکارەکانەوە بێ، بەڵام دڵتان بە خواوە پەیوەست بێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، بێگومان لەوەدا پەندو عیبرەت هەیە بۆ خاوەن عەقڵان، (عِبْرَة) لە زمانی عەرەبیدا بۆیە پێی دەگوترێ: عیبرەت کە ئێمە لە کوردیشدا بەکاری دەهێنینو هەر دەڵێین: عیبرەتی لێ وەربگرە، لەبەر ئەوەی ئینسان لە ڕووداوێکەوە دەپەڕێتەوە[1] بۆ شتێکی دیکە، واتە: مسوڵمانان لە جەنگی (بەدر)دا کەم بوونو کافرەکانیان تێکشکاند، کە سێ هێندەی وان بوون، ئەوە عیبرەتی لێ وەربگرن، یانی: لەو ڕووداوە ئێوە ئەو سوودە ببینن، کە هەرچی خوای لەگەڵ دابێ، سەر دەکەوێ، هەر کەسێ خوا یارمەتی بدات سەرکەوتووە، ئەگەر کەمیش بێ.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ﴾، واتە: خۆشەویستی ئارەزووەکان بۆ خەڵکی جوانکراوە، توێژەرەوانی قورئان مشتومڕیانە، کە ئایا ئەو جوانکارە، خوایە ﷻ یاخود شەیتانە؟ بەڵام بە سەرنجدانی ئایەتەکانی دیکەی قورئان، وەڵامەکەی زۆر ئاسانە، ئەوەتا لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سوورەتی (الکهف)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى ٱلۡأَرۡضِ زِينَةٗ لَّهَا لِنَبۡلُوَهُمۡ أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴾، واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە کردوومانە بە مایەی جوانیی، تاکو تاقییان بکەینەوە

---

١) واتە: (عبرة) لە ڕیشەی: (عَبَر یَعْبُر عبوراً)ەوە هاتوە، واتە: پەڕیەوە، دەپەڕێتەوە، پەڕینەوە.

کامیان کردەوەیان باشترە، بۆیە کێ سەر زەوی و نیعمەتەکانی زەوی ڕازاندۆتەوە؟ خوا، کەواتە: ناگونجێ بڵێین: خۆشەویستی ئارەزووەکان واتە: خۆشەویستی پیاو لە بەرانبەر ژن و منداڵ و سەروەت و سامان و ئەسپ و کشتوکاڵ و ئاژەڵ و مومتەلەکاتی دنیا، ناتوانین بڵێین: ئەوە لە شەیتانەوەیە، بەڵکو خوای کاربەجێ ئینسانی وا دروست کردوە، دڵی بەو شتانە خۆشبێ، ئەدی شەیتان چی جوان دەکات؟ کردەوەی خراپ جوان دەکات، شتی خراپ و حەرام جوان دەکات.

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾﴾ العنكبوت، واتە: شەیتان کردەوەکانی بۆ جوانکردن و لە ڕێی لادان، هەرچەندە ڕێشیان دەبینی، بەڵام شەیتان لایدان و سەری لێ شێواندن، کەواتە: جوانکرانی نیعمەتەکانی لەلایەن خواوەیە، بەڵام جوانکردنی شتی خراپ و حەرام و گوناهو تاوان، لەلایەن شەیتانەوەیە، ئنجا دیارە خۆشەویستی ژن و منداڵ و ماڵ و سامان و شتێکی خوارسکە، وە لە خودی خۆشیدا ئەو شتانە خراپ نین، مادام بە حەلاڵی بن، وە بۆ ئامانجی شەرعیی بن، بە بەڵگەی چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ کە لەوبارەوە هەن:

**فەرموودەی یەکەم:** (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: {الدُّنْيَا كُلُّهَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ}) رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٦٥٦٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٤٦٧)، والنسائي برقم: (٣٢٣٢)، وابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٠٣١)، وفي رِوَايَة معه هذه الزيادة: (إِذَا نَظَرَ إِلَيْهَا سَرَّتْهُ، وَإِذَا أَمَرَهَا أَطَاعَتْهُ، وَإِذَا غَابَ عَنْهَا حَفِظَتْهُ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٦٦٦)، وَضَعَّفَهُ الألباني في (سُنَن أبي دَاوُد)[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر - خوا

---

١) واتە: (الألباني) سەنەدی ئەوە زیادەیەی بە بێهێز داناوە، کە (أبو داود) هێناویەتی، نەك هی سەرجەم فەرموودەکە، کە (مسلم)یش هێناویەتی.

لێیـان ڕازی- بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموويـەتی: دنیـا هـەمووی ڕابـواردنێكی كاتییـە، باشـترین شـتی ڕابـواردنیش تێیـدا ئـافرەتێكی چاكە، لـە بێژەیەكی دیكەدا هاتوە: كە ئەگەر مێردەكەی تەماشای كـردو پـێی دڵخۆش بێ (واتە: مڕومۆچ نەبێ لەگەڵ مێردی، هەڵبەتـە لـە بەرانبـەردا پیـاویش لەگـەڵ ژنـی خۆیـدا دەبـێ هـەر وابـێ)، وە كـاتێك فـەرمانی پێكـرد (وە فەرمانەكـەی شـەرعیی بـوو) بـە قسـەی بكات، وە هەركـاتێك ئـەو پیاوە لـە مـاڵ نـەبوو، ئـەو ئافرەتـە بیپـارێزێ (واتـە: خـۆی بپـارێزێ لـەوەی تووشـی گـوناح بـێ، وە ماڵو سـامانی مێردەكەشی بپـارێزێ).

**فـەرموودەی دووەم:** (عَـنْ أَنَـسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ قَـالَ: {حُبِّـبَ إِلاَّ مِـنْ الـدُّنْيَا: النِّـسَاءُ، وَالطِّيـبُ، وَجُعِـلَ قُـرَّةُ عَيْنِـي فِـي الـصَّلاَةِ}) (رَوَاهُ أَحْمَـدُ بـرقم: (١٢٣١٥)، وَالنَّـسَائِيُّ بـرقم: (٣٩٣٩)، وَقَـالَ الـشَيْخ الألبـاني فـي (المـشكاة) بـرقم (٥٢٦١): حَـدِيثٌ حَـسَنٌ صَـحِيحٌ، وَحَـسَّنَهُ شـعيب الأرنـاؤوط)، واتــە: ئەنەســی كــوڕی مالیــك خــوا لێــی ڕازی بــێ، دەڵــێ: پێــغەمبەر ﷺ فەرموويــەتی: لــە دنیــادا ئافرەتــانو بــۆنی خۆشــم لــەلا خۆشەويــستن، وە ترووسكایی چاوانم نوێـژ كردنە، (كە ئارامـییم بۆ دێنـێ).

**فەرموودەی سـێیەم:** (عَـنْ عَمْـرَو بْنَ الْعَاصِ ﷺ، يَقُـولُ: قَـالَ رَسُـولُ الله ﷺ: {يَـا عَمْـرُو نِعْـمَ الـمالُ الـصَّالِحُ لِلْرَجُـلِ الـصَّالِحِ} (رَوَاهُ البُخَـارِيُّ فـي الأدب الـمفرد) (٢٩٩)، وَأَحْمَـدُ (١٧٨٣٥)، وغـيره، وَقَـالَ الألبـاني: إِسـنادُهُ صَـحِيحٌ عَلَى شَـرْطِ مُـسْلِم)، واتە: عەمری كوڕی عاص - خـوا لـێی ڕازی بـێ-، دەڵـێ: پـێغەمبەری خـوا ﷺ فەرمووی: ئەی عـەمر! باشتـرین شـت ماڵی حەڵاڵە بـۆ پیـاوی چاك، واتە: ئیسلام نیعمـەتەكانی دنیـا بـە خـراپ دانانـێ بـە مەرجـێ بە حـەڵاڵیی وەدەست بێن، وە لە سنووری شـەرعدا سوودیان لـێ ببینرێ.

<u>**مەسـەلەی یـازدەیـەم:**</u> ڕیزبەندیی خۆشـویستنی ئارەزووەكان (حُبُّ الشَّهَوَات)، كە خـوای پەروەردگار باسـی كـردوون، ئەگـەر سەرنجـیان بـدەین ڕیزبەندییـەكی لـە

گرنگترەو بۆ گرنگە، دیارە بەنسبەت زۆرینەی خەڵکییەوە، خوا ﷻ بەو شێوەیە ڕیزبەندیی کردوون: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ﴾.

١- ژنـان.

٢- کـوڕان.

٣- زێـڕو زیوی پەزمەندەکـراو (پارەی نەغدینـە).

٤- ئەسپی ڕاگیـراو، یان نیشـانەدار کراو.

٥- ئاژەڵ (حوشـتـر، مانگـا، مـەڕ، بـزن).

٦- کشـتوکـاڵ.

دیارە ئەو جۆرە ڕیزبەندیی یەش حەزو خـواستو ئارەزووی زۆربـەی خـەڵکی ڕەچـاو کـردوە، چـونکە: ئـەوەی بـەلای زۆربـەی خەڵـکییەوە گرنگـە لـە ڕووی ئیشـتیهاو ئارەزوو بۆ چـوونەوە: سـەرەتا ژنــە، ئنجا منـداڵ بـە تایبـەتی کوڕ، ئنجا پـارەو سامانە، ئنجا ئەسپە، واتـە: ئـەوەی کـە ئینسـان بـەکاری دێنـێ بـۆ سـواربوونو هـاتووچـۆ، ئنجـا ئاژەڵـە، وە پاشـان زەوی و زارو کشـتوکـاڵە.

**مەسـەلەی دوازدەیـەم:** ئیـسلام دژی فیطـرەتو دژی داخـوازییە سـروشـتییەکان نیــە، بۆیـە خــوای پـەروەردگار پـاش ئـەوەی باسـی ئـەو نازونیعمەتانـەی دنیـا دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئا ئـەوە ڕابـواردنی ژیـانی دنیایە، واتە: شتێکە کە لە ژیانی دنیادا هەیە، وە خەڵك لەززەتی لـێ وەردەگـرن، وە ژیـانی دنیـای خۆیـانی پـێ ڕاهـی دەکـەن، کەواتـە: ئیـسلام دژی داخــوازییە سروشـتییەکان نیـە، وە ئـەوەی کـە ئیـسلام دەیـەوێ ئەوەیـە: کـە ئینـسان لـە بەکارهێنانی ئارەزووەکانی دا زێـدەڕۆیی نـەکاتو تێنەپـەڕێنێ، وە لـە تێرکردنـی غەریزەکانی دا ئاگای لـە سنوورەکانی شـەرع بـێ، وە بـە دڵنیـایی پابەنـدیی بـە سنوورەکانی شەرعەوە، لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئارەزووەکانـدا لەگـەڵ تێرکردنـی

غەریزەکاندا، بە قازانج دەشکێتەوە بۆ جەستەو ڕووحو عەقڵ، هەروەها بۆ تاکو خێزانو کۆمەڵگا بۆ دنیاو دوارۆژ.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** ئیسلام دەیەوێ ئینسان ژیانی دنیاو ڕابواردنەکانی ژیانی دنیاو خۆشیو لەززەتەکانی دنیا، وەك وەسیلە تەماشا بکات، ئەوەی کە ئامانجە مەنزڵگای دوارۆژە کە بەهەشتە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ﴾، خوا باشترین سەرەنجامو مەنزڵگای لەلایە، هەروەها دوای ئەوەش دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡ﴾، واتە: بڵێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە باشتر لەوە، وە باشتر لەو نازو نیعمەتانەی دنیا، ئنجا خوای پەروەردگار باسی نیعمەتەکانی بەهەشت دەکات.

**مەسەلەی چواردەیەم:** خوا ﷻ مەنزڵگای دوارۆژ، وە نازونیعمەتەکانی بەهەشت تایبەت دەکات بە ئەهلی تەقواوەو دەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾، بۆ ئەوانەی پارێزیان کردوە، لای پەروەردگاریان ئەو نیعمەتانە هەن، کەواتە: بەبێ تەقوا ئینسان هیچی دەستگیر نابێ، سەرەنجامی خێری دنیاو دوارۆژ لە گرەوی تەقوا دایە، بۆیە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هاتوە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ؟ فَقَالَ: {تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ، وَسُئِلَ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ؟ فَقَالَ: الْفَمُ وَالْفَرْجُ}) رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٩٦٩٤)، وَالبُخَارِيُّ فِي (الأدب المفرد) برقم: (٢٩٤)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٠٤) وَقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٩١٩) وَقَالَ: صَحِيح الإسناد، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٤٦)، وَحَسَّنَهُ الآلباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٩٧٧)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێ ڕازی بێ- دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا لە باشترین شتێك کە زۆرترینی خەڵکی دەخاتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: پارێزکارییو ڕەوشتی جوانە، وە پرسیاری لێکرا لەوە

كە چ شتێك زۆرترینی خەڵكی دەخاتە دۆزەخ؟ فەرمووی: زارو داوێن، واتە: ئەو گوناهانەی كە بە دەم دەكرێن، وەك درۆو بوختانو غەیبەتو شیركو كوفرو ئەوانە، وە داوێن كە دیارە داوێن پیسییو زینای پێ دەكرێ.

**مەسەلەی پازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾، لەلای پەروەردگاریان، دیارە خوا ﷻ یەكێ لەو سیفەتانەی كە بەهەشتی پێ وەسف كردوە ئەوەیە، كە لەلای پەروەردگارە، بەلام ئەو لەلای پەروەردگار بوونە، چۆنە ؟ دیارە كە چۆنییەتەكەی نازانین، بەلام لە زۆر ئایەتدا خوای زاناو شارەزا باسی بەهەشتی كردوە، یاخود باسی بەهەشتیانی كردوە كە لە خوا نیزیكن، بۆ وێنە: لە سوورەتی (القمر) ئایەتی (٥٤ و ٥٥) دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾، واتە: بێگومان پارێزكاران لە نێو باغاتو لە نێو ڕووبارەكان لە نشینگەیەكی پڕ ڕێزو حورمەت دا (واتە: نشینگەیەك كە لێی دادەنیشن بەڕێزو حورمەت) لەلای پادشایەكی توانادار، كە خوای پەروەردگارە، بەلام ئەو لەلای خوای پەروەردگار بوونە چۆنە؟ دەڵێین: چۆنییەتەكەی تەنیا خوا دەیزانێ.

**مەسەلەی شازدەیەم:** خوا ﷻ نیعمەتەكانی ڕۆژی دوایی (بەهەشت) لە سێ شتی سەرەكی لەم ئایەتەدا، كورت كردۆتەوە:

١/ ﴿جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، چەند باغو بێستانێك، كە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

٢/ ﴿وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾، وە هاوسەرانی پاكو چاك.

٣/ ﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، وە ڕەزامەندیی خوا.

پێشێ ئینسان پێویستی بە مەنزڵگاو شوێنێكە، دوایی پێویستی بە هاودەمو هاوڕازێكە، وە لە سەرووی هەموو شتێكو پێش هەموو شتێك پێویستی بەوەیە كە خوای لێ ڕازی بێ، وە ئەو سێیانە هەموو نیعمەتەكانی

بەهەشتیان کۆکردوونەتەوە، بە مادديیو مەعنەوویيەوە، کە بە دڵنیایی ڕەزامەندیی خوا گەورەترین نیعمەتە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ... ﴿٧٢﴾ ﴾، واتە: ڕەزامەندییەك لە خواوە گەورەترە لە هەموو شتێك، وە لە ڕاستیدا بەهەشت بۆیە خۆشە، چونکە شوێنی تێدا بەرجەستەبوونی ڕەزامەندیی خوای بەخشندەیە.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** ئەوانەی کە خوای بەخشەر لێرەدا مەدحی کردوون، نۆ سیفەتی بۆ بەکارهێناون، واتە: بە نۆ سیفەت وەسفی کردوون، کە بۆ ئێمە زۆر جێی سەرنجن و پێویستە هەوڵبدەین ئەم سیفەتان لە خۆماندا بێنینە دی، ئەگەر تێماندا نەبن، وە تۆخیان بکەینەوە، ئەگەر تێماندا هەبن:

یەکەم: ئیمان.
دووەم: داوای لێبوردن کردن لە خوا ﷻ.
سێیەم: داواکردنی چەپاڵە دران لە ئاگری دۆزەخ.
چوارەم: خۆڕاگریی (صبر).
پێنجەم: ڕاستیی (صدق).
شەشەم: ملکەچیی (قنوت).
حەوتەم: ماڵ بەخشین و کەرەم و سەخاوەت.
هەشتەم: شەونوێژ.
نۆیەم: داوای لێبوردن کردنی پێش بەرەبەیان.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** خوا ﷻ بۆ خۆی شایەدیی داوە لەسەر یەکتایی خۆی، پاشان باسی شایەدییدانی فریشتەکان و زانایانی کردوە: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ ﴾، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە زانایان کەسانێك کە زانیارییان بە خوای پەروەردگار هەیە، وە زانیارییان بە شەریعەتی خوا هەیە بەتایبەت، وە پاشان زانیارییان هەیە بە

دروستکراوەکانی خـوا، ئەوانـە پلـەو پایەیـەکی بـەرزیان هەیـە، چـونکە خـوا شـایەدییدانی خـۆی هێنـاوە لەسـەر ئـەوە، کـە تـەنها خـۆی پەرستـراوە، پاشـان شـایەدیی فریـشتەکان، کـە ئـەوانیش پاکتـرینو چاکتـرین دروسـتکراون، وە دوایـی شـایەدیی زانایـان، کەواتـە: زانایـان لـە ڕیـزی فریـشتەکانن، وە خـوای پـەروەردگار لـە ڕیزی خۆیـدا دایناون لـەو ڕووەوە، کـە شـایەدیی دەدەن لەسـەر یەکتایی خـوا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لەم دەرسەمان دا حەوت ئایەت تەفسیر دەکەین لە سوورەتی (آل عمران) واتە: لە ئایەتەکانی: (١٩ تاکو ٢٥)، کە ئەم حەوت ئایەتە باسی تەنیا ئیسلام بەرنامەی ڕاست بوونی ژین دەکەن لەلای خوای پەروەردگار، وە باسی هۆکاری ڕاجیایی خاوەن کتێبەکانە بەرانبەر ئیسلام دا دەکەن، وە باسی چۆنیەتی وتوو وێژ لەگەڵ کردنیان دەکەن، واتە: لەگەڵ خاوەن کتێبەکان، وە لەگەڵ ئەوانی دیکەش، کە خاوەن کتێبی ئاسمانی نین، وە باسی سەرەنجامی بێبڕوایانێك کە دەستیان چۆتە خوێنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و کەسانێکەوە کە فەرمانیان بە دادگەریی کردوە دەکەن، کە ئەوانە سەرەنجامیان لە دنیاو دوارۆژدا چۆنە؟ وە پاشان باسی خۆ فریودانی خاوەن کتێبە پێشووەکان واتە: جوولەکەو نەصرانیی یەکانو ئەوانی دیکە دەکەن، کە چۆن بە هەندێ قسەو خەیاڵی بێ بناغە، وە بەشت داهێنان لە دینداریی دا، خۆیان فریو داوەو خۆیان دەستخەڕۆ کردوە.

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ
مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩﴾
فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ
فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ

يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ
مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ وَغَرَّهُمْ
فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَٰهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ
كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾﴾.

## مانای وشــه به وشـەی ئایەتەکـان

((بێگومـان بەرنامـە (ی ڕاسـت) لـەلای خـوا بـەس ئیـسلامە، وە ئەوانـەی کـە کتێبیان پـێدراوە نەکەوتنە ڕاجیایی یـەوە، مەگەر پاش ئەوەی زانیارییان بـۆ هـات، بـە هـۆی سـتەمی خۆیانـەوە، هەرکەسێکـیش بـڕوا بـە ئایەتـەکانی خـوا نەهێـنێ، ئـەوە مـسۆگەر خـوا لێپرسـینەوەی خێرایـە ﴿١٩﴾ ئنجـا هەرکـات شـەڕە قـسەیان لەگـەڵ کـردی ئـەوە پـێیان بڵـێ: ڕووی خـۆم بـۆ خـوا ملکـەچ کـردوە، هـەروەهـا ئـەوانـەش کـە شـوێنم کـەوتوون، وە بەوانـەی کـە کتێبیـان پـێدراوەو بـە نەشارەزایەکـانیش بڵـێ: ئایـا ملکەچـبوون (مـسوڵمان بـوون)؟ جـا ئەگـەر ملکەچبوون، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتـوە، ئەگەر ڕووشـیان وەرگێـڕا، ئـەوە تـۆ تـەنیا گەیاندنت لەسەرە، وە خوا بینەری بەندەکانییەتی ﴿٢٠﴾ بێگومان ئەوانەی بێبـڕوان بە ئایەتەکانی خـوا، وە بـە ناهـەق پێغەمبـەران دەکوژن، وە کەسـانێك دەکوژن کـە فەرمان بە خەڵکی دەکەن بە دادگەریی، ئەوە موژدەی ئـازارێکی بـە ئێـشیان بدەیـە ﴿٢١﴾ ئەوانـە کەسـانێکن لـە دنیـاو دواڕۆژدا کردەوەکانیـان هەڵوەشـاونەوەو هـیچ یاریدەدەریـشیان نـین ﴿٢٢﴾ ئایـا سـەرنجی ئەوانـە نـادەی کـە بەشـێك لـە کتێـب (ی خـوا)یـان پێـدراوە، بـۆ لای کتێـبی خـوا بـانگ دەکـرێن کـە دادوەرییـان لـە نێوانـدا بکـات، کەچـی دەسـتەیەکیان بـە سـەرپێـچیی کردنـەوە ڕوویـان وەردەگـێڕن ﴿٢٣﴾

ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە كە گوتیان: جگە لە چەند ڕۆژێكی ژمێردراو ئاگرمان ناگاتێ، وە ئەوەی كە هەڵیدەبەستن لە ئایینەكەیاندا فریوی دان﴿٢٤﴾ جا ئایا حاڵیان چۆن دەبێت كاتێك لە ڕۆژێكدا كۆمان كردنەوە كە گومانی تێدانیە، وە هەركەسە بێئەوەی ستەمیان لێ بكرێ، بە گوێرەی ئەوە كە كردوویەتی، بە تەواویی سزاو پاداشتی وەرگرتەوە؟! ﴿٢٥﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلدِّينَ): ﴿وَالدِّينُ يُقَالُ للطَاعَةِ وَالْجَزَاءِ، وَاسْتُعِيرَ للشَرِيعَةِ (حَقَّةً كَانت أَوْ باطِلةً)﴾ واتە: وشەی (دین) لە زمانی كوردییدا بە ئایین تەرجەمە دەكرێ، لە زمانی عەرەبی دا بە بەرنامە تەرجەمە دەكرێ، وە بە ملكەچییش دێ، وە بە پاداشتیش دەگوترێ، وە خوازراوەتەوە بۆ بەرنامەو شەریعەتێك كە خوا ناردوویەتی، جا چ وەك خۆی مابێتەوە، كە ئیسلامە، چ دەستكاریی كرابێ، وەك شەریعەتی پێغەمبەرانی پێشوو، وە چ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ئەو بەرنامەیە دانرابێ، یان لەلایەن غەیری خواوە دانرابێ، كەواتە: (دین) بریتیە لەو بەرنامەیەی، كە خەڵك پەیڕەویی لێ دەكەن، دیارە كاتێك وشەی (دین) لە قورئاندا بەكاربهێنرێ، مەبەست پێی ئیسلام بێ، ئەوە یان (أَل)ی تەعریفی دەخرێتە سەر، وەك: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾، یاخود بە وەسفێك پێناسە دەكرێ، وەك وشەی هەق ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ...﴿٢٨﴾ ﴾ الفتح، یاخود پاڵدەدرێتە لای خوا، وەك: ﴿ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ ﴾ النصر.

(ٱلْإِسْلَٰمُ): (الدُّخُولُ في السِّلْمِ، وَالإِسلامُ في الشَّرْعِ عَلَى ضَرْبَيْنِ: أَحَدُهُمَا: دُونَ الإِيْمَان، وَهُوَ الإِعْتِرافُ باللسان حَصَلَ مَعَهُ الإِعتِقَادُ أَو لَمْ يَحْصُلْ، وإِيَّاهُ قصِدَ بقَولِهِ: ﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ... ﴿١٤﴾ ﴾ الحجرات، وَالثَّانِي: فَوْقَ الإِيْمَانِ،

وَهُوَ أَنْ يَكُونَ مَعَ الإعْترافِ إعْتِقَادٌ بالقَلْبِ، وَوَفَاءٌ بالفِعْلِ وَاسْتِسْلاَمٌ لله سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) واتە: وشەی: (ئیسلام) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا یانی: ملکەچبوون، وە: (الدخول في السَّلْمِ)، واتە: چوونە نێو ملکەچییەوە، بەڵام لە زاراوەی شەرعدا، ئیسلام بە دوو واتا بەکاردێ:

یەکەم: لە خوار ئیمانەوەیە، کە بریتیە لە دان پێداهێنانی زمان، جا عەقیدەی لەگەڵ دابێ، یان لەگەڵ دانەبێ، وەك خوا ﷻ دەربارەی عەرەبە خێڵەکییەکان دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا ...﴿١٤﴾﴾ الحجرات، واتە: عەرەبە خێڵەکییەکان گوتیان: ئیمانمان هێناوە، پێیان بڵێ: ئیمانتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: مسوڵمان بووینو ملکەچبووین بە ڕواڵەت.

دووەم: لە قورئاندا ئیسلام لە سەرووی ئیمانەوەش بەکارهاتوە، ئەویش ئەوەیە کە وێڕای دان پێداهێنانی زمان، بڕواهێنانی بە دڵیش، وە هەروەها جێبەجێکردنی بە کردەوەش، وە ملکەچبوون بۆ خواش هەبێ، کەواتە: وشەی (ئیسلام) لە قورئاندا بە هەردوو واتاکە بەکارهاتوە، هەم بە مانای مسوڵمانبوونێکی ڕواڵەتی، وە هەم بە مانای مسوڵمانبوونێکی ڕاستەقینەش.

(بَغۡيَۢا ): (البَغي: طَلَب تجَاوزِ الإقتِصَاد فِيمَا يُتحَرَّى)، ئەسڵی وشەی: (بَغي) واتە: سنوور شکاندنو لە سنوور دەرچوون، وە لە هەندێ شوێن بە مانای (حَسَد)یان لێکداوەتەوە، چونکە حەسوودییش بریتیە لە سنوور شکاندنو لە خەت دەرچوون.

(حَآجُّوكَ): (الْمحاجَّة: أن يَطلُبَ كُل وَاحِدٍ أن يَرُدَّ الآخَرَ عَن حُجَّته ومَحجَّتِهِ)، وشەی (محاجَّة) ئەوەیە کە دوو لایەن، یاخود سێ لایەن، یاخود زیاتر هەر کامێکیان بیەوێ، ئەوی دیکە لە بەڵگەکەیو لەسەر ڕێیەکەی لابداو بیهێنێتە سەر ڕێی خۆی.

(وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ): (الأُمِّي: هُوَ الَّذِي لا يَكتبُ ولاَيَقْرأُ مِنَ الكِتاب)، (أُمِّي): کەسێکە کە نە دەنووسیێو نە دەخوێنێتەوە لە کتێبدا، (وَالأُمية: الغَفْلَةُ والجَهَالَةُ وقِلَّةُ الْمَعْرِفَة) واتە: (أمية) بریتیە لە بێ ئاگایی‌و نەزانیی‌و کەم شارەزایی.

(ٱلۡبَلَٰغُ): (البلاغُ: التَبْلِيغُ، وَالبَلاَغُ: الكِفَاية)، وشەی (بلاغ) بەمانای تەبلیغو گەیاندن دێ، وە بەمانای تەواوکردنی شتێك، دێ.

(بِٱلۡقِسۡطِ): (القِسْطُ: هُوَ النَّصِيبُ بالعَدْلِ، وَالقَسْطُ أخذ قِسط الغَير، والإقساطُ: إعْطَاءُ قِسْطِ الغَيْرِ) (قِسْط): بریتیە لە بەشێك کە بە دادگەرانە بەش کرابێ، وە دوو وشەمان هەیە: (قَسْط) بریتیە لە وەرگرتنی بەشی یەکێکی دیکە بۆخۆت، وە (إقساط) ئەوەیە کە بەشی ئەوی دیکە بدەی، کەواتە: (قاسط) کەسێکە بەشی خەڵکی خواردبێ، (مُقْسِط)یش ئەو کەسەیە کە بەشی خەڵکی دابێ بە دادگەرانە.

(حَبِطَتۡ): واتە: هەڵوەشاوەتەوە، (وَأَصْلُ الحَبْطِ مِنَ الحَبَطِ، وَهُوَ أَن تُكثِر الدَابَّة أَكَلاً حَتَّى يَنتفَخَ بطنها)، وشەی: (حَبِطَت) لە ڕیشەوە لە (حَبَط)ەوە هاتوە، ئەویش ئەوەیە کە ئاژەڵێك لەوەڕێك زۆر بخوات تاکو ورگی دەئاوسێ.

(يَتَوَلَّىٰ): لە (تَوَلَّي)ەوە هاتوە، دیارە (تَوَلَّي) بە دوو مانا بەکاردێ: (التَوَلِّي: إذَا عُدِّي بنَفسهِ يقتَضَى مَعنَى الوَلاَيَة.. وإذَا عُدِّي بـ (عَن) لَفظَاً أو تَقدِيراً اقتَضَى مَعنَى الإعْرَاضِ وتَرْكِ قُرْبِه..) وشەی (تَوَلِّي) ئەگەر تەعەددا بکا، بۆ (مَفْعُول) بە نەفسی خۆی، ئەوە مانای دۆستایەتیی دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بە وشە (عَنْ) تەعەددا بکا بۆ (مَفْعُول) وەك: (تَوَلَّى عَنهُ) ئەوە چ بە (لَفْظ) وشەی (عَنْ) بەکاربهێنرێ، چ بە تەقدیر مەزەندە بکرێ، مانای پشت هەڵکردن‌و لامل تێکردن دێ.

(مُّعۡرِضُونَ): (أَعْرَضَ: أَظْهَرَ عُرْضَهُ، أَي: ناحِيَتَهُ، إذَا قِيلَ: أَعرَضَ لِي كَذَا، أَي: بَدَا عُرْضُهُ فَأَمْكَنَ تَنَاوُلُهُ، وَأَعْرَضَ عَنِّي: وَلَّيّ مُبْدِياً عُرْضَهُ) واتە: (أَعْرَضَ)

یانی: تەنیشتی دەرخست، ئەگەر بگوترێ: (أَعرَضَ لِي كَذَا)، یانی: تەنیشتی دەركـەوتو گونجا دەستی بگەیـەنرێتێ، بـەلاَم (أَعْـرَضَ عَنِّـي)، یـانی: پـشتی هـەڵكـردو لاملی خۆی، یان تەنیشتی دەرخست .

(وَغَرَّهُمْ): (أَغفَلَهُم وَخَدَعَهُم) واتە: بێئاگای كردنو فریوی دان.

(يَفْتَرُونَ): واتـە: هـەڵی دەبەستن، یـاخود درۆ دەكـەن لـە (فَـرْي)ەوە هـاتوە: (الفَرْيُ: قَطْعُ الجِلْدِ لِلْخَرْزِ وَالإِصْلاَحِ ...) بریتیە لـەوەی چـەرمێك ببـڕدرێ بۆ ئـەوەی شتێكی پێ پینـە بكرێ، یاخود چاكی بكـەی (وَاسْتُعْمِلَ فِي القُرْآنِ بالكَذب والشِّرْكِ وَالظُّلْمِ)، واتە: وشـەی (افترى) لە قورئـاندا بەكارهـاتوە بـۆ درۆ، وە بۆ شیـرك، وە بۆ زوڵم.

(وَوُفِّيَتْ): واتـە: بـە تـەواویی پـێی درا، دەڵـێ: (الوَافِـي: الَّـذِي بَلَـغَ التَّمَـامَ) (الوَافِـي) واتـە: شـتێك كـە گەیـشتبێتە ئەنـدازەی تـەواوی خـۆی، دەگـوترێ: (دِرْهَمٌ وَافٍ، وَكَيْلٌ وَافٍ) واتە: دەرهەمێكی تـەواو لـە ڕووی وەزنو كێشـەوە، وە شتێك كە بە تەواویی بكێشرێ، (وَأَوفى: إذَا تَمَّمَ العَهْدَ وَلَمْ يَنْقُضْ حِفْظَهُ، وَتَوْفِيَةُ الشيء: بَذْلُهُ وَافِياً وَاسْتِيفَاؤُهُ: تَنَاوُلُهُ وَافِياً)، واتـە: (أَوفى) ئەگـەر پەیمانەكـەی بردبێتـە سـەرو پاراستنی هەڵنـەوەشاندبێتەوە، وە: (تَوْفِيَةُ الـشيء) یـانی: بەخـشینی بەتەواویـی، وە: (اسْتِيفَاؤُهُ) یـانی: وەرگرتنـی شـتێك بە تێرو تەواویی.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئـایەتەكـان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی كە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾، لەوبـارەوە دوو ڕیوایـەت لە قەتـادەوە هـاتوون:

ڕیوایـەتی یەکـەم: ((عَـنْ قَتَـادَةَ أُولئِـكَ أَعَـدَاءُ اللهِ اليَهُـودُ دُعُـوا إِلى كِتَـابِ اللهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُم وَإِلى نبيِّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ، وَهُمْ يَجِدُونَ مَكْتُوبَاً عِنْدهُمْ فـي التَوراَةِ والإِنْجِيلِ، ثُمَّ تَولَّوا عَنْهُ وَهُمْ مُعرِضُون)) (تفسير الطبري برقم: (٦٦٧٢))، واتە: قەتادە دەڵێ: ئـەم ئایەتـەی کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ ... ﴾، ئایا سـەرنجی ئەوانـە نـادەی، کـە بەشـێك لـە کـتێبی خـوایان پـێدرابوو، مەبەسـت پـێی دوژمنـانی خـوا، جوولەکـەکانن، بانگکران بۆ کتێبی خـوا، کە حوکمیان لە بەینـدا بکـات، وە بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ تاوەکو حوکمیان لە بەینـدا بکات، کە دەشیانبینی ناوی پێغەمبەری خـوا لە کتێبی خۆیانـدا نووسـراوە لـە تـەوڕاتو ئینجیلـدا، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا پشتیان تێکردو لاملیان تێکرد.

ڕیوایـەتی دووەم: ((عَـنْ قَتَـادَةَ هُـم اليَهُـودُ دُعُـوا إِلى كِتَـابِ اللهِ وَإِلى نَبيِّـهِ وَهُـمْ يَجِدُونَ مَكْتُوبَاً عِنْدهُمْ، ثُمَّ تَولَّوا وَهُمْ مُعرِضُون)) (تفسير الطبري برقم: (٦٦٧٣)، ولكن سندهما ضعيف حسب قول محقق تفسير الطبري)، واتـە: قەتـادە دەڵێ: مەبەست لەوانە جوولەکەکـانن بانگـکران بـۆ لای کتێبـی خـوا وە بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ (کـە نیـشانەکانی قورئـانو نیـشانەکانی پێغەمبـەر ﷺ)یـان لـەلای خۆیـان دەبینـی بـە نووسـراویی لـە کتێبـەکانی خۆیاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پشتیان تێکردو لاملیان کرد.

## مـانـای گـشـتی ئـایـەتەکــان

خــوای بەخــشندە دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾، بێگومـان بەرنامەی ڕاست، واتە: ئاینی ڕاست، ڕێبازێك کە شایستەی ژیانی ئینسان بێت لە لای خوا، تەنیا ئیسلامە، دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کـە خـوا ﷻ بێجگـە لـە ئیـسلام، ئیـسلامی بەرجەسـتە لـە قورئـانو سـوننەتدا، هـیچ بەرنـامەو ئـایینێـکی دیکە بـە ڕەوا نازانـێ کـە ئینسان بیکاتـە پـەیڕەوی ژیـانی، وە پێـوەی

پابەندبێ، وە ژیانی تاكیی‌و خێزانیی‌و كۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی خۆی پێ ڕێك بخات، وەك لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرمویٚ: ﴿ ... وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَامَ دِينًا ...﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسند كردوون، كەواتە: غەیری ئیسلام لەلای خوای پەروەردگار هەموو بەرنامەكانی دیكەی ناپەسندن‌و وەرناگیرێن، هەروەك لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: هەر كەسێك غەیری ئیسلام بە بەرنامە بخوازیٚ، وەك بەرنامەی ژیانی لێی قبوولٚ ناكریٚ، وە لە دواڕۆژدا لە زیانبارانە، ئنجا لێرەدا یەكێك بۆی هەیە بپرسیٚ‌و بڵیٚ: باشە مادام بەرنامەی ڕاست‌و ڕێك‌و ڕەوان لای خوا بەس ئیسلامە، ئەدی بۆچی خاوەن كتێبەكان، واتە: جوولەكەو نەصرانیی یەكان كە لە پێش هاتنی ئیسلامدا كتێبی ئاسمانیان بۆ هاتوە، لە بەرانبەر ئیسلامدا كەوتنە ڕاجیایی، هەندێكیان ئیمانیان پیٚهێناو زۆربەشیان ئیمانیان پیٚ نەهێنا؟ خوا ﷻ لێرەدا وەڵامی ئەو پرسیارە گریمانەیە دەداتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ﴾، ئەوانەی كە كتێبیان پیٚدرابوو نەكەوتنە ڕاجیایی یەوە، نەكەوتنە مشت‌و مڕەوە لەبارەی ئیسلامەوە، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان هەبوو كە ئیسلام ڕاستە، وە قورئان كتێبی خوایە، پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری كۆتایی خوایە، بۆچی؟ ﴿ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ﴾، وشەی (بغي) وەك تەفسیرمان كرد بە مانای دەرچوون‌و سەركەشیی‌و سنوور بەزاندن دیٚ، واتە: بەهۆی سنووربەزاندن‌و سەركێشیی‌و یاخی بوونیانەوە، ئەویش چ شتێك وای لێكردن؟ بەرژەوەندیی دنیایی، چونكە ئەگەر بڕوایان بە موحەممەد ﷺ هێنابا، بە تایبەت زاناكانیان دەبوو وازیان هێنابا لەو هەموو بەرژەوەندییانەی خۆیان، خەڵكێكی زۆر بە ناوونیشان (عنوان)ی زانای ئایینی لە جوولەكەو نەصرانیی یەكان، خزمەتی زاناو پێشەوایەكانیان دەكردو، ڕێزیان دەگرتن‌و

ئەوانیش ئامادە نەبوون دەستبەرداری ئەو هەموو خزمەتو ئیمتیازانە ببن! ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴾، وە هەرکەسێکیش بێبڕوابێ بەرانبەر بە ئایەتەکانی خوا، ئەوە بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە، واتە: فریای هەموویان دەکەوێ لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات، وە هەر کەسێك سزای پڕ بە پێستی خۆی وەربگرێ، ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ کە چۆن وتووێژیان لەگەڵدا بکات: ﴿ فَإِنْ حَاجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ ﴾، ئنجا ئەگەر وتوو ویژو شەڕە قسەیان لەگەڵ تۆدا کرد، تۆ تەنیا بڵێ: منو ئەوانەی کە شوێنم کەوتوون ملکەچین بۆ خوا، واتە: ئەو بەرنامەیەی کە لە خواوە بۆمان هاتووە، ئەو ئایینەی کە کۆتا نوسخەی هیدایەتی خوایەو بەمندا نێرراوە، ئێمە بۆی ملکەچین، ﴿ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ ﴾، وە بەوانەی کە کتێبێکیان پێدرابوو، وە بە نەشارەزایەکانیش، (واتە: ئەوانەی کتێبی خوایان لەژێر دەست دا نەبوو) پێیان بڵێ: ئایا ئێوەش ملکەچ بوون، مسوڵمان بوون؟! ﴿ فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوا ﴾، جا ئەگەر ئەوانیش ملکەچ بوون، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، چونکە لە ڕاستیدا ڕێی ڕاست ئەوەیە کە ئینسان ملکەچ بێ بۆ خوا، جا لەوانەیە بڵێن: ئێمە ملکەچین بۆ خوا، بەڵام بەپێی بەرنامەکانی پێشووی خوا ! لە ڕاستیدا ئەوە پێی ناگوترێ ملکەچیی، کە تۆ بڵێی: دوێنێ بە قسەی خوای پەروەردگارم کردوە، بەڵام ئەمڕۆ بە قسەی ناکەم، ئەو تەوجیهاتەی دوێنێ بۆی ناردووم وەریدەگرم، بەڵام ئەمەی ئەمڕۆی لێ وەرناگرم !! ئەوە پێچەوانەی ملکەچییە، ملکەچیی ئەوەیە، کە شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: ﴿ ... لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ ...﴿٢٨٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئێمە جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانو بڕوا بە هەموویان دێنین، وە بڕوا بە کتێبەکانی خوا دێنین، وە ڕێز لە هەموویان دەگرین ﴿ وَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴾، وە ئەگەر پشتیان هەڵکردو لاملیان

تێكردو ڕوویان وەرگێڕا، تۆ بەس گەیاندنت لەسەرە، دیارە هەم پێغەمبەر ﷺ هەم ئێمەش وەك شوێنكەوتەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لەسەرمانە سەبارەت بە خەڵك و كۆمەڵگاكەمان، ئەوەیە كە پەیامی خوایان پێ بگەیەنین، بە ڕێك و ڕاستیی و ڕوونیی، دوایی خۆیان بەرپرسیارن ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾، بێگومان خوا بەندەكانی دەبینێ، بینەریانەو هەموو ئەحواڵیانی لەبەرچاوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾، بێگومان ئەوانەی، كە بە ئایەتەكانی خوا بێبڕوان، وە پێغەمبەرانی خوا بە ناهەق دەكوژن، وە كەسانێك دەكوژن كە فەرمان بە خەڵكی دەكەن بە دادگەریی، ئەوانە موژدەیان پێبدە بە ئازارێكی بە ئێش، تەماشا بكەن ! پێشێ باسی بێبڕواییان دەكات بەرانبەر بە ئایەتەكانی خوا، دوایی باسی ئەوە دەكات، كە دەستیان بە خوێنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سوور بووە، ئنجا باسی دەست سووربوونیان بە خوێنی كەسانێك كە فەرمان دەكەن بە دادگەریی، دەكات! كەواتە: عەقیدەیە كە پاڵ بە ئینسانەوە دەنێ بۆ شتی چاك یان بۆ شتی خراپ، ئەوانەی كە كوفریان بە ئایەتەكانی خوا كردوە، دوایی دەستیان چۆتە خوێنی پێغەمبەرانیشەوە، وە دەستیان چۆتە خوێنی كەسانێكەوە كە فەرمان دەكەن بە دادگەریی و، فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە دەكەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾، ئا ئەوانە كردەوەكانیان لە دنیاو دواڕۆژدا هەڵوەشاونەوە، وە هیچ یارمەتیدەرێكیشیان نیە، واتە: نە لە دنیادا خێر لە كردەوەكانیان دەبینن، وە نە لە دواڕۆژیشدا، لە دنیادا بەڵێ ئەهلی باطڵ ماوەیەك دەتوانن بگوزەرێنن، بەڵام سەرەنجامیان شوومە، وەك یاسای خوا لە ژیانی ئینساندا، كە لە ئۆممەتەكانی پێش ئۆممەتی پێغەمبەردا ﷺ زۆر بە بەرجەستەیی دەبینرێ، كە هەموویان لایانداوەو دژایەتی پێغەمبەرانیان (علیهم الصلاة والسلام) كردوە، خوای

پەروەردگار لە بەینی بردوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ کۆتا ئۆممەتە، ئەگەر خوای توانادار لە بەینی بردبانایە کەس نەدەما لەسەر زەوی، لەبەر ئەوە خوای کاربەجێ هەڵاواردن (إستثناء)ی خسۆتە سەر ئەو بنچینەو یاسایەی خۆی، کە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ هەرچەندە هەڵەو کەموکووڕییان هەبن، بە تێکرایی نایانفەوتێنێ.

ئۆممەتی موحەممەد ﷺیش دوو بەشە:

١/ ئۆممەتی وەڵامدەرەوە (أمة الإجابة): ئەوانەن کە وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ یان داوەتەوە، کە مسوڵمانانن.

٢/ ئۆممەتی بانگەواز (أمة الدعوة): ئەوانەن کە لەسەر میلاکی پێغەمبەری کۆتایین، کە بریتین لە هەموو بەشەر، لەو کاتەوە کە موحەممەد ﷺ هاتوە، هەموو مرۆڤایەتی بە ئۆممەتی موحەممەد لەقەڵەم دەدرێ، لەو ڕووەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی خۆی ئاراستەی هەموویان کردوە.

جا خوای زاناو شارەزا یاسای خۆی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئۆممەتی پێغەمبەردا ﷺ گۆڕی کە خەڵکەکە بنەبڕ نەکات، وە قەڵاچۆیان نەکات، چونکە ئۆممەتێکی دیکە جێگەی ئەو ئۆممەتە ناگرێتەوە، بەڵام چەندین جۆرە سزای دیکەیان بۆ دەنێرێ لە دنیادا، بۆ ئەوەی کە بگەڕێنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم، واتە: خراپەو ئاشووب لە وشکانیو دەریادا پەیدابوو بە هۆی کردەوەی خەڵکەوە، تاکو سزای هەندێ لەوەی کردیان پێیان بچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە، ئێستا تەماشا بکەن ! بزانن چۆن دنیا لایەکی لافاوە، لایەکی ئاگرە، چەندان نەخۆشییو دەردی وا پەیدابوون، کە لە ڕاستیدا ناوازەن، بە هۆی لادان (إنحرافات)ی خەڵکەوە، کە ئەوە بەشێکە لەو سزایەی کە خوای زاڵی خاوەن تۆڵە داینـاوە، بۆ کەسانێك کە لە شەریعەتەکەی لادەدەن، وە دژی ئایەتەکانی دەوەستنەوە، دیارە سزای دواڕۆژیش لەوە گەورەترە، ئنجا دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ﴾، سەرنجی ئەوانە نادەی، کە بەشێك لە کتێبیان پێدراوە، واتە: بەشێك لە شەریعەتو بەرنامەی خوایان پێدراوە، کە مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانیی یەکانن بە پلەی یەکەم، بانگ دەکرێن بۆ کتێبی خوا تاکو حوکمیان لەبەیندا بکات، کەچی دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن، وە لامل لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەنو ڕازی نابن، کە پێغەمبەری خوا ﷺو کتێبی خوا، بکەنە دادوەری خۆیان، توێژەرەوانی قورئان زۆر شتیان لەوبارەوە باسکردوە، بەڵام ئەسڵەکەی ئەوەیە کە جوولەکەو نەصرانیی یەکان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، وە ئێستاش، بانگ دەکرێن بۆ ئیسلامو بۆ قورئان، بەڵام دیارە کەمێکیان ئیمان دێنن، ئەوانەی کە بە ئینصافن، بەڵام زۆربەیان پشت هەڵدەکەن، وە ڕوو وەردەچەرخێنن، ئنجا ئایا چ شتێك وایان لێ دەکاتو هاندەریانە بۆ ئەوە؟ دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ﴾، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە گوتیان: چەند ڕۆژێکی ژمێردراو نەبێت چەند ڕۆژێکی کەم نەبێت، ئێمە ئاگرمان تووش نابێت، دیارە ئەوە جوولەکەکان گوتوویانە: ئێمە ئەگەر بشچینە دۆزەخ تەنیا حەوت ڕۆژ لە دۆزەخدا دەسووتێین، هەندێکی دیکەیان گوتوویانە: تەنیا چل ڕۆژ، ئەویش ئەو چل ڕۆژەیە کە گوێلکیان پەرست، هەتا مووسا ﷺ لەسەر کێوی طوور هاتەوە ئەلواحی تەوراتی هێنا، دەڵێن: هەرئەوەندە دەسووتێنرێین! کە بێگومان ئەوە شتێکە خۆیان هەڵیانبەستوەو دایانهێناوە، هەڵبەتە نەصرانیی یەکان دەڵێن: ئەوەندەش ناسووتێین! بە حیسابی وان دەڵێن: کە عیسا ﷺ لە خاچدراوە، بۆتە بەلا گێڕەوەو کەفارەتی گوناهی هەموو ئەوانەی بڕوایان بە عیسا ﷺ هێناوە، وەك کوڕی خوا، بە حیسابی ئەوان!! پاکیی بۆ خوا، بۆیە دەڵێن: عیسا کە لە خاچدراوە، ئەوە گوناهی ئێمەی سڕیوەتەوەو هەرکەس نەصرانیی بێتو، خۆی بە شوێنکەوتەی عیسا دابنێ، ئەوە عیسا لەجیاتی گوناهی

ئادەمیش کە لە درەختە قەدەغەکراوەکەی خواردوە، لە خاچدراوەو لە جیاتی هەمووان ئازاری بینیوە، دیارە ئەوە درۆو دەسەلەیەکە، هیچ ئەسڵ و بنچینەیەکی نیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾، ئەوەی کە لە ئایینەکەیاندا هەڵیدەبەستن، ئەو درۆو دەلەسەیە کە سازی دەکەن، فریوی دان، دیارە ئێستاش خەڵکێکی زۆری نەصرانیی گوناح دەکات، قەتل دەکات، دزیی دەکات، خراپە دەکات، پێی وایە کە عیسا گوناهەکانی هەموو لێ دەسڕێتەوە، هەروەها جوولەکەکانیش بەتەمای ئەوەن کە حەوت ڕۆژ، یان چل ڕۆژ لە دۆزەخ دا بمێننەوە، ئەگەر گوناهبارین و دوایی دەربازیان دەبێ !! بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾، ئەوەی کە لە ئایینەکەیاندا هەڵیانبەستوەو سازیان کردوە، لە درۆو دەلەسەو ئەفسانە فریوی دان، جا دیارە ئەوە هەر تەنیا ئەوان وانین ئێمەی مسوڵمانانیش دەگرێتەوە، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ئاماژەی پێ دەکەین، خوا ﷻ لە وەڵامی ئەوەیاندا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ﴾، چی دەکەن کاتێك کۆمان کردنەوە بۆ ڕۆژێك کە هیچ گومانی تێدانیە هەر دێ، (واتە: ڕۆژی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت) چی دەکەن؟ ئایا ئەو کاتە ئەو دۆرو دەلەسانە دادیان دەدا؟! ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾، هەر کەسە پڕ بە پێستی ئەوە کە کردوویەتی، سزای دەدرێتەوە، یاخود پاداشتی دەدرێتەوە، ئەگەر خراپەبێ، سزا، وە ئەگەر چاکەبێ، پاداشت ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾، ستەمیشیان لێناکرێ، زیاد لە خۆیان سزا نادرێن، بەڵکو بە قەدەر خۆیان سزا دەدرێن بە ئەندازەی خراپەکانیان، بەڵام زیاد لە خۆیان پاداشتیان دەدرێتەوە، چونکە خوا لەگەڵ خراپەکاراندا بە داد (عدل)و، لەگەڵ چاکەکاراندا بە بەخشین (فضل) مامەڵە دەکات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾، واتە: ئایینو بەرنامە لای خوا تەنیا ئیسلامە، یانی: خوا بێجگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بە ڕاستو ڕەوا نازانێ، جا وشەی (دین)، کە بە مانای بەرنامەی ژیان هاتوە، هەرچەندە مانای ملکەچیی‌و سزاو پاداشتیشی هەیە، بەلاّم وشەی (دین) لە بەکارهێنانی قورئاندا بە زۆریی بەمانای بەرنامەیە، جا چ بەرنامەی هەق کە ئیسلامە، چ بەرنامەی ناهەق، کە وەك پێشتر گوتم: ئەگەر بەمانای ئیسلام بەکارهاتبێ، ئەوە حەتمەن نیشانەیەکی لەگەڵدایە وەك ئەلیفو لام (أل)ی تەعریف، یان وەك وەسفێك وەك: (دین الحق)، (دیناً قَیماً)، یان پاڵدراوەتە لای خوای پەروەردگار (دینِ الله)، (ئیسلام)یش بەمانای ملکەچییە لە ئەسڵی زماندا، بەلاّم دوایی کراوەتە ناو بۆ کۆتا بەرنامەی خوا، وەك (صَلاة) کە لە ئەسڵدا بەمانای دووعاو پاڕانەوەیە، بەلاّم لە قورئاندا کە وشەی (صَلاة) بەکاردێ، چ مانایەك دێتە زەینی ئێمەوە؟ دیارە ئەو خواپەرستییە تایبەتییە کە بە (اللّهُ أَكبَر) دەست پێدەکاتو ڕکووعو سەجدەی تێدایەو تەحییاتی تێدایە، وە دوایی بە سەلامدانەوە کۆتایی پێدێ، هەروەها وشەی (زکاة) بە مانای پاکبوونەوەو گەشەکردن دێ، بەلاّم وشەی (زکاة) کە ئێستا لە قورئان دا بەکاردێت، وەك زاراوەیەکی شەرعیی، بۆ ئەو عیبادەتە ماڵییە بەکاردێ کە دەیزانین، هەروەها (صوم) بە مانای بێدەنگیی دێت لە ئەسڵی زمانی عەرەبی دا، بەلاّم دوایی ئیسلام ئەو وشەیەی بەکارهێناوە بۆ ئەو عیبادەتەی کە ڕۆژووگرتنە، وە وشەی (حەج) بەمانای مەبەست (قصد) دێ، بەلاّم دوایی ئیسلام بەکاری هێناوە بۆ خواپەرستییەکی تایبەتو بۆ مەبەستی سەردانیکردنی ماڵی خواو ئەو خواپەرستییانە کە تێیدا جێبەجێ دەکرێن.

**مەسـەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ ﴾، بۆمان ڕووندەکاتـەوە کـە ئەوانـەی خـاوەن کتـێبن بـەهۆی لـە ڕێـی ڕاسـت لادانو بـەهۆی مەبەسـتی خراپەوە، بڕوایان بـە ئیـسلام نەهێنـا، واتـە: مەبەسـتو نیـازیان خـراپ بـوو و ئامانجیـان خـراپ بـوو، بۆیـە بڕوایان بە ئیسلام نەهێنـا، نـەك قەناعـەتیان پـێ نەبووبـێ، ئێـستاش وایـە زۆر لـەو طـاغـووتو فیـرعەونو دەسـتەلاتدارانە کـە دژایـەتی ئیـسلام دەکـەن، یاخـود ئەگـەر بـە ڕواڵـەتیش وا خۆیـان پیـشان بـدەن کـە مـسوڵمانن، بـەڵام پێـوەی پابەند نین، لەڕاستیدا لەبەر ئەوەیە دەزانـن کـە ئەگـەر بێـتو ئیـسلام دەستەڵاتی هەبێ، ڕێگای خراپەیان لێدەگرێو ئـەو ئیمتیـازە ناشـەرعییانەی کـە وەدەستیان هێنـاون، لێیان دەستێنێتەوە، جا ئـەوە یەکێکە لە هۆکارەکانی بـڕوا نەهێنـان بە دیـن، وە هۆیەکی دیکەشـی ئەوەیـە کـە خـوای پـەروەردگار باسـی کـــردووە دەفـــەرموێ: ﴿ ... فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ... ﴿١٤﴾ ﴾ المائدة، بریتیـە لـەوەی کـە پەیوەندی بـە خـراپ تێگەیشتنەوە هەیە، یاخیی بـوون (بغي) پەیوەنـدی بـە دڵو دەروونـەوە هەیـە، بـەڵام لەبیـرچوونو خـراپ تێگەیـشتن، پەیوەنـدی بـە عەقڵەوە هەیە، کـەواتە: ئینسـان بە دوو هۆکـار لە ئیسـلام دوور دەکەوێتەوە:

١- یـان بـەهۆی خـراپ لـێ تێگەیـشتنی، یـان لـێ تێنەگەیـشتنی، وەك زۆر لـە نەصرانیی یەکانو زۆر لە خەڵـکی دنیـا کـە لـە ئیـسلام حـاڵی نـەبوون، بەڵکـو هەندێکیان لینگاو قـووچ لـێـی حـاڵی بوونە، بە پـێچەوانەوە.

٢- یـان بـەهۆی ئامـانجو مەبەسـتی خـراپ، کـە بریتیـە لـەوەی مرۆڤـ ئامـانجو مەبەستێکی خراپی هـەیەو دەیـەوێ بـە خراپەو تـاوان ژیـان بەسـەر بـەرێ، بۆیـە خـۆی پابەنـد ناکـات بـە ئیـسلامەوە، کـە تاکـە ئـایین (دیـن)ی ڕاسـتو نەشێوێنراوی خوایە.

**مەسەلەی سێیەم**: كە دەفەرمویٚ: ﴿ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ ﴾، ئەگەر وتوویٚژیان لەگەڵدا كردی، بڵێ: من ڕووی خۆم بە خوا سپاردووەو خۆم بۆ خوا ملكەچ كردوە، لەگەڵ ئەوانەی كە شوێنم كەوتوون، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئایا ئەوە وەڵامە یاخود واز لێ هێنانە لە موناقەشە؟! بەڵام لە ڕاستی دا دەتوانین بڵێین: ئەوە وەڵامە، چونكە دەفەرمویٚ: ئەوە من ملكەچ بووم بۆ خوا، واتە: بۆ دینی خوا، بۆ كۆتا بەرنامەی خوا، كۆتا شەریعەتی خوا، بۆی ملكەچ بووم، كەواتە: ئەوە وەڵامە، یانی: ئەگەر ئێوەش بڕوا دێنن، فەرموون با بۆتان باس بكەم، ئەگەر بڕواش ناهێنن، خۆ بە تۆبزیی ئیسلامیان لەسەر فەرز ناكرێ ! چونكە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ...(٢٥٦) ﴾ البقرة، واتە: تۆبزیی كردن نیە لە دینداریيدا.

**مەسەلەی چوارەم**: پێشتریش ئاماژەمان پێدا، كە دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِالْقِسْطِ مِنَ النَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، ئەوە دەگەیەنیٚ، كە هەركەسێك كوفری بە ئایەتەكانی خوا كرد، كوفر ڕێگای گوناهی بۆ ئاچووغو تەخت دەكات، تەنانەت ئەگەر كوشتنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە كوشتنی فەرمانكەران بە دادگەرییش بیٚ ! كەواتە: هەر عەقیدەیە كە پاڵ بە ئینسانەوە دەنیٚ، جا ئەگەر عەقیدەی باشی هەبیٚ، ئەوە بەرەو چاكە پاڵی پێوە دەنیٚ، وە ئەگەر فیكرەو عەقیدەیەكی خراپی لەدڵدا هەبیٚ، ئەوە بەرەو خراپە پاڵی پێوە دەنیٚ، بناغەی جووڵانی ئینسان بەرەو خێرو شەڕ لێرەوەیە، لە عەقڵو دڵەوەیە، هەر چییەك لێرەدا (ئاماژە كردن بۆ سەرو سینە) جێگیر بوو جەستەش بەپێی ئەوە حەرەكە دەكات، بە باری خێرو شەڕدا.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ ﴾، ئەوە یاسایەكی خوایە، كە هەر كەسێك دژایەتی ئایەتەكانی خوا بكاتو دژایەتی شەریعەتو بەرنامەی خوا بكات، نە ئاكامی دنیایی دەبێ، نە ئاكامی دوارِۆژی دەبێ، كەواتە: ئێمە هەڵنەخەڵەتێین بەوەی كە ئێستا دەبینین ئەهلی باطڵ، كە ئێستا لە ئەمریكاو زلهێزاندا بەرجەستەیە، ماوەیەك كوێخایەتی دنیایان بە دەستەوەیە، لە ڕاستی دا لە ئاكامی دنیاو دوارِۆژدا تووشی ڕەنج بەخەساریی‌و ماڵ وێرانیی دەبن.

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴾، وەك (الطَّبَرِي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا هێناویەتی، توێژەرەوان لەبارەی ئەم ئایەتە چەند شتێكیان گێڕاوەتەوەو چەند هۆیەكیان باسكردوە:

هەندێك گوتوویانە: ژنێك‌و پیاوێكی جوولەكە زینایان كردبوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی حوكمیان لە بەیندا بكات، دوای ئەوەی كە حوكمی شەرعیی پێ ڕاگەیاندن پشتیان تێكردو ڕوویان وەرچەرخاند.

هەندێكی دیكە گوتوویانە: نەخێر، كێشەیەكی دی هەبوو هاتن دادوەرییان لەنێواندا بكات، كاتێك كە دادوەرییەكەی پێ ڕاگەیاندن، ڕازی نەبوون.

بەڵام (الطَّبَرِي) دەڵێ: هەرچۆن بێت نێوەرِۆكی هەڵوێستەكەیان ئەوەیە، كاتێك بانگكراون بۆ ئەوەی كە شەریعەت دادوەرییان لە نێواندا بكات، پێوەی پابەند نەبوونە، دیارە هەر ئەویش ڕاستە چونكە هۆكاری هاتنە خوارەوە نابێتە هۆی سنووردار كردن‌و تایبەتكردنی مانای ئایەتەكان.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾، وەك باسمان كرد، كە جوولەكەكان وە نەصرانیی یەكانیش بەهۆی هەندێك قسەو قاڵ‌و شتی ئەفسانەیی یەوە، كە خۆیان هەڵیان بەستوون، خۆیان فریوداوە، جوولەكەكان دەڵێن: ئێمە تەنیا حەوت ڕۆژ یان چل ڕۆژ لە ئاگردا دەمێنینەوە،

ئەگەر گوناهیش بکەین، وە نەصرانیی یەکان دەڵێن: عیسا بۆتە بەلا گێڕەوەمان! کە لە ڕاستیدا ئەو دەردو نەخۆشییە بۆ نێو مسوڵمانانیش هاتوە، هەندێك لە مسوڵمانانیش هەن ئەوەی سەیدو شێخە، بەتەمای ئەوە لێگەڕاوەو دەڵێ: من نزیکی پێغەمبەرم ﷺ وەچەی پێغەمبەرم ﷺ! وە هەندێك مەلا بەتەمای مەلایەتیی تێکەوتوون ! وە جاری وایە ئەوەی کە ئیسلامییە دەڵێ: من چونکە ناوم ئیسلامییە، تازە هەر چۆن بێ لە خەڵك هەر چاکترم! وە هەروەها کۆمەڵێك بیرۆکەی وا، کە لە ڕاستی دا هەمووی شتی پووچو شتی ئەفسانەییین، بەڵکو بناغەی ئەوەیە: ﴿وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾، هەر کەسە بەپێی ئەوەی کردوویەتی سزاو پاداشت دەدرێتەوە، کەواتە: دەبێ وریابین، خۆمان بەو شتانە فریو نەدەین، فلان کەس کوڕی فلان کەسە، یان فلان کەس بە ڕەچەڵەك و نەسەب دەچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، یان فلان کەس لە فلان بنەماڵەیە، یان فلان کەس لە فلان وەجاغەیە یان قەومەیە، جاری وایە عەرەب هەر بە عەرەبایەتیی خۆیان فریو داوە، یان فلان کەس لەبەرئەوەی سەر بە فلان شێخەیە، فلان شێخی تەریقەت، یان فلان شێخی سەلەفیی، یان فلان لایەنی ئیسلامیی، بەڵکو ئەسڵ ئەوەیە خۆت چۆنی؟ نەك ئەو ئینتیماو شتە ڕواڵەتییانە، ئەوانە هیچیان شەفاعەت بۆ کەس ناکەن و دادی هیچ کەس نادەن، هەڵبەتە کەمو زۆر لەو دەردو نەخۆشییانەی نێو جوولەکەو نەصرانیی یەکانەوە، دێنە نێو مسوڵمانانیشەوە، لە کاتێکدا کە مسوڵمانان لە قورئان دوور دەکەونەوە، کۆتایی ئەم مەسەلەیەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: {وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ} رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٢٦٩٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)، وَالدَّارَمِي برقم: (٣٤٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ) واتە: هەر کەسێك کردەوەکەی دوای بخات، ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەكانی: (٢٦ تاكو ٣٢) دەگرێتە خۆی، واتە: حەوت ئایەت لەم دەرسەدا دەتوێژینەوە، لەم حەوت ئایەتەدا خوای پەروەردگار باڵا دەستیی خۆی لە پێدانو ستاندنەوەی دەستەڵاتو جێگۆڕكەی شەوو ڕۆژ، وە دیاردەی مەرگو ژیان، وە ڕۆزی پێدانی بەندەكاندا دەخاتەڕوو، پاشان باسی قەدەغەكردنی دۆستایەتی مسوڵمانان بۆ نامسوڵمانان دەخرێتە ڕوو، كە هەركەسێك مەگەر لەكاتی ناچارییدا، ئەگەرنا نامسوڵمانان بە دۆست بگرێ، پەیوەندی بە خوای بێ هاوەڵەوە نامێنێ، وە پاشان هەڕەشە دەكات لە هەركەسێك كە ژێر بەژێر پەیوەندی هەبێت لەگەڵ نامسوڵمانان دا، وە باسی ئەوە دەكات كە لە ڕۆژی دوایی دا كردەوەكانی بە ئامادەكراوی دێنەوە بەرچاوی، وە دوایش باسی گرنگی شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكرێ، وە مەترسیی لادان لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ كە سەردەكێشێ بۆ كوفر، بە ڕوونیی دەخرێتە ڕوو.

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ

ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلۡ إِن تُخۡفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمۡ أَوۡ تُبۡدُوهُ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٩﴾ يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗاۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٣٠﴾ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣١﴾ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەكـان

((بڵێ: ئەی خوایە! خاوەنی موڵكو دەسـتەڵات، هەركەسێك بتەوێ دەسـتەڵاتی پـێ دەدەیو هەركەسێكیشت بوێ دەسـتەڵاتی لـێ دەسـتێنی، وە هەركەسێكت بوێ زاڵی دەكەیو، هەركەسێكیشت بوێ زەبوونی دەكەی، چاكە هەر بەدەست تۆیە، بێگومان تۆ بە هەموو شتێك توانـاداری ﴿٢٦﴾ شەوگار دەخەیە نێو ڕۆژگارو ڕۆژگار دەخەیە نێو شەوگار، وە زینـدوو لـە مـردوو دەردێنـیو مـردوو لـە زینـدوو دەردێنـی، وە هەركەسێكت بـوێ بەبـێ ژمـاردن ڕۆزی دەدەیـە ﴿٢٧﴾ بـا بـڕواداران لەجیـاتی بـڕواداران كـافران بـە دۆست نـەگرن، هەركەسـێكیش وابكـات مەگــەر لەبـەر ناچـاریی‌و خۆتانیـان لـێ بپارێزن، ئەگـەرنا هـیچ پەیوەنـدی بـە خـواوە نامێنێ، وە خوا سەبارەت بە (سزای) خۆی دەتانتـرسێنێ، وە سەرەنجـامیش هـەر بـۆ لای خـوایە ﴿٢٨﴾ بڵـێ: ئەگەر ئـەوەی لـە سینەكانتان دایـە پـەنهانی بكـەن یـان ئاشـكرای بكـەن، خـوا هـەر دەیزانـێ، وە هەرچـی لـە ئاسـمانەكانو زەویـش دایـە دەیزانێ، وە خـوا لەسـەر هەموو شتێك بـە توانایـە ﴿٢٩﴾ ئەو ڕۆژەی كە هەركەسـە چـی كـردوە بـە ئامـادەیی دەیبینێتـەوە، وە هـەر خراپەیـەك كـە كردوویـەتی حـەز دەكات لە نێوان خۆیو كردەوەكەیدا ماوەیەكی دوور ببووایـە، وە خـوا لـە خۆیتـان دەترسـێنێ، وە خــوا بــە بەنــدەكانی میهرەبانــە ﴿٣٠﴾ بڵــێ: ئەگـەر ئێـوە خــواتان

خۆشدەوێ شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن لە گوناهەکانیشتان دەتانبووری، وە خوا لێبوردەی بە بەزەییە (٣١) بڵێ: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، جا ئەگەر لایاندا، ئەوا بێگومان خوا کافرانی خۆشناوێن (٣٢)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ): (مَالِک) واتە: خاوەن، (مُلْک) بەمانای دەستەڵات دێت، وە بەمانای هەرشتێك دێت کە بخرێتە ژێر ڕکێفەوە، (الْمُلْكُ: هُوَ التَّصرفُ بالأمْرِ والنَّهْي في الْجُمهُورِ وذَلِكَ يَخْتَصُّ بسيَاسَةِ النَاطِقِينَ، ولِذَلِكَ يُقَالُ: مَلِكُ الناس ولاَ يُقَالُ: مَلِكُ الأشيَاءِ)، واتە: (مُلْک) بریتیە لە تەصەڕڕوف کردن بە فەرمانکردنو ڕێ لێگرتن لەنێو خەڵکدا، ئەوەش تایبەتە بە سەرپەرشتیکردنی خاوەن عەقڵان، بۆیە دەگوترێ: (مَلِكُ النَاس)، واتە: پادشاو حوکمڕانی خەڵك، بەڵام ناگوترێ: (مَلِكُ الأشيَاء) بەڵکو دەگوترێ: (مَالِكُ الأشيَاء) واتە: خاوەن شتەکان.

(وَتَنزِعُ): واتە: دادەڕنیو دەستێنی، (نَزَعَ الشَّيءَ: جَذَبَهُ مِنْ مَقَرِّهِ كَنَزْعِ القَوْسِ عَنْ كَبِدِهِ، وَنَزَعَ فُلانٌ كَذَا، أي: سَلَبَ)، دەگوترێ: (نَزَعَ الشَّيءَ) واتە: شتەکەی لە ڕیشەوە ڕاکێشا، وەك: چۆن تیرێك کە لە کەوان دەردەچێ (وَنَزَعَ فُلانٌ كَذَا، أي: سَلَبَ) واتە: فلان کەس فلانە شتەی ستاندو وەریگرت.

(تُولِجُ): واتە: دەیخەیە نێو، (الوُلُوج: الدُّخولُ في مَضِيقٍ وغيره) (ولوج) بریتیە لەوەی شتێك بخەیە نێو شتێك کە بەزەحمەت بچێتە نێوی ﴿ تُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ ﴾، واتە: (زِيادة اللَّيلِ في النَّهارِ وَزِيادَةِ النَّهارِ في اللَّيلِ) شەوگار دەخەیە سەر ڕۆژگارو ڕۆژگار دەخەیە سەر شەوگار، ئەوکاتانەی کە شەوو ڕۆژ یەکسانن، هەریەکەی دوازدە سەعاتن، بەڵام دوایی جاری وایە شەوگار درێژ دەبێو هەتا شازدە سەعات دەڕوا، بەڵکو لە

سەرووی دنیا هەتا زیاتریش دەڕوا، وە جاری وایە ڕۆژگار لەسەر حیسابی شەوگار درێژ دەبێ.

(تُقَىٰةً ): واتە: خۆپاراستن، (الوِقَايَةُ: حِفْظُ الشَيءِ مِمَّا يُؤْذِيهِ وَيضُرُّهُ)، (وِقَايَةٌ) بریتیە لە پاراستنی شتێك لەوەی كە زیانی پێ بگەیەنێ، یاخود ئازاری بدات.

(وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ): واتە: خوای دادگەر لە خۆیتان دەترسێنێ و وریاتان دەكاتەوە (الْحَذر: احترَازٌ مِنْ مُخِيف)، (حَذر) بریتیە لە، وریابوون لە شتێكی ترسێنەر.

(مُّحۡضَرٗا ): واتە: ئامادە، (أي: مشَاهَداً معَايَناً) یانی: شتێك كە بینراوبێ و ئامادەبێ.

(أَمَدَۢا بَعِيدٗا ): واتە: ماوەیەكی دوور، یاخود مەسافەیەكی دوور، (الأَمَدُ: مُدَّةٌ لَهَا حَدٌّ مَجْهُول إذا أُطلِقَ)، (أَمَدُ) واتە: ماوەیەك كە سنوورێكی نەزانراوی هەبێت، لەكاتێك دا كە بەڕەهایی دەگوترێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی، كە دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦ ﴾، دوو گێڕانەوە هەنو باسكراون:

یەكەم: (قَالَ قَتَادَة: بَلَغَني أنَّ النَّبيَّ ﷺ سَأَلَ الله أنْ يُعْطي أُمَّتَهُ مُلْكَ فَارس فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَة)[١]، واتە: قەتادە دەڵێ: پێمگەیشتوە پێغەمبەر ﷺ داوای لە خوا كردو پاڕایەوە كە دەستەڵاتی فارسی (وڵاتی فارس) بە

١) الجامع لأحكام القرآن، للقرطبي، ج: (٤)، ص: (٥٠).

ئۆممەتەکەی بدات، (واتە: لە دوای خۆی) خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە.

دووەم: ((لَمَّا افتَتَحَ رَسولُ اللهِ ﷺ مكَّةَ وَوَعَد أُمَّتَهُ مُلْكَ فَارِسَ والرُّوم، قَالَ المنَافِقُون واليَهُود: هَيْهَات هَيْهَات! مِنْ أيْنَ لِمُحَمَّدٍ مُلْكُ فَارِسَ والرُّوم، هُم أَعَزُّ وأمْنَعُ مِن ذَلِكَ أَلَمْ يَكْفِ مُحَمَّداً مَكَّة والمَدينَةَ حَتَّى طَمِعَ فِي مُلْكَ فَارِسَ والرُّوم؟ فَأَنْزَلَ اللهُ هَـذِهِ الآيَة))[1]، واتە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ مەککەی ئازاد کرد وە وەعدی بە ئۆممەتەکەیدا، وەك موژدەیەك کە کاتێك دێت وڵاتی فارسو ڕۆمیش دەکەوێتە ژێر دەستەڵاتی ئیسلام، مونافیقانو جوولەکەکان گوتیان: ئەمە شتێکی زۆر دوورە، موحەممەد چۆن دەستەڵاتی فارسو ڕۆمی دەکەوێتە دەست، ئەوان زۆر لەوە زاڵترنو بە تواناترن، ئایا (مەککە)و (مەدینە) بەس نیە بۆ موحەممەد تەماعیشی کردوە بۆ موڵکی فارسو ڕۆم!! خوای ئەم ئایەتەی ناردە خوار، بەلام ئەوەی کە مونافیقو جوولەکەکان بە دووریان دەزانی خوای زاڵ زۆر زیاتریشی بە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ بەخشی.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بە پلەی یەکەم بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ وە لەدوای ئەویش بە هەرکەسێك کە قورئان دەخوێنێت، وە بە شوێن پێی پێغەمبەردا ﷺ هەنگاو دەنێ، چونکە هەموو ئەو دواندن (خِطاب)انەی کە ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ کراون، لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ ئاراستەی ئۆممەتەکەیشی کراون، مەگەر بەڵگەو نیشانەیەکی تایبەتکەر تایبەت بن بە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە لێرەدا هیچ نیشانەیەکی تایبەتکەر نیە، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ ﴾، بڵێ: خوایە! خاوەنی دەستەڵات ﴿تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ

١) الجامع لأحكام القرآن، للقرطبي، ج: (٤)، ص: (٤٩).

مِمَّن تَشَآءُ ﴾، دەسـتەڵات بـە هەرکەسـێك دەدەی کـە بتـەوێ، وە دەسـتەڵات لـە هەرکەسـێك وەردەگریـەوە کـە بتـەوێ، ئەوکاتـە دیـارە مـسوڵمانان کـەم دەسـتەڵات بوون، ئەوە ئاماژەیـە بـەوە، کـە مـسوڵمانانی کـەم دەسـتەڵات، خـوای خـاوەن موڵـك ئەگەر ئیـرادەی کـرد دەسـتەڵاتیان دەداتـێ، وە فـارس‌و ڕۆمـی خـاوەن دەسـتەڵات، کـە لـە جێگـای ولاتـانی ڕۆژهـەڵات‌و ڕۆژئـاوای ئێـستای جیهـان بـوون‌و لـە جێـگای ولاتـانی سـەرمایەداریی‌و سۆسیالیزمیی ئێستا بـوون، ئەوانـەی دەسـتەڵاتیان هـەبوو لای خـوای بالادەسـت ئاسـان بـوو، کـە دەسـتەڵاتیان لـێ وەربگرێتـەوە ﴿ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ﴾، وە هەرکەسێك بتەوێ زاڵـی دەکـەی‌و دەیکـەی بـە خـاوەنی بالادەسـتیی‌و عیـززەت، وە هەرکەسـێکیش بتـەوێ زەبـوونی دەکـەی‌و کـەم دەسـتی دەکەی ﴿ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ﴾، چاکە هـەر بـە دەست تۆیـە، هەڵبـەتـە خراپـەش هـەر بـە دەست خوایە، یانی: بەبێ ئیـرادەی خوا خراپەش پەیدانابـێ‌و خـوا بەدیهـێنەری هـەموو شتێکە، بەڵام وەك لە فەرموودەیەکی درێژدا پێغـەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: {الْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٧١)، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، واتـە: چاکـە هـەمووی لـە دەسـتی تـۆ دایـە (ئـەی خـوایە)، بەڵام خراپە پاڵ نادرێتـە لای تۆ، چونکە خوا ﷻ تـەنیا فـەرمانی بـە خێـرو چاکە کـردوە، وە خراپـەی پـێ خـۆش نیـە، بـەڵام بـە دڵنیـایی خراپـەش بەبـێ ئیـرادەو ویستی خـوا نابێت، هەرچەندە لە خراپـەش ڕازی نیـە، بۆیـە خـوا ڕقـی لـە کوفرە، کوفـر خـراپەیە، بـەڵام ئایـا هـیچ کـەس بەبـێ ویـستی خـوا دەتوانـێ کوفـر هەڵبژێـرێ ؟ بێگومان نەخێر، بۆیە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ ... وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ...﴿٧﴾ ﴾الزمـر، واتـە: خـوا ڕازی نیـە، کـە بەندەکانی کـافربن، بـەڵام ئەگـەر سـوپاسی خـوا بکـەن‌و ئیمان بهێـنن لێتـان ڕازی دەبـێ‌و بۆتان پەسند دەکات، کەواتـە: مـەرج نیـە هـەموو ئـەو شـتانەی، کـە لـە ژێـر ئیـرادەو ویستی خـوان، ڕەزامەنـدیی خـوایان لەسـەربـێ، خـوای پـەروەردگار تـەنیا ڕەزامەنـدیی لەسـەر شـتی چاکە، بـەڵام هـیچ شـتێك بەبـێ ویـستی خـوا نابـێ،

ویستی خوا وەك ئاسمان وایە، ئینسان بەهەر لایەك دا بڕوا هەر لەبن سێبەری ئاسمان دایە، ﴿إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، بێگومان تۆ لەسەر هەموو شتێك بە توانای، ئنجا دوای ئەوەی لە عالەمی بەشەردا باسی دەستەڵاتی خوا کرا، کە خوا هەرکەسێك بیەوێ بالادەستی دەکات، وە هەرکەسێ بیەوێ دەستەڵاتی لێ دەستێنێتەوە، هەرکەسێ بیەوێ زاڵی دەکاتو هەرکەسێ بیەوێ زەبوونیی دەکاتو تێکی دەشکێنێ، ئنجا دێتە نێو دنیای غەیری بەشەر، دنیای فراوانتر لە بەشەر، شەوگارو ڕۆژگار هێنان، وە کورتو درێژی پێکردنیانو جێگۆڕکێ پێکردنیان، وە مردووو زیندوو لەیەکدی دەرهێنانو دەفەرموێ: ﴿تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ﴾، شەوگار دەخەیە نێو ڕۆژگار، واتە: لە شەوێ کەم دەکەی لە ڕۆژێ زیاد دەکەیو ڕۆژگار زیاد دەبێو، لەسەر حیسابی شەوگار درێژ دەبێ ﴿وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ﴾، وە ڕۆژیش دەخەیە نێو شەو، واتە: ڕۆژ کورت دەبێو شەو درێژ دەبێ، ﴿وَتُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ﴾، زیندوو لە مردوو دەردێنی، وە مردوو لە زیندوو دەردێنی، دەرهێنانی زیندوو لە مردوو وەك: گوڵە گەنمو گوڵە مەرزەو گوڵە جۆ، کە لە تۆیەکی بێژیان دەردێن هەر بە فەرمانی خوا، وە هەروەها شتی دیکە، وە هەندێك لە زانایان ئەوەیان وا تەفسیر کردوە، کە ئینسانی مسوڵمان لە ئینسانی کافر پەیدادەبێ یانی: بابو دایکێك کافرن، منداڵێکی صالحیان دەبێ، کوڕە یان کچە، وە بە پێچەوانەشەوە خوا مردوو لە زیندوو دەردێنێ، ئێمە چەندان شتی زیندوو دەبینین، کە لە شتی مردوو دێنە دەرێ، بۆ وێنە: خانەی مردوو لە جەستەی زیندوو جیادەبنەوە یاخود لە ڕووی مەعنەوییەوە ئینسانی خراپ لە ئینسانی صالحو چاك پەیدادەبێ، یان ئینسانی بێ ئیمان لە ئینسانی بە ئیمان پەیدادەبێ، وەك: کوڕەکەی (نووح) ﷺ ﴿وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾، وە هەرکەسێك بتەوێ بەبێ بۆ ژماردن ڕۆزی پێ دەدەی ﴿بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾، یانی: بۆی ناژمێری، چونکە ژماردنی شت نیشانەی کەمییەو، نەژماردنی شت نیشانەی زۆرییەتی،

واتــە: ڕزق‌و ڕۆزی زۆر دەدەی بــە هەرکەسـێك کــە بتــەوێ، کــە لــە ژمـارە نەیــەت، هەڵبەتە خـوای پەروەردگار ئەوانـە هەموو بەپـێی ئـەو یاسایانە دەکات کە خـوای داینـاون، شەو کە درێژ دەبێ لەسەر حیسابی ڕۆژ، ڕۆژ درێژ دەبــێ لەسـەر حیـسابی شـەو، زینـدوو کـە لـە مـردوو پەیدادەبـێ، وە مـردوو کـە لـە زینـدوو پەیدادەبــێ، کەسێك ڕزقی فراوان دەبێ یان بە پـێچەوانەوە، کەسێك ڕزقـی تەسـك دەبــێ، ئـەوە هـەمووی هۆکاری خــوای هــەیە، بـەڵام لـە پـشت هــۆکارەکانەوە خواسـتو ویـستی خــوا هــەیە، کـە لێرەشدا مەبەسـتم ئەوەیــە کـە ئێمــە لـە ویـستی خــوا غـافــڵ نەبیـن، ئەگەرنا خـوا ﷻ لە میانی یاساکاندا ئیـرادەکەی جێبەجـێ (تنفیـذ) دەبــێ، هەڵبەتە هەندێ جار بەبــێ بـوونی هۆکـارەکـان، خــوای پەروەردگــار هــەر شــتێکی بوێ ئەنجامی دەدا، یاخود چەند هۆکارێکی پەنهـان‌و چـەند هۆکـارێکـی نائاسـایی بــۆ دەرەخــسێنێ، وەك دوایــی باســی دەکــەین، کــە چــۆن عیـسا ﷺ لــە مەریــەم پەیدادەبــێ، بەبــێ ئــەوەی کــە بــابی هــەبێ، وە یــەحیا لــە زەکــەرییاو لــە دایکــی پەیدادەبــێ، لـە حاڵێکـدا، کـە دایکـی نـەزۆك بـووەو بابیـشی کەوتۆتـە تەمەنێکــی پیــریی‌و زۆر بەســاڵ دا چــووە، ئنجــا دێتــە ســەر مەســەلەیەکی زۆر گرنــگ، کــە بریتیە لـە دۆستایەتیکردنی مـسوڵمانانی لەگـەڵ کافرانـداو دەفـەرموێ: ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، بــابڕواداران بێبــڕوایان بــە دۆســت نــەگرن لــەجیاتی بــڕواداران، مــسوڵمان نابــێ دۆسـتایەتیی ئینـسانی کـافر بکـات ﴿ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ ﴾، هەر کەسێ وابکات، هـیچ پەیوەنـدی بـە خــواوە نیـە، پەیوەنـدی بـە ئیمـان، بـە دۆسـتایەتی خــواوە نیـە، پەیوەنـدی بـە ئایینی خـواوە نیە، ئەوانە هەمووی دەگرێتەوە، تەنیا یەك حاڵەت هەڵاوێردراوە کە ئینسانی مسوڵمان بـۆی هەیـە بـە ڕواڵـەت بـۆ خۆپاراسـتن جۆرێك لـە موجامەلـەو جۆرێــك لــە دۆســتایەتیی ڕواڵــەتیی نامــسوڵمانان بکــات، لــە کــاتی ناچــاریی‌و بێدەستەڵاتییــــدا ﴿ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةً ﴾، مەگــــەر وەك خۆپاراســــتن خۆتانیــان لــێ بپــارێزن لــە (کافرەکــان) بــە شـێوەیەکی ڕووکەشـیی‌و ڕواڵــەتیی

دۆستایەتییان بکەن، نەك لە دڵەوە بۆ ئەوەی کە خۆتان، واتە: گیانی خۆتان سەلامەت بکەن، یاخود ماڵو سامانی خۆتان، لەسەر ڕای هەندێکی دیکە لە زانایان.

﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ﴾، بەڵام خوا لە خۆی (واتە: لە سزای خۆی) دەتانترسێنێ وریاتان دەکاتەوە ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾، گەڕانەوەش بۆ لای خوایە، واتە: وریابن لە ئەندازەی پێویست تێنەپەڕێنن، لە مامەڵەتان لەگەڵ ئەهلی کوفردا، وە مەگەر زۆر ناچاربن ئەگەرنا بە ڕواڵەتیش دۆستایەتییان مەکەن ﴿قُلْ﴾، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! یاخود هەرکەسێ، کە لە شوێنی پێغەمبەرە ﷺ، یان ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێتەوە، بڵێ: ﴿إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ﴾، ئەوەی کە لە سینەکانتان دا هەیە، پەنهانی بکەن یاخود ئاشکرای بکەن، خوا هەر دەیزانێ، خوای زاناو شارەزا دەزانێ چی لە دڵی خەڵکدا هەیە، چ خەتەرەیەك بە دڵیان دادێ، ئاشکرای بکەن لە ڕێی دەربڕینو کردەوەکانەوە، یاخود کەس نەیزانێو پەنهانی بکەن لە سینەیان دا، هەر دەیزانێ، واتە: ئەگەر لە دڵەوە خۆشەویستیتان هەیە بۆ ئەهلی کوفر، ئەوە خوا پێی دەزانێ، کە دیارە ئەوە کوفرە، وە ئەگەر دەریشیبڕن دیارە هەر دەیزانێ، پەنهانو ئاشکرا بۆ خوا ﷻ وەك یەکە ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، نەك خوای پەنهانبین ئەوە دەزانێ، کە لە سینەی ئێوەدایە، بەڵکو هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، خوا هەمووی دەزانێ، مەگەر خوا بۆخۆی ئەو دروستکراوانەی نەهێناوەتە دی؟! کەواتە: بە هەموو شتێکیان دەزانێ ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا﴾، ڕۆژێك کە هەر کەسێك چی کردوە بە ئامادەیی دەیبینێتەوە، هەر کردەوەیەك کە کردوویەتی ﴿وَمَا عَمِلَتْ

مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗا ﴾، ئەو خراپانەی کە کردوونی، خۆزگە دەخوازێو حەز دەکات کە لە نێوانی ئەوو ئەو کردەوە خراپانەدا، ماوەیەکی زەمەنیی زۆر هەبووایە، واتە: هەرگیز بە یەك نەگەیشتبان ﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ ﴾، دووبارەی دەکاتەوەو دەفەرموێ: خوا سەبارەت بە خۆی دەتانترسێنێ لە لێپرسینەوەی خۆی ﴿ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾، وە خوا بەرانبەر بە بەندەکانی میهرەبانە، بۆیە ئێستا دەتانترسێنێ بۆ ئەوەی دوایی تووشی سزاو جەزرەبەی خوا نەبن، پاشان پێوەرو تەرازوویەك دەخاتەڕوو، کە هەرکەسە خۆیو خەڵکیشی پێ بناسێو هەڵسەنگێنێو دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي ﴾، دیارە زۆر کەس لافی خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ لێدەدا، یان لافی خۆشویستنی خوا لێدەدا، یەکێك لەوانە نەصرانیی یەکانن، وەك لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (آل عمران)دا گوتمان: ئەم سووڕەتە تا (٨٣) ئایەتی دەربارەی وتوو وێژ لەگەڵ نەصرانیی یەکاندا هاتوە، جا نەصرانیییەکان ئیددیعای ئەوە دەکەن کە خوایان زۆر خۆشدەوێو، لە دڵیاندا زۆر بەرزو بەڕێزو شیرینە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ ﴾، تۆ پێیان بڵێ: ﴿ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ ﴾، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن خواتان خۆشدەوێ ﴿ فَٱتَّبِعُونِي ﴾، شوێنم بکەون، ئەگەر خواتان خۆشدەوێ، بەدوای پێغەمبەری کۆتایی خواو خۆشەویستی خوا بکەون، کە موحەممەدە ﷺ، ﴿ يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئەگەر ئێوە بەدوای پێغەمبەری خوا بکەون، خواش خۆشی دەوێن، واتە: ئەگەر خواتان خۆشبوێ، دەبێ ئەو خۆشەویستی یە پاڵتان پێوەبنێ، بە دوای پێغەمبەری خوا بکەونو لە ئەنجامی شوێنکەوتنی پێغەمبەردا ﷺ خواش خۆشی دەوێن ﴿ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ﴾، وە لە گوناهەکانتان دەتانبوورێ ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، وە خوا لێبوردەی بە بەزەییە ﴿ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ﴾، پێیان بڵێ: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر ﷺ

بكەن، بە قسەی خواو بە قسەی پێغەمبەر بكەن، بە قسەكردنی خوا، واتە: شوێنكەوتنی قورئانو، بە قسەكردنی پێغەمبەر ﷺ واتە: شوێنكەوتنی هەم قورئانو هەم سوننەتەكەیو ڕێبازەكەی، ئەوەی كە فەرموویەتیو كردوویەتیو دانی پیدا هێناوە، كە ئەویش هەر بریتیە لە ڕوونكردنەوەی قورئان ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵكردو ڕوویان وەرگێڕا لە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، یان هەركامێكیان ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، ئەوە بێگومان خوا كافرانی خۆشناوێ، واتە: هەركەسێ بە قسەی خواو پێغەمبەری خوا نەكات، یان بە قسەی یەكێكیان نەكات (واتە: بە موتڵەقیی بەقسەی نەكات) ئەوە بێگومان كافرە، وە خوا كافرانی خۆشناوێن.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرمووێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ ... ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە حوكمڕانو خاوەنو بەرزكەرەوەو نزمكەرەوەی مرۆڤەكانو، حوكمڕانییو دەسەڵات پێدانو دەسەڵات لێستاندنەوەو هەمەكارە لە ژیان بەشەردا، بەس خوای پەروەردگارە، كەواتە: هەموو چاوەڕوانییەكی خێر دەبێ بەس لە خوا بكرێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ... ﴿١٠﴾ ﴾فاطر، واتە: كێ زاڵییو باڵادەستیی دەوێ، با تەنیا لە خوای چاوەڕێ بكات، وە لە ڕاستیدا هەركەسێك هەوڵبدات بۆ بەدەستهێنانی عیززەت وەدەستهێنانی هەر خێرو چاكەیەك لە غەیری خواو بە شێوەی پشت بە غەیری خوا بەستن، ئەوە شیركە، ئنجا دیارە كە بێئاكامیش دەبێ، بەڵام ئەوە لێرەدا ئەوە ناگەیەنێ كە یاساكانی خوا پشتگوێ بخەین، چونكە خوا ﷻ لە ڕێی هۆكارەكانەوەو لە ڕێی یاساكانییەوە ئەنجامەكان دێنێتە دی، بۆیە دەربارەی (ذو القرنين)، كە یەكێك بووە لە

بەندە چاكەكانی خوا، پێمان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾البقـرة، واتـە: ئێمـە (ذو القـرنین)مـان خـاوەن دەسـتەڵات كردبـوو لـە زەوییـدا، وە بـۆ هـەموو شـتێك هۆكارێكمـان دابـوویە (ئـەویش) بـەدوای هۆكـارەكان دەكـەوتو دەگەیـشتە ئەنجـام، كەواتـە: چاوەڕوانیـی تەنیـا لـە خـوا كردنو پـشت بـە خـوا بەسـتن، مانـای وانیـە، كـە گـوێ نەدەینـە یاسـاكانو هۆكارەكان.

<u>**مەسـەلەی دووەم:**</u> كـە دەفـەرموێ: ﴿ تُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۖ وَتُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَتُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّۖ ﴾، واتـە: نـەك تـەنیا لـە جیهـانی بەشـەردا، بـەڵكو لەسـەر لەبـەری بـوونو بونـەوەردا، بـەس خـوا هەمەكارەیـەو، هەموو شتێكی بەدەستە، كـێ دەتوانێ كاتێك خـوا شـەوگار درێژ دەكـات، كـورتی بكاتەوە یان كـاتێك ڕۆژ بـەرەو درێـژبوون دەچـێ، كـێ دەتوانـێ بڵـێ: لێـرە ڕای دەگـرم؟! بـە دڵنیـایی كـەس ناتوانـێ، یـان كـێ دەتوانـێ شـتێكی زینـدوو دروسـت بكاتو خاوەنی ژیان بێت؟ كە تا ئێستا ژیان (حیـاة) نهێنـییەكە بێجگە لـە خـوا كەس پـێی نازانـێو كەس سەری لـێ دەرناكـا، كەواتـە: خـوا ﷻ نـەك تـەنیا لـە بازنـەی بەشـەردا، بـەڵكو لـە بـازنەی بـوونو بونـەوەردا، هەمەكارەیـەو هـەموو شـتێك بەدەسـت ئـەوە، دیـارە ئەمـەش وا لـە ئینـسانی مـسوڵمان دەكـات كـە هەمیشـە خـوا بەیەك گرتنو خوا بە بەدیهـێنەرو هەمـەكارەی بـوونو كائینـات زانیـن، هەمیشـە لە دڵو مێشـكیدا درەوشاوە بێت.

<u>**مەسـەلەی سـێیەم:**</u> كـە دەفـەرموێ: ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ ﴾، واتـە: بـڕواداران بـا كـافران لـەجیاتی بـڕواداران بـە دۆسـت نـەگرن، دۆسـت كێیـە؟ دۆسـت كەسـێكە كـە خۆشـتبوێو حـەز بـە سـەركەوتنی بكـەیو بەپـێی توانا هاوكاریی بكەیو پـشتی بگـری، كـە مـسوڵمان دەبـێ تـەنیا لەگـەڵ مسوڵمان دا بەو شێوەیە مامەڵە بكـاتو، دەبـێ تـەنیا مـسوڵمانانی لـە قووڵایی

دڵییەوە خۆشبوێ، وە دەبێ تەنیا پشتی مسوڵمانان بگرێتو هەوڵبدا سەریان بخات، بۆچی؟ چونكە ئایا ئەگەر كەسێك بەڕاستی خوای خۆشبوێو دۆستی خوای پەروەردگاربێ، دەگونجێ دوژمنانی خوای خۆشبوێ؟! بەدڵنیایی نەخێر، نەك هەر بەنسبەت خوای پاكو تاك، تۆ ئەگەر هەركەسێكت بەڕاستی خۆشبوێ، دۆستەكانیشیت خۆش دەوێن، وە هەركەسێكت بەڕاستی خۆشبوێ، ڕقت لە دوژمنەكانی هەڵدەستێ، كافریش دوژمنی خوایە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، خوا كافرانی خۆشناوێنو ڕقی لێیان هەڵدەستێ، كەواتە: كاتێك مسوڵمان بابایەكی كافری خۆشدەوێو بە دۆستی دەگرێ لەجیاتی مسوڵمانان، مانای وایە لەگەڵ خۆیدا دەكەوێتە دژایەتیی (تناقض)، چونكە لە لایەك خوای خۆشدەوێو، لە لایەكەوە دوژمنی خوای خۆشدەوێ !! ئایا ئەو دوو خۆشەویستییە، چۆن لە دڵێكدا كۆدەبنەوە؟! بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيْءٍ ﴾، هەركەسێك شتێكی وابكات، هیچ پەیوەندی بە خواوە نیە، واتە: ئەگەر گریمان پێشتر خواشی خۆشبوێ، بەهۆی خۆشویستنی ئەهلی كوفرەوەو بەهۆی دۆستایەتیی كردن لەگەڵ ئەهلی كوفردا، ئەو خۆشەویستییو ئیمانەی كە لە دڵیدا هەیەتی بەرانبەر بە خوا، نامێنێو هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام لێرەدا مەسەلەیەكی گرنگ هەیەو پێویستە ئاگاداری ئەوە بین كە دۆستایەتیی كردنو هەڵسوكەوت كردنی ئیجابیی لەگەڵ ئەهلی كوفردا، سێ حاڵەتی هەن:

حاڵەتی یەكەم: ئەوەیە كە دۆستایەتییان بكاو ڕازی بێ بە كوفرەكەیان، ئەوە بێگومان هەركەسێ بە كوفر ڕازی بێ، بە دڵنیایی پێی كافر دەبێ، چونكە (الرِّضَا بِالكُفْرِ كُفْرٌ) ئەمە یەكدەنگیی (إجماع)ی زانایانی لەسەرە، ئەوە پلە یەك.

حاڵەتی دووەم: ئەوەیە كە هاوكارییان بكاو پشتیان بگرێ بە ڕواڵەت، لەبەر خزمایەتیی، یان لەبەر بەرژەوەندیی، بەڵام عەقیدەو ئیمانیشی دامەزراوبێ، بەوە، كە هەر ئیسلام ڕاستەو غەیری ئیسلام هەڵەیە، وە

بڕوای بە بەرنامەکەیان نەبێ، ئەوەیان کوفر نیە، بەڵام گوناهێکی گەورەیە، وەك هەڵوێستەکەی (حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ)، کە سەرەتای سووڕەتی (الممتحنة) بەو بۆنەیەوە هاتەوە خوار، وەك دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ ...﴿١﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دوژمنی منو دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن، یانی: بە ڕواڵەتیش بێ مەیانگرن بە دۆست، بۆیەش دەڵێین: ئەمە پلەی دووەمەو ئینسانی پێ کافر نابێ، چونکە خوا بە نازناوی ئیمان بانگی ئیمانداران دەکات ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، مانای وایە دەگونجێ کابرا ئیمانداریش بێ، بەڵام ئەوەشی لێ بپشکوێتەوە، وەك هەڵەیەك و گوناهێك، بەڵام لە بازنەی ئیمان نەچۆتە دەرێ، وەك: (حَاطِب) لە ئیمان نەچوو بووە دەرێ بەو هەڵوێستەی، چونکە لە دڵەوە خۆشی نەدەویستن بەڵکو دڵو دەروونی هەر ئارام بوو، بەس دەیویست کە بەهۆی موجامەلە کردنێکی ڕواڵەتییەوە، ئەوەبوو کە نامەی بۆ ناردن (بۆ موشریکەکانی مەککە) بەژەوەندییەکانی لەوێ پارێزراوبن.

حاڵەتی سێیەم: بریتیە لە هەڵسوکەوتی جوانی دنیایی و هەڵسوکەوتی جوامێرانەو هەڵسوکەوتی خۆش ڕەفتارانە، ئەوەیان نەك هەر کوفر نیە، بەڵکو تەنانەت گوناحو قەدەغەش نیە، بگرە جاری وایە پەسندەو جاری وایە پێویستیشە، بە بەڵگەی چی؟ خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ...﴿٨٦﴾﴾ النساء، واتە: ئەگەر سڵاوتان لێکرا بە سڵاوکردنێکی چاکتر لە هی خۆیان، یان وەك هی خۆیان وەڵامی بدەنەوە، کاتێك کەسێك سڵاوت لێدەکات ڕێزت لێ دەگرێ، دەبێ تۆ زیاتر ڕێزی لێ بگری، یان بەلای کەمەوە وەك خۆی ڕێزی لێ بگرییەوە، هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾

الممتحنــة، واتــە: خــوا لێتــان قەدەغــە ناكــات كەســانێك، كــە لەســەر دینتــان دژایەتییتان ناكەن، وە لـە نیشتیمانو مـاڵو حـاڵی خۆتـان وەدەرتـان نانێـن (لێتـان قەدەغـە ناكـات) چاكەیان لەگەڵدا بكـەنو لەگـەڵیان چاكەكاربن، وە لەگەڵیـشیان بەخـشەربن، ئنجـا هـەر ئـەوە كـە بێگومـان خــوا ﷻ سـەرەتای سوورەتی (الـممتحنة) بە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دەیهێنێ، یان لێرەدا كـە دەفــەرموێ: ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، مانــای وایـە دەگونجـێ ئـەو كەسانە ئیمانیـان هەبـێو جۆرێـك لـە پەیوەندییـشیان لەگەڵ ئەهلی كوفردا هەبێت، كە دیارە ئەگەر بگـاتە ئـەو ڕاددەیـەی كـە بـە كوفرەكــەیان ڕازی بــنو، بــە بەرنامەكــەیان ڕازی بــنو، بــە موتڵــەقیی دۆســتایەتییان بكـەن، ئـەوە دیـارە كـە پەیوەنـدییان بـە خــواوە نامێنــێو پەیوەندییــان بـە ئیـسلامەوە نامێنــێ، بـەڵام ئەگــەر لـە خــوار ئەوەوەبــێ، ئــەوە یــان گونــاهــە، یــان جــاری وایــە لــە شــەرعدا جێگــەی دەبێتــەوەو گونــاحیش نیــە، ئنجـا ئەگــەر تەماشــای ئایــەتی ژمــارە (٥١)ی ســـوورەتی (الـمائدة) بكـەین، كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ... ﴾، واتــە: ئــەی ئەوانـــەی بڕواتـان هێنـاوە ! جوولەكـەو نەصـڕانیی یـەكان مـەگرن بـە دۆسـت ئـەوان هەندێكیان دۆستی هەندێكیانن، وە هەركەسێك لە ئێوە بیـانگرێ بـە دۆسـت ئەوە لەوانە، یانی چی؟ ئەمە یانی: هەركـەس جوولەكەو نەصـڕانیی یـەكان بگرێت بە دۆسـتو لە دڵەوە خۆشی بوێنو، بـە كردەوەكانیــان ڕازی بــێو، بــە بەرنامــەكانیان ڕازی بــێو، بــە موتڵـەقیی پـشتگیرییان بكــات، ئــەوە حوكمــی ئــەوان هـــەیە، بــەڵام لــە ســەرەتای ســـوورەتی (الــممتحنة)دا دەفــــــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ ... وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ ﴾، واتــە: ئــەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنــاوە! دوژمنی منو دوژمنی خۆتانبە دۆست مەگرن... وە هەركەسێكتان وابكـات،

ئەوە لەو هەڵوێستەیدا ڕێی ڕاستی ونکردووەو لەڕێی ڕاست لایداوە، وەك دەبینین خوا نەیفەرموە: هەرکامێکتان وابکات ئەوە کافر بووەو لە بازنەی ئیمان چۆتە دەرێ، دیارە دواندن (خطاب)ەکەش هەر بەناوی ئیمان هاتوە، دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وا مەکەن، ئنجا وەك گوتمان: ئەوە هەڵاواردن (إستثناء)یشی تێدایە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةً ﴾، مەگەر خۆتانیان لێ بپارێزن، واتە: ناچاربن کە بە شێوەیەکی ڕواڵەتییو ڕووکەشیی موجامەلەیەکیان بکەن، بۆئەوەی کە لە دڵەوە خۆشتان بوێن، ئەوەیان دیارە مۆڵەتو بواری تێدا هەیە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةً ﴾، مەگەر وەك خۆپاراستن خۆتانیان لێ بپارێزن، دەڵێ: (التَقوى، والتُّقاة، والتَقيَّةُ: الخَشيةَ والخَوف)، (التَقوى والتُّقاة والتَقيَّةُ) هەرسێکیان بەمانای ترسانو خۆپاراستن دێن، (التقية: الخَشْيَة والخَوف، والتقية، عِنْدَ بَعْضَ الفِرَقِ الإِسْلاَمِيَة إِخْفَاءُ الحَقِّ وَمُصَانَعَةُ النَّاسِ في غَيْرِ دَولَتِهِم تَحـرُّزاً مِنَ التَّلَفِ)[1]، واتە: (تقية) لە لای هەندێك کۆمەڵە مسوڵمان (کە مەبەستی پێ شیعەکانە[2]) بریتیە لە شاردنەوەی هەق لە کاتێکدا کە دەستەڵاتو دەوڵەتیان بەدەستەوە نیە، بۆئەوەی خۆیان لە مەترسیی فەوتان بپارێزن، هەڵبەتە ئەم مەسەلەی خۆپاراستنو (تقية)یە مشتومڕی زۆری لەسەرە، بەڵام کورتەکەی ئەوەیە: کە مرۆڤی مسوڵمان لەکاتی مەترسیی گیانییو سامانییداو لە کاتی ناچارییدا، واتە: ترسێکی جیددیی لەسەربێ، لەسەر ژیانی، یان لەسەر

١) المعجم الوسيط ، ج: (٢)، ص: (١٠٥٢).

٢) هەڵەی شیعەش لە مەسەلەی تەقییەدا، ئەوەیە کە لەگەڵ مسوڵمانان دا دەیکەن نەك لەگەڵ کافران دا، پاشان جاری وایە دەستەڵاتدارنو هیچ پەکیشیان لەسەری نەکەوتوە، کەچی تەقییە بەکاردێننو بێگومان ئەوەش جۆرێك لە دووڕوویی و ناڕاستیی بە ئانقەست، کە سیفەتی مونافیقانە.

مالْو سامانی، لەسەر ڕای ژمارەیەك لە زانایان، بەلاَم هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە ئەگەر مەترسیی گیانیی لەسەر بوو، بۆی هەیە موجامەلەی دەستەلاَتدارانی كافرو ستەمكار بكات، بۆ سەلامەتی خۆی، هەلْبەتە نەك لە دلْەوە خۆشی بوێن، بەلْكو بە ڕوالْەت وا پێشان بدات كە دژیان نیە، بۆ ئەوەی خۆی لە شەڕو خراپەیان بپارێزێ، ئەوە كورتەكەیەتیو تەفاصیلی زۆریشی هەیە.

**مەسەلەی پێنجەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴾، دوایشیش دەفەرموێ: ﴿ إِن تُخْفُوا مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ ﴾، ئەوە دەگەیەنێ كە مەسەلەی (تقیة) واتە: جۆرێك لە موجامەلە كردنی ئەهلی كوفر لە كاتی ناچاریىو بێ دەستەلاَتیی دا زۆر وریایی دەوێ، بۆ ئەوەی ئینسان تێنەپەڕێنێو بێ ئەوەی پەكی لەسەر كەوتبێ وانەكات، وە كەواشی كرد لە سنووری شەرع تێنەپەڕێنێ، كە بەداخەوە زۆربەی مسولْمانان بۆ بچووكترین بەرژەوەندیی خۆیان تەمەللوق دەكەن، نەك هەر موجامەلەیەكی ڕووكەشیی بكەن، بەلْكو زۆرجار هەق دەكەنە ناهەق، ناهەق دەكەنە هەق، ئنجا لەوانەیە پێشیان وابێ ئەم مەسەلەی (تقیة)یە دەیانگرێتەوە!! كە لە ڕاستیدا نایانگرێتەوەو دەبێ مەترسییەكی جیددیی هەبێ، ئەوجار ئەو خۆپارستن (تقیة) دروستە.

**مەسەلەی شەشەم**: هەندێك لە زانایان دەلْێن: مەسەلەی مالْو سامان هەرچەند مەترسیشی لەسەربێ (تقیة)ی تێدا دروست نیەو، تەنیا دەبێ مەترسیی گیانیی هەبێو، مرۆڤ هەڕەشەی كوشتنی لێ بكرێ، وەك: لەم بەسەرهاتەوە دیارە كە حەسەنی بەصرایی دەیگێڕێتەوە، دەلْێ: (أَخَذَ مُسَيْلَمَةُ الكَذَّابُ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لأَحَدِهِمَا: أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله؟ قَالَ: نَعَمْ، نَعَمْ، نَعَمْ، قَالَ: أَفَتَشْهَدُ أَنِّي رَسول الله؟ قَالَ: نَعَمْ، وَكَانَ مُسَيْلَمَةَ يَزْعَمُ أَنَّهُ رَسولُ بَنِي حَنِيفَةَ، وَمُحَمَّد رَسولُ قُرَيْشٍ فَتَرَكَهُ، وَدَعَا الآخَرَ، قَالَ: أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله؟ قَالَ: نَعَمْ، نَعَمْ،

نَعَمْ، فَقَالَ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسول الله؟ فَقَالَ: إِنِّي أَصَمٌّ، ثَلاَثاً فَقَدَّمُهُ، فَقَتَلُهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسولَ الله، فَقَالَ: {أَمَّا هَذَا المَقْتُولُ فَمَضَى عَلَى يَقِينِهِ وَصِدقِهِ، فَهَنِيئَاً لَهُ، وَأَمَّا الآخَر فَقَبِل رُخْصَةَ الله فَلاَ تَبِعَةَ عَلَيْهِ})[1] مِن طَرِيق يُونس عَن الحَسَنِ البَصري، فَالحَدِيثُ مُرْسَلٌ)، واتە: موسەیلەمەی درۆزن دوو پیاوی لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گرتن، یەکێکیانی بانگکرد، پێی گوت: شایەدیی دەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە؟ گوتی: بەڵێ بەڵێ بەڵێ، پێی گوت: شایەدیی دەدەی منیش پێغەمبەری خوام؟ گوتی: بەڵێ، وە موسەیلەمەی درۆزن پێی وابوو کە ئەو پێغەمبەری بەنی حەنیفەیە، وە موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەری قورەیشە !! بۆیە وازی لەو هێنا، ئنجا ئەوی دیکەی بانگکردو پێی گوت: شایەدیی دەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە؟ گوتی: بەڵێ بەڵێ بەڵێ، پێی گوت: شایەدیی دەدەی منیش پێغەمبەری خوام؟ گوتی: من هیچ نابیستم، سێ جاران دووبارەی کردەوە (یانی: بە توانجەوە!) موسەیلەمە هێنایە پێشێو کوشتی، ئەو هەواڵە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوە، فەرمووی: ئەمما ئەوەی کوژراوە، ئەوە بەپێی یەقینی خۆیو ڕاستگۆیی خۆی ڕۆیشتوە، خۆشی (بەهەشت) بۆ ویو لێی پیرۆزبێ، وە ئەوەی دووەمیان مۆڵەتی خوای وەرگرتوە، ئەویش گوناهی ناگاتێ، واتە: لەبەر ئەوەی مەترسیی گیانیی لەسەر بووە، کەواتە: ئەوە مۆڵەتە، وە نەبێ فەرزبێ، ئەدی ئەگەر کەسێك ئەو مۆڵەتە وەرنەگرێو ئیش بە عەزیمەت بکات ؟ ئەوە بۆی هەیە بە تایبەتی ئەگەر کەسێکی وابێ دینی لێ وەربگیرێو، کەسێك بێ سەرمەشقو چاوساغیی خەڵك بێ، دەبێ ئیش بە عەزیمەت بکاتو پەنا نەباتە بەر ئەو مۆڵەتە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە هەرکەسە چی کردوە بە ئامادەکراویی دەیبینێ،

---

١) التفسير الكبير، ج: (٨)، ص: (١٢).

هەروەها لە شوێنێکی دیدا دەفەرموێ: ﴿... وَوَجَدُواْ مَاعَمِلُواْ حَاضِرًا... ﴿٤٩﴾﴾ الكهف، واتە: وە ئەوەی کردبوویان بە ئامادەیی بینییان، وە لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿... إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾ الجاثية، واتە: ئێمە ئەوەی دەتانکرد نوسخەمان لێ دەگرتەوە. ئەو ئایەتانە بەڵگەنە لەسەر پێشاندرانی خودی کردەوەکان، نەك تەنها نووسینەکەیان: چونکە لە ئایەتەکەی سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە کە هەرکەسە کردەوەی خۆی بە ئامادەیی دەبینێ، وە لە سوورەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: کردەوەکەیان بە ئامادەیی دەبینن، خودی کردەوەکە نەك بە نووسراویی، وە لە ئایەتەکەی سوورەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ئێمە نوسخە بەرداریمان دەکردو کۆپیمان دەکرد چیتان کردوە، واتە: خودی ئەو کردەوەمان کۆپی (إستنساخ) دەکرد.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾، واتە: بڵێ: ئەگەر خواتان خۆشدەوێ، شوێنم بکەون، خوا خۆشی دەوێن، کەواتە: بەڵگەی خۆشویستنی خوا بریتیە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، بەلام لێرەدا پێویستە بزانین کە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، یاخود شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەبێتە پێنج (٥) جۆر، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕێو شوێنو ڕێبازەی بۆی بەجێهێشتووین، یەك جۆر نیەو پێنج جۆرە، کە ئەمانەن:

جۆری یەکەم: ئەوەی کە وەك پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوا بە ڕەهایی فەرموویەتی، ئەوە پابەندکەرە بۆ هەموو کەس لە هەموو حاڵەتو لە هەموو شوێنێکدا، بۆ وێنە: کە فەرموویەتی: {المُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ برقم: (١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧١) وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٨٣) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا)، واتە: مسوڵمان ئەو کەسەیە، کە مسوڵمانان لە دەستو زمانی سەلامەت بن.

جـۆری دووەم: ئـەوەی، كـە وەك سـەرۆكی دەوڵـەتو پێـشەواو حـوكمڕان فەرمووـیەتیو كردوویـەتی، ئـەوە پـێویـستە وەك ئـەو سـیفەتە لێـی وەربگیـرێ، وە ئـەوە زیـاتر دەگەڕێتـەوە بـۆ حوكمڕانـانو كاربەدەستان، بـۆ وێنە: نامە نووسینی بـۆ پادشاو سەرۆكەكانی دەوڵەتانی ئـەو كاتـەی دنیـاو بانگهێـشتكردنیان بـۆ ئیـسلام، وەك نامەكـەی بـۆ (هِرَقْـل): {بِـسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ رَسولِ اللَّهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى أَمَّا بَعْدُ: فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، وَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الآرِيسِيِّينَ} (أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٧)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (٤٥٨٣))، هـەروەها كـە فەرموویـەتی: {مَـنْ قَتَـلَ قَتِـيلاً لَـهُ عَلَـيْهِ بَيِّـنَةٌ فَـلَهُ سَـلَبُهُ} (أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٣١٤٢))، واتە: هەركەسێك یەكێكی كوشـت (لە جـەنگ دا) لەسـەریەتی بەڵگە بێنێ، ئنجا كـەلو پەلەكەی بۆخۆی بێ.

جـۆری سـێیەم: ئـەوەی كـە وەك دادوەرو قـازی، فەرموویـەتی، دەبـێ تەماشـای هـەلو مـەرجی ئـەو حاڵە بكـەین كە پێغـەمبەر ﷺ حـوكمو بڕیارەكـەی تێـدا داوەو فەرموویـەتی: بـۆ وێنـە لـە فەرمایشـتێكدا فەرموویـەتی: {إِنَّمَا أَنَـا بَشَـرٌ وَإِنَّـهُ يَـأْتِينِي الْخَـصْمُ، فَلَعَـلَّ بَعْـضَهُمْ أَنْ يَكُـونَ أَبْلَـغَ مِـنْ بَعْـضٍ فَأَحْسَبُ أَنَّـهُ صَـادِقٌ فَأَقْضِي لَـهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَـهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِـيَ قِطْعَـةٌ مِنَ النَّـارِ فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَذَرْهَا} (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤٥٨)، وَمُسْلِم بـرقم: (٤٤٤٨)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٣٥٨٣)، وَالنَّـسَائِيُّ بـرقم: (٥٤٠١)، وَابْـنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣١٧)، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، واتـە: بێگومـان منـیش مـرۆڤم، وە دێنـە لام بـۆ كێـشەك (كـە لـە نێوانتانـە) لەوانەیـە هەنـدێكتان قسەی فەسیح ترو زەمانی ڕەوانتـربێ، مـن وا دەزانم ڕاست دەكاتو هـەقی پـێدەدەم، كـە ئـەوە هـەقی مـسوڵمانێكی دیكەیـە، بـەڵام بێگومـان ئـەوە پارچەیەكە لە ئاگر، جا با هەڵیبگرێ یاخود وازی لێبێنێ، كەواتە: كاتێـك پێغـەمبەر ﷺ وەك قازی بڕیارێك دەدات، مـەرج نیـە لای خـوای پەهانـزان

بەو شێوەیە بێ، بەڵكو ئەو بە ڕواڵەت وای لێ حاڵی بووەو ئەگەر دوایی زانرا كە هەقی تێدا نەپێكراوە نابێتە پابەندكەر (مُلْزِم).

جۆری چوارەم: ئەوە كە وەك موفتی فەرموویەتی: یان كە پرسیاری لێكراوەو فەتوای داوە ئەوەش دەبێ لەو سنووورەدا تەماشا بكرێ، بۆ وێنە، ئەم دەقە: (قَالَتْ هِنْدُ امْرَأَةُ أَبِي سُفْيَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَلَيْسَ يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي و ولَدِي، إِلاّ مَا أَخَذْتُ مِنْهُ، وَهُوَ لا يَعْلَمُ؟ قَالَ: {خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَ وَلَدَكِ بِالمَعْرُوفِ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٠٤٩)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا)، واتە: هیندی هاوسەری ئەبو سوفیان بە پێغەمبەر ﷺی فەرموو: ئەبو سوفیان پیاوێكی چرووكەو هێندەم ناداتێ بەشی خۆمو منداڵەكانم بكات، جگە لەوەی بۆخۆم لێی دەردێنمو ئەویش پێی نازانێ (واتە: بە پەنهانیی)؟ فەرمووی: بە شێوەیەكی پەسند ئەوەندەی بەشی خۆتو منداڵەكانت دەكات، لێی لابدە.

جۆری پێنجەم: ئەوەی كە وەك سروشتی بەشەریی پێغەمبەر ﷺ هەیبووە، بۆ وێنە لە سوننەتدا هاتوە: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ} (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٤٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٦٦٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧١٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٣١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٢٥٤)، واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەلواو هەنگوینی پێخۆش بووە، ئایا خواردنی حەلواو هەنگوین سوننەتە بۆ كەسێك، كە نەخۆشی شەكرەی هەیە، یاخود حەزی لە شتی شیرین نەبێ ؟! نەخێر، یان پێغەمبەر ﷺ جۆرە خواردنێكی پێ ناخۆش بووە، بێگومان ئەوە بۆ ئێمە نابێتە سوننەتێكی پابەندكەر، چونكە وەك سروشتی بەشەریی ئەوانەی كردوە.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** کە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، واتـە: بڵـێ: فەرمانبـەریی خـواو پێغـەمبەر بکـەن، جـا ئەگەر پـشتیان هەڵـکرد خـوا کافرانی خـۆش نـاوێن، کەواتـە: سـەنگی مەحـەکی مسوڵمانەتیی، پابەندییـە بـە ڕێبـازی پێغەمبـەرەوە ﷺ، بـەڵام لێرەدا دەبـێ لە یەك شت وریـابین، ئێستا ئەگەر کەسێك بـە گـشتی ڕێبـازی پێغەمبـەر ﷺ ڕەفز بکات ئـەوە کـافرە، باشـە ئـەدی ئەگـەر یـەکێك لـە سـوننەتەکان نـەکاتو بڵـێ: لـە توانــام دانیـەو پـێم ناکـرێ، ئایـا کـافر دەبـێ ؟ بێگومـان نەخێـر، پـێی کافر نابـێ، بەڵام خێرێکی لە دەست دەچـێ، هەڵبەتـە ئەگەر سـوننەتەکە واجب بـێ گوناهی دەگـا، بەڵام ئەگەر بڵـێ: ڕەفزی دەکەم دەشزانم پێغـەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوە پـێی کافر دەبـێ، وە ئەگەر بڵـێ: مـن پـێم وایـە ئـەوە سـوننەتێکی پێغـەمبەر ﷺ نیـەو وای نەفـەرمووە ! ئـەوە ئەوپـەڕی دەتـوانین بڵـێین: گوناهبـارە، ئـەویش ئەگـەر بەڵگـەی نـەبێ، ئەگـەرنا گوناهبـاریش نیـە، بەڵام بێگومـان پـێی کـافر نابـێ، تـەنیا لـە حاڵێـدا کافر دەبـێ کە بڵـێ: ئـەوە سـوننەتێکی پێغـەمبەرە ﷺ بـەڵام مـن قبـووڵی ناکـەمو ڕەتـی دەکـەمەوە، ئـەویش لەبەرئـەوەی ئـەم جـۆرە قـسانە پـێچەوانەی ئیمـانو بەڕاسـتزانین (تصدیق)نو، پـێکەوە کۆنابنـەوەو، سەر دەکێشن بۆ کوفر.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی (٣٣ تاکو ٤٤) دەگرێتەوە، واتە: نۆ ئایەت، کە خوای پەروەردگار لەو نۆ ئایەتەدا باسی هەڵبژێردرانی هەرکام لە پێغەمبەرانی ئادەمو نووح (علیهما الصلاة والسلام) وە ئالی ئیبراهیمو ئالی عیمران دەکات، وە باسی هاوسەری عیمران دەکات، واتە دایکی مەریەم، وە نەزرکردنی کۆرپەکەی کە مەریەمە بۆ خزمەتکردنی ماڵی خوای پەروەردگار، وە قبووڵ کرانی لەلایەن خواوە، وە سپێررانی بە زەکەریا ﷺ بابی یەحیا، بۆ ئەوەی کە سەرپەرشتی بکاتو پەروەردەی بکات، وە پاشان باسی دوعای زەکەریاو پاڕانەوەکەی دەکات، کە منداڵی پێببەخشێ، پاشان باسی بەخشرانی یەحیا بە زەکەریا (علیهما السلام) دەکات، وە باسی داواکردنی زەکەریا بۆ ئەوەی کە خوا نیشانەیەکی پێشان بدات کە ئەو منداڵەی پێ دەبەخشێ دەکات، وە خوا نیشانەی بۆ دادەنێ، کە سێ شەوو ڕۆژ بە ئاماژە نەبێ نەتوانێ قسەی بکات، ئەوە نێوەڕۆکی ئەو ئایەتانەیە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا
مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا
فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ
بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ

ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٖ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنٗا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّاۖ كُلَّمَا
دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ
ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥۖ قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن
لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتۡهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٞ يُصَلِّي فِي ٱلۡمِحۡرَابِ
أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحۡيَىٰ مُصَدِّقَۢا بِكَلِمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدٗا وَحَصُورٗا وَنَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾
قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَقَدۡ بَلَغَنِيَ ٱلۡكِبَرُ وَٱمۡرَأَتِي عَاقِرٞۖ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ
مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا
رَمۡزٗاۗ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرٗا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٤١﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((بێگومان خوا ئادەمو نووحو ئیبراهیمو نیزیكانیو عیمرانو نیزیكانی بەسەر جیهانییان دا هەڵبژاردوە ﴿٣٣﴾ هەندێكیان وەچەی هەندێكیانن، وە خوا بیسەری زانایە ﴿٣٤﴾ یادبكەوە كاتێك هاوسەری عیمران، گوتی: پەروەردگارم ! من ئەوەی لە زگم دایە بە ساغیی دەیدەمە تۆ، دە تۆش لێم وەربگرە، بێگومان هەر تۆی بیسەری زانا ﴿٣٥﴾ جا كاتێك كۆرپەكەی بوو، گوتی: پەروەردگارم ! من ئەوەی بووم كچە، وە خواش دەزانێ چی بووە، دیارە نێرینەش وەك مێینە نیە، وە من ناوم ناوە مەریەم، وە من خۆیو وەچەكەی لە خراپەی شەیتانی دوور خراوە (لە ڕەحمەتی تۆ) بە تۆ پەنا دەدەم، ﴿٣٦﴾ ئنجا پەروەردگاری بە وەرگرتنێكی باش لێی وەرگرتو بە چاكییش پێیگەیاند، وە بە زەكەرییای سپارد، هەر كات زەكەرییا لێی وەژوور (میحراب) دەكەوت، ڕۆزییەكی لەلا دەبینی، گوتی: ئەی مەریەم! ئەمەت لە كوێ بوو؟! گوتی: ئەوە لەلایەن خواوەیە، بێگومان خوا

هەرکەسێك بیەوێ بە بێ ژماردن ڕۆزی دەداتێ ﴿٣٧﴾ جا لەوکاتەدا زەکەریا لە پەروەردگاری پاڕایەوە، گوتی: پەروەردگارم ! لە لایەن خۆتەوە وەچەیەکی چاكو پاکم پێببەخشە، بەڕاستی تۆ بیسەری پاڕانەوەی ﴿٣٨﴾ ئنجا فریشتەکان لە کاتێکدا کە لە میحراب دا بە پێوە نوێژی دەکرد بانگیان کرد: کە خوا مژدەت پێ دەدات بە یەحیا، وشەیەك کە لەلایەن خواوەیە (مەبەست عیسایە) بە ڕاستی دەزانێ، وە بە ڕێزو خۆپارێزەو پێغەمبەرێکە لە چاکان ﴿٣٩﴾ گوتی: جا پەروەردگارم ! چۆن کوڕم پەیدادەبێ لە حاڵێکدا کە پیریم تووش بووەو ئافرەتەکەشم نەزۆکە؟! فەرمووی: ئاخر ئاوا خوا هەرچی بوێ دەیکات ﴿٤٠﴾ گوتی: پەروەردگارم ! نیشانەیەکم بۆ دانێ، فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە کە ماوەی سێ ڕۆژان بە ئاماژە نەبێ قسان ناکەی، وە ئێوارانو بەیانیان پەروەردگارت بە پاك بگرە ﴿٤١﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱصۡطَفَىٰٓ): واتە: هەڵیبژارد (أصْلُ الصَفَاء: خلُوصُ الشَّيءِ مِنْ الشوبِ)، لە بنەڕەتدا (صَفَاء) ئەوەیە شتێك لە خڵتەو جسمێکی نامۆ کە تێکەڵی بووە لێی جیابکرێتەوە (والإصطفاء: تَنَاولُ صَفْوِ الشَّيء) (إصطفاء) بریتیە لەوەی، کە پوختەی شتێك هەڵبژێری، وەك (الإختيار: تناولُ خَيرهُ) (إختيار)، واتە: چاکەکەی هەڵبژێری (إصطفاء)، واتە: شتێك پوختەکەی هەڵبژێری.

(ذُرِّيَّةً): واتە: وەچە، جا هەم بۆ یەك منداڵیش بەکاردێ، هەم بۆ زۆرانیش بەکاردێ (الذُّرِّيَةُ أَصْلُهَا نَسْلُ الرَّجُل، وقِيلَ: الصِّغَار مِنَ الأولاَد وَهُوَ لِلصِّغارِ والكِبَارِ وَيُستَعْمَلُ لِلْوَاحِدِ والجَمْعِ)، (ذُرِّيَة): لە بنەچەدا بە مانای وەچەی پیاو دێ، هەندێکیش دەڵێن: منداڵی گچەکەی ئینسان پێی دەگوترێ: (ذُرِّيَة)، بەڵام بەپێی عورفو باو وشەی: (ذُرِّيَة) بۆ گەورەو

بۆ گچکە بەکاردێ، واتە: بەتەمەن بن یا کەم تەمەن بن، وە بۆ تاکو کۆمەڵیش بەکاردێ.

(**نَذَرْتُ**): واتە: نەزرم کردوە، لەسەر خۆم پێویست کردوە، (النَّذْرُ: أنْ تُوجِبَ عَلَى نَفْسِكَ ما لَيسَ بِوَاجِبٍ لِحدُوثِ أَمْرٍ)، (نَذْرُ): بریتیە لەوەی تۆ شتێك لەسەر خۆت پێویست بکەی کە لە ئەسڵ دا لەسەرت پێویست نەبێ، بۆ پەیدابوون یان نەبوونی شتێك بۆ وێنە: یەکێك بۆ ئەوەی شتێکی بۆ ببێ، یان بۆ ئەوەی شتێك نەبێو ڕوونەدات دەڵێ: خوایە ئەوەندە پارەیەم نەزر بێ، فلان شتەم نەزر بێ، وە زانایان ئاوا پێناسەی (نَذْرُ)یان کردوە: (إلتِزَام الفِعْل بالقَوْلِ مِمَّا يَكُونُ طَاعَةً للهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الأعْمَال قربة)[1] ، واتە: بە قسە پابەندیی خستنەڕوو بە کردەوەیەکەوە، کە فەرمانبەریی خوای زاڵو پایەدارە، بە نیازی لە خوا نیزیك بوونەوە.

(**مُحَرَّرًا**): واتە: ئازادکراو یاخود ساغ بووەوە، (مُحَرَّراً: مُخْلَصاً لِلْعِبادَة، حَرَّرَهُ: أَطْلَقَ سَرَاحَهُ) واتە: ئەو کۆرپەیەم بە ساغیی تەرخان دەکەم بۆ خواپەرستیی، یاخود بۆ خزمەتی ئەو پەرستگایە، چونکە (حَرَّرَهُ) واتە: ئازادی کرد.

( **فَتَقَبَّلَهَا** ): واتە: لێی قبووڵکرد، (التَقَبُّلُ: أَخْذُ الشَّيء عَلَى وَجْه الرِّضَا) (تقبُّل) بریتیە لە وەرگرتنی شتێك لەسەر شێوەی پێ ڕازیبوون.

(**وَكَفَّلَهَا** ): واتە: پێی سپارد (الكَفَالَةُ الضَّمَانُ)، وەك: دەگوترێ: فلان کەس بە کەفالەت فلان شتی کرد، واتە: وە ئەستۆی گرت، (تَكَفَّلْتُ بِكَذَا، وَكَفَّلْتُ فُلاَناً) دەگوترێ: فلان شتم بە کەفالەت وەرگرت، یاخود فلان کەسم کردە کەفیل، واتە: ئەو کارەم بە فلان کەس سپارد.

---

١) أَحْكَام القُرْآن، لأبي بَكر محمد بن عبدالله، ج(١)، ص(٣٥٢).

(ٱلۡمِحۡرَابَ): (صَدْرُ المَجْلِسِ والمَسْجِدِ) میحــراب بـە پێشـەوەی مەجلیسێك، یـان دیوەخانێك، یاخود پێشـەوەی مزگـەوت دەگوترێ، یـان ژوورێکـی تایبـەت کە خـواپەرستیی تێدا دەکرێ.

(طَيِّبَةً): واتـە: پـاكو چـاك، ( ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ) واتـە: وەچەیـەکـی پـاكو چاکـم پـێ ببەخـشە، (أَصْلُ الطَّيِّبِ: مَا تَسْتَلِذُّهُ الحَوَاسُّ)، وشـەی: (طَيِّب) لـە بنەڕەتـدا هەرشـتێکە کـە هەستەوەرەکـان لـەززەتی لێبکـەن، ئەگـەر ڕەنگـە چـاو پێی جوانبێ، ئەگەر بۆنە لووت بۆنەکەی پێ خۆشبێ، وە ئەگەر تامە دەم تامەکـەی پـێ خۆشبـێ، (وَالطَّيِّبُ مِنَ الإنْسَانِ: مَنْ تَعَرَّى مِنْ نَجَاسَةِ الجَهْلِ وَالْفِسْقِ وقَبَائِحِ الأَعْمَالِ)، ئینسـانی (طَيِّب) کەسێکە، کە پـاك بۆتـەوە لە پیسیی نەزانینو لادانو کردەوە خراپەکـان.

(بِكَلِمَةٍ): واتە: وشە، بەڵام لێرەدا دەگونـجێ مەبەست پـێی وشـەی خـوا بێـت، کـە وشـەکانی خـوا ﷻ یـانی: کتێبـی خـوا، وە دەشـگونجێ مەبەسـت پـێی عیـسا ؑ بـێ، چونکە عیسـا بـە (كَلِمَة) نـاوبراوە، لەبـەر ئـەوەی کـە بـە وشەی خـواو بە فەرمانی تایبەتـی خـوا دروست کراوە، نەك وەك منداڵی دیکـە لە ئەنجامی بە یەکگەیشتنی ژنو مێـرد دا، دروست بووبێ.

(وَسَيِّدًا): واتــە: ســەروەر، بەڕێــز (الـسَيِّد: الْمُتَـوَلِّي لِلـسوادِ، أَيْ: الجَمَاعَـة الكَثِيـرَة)، واتە (سَيِّد) بە کەسێك دەگوترێ سەرپەرشتی کۆمەڵێکی زۆر بکات.

(وَحَصُورًا): واتــە: خۆپـارێز لــە ئافرەتــان، (الْحَـصْرُ: التَّـضْيِيقُ) بریتیــە لــە وەتـەنـگ هەڵهێنان (حَصِير) بەمانای (حَابِس)دێت، وەك خـوای پەروەردگـار دەفەرموێ: ﴿ ... وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ۝٨ ﴾ الإسراء، واتـە: دۆزەخمـان بـۆ کـافران گێـڕاوە بـە زینـدان، واتـە: حەپـسیان دەکـاتو نایەڵـێ بـچنە دەرێ (حَـصُوراً: الَّـذِي لا يـأْتِي النـسَاء)، واتــە: ئــەو پیــاوەی کــە ناچێتــە لای ئافـرەتان، بەڵام نەك لەبەر نەتوانیـن، بەڵکو لەبەر خۆپاراسـتن.

(عَاقِرٌ): واتە: نەزۆك، (عَاقِر: للرَّجُلِ والمرأةِ: اللَّذَانِ لاَيلْدَان) واتە: پیاو، یان ئافرەت كە منداڵیان نابێت (عَاقِر)یان پێ‌دەگوترێ.

(رَمْزًا): واتە: ئاماژە، (الرمْزُ: الإِشَارَةُ بالشَفَةِ وَالصَّوتِ الخَفِيِّ وَالغَمْزِ بِالحَاجِبِ)، وشەی: (رَمْز) بریتیە لە ئاماژە كردن بە لێو، یاخود بە دەنگێكی كپو نزم، یاخود بە برۆ، یان بە هەرشتێك كە ئاماژەی پێ‌بكرێ، پێی دەگوترێ: (رَمْز) بە كوردیی دەڵێین: هێما.

(بِٱلۡعَشِيِّ): (بَعْدَ العَصْرِ، أو بَعْدَ الزَوَالِ) وشەی (عَشِيّ)، واتە: لە دوای عەسر (ئێوارە) یاخود لە دوای نیوەڕۆوە.

(وَٱلۡإِبۡكَٰرِ): (بَعْدَ شرُوقِ الشَّمْسِ) واتە: كاتێك خۆر دەردەكەوێ‌و خۆر هەڵدێ، پێش نیوەڕۆ.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ پاش ئەوەی لە ئایەتەكانی پێشوودا باسی چەند ڕاستییەكی كرد دەربارەی دینی خۆی‌و دەربارەی پەروەردگارێتی خۆی، وە دەربارەی ئەوە كە ئیمانداران تەنها دەبێ لەگەڵ ئیمانداران دا دۆستایەتیی بگرن، وە خۆیان بپارێزن لە دۆستایەتیی كردن لەگەڵ كافراندا، مەگەر بە ناچاریی‌و ڕووكەشیی‌و ڕواڵەتیی‌و بۆ خۆپاراستن، وە دوای ئەوەی باسی گرنگیی شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوای ﷺ كرد، كە وەك باسمان كرد ئەوە ئاماژەیەكە بۆ ئەو نەصرانیی یانەی كە لافی ئەوە لێدەدەن خوای پەروەردگاریان خۆشدەوێ، خوا بە پێغەمبەری فەرموو: بڵێ، ئەگەر خواتان خۆشدەوێ شوێنم بكەون خواش خۆشی دەوێن، كەسێك بەڕاستی خوای خۆشبوێ، دێ بەدوای ڕەوانەكراوانی خواو خۆشەویستانی خوا دەكەوێ، بە تایبەتی سەروەرو گەورەیان‌و كۆتاییان موحەممەد ﷺ دوای ئەوە خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ

ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، واتە: بێگومان خوا ئادەمو نووحو ئالی ئیبراهیمو ئالی عیمرانی بەسەر جیهانییاندا هەڵبژاردوون، گوڵبژێری کردوون ئەوەش لە لایەکەوە زەمینە خۆشکردنە بۆ بەسەرهاتی مەریەمو لە دایك بوونی عیسا، وە بەسەرهاتی یەحیا کە هەردووکیان بەشێوەی نائاسایی لەدایك بوونە، وە لەلایەکی دیکەشەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەگەر خوای کاربەجێ موحەممەدی هەڵبژاردوە، شتێکی سەرسوورهێنەر نیە، شتێکی بێ پێشینە نیە، چونکە لە پێش موحەممەدیشدا ﷺ خوا پێغەمبەرانی دیکەی وەك: ئادەمو نووحو ئالی ئیبراهیمو ئالی عیمرانی هەڵبژاردوون، کەواتە: موحەممەدیش ﷺ ئەڵقەیەکە لەو زنجیرە پیاوە بەرێزو بەپێزو ناوازانەی خوا هەڵیبژاردوون، کە پێغەمبەرانن، دەفەرموێ: بێگومان خوا ئادەمو نووحی هەڵبژاردوون، هەروەها ئالی ئیبراهیم، واتە: نیزیکانو شوێنکەوتووانی ئیبراهیم، جا چ خزمی بن یان بێگانە، وە ئالی عیمران، واتە: نیزیکانو شوێنکەوتووانی عیمران، ئەوانیش بەهەمان شێوە، چ خزمیان بن، چ بێگانە، بەسەر هەموو جیهانییاندا هەڵیبژاردوون، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ ﴾، ئەوانە هەندێکیان وەچەی هەندێکیانن، دیارە هەموویان دەچنەوە سەر ئادەم، وە پاشان ئیبراهیمو ئالی ئیبراهیم، وە عیمرانو ئالی عیمران ئەوانە دەچنەوە سەر نووح، ئەوانە هەندێکیان وەچەی هەندێکیانن، واتە: لە رووی رەچەڵەكو نەسەبەوە، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ، کە هەندێکیان وەك هەندێکیان دەچن لە رووی عەقیدەو دینداریی‌و چاکەکارییەوە ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا بیسەری زانایە، واتە: قسەی بەندەکانی دەبیستێ، پاڕانەوەکانیان دەبیستێ، وە پێشیان زاناو ئاگادارە ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ﴾، یادبکەوە کاتێك هاوسەری عیمران گوتی: پەروەردگارم! من ئەوەی لە زگم دایە نەزرم کردوە بۆ تۆ بە ساغیی، واتە: کە

بۆ هیچ شتێکی دیکە بەکارنەیەتو تەنیا بە طاعەتی تۆوە سەرگەرمبێ، یاخود تەنیا بە خزمەتکردنی ئەو پەرستگایەوە، کە خوای تیادا دەپەرسترێ، سەرگەرمبێ، دەجا: لێم قبووڵبکەو لێم وەربگرە ﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، بێگومان هەرتۆی بیسەری زانا، دیارە خێزانی عیمران کە دوایی باسی دەکەین، هەندێك دەڵێن: ناوی (حیمنە) بووە، دوای ئەوەی کە دەزانی زگی هەیە، ئەو زگەی خۆی نەزر دەکات بۆ خوای پەروەردگار، دیارە ئەوکاتە عادەت وابووە، ئەوانەی خزمەتی پەرستگایان کردوە، پیاو بوون، وەك چۆن ئێستاش ئەوانەی کە (خادم)ن و خزمەتی مزگەوت دەکەن، یان بانگ دەدەن، پیاون، لەبەرئەوەی ئافرەت جاری وا هەیە حاڵەتی نەخۆشیی و کەوتنە حەیزو منداڵ بوون و ئەوانەی بەسەر دادێت، دادەبڕێ لە خزمەتکردنی مزگەوت، دیارە وایزانیوە یاخود ئومێدی وابووە، کە زگەکەی کوڕ بێت ﴿ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ ﴾، جا کاتێك زگەکەی دانا، کۆرپەکەی بوو، گوتی: پەروەردگارم ! من مێینەم دانا ! لەم قسەیەدا وا دەخوێنرێتەوە بە جۆرێك دڵ نارەحەتیی و بە جۆرێك لە خەمناکییەوە قسەکەی کردبێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ ﴾، واتە: خوا دەزانێ چی داناوە، یانی: بەڵێ مێینەیە، بەڵام مێینەیەکە نەك وەك مێینەکانی دیکە، مێینەیەکە زۆر نێرینەش وەك وی نابن، خوا دەزانێ چی داناوەو چ جۆرە مێینەیەکە؟! چونکە ئەو ئافرەتە ئەو زگەی خۆی نەزری خوای پەروەردگار کردوە ئەویش کردوویەتی بە مێینە، بەڵام مێینەکی ناوازەو هەڵبژێردراو بەسەر هەموو ئافرەتانی دنیادا ﴿ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰ ﴾، ئەوە قسەی دایکی مەریەمە، دەڵێ: نێرینەش وەك مێینە نیە، واتە: نێرینەو مێینە وەك یەك نین بۆ ئەو کارەی کە ئەو مەبەستی بووە، وە ئەو ئامانجەی کە ئەو کۆرپەکەی بۆ نەزر کردبوو، کە بریتی بووە لە خزمەتکردنی ماڵی خوا، پەرستگا ﴿ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ ﴾، وە من ناوم لێنا مەریەم، مەریەم لە زمانی عیبریدا واتە: خواپەرست (عابدة)، ﴿ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾،

وە من ئەی خوایە! پەنای پێ بە تۆ دەگرم خۆی و وەچەکەی لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەو بەزەیی تۆ، واتە: هەر لە ئێستا ڕا خوایە ئەوە خستمە پەنای تۆوە، تۆ چەپاڵەی بدە، خۆی و ئەو وەچەیەی کە لێی پەیدادەبێ، لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خۆت چەپاڵەی بدەو بیپارێزە ﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ ﴾، پەروەردگاری بە وەرگرتنێکی زۆر باش لێی وەرگرتو چاکی لێ قبووڵکرد، خوای زاناو شارەزا بەپێی نیەت کردەوەکانی ئینسان قبووڵ دەکات، هەرکەسێك نیەتی باشتربێ خوا کردەوەکەی باشتر لێ قبووڵ دەکات، دیارە ئەو ئافرەتەش، خێزانی عیمران زۆر لە دڵێکی ساغەوە زۆر بە نیەتێکی باشەوە، ئەو کۆرپەیەی نەزری خوا کردوە، کە خزمەتی دینی خوا بکات، وە خزمەتی ماڵی خوا بکات، بۆیە خوای پەروەردگاریش لەقەدەر نیەتی خۆی کردەوەکەی لێ وەرگرت ﴿ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا ﴾، وە خوا باشی پێگەیاند، لێرەدا توێژەرەوانی قورئان هەندێکیان گوتوویانە: یەك ڕۆژەی دوو ڕۆژەی بووە، واتە: بە ساڵێك بە قەدەر دوو ساڵی منداڵێکی دیکە هەراش بووەو گەشەی کردوە، هەندێکیشیان گوتوویانە: لە ڕووی مەعنەوییەوە بووە، بەڵام لە ڕاستیدا هەردووکی دەگرێتەوە، یانی لە هەردوو ڕووەوە خوای پەروەردگار ئەو کۆرپەیەی پێگەیاندو چاکی پێگەیاند، هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە خوای بە بەزەیی لەسەر سیفەتو ڕەوشتی جوان سروشتاند بووی و فیطرەتەکەی فیطرەتەتێکی چاكو پاك بوو، وە هەم لە ڕووی جەستەییشەوە، خوای کاربەجێ قەدو قیافەیەکی جوانو جەستەیەکی بەهێزی پێدابوو، هەمووی دەگرێتەوە ﴿ وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ﴾، وە خوا ﷻ بە زەکەرییای سپارد، دوای باسی دەکەین کە چۆن مەریەم دەکەوێتە دەستی زەکەرییا، کە زەکەرییا مێردی خوشکی دایکی مەریەمە (مێردی پلکیەتی)، واتە: (حیمنە) خێزانی عیمرانو هاوسەری زەکەرییا خوشك بوون، مانای وایە مەریەم دەکەوێتە لای زەکەرییا کە مێردی پلکیەتی، خوا دەفەرموێ: خوا بەخێوکردنو سەرپەرشتیکردنی مەریەمی بە زەکەرییا سپارد،

زەکەرییاش ﷺ پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوایە، ئنجا خوا ﷻ بۆمان باسی هەندێ کەرامەتو ڕێزو حورمەتی مەریەم دەکات، لەلای خوا ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ﴾، هەرکاتێك زەکەریيا دەچوو بۆ ئەو میحرابە کە مەریەمی تێدابوو، (میحراب) واتە: ژوورێکی تایبەت لە مزگەوت، یاخود پێشەوەی مزگەوت، وە کە ئێستا میحراب دروست کراوە، مەرج نییە ئەو کات وا بووبێ، هەرکات زەکەریيا دەچووە لای مەریەم کە مەریەم لە میحرابەکەدا خواپەرستیی دەکرد ﴿وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا﴾، ڕزقو ڕۆزییەکی تایبەتی لای مەریەم دەبینی، هی دنیا نەبوو، یاخود هی بەشەران نەبوو، لە لایەنی خەڵکی دنیاوە بۆی ئامادە نەکرابوو، زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: ئەوە میوە بووە، کە لە زستاندا میوەی هاوینەی لەلا دەبوو، وە لە هاویندا میوەی زستانەی لەلا دەبوو، واتە: شتێکی لەلا دەبوو، کە لەو وڵاتەدا نەبووە، ﴿قَالَ يَـٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَـٰذَا﴾، گوتی: ئەی مەریەم ! ئەمەت لە کوێ بووە، ئەو ڕزقو ڕۆزییە، ئەو میوەیەو ئەو بژیوەت لەکوێ بووە؟! ﴿قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾، گوتی: ئەوە لەلایەن خواوەیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾، بێگومان خوا ڕۆزی بە هەرکەسێك دەدات کە بیەوێ بەبێ ژماردن، واتە: بێ ئەوەی کە سنوورێکی هەبێ، وە بەبێ ئەوە کە هۆکارێکی دیاریکراویشی هەبێ، ئەگەر خوا بیەوێ بەبێ هۆکاریش شت دەخولقێنێو دەرەخسێنێ ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ﴾، لێرەدا کە مەریەم بەو شێوەیە ڕزقو ڕۆزیی بێ ئەوەی کە لەکاتی خۆیدا بێو، بێ ئەوەی دەستی کەسی تێدابێ، لەلای مەریەم دەیبینێ، ئەوە وا دەکات کە زەکەریيا بە تەماع بکەوێ، هەرچەندە زۆر کەوتۆتە تەمەنەوەو پیربووە، وە خێزانەکەشی نەزۆکەو منداڵی نەبووە، دیارە بە تەماع دەکەوێو دەڵێ: خوایەك بتوانێ بە ناوەخت میوە، یان جۆرە ڕزقێکی تایبەت بەو ئافرەتە بدات، ئاسانە لەلای ئەو منداڵێکیش بە من بدات ! لەوکاتەدا زەکەریيا لە پەروەردگاری پاڕایەوە:

﴿قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾، گوتی: پەروەردگارم ! لە لایەن خۆتەوە وەچەیەكی پاكو چاكم پێببەخشە، بێگومان تۆ بیسەری پاڕانەوەی، واتە: پاڕایەوە لە خوای بەخشەر كە منداڵێكی صاڵحی پێ بدات ﴿فَنَادَتۡهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٞ يُصَلِّي فِي ٱلۡمِحۡرَابِ﴾، فریشتەكان بانگیان كرد لە حاڵێكدا كە ئەویش لە میحرابدا ڕاوەستابوو نوێژی دەكرد، طاعەتو بەندایەتیی بۆ خوای بەرزو مەزن دەكرد، ئنجا مەرج نیە نوێژەكەی وەك نوێژی ئێمە بووبێ! وشەی (صلاة) بە مانای پاڕانەوە دێ، وە بە مانای پەرستشو بەندایەتیی بۆ خواش دێ، كە دەگونجێ لە شەریعەتێكەوە بۆ شەریعەتێكی دیكە بگۆڕێ، جا لێرەدا زەكەریيا لە خوا دەپاڕێتەوە كە منداڵی پێبدات، بەڵام لە سەرەتای سووڕەتی (مەریەم)دا بە تەفصیل باسی كردوە، دیارە لەوێ دەپاڕێتەوە، وە داواش دەكات كە نێرینە بێ، دەڵێ: ﴿فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ٦﴾مریم، واتە: (خوایە منداڵێكم پێببەخشە كوڕ بێت، بۆ ئەوەی میراتی منو میراتی ئالی یەعقووبیش بگرێ، (واتە: میراتی دینیی، ڕێبازی ئێمە بپارێزێ))، وە خوایە وای لێبكە جێگەی ڕەزامەندیی تۆ بێو تۆ لێی ڕازی بی، لەوێ بە تەفصیل باس دەكات، جا دەفەرموێ: فریشتەكان بانگیان كرد لەكاتێكدا كە لە میحرابدا دەپاڕایەوە، وە خواپەرستی دەكرد ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحۡيَىٰ﴾، كە خوا موژدەت پێ دەدات بە یەحیا، واتە: ناوەكەشی هەر لەلایەن خواوە نراوە ﴿مُصَدِّقَۢا بِكَلِمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، وشەیەك كە لە خواوە دێ بەڕاستی دەزانێ، مەبەست لە وشەیەك لە خواوە دێ واتە: كتێبو پەیامی خوا یاخود مەبەست پێی عیسایە ﷺ یانی: یەحیا بڕوا دێنێت بە پێغەمبەرایەتیی عیسا ﷺ كە هەردووكیشیان كوڕە پلكی یەكدینو دایكیان خوشكن، بۆیەش ناو لە عیسا نراوە (كلمة) چونكە بە وشەی خوا ﷻ دروست بووە، بەبێ ئەوەی كە ئافرەتو پیاوێك بە یەكدی

گەیشتبنو ئەویان لێ پەیدا بووبێ، عیسا دیارە کە بابی نەبووە ﴿ وَسَيِّدًا ﴾، وە ئەو یەحیایە پیاوێکی سەروەرو بەڕێز دەبێ لەنێو گەلی خۆیدا، وە سیفەتی وای دەبن کە بیکەنە برا گەورەو سەروەر ﴿ وَحَصُورًا ﴾، وە لە ڕووی ڕەوشتەوە خۆپارێز دەبێ بەرانبەر بە ئافرەتان بە ئیرادەی خۆی، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: نەیتوانیوە بچێتە لای ئافرەتان! کە لە ڕاستییدا ئەوە مەدح نیە، ئەو زەممە، پیاوێك کە نەتوانێ لەگەڵ ئافرەتان دا جووت بێ، واتە: هێزی جینسیی نەبێ، ئەوە بە مەدح دانانرێ، بەڵکو بە زەم دادەنرێ، بۆیە ئەو تەفسیرە ڕاست نیەو، ئەوەیان ڕاستە کە خۆپارێز بووە لە ئافرەتان، لە حاڵێکدا کە پیاوێکی تێرو تەواو بووە، لایەنی جینسیی هیچ کەمو کوڕیی نەبووە، بەڵام لەبەر خوا خۆی پاراستووەو ئارەزووی خۆی گرتۆتەوە، کە دیارە لە شەریعەتی ئەواندا وابووەو، شتێکی پەسند بووە پیاو ژن نەهێنێ، یاخود تایبەتمەندیی یەحیا ﷺ، وای خواستوە کە هاوسەرگیریی نەکات ﴿ وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾، وە پێغەمبەرێك دەبێ لە چاکەکاران، لە چاکان، ﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَـٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِىَ ٱلْكِبَرُ ﴾، گوتی: پەروەردگارم ! جا چۆن کوڕم دەبێ، کوڕم لە کوێ پەیدادەبێ لە حاڵێکدا کە پیریيم گەیشتۆتێ، وەك بڵێی پیریی شتێك بێ بە دوای ئینسان بکەوێ ﴿ وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ ﴾، ئافرەتەکەشم نەزۆکە، تا ئێستا منداڵی نەبووە، تەمەنێکی زۆرمان پێکەوە گوزەراندوە ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴾، (خوا) فەرمووی: (یاخود فریشتەکە فەرمووی) ئا بەو شێوەیە هەر شتێ خوا بیەوێ دەیکات، هەر شتێك ویستی لەسەربێ ئەنجامی دەدات، دەتوانێ لە پیاوی بە تەمەنو بەساڵدا چووو ئافرەتی نەزۆك، منداڵ پەیدا بکات، وە جاری واش هەیە پیاوەکەو ئافرەتەکە گەنجیشن، منداڵیشیان لێ پەیدا نابێ، ﴿ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً ﴾، (زەکەریيا) گوتی: پەروەردگارم ! نیشانەیەکم پێ بڵێ، بۆ ئەوەی بزانم کەی خێزانەکەم کۆرپەی لە زگدا پەیدادەبێو

تاكو دڵی پێ خۆش بێ، ﴿ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا ﴾، گوتی: نیشانەكەت ئەوەیە كە سێ ڕۆژان مەگەر بە ئاماژەو هێما، ئەگەرنا قسەت بۆ لەگەڵ خەڵكی ناكرێ، بێ ئەوەی نەخۆش بی، زمانت دەبەسترێو قسەت بۆ ناكرێ، چونكە ئەگەر بۆخۆی قسە نەكات بە نیشانە دانانرێ، بەڵام ئەوە كاتێك نیشانەو موعجیزەیە ساغ بێتو بۆخۆی بیەوێ قسە بكات، بەڵام نەتوانێو قسەی بۆ نەكرێ، لەخۆڕا زمانی ببەسترێ ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴾، وە زۆر یادی پەروەردگاری خۆت بكەو بە پاكیی بگرە، ئێواران و بەیانیان.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، واتە: بێگومان خوا ئادەمو نووحو ئالی ئیبراهیمو ئالی عیمرانی بەسەر جیهانییاندا هەڵبژاردوون، دیارە هەڵبژاردنی خوا بەگۆترە نیە، بۆچی؟ چونكە یەكێك لە سیفەتەكانی خوا بریتیە لەوە كە كاربەجێ (حكیم)ە، واتە خوا كاری نابەجێ ناكات، لە خۆڕا كەس هەڵنابژێرێ، وە لەخۆڕا شتێك بە كەس نادات، جا مەرج نیە هەركەسێك شتێكی پێدرا لە لای خوا خۆشەویست بێ، بەتایبەتی سەروەتو سامانو دەسەڵاتو ئەوانە ... هتد، یاخود زانیاری، جاری وا هەیە خوای پەروەردگار وا دەكات مرۆڤ زانیاریشی پێ بدرێت، بەڵام مەرج نیە لای خوای كاربەجێ پەسند بێت، بەڵكو بۆ تاقیكردنەوەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هیچ شتێكی خوا بێ حیكمەت نیەو بێجێ نیە، وەك لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٢٤)دا دەفەرموێ: ﴿ ... ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ... ﴾، واتە: خوا بەوە زاناترە پەیامی خۆی لەكوێ دادەنێ، هاوبەش پەرستەكانی مەككە ڕەخنەیان

دەگرت لە پـێغەمبەر ﷺ دەیانگـوت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾الزخرف، واتـە: دەبووایـە ئـەم قورئـانە بـۆ لای یەکێـك لـە دوو پیـاوە گەورەکـەی دوو شـارەکە (طـائفو مەککـە) هاتبایـە خـوار، کـە مەبەستیان (الولید بن الـمغیرة و عروة بـن مـسعود الثقفـي)[1] بـووە، خـوا لـە وەڵامی ئەوەدا دەفـەرموێ: ﴿ ... ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ...﴿١٢٤﴾ ﴾الأنعام، واتە: خـوا بـەوە زاناترە پەیامی خۆی لە کوێ دادەنێو بە کـێ دەدا، مـەرج نیـە ئەوەی لەلای ئێـوە گـەورە بـوو لـەلای خـوای بـەرز گەورەبـێ ! لای خـوا کەسـێ گەورەیـە لـە ڕووی مەعنـەوویو ڕووحییـەوە گەورەبـێ، لـە ڕووی ئیمانـەوە گەورەبـێو مەعدەنەکـەی چـاك بـێو سـیفەتەکانی بـەرزبن، ئـەوە لای خـوا گەورەیە، تەرازووی خوا لەگەڵ هی خەڵکی جیایە .

<u>مەسـەلـەی دووەم:</u> کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا ﴾، واتە: ژنی عیمـڕان (خـوا لـێیان ڕازی بێ)، وەك لە تەفسیـرەکاندا هـاتوە، ناوی (حمنـة) بووە، ئەو ئافرەتە کە خێزانی عیمـڕانە، دیارە ئافرەتێکـی صـاڵحو خـواناسو خـواپەرست بـووە، حـەزی کـردوە منـداڵێکی ببـێ تـەرخانی بکـات بـۆ دینـی خـوا بـۆ خزمـەتکردنی پەرسـتگا، خزمەتکـردنی مـاڵی خـوا، ئیـدی ئومێدیشی وا دەبێت ئەو منداڵەی نێرینە بێـت، بۆ ئەوەی خزمەتی ماڵی خوا بکات، بەڵام وەك باسـمان کـرد کچی دەبـێ، پـێشـتـریش پـێناسـەی وشـەی: (نَـذْر)مـان کـرد، ئـەویش ئەوەیـە کـە شـتێك لەسـەر خـۆت پـێویـست بکـەی، کـە شـەریعەت پێویستی نەکردبێ، بەڵام بۆخۆت لەسـەر خـۆتی پێویـست بکـەی بـۆ ئەوەی خـوا شتێکت بـۆ بکـات بـە بـاری خێـردا، یـاخود شـتێکت لـێ لابـدات بـە بـاری شـەڕو خراپـەدا، کـە ئـەوە دروسـتە، پێغەمبـەر ﷺ دەربـارەی (نَـذْر) فەرموویـەتی: {مَـنْ نَـذَرَ أَنْ يُطِيـعَ اللَّـهَ فَلْيُطِعْـهُ، وَمَـنْ نَـذَرَ أَنْ يَعْـصِيَ اللَّـهَ فَـلاَ

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص: (١٢٤٤، ١٢٤٥).

يَعْصِهِ} (رَوَاهُ مَالِك برقم: (١٠٥٥)، وأَحْمَدُ برقم: (٢٤١٢١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٦٩٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٨١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٢٦) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٨٠٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢١٢٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٣٨٩)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، واتە: هەرکەسێك لەسەر خۆی نەزر کرد کە فەرمانبەریی بۆ خوا بکات، با فەرمانبەریی بۆ خوا بکات، بەڵام هەر کەسێك شتێکی لەسەر خۆی نەزر کرد کە سەرپێچیی بوو، با سەرپێچیی نەکات، واتە: شتی خراپ لەسەر خۆی نەزر نەکات، ئەگەر کردی تۆبەی لێ بکاتو بڵێ: خوایە جارێکی دی شتێکی وا ناڵێم، بۆیە ئەگەر لەسەر خۆت نەزر کرد قسە لەگەڵ برات، لەگەڵ خزمەت نەکەی، ئەوە پچڕاندای صیلەی ڕەحمەو نابێ پێوەی پابەندبیو دەبێ تۆبەی لێبکەی، وە (إبن العربي) لە (أحكام القُرآن)دا دەربارەی پێناسەی (نَذْر) دەڵێ: (النَّذْر: وَهُوَ الْتِزَامُ الْفِعْلِ بِالْقَوْلِ مِمَّا يَكُونُ طَاعَةً لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، مِنْ الأَعْمَالِ قُرْبَةً)، واتە: نەزر بریتیە لەوەی کە بە قسەی خۆت، خۆت پابەند بکەی بە کردەوەیەکەوە، لەو کردەوانەی کە فەرمانبەریین بۆ خوای بەرزو خاوەن شکۆ، بە مەبەستی لە خوا نیزیك کەوتنەوە، کەواتە: ئەگەر کەسێك شتێکی لەسەر خۆی نەزر کرد کە طاعەت نەبوو، بە نەزر لەقەڵەم نادرێو مرۆڤ پابەند ناکات.

<u>**مەسەلەی سێیەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ﴾، بەپێی ڕواڵەتی سیاقەکە با دەبوو گوترابا: (وَلَيْسَ الأُنْثَى كَالذَكَر) مێینە وەك نێرینە نیە، چونکە ئەو پێی خۆش بوو نێرینەی ببێ، کوڕی ببێ، کەچی ئێستا کچی بووە، بەڵام ئایەتەکە ئاوا هاتوە، ئنجا توێژەرەوان لەوبارەوە زۆریان قسەکردوە، گرنگ ئەوەیە لێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو نێرینەیەك وەك ئەو مێینە نیەو نابێ، واتە: وەنەبێ هەموو کوڕێکیش وەك ئەو کچە بێ، ئەو کچە کچێکی ناوازەیەو کچێکی شایستەو هەڵکەوتوە، هەموو نێرینەیەك وەك ئەو نابێ، هەڵبەتە وەك یەك نەبوونی کوڕو کچ، واتە: لە سروشتو پێکهاتەیاندا، بەڵام لە ڕێزو حورمەتیاندا لە بەندایەتییاندا بۆ

خوا، لە مرۆڤبوونیاندا، وەك یەكن، بەلاَم ئایا لە سروشتیانداو لە پێكهاتەی نەفسییو جەستەییاندا وەك یەكن؟! بەدلنیایی نەخێر، ئیدی هەرچەندە ئێستا بانگەشەكەرانی یەكسانكردنی پیاوانو ئافرەتان زۆر قسە دەكەن، بەلاَم هەمووی بایی فلسێكە، چونكە خوا ئافرەتی بە مێ دروستكردووەو، مێینایەتیی ئافرەتیش كاریگەریی دادەنێ لەسەر باری دەروونیی، لەسەر عەقلی، لەسەر جەستەی، لەسەر هەلسوكەوتەكانی، هەروەك خوای زاناو شارەزا پیاوی بە نێر دروستكردووەو نێرینایەتیی پیاویش كاریگەریی دەبێ لەسەر باری دەروونیی، لەسەر عەقلی، لەسەر جەستەی لەسەر هەلسوكەوتەكانی، هەر بۆیە شەریعەت كۆمەلێك ئەركی وەك یەكی بۆ پیاوو ئافرەت داناوە، بەلاَم كۆمەلێك ئەركی تایبەتیشی بۆ هەریەكیان داناوە، بۆ وێنە:

١- پیاو سەرپەرشتیاری خێزانە ﴿ ... ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ...﴿٣٤﴾ ﴾ النساء.

٢- پیاو دەبێ رزقو بژیوی خێزانو مندالەكانی پەیدابكات ﴿ ... وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ ...﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة.

٣- دابینكردنی جێگەو رێگا لەسەر پیاوە، ﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ...﴿٦﴾ ﴾ الطلاق، بەلاَم ئافرەت دایكە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ ...﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة، وە دایكان شیر بە مندالەكانیان دەدەن، وە ئافرەت مندال بەخێوی دەكات.

بە كورتی: كۆمەلێك ئەرك مێینایەتیی ئافرەت دەیانخوازێو، كۆمەلێك ئەرك نێرینایەتی پیاو دەیانخوازێ، وە كۆمەلێك ئەركیش مرۆڤبوونی پیاوو ئافرەت دەیانخوازن، وەك یەك[1].

---

١) لەوبارەوە واباشە سەرنجی كتێبی (ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەت دا) بدرێ، بەشی یەكەم: دەروازەیەكی گشتی.

**مەسەلەی چوارەم:** ﴿ وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ ﴾، وە من ناوم لێنا مەریەم، ئەم ڕستە قورئانییە ئەوە دەگەیەنێ کە پێویستە ئینسان ناوی باش لە منداڵی خۆی بنێ، دەڵێن: لە زمانی عیبریدا مەریەم بە مانای خواپەرست (عابدة) دێت، ئینسان دەبێ ناوی باش لە منداڵی بنێ، چ کچ بێ، چ کوڕ، ناوێکی وا کە لەنێو خەڵک پێی ناخۆش نەبێ، پێی شەرم نەبێ، بەڵکو ناوێکی شیرین بێ، ئیدی بە هەر زمانێك بێ، شەریعەت دیاری نەکردوە، وە ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە دروستە لە شەوو ڕۆژی لەدایك بووندا منداڵ ناوبنرێ، هەر لەو ڕۆژەدا کە منداڵ تێیدا لەدایك دەبێ، یان لەو شەوەدا کە تێیدا لەدایك دەبێ دروستە ناوبنرێ[1]، وە ئەوە کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، حەوتەی بچێ و گۆزەبانە (العَقِيقَة)ی بۆ بکرێ، ئەوجار ناوبنرێ، ئەوەش حاڵەتێکە، بەڵام دروستیشە لەو شەوو ڕۆژەی تێیدا لەدایك بووە ناوبنرێ، بە بەڵگەی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ وێڕای ئایەتەکە، چونکە زانایان کێشەیان هەیە، کە ئایا (شَرعٌ مِنْ قَبْلِنا شَرعُ لَنَا أَو لَيس شَرعاً لنا؟) واتە: ئایا بەرنامەی پێغەمبەرانی پێشوو، بۆ ئێمە بەرنامەیە، یان بەرنامە نیە؟ ئەوە مشتومڕی زۆری لەسەرە، بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە بەرنامەی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ ئێمە بەرنامەیە، مەگەر لە شەریعەتی ئێمەدا نەسخ کرابێتەوەو هەڵوەشێنرابێتەوە، بۆچی خوای پەروەردگار بەسەرهاتی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ ئێمە باس دەکات؟ بێگومان تاکو شوێنیان بکەوین، کەواتە: بەرنامەی ئەوان بەرنامەشە بۆ ئێمە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْۗ ... ﴿٩٠﴾ ﴾الأنعام، واتە: ئەوانە پێغەمبەرانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، تۆش بەدوای ڕێنمایی ئەوان بکەوە، هەڵبەتە مەرج نیە لە هەموو وردو درشتێك دا، بەڵام بەگشتی، فەرموودەی پێغەمبەر ﷺیش لەوبارەوە هەیە: {عَنْ أَنَسِ بْنِ
مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وُلِدَ لَنَا اللَّيْلَةَ غُلَامٌ فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِي

١) بڕوانە کتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا) بدڕی بەشی شەشەم: مافی ڕۆڵە لەسەر باب و دایکیان و مافی باب و دایکیان لەسەر ڕۆڵەکانیان.

قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وُلِدَ لنا اللَّيْلَةَ، غُلاَمٌ فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِي إِبْرَاهِيمَ} (رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (١٣٠٣٧)، وَالبُخَارِي برقم: (١٣٠٣)، ومُسْلِم برقم: (٥٩٧٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣١٢٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٩٠٢)، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم شەو منداڵێکمان بووە، بە ناوی بابم (ئیبراهیم)م کردۆتەوە، واتە: ئەو شەوە کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ کە لە مارییەی (قِبْطِي) لەدایك بووە، هەر ئەو شەوە ناوی لێناوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دایکی مەریەم دەڵێ: ﴿ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، وە من ئەی خوایە! پەنای پێ بە تۆ دەگرم خۆی و وەچەکەی لە شەیتانی دوورخراوە (لە ڕەحمەو بەزەیی تۆ)، ئەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە، کە لە بەرەکەتی ئەو دوعایەو بەرەکەتی ئەو پەنا پێ بە خوا گرتنە، شەیتان نەیتوانیوە زیان بە مەریەمو بە (عیسا)ش بگەیەنێ، وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاّ الشَّيْطَانُ يَمَسُّهُ حِينَ يُولَدُ، فَيَسْتَهِلُّ صَارِخًا مِنْ مَسَّةِ الشَّيْطَانِ إِيَّاهُ، إِلاّ مَرْيَمَ وَابْنَهَا ثُمَّ يَقُولُ: أَبُو هُرَيْرَةَ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾} رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٧٦٩٤)، والبُخَارِيُّ برقم: (٤٥٤٨)، وَمُسْلِم برقم: (٦٠٨٦)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ - دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ منداڵێ نییە کە لەدایك دەبێ، مەگەر شەیتان دەستێکی دەگەیەنێتێ، ئەو منداڵە قیژەیەکی لێ بەرز دەبێتەوە، لە ئەنجامی ئەو دەستگەیاندنەی شەیتاندا، جگە لە مەریەمو کوڕەکەی شەیتان نەیتوانیوە دەستیان بگەیەنێتێ، پاشان ئەبو هورەیرە دەڵێ: ئەگەر دەتانەوێ ئەو ئایەتە بخوێننەوە: ﴿ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ﴾، هەڵبەتە خوێنراویشەوە (وكَفَلَهَا زَكَرِيَّا)، واتە: بەبێ شەددە، کە ئەگەر بخوێنرێتەوە (كَفَلَهَا زَكَرِيَّا) واتە: زەکەریبا لە ئەستۆی خۆی گرت، بەڵام ئەگەر بخوێنرێتەوە (كَفَّلَهَا زَكَرِيَّا) ئەو کاتە (فعل)ەکە، دەبێتە (متعدي)، واتە: خوای پەروەردگار زەکەریبای کردە کەفیلی مەریەمو سەرپەرشتیاریی مەریەمی بەو سپارد، ئنجا خوای کاربەجێ چۆنیەتی ئەو بە ئەستۆوە گرتنو بەخێوکردنەی مەریەم لەلایەن زەکەریباوە، هەر لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (٤٤)دا بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾، واتە: ئەوە لە هەواڵەکانی نادیارە کە بۆ تۆی دەنێرین (ئەی موحەممەد ﷺ) وە تۆ لە لایان نەبووی کە قەڵەمەکانیان فڕێدا پشکیان لێکرد (قورعەیان بۆ ڕاکێشا) داخۆ کامیان مەریەم وەئەستۆ بگرن، (چونکە هەموویان خوازیار بوونو هەر یەکەیان حەزی دەکرد مەریەم لەلای خۆی بێت، لەبەر ئەوەی عیمران گەورەی دینیان بوو، زانایان بوو) وە تۆ لەلایان نەبووی کە کەوتنە ناکۆکییەوە، هەرکامێکیان پێی خۆش بوو مەریەم لەلای ئەو بێتو بەخێوی بکاتو سەرپەرشتیی بکات، واتە: زەکەریبا لە ئەنجامی قورعەکێشاندا کە خوای زانا ویستی وابوو، بوو بە سەرپەرشتیاری مەریەم.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ﴾، هەرکاتێك زەکەریبا دەچوو بۆ ئەو میحرابە کە مەریەمی تێدابوو، ڕزقو ڕۆزییەکی تایبەتی لای مەریەم دەبینی، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە دۆستانی خوا کەرامەتیان هەیە، وە شتی نا ئاساییان بۆ ڕوودەدات، بەڵام بەدڵنیاییی گەورەترین کەرامەت بریتییە لە ڕەوەستانو دامەزراویی (الإستقامة) لەسەر شەریعەت، وەك زانایان فەرموویانە: (أَفْضَلُ الكَرَامَةَ

الإِسـتِقَامَةَ عَلَـى الـشَرِيعَةَ) ڕاوەسـتانو پابەنـدبوون بـە شـەریعەت ئـەوە گـەورەترین کەرامەتـە، کەرامـەت واتـە: ڕێزگرتنـی خـوا لـە بەنـدەی خـۆی، گەورەترین ڕێـزێك کە خـوا لـە بەنـدەی خـۆی بگرێ، ئەوەیـە کـە وای لـێبکـات لەسەر بەرنـامەو شـەریعەتی خـوا لانـەدات[١].

**مەسـەلەی هەشـتەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، زەکـەریيا لێـی دەپرسـێ: ئـەو ڕزقو ڕۆزییـەت لـەکوێ بـۆ دێ؟! ئەویـش دەڵـێ: لەلایـەن خـواوەیـە، کەواتە: لەکاتی پـێویـستیدا دروستە کەرامەت وەك خـۆی باسبکـرێ، مادام پـێویست بکات، بەڵام نـەك بـۆ خۆهەڵکێشـان !! بـەڵکو تـەنیا بـۆ بـەیانی حەقیقـەت، هـیچ ناشـەرعییەکـی تێـدا نیـە کـە باسـبکرێ، بەبـێ زۆر هەڵکۆڵینو وەك خـۆی.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مُصَدِّقَۢا بِكَلِمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدٗا وَحَصُورٗا وَنَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، هەرچـەندە پـێـشتـریش تەفسـیرمان کـرد، واتـە: یـەحیا کـە وشـەیەك لـە لایـەن خـواوە دێ بەڕاسـتی دەزانـێ، دەگونجـێ وشـەکە مەبەسـت پـێی بەرنامەی خـواو کـتێبی خـوا بـێ، دەشگونجـێ مەبەست پـێی عیسا بێـت، وشـەی (سـید)یش واتـە: سـەرۆكو بـەڕێزو سـەروەر، وە وشـەی (حـصور)یـش واتـە: خـۆ دوورگـر لـە ئافرەتـان، نـەك لەبـەر بـێتوانایی کـە ئەگـەر لەبـەر بـێتوانایی بـێ، ئـەوە شـتێك نیـە کـە خـوا مـەدحی یەحیـای پـێ بکات، بـەڵکو لەبەر زێدە خۆپـارێزیی وابـووە، چونکە نـەتوانین (عَـجْز) شـتێك نیـە مرۆڤـی پـێ ستایش بکـرێ.

**مەسـەلەی دەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَقَدۡ بَلَغَنِيَ ٱلۡكِبَرُ وَٱمۡرَأَتِي عَاقِرٞۖ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ﴾، ئـەوەی لـێ

١) لە کتێبی: (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)دا بە درێژیی باسی ئەم مەسەلەیەمان کـردوە، بڕوانە: چاپی پێنجەم.

وەردەگیرێ كە خوا ﷻ بەپێی یاساكانی كارەكانی خۆی دەكاو كاروباری بوونەوەر بەڕێوە دەبات، بەڵام خوا مەحكوومی یاساكانی خۆی نیە، واتە: دەتوانێ یاساكان لاببات، یاسای خوا وایە مندالْ لە دایكو باوكێكی گەنج پەیدابن، لە پیاوی پیرو ئافرەتی نەزۆك مندالْ پەیدا نابێ، یاسای خوا وا بووە، بەڵام خوا دەتوانێ ئەم یاسایە هەڵبوەشێنێتەوە بە یاسایەكی دیكە كە ئێمە نایزانین، وە یاسای خوا وایە كە مندالْ لە دایكو باب پەیدابێ، بەڵام دەتوانێ ئەو یاسایە هەڵوەشێنێتەوە بە یاسایەكی دیكەو بەبێ باب مندالْ لەدایك بێ، وەك عیسا ﷺ بەڵكو بەبێ بابو دایك وەك: ئادەم عليه السلام، كە دوایی باسی دەكەین.

**مەسەلەی یازدەیەم:** كە زەكەرییا داوای نیشانەیەك دەكات، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَـٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا ﴾، گوتی: نیشانەكەت ئەوەیە كە سێ ڕۆژان، مەگەر بە ئاماژەو هێما ئەگەرنا قسەت بۆ لەگەڵ خەڵكی ناكرێ، حیكمەتەكەی ئەوەیە كە جاری وا هەیە هۆكارە ڕواڵەتییەكان نینو شت پەیدادەبێ، جاری واش هەیە هۆكارەكان هەن، كەچی شت پەیدانابێ! لە لایەكەوە بۆچی یەحیا بابی پیرەو دایكی نەزۆكە، كەچی یەحیا لەدایك دەبێ، لەو لاشەوە زەكەرییا ساغو سەلامەتە كەچی قسەی بۆ ناكرێ؟! لەلایەكەوە هۆكارەكان هەنو ئەنجام نیە، لە لایەكی دیكەشەوە هۆكارنین، بەڵام ئەنجام پەیدادەبێ!! چونكە دەسەڵاتی خوا ڕەهایە، وە دەسەڵاتی خوا نەبەستراوەتەوە بە هۆكارەكانەوە، بەڵكو دەتوانێ بەبێ هۆكار ئەنجامەكان پەیدا بكات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

لـەم دەرسـەماندا ئایەتـەکانی (٤٥ تاکـو ٥١) لـە سـوورەتی (آل عمـران) دەتوێژینـەوە، واتە: دە ئایـەت، لەم دە ئایەتە موبارەکەدا خـوای پـەروەردگار باسـی قسە کردنی فریشتان بە تایبەتی جیبـریل لەگەڵ مەریـەم دا دەکـات، کە مـوژدەی ئـەوەی پـێدەدەن لەلایـەن خـوای زانـاو شـارەزاوە بەسـەر ئافرەتـانی دنیـادا هەڵبـژێردراوە، وە مـوژدەی پـێدەدەن بـە کوڕێـك بـەناوی عیـسا (المـسیح) بێئـەوەی کە بـابی هـەبێت، وە باسی کۆمـەڵێك لـە تایبەتمەندییـەکانی عیـسا ﷺ دەکـرێ، وە باسـی بەرنامەکـەی بـۆ گەلـی بـەنی ئیـسرائیل دەکـرێ، ئنجـا باسـی موعجیزەکانی دەکرێ، وە لە کۆتاییدا باسـی دوا پـەیامی عیـسا ﷺ لەسـەر زمـانی خۆی ﷺ دەکرێ، بۆ وەچەی ئیسرائیل.

﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ
ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَـٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ
أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَـٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا
كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ
مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ
ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى
بَشَرٌ ۖ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ

ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم
بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ
طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا
تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا
لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم
بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَٰطٌ
مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە یادبکەوە کاتێك فریشتەکان (یان جیبریل) گوتیان: ئەی مەریەم ! بێگومان خوا هەڵیبژاردووی و پاکیی کردوویەوەو بەسەر ئافرەتانی جیهانییاندا هەڵیبژاردووی ﴿٤٢﴾ ئەی مەریەم! بۆ پەروەردگارت ملکەچبەو کڕنووش بەرەو لەگەڵ ڕکووع بەراندا ڕکووع بەرە ﴿٤٣﴾ ئەوەی کە پێت ڕادەگەیەنین بە شێوەی وەحیی لە هەواڵەکانی نادیارە، ئەگەرنا تۆ لەلایان نەبووی کاتێك کە قەڵەمەکانیان دەهاویشت بۆ قورعە ڕاکێشان داخۆ کامیان مەریەم وەئەستۆ دەگرێ بۆ سەرپەرشتیکردنی؟! وە تۆ لەلایان نەبووی کە تێیدا دەکەوتنە مشتومڕەوە ﴿٤٤﴾ وە یادبکەوە کاتێك فریشتەکان گوتیان: ئەی مەریەم ! بێگومان خوا موژدەت دەداتێ بە منداڵێك کە بە وشەیەك لەلایەن خۆیەوە دەبێ، ناوی مەسیح عیسای کوڕی مەریەمە، لە دنیاو دواڕۆژدا پایە بەرزەو لە زۆر نیزیکانە لە خواوە ﴿٤٥﴾ وە لە بێشکەداو بە کامڵییش خەڵکی دەدوێنێ و لە چاکانە ﴿٤٦﴾ (مەریەم) گوتی: پەروەردگارم ! جا چۆن منداڵم دەبێ، خۆ هیچ کەس دەستی لێنەداوم؟ فەرمووی: هەر ئاوایە خوا چیبوێ دروستی دەکات، هەرکاتێك

فەرمانێکی کرد بەس پێی دەفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ ﴿٤٧﴾ وە کتێب (یان نووسین)و حیکمەتو تەوراتو ئینجیلیشی فێردەکات ﴿٤٨﴾ وە ڕەوانەی دەکات بۆ وەچەی ئیسرائیل، دەڵێ: من نیشانەیەکم لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون، من لە قوڕ وەك شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم، فووی پێدادەکەمو بە فەرمانی خوا دەبێتە باڵندە، وە کوێری زگماكو بەڵەك چاكدەكەمەوە بە فەرمانی خوا، وە مردووان زیندوو دەکەوە، وە هەواڵتان پێ دەدەم بەوەی کە دەیخۆن، وە بەوەی لە ماڵەکانتان هەڵیدەگرن (واتە: لە خواردنو خۆراك) بێگومان لەوەدا نیشانەیەك بۆ ئێوە هەیە، ئەگەر بڕوادارین ﴿٤٩﴾ وە بەراستدانەری تەوراتی پێش خۆمم، وە هەندێك شت کە لێتان قەدەغەکراوە بۆتان حەڵاڵ دەکەم، وە لە پەروەردگارتانەوە نیشانەیەکی گەورەم بۆ هێناون، جا پارێز لە خوا بکەنو فەرمانبەرییم بکەن ﴿٥٠﴾ بێگومان خوا پەروەردگاری منیشو ئێوەشە، دەجا بەس ئەو بپەرستن، ئەمەیە ڕێی ڕاست ﴿٥١﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ**): واتە: قەڵەمەکانیان فڕێدەدا، یاخود ئەو تیرانەی، کە بۆ قورعەکێشان دایانابوو فڕێیان دەدا بە مەبەستی ئەوە کە بزانن سەرپەرشتییکردنی مەریەم بەرکامیان دەکەوێ، (أَقْلاَم) کۆی (قَلَم)ە، (القَلَمُ: القَصُّ مِنَ الشَيءِ الصُّلْبِ، وَخُصَّ ذَلِكَ بِمَا يُكْتَبُ بِهِ، وبالقِدْحِ الَّذِي يُضْرَبُ بِهِ، وَجَمْعُهُ أقلاَمٌ)، وشەی: (قَلَم) ئەوەیە کە شتێکی ڕەق داتاشی، وە ئەوە تایبەت کراوە بەو شتەی کە پێی دەنووسرێ، هەروەها بە (قِدح) واتە: ئەو تیرەی کە بۆ قورعە ڕاکێشان بەکاردێ، کۆیەکەی (أَقْلاَم)ە.

(**يَخْتَصِمُونَ**): واتە: دەکەوتنە مشتومڕو ناکۆکییەوە، (خَصَمْتُهُ: نَازَعْتُهُ وأَصْلُ الْمُخَاصَمَةِ: أَنْ يَتَعَلَّقَ كُلُّ وَاحِدٍ بِخُصْمِ الآخَرِ، أي جَانِبِهِ)، (خَصَمْتُهُ)،

واتە: (نَازَعْتُهُ) واتە: ناكۆكیی‌و مشتومڕم لەگەڵی هەبوو، وە وشەی (مُخَاصَمَة) ئەوەیە لە بنەڕەتدا كە هەركام لە دوو لایەنەكان لاتەنیشتی ئەویدیكە بگرێ، یان لایەخەی بگرێ.

(ٱلْمَسِيحُ): نازناوە بۆ عیسا، كە عیسا بۆ خۆی ناوی عیسایە، وە (مَسِيح) لە (مَسْح)ەوە هاتوە، (الْمَسْحُ: إِمْرَارُ اليَدِ عَلَى الشَيْءِ) وشەی (مَسْح) واتە: دەست بە شت دا هێنان، (وَعُبِّرَ عَن السَّيْرِ بالْمَسْح) ڕۆیشتن پێی دەگوترێ: (مَسْح)، (المَسيحُ من الماسِح بالأَرْض) واتە: (مَسیح) لەوەوە هاتوە، كە بەزەوی دا دەڕوات، (أَو لأَنَّهُ يَمْسَحُ المرضَى)، یان لەبەرئەوەی كە دەستی بە نەخۆشان دا هێناوەو بە فەرمانی خوا چاكبوونەتەوە.

(وَجِيهًا): (الوجه ذو الجاه) (وجِيه)، واتە: خاوەن پایەو ڕێزو مەقامی تایبەت.

(وَكَهْلًا): (الكَهْلُ: مَنْ وَخَطَهُ الشَّيْبَ: أي فشافيه وَخالَطَهُ، وَاكْتَهَلَ النَّبَاتُ إِذَا شارَفَ اليُبُوسَةَ مشارَفَةَ الشَّيْبَ) وشەی: (كَهْل) بە كەسێك دەگوترێ: كە مووی سپی تێكەڵاو بە مووە ڕەشەكانی بووبن، وە دەگوترێ: (إكتهل النبات) لە وشكبوون نیزیك بووبێتەوە، دەڵێن: لە چلساڵییەوە وشەی كەهل بەكاردەهێنرێ، تا پەنجا ساڵیی، یاخود تا شەست ساڵیی.

(وَلَمْ يَمْسَسْنِى): واتە: دەستی لێ نەداوم، مەبەست سەرجێی (جماع) لەگەڵ كردنە (المَسُّ كَاللَّمْسِ وَهُوَ كِنايَةٌ عَن الْجِمَاع)، (مَسّ)و (لَمْس)، وەك یەكن، واتە: دەست لێدان، كە ئەوە كینایەیە لە جووتبوونی پیاوو ئافرەت.

(قَضَىٰٓ): (القَضَاءُ: فَضلُ الأمْرِ قَوْلاً كَانَ ذَلِكَ أَوْ فِعْلاً)، وشەی: (قَضَاء) بریتییە لە بڕیاردان، یاخود لە یەك جیاكردنەوەی شتێ بە قسە، یان بە كردەوە، (قَضَى) واتە: بڕیاریدا، یاخود لە یەكی جیاكردەوە.

(ٱلْكِتَٰبَ): بە مانای بەرنامە دێ، یاخود یاساكان، یاخود نووسین.

(وَٱلْحِكْمَةَ ): (الحِكْمَةُ: إصَابةُ الحَقِّ بالعِلمِ والعَمَلِ، أو مَعْرِفة المَوْجُودَات وفعلُ الخَيرَاتِ، أو فهم حَقَائقِ القُرْآن) وشەی (حِكْمَةُ) بە چەند شێوەیەك لێكدراوەتەوە:

یەكەم: كە ئینسان هەق بپێكێ بە زانستو كردەوە.

دووەم: كە ئینسان دروستكراوەكان بناسێو كردەوە چاكەكانیش ئەنجام بدات.

سێیەم: تێگەیشتنی ڕاستییەكانی قورئان.

وەك پێشتر گوتوومانە، دەشتوانین بڵێین: (حِكْمَة)، واتە: كارامەییو وەستایی لە جێبەجێكردنی شەریعەتو بەرنامەی خوادا، یان بە هاوئاكارو ڕەوشتە بەرزو پەسندەكان.

(ٱلْأَكْمَهَ ): (الأَكْمَهُ مِن الكمه: هُوَ الَّذِي يُولَدُ مَطْمُوسَ العَينِ) (أَكْمَه) واتە: كەسێك كە چاوی سڕابێتەوە، یاخود كوێری زگماك.

(وَٱلْأَبْرَصَ ): واتە: بەڵەك، (بَرَصْ)یش بەڵكییە كە جۆرە نەخۆشییەكی پێستییە.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوای پەروەردگار لە ئایەتەكانی پێشێدا باسی هاوسەری عیمرانو چۆنیەتی لەدایك بوونی مەریەمی كرد، هەروەها باسی زەكەرییاو لەدایك بوونی یەحیای كوڕی زەكەرییای – سەلامی خوایان لێ بێ – كرد، ئنجا لەم ئایەتانەدا دێتە سەر باسی مەریەم، وە عیسای كوڕی سەلامی خوایان لێبێ، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ وە یادبكەوە كاتێك فریشتەكان گوتیان: ئەی مەریەم ! بێگومان خوا تۆی هەڵبژاردوە، وە تۆی پاككردۆتەوە، وە تۆی بەسەر ئافرەتانی هەموو جیهانییاندا هەڵبژاردوە، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە فریشتە

جیبـریله ﷺ وەك لـه لـه سـوورەتی (مـریم)دا دەفـەرموێ: ﴿ ... فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ ﴾، ئێمە ڕووحی خۆمان (واتـه: جیبـریلـمان) ناردە لای (مەریەم لـه کاتێکدا کـه خـەریکی خـۆ شـۆردن بـوو) بـۆی چووە سـەر شـێوەی پیاوێکی تێرو تـەواو، ئەمجار قسـەی لەگەڵ کرد، چونکه وشـەی (ملائکـة) هـەم بـه یەکێکیش دەگوترێ، هـەم بـه کـۆمەڵیش دەگوترێ، بـه هـەرحاڵ فریـشتەکان یـان فریشتەکه گوتی: ئەی مەریەم! بێگومان خوا تۆی هـەڵبژاردوە، ئـەم هـەڵبژاردنەی یەکـەم هەڵبژاردنی وەهبیـیـه، واتـه: خـوای کـاربەجێ بـه شـێوەیەك تـۆی دروست کـردوە، کـه هەڵبـژێردراوو خـاوەن مەعـدەنو کەسـایەتیی‌و فیطـرەتێکـی پاکـی، چونکـه بۆخـۆت دەسـتت تێیـدا نیـه، وە تـۆی پـاك کردۆتـەوە، واتـه: لـه سـیفەتی خراپ، یـاخود لـەو تۆمـەتو گومانـه خراپەیـەی کـه بـۆت هەڵبەسـتـراوە، لـه لایـەن جوولەکـەو ناحـەزانی (عیـسا)ەوە، سـەلامی خـوای لێبـێ، ﴿ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، وە تـۆی هەڵبـژاردوە بەسـەر ئافرەتـانی جیهـانییان دا، واتـه: ئافرەتـانی ڕۆژگـاری خۆیـدا، ئـەویش بەهـۆی ئـەوەوە کـه یارمـەتی داوە کۆمەڵـێك سیفەت لەخۆیـدا بێنێتە دیو بە شێوەیەك بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکات، کـه ببێتـه مایـەی هەڵبـژێرران‌و پەسـندکردنی لەلایـەن خـواوە ﴿ يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾، ئنجـا فریـشتەکان پـێی دەڵـێن: ئـەی مەریـەم ! بـۆ پـەروەردگاری خـۆت ملکەچـبەو وە کڕنووشـی بـۆ بـەرەو لەگـەڵ ڕکووعـبەراندا ڕکووع بـەرە، واتـه: مـادام خـوای بەخـشـەر ڕێـزی لـه تـۆ نـاوەو تـۆی هەڵبـژاردوە، تۆش لە بەرانبەری ئەو نیعمەتەی خوای بەخشـەردا سـوپاسگوزاریی نیعمـەت بکـه، کە سـوپاسگوزاریی نیعمـەت ئەوەیـه تۆ پـاش لـه خـوا زانینـی نیعمەتەکە بـه دڵ‌و، ستایشـی خـوا لەسـەرکردنـی بە زمان، بە کـردەوەش ئـەو نیعمەتـه لـه ڕەزامەنـدیی خـوادا ﷻ بەکـاربهێنی، ئنجـا ڕوو دەکـاتە پـێـغەمبەر ﷺو دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ﴾، ئـا ئـەو بەسـەرهاتەیه لـه هەواڵەکانی نادیـارە، لـەو

هەواڵە پەنهانانەیە کە بێجگە لە خوا کەسی دیکە نایانزانێ، ئێمە خۆمان پێت ڕادەگەیەنین ﴿ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ﴾، تۆ لەلایان نەبووی کە زاناکانی جوولەکە دەکەوتنە مشتومڕەوە، وە قەڵەمەکانیان فڕێ دەدا بۆ قورعە کێشان، داخۆ کامیان مەریەم وەئەستۆ بگرێ، وە ببێتە سەرپەرشتیاری ﴿ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾، وە تۆ لەوێ نەبووی کە کەوتنە کێشەو مشتومڕەوە، ئەدی کێ پێغەمبەری خوای ﷺ ئاگادار کردۆتەوە؟! خوای پەنهانزان لە ڕێگای وەحییەوە ئاگاداری کردۆتەوە، کە ئەوە بۆخۆی یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ کە خوا لەو مەسەلە گرنگانەی کە لەپێش خۆیدا بوون، وەك ئەوەی بۆخۆی لەوێ بووبێ ئاوا ئاگاداری کردۆتەوەو بەرچاوی ڕوونکردۆتەوە، ئنجا بەردەوام دەبێ‌و دەفەرموێ:

﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾، کاتێك فریشتەکان گوتیان: ئەی مەریەم! بێگومان خوا موژدە بە تۆ دەدات بە وشەیەك لە لایەن خۆیەوە، عیسا ﷺ بە وشە (کلمة)ش ناسێنراوە، بۆچی؟ چونکە بە وشەی خوا دروست بووە، نەك بە شێوەی ئاسایی، کە دایك‌و باب بچنە لای یەك، وە منداڵیان بکەوێتە بەینێ، بەڵکو بە وشەی خوای پەروەردگارو بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا، عیسا ﷺ دروست بووە، بۆیە بە وشەی (کلمة) ناوزەند کراوە، ﴿ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾، ناوی مەسیحە، هەڵبەتە ئەوە نازناوەکەیەتی[1]، وە ناوەکەی عیسای کوڕی مەریەمە، هەڵبەتە مەریەم دەزانێ کە کوڕی خۆیەتی، بەڵام بۆ ئەوەیە کە بزانێ بابی نیە، وە ئەوە بە درۆخستنەوەی نەصرانییەکانە، کە دەڵێن: عیسا کوڕی خوایە! نەخێر عیسا کوڕی دایکی خۆیەتی، ڕاستە بابی نیە، بەڵام خوای کاربەجێ فەرمانی وابووە، بەبێ باب عیسا لە دایکی دروست بکات، تاکو بۆ هەموو کەس

---

١) کە دیارە نازناو (لقب)یش بە ناو (اسم) دادەنرێ، دەشگونجێ وێڕای (عیسی)، (مَسیح)یش هەر ناوی بێ‌و دوو ناوی هەبن.

دیاربێ كە خوا ﷻ وە نەبێ بەبێ ئەو یاسایانەی كە دیاریكراون، نەتوانێ شت دروست بكات، یاسای خوا وایە منداڵ لە دایكو باب پەیدادەبێ، بەڵام ئەگەر خوا بیەوێ بەبێ بابیش پەیدادەبێ، یان بەبێ دایكیش پەیدادەبێ، وە بەبێ هیچ كامیشیان، وەك دوایی باسی دەكەین، كە ئادەم نە دایكی هەبووەو نە باب‌و، خواش دروستی كردوە ﴿ وَجِيهًا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، ئەو (عیسا)یە، ئەو كوڕەی تۆ ئەی مەریەم! خاوەن پایە دەبێ، خاوەن ڕوو دەبێ، واتە: ئینسانێكی بەڕێزو ناسراوو خاوەن حورمەت‌و پایە دەبێ، لە دنیاو لە دوارۆژیشدا ﴿ وَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴾، وە لە زۆر نیزیك خراوان دەبێ، لە كێ نیزیك دەبێ؟ لە خوای بێ وێنە ﴿ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، وە خوا وای دروست دەكات كە لە بێشكەشدا قسە بكات، وە بە گەورەییش قسە بكات، كاتێك كە دەكەوێتە قۆناغی كامڵ بوونیشەوە قسە دەكات، وە كاتێك كە لە بێشكەش دایە، وەك ئەو كاتەی دەكەوێتە قۆناغی كامڵ بوونەوە، لەگەڵ خەڵكدا بدوێ، ﴿ وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، وە لە چاكەكاران دەبێت، ئەوە فریشتەكان پێناسەی عیسایان كرد بۆ مەریەم (علیهما السلام)، كە جارێ هێشتا ڕووحی عیسا بە بەدەنیدا نەكراوە، دیارە خوای پەروەردگار وا پێناسەی عیسا بۆ دایكی دەكات، تاكو پێی دڵخۆشبێ، وە تاكو بزانێ ئەوە بەخشش‌و خەڵاتێكی خوایە، بۆچی؟ چونكە دیارە مەریەم دووچاری گومانی خراپ‌و تۆمەت دەبێتەوە، هەر لەو گۆڕەی منداڵێكی پەیدابێ، گومانی خراپی پێ دەبەن، بۆیە خوا ﷻ لە ڕێی فریشتەكانەوە ئاگاداری دەكاتەوە، كە تۆ لەگەڵ ئەوەدا ڕووبەڕوو دەبیەوە، بەڵام خوای پەروەردگاریش قەڵغانێكی بۆ داناوی، ئەوە چاكەیەكی گەورەی خوایەو، ئەو چاكەو فەزڵە لەیاد مەكە! وە پاشان ئەو منداڵەی تۆش خوا بە جۆرێك دروستی دەكات، كە لە بێشكەدا قسە بكات، بۆ ئەوەی بەرگریی لە دایكی بكات ﴿ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، وەك دوایی باسی دەكەین كە عیسا لە بێشكەدا چی گوتوە، لە كاتێك كە وەك كوردەواریی دەڵێن:

لەسەر قۆنداغ بووە، هەر تازە لە دایكی بەربۆتەوە، قسەی كردوونو، كاتێك دایكی بردوویەتەوە بۆ لای قەومەكەیو بەرگریی لە دایكی كردوە، وەك لە سوورەتی (مەریەم) دا هاتووە لە ئایەتەكانی، (٢٩- ٣٣)دا.

ئنجا مەریەم گوتی: ﴿ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ ﴾، پەروەردگارم ! جا مندالّم چۆن پەیدادەبێ، خۆ هیچ بەشەرێك دەستی نەگەیاندۆتە من؟! چونكە هاوسەری نەبووەو بە حەرامییش كەس دەستی نەگەیاندۆتێ، ئنجا خوای بە بەزەیی لە رێی فریشتەكانەوە پێی فەرموو، یاخود راستەوخۆ خستییە دڵیو پێی فەرموو: ﴿ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾، ئا بەم شێوەیە خوا هەرچی بوێ دروستی دەكات، خوا هیچی لەبەر عاسێ نابێ، ﴿ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، هەركاتێك بریارێكی دەركردو ویستی كارێك بكات، بەس پێی دەفەرموێ: ببە، دەبێ، هەر ئەوەندەی دەوێ تا بەو شتە دەفەرموێ: ببە، واتە: ئیرادەو ویستی خوا روو بكاتە ئەو شتە، یەكسەر ئەو شتە دەبێ، ئنجا ئێمە كە باسی ئەو تەعبیرە دەكەین، ئایا رواڵەتەكەی مەبەستە یاخود مانایەكی دیكەی لە پشتەوەیە ؟! دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا قسەی لەبارەوە دەكەین، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴾، دیسان زیاتر لەسەر پێناسەو وەسفی عیسا بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: وە كتێبو حیكمەتی فێردەكات، وە تەوراتو ئینجیلیشی فێردەكات، دیارە (كتاب) لێرەدا دەگونجێ بەمانای نووسین بێ، دەشگونجێ بەمانای بەرنامە (شریعة)بێ، ﴿ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، واتە: كتێبو بەرنامە، یان نووسینی فێردەكات، ﴿ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، واتە: داناییو وەستاییو كارامەیی لە قسەو لە كردەوەدا، چونكە حیكمەت ئاوا تەفسیر كراوە: (الإِصَابَةُ فِي القَوْلِ وَالعَمَلِ أَو عِلْمَاً وَ عَمَلاً)، واتە: لە نیشانەدان لە قسەو لە كردەوەدا، كە لە جێی خۆیان دابن، وە ئەگەر تەماشای قورئان بكەین وشەی: (حِكْمَةَ) هەرچەندە لێرەدا

توێژەرەوانی قورئان بە مانای سوننەتیان مانا لێداوەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا بەمانای سوننەت نایە، چونكە خوا باسی حیكمەت دەكات كە داویەتی بە لوقمان، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ ...﴿١٢﴾﴾ لقمان، وە خوا ئاماژەی بۆ دەكات كە حیكمەت دەدرێتە غەیری پێغەمبەرانیش، وەك دەفەرموێ: ﴿... وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ...﴿٢٦٩﴾﴾البقرة، وە لێرەدا ئەوەتا باسی تەوراتو ئینجیل دەكات، بەڵام لە پێشەوە باسی كیتابو حیكمەت دەكات، ئنجا كتێبێك كە بە عیسا دراوە بریتی بووە لە ئینجیل، هەڵبەتە تەوراتیشی فێركراوە، واتە: ئەو كتێبەو ئەو حیكمەتە دەبێ جیابن لە تەوراتو ئینجیل، كەواتە: (كتاب)ەكە، یان بەمانای نووسینە یان بەمانای شارەزاكردنی عیسایە لە یاساكانی خوادا، كە هەر بەشێكن لە تەوراتو ئینجیل، وە حیكمەتیش وەك گوتم بە مانای قسەو كرداری بەجێییە، وە دەگونجێ بە مانای زانیاریی هەبوون بێ بە كردەوە چاكەكانو ئەنجامدانی كردەوە چاكەكان، وە دەگونجێ مەبەست پێی خۆڕازاندنەوە بێ بە سیفەتە پاكو بەرزو پەسندەكانو خۆ دووركرتن لە سیفەتە نزمو خراپەكان بێ، وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا ئەوە دەگەیەنێ كە خوای پەروەردگار كۆمەڵێك سیفەتی بەرزو پەسند باس دەكات، وە كۆمەڵێك سیفەتی خراپ باس دەكات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ...﴿٣٩﴾﴾ البقرة، واتە: ئەوە ئەو حیكمەتەیە كە پەروەردگارت بۆ تۆی ناردوە، واتە: ئەو سیفەتە بەرزانە كە خۆیان پێ بڕازێنیەوە، وە سیفەتە خراپەكان كە خۆتیان لێ بژاربكەی، یان خۆتیان لێ وە دوور بخەی، ئا ئەوە حیكمەتە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، وە ڕەوانە كراویشە، ئەو عیسایە ؑ بۆ لای وەچەی ئیسرائیل، هەڵبەتە ئیسرائیل لەقەبی یەعقووب پێغەمبەرە ؑ كە بەمانای بەندەی خوا دێ بەزمانی عیبری ﴿بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، واتە وەچەی ئیسرائیل، واتە: ئەو هۆزەی كە لە یەعقووب وە پاش كەوتوون،

یەعقووب دوازدە كوڕی بوو ون، (یوسف) عليه السلامو یازدە برایەكەی دیكەشی، وەچەی ئیسرائیل ئەوانەن كە لەو دوازدە كوڕەی یەعقووب وەپاش كەوتوونو بلاوبوونەوە، ﴿أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾، بێگومان من لەلای پەروەردگارتانەوە نیشانەیەكم بۆ هێناون، ئنجا عیسا عليه السلام لەسەر قسەكانی بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: ﴿أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾، واتە: بێگومان من لە لایەن پەروەردگارتانەوە نیشانەیەكم بۆ هێناون، هەڵبەتە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە بڵێ: من پێغەمبەری خوامو نیشانەیەكو موعجیزەیەكو بەڵگەیەكی ڕوونو ئاشكرای پێ نەبێ كە ئیسپاتی ڕاستیی بانگەوازەكەی بكات، كە پێغەمبەری خوایە، بۆچی؟ چونكە جیاوازی نێوان ڕاستگۆیانو درۆزنان بەلگەیە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١١١﴾﴾ البقرة، واتە: بلێ: بەڵگەتان بێنن ئەگەر ڕاست دەكەن، هەركەسێك بەڵگەی پێ نەبوو مانای وایە ڕاست ناكات لە قسەو دعوایەكەیدا، بۆیە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەموویان خاوەنی موعجیزەو بەڵگە بوون، بەڵگەیەك كە خەڵكی ڕۆژگاری خۆیانی پێ دەستەوستان بكەن، ئنجا ئایا موعجیزە یانی چی؟ واتە: شتێك كە ببێتە هۆی دەستەوستان كردنی بەرانبەرەكەتو دەستە پاچەكردنی، بە جۆرێك كە نەتوانێ وەڵامی بەڵگەی تۆ بداتەوە، جا پێشێ بەگشتی دەفەرموێ: من نیشانەیەكم لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون، ئنجا دێتە سەر ڕوونكردنەوەی ئەو نیشانەیە كە لە ڕاستی دا هەر نیشانەیەك نیە، بەڵكو زۆر نیشانەی گرتوونە خۆی، دەفەرموێ: ﴿أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ﴾، من لە قوڕ لە شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەكەم، پەیكەرێكتان بۆ دروست دەكەم لە شێوەی باڵندەدا ﴿فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا﴾، ئنجا فووی پێدا دەكەم، یەكسەر دەبێتە باڵندە، بەڵام بە فەرمانی كێ؟ ﴿بِإِذْنِ اللَّهِ﴾، بە فەرمانی خواو، بە مۆڵەتی خوا دەبێتە باڵندە، نەك بە فەرمانو هێزی عیسا

السَّلام، ﴿وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ﴾، هەروەها کوێری زگماك و بەڵەکی زگماك، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿وَٱلۡأَبۡرَصَ﴾، بە مانای گەڕ دێ، ئەوانیش چاك دەکەمەوە، کوێری زگماك و بەڵەکی زگماك و یان گەڕوگول ﴿وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾، وە مردووان زیندوو دەکەمەوە، ئەویش چۆن؟ ﴿بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾، بە فەرمانی خواو بە یارمەتی خوا، ﴿وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡ﴾، هەروەها هەواڵیشتان پێ دەدەم، بەوەی کە دەیخۆن بەوەش کە لە ماڵەکانتاندا هەڵیدەگرن و پاشەکەوتی دەکەن لە خواردن، جا ئایا ئەوە چۆن بووە؟ دەڵێن: خەڵك هاتوون بۆ مەجلیسی عیسا السَّلام یەك بە یەك پێی گوتوون: تۆ فلان شتت خواردوە، تۆ فلان شتت خواردوە، ئێوە فلان خواردنتان هەڵگرتوە، دیارە ئەوانە هەموو خوای زانا فێری کردوون ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾، لە هەموو ئەو شتانەدا نیشانە هەیە بۆ ئێوە، ئەگەر ئیماندار بن، واتە: ئەگەر بتانەوێ بڕوا بێنن بە من کە پێغەمبەری خوام، ئەوە نیشانەیە و بەڵگەیە بۆ ئێوە، بۆچی؟ چونکە هیچ کەس ئەوانەی بۆ ناکرێن، نە ئەو کاتە بۆیان کراوە، وە نەدوای ئەو کاتەش، ئەدی باشە عیسا السَّلام هەڵوێستی لە بەرانبەر تەوراتدا چۆن بووە؟ ﴿وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾، وە ئەو تەوراتەی کە لە پێش منەوە بووە، بەڕاستی دەزانم، ئەدی باشە بەنسبەت هەندێ یاساوە کە لە تەوراتدا هاتوون، کە لە ئەنجامی سەرپێچیی و لادانی جوولەکانەوە بووە، هەندێك شتیان لێ قەدەغە کردوون، لەوبارەشەوە گوتوویەتی: ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ﴾، وە هەندێ شت کە لێتان قەدەغە کراون، هەندێکیانتان بۆ حەڵاڵ دەکەم، چونکە لە ئەنجامی سەرپێچیی و لادانی خۆتانەوە، وەك سزادان خوای دادگەر هەندێ شتی لێ قەدەغە کردوون، من هەندێ لەوانەتان بۆ حەڵاڵ دەکەم، وەك خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ١٦٠﴾ النساء،

واتە: وە لەسەر ئەوانەی جوولەکە بوون هەندێ لەو ڕۆزییە چاکەکانمان لێ قەدەغە کردن، بەهۆی ستەمیانو بەهۆی زۆر خەڵك لە ڕێی خوا لادانیانەوە، ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَجِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، دووبارەی دەکاتەوە کە من لە پەروەردگارتانەوە نیشانەو بەڵگەم بۆ هێناون ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، پارێز لە خوا بکەن، وە بە قسەی منیش بکەن، فەرمانبەریی بۆ من بکەن ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُ ﴾، بێگومان خوا خاوەنو مشوورخۆرو پەروەردگاری منیشەو هی ئێوەشە، هەر ئەو بپەرستن ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴾، ئا ئەوە ڕێی ڕاستە، کە تەنها خوا بەندایەتیی بۆ بکرێو تەنها ئەو بپەرسترێ، لێرەدا عیسا ﷺ دەیەوێ بە جوولەکەکان بڵێ: کە ئێوە عوزێر دەپەرستن، وە دەیەوێ بە نەصرانیی یەکان بڵێ: کە حەتمەن خوای زانا ئاگاداری کردوە، کە لە دوای وەفاتی عیسا دەیپەرستنو دەیکەن بە کوڕی خوا، دەیەوێ پێیان بڵێ: کە بەس خوا پەروەردگاری ئەوانەو هی ئەویشە، وە تەنها خوایە کە دەبێ بەندایەتیی بۆ بکرێو بپەرسترێ، هەر ئەوەش ڕێی ڕاستەو ئەوی دیکە ڕێی چەوتو لارە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، وەك پێشتریش گوتم: زۆربەی توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست لە مەلائیکە جیبریلە، بۆچی؟ چونکە قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات، ئەوە لێتان وەصیەت بێ ئەگەر بتانەوێ لە ئایەتێکی قورئان تێبگەن، تەماشاکەن بزانن داخۆ لەو بابەتەوە چەند ئایەتی دیکە هەن، بێنن کۆیان بکەنەوەو تەماشایان بکەن، ماناو چەمکی ئەو ئایەتەتان زۆرچاك بۆ ڕوون دەبێتەوە، بۆ وێنە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ ﴾، کاتێك فریشتەکە گوتی: یان

فریشتەکان گوتیان: ئەی مەریەم! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، لێرەدا مەبەست لە کۆمەڵێك فریشتەیە یان فریشتەیەکی تایبەتە کە جیبریلە؟ لە سوورەتی (مریم) ئایەتی (١٧)دا بۆمان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿... فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴾، واتە: ڕووحی خۆمانمان ناردە لای، ﴿کە دیارە یەکێ لە ناوەکانی جیبریل (روح)ە﴾، وە بردمانە سەر شێوەی بەشەرێکی تێرو تەواو، پیاوێکی تێرو تەواو، ئنجا وتوویژ لەگەڵ مەریەم دا دەکات، دەڵێ: ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ ﴾مریم، واتە: بێگومان من نێرراوی پەروەردگارتم بۆ لای تۆ، کە منداڵێکی زۆر پاكو چاکت پێ ببەخشم، ئەویش دەڵێ: ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ ﴾ مریم، واتە: جا چۆن منداڵم دەبێ؟! خۆ کەس دەستی نەگەیاندوومێ، وە من داوێن پیس نیم، ئەویش دەڵێ: ئەوە فەرمانی خوایە، پەروەردگار منی ناردوە، وە لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: جیبریل فوو بە یەخەی کراسەکەیدا دەکات، بە فەرمانی خوای کاربەجێ، یاخود فوو بە دەمیدا دەکات، وە ڕووحی عیسا عليه السلام دەچێتە نێو منداڵ دانییەوە، وە بەو شێوەیە عیسا دروست دەبێ، شایانی باسیشە ئەگەر بشگوترێ: مەبەست لە (ملائکة) لە ڕستەی: (قالت الملائکة) کۆمەڵێك فریشتەن نەك تەنیا (جبریل)، هیچ ئیشکالێك دروست نابێ، بێگومان (جبریل) کە سەرۆکی فریشتەکانەو پێگەیەکی بەرزو گەورەی هەیە، بە تەنیا نایەتو هەردەم کۆمەڵێك فریشتەی هەر لەگەڵ دەبن، بەڵام (جبریل) چۆن قسەی لەگەڵ مەریەم دا کرد، خۆ وەحی تەنیا بۆ پێغەمبەرانە؟! لێرەدا دەڵێین: مەرج نیە، قسەی فریشتان هەمیشە وەحی بێ، وە ئەگەر گریمان وەحییش بێ دیسان بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە مەریەم پێغەمبەری خوایە، بۆچی؟ چونکە خوا سبحانه وتعالى باسی کردوە کە تەنیا پیاوانمان کردوونە بە

پێغەمبەر ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۚ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾النحل، واتە: لە پێش تۆدا تەنیا پیاوانمان ناردوەو وەحییمان بۆ ناردوون، كەواتە: پێغەمبەران تەنیا لە پیاوان بوون، ئەدی لێرەدا چۆن قسەیان لەگەڵ مەریەم دا كردوە؟ هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەوە هەر وەحییە، بەڵام مەرج نیە وەحی تەنیا بۆ پێغەمبەران بێ، چونكە وشەی وەحی بە مانا عورفیو باوەكەی تەنیا بۆ پێغەمبەرانە، بەڵام وەحی چەند مانایەكی دیكەشی هەن لە قورئاندا، بە لای كەمەوە وشەی وەحی وێڕای مانا ئەسڵییەكەی بە چوار واتا بەكارهاتوە:

١/ بە مانای ئەو غەریزەیەی كە خوا بە ژیانداران دەداتو بەهۆیەوە كاروباری خۆیان بەڕێوە دەبەن، وەك دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ... ﴿٦٨﴾﴾النحل، واتە: وە پەروەردگارت وەحی كرد بۆ هەنگ، كە هێلانە بكات لە نێو چیاكان دا...، ئەو وەحییەی بۆ هەنگ دەكرێ، دیارە ئەو وەحییە نیە كە بۆ پێغەمبەران دێ، واتە: غەریزەیەكی بە هەنگ داوە، بە پێی ئەو غەریزەیە دەتوانێ بڕواو بچێو هێلانە دروست بكاو... هتد.

٢/ وە بە مانای خورپەو ئیلهام هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾﴾القصص، واتە: وە وەحییمان نارد بۆ لای دایكی مووسا كە شیری پێبدەو ...هتد، ئەمەش ئیلهامو خورپەو خستنە نێو دڵە، هەرچەندە وشەی وەحیشی بۆ بەكارهێنراوە .

٣/ وە بە مانای ئاماژە كردنو هێماش هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾﴾مريم، واتە: كە (زەكەریيا) لە میحرابەكەی چووە دەرەوە بۆ نێو قەومەكەی، ﴿فَأَوْحَىٰٓ

إِلَيْهِمْ ﴾، یانی: ﴿(فأشار إليهم)، (رمز إليهم)﴾ بە ئاماژە، ئاماژەی بۆ کردن، کەواتە: وەحی بەمانای ئاماژەکردنیش دێ.

٤/ وە هەروەها وەحی لە قورئاندا بە مانای وەسوەسەی شەیتانەکانیش بەکارهاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ... شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ... ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعام، واتە: شەیتانەکانی ئینسو جند هەندێکیان قسەی بریقەدارو فریودەر بۆ یەکدی ڕەوانە دەکەن، کە مەبەست پێی وەسوەسەو دنەدانی خراپە.

وە مانای (وحي) لە ئەسڵدا بریتیە لە: (الإشارة السريعة) واتە: ئاماژەیەکی خێرا، وە وەحی تەفسیر کراوە بە (الكلام الخفي) واتە: قسەیەکی پەنهان، کەواتە: قسە کردنی فریشتەکان لەگەڵ مەریەم دا بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە مەریەم ئەو وەحییەی بۆ هاتوە کە بۆ پێغەمبەران دێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە خوای پەروەردگار حاڵی کردووەو تێیگەیاندوە، لە ڕێی فریشتەکانەوەو بە ئاماژەو خورپە خستنە دڵ بووە، وە بەڵگەی ڕوونو ڕاشکاویشمان لەسەر ئەوە کە مەریەم پێغەمبەر نەبووە، ئەوەیە کە خوا ﷻ لە سوورەتی (المائدة)دا لە ئایەتی (٧٥)دا دەفەرموێ: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ... ﴾، واتە: عیسای کوڕی مەریەم تەنیا ڕەوانەکراوێك بوو کە لە پێش ئەویشدا پێغەمبەران تێپەڕ بوو بوون، وە دایکیشی (صدیقة) بوو، ﴿(صدیقة) واتە: زۆر بڕوا پێتەو﴾، کە خواردنیان دەخوارد وەك خەڵك، کەواتە: مەریەم (صدیقة)[1] بووە، واتە زۆر بڕوا پێتەو، کە پلەیەکە لە خوار پێغەمبەرایەتییەوەیە، نەك پێغەمبەر بووبێ.

---

١) صديق: كثير التصديق، أو كثير الصدق، (صدیق) یانی: زۆر بەڕاستدانەر، یان زۆر ڕاستبێژ، بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن)، ص: (٤٧٩، ٤٨٠)، وە (المعجم الوسيط)، ص: (٥١١).

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بێگومان قورئان هیچ شتێکی تێدانیە دووبارە بێو بێ حیکمەت بێ، چونکە شتێك دووبارە بێتەوە بێ حیکمەت، مانای وایە قسەیەکی زیادە، کەلامی خواش پیتێکی زیادیشی تێدانیە، نەك وشەیەکی زیاد، یان ڕستەیەکی زیاد! لێرەدا دووجار وشەی: هەڵیبژاردوی ﴿ ٱصْطَفَىٰكِ ﴾، هاتوە، خوا تۆی هەڵبژاردوە، وەك پێشریش باسمان کرد، دەگونجێ هەڵبژاردنی یەکەم هەڵبژاردنی بەخشراوبێ (وَهْبي)ی بێ، خوا مەریەمی وا دروست کردوە، مەعدەنێکی پاك فیطرەتێکی چاك، هی دووەمیشیان هەڵبژاردنێکە کە ئیختیاری ئینسانی تێدایە، جاری وا هەیە هەندێ کەس خوای کاربەجێ هەر بە سروشت زیرەکی خولقاندوە، بەڵام دوایش بۆخۆی دەچێ زیاتر شت دەخوێنێتەوەو لێ دەکۆڵێتەوە، کە ئەوەی دووەمیان وەدەستهێنراو (كَسبْيّ)ەو، هی یەکەمیشیان بەخشراوو (وَهْبي)و جیبللییە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، دیارە نەصرانیی یەکان دەڵێن: ئەوە لە قورئانیشدا هاتوە، کە مەریەم بەسەر هەموو ئافرەتانی دنیادا هەڵبژێرراوە، هیچ ئافرەتێك ناگاتە مەریەم، دیارە دەشگونجێ وابێ، هەڵبەتە ئێمە هیچ حەساسیەتمان پێی نیە، چونکە ئەهلی ئیسلام جیاوازیی ناخەنە نێوان پێغەمبەرەکانەوە (علیهم الصلاة والسلام)، وە جیاوازیی ناخەنە نێوان بەندە بۆ خوا صولحاوەکانەوەو، هەموویان خۆشدەوێن، مەریەم دایکی عیسایە ﷺ، وە ئافرەتێکی هێندە گەورەو چاکە، ئەگەر لە هەموو ئافرەتانی دنیاش چاکتربێ ئێمە هیچ کێشەیەکمان نیە، بەڵام ئەو ڕستە قورئانییە ئەوە ناگەیەنێ، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کە هەڵبژێرراوە بەسەر ئافرەتانی ڕۆژگاری خۆیدا، نەك بەسەر هەموو ئافرەتانی دیکەدا، بۆچی؟ چونکە هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە هەن، ڕێمان لێدەگرن کە ئەو ئایەتە بەو شێوەیە تەفسیر بکەین،

کە مەریەم لە هەموو ئافرەتانی دنیا چاکتربێ، بۆ نموونە:

فەرمایشتی یەکەم: {عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ)} (رَوَاهُ وَأَحْمَدُ برقم: (١١٠٩)، والبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٣٢)، وَمُسْلِم برقم: (٦٢٢١)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٧٧) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ)، واتە: عەلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترین ئافرەتی دنیا (ڕۆژگاری خۆیان) مەریەمی کچی عیمران بوو، وە باشترین ئافرەتی دنیا (ی ئیسلامیش، یانی: ڕۆژگاری خۆیشی) خەدیجەی کچی خوەیلید بوو (خوا لێیان ڕازی بێ).

فەرمایشتی دووەم: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، قَالَ: قَالَ رَسول اللهِ ﷺ: (أَفْضَلُ نِسَاءِ العَالَمِين: خَدِيْجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ، وَفَاطِمَةُ ابْنَةُ مُحَمَّدٍ، وَمَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ وَآسِيَةُ بِنْت مزاحم امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ)} رَوَاهُ الحَاكِمُ برقم: (٤١٦٠) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الإسناد، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي في (التلخيص)، واللَّفظ لَهُ، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٧٨)، وَقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٦١٨١)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین ئافرەتانی دنیا: خەدیجەی کچی خوەیلیدە، وە فاطیمەی کچی موحەممەدە، وە مەریەمی کچی عیمرانە، وە ئاسیەی کچی مەزاحیمی خێزانی فیرعەونە.

فەرمایشتی سێیەم: {عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (كَمُلَ مِنْ الرِّجَالِ كَثِيرٌ وَلَمْ يَكْمُلْ مِنْ النِّسَاءِ غَيْرُ مَرْيَمَ بِنْتِ عِمْرَانَ، وَآسِيَةَ امْرَأَةِ فِرْعَوْنَ، وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ)}رَوَاهُ أَحْمَدُ رقم: (١٩٥٤١)، والبُخَارِيُّ برقم: (٣٧٦٩)، ومُسْلِم برقم: (٦٢٢٢)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٨٧) عن أنَس، واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە پیاوان زۆر

کەس کامڵ بووە، بەڵام لە ئافرەتان بەس مەریەمی کچی عیمران تێرو تەواو بووە، وە ئاسییای هاوسەری فیرعەون، وە چاکییو پەسەندیی عائیشە بەسەر ئافرەتانی دیکەدا وەك: چاکییو پەسەندیی ثەریدە بەسەر باقی خواردنەکاندا، [ثەرید: خواردنێکی نایابو پەسەندی نێو عارەبانە، یانی: باشترین جۆری خواردنیانە، ئەوەی کە نانو گۆشتو شلەو ئەوانە تێکدەگوشرێ، ئێستا لە ڕۆژگاری ئێمەدا وایە ڕەنگە لە ڕۆژگاری خۆیدا بە شێوەیەکی دیکە بووبێ، بە هەر حاڵ ئەو کاتە چاکترین خواردنی گەلی عەرەب بووە، جا وەك چۆن (ثەرید) لە هەموو جۆرە خواردنێك چاکترە، بەو شێوەیە عائیشەش - خوا لێی ڕازی بێ- دایکی مسوڵمانان ڕاستبێژی کچی ڕاستبێژ، بەنسبەت ئافرتانی دیکەوە ئاوایە، کەواتە: ناگونجێ بڵێین: ئەم ڕستە قورئانییە ئەوە دەگەیەنێ کە: مەریەم بە ڕەهایی لە هەموو ئافرەتانی دنیا چاکترە، بەڵکو لە ئافرەتانی ڕۆژگاری خۆی چاکتر بووە].

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ مَرۡيَمَ ﴾،

مەسەلەی قورعە کێشان، کە بە کوردی دەڵێین: (دەو)ی لێدەکات، واتە: قورعەی لێ دەکات، پشکی لێ دەکات، کۆمەڵێك شتی وەك یەك بن، چۆن یەکێکیان دیاری بکەی، دەبێ پشکی لێ بکەی، قورعەی بۆ بکێشی، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوە وەك یانسیبە، وەك بڵێی شتێکی ڕەوانییە، بەڵام ڕایەکەیان ڕاست نیە، چونکە ئێمە فەرموودەیەکی (صحيح)مان هەیە لەوبارەوە، کە پێغەمبەر ﷺ قورعە کێشانو پشککردنی لە شت بەڕەوا داناوە یەکێ لەو فەرموودانە: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا، أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ)} (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٨٧٩)، ومُسْلِم برقم: (٦٩٥١)، واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ-، خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ویستبای دەربچێ بۆ سەفەر، قورعەی لە نێوان خێزانەکانی دەکێشا، (پشکی لە نێوانیاندا دەکرد) هەر کامیان پشکەکەی دەرچووبایە، ئەوی

لەگەڵ خۆیدا دەبرد، هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الأَذَانِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاسْتَهَمُوا)} رَوَاهُ مَالِك بِرقم: (١٥٣)، وَأَحْمَدُ بِرقم: (٧٢٢٥)، والبُخَارِيُّ بِرقم: (٦١٤)، وَمُسْلِم بِرقم: (٩٨٠)، وَالتِّرمِذِيّ بِرقم: (٢٢٥)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٥٤٠)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٢١٥٣)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ - دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵك دەیانزانی چ پاداشتێك لە بانگدانو ڕیزی یەکەمی نوێژی بە کۆمەڵ دا هەیە، پاشان هیچیان بۆ نەکرابایە بیکەن، ئەوە نەبێ کە قورعەی بۆ بکەن، قورعەیان بۆ دەکرد، کەواتە: قورعەکردن دروستە.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنۡهُ ﴾، بێگومان خوا مـوژدەت پـێدەدات بـە وشـەیەك لەلایـەن خۆیـەوە، واتـە: هۆکاری ماددیی‌و ئاسایی ڕۆڵی تێدا نەگێڕاوە، تەنیا بە ویستی خواو بە فەرمانی خوا پەیدابووە، تەنیا بە وشەی ﴿ كُن فَيَكُونُ ﴾، واتە: ببە، دەبێ، ئنجا مەبەست لەوە چییە کە عیسا بە (وشە) ناونراوە؟ چونکە بە وشەی ڕاستەوخۆی خواو بڕیاری ڕاستەوخۆی خوا پەیدابووە، لەبەر ئەوە ئەو ناوەی لێنراوە.

<u>مەسەلەی شەشەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، واتە: خەڵکی دەدوێنێ‌و قسە لەگەڵ خەڵك دا دەکات، لە بێشکەدا، لە (لانکەدا)، وە ئەو کاتەش کە کامڵ دەبێ، ئنجا با بزانین لە بێشکەدا چی گوتوە؟! دیارە لە سوورەتی (مریم) ئایەتی (٣٠ تا ٣٣)دا، ئەو قسانەی عیسا ﷺ کە مەلۆتکە بووەو قۆنداغ بووە، بۆمان دەگێڕێتەوە: کە دوای ئەوەی مەریەم عیسای دەبێت‌و دەیباتەوە بۆ لای قەومەکەی‌و لەسەر دەستییەتی، پێی دەڵێن: ئەوە ئەو منداڵەت لەکوێ بوو؟! لەگەڵی دەکەونە وتووێژ، ئەویش دیارە خوای پەروەردگار پێشتر پێی فەرمووە کە بڵێ: من بە ڕۆژوومو قسە ناکەم، بۆیە قسەیان لەگەڵ ناکات‌و ئاماژە دەکات بۆ

مەلۆتکەکەی، ئەوانیش دەڵێن:﴿ ... كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ ﴾ مريم، واتە: چۆن لەگەڵ کەسێك قسە بکەین کە جارێ مەلۆتکەیەو لە لانکدا پێچراوەیە؟! ئەمجار یەکسەر عیسا ﷺ دێتە قسە: ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ﴾ مريم، واتە: گوتی: من بەندەی خوام، کتێبی پێداوەو بووم بە پێغەمبەر، (واتە: کە گەورەبووم کتێبم پێدەداو دەمکاتە پێغەمبەر، ئەگەرنا خۆ بە مەلۆتکەیی کتێبەکەی کوا؟!)، وە منی موبارەك کردوە بەپێزم لە هەر شوێنێك بم، (مایەی خێرو خۆشییم بۆ خەڵك)، وە خوا ئامۆژگاریی منی کردوە کە نوێژ بکەمو زەکات بدەم، هەتاکو زیندووبم، وە فەرمانی پێ کردووم کە لەگەڵ دایکم چاك بم، وە منی نەکردوە بە کەسێکی ستەمکارو بەدبەخت، وە سڵاوی خوام لێ بێ، (ئاشتیو سەلامەتیی خوا لەسەر من بێ)، ئەو ڕۆژەی کە لە دایك بووم، وە ئەو ڕۆژەی کە دەمرم، وە ئەو ڕۆژەی کە تێیدا زیندوو دەکرێمەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، هەر کاتێك خوا بڕیارێکی دەرکرد، ویستی کارێك بکات، بەس پێی دەفەرموێ: ببە، دەبێ، جا ئایا لێرەدا ڕواڵەتەکەی مەبەستە؟ وە کاتێك خوای بەدیهێنەر شتێکی بوێ، پێی دەفەرموێ: ببە، یاخود ئەوە ڕەمزو هێماو تەعبیرێکە بەکاردەهێنرێ بۆئەوەی ئێمە لێی حاڵی بین، یانی: خوای بێ وێنە هەر کاتێك ویستی شتێ دروست بکات، وەك چۆن ئێمە بە شتێك بڵێین: ببە، یەکسەر ببێ، ئاوا بەو شێوەیە خوا بە خێرایی شتان دروست دەکات، واتە: مەبەست پێی خێرایی دروستبوونی شتەکانە، کاتێ ئیرادەی لەسەریان بوو؟ دیارە ئەوەی دووەمیان مەبەستە، ئەگەرنا مەرج نیە خوای بەرز بە

هەموو شتێك بفەرموێ: ببە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: شتێك كە بوونی نیە، (معدوم)ە، خۆ قسەی لەگەڵدا ناكرێ، پێی بڵێی: ببە، جارێ نیە تا قسەی لەگەڵ بكات، كەواتە: لەڕاستییدا مەبەست ئەوەیە كە ئەگەر یەكێك لە ئێوە بە شتێك بڵێ: پەیدابە، یەكسەر پەیدابێ، چەند خێرایە، بۆ ئەوەی لە عەقڵی ئێمە نیزیكی بخاتەوە، ئیرادەی خواش كاتێك ڕوو دەكاتە شتێك بۆئەوەی دروستی بكات، بەو شێوەیە یەكسەرو بێ دواكەوتن ئەو شتە دەستبەجێ دروست دەبێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴾، پێشتر باسمان كرد، ناگونجێ مەبەست لە (كتاب)و (حكمة) هەمان تەوراتو ئینجیل بێ، تەورات ئەو كتێبو شەریعەتەیە كە خوا بۆ مووسای ناردوە، وە ئینجیل ئەو كتێبەیە كە خوا بۆ عیسای ناردوە (علیهما السلام)، كەواتە: (كتاب) یان بەمانای ئەو یاسایانەیە كە بەشێكن لە تەوراتو ئینجیل، كە لەبەر گرنگیی بە جیا باسكراون، یاخود (كتاب) لێرە بە مانای نووسینە، وە (حكمة)تیش، واتە: دانایىو وەستایی كە پێشتر پێناسەمان كردو لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)ش دا بەدرێژیی پێناسەمان كردوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** جیاوازیی موعجیزەكانی پێغەمبەران (علیهم السلاة والسلام) لەڕووی حیكمەتێكی بەرزەوەیە، مووسا ﷺ گۆچانی هەیە، كە فڕێی دەدا دەبێتە حەزیا، وە كە دەستی دەخستە بن هەنگڵی ڕووناك دەبوو، وە كۆمەڵێك موعجیزەی دیكە، وەك خوای پەنهانزان باسیان دەكات لە ئایەتەكانی (١٣٠ -١٣٣)ی سوورەتی (الأعراف)دا، عیسا ﷺ موعجیزەكەی شتێكی دیكە بووە، مردوو زیندوو دەكاتەوە، نەخۆش چاك دەكاتەوە، لە قوڕ شێوەی باڵندە دروست دەكاتو فووی پێدادەكاتو دەبێتە باڵندەو ژیانی دەچێتەبەر، هەواڵیان پێدەدات بە خواردن، كە چییان خواردوەو چییان

هەڵگرتوە، موعجیزەی پێغەمبەر صالح ﷺ حوشتر بووە، بەڵام ئایا بۆچی موعجیزەی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ قورئان بووە؟ حیكمەتەكەی ئەوەیە كە خوا ﷻ خەڵكی ئەو ڕۆژگارانە، بە چ شتێك زۆر سەرسام بوون، بە چ شتێك پێویست بووبێ تەحەددا بكرێ، موعجیزەی پێغەمبەرەكانی بەو شێوەیە داناوە، بۆ وێنە: لە سەردەمی عیسادا ﷺ زانستی پزیشكیی زۆر باو بووە، هەر كەسێك پزیشكێكی ماهیرو شارەزا بووبێ، پێی سەرسام بوون، خوای كاربەجێ موعجیزەیەكی داوەتە عیسا ﷺ كە پێی پێش هەموو پزیشكان كەوتۆتەوە، نەك هەر بۆ سەردەمی خۆی، بەڵكو بۆ دوای خۆیشی، كێ دەتوانێ مردوو زیندوو بكاتەوە؟ كێ دەتوانێ لە قوڕ شێوەی باڵندە دروست بكاو بیكاتە باڵندە؟ كێ دەتوانێ كوێری زگماك‌و گەڕوگولی زگماك چاك بكاتەوە؟ هەروەها موعجیزەی پێغەمبەرەكانی دیكەش بە هەمان شێوە لەگەڵ پێداویستی فیكریی‌و كلتوریی ڕۆژگاری خۆیاندا گونجاو بوون.

**مەسەلەی دەیەم:** عیسا ﷺ كە دەفەرموێ: ﴿ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ ﴾، واتە: من لە قوڕ لە شێوەی باڵندەدا بۆتان دروست دەكەم، وە فووی پێدادەكەم‌و بە فەرمانی خوا دەبێتە باڵندە، واتە: باڵندەیەكی زیندوو، ئنجا وشەی: ﴿ أَخۡلُقُ لَكُم ﴾، بەمانای وەدیهێنان‌و لە نەبوون هێنانەدی نیە، چونكە ئەوە تەنیا بە خوای بەدیهێنەر دەكرێ، وە لە زۆر شوێنی قورئاندا خوای بەرز سیفەتی دروستكردن (خلق)ی، بە سیفەتی تایبەتی خۆی داناوە، كەواتە: دەبێ ئەم وشەی (أخلق)ە، كە عیسا ﷺ بۆخۆی بەكاری هێناوە، مەبەستێكی دیكەی هەبێ، با تەماشای بكەین: خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ۝٦٢ ﴾الزمر، واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە، وە لەسەر هەموو شتێك چاودێرەو مشوورگێڕە، كەواتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە، وە هیچ كەس هیچ شتێكی دیكەی دروست نەكردوە، وە لە

سووورەتی (الرعد)دا فەرموویەتی: ﴿ ... قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: بڵێ: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، وە ئەو تەنیایەو ملپێکەچکەرە، وە لە سووورەتی (النحل)دا فەرموویەتی: ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: ئایا ئەو کەسەی کە دروست دەکات، وەك ئەوە وایە کە دروست ناکات، بۆچی پەند وەرناگرن؟ کەواتە: کێ لە نەبوونەوە دروست دەکاتو دێنێتە دی؟ تەنیا خوا ﷻ، ئەدی ئەو وشەیەی عیسا ﷺ کە دەفەرموێ: (أخلُقُ) ماناکەی چییە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ماناکەی وێنە کێشانە، واتە: وێنە دەکێشم، یاخود بەمانای دروستکردنی ڕواڵەتییە، یان بەمانای قوڕ خڕدەکەمەوەو شێوەی باڵندە دروست دەکەم، یان بەمانای دەستکارییکردنە (جَعْل)، واتە: وشەی (أخلُقُ)یان بە مانای وێنەکێشان (تصویر)، یان بە مانای دروسکردن (صنع)، یان بەمانای دەستکاریی کردن (جَعْل)ە، نەك بەمانای هێنانەدی لە نەبوون[1].

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە عیسا ﷺ بە وەچەی ئیسرائیلی فەرمووە: ﴿ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، واتە: بۆتان حەڵاڵ دەکەم هەندێك لەوەی کە لێتان قەدەغەکراوە، ئنجا ئایا چییان لێ قەدەغە کرابوو؟ لێرەدا عیسا ﷺ هەر بە کورتی دەفەرموێ: هەندێ لەوەی کە لێتان قەدەغە کرابوو بۆتان حەڵاڵ دەکەم، بەڵام خوای پەروەردگار لە سووورەتی (الأنعام) لە ئایەتی (١٤٦)دا بۆمان ڕوونەکاتەوە، کە جوولەکەکان، وەچەی ئیسرائیل، چییان لێ قەدەغە کرابوو، وە لەبەرچیش لێیان قەدەغە کرابوو؟ بۆیە دەڵێین: قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ

---

١) (مفردات ألفاظ القرآن)، ص: (٢٩٦)، لفظ (خلق)، کە گوتوویەتی: (وليس الخَلْق الذي هو الإبداع الاّ لله تعالى ... وأمّا الّذي يكوُن بالإستحالة فقد جعله الله تعالى لغيره في بعض الأحوال كعيسى حيث قال: ﴿ ...وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي ... ﴿١١٠﴾ ﴾ المائدة.

حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍۖ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍۚ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾، واتە: وە لەسەر جوولەکەکان قەدەغەمان کردبوو هەموو خاوەن نینۆکێك (وەك: قازو مراویو وشترو وڵاخە بەرزەو هەرچی کە سمی هەبێ) وە لە مانگا (واتە: ڕەشە وڵاخ)و مەڕو بزنیش بەزو چەورییەکەیانمان لێ قەدەغە کردبوون، مەگەر ئەو چەوریيو دونگەی، کە بە پشتیانەوە نووساوە، یان لەنێو ڕیخەڵۆکاندا هەبوو، (لەبەر ئەوەی نەدەکرا لێك جیا بکرێتەوە)، یاخود ئەوەی کە لەگەڵ ئێسقاندا تێکەڵ بووەو لێك جیا ناکرێتەوە، (جا ئایا هۆکاری قەدەغەکرانی ئەوانە چی بوو؟ خوای کاربەجێ دەفەرموێ:) سزامان دان بەهۆی لە ڕێ دەچوونیانو سنوور شکێنییان، وە ئێمە ڕاستگۆین، ئەوە خوا وا دەفەرموێ، جا ئایا کێ لە خوا ڕاستگۆترە؟! بێگومان هیچ کەس، هەروەها لە سوورەتی (النساء)دا زیاتر ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی ئەو شتانەی لێ قەدەغەکردوونو دەفەرموێ: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ...﴿١٦١﴾ ﴾، واتە: وە بەهۆی ستەم لەلایەن جوولەکەکانەوە، چەند خواردنێکی بە تامو چێژو خۆشمان لێ قەدەغە کردبوون، (کە لە ئەسڵدا پیسو خراپ نین، بەڵام بە هۆی ستەمو خراپەی ئەوانەوە خوا هەندێ شتی چاکی لێ قەدەغە کردبوون، ڕەنگە کام شتەی پێیان خۆشبووە خوای بەرز ئەوەی لێ قەدەغە کردبن، وەك سزا) کە پێشتر بۆیان حەڵاڵ بوو، لە سۆنگەی ئەوەوە کە زۆریان خەڵك لەڕێی خوا لادەدا، وە بەهۆی ئەوەوە کە سوودیان وەردەگرت کە لێشیان قەدەغە کرابوو، (کە ئێستاش نەصرانییو جوولەکەکان هەر مامەڵە بە سوو دەکەن، بەڵام خوا ڕاست دەفەرموێ: لێی قەدەغە کردبوون، هەرچەندە ئەوکاتیش مامەڵەیان بە سوود هەر دەکرد،

بەتایبەتی جوولەكەكان) وە بە هۆی ئەوەوە كە ماڵی خەڵكیان بە ناهەق دەخوارد.. لێرەدا خوای زاناو شارەزا بۆ قەدەغەكردنی ئەو خواردنە خۆشانە، چوار هۆكاری باسكردوون:

یەكەم: زوڵم كردن.

دووەم: خەڵك لە ڕێی ڕاست لادان.

سێیەم: سوود خۆریی.

چوارەم: ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردن.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، پارێز لە خوا بكەنو بە قسەی من بكەن، پەرستنو پارێز كردن تەنیا لە خوایە، پەرستنو عیبادەت تەنیا بۆ خوایەو، تەقواش تەنیا بۆ خوایە، تەقوا بۆ كەس ناكرێو تەنیا تەقوا بۆ خوا دەكرێ، ﴿ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ ﴾الزمر، واتە: ئەی بەندەكانم! تەنیا پارێز لە من بكەن، بەڵام فەرمانبەریی بۆ خوای پەروەردگاریش دەكرێو بۆ پێغەمبەریش دەكرێ ﷺ، وە بۆ غەیری پێغەمبەریش ﷺ دەكرێ، بۆیە خوا ﷻ كە باسی عیبادەت دەكات، تایبەتی دەكات بەخۆیەوە، وە كە باسی تەقوا دەكات تایبەتی دەكات بەخۆیەوە، بەڵام كە باسی فەرمانبەریی (إطاعة) دەكات، دەیگشتێنێ بۆخۆیو بۆ پێغەمبەر ﷺو بۆ مشوور خۆرانو كاربەدەستانیش، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ...﴿٥٩﴾ ﴾النساء، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بكەنو، فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن، وە هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** كە عیسا عليه السلام دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴾، واتە: بێگومان خوا پەروەردگاری منیشو ئێوەشە جا هەر ئەو بپەرستن، ئا ئەوەیە ڕێی ڕاست، كەواتە: بێجگە لە خوا ﷻ هیچ

کەس پەروەردگار نیە، وە نابێ بەشی هەبێ لە پەرستن دا، دەبێ کێ بپەرسترێ؟ کەسێك کە دروست دەکاتو بەخێو دەکات، کەسێك کە بەدیهێنەرو پەروەردگارە، ئنجا ئایا کێ بەدیهێنەرە؟ تەنیا خوا، وە کێ پەروەردگارە؟ تەنیا خوای بێ وێنە، بۆیە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ئا ئەوە ڕێی ڕاستەو ڕاستە شەقامە، واتە: هەر کەسێك لەو ڕێگایە لابدات، ئەوە کەچ ڕۆیشتوەو لە ڕاستە شەقام لایداوە.

## دە (١٠) جۆرە شیرك كە هەندێك لە مسوڵمانان پێیانەوە گیرۆدە بوون:

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە هەندێك لە مسوڵمانانیش لەو بوارەدا کەمو زۆر تووشی لادانو خلیسکان بوون، وە هەندێ جۆرە خواپەرستیی کە دەبێ تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدرێن، کەچی غەیری خوایان تێدا بەشدار دەکەن، بۆ وێنە:

یەکەم/ پاڕانەوە لە غەیری خوا: هەندێ خەڵك هەیە لە غەیری خواش دەپاڕێتەوە! لە حاڵێکدا کە پاڕانەوە خواپەرستییە، وەك لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ} رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، وَحَسَّنَهُ الألباني في (سُنَن أَبِي دَاوُدَ)، واتە: پاڕانەوە خودی خوا پەرستییە، ئنجا ئێمە لە سوورەتی (الفاتحة)دا دەڵێین: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾، واتە: هەر تۆ دەپەرستینو داوای یارمەتیش هەر لە تۆ دەکەین، پاشان دوعا لە قورئاندا بەمانای عیبادەت هاتوە، وە عیبادەت بەمانای دوعا هاتوە[1]، بەڵام هەندێك لە مسوڵمانان لە غەیری خوا دەپاڕێنەوە، بەڵكو جاری وایە نەك هەر لە زیندوو بەڵکو لە مردووش دەپاڕێنەوە، لەو ئێسكو پروسکانە

---

١) بۆ وێنە: ﴿... وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ۝٤٨ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ... ۝٤٩﴾ مريم.

دەپارێنەوە! كە ئەوە شیركی گەورەیەو ئینسانی پێ لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەچێتە دەر.

دووەم/ شیفا خواستن لە غەیری خوا: شیفا دەبێ تەنیا لە خوا بخوازرێ، وەك پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ الشعراء، واتە: ئەگەر نەخۆش بووم هەر خوایە شیفام دەدات، بەڵێ، دكتۆر دەور دەبینێ، دەرمان دەور دەبینێ، ئەوانە هۆكارن، بەڵام ئایا شیفاهێن (شافي) كێیە؟ تەنیا خوای زاناو توانایە، كێ دەرمانەكەی دروست كردوە، كێ دكتۆرەكەی سەركەوتوو كردوە بۆئەوەی چارەسەری نەخۆشەكە بدۆزێتەوەو ئەو دەرمانەی بۆ دابنێ؟ بێگومان خوا ﷻ.

كەواتە: خوای كاربەجێ شیفادەرە، وە لە ڕاستیدا جاری وا هەیە هەرچی داوو دەرمانو دكتۆرە كۆی بكەیەوە بۆ چارەسەری نەخۆشییەك، ئەگەر خوا نەیەوێ چاك نابێتەوە، كەچی جاری واهەیە بەبێ هۆكاریش نەخۆشەكە چارەسەر دەبێ، یان بە هۆكارێكی نائاسایی، بۆ وێنە: دوعای ئینسانێكی صاڵح.

سێیەم/ طەواف بە دەوری غەیری كەعبەدا: طەواف تەنیا دەبێ بە دەوری ماڵی خوادا بكرێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ﴾الحج، كەچی خەڵكێكی نەزان بە دەوری گۆڕو مەزارو مەرقەدی هەندێ لە پیاوچاكاندا طەواف دەكەن، كە ئەوە خواپەرستییە! بۆیە دەبێ تەنیا بۆ خوای پەروەردگار ئەنجام بدرێو بەس بە دەوری كەعبەشدا بێ، ئەگەرنا مزگەوتەكانی دیكەش ماڵی خوان، بەڵام بە دەوری هیچ مزگەوتێكدا طەواف ناكرێ بە نیەتی خواپەرستیی، بەڵام ئەگەر كەسێك بسووڕێتەوە بە دەوری مزگەوتێكدا بۆئەوەی بزانێ چەند دەرگای هەن، یان بزانێ چی لە دەوروبەری هەیە، قەیناكە، بەڵام چ گۆڕبێ، چ مزگەوت بێ، چ هەرشتێكی

دیکەبێ، بەدەوریدا بسوورێتەوەو بە عیبادەتی بزانێ، ئەوە لە ڕاستیدا پێشکەشکردنی خواپەرستییە بە غەیری خوا.

چوارەم/ سوێند خواردن بە غەیری خوا: سوێند تەنیا بە خوا دەخورێ، بۆیە هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا دەخوات ئەوە لە ڕاستیدا خواپەرستییەکی پێشکەش بە غەیری خوا کردوە، کە لە ئەسڵدا هی خوایە، لەبارەی دروست (جائز) نەبوونی سوێند خواردن بە غەیری خواش، فەرمووده زۆرن، بۆ نموونە: {عَنْ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنه إنِّي سَمِعْتُ رَسولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَشْرَكَ)} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٦٠٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٣٥) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٥) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرط الشيخين، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٥١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٣٥٨) وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٠٤٢)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سوێند بە غەیری خوا بخوا، ئەوە هاوبەشی (بۆ خوا) پەیداکردوە.

پێنجەم/ بەکارهێنانی سیفەتی خوا بۆ بەندە: کەسی وا هەیە پێی وایە، فلانە شێخ، یان فلانە کەس و... هتد، هەموو شتێك دەزانێو دەتوانێ ! بەڵام تەنیا خوای زاناو توانایە، کە هەموو شتێك دەزانێو دەتوانێو ئەوانە سیفەتی خوان، نابێ بۆ غەیری خوا بەکاربهێنرێن، ئەگەرنا مانای وایە ئەوکەسە غەیری خوای پەرستوەو وە ئەوەش بەدڵنیایی شیرکە، چونکە ڕیشەی شیرك بریتیە لە: غەیری خوا وەك خوا سەیرکردن، وەك خوا لەسەر زمانی ئەوانەی بەهۆی شیرك‌و کوفرەوە گیرۆدەی دۆزەخ بوون، فەرموویەتی: ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾ الشعراء، کەواتە: یەکسانکردنی غەیری خوا لەگەڵ خوادا، لە هەر ڕوویەکەوە بێ، شیرکە!

شەشەم/ پشت بەستن بە غەیری خوا وەك چۆن پشت بە خوا دەبەسترێ، كەسی واهەیە بە هەمان شێوەی خوا، پشت بە شتێكی دیكە دەبەستێ، كە ئەوە شیركە، چونكە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿... وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾﴾ إبراهيم ، واتە: وە با پشت بەستووان تەنیا پشت بە خوا ببەستن، وە فەرموویەتی: ﴿... وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾ آل عمران ، واتە: وە با ئیمانداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، كەواتە: هەر كەسێك پشت بە غەیری خوا ببەستێ، ئەوە لە ڕاستییدا شیركی كردوەو، پەرستنێكی بۆ غەیری خوا بەكارهێناوە.

حەوتەم/ خۆشویستنی غەیری خوا وەك خوا: بێگومان ئەوپەڕی خۆشویستن دەبێ بەس بۆ خوا بێ، هەركەسێك شتێكی خۆشبوێ بە ئەندازەی ئەوەی كە خوای خۆشدەوێ، ئەوە لە ڕاستییدا پەرستنێكی بەكارهێناوە بۆ غەیری خوا، لە كاتێكدا كە تایبەتە بە خواوە، ئێمە دەبێ كێمان لە هەموو كەسێك‌و هەموو شتێك خۆشتر بوێ؟ خوای بەرزو مەزن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿...وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ... ﴿١٦٥﴾﴾ البقرة، واتە: وە ئەوانەی بڕوادارن خۆشەویستییان بۆ خوا لە خۆشەویستیی هەموو كەس زیاترە بۆ خۆشەویستەكانی خۆیان.

هەشتەم/ بەگەورە گرتن (التَعْظِيم): ئەوەش دیسان سیفەتێكی تایبەتی خوای زاڵی خاوەن شكۆییە، دەبێ تەنیا بۆ خوا بێ، وە هەركەسێك كەسێك یان شتێك زۆر بە گەورە بگرێ‌و بیهێنێتە ڕیزی خوا، ئەوە مانای وایە ئەو كەسە یان ئەو شتەی پەرستوەو كردوویەتی بە هاوبەشی خوا، چونكە بەرزیی‌و مەزنیی ڕەها (العلو والعظمة المطلقة) تەنیا هی خوایە: ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾﴾ البقرة.

نۆیەم/ ملكەچبوون: كەسی واهەیە وەك چۆن مل بۆ خوا كەچ دەكات، ئاواش مل بۆ غەیری خوا كەچ دەكات، وەك چۆن ئەگەر گوترا: ئەوە

حوکمی خوایە، ملی بۆ کەچ دەکات، بەو شێوەیەش مل بۆ حوکمی کەسێکی دیکەش کەچ دەکات، کەواتە: ئەویشی پەرستوە، وەك چۆن خوای پەرستوە، بۆچی؟ چونکە وەك خوا مامەڵەی لەگەڵ کردوەو لەگەڵ خوادا یەکسانی کردوەو ئەوەش کوفرو شیرکە.

دەیەم: ترسانو سامو هەیبەت لێکردن وەك هی خوای زاڵ: ئینسان دەبێ وەك ئەوەی لە خوا دەترسێو شەرمی لێ دەکاو سامو هەیبەتی خوای لە دڵ دایە، بەرانبەر بە هیچ کەسو شتێکی دیکە وانەبێ، هەرکەسێك ئاوا مامەڵەت لەگەڵدا کرد، وەك لەگەڵ خوادا دەیکەی، ئەوە لە ڕاستییدا پەرستنێکت بۆ داناوە، کە تەنیا هی خوایە، لەبارەی تەنیا لێترسانی خواشەوە بە شێوەیەکی ڕەهاو شایستەی خوا، خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾ آل عمران، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴿١٨﴾ ﴾ التوبة، ئەمانە هەموویان بە شیرك لەقەڵەم دەدرێن، وە شیرکی گەورەشن، چونکە ئینسانیان پێ لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەچێتە دەر.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەشمان هەر لە خزمەت سوورەتی (آل عمران)داین‌و ئایەتەكانی: (٥٢ تاكو ٦٣) تەفسیر دەكەین، واتە: دوازدە ئایەت، كە لەو دوازدە ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی داواكردنی عیسا ﷺ بۆ پشتگیریی، وە ئامادەیی دەربڕینی حەوارییەكان، واتە: هاوەڵانی تایبەتی عیسا ﷺ دەكات، وە باسی پیلانی دوژمنانی عیسا ﷺ دەكات بۆ كوشتنی، وە نەخشەی خوای كاربەجێ‌و هەڵوەشاندنەوەی پیلانی ناحەزانی عیسا ﷺ بۆ دەربازكردنی لە چنگیان‌و بەرزكردنەوەی، وە باسی سەرەنجامی هەركام لە بڕواداران‌و بێبڕوایان لە دوارۆژدا دەكات، وە باسی بەراوردكردنی دروستكردنی عیسا ﷺ وە ئادەم ﷺ دەكات، وە باسی موباهەلەو وتووێژ دەكات لە نێوان وەفدی نەصرانییەكان كە لە نەجرانەوە هاتبوون، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە سەرەنجام وایان دەربڕی كە نەهاتوونەتە قەناعەت، خوای پەروەردگاریش باسی ئەوە دەكات كە بانگیان بكە بۆ موباهەلە كە دوایی ڕوونی دەكەینەوە مەبەست پێی چییە؟! پاشان باسی ڕاستە شەقامی خۆی دەكات، وە باسی ئەوە دەكات كە ئەو زانایە بەو كەسانەی پشت هەڵدەكەن‌و ڕوو لە ڕاستی وەردەگێڕن.

﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ

خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ ثُمَّ إِلَىَّ
مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ
عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ
مِنَ ٱلْءَايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ
ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ
بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا
وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ
ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ
عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((جا کاتێك عیسا هەستی بە کوفریان کرد، گوتی: کێ پشتیوانم دەبێ بەرەو خوا؟ حەوارییەکان، گوتیان: ئێمە پشتیوانانی خواین، بڕوامان بە خوا هێناوەو شایەدبە ئێمە مسوڵمانین ﴿٥٢﴾ پەروەردگارمان! بڕوامان بەوە هێنا کە ناردووتە خوار، وە شوێن پێغەمبەر کەوتین، دەجا لەگەڵ شایەداندا بمانووسە ﴿٥٣﴾ وە ئەوان (ناحەزانی عیسا ﷺ) فێڵیان کرد، وە خواش تەگبیری کرد، وە خوا چاکترین تەگبیرکەرە ﴿٥٤﴾ یادبکەوە کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا! من بەتەواویی وەرتدەگرمو بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە، وە لەوانەی بێبڕوان پاکت دەکەمەوە، وە ئەوانەی شوێنتکەوتوون، هەتا ڕۆژی دوایی دەیانخەمە

سـەروو ئەوانـەی بێبـڕوان، پاشـان گەڕانـەوەتان بـۆ لای منـەو، لـەوەدا کـە تێیـدا کەوتوونەتـە مـشتومڕەوە، دادوەرییتـان لـە نێوانـدان دەکـەم ﴿٥٥﴾ جـا ئەوانـەی بێبـڕوان بـە ئـازارێکی تونـد سـزایان دەدەم لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا، وە هـیچ یارمەتیدەریـشیان نـابن ﴿٥٦﴾ وە هەرچـی ئەوانەشـن کـە بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشەکان دەکەن، ئەوە بە تەواویی پاداشتی خۆیان دەدەاتەوە، وە خـوا ستەمکـارانی خۆشـناوێن ﴿٥٧﴾ بێگومـان ئـەوەی بەسەرتـدا دەخوێنرێتـەوە لـە ئایەتـەکانو بیـرخەرەوەی کاربەجێیـە ﴿٥٨﴾ بێگومـان وێنـەی عیـسا لـەلای خـوا، وەك وێنـەی ئادەمـە کـە لەگـەڵ دروسـتی کـردو فـەرمووی: ببـە، یەکـسەر بـوو ﴿٥٩﴾ هـەق لـە پەروەردگارتەوەیـە، بۆیـە لـە گومانـداران مەبـە ﴿٦٠﴾ وە هـەر کـەس پـاش ئـەوەی زانیارییـت بـۆ هـات (لـەبارەی دروسـت بـوونی عیـساوە ﷺ) شـەڕە قـسەی لەگـەڵ کـردی، پـێـیـان بڵـێ: وەرن کوڕانمـانو کوڕانتـان، وە ئافرەتانمـانو ئافرەتانتـان، وە خۆمـانو خۆتـان، بـانگ بکـەینو پاشـان بپاڕێینـەوەو نـەفرینی خـوا لـە درۆزنـان بکەین﴿٦١﴾ بێگومان ئەوە هەواڵی ڕاستە، وە جگە لە خـوا هـیچ پەرسـتـراو نـین، وە بێگومـان خـوا زاڵی کـاربەجێیە ﴿٦٢﴾ جـا ئەگـەر پـشتیان هەڵکرد، ئـەوە بێگومـان خـوا بە تێکدەران زانـایە ﴿٦٣﴾)).

## شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەکان

(**أَحَسَّ**): واتە: هەستی پـێکرد، دەگـوترێ: (أَحْسَسْتُهُ: أَدْرَكْتُهُ بِحَاسَّتِي، وَأَحَسْتُ مِثْلُهُ) (أَحْسَسْتُهُ)، واتـە: بـە هەسـتەوەرەکانم پـەییم پـێبرد، وە (أَحَسْتُ)، واتە: هەستم پـێکردو زانیم.

(**الْحَوَارِيُّونَ** ): کـۆی (حَوَارِي)یـە، (حَوَارِي) یـان لـە پاککردنـەوەوە هـاتوە، لەبـەر ئـەوەی کـە شـوێنکەوتووەکانو هاوەڵە تایبەتـەکانی عیـسا ﷺ - خـوا لێیـان

ڕازی بێ -، خەڵکیان پاکدەکردەوە لە شیرك و کوفرو سیفەتی خراپ، یاخود لەبەر ئەوە کە پیشەیان بریتی بوو لە جل سپی کردنەوە (قصَّار) بوون، هەندێکیش دەڵێن: (حَوَارِيّ) بە مانای پشتیوان (ناصر) دێ، بۆیە گوتراوە: (الحَوَارِيُون: اسْمٌ لأنْصَارِ عِيسَى عليه السلام وَسُمُّوا بِهَذَا الإسم لأنَّهُمْ كَانُوا يُطَهِّرُونَ نُفُوسَ النَّاسِ بِإِفَادَتِهِم الدِّين وَالعِلْمِ، أَو لأنَّهُمْ كَانُوا قَصَّارِينَ)، دیارە جل سپی کردنەوە ئەوکات پیشەیەك بووە، ئەوان هەیان بووە، یاخود لەبەر ئەوە بووە کە یارمەتیدەری عیسا عليه السلام بوون، ئەگەر حەواریی بەمانای یارمەتیدەرو پشتیوان بێ.

(**ٱلشَّٰهِدِينَ**): واتە: شایەدیدەران، کە کۆی (شَاهِد)ە، (الشَّهَادَةُ: قَوْلٌ صَادِرٌ عَن عِلْمٍ حَصَلَ بِمشاهَدَةِ بَصيرَةٍ أَوْ بَصَرٍ)، واتە: شایەدییدان: قسەیەکە لە زانیارییەوە دەرچووە، زانیارییەك کە لە ئەنجامی دیتنی چاو، یاخود دیتنی عەقڵەوە پەیدابووە، واتە: کەسێك کە شایەدییدا، دەبێ یان بە چاو شتەکەی بینیبێ، یان دڵنیا بووبێ بە عەقڵ و دڵ کە ئەو شتە وایە.

(**وَمَكَرُواْ**): واتە: فێڵیان کرد، (الْمَكْرُ: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يقصِدُهُ بِحِيلَةٍ، وَذَلِكَ ضَرْبَانِ: مَكْرٌ مَحْمُودٍ وَهُوَ أَنْ يَتَحَرَّى بِذَلِكَ فِعْلَ جَمِيلٍ، وَمَذْمُومٌ وَهُوَ أَنْ يَتَحَرَّى بِهِ فِعْلَ قَبِيحٍ)، واتە: لە زمانی عەرەبییدا وشەی: (مَكْر) بریتیە لە لادانی بەرانبەرەکەت لەو ئامانجەی دەیەوێت، وە بە فێڵێك لایبدەی بە شێوەیەك کە بۆ خۆی هەستی پێنەکات، جا ئەویش دوو جۆرە:

**فێڵی باش**: کە ئەوە مەبەست پێی هێنانەدی کردەوەیەکی باشبێ.

**فێڵی خراپ**: ئەویش ئەوەیە کە بەهۆی ئەو فێڵەوە بیەوێ کردەوەیەکی خراپ، یان ئامانجێکی خراپ بێنێتە دی، ئنجا وشەی: (مَكْر) کە بۆ دوژمنانی عیسا عليه السلام بەکارهاتبێ، بە مانای پیلان و فێڵ لێکدەدرێتەوە، بەڵام کە بۆ خوای دادگەر بەکارهاتبێ، بە مانای تەگبیرو نەخشەکێشانە.

(مُتَوَفِّيكَ ): بە سێ واتا هاتوە: (مُمِيتُكَ أَوْ مُنِيمُكَ أَوْ قَابِضُكَ) واتە: دەتمرێم یان دەتخەوێنم یان وەرتدەگرم، وە دەگوترێ: (تَوَفَّى الْمُدَّة: بَلَغَهَا وَاسْتَكْمَلَهَا) واتە: ماوەكەی تەواو كردو گەیاندیە سەر، یاخود تەواوی كرد، كە دوایی باسی دەكەین، خوای بەرزو مەزن كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ ﴾، دەبێ سەرنج بدەین كام مانایان لەگەڵ سیاقەكەدا دەگونجێ، ئەگەرنا لە ئەسڵدا (مُتَوَفِّيكَ) ئەو سێ واتایەی هەیە: مراندنو خەواندنو وەرگرتن.

(ٱلْمُمْتَرِينَ): (إمْترَى) واتە: (شَكَّ) یانی: كەوتە گومانەوە، (الـمُمْتَرِينَ)، واتە: (الشَاكِّينَ) ئەوانەی لە گوماندان.

(نَبْتَهِلْ): (البَهْلُ وَالإبتِهَالُ في الدُّعَاءِ: الإِسْتِرسَالِ فِيهِ) هەردوو وشەی: (بَهْل)و (إبتِهَال) لە پاڕانەوەدا، واتە: زۆر بپاڕێیەوە، كەواتە: (نَبْتَهِلْ)، واتە: زۆر دەپاڕێینەوە، (وَفُسِّرَ الإبتِهَالُ باللعن) وە (إبتِهَال) بە لەعنەتیش مانا كراوە.

(لَّعْنَتَ ٱللَّهِ): واتە: نەفرینی خوا، (الَّلعْنُ: الطَّرْدُ والإبْعَادُ عَلَى سَبيلِ السَّخَطِ وذَلِكَ مِنَ اللهِ تعالى في الآخِرَةِ عُقُوبَةٌ وفي الدُّنيا انْقِطَاعٌ مِنْ قَبُولِ رَحْمَتِهِ وتَوفِيقِهِ)، واتە: (لعْن) دەركردنو دوورخستنەوەیە، بەشێوەی لێتووڕەبوون، كە ئەوەش لەدواڕۆژدا سزادانە لەلایەن خوای بەرزەوە، وە لە دنیادا دابڕانە لە وەرگرتنی بەزەییو هاوكاریی خوا.

(ٱلْقَصَصُ ): لە زمانی عەرەبییدا بە سێ واتایان دێ، وەك لە (المعجم الوسيط)دا هاتوە:

یەكەمیان: (الْخَبَرُ الْمَقْصُوص)، واتە: هەواڵێكی گێڕدراوە.

دووەمیان: (رِوَايَةُ الْخَبَر)، واتە: گێڕانەوەی هەواڵێك.

سێیەمیان: (الأثَـر)، واتە: شوێنەوار[١]، وە (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (قَصَص: القَصُّ تَتَّبُعُ الأثَرِ) وشەی: (قَصَص) بریتیە لە شوێنکەوتنی شوێنەوارێك، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا ٦٤﴾ الكهف، واتە: بە شوێن پێکانی خۆیاندا ڕۆیشتنەوە (وَالقَصَصُ: الأخْبَارُ الْمُتَتَبَّعَةُ) (قَصَص) بریتیە لە هەواڵێك گێڕدرابێتەوەو تەحقیقی تێدا کرابێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٥٩ ﴾، (قُرْطُبي) ئەم بەسەرهاتەی هێناوە: (نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة بِسَبَبِ وَفْدِ نَجْرَان حِينَ أَنْكَروا عَلَى النَّبِيّ ﷺ قَولَه: إنَّ عِيسَى عَبدُ اللهِ وَكَلِمَتُهُ، فَقَالُوا: أَرِنَا عَبْدَاً خُلِقَ مِنْ غَيْرِ أبٍ، فَقَالَ لَهُم النَّبِيّ ﷺ: {آدَمَ مَنْ كَانَ أَبُوهُ أَعَجِبْتُم مِن عِيسَى لَيْسَ لَهُ أَبٌ ؟ فآدَمُ عليه السلام لَيْسَ لَهُ أبٌ وَلا أُمٌّ}[٢]، واتە: ئەم ئایەتە بەهۆی شاندی نەجرانەوە هاتە خوار، کە نکووڵییان کردو ڕەخنەیان گرت لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: عیسا عليه السلام بەندەی خوایەو وشەی خوایە، (واتە: بە وشەی خوا دروست بووە)، گوتیان: بەندەیەکمان پێ پیشان بدە، کە بەبێ باب دروست بووبێ و لەدایك بووبێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی بابی ئادەم کێیە؟ ئایا سەرسام دەبن بەوە کە عیسا عليه السلام بابی نیە، بەڵام سەرسام نابن کە ئادەم نە بابی هەیە، نە دایك؟ بۆیە خوا ئەم ئایەتە موبارەکەی ناردە خوار.

---

١) المعجم الوسيط ، ص: (٧٤٠).

٢) الجامع لأحكام القُرآن للقُرْطُبي، ج: (٤)، ص: (٩٢)، وأسباب النزول للسيوطي برقم: (١٩٨)، وَ أَيضَاً رَوَاهُ ابْنُ أَبي حَاتم مُرْسَلاً.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ ﴾، {عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ الْعَاقِبُ وَالسَّيِّدُ صَاحِبَا نَجْرَانَ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُرِيدَانِ أَنْ يُلاَعِنَاهُ، قَالَ: فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: لاَ تَفْعَلْ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ كَانَ نَبِيّاً فَلاَعَنَّا، لاَ نُفْلِحُ نَحْنُ وَلاَ عَقِبُنَا مِنْ بَعْدِنَا، قَالاَ: إِنَّا نُعْطِيكَ مَا سَأَلْتَنَا، وَابْعَثْ مَعَنَا، رَجُلاً أَمِينًا وَلاَ تَبْعَثْ مَعَنَا إِلاَ أَمِينًا، فَقَالَ: (لأَبْعَثَنَّ مَعَكُمْ رَجُلاً أَمِينًا، حَقَّ أَمِينٍ)، فَاسْتَشْرَفَ لَهُ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: (قُمْ يَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ)، فَلَمَّا قَامَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (هَذَا أَمِينُ هَذِهِ الأُمَّةِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٣٨٠)، واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان - خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: عاقیبو سەیید سەرۆکی نەجرانییەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانویست مولاعەنەی لەگەڵ بکەن (مولاعەنەو موباهەلە، واتە: هەردوولا بپاڕێنەوەو بڵێن: خوایە کاممان درۆزنین لەعنەتمان لێبکە)، یەکێکیان بە هاوەڵەکەی خۆی گوت: ئەم کارە مەکە، (دیارە زانیویانە کە پێغەمبەری خوایە وەك لە ئایەتی دیکەدا هاتوە، واتە: نەك گومان، بەڵکو یەقینیان هەبووە کە پێغەمبەرە) سوێند بە خوا ئەگەر پێغەمبەر بێ ئەوە لەعنەتمان لێ دەکرێ، وە هەرگیز سەرفراز نابین نەخۆمانو نەوەچەی دواییشمان، گوتیان: ئێمە ئەوەت پێدەدەین کە داوات لێکردین، پیاوێکی ئەمینمان لەگەڵدا بنێرە، بەڵام ئەمین نەبێ لەگەڵمان مەنێرە، فەرمووی: پیاوێکی ئەمینو بەڕاستی ئەمیندارتان لەگەڵ دەنێرم، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ حەزیان کرد ئەو ئەرکە بە هەرکامێك لەوان بسپێردرێو خۆیان بۆ ئامادە کرد، فەرمووی: هەڵسە ئەی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح، کاتێك هەڵسا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە ئەمینداری ئەم ئۆممەتەیە.

هەڵبەتە مەبەستی ئەوە نیە، کە تەنیا ئەو ئەمیندار بێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەو لە ئەمانەتو دەست پاکییدا لە یەکەمەکانە، یاخود یەکەمەو پێش هەمووان کەوتۆتەوە.

وە (ابْنُ هِشَام) هەر لەوبارەوە درێژتر هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکەی هێناوە، کە خوای پەروەردگار فەرمان دەکات بە پێغەمبەر ﷺ کە بانگی نەصرانیی یەکان بکات بۆ مولاعەنە، (ابْنُ هِشَام) دەڵێ: {فَلَمّا أَتَى رَسولَ اللّهِ ﷺ الْخَبَرُ مِنْ اللهِ عَنْهُ وَالْفَصْلُ مِنْ الْقَضَاءِ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ وَأَمَرَ بِمَا أُمِرَ بِهِ مِنْ مُلاعَنَتِهِمْ إنْ رَدّوا ذَلِكَ عَلَيْهِ دَعَاهُمْ إلَى ذَلِكَ، فَقَالُوا لَهُ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ! دَعْنَا نَنْظُرْ فِي أَمْرِنَا، ثُمّ نَأْتِيكَ بِمَا نُرِيدُ أَنْ نَفْعَلَ فِيمَا دَعَوْتنَا إلَيْهِ، فَانْصَرَفُوا عَنْهُ، ثُمّ خَلَوْا بِالْعَاقِبِ وَكَانَ ذَا رَأْيِهِمْ، فَقَالُوا: يَا عَبْدَ الْمَسِيحِ مَاذَا تَرَى؟ فَقَالَ: وَاَللّهِ يَا مَعْشَرَ النّصَارَى لَقَدْ عَرَفْتُمْ أَنّ مُحَمّدًا لَنَبِيّ مُرْسَلٌ، وَلَقَدْ جَاءَكُمْ بِالْفَصْلِ مِنْ خَبَرِ صَاحِبِكُمْ، وَلَقَدْ عَلِمْتُمْ مَا لاَعَنَ قَوْمٌ نَبِيّا قَطّ فَبَقِيَ كَبِيرُهُمْ وَلاَ نَبَتَ صَغِيرُهُمْ، وَإِنّهُ لَلْإِسْتِئْصَالُ مِنْكُمْ إنْ فَعَلْتُمْ، فَإِنْ كُنْتُمْ قَدْ أَبَيْتُمْ إلاّ إلْفَ دِينِكُمْ وَالإِقَامَةَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ الْقَوْلِ فِي صَاحِبِكُمْ، فَوَادِعُوا الرَّجُلَ ثُمَّ انْصَرِفُوا إلَى بِلاَدِكُمْ، فَأَتَوْا رَسولَ اللّهِ ﷺ، فَقَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ! قَدْ رَأَيْنَا أَلاّ نُلاَعِنَكَ، وَأَنْ نَتْرُكَكَ عَلَى دِينِكَ وَنَرْجِعَ عَلَى دِينِنَا، وَلَكِنْ ابْعَثْ مَعَنَا رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِكَ تَرْضَاهُ لَنَا، يَحْكُمْ بَيْنَنَا فِي أَشْيَاءَ اخْتَلَفْنَا فِيهَا مِنْ أَمْوَالِنَا، فَإِنَّكُمْ عِنْدَنَا رِضًا)}[1]، واتە: ئیبنو هیشام دەڵێ: کاتێك هەواڵ لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتو بڕیاری کۆتایی لە نێوانی پێغەمبەری خواو نەصرانیی یەکاندا درا، (کە ئەو مشتومڕو تووێژەی کە ڕوویداوە دیارە چەند ڕۆژی خایاندوە، وەك پێشتر باسمان کرد)، وە دوای ئەوەی کە فەرمانی پێکرا تا بانگیان بکاتو موباهەلەیان لەگەڵدا بکات، ئەگەر بانگەوازەکەی پێغەمبەریان قبووڵ نەکردو بەسەریاندا دایەوەو ئیسلامیان

---

١) (السيرة ابْنُ هِشَام، ج: (٢)، ص: (١٣٣).

قبووڵنەکرد، ئنجا پێغەمبەری خوا بانگی کردنو ئەوانیش گوتیان: (یا أبا القاسم) (کە دیارە ئەوە کونییەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، وە ئەوانیش بۆیە وایان دەربڕیوە تا وایپێشان بدەن کە بە پێغەمبەری نازانن، نەیانگوتوە ئەی پێغەمبەری خوا !) ئەی بابی قاسم! لێمانگەڕێ با بیربکەینەوەو سەرنج لە هەڵوێستی خۆمان بدەین، پاشان پێت دەڵێینو وەڵامت دەدەینەوە، بۆ ئەوەی کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، ڕۆیشتن، دواتر لەگەڵ عاقیب بە تەنیا کۆبوونەوە کە زاناو شارەزایان بوو (وە دیارە قسەشی بەدەست بووە) گوتیان: ئەی عەبدولمەسیح (کە ئەوە کونییەی عاقیب بووە) چۆنی دەبینی؟ گوتی: بە خوا کۆمەڵی نەصرانیی یەکان! ئێوە دەزانن کە موحەممەد پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، وە دەربارەی هاوەڵەکەشتان (واتە: دەربارەی عیسا ﷺ) هەواڵێکی کۆتایی بۆ هێناون (کە عیسا ﷺ پێغەمبەری خوایەو بە وشەی خوا دروست بووە، وەك ئێمە دەڵێین)، وە ئێوە دەشزانن، (چونکە خاوەن کتێب بوونە) هیچ کۆمەڵێك نەبووە مولاعەنەیان لەگەڵ پێغەمبەرێکدا کردبێ، دوایی یەکێکی گەورەیان مابێتو یەکێکی بچووکیشیان لە دوای ئەوان پێگەیشتبێ، (واتە: گەورەو گچکەیان بنەبڕ بوون) بۆیە ئەوە دەبێتە هۆی بنەبڕبوونی ئێوە، ئەگەر مولاعەنەی لەگەڵدا بکەنو لەعنەتی خوا بتانگرێتەوە، ئەوە هیچتان نامێننو بنەبڕ دەبن، جا ئەگەر هەر ڕازی نابن، وە ئەو دینەی کە عادەتتان پێوە گرتوە، هەر لەسەری دەمێننەوە، وە ئەو قسەیەی کە دەیڵێن: دەربارەی هاوەڵەکەتان (واتە: دەربارەی عیسا ﷺ کە دەڵێن: کوڕی خوایەو یەکێکە لە سێیەکانو بە هەرسێکیان خوای پەروەردگار پێکدێنن!! کە ئەفسانەی نەصرانیی یەکانە)، هەر لەسەری بەردەوام دەبن، ئەوە واز لەو پیاوە بێننو بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان، هاتن گوتیان: ئەی بابی قاسم! ئێمە وامان بۆ دەرکەوت کە مولاعەنەت لەگەڵدا نەکەین، وە ئێمە لێت دەگەڕێین تۆ لەسەر دینی خۆتبە، وە ئێمەش لەسەر دینی خۆمان دەبین، بەڵام پیاوێکمان لەگەڵ بنێرە لە هاوەڵانت کە تۆ لێی ڕازی بیو جێی پەسندی تۆبێ، بۆ ئەوەی ببێتە دادوەرمان لە هەندێ شتدا لەماڵو سامانمان بە هۆی کێشەو ڕاجیاییەوە با ببێتە دادوەر لە نێوانمان،

چونکە ئێمە متمانەمان بە ئێوە هەیەو لە ئێوە ڕازین، (واتە: ئەو کێشەیەمان بۆ چارەسەر بکات).

جا هەندێك دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ سەرانەی لەسەر داناون و هەندێکیش دەڵێن: نەخێر ئەوکاتە ئایەتی (جزیة) نەهاتبووە خوار، چونکە لە سووڕەتی (التوبة) دایەو ئەو بەسەرهاتەش پێش دیاریکرانی سەرانە بووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مادام مسوڵمان نابن لە بەرانبەر ئەوەدا ئامادەنین مسوڵمان بین و ئامادەش نین مولاعەنەت لەگەڵدا بکەین، ئەوە لە بەرانبەردا ساڵانە بڕێك پارەمان دیاریکرد کە بیدەن.

هەروەها هەر لەوبارەوە کە ئایا پێغەمبەر ﷺ کێ و کێی بانگ کردن، کە لەگەڵ نەصڕانیی یەکان مولاعەنەیان پێ بکات، ئەم فەرمایشتەش هەیە: (لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ﴾، دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلِيًّا وَفَاطِمَةَ وَحَسَنًا وَحُسَيْنًا فَقَالَ: {اللَّهُمَّ هَؤُلاَءِ أَهْلِي}) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٣٧٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٩٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٧١٩) عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنْ أَبِيهِ)، واتە: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار، کە دەفەرموێ پێیان بڵێ: وەرن کوڕانمان و کوڕانتان، وە ئافرەتانمان و ئافرەتانتان، وە خۆمان و خۆتان بانگ بکەین و پاشان بپاڕێینەوە، نەفرینی خوا لە درۆزنان بکەین، پێغەمبەر ﷺ بانگی عەلی و فاطیمەو حەسەن و حوسەینی کردو، فەرمووی: ئەی خوایە! ئەوانە ئەهلی منن، هەتا لە شوێنەوار (أثر)ێکدا هاتوە، دەڵێ: کە نەصڕانیی یەکان پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی کە عەلی و فاطیمەی کچی و حەسەن و حوسەینی نەوەی لە خزمەت دابوون، گوتیان: وەڵڵاهی ئەم دەم و چاوانە دوعا لە هەر کەسێك بکەن، سەلامەت دەرناچێ، مولاعەنەو موباهەلە لەگەڵ ئەوانەدا مەکەن.

## مانـای گـشـتـی ئـایـەتـەكـان

پێشتر خوای پەروەردگار بۆی باسكردین كە پێغەمبەر عیسا ﷺ چۆن پەیامی خۆی ڕوونكردۆتەوەو، موعجیزەی خۆی بۆ وەچەی ئیسرائیل خستۆتە ڕوو، ئنجا دەفەرمویّ: ﴿ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ ﴾، ئنجا كاتێك عیسا ﷺ كوفری لێ دیتن‌و لێ هەست پێكردن‌و دڵنیابوو كە بێبڕوان، واتە: بێبڕوان بە عیسا ﷺو بە پەیامەكەی‌و بە پێغەمبەری نازانن، یاخود دانییپێدا ناهێنن، جا ئایا ئەوانە كێ بوون ؟ دیارە جوولەكەكان بوون، ﴿ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، واتە: عیسا ﷺ فەرمووی: كێ پشتیوانمە بۆ لای خوا؟ كێ ئامادەیەو پشتم دەگرێ بۆ لای ڕەزامەندیی خوا بچین‌و دینداریی بكەین ؟ ﴿ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ﴾، حەوارییەكان گوتیان: ئێمە پشتیوانانی خواین، حەوارییەكان، واتە: هاوەڵە تایبەتەكانی عیسا ﷺ، كە هەندێك دەڵێن: دوازدە كەس بوون، هەندێك دەڵێن: نۆ كەس بوون، ... هتد، بە هەر حاڵ كۆمەڵێك بوون، بەڵام دیارە زۆر نەبوون ﴿ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾، حەواریی یەكان گوتیان: ئێمە بڕوامان بە خوا هێناوە، وە شایەدبە كە ئێمە مسوڵمانین، یاخود ئێمە ملكەچین، وە مسوڵمانەتیش هەر بەمانای ملكەچیی دێ، واتە: ئەوە ئێمە ئیمانمان هێناوە، وە تۆش شایەدمان بە كە ئێمە ملكەچین بۆ خوا عزّ وجل، وە ملكەچین بۆ پێغەمبەری خواو مسوڵمانین، ئنجا خوای زاناو توانا باسی پاڕانەوەیەكی حەواریی یەكان دەكات، كە گوتوویانە: ﴿ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ ﴾، پەروەردگارمان ! بڕوامان بەوە هێناوە كە ناردووتە خوار [ بۆ عیسا ﷺ كە (ئینجیل)ە، وە بۆ غەیری عیساش ﷺ هەرچی پەیامەو ناردووتە ئیمانمان پێیەتی]، وە كەوتینە دوای پێغەمبەریش،

ئنجا ئەو پێغەمبەرە کێیە؟ بێگومان عیسایە ﷺ، ﴿ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، وە تۆش لە شایەدان بماننووسە، لە ڕیزی گەواهیدەران دا بمانووسە، ئێمە شایەدیی دەدەین، کە عیسا پێغەمبەری خوایە، وە ئەو کتێبەی بۆی هاتوە پەیامی تۆیە، ﴿ وَمَكَرُواْ ﴾، خوای زاناو پەنهانزان بە گشتی فەرموویەتی: جوولەکەکانو ناحەزانی دیکەی عیسا پیلانیان گێڕا، هەرچەندە بە پلەی یەکەم مەبەست پێی جوولەکەکانە، ئەوانەی کە بڕوایان بە عیسا ﷺ نەهێنا، ﴿ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ﴾، خواش نەخشەی داناو تەگبیری کرد، وشەی: (مَكر) لەبەر ئەوەی ئەوان مەبەستیان ئەوە بووە ئامانجێکی خراپ بێننەدی، کە بریتی بوو لە: کوشتنی عیسا ﷺ، بەڵام خوای کاربەجێ ویستوویەتی ئامانجێکی باش بێنێتە دی، کە ڕزگارکردنی عیسا بووە، بۆیە دەڵێین: وشەی: (مَكروا) بۆ ئەوان واتە: فێڵیان کرد، ﴿ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ﴾ وە خوای دادگەریش تەگبیری کرد! بۆیە لێرەدا دەبێ بڵێین: وشەی فێڵ دوو واتای هەن، واتای باش، کە تەگبیرکردنە، وە واتای خراپ، واتا باشەکەی بۆ کەسێکە کە ئامانجی باشبێ، واتا خراپەکەشی بۆ کەسێکە کە ئامانجی خراپ بێ، وەك پێغەمبەری خوا لە فەرمایشتێك دا فەرموویەتی: {الْحَرْبُ خِدْعَةٌ} رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٠٣٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٥١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٣٦) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، واتە: جەنگ فێڵە، ﴿ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴾، وە خوا باشترین تەگبیرکەرە، باشترین نەخشەدانەرە، ئنجا باسی ئەوە دەکات کە ئەوان چۆن فێڵیان کردوەو پیلانەکەیان چۆن بوو؟ دیارە ئەوان ویستوویانە عیسا ﷺ بکوژن، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، لە کاتێك دا کە عیسا ﷺ لەگەڵ هاوەڵە تایبەتییەکانی دا (واتە: حەوارییەکان) خۆی حەشاردا بوو، ئەوانیش چوون تاکو عیسا بگرن، دەوری شوێنەکەیان دا، خوای پەروەردگار ئەوە ڕووندەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ ﴾، کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا! من تۆ وەردەگرم،

لێرەدا (مُتَوَفِّيكَ) واتە: بەتەواویی وەرتدەگرم، چونكە (تَوَفّاةُ) واتە: (قَبَضَهُ) یانی: بە تەواویی وەریگرت، لێرەدا بە مانای مراندن نایەت، چونكە عیسا ﷺ ئەگەر خوا مراندبێتی، ئنجا بەرزی كردبێتەوە، ئەوە ناكاتە دەربازكردن، چونكە ئاوا هەر بە مردوو حیسابە! نەء، وە بە مانای خەواندنیش نایەت لەسەر ڕای زۆربەی توێژەرەوانی قورئان، بەڵكو بە مانای (قَابِضُكَ) وەرتدەگرم بە تەواویی، واتە: بە ڕووحو جەستەوە هەڵتدەگرم، ﴿وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، بەرزت دەكەمەوە بەرەو لای خۆم، وە پاكتدەكەمەوە لەوانەی بێبڕوان، واتە: لەنێو ئەوان دەرتدەهێنم، ئەوان كەسانێكی پیسن، خراپن، تۆ شایستەی نێو ئەوان نی، ﴿وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾، واتە: وە ئەوانەی شوێنتكەوتوون دەیانخەمە سەروو ئەوانەی بێبڕوان، تا ڕۆژی قیامەت، واتە: بەسەر واندا زاڵیان دەكەم، كە لێرەدا دەبێ مەبەست ئەوەبێ، ئەوانەی كە شوێنتكەوتوون چ حەوارییەكان، چ لە مسوڵمانانی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ بەسەر بێبڕواییاندا زاڵیان دەكەم، لە ڕووی بەڵگەوە، ئەگەرنا مەرج نیە لە ڕووی زاڵبوونی ڕواڵەتییەوە، هەمیشە شوێنكەوتووانی عیسا ﷺ زاڵبوبن بەسەر نەیارەكانیاندا لە مەیداندا، ﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾، واتە: پاشان گێڕانەوەتان بۆ لای منە، وە من دادوەرییتان لەنێواندا دەكەم، لەوەدا كە لەسەری كەوتوونەتە ڕاجیایی‌و كێشەو مشتومڕەوە ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ﴾، واتە: ئنجا ئەوانەی بێبڕوان ئەوە لە دنیاو لە دواڕۆژدا زۆر بە ئازارێكی توند سزایان دەدەم، وە هیچ یارمەتیدەریشیان نابن، ئەوە بەنسبەت ئەوانەوە، هەم لە دنیادا سزایان دەدەم، كە سزادانی دنیاییان بە دەستی مسوڵمانانە، یان بە ئازارو نەخۆشییەكانە، یان لەسەرە مەرگ دایە، سزای دواڕۆژیش ئەوە دیارە كە دۆزەخە، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾، بەڵام ئەوانەی

بڕوایـان هێنـاوەو كـردەوە باشـەكان ئـەنجام دەدەن، ئـەوە پاداشـتیان بـە تـەواویی دەداتـەوە، ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە خـوا سـتەمكارانی خـۆش نـاوێن، هەڵبەتـە ئێمـە دوایـی باسـی چـۆنیەتی بـەرز كردنـەوەی عیـسا ﷺ دەكـەین، لـە مەسـەلە گرنگەكەكانـدا، چونكە پـێویستی بە باسێكی تایبەت دەكات، وە ڕوونـی دەكەینـەوە چۆنو بۆچی نەصرانیی یەكان كە ئێستا بەهەڵەدا چوونو پـێیان وایـە عیـسا ﷺ لە دار دراوە، لە سێدارە دراوە، چونكە خـوای پەنهـانزان بـە دەقـی قورئـان ڕوونـی كردۆتـەوە كـە لـە سـێدارە نـەدراوەو دەفـەرموێ: ﴿ ... وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ... ﴿١٥٧﴾ ﴾النـساء، واتـە: نەكوشـتیانو نـە لـە سێدارەشـیان دا، نـە هەڵیـشیانواسی، بـەڵكو وێنـەی عیـسایان بـۆ برایـە سـەر وێنـەی یـەكێكی دیكـەو، ئەویان لەجیـاتی عیـسا ﷺ لە سێدارەدا، كە دوایی بە درێژیی باسی دەكەین، ئنجا خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْءَايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، ئا ئەوەی بەسـەرت دا دەخوێنینـەوە لـە ئایەتـەكانو لـە یادخـەرەوەی كاربەجێیـە، دیارە یەكێك لـە ناوەكـانی قورئـان بریتیـە لـە (ذِكْر)، وە یـەكێك لـە سیفەتەكانی قورئـان ئەوەیـە كـە كاربـەجێ (حَكیم)یـە، واتـە: كاربەجێیـە لـە: فەرمانـەكانیو حوكمـەكانیو هەواڵـەكانی دا، كـە هـەموویان لـە شـوێنی خۆیانـدان، وە یـەكێك لـە سیفەتەكانی قورئان ئەوەیـە كـە حەقیقەتـە فیطرییـەكان بیـر ئینسان دەخـاتەوە ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، وێنەی عیسا لە لای خـوا وەك ئادەمە، لە گڵ دروسـتی كـرد، پاشان پـێـی فـەرموو: ببـە، یەكـسەر بـوو، واتـە: دروسـتكرانی عیـسا ﷺ لەلایـەن خـوای زانـاو توانـاوە، هەروەك دروستكرانی ئادەمە، عیسا ﷺ بابی نیـە، كەچی ئـادەم ﷺ نـە بـابی هـەیـە، نـە دایكـی هـەیە، خـوای كاربـەجێ لـە گڵ دروسـتی كـرد، ئەگـەر عیـسا لایەنێكی هەیە، كە دایكـە، ئەوە ئـادەم ﷺ هـیچ كام لـەو دوو لایەنـەی نـەبووە، واتە: نە باب نە دایك، ﴿ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾، واتە: هـەقو ڕاسـتی

لە پەروەردگارتەوەیە تۆ لە گومانداران مەبە، دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ وە لە هەرکەسێکی دیکەیە کە قورئان دەخوێنێتەوەو شوێن پێی پێغەمبەر ﷺ هەڵدەگرێ، کە نەکەوێتە گومانەوە، یانی: لە گومانداران‌و دوودڵان مەبە، ئەوەی بۆت دەگوترێ لەبارەی عیساوە ﵇ کە خوا بەو شێوەیە دروستی کردوە هەقەو لە پەروەردگارتەوەیە ، ﴿ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، ئنجا دوای ئەوە زانیارییت بۆ هات دەربارەی دروستبوونی عیسا ﵇ لە لایەن خوای زاناو شارەزاوە، زانیارییەك کە هیچ تەم‌ومژی بەسەرەوە نیە، وە هیچ خڵتەی هەڵەو پەڵەی تێدانیە، کە لە زانیاری بێسنووری خواوە هاتوە، هەرکەسێك لەبارەی عیساوە ﵇، لەمەو دوا مشت‌ومڕی لەگەڵ کردی، دوای ئەوەی کە هیچ قسەیەکی بەدەستەوە نەما، ﴿ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ ﴾، پێیان بڵێ: مادام لە بواری وتووێژدا دۆڕاندتان‌و هیچ بەڵگەیەکتان بەدەستەوەنیە، باشە وەرن بۆ یەکلاکردنەوەی هەق‌و ناهەق، قۆناغێکی دیکەمان ماوە، ئەویش بریتیە لە موباهەلە، مولاعەنە، وەرن با شەرە لەعنەت بکەین، چۆن؟ ﴿ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴾، وەرن با کوڕەکانمان‌و کوڕەکانتان، وە ئافرەتەکانمان‌و ئافرەتەکانتان، وە خۆمان‌و خۆتان، بانگ بکەین، دوایی هەردووولامان زۆر دوعا دەکەین‌و دەپاڕێینەوەو دەڵێین: نەفرینی خوا لە درۆزنان بێ‌و کێ درۆزنە لەو دوولایەنە لەعنەتی لێبکەین، بڵێین: خوایە لە ڕەحمەتی خۆت دووری بخەوەو سزای بدە!! دیارە وەك پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، نەصرانییەکان ئامادە نەبوون، چونکە دەیانزانی دەدۆڕێن‌و دڵیابوون کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، وە بە دڵنیایی ئەو چەند ڕۆژەی کە لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ ماونەتەوە، ئاکارو ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر ﷺیان بینیوە، وە هەڵسوکەوتی مسوڵمانانیان بینیوە، ئەو ئایەتانە کە هاتوونەتە خوار بەو بۆنەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆی خوێندوونەتەوەو وتووێژی لەگەڵدا کردوون،

گەیشتوونەتە دڵنیایی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان ئامادە نەبوون ئیمان بێنن، چونکە دەستیان بۆ لە بەرژەوەندیی یەکانی خۆیان هەڵنەگیراوە، جا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ﴾، ئەوە هەواڵی ڕاستە، ئەوەی کە بۆت خوێنرایەوە، ئەوە هەواڵی ڕاستە، یاخود ئەوە گێڕانەوەی ڕاستی هەواڵەکەیە، ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، وە جگە لە خوا هیچ پەرستراونین، وە خوا زاڵی کاربەجێیە، عیسا ﷺ وەك نەصرانیی یەکان دەڵێن: کاتێك کە لە خاچدرابێ‌و بەرگریی پێ لەخۆی نەکرابێ، ئەدی عیززەتەکەی لە کوێ بووە، کە نەیتوانیبێ بەرگریی لەخۆی بکات؟! ئەوە بە پێی عەقیدەی نەصرانیی یەکان، وە بە پێی عەقیدەی ئێمەش خوای پەروەردگار بەرزی کردۆتەوە، وەك دوایی باسی دەکەین، ئنجا دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ﴾، جا ئەگەر هەر پشتیان تێکردی‌و لاملیان تێکردی‌و وازیانهێنا، واتە: هەقیان قبووڵ نەکرد، ئەوە بێگومان خوا بە خراپەکاران‌و تێکدەران زانایە، واتە: ئەوانە تێکدەرو خراپەکارو ئاشووب گێڕن‌و، لە هەق ناگەڕێن، وە عەودالی دادگەریی‌و ڕاستیی نین، خوای زاناش پێیان زانایە، بەڵام لە دنیادا سوننەتی خوا وایە، یاسای خوا وایە، کە سزایان نادات، بەڵکو لە دوارۆژدا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ﴾، توێژەرەوان باسی ئەوەیان کردوە کە ئایا ئەوانە کێ بوون کە عیسا ﷺ هەستی بە کوفریان کردوە، یاخود کوفرو بێبڕوایی ئەوانی بۆ دەرکەوتوە؟ زۆربەیان ڕایان وایە: کە جوولەکەکانن، وە سیاقی ئایەتەکانیش هەر ئەوە دەگەیەنێ، هەر چەندە وێڕای جوولەکەکان، ڕۆمەکانیش هەر بڕوایان بە عیسا ﷺ

نەهێناوەو ئەوانیش دەگرێتەوە، بەڵام ئەم ئایەتانە زیاتر لەبارەی جوولەكەكانەوە دەدوێن، چونكە لە ئایەتی پێشتردا ئەوە هاتوە: ﴿ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ﴾، واتە: ئەو تەوراتەی كە لەپێش منەوەیە بەڕاستی دەزانم، وە هەندێك لەو شتانەی لێتان قەدەغە كراون، بۆتان حەڵاڵ دەكەم، كە دیارە جوولەكەكان بوون كە شتیان لێ حەرام كراوە، وەك پێشتر باسمان كرد، وە ئەوانیش بوون كە تەوراتیان بۆ نێردراوە، كەواتە: مەبەست لە ڕستەی: ﴿ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ ﴾، ئەوەی كە ڕاناوی (هم)ی دەچێتە سەر جوولەكەكانن بە پلەی یەكەم، بەڵام ڕۆمەكانیش هەر دەگرێتەوە، چونكە ئەوانیش بێبڕوا بوون، بڕوایان بە پەیامی عیسا ﷺ نەهێناوە.

**مەسەلەی دووەم:** كە عیسا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، كێ پشتیوانمە بەرەو خوا؟ دیارە مەبەستی لە كێ پشتیوانمە، واتە: كێ پشتم دەگرێ لە دینداریكردندا؟ بەو پێیەی كە خوا فەرمانی پێكردوە، لە هەڵگرتنی پەیامی خوادا، لە گەیاندنی پەیامی خوادا، لە جێبەجێكردنی شەریعەتی خوادا، بەڵام بۆیە تەعبیرە كە بەو شێوەیە هاتوە، چونكە كەسێك كە پابەندبێ بە شەریعەتو دینی خوای پەروەردگارەوە، وەك ئەوە وایە كە ڕێبازێك بگرێتەبەر، بەرەو خوا بەرەو ڕەزامەندیی خواو بەرەو دیداریی خوا، وە ئەم ڕستە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە سەرخستنی پەیامی خواو چەسپاندنی بەرنامەی خوا، پێویستی بە هاوكاریی خەڵكی دیكە دەكات، ئینسان بە تەنیا بۆی ناچێتە سەر، بۆیە نەك هەرشتێكی ڕەواو پەسەند، بەڵكو زۆر جار پێویستە كە ئینسان داوا لە خەڵكی دیكە بكات هاوكارو دەستبارگریی بن، وە پشتگیرو پشتیوانی بن، بۆ گەیاندنی پەیامی خوا، وە بۆ جێبەجێكردنی شەریعەتی خوای پەروەردگار، چونكە ئەم دنیایە دنیای هۆكارەكانە، ئەوە هەر عیسا ﷺ نەبووە كە داوای هاوكاریی كردوە، بەڵكو

ئـەوەتا پـێغەمبەری پـێشەوامان موحەممـەد ﷺ وەك هەركـام لـە ئەحمـەدو ئەبو داوود گێڕاویانەتەوە، پێش كۆچكردنی بۆ مەدینـە لە (مواسم)ی حـەج دا دەیفەرموو: {مَنْ رَجُلٌ يُؤْوِني حتَّى أُبَلِّغَ كَلاَمَ رَبِّي، فَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ مَنَعُونِي أَنْ أُبَلِّغَ كَلاَمَ رَبِّي} (رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (١٥١٩٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٣٤) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحيح عَلَى شَرْط البُخَارِي رجالُهُ ثِقَات رجال الشيخين غير عثمان بن المغيرة فمن رجال البخاري)، واته: جابیری كوڕی عەبدوڵلا- خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: پـێغەمبەری خـوا ﷺ (دیارە لە مەككە بووە، كـاتێ وایفـەمووە) فەرموویـەتی: چ پیـاوێك هەیـە من پەنـا بـدات؟ (واتـە: كەسێك سێبەرو پەنایـەكی هـەبێت پـەنام بـدات) تـاكو فەرمودەی پەروەردگارم بگـەیەنم، چونكە قورەیـشییەكان ڕێیـان لێگـرتووم كـە فەرمایشتی پەروەردگارم بگـەیەنم.

هـەروەها پـێغەمبەرێكی پایـە بـەرزی وەك شـوعەیب ﷺ كـە خـوای پەروەردگار بەسەرهاتەكەیمان بۆ دەگێڕێتەوە لە سـووڕەتی (هـود)دا، لـە ئایـەتی ژمـارە (٩١) كـە قەومەكـەی پـێـی دەڵـێن: ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە كـە خەڵكێكـت لـە پـشتەوەیەو پـشتگیـرییت دەكەن، ئـەوە بـەرد بارانمـان دەكـردی: ﴿ قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَـٰكَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ ﴾ هـود، واتـە: (گەلەكـەی) پێیـان گـوت: ئـەی شوعـەیب ! زۆر لـەوەی كـە دەیڵـێی، وە لـە قـسەكانت تێناگـەین، ﴿هەڵبەتـە شوعەیب ﷺ پـێغەمبەرێكی زۆر قسەزانو زمان پاراو بووە، هـەتا هەنـدێك لـە توێژەرەوان بە (خَطِيبُ الأَنْبِيَاء)، واتە: وتاربێژی پـێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ناوزەدیان كـردوە، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـتیان پـێ چەواشـەكاریی بـووە، واتە: قسەكانت ڕۆشـن نـینو لێـت حـاڵی نابیـن﴾ وە ئێمـە تـۆ لـەنێو خۆمانـدا بەبـێ دەسـەڵاتو بەبـێ هێـز دەبیـنین‌و، ئەگـەر كۆمەڵەكـەت نەبوونایـە بەردبارانمان دەكردی، وە تۆ لـەلای ئێمـە خـاوەن دەسـەڵاتو عیـززەت نـی، واتـە: ئێمـە وەك خـۆت بـە دەسـەڵاتدارت نـابینین، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی كـە كۆمـەڵێك

پشگیرییت لێ دەکەن، بۆیە بەرد بارانت ناکەین، ئنجا دەگونجێ مەبەست لەو (رهط)ە، عەشیرەتەکەو هۆزەکەی بووبێ، یانی: خزمەکانی بووبن، وە دەشگونجێ مەبەست پێی شوێنکەوتووانی بووبن، گرنگ ئەوەیە کەسانێك هەبوون کە بەرگرییان لێکردوە، جا یان بە دافیعی ئیمانو عەقیدە، ئەگەر شوێنکەوتووانی بووبن، یاخود بە دافیعی خزمایەتییو تیرو هۆزگەرێتیی، ئەگەر خزمەکانی بووبن، وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر لووط ﷺ کاتێك کە فریشتەکان دەبنە میوانی، وە قەومە خراپەکەی دەوری ماڵەکەی دەگرن، بۆ ئەوەی میوانەکەی تەسلیم بکاتو خراپەیان لەگەڵ بکەن، وەك لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٨٠و ٨١)دا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٖ شَدِيدٖ ﴿٨٠﴾ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيْكَ ... ﴾، کاتێك کە قەومە (خراپە)کەی دەوری ماڵەکەی دەگرنو ئابڵووقەی دەدەن، وە داوای لێ دەکەن ئەو میوانانەیان تەسلیم بکات بۆ ئەوەی خراپەیان لەگەڵدا بکەن، لووط ﷺ بە خەمبارییەکی زۆرەوە هەروەك لە قسەکانیدا دەبینرێ، دەڵێ: خۆزگە خۆم دەسەڵاتم بەسەرتاندا شکابایە، یاخود پەنایەکم هەبایە پەنام پێگرتبایە واتە: یان بۆخۆم پێتان وێرابام، یان کەسێك هەبا کە بەرگریی لێ کردبامایە، (فریشتەکان) گوتیان: ئەی لووط! ئێمە نێرراوی پەروەردگارتین، وە ئەوانە دەستیان ناگاتە تۆ، دیارە دوایی فریشتەکان ئەو قەومە لە بەین دەبەن، وە پێغەمبەری خۆمان ﷺ وەك قسەیەك لەسەر ئەو هەڵوێستەی لووط ﷺ فەرموویەتی: {يَرْحَمُ اللَّهُ لُوطًا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ: ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٖ شَدِيدٖ ﴾} رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٨٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٢٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٠٨)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتە: خوا بەزەیی بە لووط دا بێتەوە (خوا ڕەحمی پێبکات) پشتی بە پەنایەکی بەهێزەوە دابوو، (کە پەنای خوای پەروەردگار بوو، وە فریشتەکان بەرگریی لێبکەن)، کاتێك بە قەومەکەی

گوت: خۆزگە پەنایەکم هەبایە، پەنام پێگرتبایە، بەڵام دیارە لووط عليه السلام ئەوەی نەدەزانی کە ئەوانە فریشتەن‌و لەسەر شێوەی بەشەر هاتوون بۆ لای، ئەگەر بیزانینیایە فریشتەن‌و خوا ناردوونی، دەیزانی کە ئەو پایە بەهێزەی هەیە کە بە ئاواتی دەخوازێ هەیە، پشتی پێ بدات کە فریشتەکانن، دەشگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەك تێبینی‌و ڕەخنەگرتن لەسەر پێغەمبەر لووط عليه السلام ئەوەی فەرمووبێ، کە لەو کاتەدا لووط دیارە زۆر تینی بۆ هاتوە، نەدەبووایە بێئاگابێ لەوەی کە خوا، ئەو قەڵا مەحکەمەیە کە ئیمانداران هەمیشە دەبێ لەبەر چاویان بێ، وە پشتی پێوە بدەن‌و بە پشتیوانی خۆیانی بزانن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾، حەواریی یەکان دوای ئەوەی کە عیسا عليه السلام دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، کێ پشتیوانمە بۆ لای خوا؟ دەڵێن: ئێمە پشتیوانانی خواین، بڕوامان بە خوا هێناوە، وە تۆ شایەدبە کە ئێمە گەردنکەچین بۆ خوا، یاخود ئێمە مسوڵمانین، دیارە مسوڵمانیش دەبێ گەردنکەچبێ، بۆیە ناوی لێنراوە مسوڵمان.

لێرەدا پێویستیمان بە وەڵامی چەند پرسیارێك هەیە؟

**پرسیاری یەکەم: ئایا وشەی حەواریی یانی چی؟**

پێشتر باسمان کرد، کە وشەی (حەواریی) دەگونجێ لەوەوە هاتبێ کە وشەی: (حور)و (حَوْرَاء) بە مانای سپی دێ، (حور العین) کە، کۆی (حوراء)ە، بۆیە وایان پێدەگوترێ، چونکە ئافرەتانی بەهەشت سوورو سپیین، دەگونجێ لەوەوە هاتبێ کە ئەوانە دەروونی خەڵك سپی دەکەنەوە بەو هیدایەتەی کە پێیانە، دەروونیان دەشۆن خاوێنیان دەکەنەوە، وە دەشگونجێ پیشەو کارێکیان بووبێ، وەك چۆن ئێستا شوێنێك هەیە بەرگو

پۆشاکی خەڵك دەشواو ئوتوی دەکات، ئەوە کاتی خۆی (قصّار)یان پێگوتوە، ئەوەی کە بەرگی خەڵکی شۆردوەو سپی کردۆتەوە، وە دەشگونجێ بە مانای یارمەتیدەرو پشتیوان بێ، وەك لەو فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ دەبینرێ: {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه نَدَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ ثَلاثاً، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، فَقَالَ: النَّبِيُّ ﷺ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيٌّ وَحَوَارِيِّ الزُّبَيْرُ} (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٨٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦١٩٣). واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەندەق (واتە: لە ڕۆژی ئەحزاب)دا، خەڵکی هاندا، یاخود خەڵکی بانگ کرد، بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کافرەکان، سێ جاران زوبەیر بەدەمیەوە هات، گوتی: من ئامادەم، جارێکی دی هانی دانو بانگی کردن، هەر زوبەیر ئامادەیی دەربڕی، جارێکی دی بانگی کردن هەر زوبەیر ئامادەیی دەربڕی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێك حەواریی یەکی هەیە، حەواریی منیش زوبەیرە، کەواتە: حەواریی، واتە: پشتیوانی تایبەت پشتگیرێکی تایبەت، کە لە سەختترین کاتدا ئامادەبێ پشتگیریی لە ئینسان بکات، ئنجا مانای وشەی: (حەواریی) هەر کامێکیان بێ، گرنگ ئەوەیە کە حەوارییەکانی عیسا عليه السلام خوا لێیان ڕازی بێ، هاوەڵە تایبەتییەکانی بوون، کە لە سەختترین کاتدا ئامادەبوون پشتگیریی لێبکەن، وە لە هەڵگرتنو گەیاندنی ئەم پەیامەدا هاوکارو پشتگیری بوون.

**پرسیاری دووەم: حەوارییەکان چەند کەس بوون؟**

زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: دوازدە کەس بوون، هەندێکی دیکەیان دەڵێن: نۆزدە کەس بوون، (الطَّبَرِي)، دەڵێ نۆزدە کەس بوون، ... هتد، دیارە لە قورئاندا ژمارەیان باس نەکراوە، چونکە ئێمە هیچ پەکمان لەسەری نەکەوتوە دوازدە بووبن، یان نۆزدە بووبن، زیاتر یان کەمتر، هیچ گرفت نیە، چونکە پێویستیمان بە زانینی ئەو ژمارەیە نیە.

**پرسیاری سێیەم: ناوی حەوارییەكـان چـی بووە؟**

دیـارە لـە [پـەیمانی نـوێ]دا واتـە: ئەوانـەی پێـیان دەگـوترێ: چـوار ئینجیلـەكان، لەگـەڵ ئـەو كتێبانـەی كـە لەگەڵـیان كـۆ كراونەتـەوە، ناویـان هـاتوە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ئـەوەی كـە لـە قورئانـدا نەهاتبـێ جێـی پـشت پـێ بەسـتن نیـەو ئینـسان لـێی دڵنیـا نیـە، كـە ڕاسـتە یـان نـا؟! وە پەكیـشمان لەسـەر ناوەكانیـان نەكـەوتوە، گـرنگ ئەوەیـە عیـسا ﷺ كۆمەڵـە بـرادەرو هاوەڵێكی تایبەتیی هەبوون، كـە بڕوایـان پـێ هێنـاوەو پـشتگیرییان كـردووەو لە سەختیـیو دژوارییەكـان دا پشتیوانی بوو ون.

**مەسـألەی چـوارەم:** كـە حـەواریی یـەكان گوتوویانـە: ﴿ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، خـوایە لەگـەڵ شـایەدییدەراندا بماننووسـە، لێـرەدا ئـەوە دەردەكـەوێ كـە ئیمـان هێنـان جیایـە لـە شـایەدیی دان، چـونكە پێـشێ دەڵێن: ﴿ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، واتـــە: پـەروەردگارمان! ئیمانمـان بـەوە هێنـاوە كـە ناردووتـە خـوار، وە دوای پـێغەمبەرەكەشـت كـەوتووین، ئیمانمـان بـە پـەیامو كتێبـی خـوا هێنـاوە كـە ئینجیلەو بۆ عیسا ﷺ هاتوە، وە بە دوای پـێغەمبەری خـواش كەوتووین كە (عیسـا)یـە ﷺ، بـەڵام دوایـی دەڵێن: ﴿ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، لەگەڵ شـایەداندا بماننووسـە، كەواتـە: دەبـێ شـایەدییدان جیابـێ لـە ئیمـان هێنـانو شـوێنكەوتن، شـایەدییدان بریتیـە لـەوەی كـە ئینـسان بـە شـێوەیەك بـژی كـە ژیـانی، ئاكـاریی، هەڵوێـستەكانی بـە شـێوەیەك بـن، كـە ببێتـە شـایەدو بەڵگـە لەسـەر ڕاسـتیی ئـایینو بەرنامـەی خـوای پەروەردگـار، كـە بەڕاسـتی ئـەوە ئەركێكـی زۆر گەورەیـە، زۆر كـەس دەتوانـێ ئیمـان بێنـێ، زۆر كـەس دەتوانـێ بـەدوای پـێغەمبەری خـوا ﷺ بكـەوێ، بـەڵام ڕەنگـە زۆر كـەس نـەتوانێ بـە كردەوەكـانی، بـە هەڵوێـستی، بـە ژیـانی كردەیـی ببێتـە بەڵگـەو شـایەد لەسـەر

ڕاستیی ئایینی خوای بێوێنە، کە ئەوە بەڕاستی ئاسان نیە، خوای میهرەبان بۆمان ئاسان بکات کە کردەوەو ئاکارو هەڵسوکەوتەکانمان بەڵگەو شایەد بن لەسەر ڕاستیی ئایینی خوای کاربەجێ، دیارە ئەوەش لە کاتێکدا دەبێ، کە بە موو لە شەریعەتی خوای پەروەردگار لانەدەین، هەر کەسێك کە ئێمەی بینی، ڕاستیی‌و تێرو تەواویی (ئیسلام)ی بکەوێتە بەرچاو، وەك هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ - خوا لێیان ڕازی بێ- کە هەر کامێکیان قورئانێکی زیندوو بووە، هەر کامێکیان قورئان چۆنی فەرمووە، ئەو وایکردوەو بەو شێوەیە ڕەفتاری کردوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴾، پێشتریش باسمان کرد وشەی: (الْمَكْر) (والْمَكْرُ: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يقصِدُهُ بِحِيلةٍ)، کە لە زمانی عەرەبیی دا (مَكْر) بریتیە لە لادانی بەرانبەرەکەت لەو ئامانجەی دەیەوێت، وە بە فێڵێك لایبدەی بە شێوەیەك کە بۆخۆی هەستی پێنەکات، جا ئەوە دەگونجێ (مکر)ێکی باش بێ، وە دەشگونجێ خراپ بێ، لە کوردییدا فێڵی پێی دەگوترێ، وە (پیلان)ی پێ دەگوترێ، ئەگەر بۆ مەبەستێکی باش بێ، ئەوە دیارە خاوەنەکەی بە کەسێکی باش دادەنرێ، وە ئەگەر بۆ مەبەستێکی خراپیش بێ، بە کەسێکی خراپ دادەنرێ، دیارە ئێمە بەپێی ئەوە کە خوای پاك‌و تاك ناوی هەرە چاکی هەن، وە سیفەتی هەرە بەرزو پەسەندی هەن، دروست نیە هیچ وشەیەك بۆ خوای بێ وێنە بەکاربێنین، مەگەر بە تەواوترین‌و بەباشترین مانای، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار لە ئایەتی (١٨٠)ی سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، واتە: بۆ خوا ناوە هەرە چاکەکان هەن، بە ناوە هەرە چاکەکانی لێی بپاڕێنەوە وە واز لەوانە بێنن کە لادان دەکەن لە ناوەکانی خوادا، لەمەو دوا سزای ئەو کارەیان وەردەگرنەوە، کەواتە: ئەگەر

وشەی: (مکر) بۆ خوای بێ وێنە بەکاربێ، دەبێ چاکترین و پەسەندترین مانای لێ بگرین، ئەگەرنا دروست نیە بەکاربێ، هەڵبەتە وشەی: (ماکر)یش لە ناوە چاکەکانی خوای بەرزو مەزن نیە، هەرچەندە خوای بێ هاوەڵ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ﴾، خوا باشترینی فێڵکەرەکانە، بەلام لەبەر ئەوەی وشەی (فێڵ) لە بەکارهێنانی خەڵکدا زیاتر بۆ مانا ناپەسەندەکەی بەکاردێ، بۆیە ئەو وشەیە بە یەکێك لە ناوە چاکەکانی خوا، یان سیفەتە پەسەندەکانی خوا بەکارنەهاتوە، هەڵبەتە زۆر شت هەیە کە سیفەتی خوایە، بەلام دروست نیە بکرێنە ناوی خوا، بۆ وێنە: ﴿...ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ...﴿٥٤﴾﴾الأعراف ، واتە: دوایی خوا چووە سەر عەرش، ئەوە سیفەتی خوایە، بەلام نەکراوە بە ناوی خوای بێ هاوتا، هەروەها لێرەدا وشەی: ﴿وَمَكَرَ ٱللَّهُ﴾، سیفەتی خوایە، یان کە دەفەرموێ: ﴿وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾﴾ الطارق، سیفەتی خوایە، بەلام مەرج نیە هەرچی سیفەتی بوو، دروست بێ بکرێتە ناوی خوای پەروەردگار.

<u>مەسەلەی شەشەم</u>: کە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، واتە: کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا! من تۆ وەردەگرم، وە بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە، وە لەوانەی بێبڕوان پاکت دەکەمەوە، لێرەدا وشەی: ﴿إِنِّى مُتَوَفِّيكَ﴾، من تۆ وەفات پێدەکەم، لە زمانی عەرەبی دا ﴿مُتَوَفِّيكَ﴾، پێشتر باسمان کرد سێ واتا دەگرێتەوە:

یەکەم: بەتەواویی وەرتدەگرم.

دووەم: دەتخەوێنم.

سێیەم: دەتمرێنم.

هەرسێ واتاکەی هەن، بۆیە توێژەرەوانی قورئان دەربارەی تەفسیری ئەم ڕستە قورئانییە سێ هەڵوێستیان هەن:-

١- زۆربەیان گوتوویانە: ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ﴾، یانی: (إنّي قَابِضُكَ)، واتە: من وەرتدەگرم (إنّي آخِذُكَ بتَمَامِكَ) من بەتەواویی وەرتدەگرم، واتە: بە ڕووحو جەستەوە هەڵت دەگرم، وە پاشان بەرزت دەکەمەوە بەرەو سەرەوە، وە پاکت دەکەمەوە لە بێبڕوایەکان.

٢- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە ﴿مُتَوَفِّيكَ﴾، واتە: (إنّي مُنِيمُكَ) من دەتخەوێنم، بۆچی؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ...﴿٤٢﴾﴾الزمر، واتە: خوا گیانەکان دەکێشێ لەکاتی مردنیاندا، وە ئەوەی نەمردبێت لەکاتی خەوتنیدا... هتد، کەواتە: خەواندنیش وەفاتی پێ دەگوترێ.

٣- ژمارەیەکی زۆر کەم گوتوویانە: (إنّي مُمِيتُكَ)، واتە: من دەتمرێنم، بەڵام لەڕاستیدا بە سەرنجدانی سیاقی ئایەتەکان بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست لە: ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ﴾، واتە: من تۆ وەك خۆت بە تەواویی‌و بە زیندوویی بە بێداریی وەردەگرم‌و بەرزت دەکەمەوە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر بڵێین: خوا عیسای عليه السلام مراندوە، ئنجا بەرزی کردۆتەوە، دەڵێین: جا خۆ دوژمنانی عیسا عليه السلام مەبەستیان کوشتنی عیسا عليه السلام یان مراندنی بووە، کەواتە: ئامانجی ئەوان هاتۆتەدی! ئەدی دەربازکرانی عیسا عليه السلام لەلایەن خواوە کوا؟ کەواتە: دەرباز نەکراوە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێ: (چ گورگ بتخوا چ سوار بتبا)، جوولەکەکان ویستوویانە عیسا عليه السلام بکوژن، ئەگەر بەدەستی وانیش نەکوژرابێ، بەڵام خوا مراندبی، کەواتە: ئامانجی ئەوان هەر هاتۆتەدی، بۆیە دەڵێین: ئەو مانایە ڕاست نیە کە خوای توانا عیسای عليه السلام مراندبێ، پاشان جەستەکەی بەرز کردبێتەوە جەستەکەی بەبێ ڕووح، هەروەها نەشی خەواندوە، چونکە لە هیچ شوێنێکەوە بۆمان دەرنەکەوتوە

کە خەوێنرابێ، بەڵکو خوای باڵادەست عیسای ﷺ بە زیندوویی‌و بە بێداریی بە ڕووح‌و جەستەوە بەرز کردۆتەوە بۆ ئاسمانەکان، وە دەربازی کردوە، وە دەتوانین بڵێین: ئەو ئایەتە لە جۆری ئایەتەکانی موتەشابیهاتە، چونکە زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرێ‌و شەی: ﴿ مُتَوَفِّيكَ ﴾، زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرێ، وە پێویست بە سەرنجدانی زیاتر دەکات، وە ئەوانەی کە زیاتر بە زانیارییدا قووڵ دەبنەوە، زیاتر دەتوانن مانای ڕاستی ئەم ئایەتە موتەشابیهە، کە چەند مانایەکی وێکچووو جۆراو جۆری هەن، مانا ڕاستەکەی کە لەگەڵ ئایەتە موحکەمەکاندا دەگونجێ بدۆزنەوە، بەڵام ئەوەی کە ڕاست نیەو شتێکی ئەفسانەیەو بێ بنەمایە، ئەوەیە کە نەصرانیی یەکان دەربارەی عیسا ﷺ دەیڵێن، کە گوایە: عیسا کەوتۆتە دەست جوولەکەکان، وە جوولەکەکان بە هاوکاریی ڕۆمەکان عیسایان ﷺ لە سێدارە داوە، وە دەڵێن: دوایی، دوای سێ ڕۆژان خوای زاڵ زیندووی کردۆتەوە، ئنجا بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان، بەڵام لە ڕاستییدا ئەو قسەیەی نەصرانیی یەکان شتێکی بێ مانایەو، دوایی ڕوونی دەکەینەوە کە ئەو قسەیە لە چییەوە هاتوەو چۆن کەوتوونە هەڵەوە، وە کە دەڵێین: بێ بنەمایە لەبەر ئەوەیە کە خوای زاناو توانا لە ئایەتەکانی (١٥٦ تاکو ١٥٩)ی سوورەتی (النساء)دا زۆر بە ڕوون‌و ڕاشکاویی بۆمان باس دەکات، کە عیسا ﷺ بە دەستی جوولەکەکان‌و ڕۆمەکان نەکوژراوە، لە ئایەتی پێشوودا باسی جوولەکەکان دەکات‌و دەفەرموێ: بەهۆی پەیمان شکاندنیانەوە لەعنەتمان لێکردن‌و دڵمان ئاوا لێکردن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ ﴾، واتە: وە بەهۆی کافر بوونیان، وە بەهۆی ئەوەوە کە تۆمەتێکی مەزنیان بۆ مەریەم هەڵبەست، [ کە گوتیان: مەریەم زینای کردوەو عیسا ڕۆڵەی زینایە بیژوویە، زۆڵە، ئەوە بۆختانێك‌و تۆمەتێکی گەورە بوو کە جووەکان بۆ مەریەمیان هەڵبەست] ﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ

﴿ رَسُولَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: وە (تاوانێکی دیکەیان ئەوە بوو) ئەو قسەیان کرد کە گوتیان: ئێمە عیسای کوڕی مەریەم ﷺ کە پێغەمبەری خوایە کوشتمان، جا هەرچەندە نەیانکوشتوە، بەڵام هەر ئەوە کە شانازییان کردوە، کە پێغەمبەری خوایان کوشتوە، ئەوە بۆ خۆی لە خۆیدا تاوانە، چونکە کەسێك گوناهێکی نەکردبێ، بەڵام خۆی پێ هەڵکێشێ، بۆی دەنووسرێ بۆچی؟ چونکە مانای وایە وەك کردبێتی وایە، جا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ﴾، واتە: وە نەکوشتوویانەو نەهەڵیشیان واسیوە، بەڵکو وێنەی ئەویان (عیسایان) بۆ خراوەتە سەر کەسێکی دیکە، وە ئەو کەسەی کە وێنەی عیسای ﷺ چۆتە سەرێ، کە دیارە ئەویش بەپێی تەگبیرو نەخشەی خوای زاناو توانا بووە، سەرەنجام ئەو کەسەیان لە سێدارە داوەو، وایانزانیوە عیسایە ﷺ !! ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ﴾، وە ئەوانەی تێیدا کەوتونەتە ڕاجیاییەوە، خۆشیان لە گوماندان، چونکە کابرا وەك عیسا ﷺ دەچێ، دەبێ هەوبێ هەونەبێ؟! وە وەك دوایی باسی دەکەین، ئەو کەسەی کە لەسێدارەیان داوە، زۆر هاواری کردووەو گوتوویەتی: من عیسا نیم، من یەهوذای ئەسخەریوطیم، مەمکوژن، بۆیە خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ﴾، ئەوانەش کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە لێی لە گوماندانو دڵنیانین ﴿ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ ﴾، هیچ زانیارییان دەربارەی نیە، مەگەر شوێنکەوتنی گومان، وە بە دڵنیاییەوە جوولەکەکان عیسایان ﷺ نەکوشت ﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ ﴾، بەڵکو خوا بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، وە خوا زاڵی کاربەجێیە، ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ ﴾، وە هیچ کام لە خاوەن

کتێبەکان نیە، مەگەر پێش مەرگی ئیمانی پێ دێنێ‌و ئیمان بە عیسا ﷺ دێنێ، وە لە ڕۆژی دواییشدا عیسا ﷺ لەسەریان دەبێتە گەواهیدەرو چاودێر، لێرەدا کە دەفەرموێ: هەر کام لە خاوەن کتێبەکان مسۆگەر ئیمانی پێ دێنێ، پێش مردنی، زۆر لە توێژەرەوانی قورئان وایان تەفسیر کردوە کە: عیسا لە کۆتایی دنیادا دێتە خوار، وە بێگومان کار بە شەریعەتی ئیسلام دەکات، وە ئەهلی کیتاب هەموویان ئیمانی پێ دێنن، واتە: پێش ئەوەی عیسا بمرێ، هیچ کام لە خاوەن کتێبەکان نامێنن، کە ئیمانی پێ نەهێنن، بەوەی کە پێغەمبەری خوایە، واتایەکی دیکەشی هەیە، کە ئەو ڕاناوی سەر (مَوْتِهِ) بچێتەوە سەر (أهل الكتاب)، نەك سەر عیسا، واتە: هەر کام لە خاوەن کتێبەکان مسۆگەر پێش ئەوەی گیانی دەربچێ، لەسەرە مەرگدا بۆی دەردەکەوێ کە عیسا ﷺ پێغەمبەری خوایەو بەندەی خوایەو ئیمانی پێ دێنێ[1].

کەواتە: خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوون‌و ڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێ کە جوولەکەکان‌و ڕۆمەکان عیسایان نەکوشتوەو لە سێدارەشیان نەداوە، بەڵکو وێنەی عیسا ﷺ خراوەتە سەر کەسێکی دی، وە ئەو کەسە لە جێی عیسا کوژراوە، کەواتە: ڕاستیی ئەوەیە کە عیسا ﷺ نەکەوتۆتە ژێر دەستی دوژمنەکانی، بەڵکو خوا بەرزی کردۆتەوەو وێنەی عیسا ﷺ براوەتە سەر کەسێکی دیکەو ئەو کەسە لە سێدارە دراوە، دیارە هەر لێرەوەش ئیشکال هەم بۆ جوولەکەکان پەیدابووە، کە پێیان وابووە عیسایان کوشتوەو، هەم بۆ نەصرانیی یەکانیش پەیدابووە کە پێیان وابووە عیسا لە خاچ دراوە، جا دوایی نەصرانی یەکان هەستاون بۆ پینەکردنی ئەوە کە کوڕی خوا چۆن دەبێ لەسێدارە بدرێ‌و بکەوێتە دەستی دوژمنەکانی؟ هەڵساون پینەی ئەوەیان کردوە، بەوە کە گوتوویانە: خوا ئەو تاقە کوڕەی خۆی بە لە سێدارەدان داوە،

---

١) مانای یەکەمیان ڕاناوی سەر (موْتە) دەگەڕێتەوە بۆ (عیسی ﷺ)، وە مانای دووەم ڕاناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ (إنْ من أهل الكتاب).

بۆ ئەوەی بیکاتە کەفارەتی گوناهی ئەوانەی کە شوێنیکەوتوون !! ئەوەش شتێکی درۆیە، خەڵکی کە ئێستا گوناح دەکات، بۆ دەبێ عیسا دوو هەزار (٢٠٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا کەفارەتەکەی بدات؟! شتێکی بێ بناغەیە، ئنجا ئایا ئەو کەسەی کە چۆتە سەر شێوەی عیسا ﷺ بە ویستی خۆی چۆتە سەر شێوەی واتە: خۆبەخشانە (تطوعاً)، یاخود وەك سزادانێك خوای پەروەردگار بردوویەتە سەر شێوەی عیسا ﷺ ؟! هەردوو رایەکە هەن، هەندێکیان گوتوویانە: عیسا ﷺ داوای لە هاوەڵەکانی کردوەو گوتوویەتی: کامەتان ئامادەیە لە جیاتی من لە سێدارە بدرێ؟ یەهوذا گوتوویەتی: من ئامادەم، بەلام زۆربەی مێژوونووسان دەڵێن: نەخێر، ئەو کەسە خائین بووە، چووە شوێنی عیساو هاوەڵەکانی بە رۆمەکانو جوولەکەکان گوتوە، ئەوانیش هاتوون دەوریان داون، خوای دادگەریش وەك سزادانێك شێوەی عیسای ﷺ بردۆتە سەر ئەو کەسە، دەنگیو رەنگیو شێوەی وەك عیسای لێهاتوە، جوولەکەکانو رۆمەکانیش کە هاتوونەتە ژوورێ، گرتوویانەو دوایی لە سێدارەیان داوە، ئەوە وەك ئەوەیە کە دەڵێ: (هەر کەس چاڵ بۆ خەڵکی هەڵکەنێ بۆخۆی دەکەوێتە نێوی)، ئنجا نەصرانیی یەکان ئەوانەی سەردەمی خۆی، هەڵبەتە حەتمەن زانیویانە کە عیسا ﷺ بەرز کراوەتەوەو لە سێدارە نەدراوە، بەلام دوای خۆی شتەکە گۆردراوەو بەو شێوەیەی لێکراوە کە ئێستا نەصرانیی یەکان عەقیدەیان وایە، بەلام ئایا کێ ئەوەی راست کردۆتەوە؟ قورئان، ئەگەر قورئان نەهاتبایە خوارێ، تا ئێستا کەس نەیدەزانی کە لە سێدارە نەدراوە، بۆچی؟ چونکە زانیارییە راستەکە تەنیا لای هاوەڵە دڵسۆزەکانی بوو، ئەوانیش زۆر چەوسێنرانەوەو راونراونو دەربەدەرکرانو، سەرەنجام ئەو بیروبڕوا ناراستە جێی گرت، کە ئێستا لەنێو نەصرانیی یەکان دا باوە.

بەڵێ ئەگەر قورئان نەهاتبایە خوارێ کەس نەیدەزانی حەقیقەتەکە چۆن بوو، ئنجا با گوێ لە ئینجیلی (بەرنابا) بگرین کە تاکە ئینجیلێکە جێی پشت پێ بەستنە، وە لە راستیدا ئەوەی لە ئینجیلی (بەرنابا)دا هاتوە، لەگەڵ

ئـەوەی کـە قورئــان دەیفــەرموێ، کــتو مــت وەك یەکــە، بــە تایبــەتی لــەو مەسـەلەیەدا، بـا تەماشـا بکـەین: لـە (إنجیـل بَرنابـا)داو لـە: (الفـصل الثـالث عـشر بعـد المِئَـتَين) واتـە: لـە فەصــلی (٢١٣)دا لـە ئایـەتی (٢٤ تـاکو ٢٩) بـەو شـێوەیە هـاتوە:

﴿(٢٤) فَقَـالَ يَـسوعُ أَيـضاً: (الْحَـقَّ أَقُـولُ لَكُـمْ: إِنَّ وَاحِـداً مِـنْكُمْ سَيُـسَلِّمُنِي فَأُبَاعُ كَخرُوف). (٢٥) وَلَكِنْ وَيْلٌ لَهُ لأَنَّهُ سَيَتِمُ كُلُّ ما قَالَ دَاوُدَ أَبُونا عَنْهُ أَنَّهُ: (سَيَسقُط فـي الْـهوة الَّتـي أَعَـدَّهَا للآخـرِين). (٢٦) فَنَظَـر مـن ثُـمَّ التَّـلاَمِيذ بَعْضُهُم إِلـى بَعْضٍ قَائِلِينَ بحزن: (مَـنْ سَيكُونُ الْخَـائِن؟). (٢٧) فَقَـالَ حينَئـذٍ يَهُوذَا: (أَأَنَـا هُوَ يَـا مُعَـلّم؟). (٢٨) فَأَجَـابَ يَـسوعُ: (لَقَـدْ قُلْـتَ لـي مَـنْ هُوَ الَّـذي سَيُـسَلِّمُنِي). (٢٩) أَمـا الأَحَـدَ عَـشَرَ رَسـولاً فَلَـمْ يَـسْمَعُوهُ﴾، واتـە: هــەروەها یەسووع گـوتی: من هەقـتان پێ دەڵێم: یەکـێك لـە ئێـوە مـن تەسـلیم دەکاتو مـن وەك بــەرخ دەفرۆشـرێم، بـەڵام سـزای سـەخت بـۆ وی لەبـەر ئـەوەی ئـەوە دێتەدی کە باوکمان داوود گوتوویەتی: سـەرەنجام دەکەوێتــە ئـەو چـاڵەوە کــە بـۆ خەڵـکی دیکـەی هەڵـکەندوە، قوتابییـەکان تەماشـای یەکـدییان کـرد (واتـە: حەواریی یەکان تەماشای یەکدییان کرد) بـە دڵ تەنگییـەوە گوتیـان: دەبــێ ئـەو خائینــە کــێ بــێ؟ لـەو کاتـەدا یـەهــوودا گـوتی: ئایــا مـنم ئـەی مامۆســتا؟! یەسـووع، (واتـە: عیـسا ﵇) وەڵامـی دایـەوە، گـوتی: ئـەوە تـۆ پـێت گوتــم کـە کێیــە تەسـلیمم دەکـات، (واتـە: بۆخـۆتی)، بـەڵام یــازدە قوتابییـەکان گوێیــان لــەو قسـەی عیسا ﵇ نەبـووە.

وە لـە (الفـصل الرابـع عـشر بعـد المِئَـتَين)، واتـە: لـە فەصــلی (٢١٤)دا لــە ئایــەتی (٢ تاکو ٧) بەو شـێوەیە هـاتوە:

﴿(٢) لَمـا كَـانَ يَهُـوذَا يعـرف المَوضـع الَّـذِي كَـانَ فِيـهِ يَـسوعُ مَـعَ تَلاَمِيـذِهِ ذَهَبَ إِلـى رَئِيس الكَهنة (٣) وَقَالَ: (إِذَا أَعطيتني ما وَعَدْتَ بِـهِ أُسَلِّمُ هَذِهِ اللَّيلَـةَ ليدك يَـسوعَ الَّذي تَطلَبونَهُ (٤) لأَنَّهُ مُنْفَـرِدٌ مَـعَ أَحَدَ عَشَرَ رَفِيـقاً). (٥) أَجَـابَ

رَئِيس الكَهنة: (كَمْ تَطْلب؟). (٦) قَالَ يَهُوذَا: (ثَلاَثِينَ قِطْعةً مِنَ الذَّهَب). (٧) فَحِينَئِذٍ عَدَّ لَهُ رَئِيس الكَهنة النقود فَوْرًا...﴾، واتە: لەبەر ئەوەی یەهووذا ئەو شوێنەی دەزانی کە یەسووع لەگەڵ قوتابییەکانی تێیدا بوو، چوو بۆ لای سەرۆکی کاهینەکان، گوتی: ﴿ئەگەر ئەوەی بەڵێنت پێداوم بمدەیە (واتە: ئەو ئەندازە پارەیە) ئەوە من ئەمشەو یەسووع (عیسا) تەسلیمی دەستی تۆ دەکەم کە ئێوە بەدوایدا دەگەڕێن، چونکە لەگەڵ یازدە لە هاوەڵەکانی شوێنێك تاك بۆتەوە خۆیان پەنهان کردوە﴾ سەرۆکی کاهینەکان (واتە: سەرۆکی پەرستگای جوولەکەکان) گوتی: چەند داوا دەکەی چەندت بدەمێ؟ یەهووذا گوتی: سێ پارچە زێڕ، لەوکاتەدا سەرۆکی کاهینەکان ئەو ئەندازە پارەیەی دەستبەجێ بۆ ژمارد.

وە لە (الفصل الخامس عشر بعد الْمِئَتَين)، واتە: لە فەصلی (٢١٥)دا لە ئایەتی (١ تاكو ٦) بەم شێوەیە هاتوە:

﴿(١) وَلَما دَنَت الجنُود مَعَ يَهُوذَا مِن الْمحَل الَّذِي كَانَ فِيهِ يَسوعُ سمعَ يَسوعُ دنوَّجم غفير (٢) فَلِذَلِكَ انسَحَب إلى البَيْتِ خَائِفاً (٣) وَكَانَ الأحَد عَشَرَ نياماً (٤) فَلَمَا رَأى اللهُ الخَطَر عَلَى عَبْدِهِ أمَرَ جبريل وميخائيل و رفائيل و أوريل سفراءه أنْ يأخذوا يَسوعَ من العالَم (٥) فَجَاءَ الملائكَة الأطهار وأَخَذوا يَسوع من النافذة المشرفة عَلَى الجنُود (٦) فَحَمَلُوهُ وَوَضَعُوهُ في السماء الثَالثة في صحبة الملائكة الَّتي تسبح الله إلى الأبَد﴾، واتە: وە کاتێك سەربازەکان لەگەڵ یەهووذا لەو شوێنە نزیك بوونەوە کە یەسووعی تێدابوو، یەسووع گوێی لە غەڵبە غەڵبو دەنگێکی زۆر بوو، بۆیە لەو کاتەدا (عیسا ﷺ) بەترسەوە چوو بەرەو پشتەوەی ژوورەکە، وە یازدە هاوەڵەکەی خەوتبوون، کاتێك خوا ﷻ مەترسیی لەسەر بەندەکەی خۆی بینی، فەرمانی کرد بە جیبریلو میخائیلو ڕوفائیلو ئۆریل کە ئەوانە نوێنەری ئەون، کە یەسووع لە دنیا بەرنە دەرێو بەرزی بکەنەوە، ئەو فریشتە پاکانە هاتنو یەسووع (عیسا ﷺ)یان لەو پەنجەرەوە کە بە ڕووکاری باشووردا دەڕوانێ،

عیسایان عليه السلام لەوێوە بردە دەر، هەڵیان گرتو لە ئاسمانی سێیەمیان دانا، لە لای ئەو فریشتانەی کە هەتا ئەبەد خوا بە پاك دەگرن.

وە لە (الفصل السادس عشر بعد الْمِئَتَين)، واتە: لە فەصلی (٢١٦)دا لە ئایەتی (١ تاکو ٩) بەم شێوەیە باس دەکات:

﴿ (١) وَدَخَلَ يَهُوذَا بعُنف إلى الغُرفَةِ الَّتي أُصْعَدَ مِنْها يَسوعُ (٢) وَكَانَ التَّلاميذُ كُلُّهُمْ نياماً (٣) فأتى الله العَجَبُ بأَمر عَجيب (٤) فَتَغَيَّرَ يَهُوذَا في النطق وفي الوَجْهِ فَصَارَ شبيهاً بيَسوع حتَّى اننا اعتَقَدنا أَنَّهُ يَسوع (٥) أَمَّا هُوَ فَبَعْدَ أن أيقظنا أخذ يفتش لينظر أَيْنَ كَانَ الْمُعَلِّمْ؟ (٦) لِذَلِكَ تعَجَبْنا وَأجَبْنا: (أَنْتَ يَا سيد هُوَ مُعَلِّمنا أَنَسِيتَنا الآن؟). (٧) أَمَّا هُوَ فَقَالَ متَبَسما: (هَلْ أَنْتُمْ أَغْبياءٌ حَتَّى لا تعرفونَ يَهُوذَا الأسْخَريُوطي). (٩) وَبَيْنَما كَانَ يَقولُ هَذَا دَخَلَتِ الجنُودُ وَألقوا أَيديهِم عَلَى يَهُوذَا لأَنَّهُ كَانَ شَبيهاً ليَسوع مِنْ كُلّ وَجْه﴾، واتە: یەهوذا بە توندیی چوە ژووری، ئەو ژوورەی کە یەسووع (عیسا عليه السلام)ی لێ بەرز کرایەوە، وە قوتابییەکان هەموویان خەوتبوون، بەڵام خوای سەرسوڕهێنەر شتێکی سەرسامکەری کرد، ئەویش ئەوە بوو کە یەهووذا هەم قسەو هەم دیمەنو دەمو چاوی گۆڕاو وەك یەسووع (عیسا عليه السلام)ی لێهات، هەتا ئێمە پێمان وابوو کە هەر یەسووعە، بەڵام ئەو دوای ئەوەی کە ئێمەی هەڵساند چاوی دەگێڕا کە داخۆ مامۆستا لە کوێیە؟ بۆیە ئێمە سەرمان سوڕما گوتمان: ئەی گەورەمان ! ئەدی تۆ مامۆستامان نی، ئێستا ئێمەت لە بیر چۆتەوە؟! (واتە: وامانزانی کە عیسایە) بەڵام ئەو بە زەردەخەنەوە گوتی: ئایا ئێوە گێلن! ئەدی ئێوە یەهووذای ئەسخەریوطیی ناناسنەوە (واتە: نامناسن من یەهووذام؟!) بەڵام کاتێك ئەو ئەو قسانەی دەکرد، سەربازەکان هاتنە ژوورەوەو گرتیان، چونکە لە هەموو ڕوویەکەوە بە عیسا عليه السلام دەچوو (وایانزانی عیسایان عليه السلام گرتوە).

جا دەڵێ جێی سەرسوڕمان ئەوە بوو بە یەهووذاوە دەبوو دوازدە کەس بن، بەڵام دەیان ژماردن یازدە کەس بوون، یەکێ کەم بوو، چونکە عیسا عليه السلام

بەرزکرابۆوە، ئەوە ئینجیلی بەرنابا لە لاپەڕە (٣٠٧و ٣٦٩) هێناویەتی، کە (الدکتور خلیل سعادة) لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕراوە بۆ زمانی عەرەبی، وە لە ساڵی (١٣٢٦)ی کۆچی چاپ کراوە، کەواتە: وەك گوتم: ئەگەر قورئان نەهاتبایە خوار، ئێستاش نەصرانیی یەکان وایاندەزانی کە ڕاستە عیسا ﷺ لە سێدارە دراوەو نەیاندەزانی، کە ئەوە شەبیهەکەیەتیو هاوێنەکەیەتی لە سێدارە دراوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، واتە: ئەوانەی کە شوێنت کەوتوون بەسەر ئەوانەیان دەخەم کە بێبڕوان تا ڕۆژی دوایی، دیارە لێرەدا ﴿ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ ﴾، ئەوانەی شوێنت کەوتوون، ئەوانەی کە کاتی خۆی ئیمانیان بە عیسا ﷺ هێناوە دەیانگرێتەوە، کە حەوارییەکانن، ئیماندارەکانن، وە ئەوانەش دەگرێتەوە کە لە مسوڵمانان شوێنی دەکەون، جا ئەوانەی ئەو کاتە بەدوای عیسا ﷺ کەوتوون، ئەوە دیارە کە زاڵ نەبوون بەسەر ئەوانەدا کە بێبڕوان لە جوولەکەکانو ڕۆمەکانیش، پاشان مەرج نیە مسوڵمانانیش کە شوێنکەوتووی ڕاستەقینەی عیسان ﷺ هەمیشە زاڵبن بەسەر کافراندا، ئەدی چۆنی تەفسیر بکەین؟ لە ڕاستییدا لێرەدا ناچارین بڵێین: سەروو (فوق) مەبەست پێی سەروو (فوق)یەتی مەعنەوییە، واتە: خوا دەفەرموێ: ئەوانەی شوێنکەوتووی تۆن، ئەی عیسا ! چ لە سەردەمی خۆتدا، چ لە دوای تۆ، ئێمە وا دەکەین کە لە ڕووی مەعنەوییەوە لە ڕووی بەڵگەو لە ڕووی هەق پێبوونەوە، زاڵبن بەسەر کافرەکاندا، بۆچی؟ چونکە وەك گوتم: حەواریی یەکان هەموو پەراگەندەبوون، ئەوانەی بە ڕاستیی شوێنی عیسا ﷺ کەوتبوونو عیسایان ﷺ بە بەندەو بە پێغەمبەری خوا دەزانی، زۆر چەوسێنرانەوەو سەرەنجام نەصرانییەتیش گۆڕدراو، ئەوەبوو کە لە خوا بە یەکگرتن (توحید)ەوە کرا بە سێ پەرستراویی (تثلیث)، کەواتە: دەبێ بڵێین: ئەوانەی

بەڕاستیی شوێن عیسا عليه السلام کەوتن، نەك بە ڕواڵەتییو لە مەیدانی وەقیعدا، بەڵکو لە ڕووی مەعنەوییەوە بە بەڵگە زاڵ بوون بەسەر ئەوانی دیکەدا، کە کافرەکانن.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن ﴾، وێنەی عیسا عليه السلام لە لای خوا، وەك وێنەی ئادەمە کە لە گڵ دروستی کرد، پاشان فەرمووی: ببە، ئەویش بوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قیاس شتێکی ڕەوایە، چونکە لێرەدا خوا تعالى قیاسی عیسا عليه السلام دەکات لەسەر ئادەم، واتە ئەگەر پەیدابوونی عیسا عليه السلام بەبێ باب شتێکە لە لاتان سەیرە! خۆ پەیدابوونی ئادەم بەبێ دایكو باب سەیرترە، کەواتە: قیاسی عیسا عليه السلام کراوەتە سەر ئادەم کە هەردووکیان سەیرن، بەڵام هی ئادەم سەیرترە، کەواتە: بۆچی بە عیسا عليه السلام دەڵێن: کوڕی خوایە، ئەگەر هەر لەبەر ئەوەی کە بێ بابە، کوڕی خوایە، دەبێ ئادەم چاکتر کوڕی خوابێ !! کە ئەمە لە ڕاستییدا هەڵەیەو هەردووکیان بەندەی خوانو پێغەمبەری خوان، وە دروستبوونی ئادەم بێ دایكو باب سەیرترە لە عیسا عليه السلام کە تەنها بابی نەبووە، بەڵام دایکی هەبووە، ئەوە قیاسە، کەواتە: قیاس شتێکی ڕاستە کە زۆربەی هەر زۆری زانایان، ئەگەر نەڵێین هەموویان، بە شتێکی ڕەوای دەزانن.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئایا مەسەلەی موباهەلە ئێستا ڕەوایە یان نا، واتە: ئایا دروستە مسوڵمانێك لەگەڵ غەیرە مسوڵمانێك، یان مسوڵمانان لەنێو خۆیاندا، کاتێك لەسەر شتێك کەوتنە کێشەوە دروستە پەنا بەنەبەر موباهەلەو نەفرین کردن لەو کەسەی کە درۆ دەکات؟ لەوبارەوە (الآلوسي) گوتوویەتی: (وَمَنْ ذَهَبَ إلى جَوَازِ الْمُبَاهَلَةِ اليوم عَلَى طراز مَا صنع رَسول اللهِ ﷺ اسَتَدَلَّ بِمَا أَخْرَجَهُ عَبْدِ بْنِ حُمَيد عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْد أَنَّ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ

اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ آخر شَيءٌ فَدَعَاهُ إِلى الْمُبَاهَلَة)[1]، واتە: ئەوانەی کە پێیان وایە کە ئێستا موباهەلە دروستە بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی، بەڵگە بەوە دێننەوە کە عەبدی کوڕی حومەید لە قەیسی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس - خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ-، لەگەڵ یەکێکی دیکەدا کێشەیەکی بوو، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس داوای کرد بۆ موباهەلە، واتە: وەرە دوعا بکەین کە کێ درۆزنەو بەهەڵەدا چووە، یاخود کێ نەیپێکاوەو ستەمکارەو خەتایەتی، خوا لەعنەتی لێ بکاو لە ڕەحمەتی خۆی دووری بخاتەوە، ئنجا دیارە مەسەلەی موباهەلە بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەر ﷺ، چونکە دیارە نەصرانیی یەکان دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن بۆ موباهەلە، ئەوان نکوولێیان کردو پاشگەزبوونەوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان زانیویانە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەگەرنا دەبوو ئەو موباهەلەیان لەگەڵدا بکردایەو، کە نەیانکردوە دیارە یەقینیان هەبووە کە ئەوە پێغەمبەری خوایەو، ئەگەر ئەو موباهەلە بکەن زەرەری لێ دەکەن.

**مەسەلەی دەیەم:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡقَصَصُ ٱلۡحَقُّ ﴾، وشەی (قصص) پێشتر باسمان کرد، سێ واتای هەن، یەکەمیان: (الْخَبَرُ الْمَقْصُوص)، واتە: هەواڵێکی گێڕدراوە، دووەمیان: (رِوَايَةُ الْخَبَر)، واتە: گێڕانەوەی هەواڵێك، سێیەمیان: (الأَثَر)، واتە: شوێنەوار، ئەوەی لێرەدا مەبەستمە بیڵێم، ئەوەیە کە بەڕاستیی بەسەرهاتەکانی قورئان یەکێکن لە لایەنە زۆر گەورە ئیعجازییەکانی قورئان، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار زۆر نهێنی بۆ ئێمە لە بەسەرهاتەکانی قورئاندا دەرخستوون، کە ئەگەر قورئان نەهاتبایە نەماندەزانی، یەکێ لەوانە مەسەلەی دەربازکرانو بەرزکرانەوەی عیسا ﷺ کە نەصرانیی یەکانو جوولەکەکانو خەڵك بەگشتی هەر وایانزانیوە کە عیسا ﷺ لە سێدارە دراوە، ئێستا

---

١) الأساس في التفسير، ج: (٢)، ص: (١٨١).

نەصڕانیی یەکان ڕەمزی نەصڕانیی بوونیان خاچێکە لە ملی دەکەن واتە: عیسا علیه السلام بەو شێوەیە لە سێدارە دراوە، کە لە ڕاستییدا ئەوە شتێکی ئەفسانەیەو هیچ بناغەیەکی نیە، چۆنمان زانی؟ قورئان بۆی دەرخستووین، بۆیە خوای بەرز لە ئایەتی (٤٨)ی سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ... ﴾، واتە: وە کتێبمان بۆ تۆ ناردوە بە هەق کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، وە بەسەریشیانەوە چاودێرە، واتە: هەر شوێنێك لە کتێبە پێشووەکان دەستکاریی کرابێ، قورئان دەیزانێو ئەگەر پێویست بووبێ ڕوونی کردۆتەوە، هەروەها لە ئایەتەکانی (٧٦و ٧٧و ٧٨)ی سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ ﴾، واتە: ئەم قورئانە بەسەر بەنی ئیسرائیل دا دەخوێنێتەوە زۆربەی ئەوەی لەسەری کەوتوونەتە ڕا جیاییو، تێیدا کەوتوونەتە مشتومڕەوە، وە ڕێنماییو ڕەحمەتە بۆ بڕواداران، وە بێگومان خوا بە حوکمی خۆی دادوەرییان لەنێواندا دەکاتو خوا زاڵی زانایە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (٦٤) تاکو (٧٤) دەگرێتەوە، واتە: یازدە ئایەت، کە لەم یازدە ئایەتەدا خوای پەروەردگار بانگی خاوەن کتێبەکان دەکات، واتە: ئەوانەی کتێبی ئاسمانییان لەبەر دەست دایە، جا چ وەك خۆی مابێتەوە، کە تەنها قورئانە، چ گۆڕدرابێ، کە تەوراتو ئینجیلو زەبوورو هەموو ئەو کتێبانەی دیکەن کە خوا ناردوونی، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست پێی بانگکردنی غەیری ئەهلی ئیسلامە، دەفەرموێ: بانگیان بکە بۆ خوا بەیەکگرتن (توحید)، کە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، وە خاوەن کتێبەکان بەتایبەتی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، سەرکۆنە دەکرێن لەسەر قسەکردنیان دەربارەی ئیبراهیم ﷺ، لە حاڵێکدا کە زانیارییان دەربارەی ئیبراهیم ﷺ نیە، چونکە تەوراتو ئینجیل پاش ئیبراهیم ﷺ هاتوونە خوار! وە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە ئیبراهیم ﷺ نە جوولەکە بووە، نە نەصرانیی بووەو نە موشریکیش بووە، بەڵکو مسوڵمانێکی ڕاستو ساغ بووە، وە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە ئیبراهیم ﷺ کێ لێی نیزیکە؟ دیارە ئەوانەی کە بەڕاستی شوێنی کەوتوون، وە پێغەمبەری خوا ﷺو مسوڵمانانیو شوێنکەوتووی، وە باسی خۆزگەو ئاواتی خاوەن کتێبەکان بەوە کە مسوڵمانان تووشی گومڕایی بکەن، دەکات، ئنجا سەرکۆنەی هەندێکیان دەکرێ لەسەر کوفرو تێکەڵکردنی هەقو ناهەق، وە ئاشکراکردنی پیلانێکی مەترسیداری خاوەن کتێبەکان کە بریتییە لە مسوڵمانبوونو پاشان هەڵگەڕانەوە، بۆ ئەوەی مسوڵمانان بخەنە گومانەوەو تووشی بەلبەلەی فیکرییان بکەن.

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤْمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بڵێ: ئەی خاوەن کتێبینە! وەرن بۆ قسەیەکی یەکسان لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، کە جگە لە خوا هیچ شتێك نەپەرستین، وە هیچ شتێك نەکەینە هاوبەش، وە هەندێکمان هەندێکمان لەجیاتی خوا بە سەروەرو پەروەردگار نەگرین، جا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بڵێن: شایەد بن کە ئێمە مسوڵمانین ﴿٦٤﴾

ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی لەبارەی ئیبراهیمەوە شەڕە قسە دەکەن؟ خۆ تەوراتو ئینجیل دوای وی هاتوونە خوار، ئایا نافامن! ﴿٦٥﴾ باشە ئەوە ئێوە لە شتێکدا دمبەدمەتان کرد کە زانیارییتان لەبارەیەوە هەیە، بەلام بۆچی لەبارەی شتێکەوە کە زانیارییتان پێی نیە، مشتومڕ دەکەن ؟ وە خوا دەزانێو ئێوە نازانن ﴿٦٦﴾ ئیبراهیم نە جوولەکە بووو نە نەصرانیی بوو، بەڵکو ڕاستڕەوێکی مسوڵمان بوو، وە لە هاوبەشدانەران نەبوو ﴿٦٧﴾ بێگومان لە پێشترین کەس لە ئیبراهیم ئەوانەن کە شوێنی کەوتوون، وە ئەم پێغەمبەرەیە، وە ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە، وە خوا دۆستی بڕوادارانە ﴿٦٨﴾ دەستەیەك لە خاوەن کتێبان حەز دەکەن گومڕاتان بکەن، وە تەنیا خۆشیان سەرگەردان دەکەن، بەلام هەست ناکەن ﴿٦٩﴾ ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی بە ئایەتەکانی خوا بێبڕوان؟ لە حاڵێکدا شایەدییش دەدەن لەسەر ڕاستیی ئایەتەکانی خوا ﴿٧٠﴾ ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی هەق لەگەڵ ناهەق تێکەڵ دەکەن، وە لە حاڵێکدا کە دەشزانن ڕاستیی دەشارنەوە ﴿٧١﴾ وە دەستەیەك لە خاوەن کتێبان لەنێو خۆیاندا گوتیان: پێش نیوەڕۆ بڕوابێنن بەوەی بۆ سەر بڕواداران نێرراوەتە خوار، دوای نیوەڕۆش بێبڕوایی پێشان بدەن، بەڵکو لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە ﴿٧٢﴾ وە مەگەر بۆ کەسێك شوێن ئایینەکەتان کەوتبێ ئەگەرنا متمانە بە کەس مەکەن، بڵێ: بێگومان ڕێنمایی هەر ڕێنمایی خوایە (وە لە نێو خۆیاندا گوتیان: بڕوا مەکەن)، کە هیچ کەس ئەوەی پێبدرێ لە کتێبو وەحی کە بە ئێوە دراوە، یان کە لەلای پەروەردگارتان شەڕە قسەتان لەگەڵ بکەن، بڵێ: بێگومان بەخشش هەر بەدەستی خوایە، هەر کەسێکی بیەوێ دەیداتێ، وە خوا فراوانی زانایە ﴿٧٣﴾ هەر کەسێکی بیەوێ تایبەتی دەکات بە بەزەیی خۆیەوە، وە خاوەن بەخششی مەزنە ﴿٧٤﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(**سَوَآءِ**): واتە: یەكسان، مەبەست ئەوەیە كە خاوەن كتێبەكان بانگ بكرێن بۆ شتێك كە بۆ هەموو لایەكیان وەك یەكە، كە ئەویش بریتیە لە: خوا بەیەكگرتن دەگوترێ: (مَكَانٌ سوىً وَسواءٌ، أي: وَسَطٌ) هەردوو وشەی: (سوىً) و(سواءٌ)، واتە: ڕاستو یەكسان، (وَيُقَالُ سواءً وَسِوىً وَسُوىً، أَي: يَسْتَوِي طَرَفَاهُ)، واتە: وە دەگوترێ: (سواءً وَسِوىً وَسُوىً) یانی هەردوك لای یەكسانن. وە ﴿فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍ ...﴿٥٨﴾﴾ الأنفال، واتە: بە شێوەیەكی دادگەرانە ئەوانیشو ئێوەش بزانن كە ئەو پەیمانە هەڵوەشاوەتەوە، وە یەكسانكردنی شتێكو ڕێكخستنیو وەك یەك لێكردنی بەشەكانی پێی دەگوترێ: (تسوية).

(**أَرۡبَابًا**): كۆی (رَبّ)ە، ئنجا (رَبّ)یش بە مانای پەروەردگارو خاوەنو سەروەر، دێ، (الرَّب في الأصْلِ: التَربِيَةَ وَهوَ إنشاءُ الشَيءِ حَالاً فحَالاً إلى حَدِّ التَمَام، فَالْرَبُّ مَصْدَرٌ مُسْتَعَارٌ لِلْفَاعِلِ، وَجَمْعُهُ أَرْبَاب)، واتە: وشەی (رَبّ) لە ئەسڵدا لە تەربیەوە هاتوە، ئەمیش ئەوەیە كەشتێك قۆناغ بە قۆناغ پێبگەیەنی، هەتا ڕادەی كامڵبوون، خواش پەروەردگاری جیهانەكانە، (واتە سەرپەرشتییان دەكاتو مشوورییان دەخوات پێیان دەگەیەنێ)، وە وشەی (رَبّ) لە ئەسڵدا چاوگە، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ بكەر، وە كۆیەكەی (أَرْبَاب)ە.

(**حَنِيفًا**): (الْحَنَفُ: هُوَ مَيْلٌ عَنِ الضَّلَالِ إلى الإسْتِقَامَةِ، عَكْسُ الجَنَف: هُوَ مَيْلٌ عَنِ الإسْتِقَامَةِ إلى الضَّلَال، والحَنِيفُ: هُوَ المائِلُ إلى ذَلِكَ والجمع حُنفاء)، واتە: (الحَنَفُ) بریتیە لە مەیلكردنو بەلادا چوون لە گومڕاییەوە بەرەو ڕاستە ڕێگا، بە پێچەوانەوەی (الْجَنَف)ەوە، وە وشەی (الْحَنِيف) بریتیە لە كەسێك مەیلی كردوە بۆ وازهێنان لە گومڕاییو لەڕێی لارو خوار بەرەو ڕاستە شەقامی خوا، وە كۆیەكەی (حُنَفَاء)ە.

(طَآئِفَةٌ): واته: كۆمەڵ، (طَائِفَةٌ مِنَ النَّاس جَمَاعَةٌ مِنْهُمْ، وَمِنَ الشَّيءِ القِطْعَةُ مِنْهُ) واته: (طَائِفَة) كۆمەڵێك لە خەڵك، وە ئەگەر مەبەست پێی شتێك بێ، واتە: پارچەیەك لەو شتە.

(تَلْبِسُونَ): واتە: تێكەڵی دەكەن، (أَصْلُ اللَّبسِ سَتْرُ الشَّيءِ)، واتە: وشەی: (لَبْس) لە ئەسڵی زمانی عەرەبی دا بە مانای داپۆشینی شتێك دێت، وە دەگوترێ: (لَبَسْتُ، أي: خَلَطْتُ عَلَيْهِ أَمْرَهُ) واتە: شتەكەم لێ تێكەڵ كرد، لێم ئاوێتە كرد، كەواتە: ﴿لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ﴾، واتە: بۆچی هەقو ناهەق تێكەڵ دەكەن.

(وَجْهَ ٱلنَّهَارِ): (أَي صَدْرَ النَّهَارِ)، واته: پێش نیوەڕۆ، سەرەتای ڕۆژ.

(وَلَا تُؤْمِنُوٓاْ): واتە: متمانەی پێ مەكەن، وەك براكانی (یوسف) بە پێغەمبەر یەعقووب (علیهما السلام) دەڵێن: ﴿... وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٖ لَّنَا ... ﴿١٧﴾﴾، (أي بِمُصَدِّقٍ لَنَا)، واته: تۆ ئێمە بەڕاست دانانێی، هەر لە قورئان لە سوورەتی (التوبة)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿... وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ ... ﴿٦١﴾﴾، (یعني: یصدِّقُ للمؤمنین)، واتە: بڕواداران بەڕاست دەزانێ، متمانەیان پێ‌دەكات.

(ٱلْفَضْلَ): (فَضْلٌ: الزِيَادَةُ عَنِ الإقتِصَاد) زیادە لەڕاددەی میانجیی، یان هەر جۆرە زیادەیەك، وە ئاواش پێناسەكراوە: (وكُلُّ عَطِيَّةٍ لاَ تَلْزَمُ مَنْ يُعْطِي) هەر بەخششێكە كە پێویست نەبێت بەخشەر بیبەخشێ، واتە: ئەوە كە كەسێك شتێكت بداتێ كە پێویست نەبێ لەسەری بتداتێ، بۆیە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ... ﴿٣٢﴾﴾النساء، واتە: لە بەخششی خوا داوا بكەن، بێگومان هیچ شتێك لەسەر خوای پەروەردگار پێویست نیە، بۆیە هەموو ئەو شتانەی كە خوا دەیانبەخشێ، ناوی لێناون (فَضْل)، چونكە خوا هیچ شتێكی لەسەر پێویست نیە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٦٥ ﴾، ((أَخْرَجَ ابْنُ إِسْحَاق وَابْنُ جَرِير وَالبَيْهَقِيُّ في (الدلائل) عَنِ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، قَالَ: اجْتَمَعت نَصَارَى نَجْرَان وَأَحْبَارُ يَهُود عِنْدَ رَسول ﷺ فَتَنَازَعُوا عِنْدَهُ فَقَالَتْ الأَحْبَارُ: مَا كَانَ إِبْراهِيمُ إلاّ يَهُودِيًّا، وَقَالَتِ النَّصَارَى: مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ إلاّ نَصرَانيًّا، فَنَزَلَ فِيهِم: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ ﴾))[1]، واتە: ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو جەریرو بەیهەقییش لە (دلائل)دا لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: ڕۆژێك نەصرانیی یەکانی نەجران لەگەڵ زانایانی جوولەکە کۆبوونەوە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، وە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتنە مشتو مڕەوە، زانایانی جوولەکە گوتیان: ئیبراهیم جوولەکە بووە، نەصرانیی یەکانیش گوتیان: نەخێر، ئیبراهیم نەصرانیی بووە، ئیدی ئەم ئایەتە دەربارەیان هاتە خوار، کە چۆن دەگونجێ ئیبراهیم جوولەکە بووبێ، یان نەصرانیی بووبێ، لە حاڵێکدا کە تەورات نیزیکەی هەزارساڵ دوای وی‌و ئینجیل نیزیکەی دوو هەزار ساڵ دوای وی هاتۆتە خوار؟! کەواتە: ناگونجێ ئیبراهیم جوولەکەو نەصرانیی بووبێ، چونکە جوولەکایەتی‌و نەصرانییەت، یەکیان هەزار ساڵو ئەویدیکەیان دوو هەزار ساڵ دوای وی پەیدا بووە !!

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٧١ ﴾، ((أَخْرَجَ ابْنُ

---

١) جامع البيان للطَّبَري، ج: (٣)، ص: (٣٣٠)، وفتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٤٥١).

إِسْحَاق، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ الْمُنذِر، وَابْنُ أَبِي حَاتِم عَنِ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: وَقَالَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ صَيْفٍ، وَعَدِيُّ بْنُ زَيْدٍ، وَالْحَارِثُ بْنُ عَوْفٍ، بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ تَعَالَوْا نُؤْمِنْ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمّدٍ وَأَصْحَابِهِ غُدْوَةً وَنَكْفُرْ بِهِ عَشِيّةً، حَتّى نَلْبِسَ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ، لَعَلَّهُمْ يَصْنَعُونَ كَمَا نَصْنَعُ، وَيَرْجِعُونَ عَنْ دِينِهِم، فَأَنْزَلَ اللّهُ تَعَالَى فِيهِمْ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾، إِلى قَوْلِهِ: ﴿ ... وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ ﴾))[1]، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: عەبدوڵلای كوڕی صەیفو عەدیی كوڕی زەیدو حاریسی كوڕی عەوف (ئەوانە كۆمەڵێك لە زانایانی جوولەكە بوون) هەندێكیان بە هەندێكیان گوت: وەرن با پێش نیوەڕۆ، بەرەبەیان ئیمان بەوە بێنین، كە بۆ سەر موحەممەدو هاوەڵانی هاتۆتە خوار (واتە: ئیمان بە قوڕئان بێنین)، وە دوای نیوەڕۆیەكەشی بڵێین: ئێمە كافر بووینەوە! بۆ ئەوەی دینەكەیان لێ تێكەڵ بكەین، ئەوانیش وەك ئێمە بكەن (واتە: بیانخەینە گومانەوەو بڵێن: زانایانی جوولەكە مسوڵمان بوون، دوایی كافر بوونەوە ! دیارە بۆیان دەركەوتوە كە ئیسلام هەڵەیە، بۆیە كافر بوونەتەوە، تەماشا چ پیلانێكیان داناوە!!) ئیدی خوای بەرز لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، كە ئێمە دوایی زیاتر تیشكی دەخەینە سەر.

## مانای گشتی ئایەتەكان

دیارە ئێمە هەموو جارێ پێش مانای گشتی ئایەتەكان، هەم بەگشتی پێناسەیان دەكەین، هەم مانای وشە بە وشەیان دەكەین، وە هەندێ لە وشەكان شی دەكەینەوەو هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكانیش باس دەكەین، بۆ ئەوەی زەمینە خۆش بكرێ تاكو لە مانای گشتی ئایەتەكان باشتر حاڵی بین، خوای پەروەردگار دوای ئەوەی كە لە ئایەتەكانی ڕابردوودا بۆی باس كردین، كە

---

١) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٤٥٤).

مشتومڕو وتووویژێکی زۆر لە نێوانی پێغەمبەری خوا ﷺ و نەیارەکانیدا بەگشتی بووە، بە تایبەت جوولەکەو نەصرانیی یەکان کە خاوەن کتێبن، دوای ئەوە بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە لەدوای پێغەمبەری خواشەوە هەرکەسێك کە قورئان دەخوێنێ و بەدوای پێغەمبەردا دەڕوا، فەرمانی پێکراوە، بڵێ: ئەی خاوەن کتێبینە! وەرن، بۆ کوێ بێن؟ ﴿ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴾، وەرن بۆ وشەیەك کە بۆ هەمووومان وەك یەکە، واتە: وەرن بۆ خاڵی هاوبەش، ئێمە خاڵێکی هاوبەش هەیە لەسەری پێك دەگەین، تەماشا بکەن ! ئیسلام زۆر مەبەستیەتی خەڵك لەسەر خاڵە هاوبەشەکان کۆبێتەوە، بە مەرجێك ئەو خاڵە هاوبەشانە هەق و ڕاست بن، جا ئایا ئەو خاڵە هاوبەشەی کە لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان لەلایەك و، جوولەکەو نەصرانیی و هەموو خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان، لەلایەکی دیکەوە، هەیە، چییە؟ ڕوونی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئەو خاڵە هاوبەشە بریتیە لە: خوا بە یەکگرتن، تەنیا خوا بە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و پەرستراوو حاکم و هەمەکارەی بوونەوەرو کائینات زانین، ئەوە خاڵی هاوبەشە، کە جگە لە خوا هیچ نەپەرستین، وە هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی، وە هەندێکمان لەجیاتی خوا هەندێکمان نەکەینە پەروەردگاری خۆمان، ئیسلام بۆیە هاتوە خەڵك هەمووی بەندەی خوا بێ و پێکەوە برا بێ، وە لە ڕاستیدا بەهۆی ئیسلامەتییەوە خەڵك ڕزگاری دەبێ و قوتاری دەبێ لەوە کە هەندێکی ببێتە کۆیلەو خزمەتکاری هەندێکی، تەنیا لە ئیسلامداو بەهۆی خوا بە یەکگرتنەوە، خەڵك هەمووی یەکسان دەبێتەوەو، لە بەرانبەر خوادا هەموو بەندە دەبن، بەڵام وەختێك مرۆڤ لە ئیسلام لادەدات، کەسانێك لە خەڵك دەبنە پەرستراو پەروەردگارو سەروەر بەسەر ئەوانی دیکەوەو خۆیان لێ دەکەنە طاغووت و

فیــــرعەون ... هتـــد، ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾، ئەگـــەر قبووڵیان نەكردو پشتیان تێكردی، ئـەوە بڵـێن: واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ، تـۆو مسوڵمانان بڵێن: شایەدیی بدەن، كە ئێمـە مـسوڵمانین، ئێمـە ملكـەچین بـۆ خـوا، ئەگەر ئێوە ملكـەچ نـابنو خـوا بـە یـەكگرتن قبـووڵ ناكەن، ئـەوە ئێمـە بـۆ خـوا ملكـەچین، ئنجـا خـوای زانـاو شـارەزا جارێكی دیكـە بـانگی خـاوەن كتێبـەكان دەكـــاتو دەفــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئەی خاوەن كتێبینە! بۆچی دەربارەی ئیبـراهیم وتووێـژو مـشتو مـڕ دەكـەن؟ هەندێكـتان دەڵـێن: ئیبـراهیم ؈ جوولەكــە بــووە، هەندێكــتان دەڵــێن: نەصــرانیی بــووە، لــە حاڵێكــدا كــە تــەوراتو ئینجـیل كـە بناغـەی یەهودییـەتو نەصـرانییەتن، یەهـودییەت یـانی چی؟ واتـە: ئەو دینـەی كـە تـەورات تەعبیـری لـێ دەكات، وە نەصـرانییەت واتـە: ئەو دینەی كە ئینجیل تەعبیـری لـێ دەكات، ئـەو تـەوراتو ئینجیلـە كـە بناغـەی جوولەكایەتیو نەصرانییەتن، لە دوای ئیبـراهیم ؈ هـاتوونە خـوار، تـــەورات بە نیزیكەی هەزار ساڵ بەلای كەمـەوە، ئینجیلیش بـە نیزیكـەی دوو هـەزار سـاڵ دوای ئیبـــراهیم ؈ ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئـــایا نافـــامن ؟!، واتـــە: تـــەوراتو ئینجـیلێك كـە بـە هـەزار ساڵو دوو هـەزار سـاڵ دوای ئیبـراهیم هاتبنـە خـوار، دەكــرێ ناوێـك كـە لـە تـەوراتو ئینجـیل وەرگیــراوە، كـە جوولەكــایەتی یــان نەصــرانییەتە، ئــەو نــاوە بەســەر ئیبــراهیمدا ؈ ببــڕڕێ ؟ نــەخێر ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجۡتُمۡ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ ﴾، ئنجا خـوای زانـاو توانا سەركۆنەیان دەكـاتو دەفـەرموێ: باشــە ئـەوە ئێـوە وتووێژتــان كـرد دەربـارەی شـتێك كـە زانیـارییتـان پـێــی هەیــە ﴿فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ ﴾، بۆچــی دەربــارەی شـــتێك موناقەشـە دەكەنو مشت ومڕ دەكـەن كە زانیارییتـان پێی نیـە ؟ ئێـوە زانیـارییتان بە ئیبـراهیم ؈ نیـە، چونكە دوو هـەزار سـاڵ پێـش نەصرانیی یـەكانو هـەزار

ساڵ پێش جوولەکەکان بووە، کەواتە: بۆ لەخۆوە قسەی لێ دەکەن؟ ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، وە خوا دەزانێ‌و ئێوە نازانن، ئنجا خوای بێ‌هاوتا ڕایدەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا ﴾، ئیبراهیم عليه السلام نە جوولەکە بووە، نە نەصرانیی بووە، ئەدی چی بووە؟ بەرنامەکەی ئیبراهیم عليه السلام چی بووە؟ وە نازناوەکەی چی بووە؟ ﴿ وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا ﴾، کەواتە: ئیبراهیم عليه السلام حەنیف بووە، پێشتر ڕوونمان کردەوە کە حەنیف یانی چی؟ واتە: لە هەموو بیروبڕوایەکی چەوتەوە دوورکەوتبۆوەو هاتبووە سەر بیرو بڕوای ڕاست لە هەموو ڕوویێکەوە، هاتبووە سەر ڕاستە شەقامی خوا، وە بۆ خوا ملکەچ بوو، ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، وە وەك بتپەرستەکانیش ئیددیعا دەکەن، وە وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش ئیددیعا دەکەن، لە هاوبەشدانەرانیش نەبووە، بەڵکو ئیبراهیم عليه السلام مسوڵمانێکی حەنیف بووە، مسوڵمانێکی ڕاست‌و ساغ بووە، کەواتە: لێرەدا بۆیە خوای بێ وێنە وا دەفەرموێ: چونکە جوولەکەکان شانازیی بە ئیبراهیمەوە عليه السلام دەکەن‌و، نەصرانیی یەکان شانازیی بە ئیبراهیم عليه السلام دەکەن، هەروەها مسوڵمانانیش شانازیی پێوە دەکەن، وە صابیئەش شانازیی پێوە دەکەن، هیچ خاوەن کتێبێکی ئاسمانیی نیە، با کتێبەکانیشیان گۆڕیبێ، مەگەر شانازیی بە ئیبراهیمەوە عليه السلام دەکات، واتە: ئیبراهیم عليه السلام خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو بەرنامە ئاسمانییەکانە، بۆیە خوای پەروەردگار باسی ڕێبازەکەی دەکات، ئنجا ئایا ئەو ڕێبازەی ئیبراهیم عليه السلام کە خوا باسی دەکات، لەگەڵ جوولەکایەتی دێتەوە؟ یان لەگەڵ نەصرانییەت دێتەوە؟ بەدڵنیایی نەخێر، بەڵکو هەرهەمان ڕێبازە کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ گرتوویەتیە بەر، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوۡلَى ٱلنَّاسِ بِإِبۡرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ ﴾، بێگومان لە پێشترین کەس لە ئیبراهیم عليه السلام، ئەوانەن کە شوێنی کەوتوون، لە سەردەمی خۆیدا، ﴿ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، وە ئەم پێغەمبەرە، مەبەست لەو

پێغەمبەرە کێیە؟ بێگومان موحەممەدە ﷺ، ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، وە ئەوانەش کە بڕوایان بەم پێغەمبەرە کۆتاییە هێناوە، ئەوان لە هەموو کەس لە ئیبراهیم ؈ لەپێشترن، ﴿ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، خواش دۆستو پشتیوانو یارمەتیدەری بڕوادارانە، کەواتە: ئێوەش ئەگەر دەتانەوێ لە ئیبراهیم ؈ لەپێش بنو لێی نیزیك بن، ئەوە بە لاف لێدانو ئیددیعا نابێ ! بەڵکو دەبێ بە ڕاستیی شوێنی بکەونو، ئیمان بەو پێغەمبەرە کۆتاییە بێنن، کە ڕێكوپێك لەسەر ڕێبازی ئیبراهیم ؈ دەڕوات، ئنجا دێتە سەر باسی کینەو بوغزو مەبەستی خراپی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، دەربارەی ئەهلی ئیسلامو دەفەرموێ: ﴿ وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ ﴾، کۆمەڵێك لە خاوەن کتێبەکان ویستیانو ئاواتەخواز بوون کە گومڕاتان بکەن، لاتان بدەنو سەرتان لێ بشێوێنن ﴿ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾، بەڵام هەر خۆیان گومڕا دەکەن، وە هەستیشی پێ ناکەن، واتە: ناتوانن ئێوە گومڕا بکەن، تا ئێوە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بن، وە هەتا دەستگرتوو بن بە قورئانەوە، جوولەکەو نەصرانیی یەکان زەفەرتان پێ نابەن، بەڵام زەفەر بە کێ دەبەن؟ زەفەر بەوانە دەبەن کە لە قورئان دوور دەکەونەوە، لە ڕۆژگاری ئێستاماندا مسوڵمانانێکی زۆر کە لە قورئان شارەزا نینو دوور کەوتوونەتەوە، کەوتوونە ژێر کاریگەریی ئەو بیردۆزەو بیرو بۆچوونو، ئەو شتانەی کە جوولەکەو نەصرانیی یەکان ڕەواجی پێدەدەن، وەك فیکرەو بەرنامەکانی: مارکسیزم، کە مارکس کابرایەکی جوولەکە بووە، وە داروینیزم کە داروین نەصرانیی بووە، بەڵام بەکرێگیراوی جوولەکە بووە، وە فرۆیدیزم کە (فرۆید)یش کابرایەکی جوولەکە بووە، ئنجا لیبرالیزمو سیکۆلاریزمو ئەو فیکرانە ... هتد، لێیان بکۆڵەوە هەموویان ڕیشەکەیان دەچێتەوە سەر بابایەکی جوولەکە یان نەصرانیی، ئنجا ئایا کێ کارتێکراو دەبێو دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو فیکرانەوە؟ ئەوانەی کە لە قورئانو ئیسلام دوورن، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ:

﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾، یانی: هەر خۆیان گومڕا دەکەنو هەستیشی پێ ناکەن، واتە: زەفەر بە ئێوە نابەن ئەگەر ئێوە مسوڵمانی چاك بن، پاشان دووبارە خوای زاناو شارەزا ڕوویان تێدەکاتو ڕەخنەیان لێ دەگرێو سەرکۆنەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، ئەی خاوەن کتێبینە! ﴿لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴾، بۆچی بێبڕوا دەبن بە ئایەتەکانی خوا، وە ئێوە شایەدیی دەدەنو دەشزانن کە ئەو ئایەتانە لە لایەن خواوە هاتوون؟ چونکە بۆ زانیارییتان هەر کەسێك کە خاوەن کتێب بووبێ، دەزانێ کە ئایا ئەو قسەیە کە دەکرێت وەحی یەو قسەی خوایە، یان قسەی خوا نیە، یانی: هەروەك چۆن کابرای زێڕینگر زێڕی ساغو ناساغ لێکدەکاتەوە، هەر خاوەن پیشەیەك لە بواری خۆیدا هەقو ناهەق لێك جیادەکاتەوە، وە بەرگدروێك تەماشای قاتێك بکات دەزانێ چاك دروواوە، یان خراپ دروواوە ؟ ئەندازیارێك تەماشای بینایەك بکات دەزانێ نەخشەکەی چاکە یان چاك نیە؟ جا ئەوانیش زۆر چاکیان زانیوە، کە موحەممەد ﷺ ئەو قسانەی دەیکات هی خۆی نین، بەڵکو فەرمایشتی خوانو لە لایەن خواوە ئەو کتێبەی بۆ هاتوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: کاتێك ئێوە دەزاننو شایەدیی دەدەن ئەو ئایەتانە لە لایەن خواوە هاتوون، بۆچی کوفریان پێ دەکەنو ئیمانیان پێ ناهێنن؟ ئنجا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَـٰطِلِ ﴾، ئەی خاوەن کتێبینە! (کە خاوەن کتێبەکان، وەك گوتمان: بە پلەی یەکەم جوولەکەو نەصرانیی یەکانن، وە دوایی هەرکەسێکی دیکەیە کە ئیددیعای ئەوە بکات کتێبێکی ئاسمانیی هەیە، جا ئێزیدیە، بوذاییە، کاکەییە، صابیئییە، مەجووسیی یە، ... هتد) دەفەرموێ: ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی هەق لەگەڵ ناهەق تێکەڵ دەکەن؟ واتە: تۆزێکتان هەق پێیە، بەڵام لەگەڵ باطڵ ئاوێتەی دەکەن، هەندێ شتی باشتان هەیە، بەڵام لەگەڵ شتی خراپی تێکەڵ دەکەن ﴿وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ

تَعۡلَمُونَ ﴾، وە هەقیش دەشارنەوە کام هەق؟ ئەو هەقەی کە لە لای ئەوان زانراوە، کە پێغەمبەرێك دێت بە ناوی (موحەممەد)و (ئەحمەد)، وە نیشانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە تەوراتی ئێستادا هەن، من خۆم خوێندوومەتەوە لە هەر کام لە (پەیمانی کۆن)[1]و (پەیمانی نوێ) [2]دا ئێستاش لەگەڵ ئەوەی دەستکارییشیان کردوە، کۆمەڵێك سیفەتو نیشانەی پێغەمبەری ئێمەیان ﷺ تێدا هەن، کە ئەو سیفەتانە تەنیا بەسەر پێغەمبەری کۆتایی دا ﷺ دەچەسپێن، ئنجا بەڵام ئەوان ئەو هەقەی کە لەلایان بوو کە نیشانەکانی پێغەمبەری کۆتایی یە ﷺ، دەیشارنەوە لە حاڵێکدا کە دەشزانن ئەوە پێغەمبەری کۆتایی یە، ئنجا خوای پەنهانزان باسی ئەو پیلانە ژەهراوییەی خاوەن کتێبەکان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، وە دەستەیەك لە خاوەن کتێبەکان گوتیان: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى

---

١) بۆ وێنە ئەم دەقە: (لهذا أُقيمُ لهم نبياً من بين إخوتهم مثلك وأضَعُ كلامي في فَمِهِ فَيُخاطبهم بكلِّ ما امرهم به... ) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سِفْر التثنية، الإصحاح : (١٨)، الآية: (١٩)، ص: (٣٩٠).

هەروەها ئەم دەقە: (أقبل الربُّ من سيناء، وأشرف عليهم من سعير، وتألَّق في جبل فاران...)، العهد القديم، سِفْر التثنية، الإصحاح : (٣٣)، الآية: (٢)، ص: (٤١٥).

ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی دەلالەتی ئەم دەقانەش لە کتێبی: (الإسلام كما يتجلَّى في كتاب الله تعالى) بەرگی (٣)دا هاتووەو، لێرە تەنیا مەبەستم ئاماژە پێکردن بوو.

٢) بۆ وێنە ئەم دەقە: (إن كنتم تُحِبّونني فاحفظوا وصاياي وأنا أطلب من الاب فيعطيكم مُعَزِّياً آخر ليمكث معكم الى الأبَدِ رُوحُ الحق) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل يوحنا، الإصحاح : (١٤)، الآية: (١٥، ١٦)، ص: (٢٢٢٢).

شایانی باسیشە، ئەوە قسەی (عیسى)یەو مەبەستیشی لە (مُعزِّياً آخر) یان (مُعِيناً آخر)، پێغەمبەری کۆتایی (محمد)ە ﷺ، ئنجا لە نوسخەیەك دا بە (مُعزِّياً آخر) و لە یەکی دیکەشیان بە (مُعِيناً آخر) وەسفی کردوە، بڕوانە: (الكتاب المقدس)، كتاب العهد الجديد، إنجيل يوحنا، الإصحاح : (١٤)، الآية: (١٥، ١٦)، ص: (١٧٥)، ط دار الكتاب المقدس في العالم العربي.

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾، پـێش نیـوەڕۆ ئیمـان بێـنن (وا پـێشـان بـدەن ئیمانتـان هێنـاوە) بـەوەی كـە دابـەزێنراوە بـۆ سـەر مسولْمانان، وە پاش نیـوەڕێ كافربنـەوە، بڵێن: (هەڵگەڕاوینـەوە)، بۆچـی؟ تـاكو خەڵك بڵـێ: بۆچی هەڵگەڕاونـەوە؟ ئـەوانیش بڵـێن: ئـاخر بۆمـان دەركـەوت كە قورئان هـەڵەیە، بۆیـە هەڵـگەڕاوینەوە!! تـاكو خـەڵك تووشـی گومـانو ڕاڕایـیو دوو دڵـیی بكەن، ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾، بۆ ئـەوەی هەڵبگـەڕێنەوەو واز لـە ئیـسلام بێـنن، ئنجا خـوای زاناو شارەزا بەردەوام دەبـێ لەسەر ئاشـكراكردنی پیلانەكـەیان: ﴿ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ ﴾، وە متمانـەش مەكـەن، (واتـە: جوولەكـەكان لـە نێـو خۆیـانـدا، یاخود جوولەكەو نەصرانیی یـەكان لـەنێو خۆیانـدا دەڵـێن) متمانـە بـە كـەس مەكـەن مەگـەر كەسـێك بـەدوای دینەكـەتـان بكـەوێ، واتـە: متمانـەی پـێ مەكەن كە كتێبێكی خـوایی بۆ هاتبـێ، پـەیامو وەحـی خـوایان بـۆ هـاتبـێ، یـاخود متمـانـەیان پـێ مەكەن كە ئەو نەخشـەیەی خۆتان بدركێنن، ئـەو نەخـشـەو پیلانـە بـا هـەر لـە بەینـی خۆمانـدا بـێ، كـەس پـێـی نـەزانێ، بـەڵام خـوای پەنهـانزان لـە سـەرووی حـەوت تەبەقـەی ئاسـمانانەوە ئـەو پیلانـەیان لێـی ئاشـكرا دەكـاو، پـەردەیـان لەسەر هەڵـدەماڵێ، چونكە خۆ مـسولْمانان ئاگایـان لـەو پیلانـە نـەبووە، وەك لە هـۆی هاتنە خـوارەوەدا باسـی لــە سـێ زاناكـەی جوولـە كـرد، كـە لـە نێـو خۆیانـدا بـە شـێوەیەكی زۆر نهێنیـی ئـەو پیلانـەیان دارشـتوە، بـەڵام خـوا دیـارە مـسولْمانان ئاگـادار دەكـاتەوە، لـەوەی كـە ئـەوان خـەریكی پیلانێكـی ئـاوان، ئنجا خـوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ ﴾، پـێیان بڵـێ: ڕێنمـایی هـەر ڕێنمـایی خـوایە، هـەر ڕێنمـایی خـواو ڕێ نیـشـاندانی خـوا ڕێ نیـشاندانە، دوایـی دێتـەوە سەر قسـەی ئەوانو دەفـەرموێ: ﴿ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ ﴾، متمانـە بـە هـیچ كـەس مەكـەن غـەیری ئەوانـەی كـە شـوێنتان كـەوتوون، كـە هـیچ كـەس كتێـبو پـەیامی خـوای پـێ بـدرێ، وەك بـە ئێـوە دراوە، ﴿ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡ ﴾،

متمانەیان پێ مەکەن، کە لە ڕۆژی دواییدا موناقەشەتان لەگەڵدا بکەنو مشتومڕتان لەگەڵ بکەن، لەلای خوای پەروەردگارتان، یاخود ئەو ڕاستییانەیان بۆ دەرمەخەن بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا ئەو ڕاستییە کە موحەممەد ﷺ، پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەری کۆتایی یە، کە ئێمە دەیزانین، ئەوەیان بۆ دەرمەخەن بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا موناقەشەتان لەگەڵ دا نەکەن، بڵێن: ئێوە کە دەتانزانی موحەممەد پێغەمبەری خوایە، بۆچی ئیمانتان پێ نەهێنا؟ ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ ﴾، تۆ بڵێ: بەخششو خەڵات لە دەست خوایە، ﴿ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾، دەیدا بە هەرکەسێك کە بیەوێ، واتە: ئێوە لەبەر ئەوەی حەسوودیی بە پێغەمبەر ﷺو بە مسوڵمانان دەبەن، کە پێغەمبەری کۆتایی لە نێو گەلی عەرەبدا هاتوە، نەك لە نێو جوولەکەکان دا، وە نەك لە نێو نەصرانیی یەکاندا، ئەو حەسوودییو ئێرەیی پێ بردنە، واتان لێ دەکات ئیمان نەهێنن، بەڵام بزانن کە بەخشش بە دەست خوایە، یانی: بەخششی خوا لە دەستی هیچ کەس دا نیە، نە لە دەست جوولەکەکان دایە، نە لە دەست نەصرانیی یەکان دایە، وە نە لە دەست مسوڵمانانیش دایە، بەس لە دەست خوا دایە، ﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا فراوانی زانایە، واتە: خوا سیفەتەکانی فراوانن، ڕەحمەتی، بەخششی، دەستەڵاتی... هتد، وە زاناشە، واتە: دەزانێ دەیدا بە کێ ؟ ﴿ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، هەرکەسێك بیەوێ تایبەتی دەکا بە بەزەیی خۆیەوە، ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، وە خوا بەخششی مەزنەو هەرکەسێك بیەوێ بەخششی مەزنو گەورەی پێ دەدات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾، ئایا مەبەست جوولەکەکانە، یان نەصرانیی یەکانە، یان مەبەست هەردووکیانە؟ هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: مەبەست پێی جوولەکەکانە، هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست پێی نەصرانییەکانە، هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست هەردووکیانە، بەڵام ئێمە دەڵێین: لە ڕاستیدا مەبەست پێی هەردووکیانە، وە هەر کەسێکی دیکەش لافی ئەوە لێبدات کە خاوەنی کتێبی ئاسمانییە، وەك: صابیئەکانو مەجووسییەکان، کە دەڵێن: (ئاڤێستا) بۆ زەرادەشت هاتوە، وە کاکەییەکان کە من خۆم قسەم لەوبارەوە لەگەڵ کردوون، دەڵێن: ئێمە بەدوای داوود ﷺ کەوتووین، کە زەبووری بۆ هاتووە، وە یەزیدییەکان کە بە حیساب دەڵێن: ئێمە موصحەفی ڕەشمان هەیە! کە دیارە ئەوانە کۆمەڵێکن لە مسوڵمانان لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، بەڵام ڕێیان لێ تێکچووە، بە هەر حاڵ، هەر کەسێك ئیددیعای ئەوە بکات کە کتێبێکی ئاسمانیی لەلایە، ئەوە دەیگرێتەوە، هەر کەسێك خۆی بە خاوەن کتێب دەزانێ، تۆ بانگی بکەو بڵێ: وەرن ئەی خاوەن کتێبەکان، ئەوانەی کە لافی ئەوە لێدەدەن کە کتێبی خواتان بۆ هاتوەو دەڵێن: پەیامو بەرنامەمان لە خواوە بۆ هاتوە، بۆ خاڵێکی هاوبەش کە بریتیە لە خوا بەیەکگرتنو تەنیا خوا بپەرستین، وە هاوبەشی بۆ پەیدانەکەین، وە هێندێکمان هێندێکمان نەکەینە پەرستراوو پەروەردگارو هەمەکارەی خۆمان، هەمووومان تەنیا ملکەچی خوا بین، پێکەوە براو تەبابینو ملکەچیی خوا بین.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴾، وەرن بۆ وشەیەك کە یەکسانە لە نێوانی ئێمەو ئێوەدا، واتە: خاڵی هاوبەش، جا

خاڵی هاوبەش لە هەر كۆمەڵگایەكدا بناغەی تەبایی یە، خەڵك چۆن پێكەوە تەبا دەبێ، چۆن پێكەوە برا دەبێ ؟ دیارە دەبێ شتێك هەبێ لەسەری پێكبگەن، بەڵام ئەگەر یەكێك بڵێ: من بەوێدا دەڕۆم، ئەوەی دیكە بڵێ: منیش بەوێدا دەڕۆم، وە هیچیان لە هیچ شتێكدا پێك نەگەن، ئەوە بە دڵنیایی تەبایی دروست نابێ، ئنجا ئیسلام هەمیشە عەوداڵی تەبایی یە، تەنانەت لەگەڵ كافرانیشدا، ئەوەتا هەركام لە جوولەكەو نەصرانیی كافرن‌و ئەوانی دیكەش كافرن، بەڵام دەفەرموێ: وەرن بۆ شتێك كە خاڵی هاوبەشە، جا ئەوە بەنسبەت ئەوانەوە كە لافی ئەوە لێدەدەن كتێبی خوایان هەیە، وە ئەوانەی كە كتێبی ئاسمانییشیان نەبێ، یان هەر بڕوایان بە خوا نەبێ‌و بڕوایان بە دوارۆژ نەبێ، بڕوایان بە هیچ دینێكی دیكە نەبێ، ئیسلام لەگەڵ ئەوانیشدا خاڵی هاوبەشی هەر هەیە، دەڵێ: وەرن با بەیەكەوە خزمەتی ئەو كۆمەڵگایە بكەین، با بەیەكەوە بەرگریی لە نیشتیمان بكەین، با بەیەكەوە ئەو كارە چاكانە بكەین، كە بۆ هەموو لایەك باشن، وە ئامانجی هاوبەش بناغەی تەبایی یە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ ... وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ... ﴿٢﴾ ﴾ المائدة، واتە: وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی‌و پارێزكاریی.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، بنەمایەكان سێن:

١- تەنیا خوا بپەرستین.

٢- هیچ شتێك نەكەینە هاوبەش بۆ خوا.

٣- هەندێكمان هەندێكمان بە پەروەردگار نەگرین، چونكە بە درێژایی مێژوو مرۆڤ كە ڕێی لێ تێكچووەو لە ڕاستە شەقامی خوا لایداوە، یان لەبەر ئەوە بووە كە لەگەڵ خوا شتی دیكەی پەرستوەو هاوبەشی بۆ خوا پەیداكردوە، یان لەبەر ئەوە بووە كە هەندێ كەس لە بەرگی دیندا، یان لە

بەرگی دنیادا کراون بە پەروەردگارو کراون بە پەستراوو ملکەچیی ڕەهایان بۆ کراوە، بە زۆریی خەڵك بەوە سەری لێ تێکچووەو لەڕێ دەرچووە، بۆیە خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرمووێ: ئەوانە بانگ بکە بۆ شتێك کە بناغەی دەربازبوونی خەڵکە لە کۆیلایەتی بۆ یەکدی، وە بناغەی تەبایی هەموو لایەکە، کە تەنیا خوای پەروەردگار پەرستراو پەروەردگارو هەمەکارەبێ، (ابْنُ جُرَيْج) دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرمووێ: ﴿ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، گوتوویەتی: (لا يُطِعْ بَعْضُنَا بَعْضاً فِي مَعْصِيةِ اللّٰه، وَيُقَالُ: إنَّ تِلْكَ الرُّبُوبيةَ أن يُطِيعَ النَّاسُ سَادَتُهُمْ وَقَادَتُهُم فِي غَيْرِ عِبادَةٍ، وَإِنْ لَمْ يُصَلُّوا لَهُمْ)[1]، واتە: هەندێکمان بە قسەی هەندێك نەکەین لە شتێکدا کە سەرپێچیی فەرمانی خوایەو لادانە لە شەریعەت، وە ئەو پەروەردگارێتی یە ئەوەیە: کە خەڵك بە قسەی گەورەکانیان و فەرماندەکانیان، وە بە قسەی بەرپرسانیان بکەن، لە شتێك دا کە بە (چەمکی تەسکی) عیبادەت لەقەڵەم نادرێ، (بەڵام بە چەمکە فراوانەکەی بە عیبادەت لەقەڵام دەدرێ)، هەر چەند نوێژیشیان بۆ نەکەن.

زۆر جار باسمان کردوە کە عیبادەت تەنیا نوێژکردن نیەو تەنیا زیکرو دوعا نیە، بەڵکو ملکەچیی بەگشتی پێی دەگوترێ: عیبادەت.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگرێ کە ئینسانی عاقڵ لەبارەی شتێکەوە قسەو موناقەشە نەکات کە شارەزایی لەبارەوە نەبێ، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء،

---

١) (جامع البيان)، بەرگی (٣) لاپەڕە (٣٢٩) بە ژمارەی (٧٠٨٨) هێناویەتی .

واتە: بەدوای شتێك مەكەوە، كە زانیارییت لەبارەوە نیە، واتە: قسەی لێ مەكە، عاقڵ قسە لە شتێك ناكات كە شارەزایی دەربارەی نەبێ، دەڵێ: نایزانم، بۆیە لە فەرمایشتێكدا هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِراءَ، وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا بِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ} (رَوَاهُ أَبُو دَوُدَ برقم: (٤٨٠٠)، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، وَصَحَّحَهُ العَلاَمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٧٣)، واتە: من دەستەبەركەریی كۆشكێكم لە كەناری بەهەشت بۆ ئەو كەسەی كە واز لە موناقەشەو شەڕە قسە بێنێ، ئەگەر لەسەر هەقیش بێ، ئەوە بە كۆشكێك لە نێوەڕاستی بەهەشتدا، واتە: دمبەدمەو شەڕەقسە باش نیە، ئەگەر ئینسان لەسەر هەقیش بێ، چ جای لەسەر ناهەق بێ! ئەگەر لەسەر ناهەق بێ، هەر نابێ شەڕەقسە بكات، بەڵكو ئەگەر لەسەر هەقیش بێ وا باشە بە شێوەی شەڕەقسە نەیكات، چونكە لایەنی بەرانبەر كەمتر وایە لە ئەنجامی شەڕەقسەدا بگاتە قەناعەت، یاخود جاری وایە هەر هەقەكەت لێ وەرناگرێ، بۆیە خوا ﷻ كە باسی (جدال) دەكات، دەفەرموێ: ﴿... وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴿١٢٥﴾﴾ النحل، واتە: وە موناقەشەیان لەگەڵ بكەن بە چاكترین شێواز، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ...﴿٤٦﴾﴾ النحل، واتە: موجادەلە لەگەڵ خاوەن كتێبەكان مەكەن مەگەر بەچاكترین شێواز، چونكە ئەگەر شێوازەكە زۆر چاك نەبێ، لایەنی بەرانبەر ئەو هەقەی كە لەلاتە لێت وەرناگرێ.

**مەسەلەی پێنجەم**: كە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە ئێمەی مسوڵمان نابێ بە شێوەی عاطیفیانە بیروبڕواو فیكری بەرانبەر هەمووی هەر ڕەفز بكەینو بڵێین هیچی بەكەڵك نایەت، تەماشا بكەن خوا ﷻ بەو هەموو گەورەییەی خۆی، بە جوولەكەكانو نەصرانیی یەكان، وە بە خاوەن

کتێبە لادەرەکان دەفەرموێ: هەقتان پێیە، بەڵام بۆ لەگەڵ ناهەق تێکەڵی دەکەن؟ هەندێ شتی ڕاستتان پێیە، بەڵام لەگەڵ شتی هەڵەو پەڵەو ناڕاست تێکەڵی دەکەن، واتە: خوای پەروەردگار نەیفەرمووە: هیچ شتێکتان ڕاست نیە، بەڵکو دەفەرموێ: هەقتان پێیە، بەڵام گرفتتان ئەوەیە، ئەو هەقە لەگەڵ شتی ناهەقو ناڕاستو هەڵە تێکەڵ دەکەن، کەواتە: ئێمە دەبێ بزانین هەر بەرنامەیەك بێنێ: سۆسیالیزمە، کۆمۆنیزمە، سیکۆلاریزمە، لیبڕالیزمە، ... هتد، هەر فیکرەیەك بێنێ، هەندێك شتی هەقی هەر تێدایە، ئێمە نابێ بڵێین: هیچی بە کەڵك نایێ، ئێستا تەوراتو ئینجیل دوای ئەوەی کە گۆڕدراویشن، هەقیان تێداماوە، بەڵام کێشەیان ئەوەیە ناهەقیان لەگەڵ تێکەڵ کراوە، جا هەموو بەرنامەو فیکرەیەك هەروایە، کەم وایە سەدا سەد هەمووی ڕاست بێ، زۆربەی وایە ڕاستی تێدایەو ناڕاستی تێدایە، تۆ دەبێ (کا)و (دان) لێك جیابکەیەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، پێشتر باسمان کرد، کە ئەوەش پیلانێك بووە بۆ دروست کردنی دڵەڕاوکەو بەلبەلە لە نێو مسوڵمانانداو، هەمیشە جوولەکەو نەصرانیی یەکان عەودالی ئەوە بوون کە مسوڵمانان لە قورئانو ئیسلام دوور بخەنەوە، دەڵێن: جارێك قەشەیەکی ناودار گوتوویەتی: دەبێ خەڵات بکرێم، وە خەڵاتیش کراوە لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە حیساب فیکرەی نەصرانیی بڵاوکردۆتەوە، دوایی گوتوویانە: جا کاکە خۆ تۆ هیچ کەست نەکردوە بە نەصرانیی بۆ خەڵات بکرێی؟! گوتوویەتی: گرنگ ئەوە نیە داخۆ چەند کەسم کردوون بە نەصرانیی، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چەند مسوڵمانم لە ئیسلام دوورخستوونەتەوە، کەواتە: من ئامانجەکەم پێکاوە! ئەوانە بەڕاستیی زۆر ئێش لەسەر ئەوە دەکەن کە مسوڵمانان لە قورئان دوور بخەنەوەو لە ئیسلام دووربکەونەوە، با نەچنە سەر بەرنامە باطیڵەکەی ئەوانیش، بەڵام

گرنگ ئەوەیە لە ئیسلامیان دوور بخەنەوە، ئامانجی ئەوان بەوە دەپێکرێ، هەڵبەتە پێشتر باسمان کرد کە چۆن ئەو پیلانەیان دارشتوە، پێش نیوەڕۆ خۆیان وا پێشانداوە کە مسوڵمانن‌و دوای نیوەڕۆ گوتوویانە: کافر بووینەوەو هەڵگەڕاینەوە، کە بێگومان مەرج نیە لێرەدا مەبەست خودی پێش نیوەڕۆو دوای نیوەڕۆ نیەو، مەبەست خۆ بە مسوڵمان پێشاندان‌و پاشان هەڵگەڕانەوەیەو، مەرج نیە هەردووکیان لە یەك ڕۆژدابن !

**مەسەلەی حەوتەم:** ئایا سوودو حیکمەتی ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانان لەو پیلانانەی جوولەکەکان، یاخود جوولەکەو نەصرانیی یەکان چییە، بۆچی خوای پەنهانزان ئاگاداری کردوونەتەوە؟ ئەو ئاگادار کردنەوەیە سێ حیکمەتی تێدا هەن:

١/ ئەو پیلانە شتێکی نێوخۆو تایبەتییان بووە، وە کەسیش پێی نەزانیوە، کەواتە: ئەوە هەواڵدانە بە پەنهان، دیارە ئەوەش موعجیزەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ‌و لەوانەیە هەندێك لە جوولەکەکان‌و نەصرانیی یەکان هەر بەوە مسوڵمان بووبن، گوتبیان: باشە ئێمە لە بەینی خۆماندا تەگبیرمان کردوەو کەس پێی نەزانیوە، ئێمە لە بەینی خۆماندا نەخشەیەکمان داناوە، کە بەو شێوە مسوڵمانان بخەینە گومانەوە، کێ ئەو نەخشەیەی ئاشکرا کردوە؟! دیارە موحەممەد ڕاست دەکات لەلایەن خواوە وەحی بۆ دێ، هەواڵ‌و پەیامی بۆ دێ، خوا لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە لەو پیلانە ئاگادار بووە.

٢/ ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانان لەو فێڵە کە دەبێتە هۆی ئەوەی مسوڵمانان حەصانە پەیدابکەن، چونکە کەسێك فێڵی لێ بکرێ‌و بە فێڵەکەش نەزانێ، ڕەنگە کڵاوی بچێتەسەر، بەڵام کەسێك بزانێ کە فڵان کەسە دەیەوێ فێڵی لێ بکات‌و، هەر لەڕێوە فێڵەکەی ببینی، دیارە لێناگەڕێ فێڵەکەی سەربگرێ‌و هەڵیدەوەشێنێتەوە.

٣/ ئەوە پەردە لەسەر لادانی جوولەکەو نەصرانیی یەکانیش بووە، بۆ ئەوەی بپرینگێینەوە لەو جۆرە پیلانو فێڵانە، چونکە کە بزانن ئەوە خوای پەروەردگار فێڵو پیلانەکانیان ئاشکرا دەکات، بە تەئکید لێی دەسڵەمنەوە[1].

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ ﴾، هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰ ... ﴿١٢٠﴾ ﴾، واتە: هیدایەت بەس هیدایەتی خوایە، ڕێنمایی بەس لە خواوەیە، ئەوە یانی چی؟ یانی: مادام هیدایەتی ڕاستەقینە هەر هیدایەتی خوابێ، کەواتە: چ بە مووسادا بینێرێ، چ بە عیساو، چ بە موحەممەددا (علیهم الصلاة والسلام)، کەسێك ڕاست بکات عەودالّی هیدایەتەو بەدوای هیدایەتی خوای پەروەردگاردا دەگەڕێو، شەیدای دۆزینەوەی هیدایەتی خوایە، دەبێ لەسەر دەستی هەر کەسێکەوە بێ وەریبگرێ، بەڵام ئەوانە کە دەڵێن: ﴿ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ ﴾، واتە: شوێن کەس مەکەون، مەگەر بەدوای بەرنامەی ئێوە بکەوێ، کەواتە: ئەوانە لە ڕاستییدا دەمارگیرییان هەیەو بەدوای هەقدا ناگەڕێن، چونکە ئەگەر ئینسان بەدوای هەقدا بگەڕێ، وەك گوتراوە: (أُنْظُرْ إلى مَا قِيل، وَلا تَنْظُرْ إلى مَنْ قَال)، واتە: تەماشا بکە چی گوتراوە، تەماشا مەکە کێ گوتوویەتی، ئەسڵ ئەوەیە هەرکەسێك قسەی هەقی کرد ئینسان دەبێ لێی وەربگرێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٧٣﴾ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، ئەم ئایەتەش ئەو ڕاستییەی لێوەردەگیرێ کە: هیچ کەس بۆی نیە تەصەڕروف

---

١) تفسير الكبير، ج: (١)، ص: (٨٨)، فخر الدين الرازي.

لە بەخشینی خوادا بکا، وە خوا بە خواستو ویستی ڕەهاو ئازادی خۆی دەیبەخشێ، بەڵام بێگومان لەسەر بناغەی کاربەجێیی، چونکە خوای زاناو شارەزا کاربەجێیە، وە هیچ شتێکی گۆترە کاریی نیە! جا دیارە ئازادبوونی ویستی خواو ڕەها بوونی ویستی خوای بێ وێنە، لەگەڵ بەپێی حیکمەتو زانیاریی بوونی تێکناگیرێ، خوا شتی بەجێ دەکات، بەڵام خاوەنی ئیرادەو ویستێکی ڕەهاشە، کەواتە: ئەی خاوەن کتێبەکان! ئەی جوولەکەو نەصرانیی یەکان! پێتان وانەبێ، کە بەخششی خوا لەسەر ئێوە تاپۆکراوەو ئێوە قۆرختان کردوە، بەڵکو بەخششی خوا تەنیا بەدەستی خوایە، جارێك مووسا ﷺ دەنێرێو جارێك عیسا ﷺو جارێك موحەممەد ﷺ دەنێرێ، جارێك یەکی دیکەی ناردوە، بەخششی خوا لەسەر هیچ تیرەیەكو طائیفەیەكو کۆمەڵێك کورت هەڵاتوو (حصر)نیە.

__مەسەلەی دەیەم:__ کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، بەکارهێنانی وشەی: (فَضْل)، بۆ بەخششەکانی خوا لەبەر ئەوەیە کە (فَضْل) وەك پێناسەمان کرد: (كُلُّ عَطيَّةٍ لا تَلْزَمُ مَنْ يُعْطِي) بریتیە لە هەر بەخششێكو خەڵاتێكو دیارییەك، کە ئەوەی دەیبەخشێ لەسەری پێویست نیە بیبەخشێ، وە خوای پەروەردگاریش بە دڵنیایی هیچ شتێکی لەسەر پێویست نیە، وەك دەفەرموێ: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأنبياء، واتە: لێی ناپرسرێتەوە لەوەی دەیکاتو ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە، کێ بۆی هەیە بڵێ: من فلان شتم لەسەر خوا فەرزە؟! بەڵێ، خوای باڵادەست لە بەخششی خۆی جاری وایە شت لەسەر خۆی پێویست دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ ...وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ ... ﴿١٥٦﴾ ﴾ الأعراف، واتە: وە بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام بۆ پارێزکاران دەینووسم، یان جاری وایە دەفەرموێ: فلان شتم لەسەر خۆم فەرز کردوە، وەك لە سووڕەتی (الروم)دا هاتوە: ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾،

واتە: وە هەقی بڕوادارانمان لەسەرە کە سەریان بخەین، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا لە ڕووی بەخششو بەزەیی فراوانی خۆیەوە، شت لەسەر خۆی پێویست دەکات، بەڵام هیچ کەس هیچ هەقێکی پێویستی لەسەر خوای بەرزو مەزن نیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆ ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتی (٧٥) تاکو (٨٣) لەم نۆ ئایەتەدا خوای بێ هاوتا بۆمان باسی خاوەن کتێبەکان دەکات، واتە: جوولەکەو نەصرانیی یەکانو ئەوانی دی، وە پۆلێنیان دەکات کە هەموویان یەك جۆرنین، لە ڕووی ئەمانەتو خیانەتەوە، بەڵکو تێیاندا هەیە ئەمینندارەو تێشیاندا هەیە خیانەتکارە، وە پاشان باسی گرنگیی وەفا بە پەیمانو خراپیی بێ پەیمانیی و پەیمان شکاندن دەکات، دوایی باسی گۆڕین (تحريف)ی کتێبی خوای پەروەردگار دەکات، ئنجا باسی ئەوە دەکات کە هیچ کەس بۆی نیە خۆی بکات بە پەرستراو، یان فریشتەکانو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بکات بە پەرستراو لەجیاتی خوا، وە باسی پەیمان وەرگیران لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەکات، کە پشتگیریی یەکدی بکەن، یاخود پشتگیریی هەر پێغەمبەرێك بکەن کە لە لایەنی خوای بەرزو بێ وێنەوە ڕەوانە دەکرێ، وە لە کۆتاییدا باسی ملکەچیی دانیشتوانی ئاسمانەکانو زەوی بۆ خوای بێ هاوتا دەکات، واتە: ئەوانەی کە بە ئیختیاریی خۆیان یاخود بە ناچاریی بۆ خوا ملکەچن.

﴿ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُو۟لَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ

وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ
﴿٧٧﴾ وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ
مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ
وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ
لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ
وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ
بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۦنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ
ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ
عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ
بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ
مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە لە خاوەن کتێبان (واتە: جوولەکەو نەصرانیی یەکانو ئەوانی وەك وان) هی وا هەیە ئەگەر سامانێکی زۆری پێبسپێری دەتداتەوە، وە هی وایان هەیە ئەگەر دینارێکی پێبسپێری، مەگەر بەردەوام بەسەریەوە ئاگاداربی (و چاودێر بی) دەنا ناتداتەوە، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە گوتیان: هیچ ڕێی گلەییمان نایەتەوە سەر، هەرچی بکەین لەگەڵ نەشارەزایان (ی کتێبی خوا) وە لە حاڵێك دا کە دەشزانن، درۆ بە ناوی خواوە دەکەن ﴿٧٥﴾ با (گلەیی یان دێتە سەر بە هۆی خیانەتەوە) هەرکەسێك پەیمانی خۆی بباتە سەر وە پارێز بکات، ئەوە بێگومان خوا پارێزکارانی خۆش دەوێن ﴿٧٦﴾ بێگومان ئەوانەی بە پەیمانی خواو

سوێندەکانیان نرخێکی کەم دەکڕن، ئا ئەوانە لە دوا ڕۆژدا هیچ پشکیان نیە، وە خوا لە ڕۆژی قیامەتێ نایاندوێنێو تەماشایان ناکات، وە پاکیان ناکاتەوە، وە ئازارێکی بە ئێشیان هەیە ﴿٧٧﴾ وە دەستەیەك هەن لە کاتی خوێندنەوەی کتێب دا (واتە: کتێبی خۆیان) زمانیان بادەدەن، تاکو ئەو مەبەستەی هەیانە بە کتێبی تێبگەن، لە حالێك دا کە لە کتێبیش نیە، وە دەڵێن: ئەوە لەلایەن خواوەیە، وە لەلایەن خواوەش نیە، وە بە ناوی خواوە درۆ دەڵێنو دەشزانن (کە درۆیە) ﴿٧٨﴾ هیچ کەس بۆی نیە کە خوا کتێبو حیکمەتو پێغەمبەرایەتی پێبدات، کەچی بە خەڵکی بڵێ: لەجیاتی خوا ببنە بەندەی من! بەڵکو (دەبێ بڵێ:) ببنە کەسانی ڕەببانیی، لە سۆنگەی ئەوەوە کە کتێب فێری خەڵکی دەکەن، وە لەبەر ئەوەی دەتانخوێند ﴿٧٩﴾ وە فەرمانتان پێ ناکات کە فریشتانو پێغەمبەران بکەنە پەروەردگارگەل، ئایا پاش ئەوەی مسوڵمان بوون فەرمانتان پێ دەکات بە کوفر؟! ﴿٨٠﴾ وە یادبکەوە کاتێك خوا پەیمانی پتەوی لە پێغەمبەران وەرگرت (فەرمووی:) چونکە کتێبو حیکمەتم پێداون، دوایی ئەگەر پێغەمبەرێکتان هاتەلا، کە بە ڕاستدانەری ئەوە بوو کە پێتانە (لە بەرنامە)، ئەوە دەبێ بێگومان بڕوای پێبێننو پشتی بگرن، (خوا) فەرمووی: ئایا دانتان پێداهێناو پەیمانی منتان لەسەر ئەوە وەرگرت؟ گوتیان: دانمان پێداهێنا، فەرمووی: دەجا شایەدبن، وە منیش لەگەڵتان دا لە شایەدانم ﴿٨١﴾ هەرکەسێکیش دوای ئەوە لابدات، ئەوە هەر ئەوانەن لە ڕێ دەرچووان ﴿٨٢﴾ ئایا جگە لە بەرنامەی خوا دەخوازن (واتە: بەرنامەیەکی دیکە دەخوازن) لە حالێك دا کە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان چاروناچار بۆی ملکەچن، وە هەر بۆ لای ویش دەگێڕڕێنەوە !! ﴿٨٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(تَأْمَنْهُ): واتە: لێی دڵنیای، یاخود بە ئەمینی دەزانی، (أَصْلُ الآمْنِ: طُمْانِينَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الْخَوْفِ، يُقَالُ: أَمِنَ فُلاناً عَلَى كَذَا، وَثِقَ بِهِ وَطْمَئِنَ بِهِ أَوْ جَعَلَهُ أَمِيناً عَلَيْهِ) لە ڕیشەدا (أَمْن)، واتە: نەفس ئارام بگرێ وە ترسی نەبێ، یانی: هێمنییو ئاسایش، وە دەگوترێ: (أَمِنَ فُلاناً) واتە: متمانەی پێکردو لێی دڵنیا بوو، یاخود بە ئەمینداری دانا.

(خَلَٰقَ): واتە: (نَصِيب): بەش، (الخَلاَقُ: مَا اكْتَسَبَهُ الإِنسَانُ مِنَ الفَضِيلَةِ بِخُلُقِهِ) واتە: (خَلاَق) ئەو خەسڵەتە جوانەیە کە مرۆڤ بە ڕەفتاری خۆی وەدەستی دێنێ.

(يَلْوُنَ): واتە: زمانی خۆیانی لەگەڵ لار دەکەن، یاخود زمانیان بادەدەن، (اللّيُّ فَتْلُ الْحَبْلِ) واتە: (لَيٍّ)، بەمانای گرێدانی پەتێکە، یاخود پێچاو پێچکردنیەتی (ولَوى رَأْسَهُ) واتە: سەری بادا، سووڕاند، (وَلَوى لِسَانَهُ بِكَذَا) یانی: ئەگەر بگوترێ زمانی بەو شتە بادا، ئەوە مەبەستی پێی درۆ کردنە.

(رَبَّٰنِيِّۦنَ): کۆی (رَبَّاني)یە، (والرَّبَّانِيُّ: قيلَ: مَنْسوبٌ إِلَى الرَّبِّ، الَّذِي هُوَ الْمَصْدَرُ، وَهُوَ الَّذِي يَرُبُّ العِلْمَ كَالْحَكِيم، وَقِيلَ: مَنْسوبٌ إلى الرَّبِّ أَي اللهِ تَعَالى، فَالرَّبَّانيُّ إِلَهيٌّ، وَقِيلَ: لَفْظٌ في الأصْل سُرياني وَقيلَ: مَنْسوبٌ إلَى الرَّبانيّ الَّذِي يَرُبُّ النَّاسَ وَيُصْلِحهمْ) وشەی: (ربَّانِي) هەندێك دەڵێن: پاڵدراوەتە لای (رَبّ) کە چاوگە، واتە: ئەو کەسەی کە زانیاریی پەیدا دەکات، زانیاری زیاد دەکات، وەك (حكيم)، هەندێکیش گوتوویانە: وشەی: (ربَّانِي) پاڵدراوەتە لای (رَبّ) واتە: خوای بەرز، کەواتە: (ربَّانِي) وەك (إلهيٍّ) وایە، یانی خوایی، هەندێکیش گوتوویانە: وشەی: (ربَّانِي) بێژە (لَفْظ)یەکی سوورەییانی یە، واتە: عەرەبی نیە، هەندێکیش گوتوویانە: وشەی: (ربَّانِي)

پاڵدراوەتە لای (رَبَّـان) واتــە: ئـەو کەســەی خەڵــك پــەروەردە دەکــاتو مشووریان دەخوا، دواییش زیاتر باسی وشەی (ربَّانِي) دەکەین.

(**تَدْرُسُونَ**): (تَقْـرَؤُنَ) یـانی: دەخـوێنن، وە دەگـوترێ: (دَرَسْتُ العِلْمَ تَنَاوَلْتُ أَثَرَهُ بالْحِفْظِ)، واتە: زانیارییەکەم دەرس کرد، واتە: لەبەرم کرد.

(**ءَأَقْرَرْتُمْ**): واتـە: دانتـان پـێداهێنـا، (وَالإِقـرَارُ: إِثْبَـاتُ الـشَّيءِ) وشـەی (إِقـرَار) واتـە: چەسپاندنی شتێك، وەك خـوای پەروەردگـار فەموویـەتی: ﴿ ... وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ ... ﴿٥﴾ ﴾ الحج، واتـە: لـە منداڵدانانـدا جێگیـر دەکەین ئەوەی کە بمانـەوێ، ئنجا دەڵێ: (وَالإِقـرَارُ: قَدْ يَكُونُ ذَلِكَ إِثبَاتَـاً إِمَّا بالْقَلْبِ وَإِمَّا بِاللِّسَانِ وَإِمَّا بِهِمَـا)، واتـە: (إِقـرَار) دانپـێداهێنـان، جاری وایـە بـە زمان دەبـێ، جاری وایـە بـە دڵ دەبـێ، وە جاری وایـە بـە هـەردووکیان دەبـێ، کـە (إِقـرَار) لە (قَـرّ)ەوە هـاتوە، (قَرَّ فـي مَكَانِـهِ يَقَـرُّ قَرَاراً، إِذَا ثَبَـتَ ثُبُوتَـاً جَامِـداً) واتە: لە شوێنی خۆی چەسپاو نەجووڵا.

(**إِصْرِي**): واتــە: (عَهْـدِي) یــانی: پەیمــانم، (وَالإِصْـرُ العَهْـدُ الْمُؤَكَّـد) واتــە: پەیمانێکی جەخت لەسەرکراو، ئـەویش لـەوەوە هاتوە: (وَالإِصْرُ: عَقْدُ الشَّيءِ وَحَبْسُهُ بِقَهْرِهِ) وشــەی: (إِصْر) بریتیــە لــەوەی شــتێك گــرێ بـدەی، یــاخود شـتێك بهێڵیەوەو نەهێڵی بجووڵێ.

(**يَبْغُونَ**): واتــە: (يَطْلُبُـونَ) یــانی: دەخــوازن، دەگــوترێ: (بَغيْـتُ الـشَّيءَ: إِذَا طَلَبْتَ أَكْثَرَ مـا يَجِبُ) واتـە: کەسـێك شـتێك داوا بکـات زیـاد لـە پـێویـست، دەگوترێ: (بغـاهُ).

(**طَوْعًا**): (الطَّوْعُ: الإِنقيَـادُ ويُضَـادُّهُ الكُـرْهُ)، (طَوْعُ) بریتیـە لـە ملکەچ بـوون، وە پـێچەوانەکەشی بریتـیـە لـە (كُرْهُ) واتـە: پـێناخۆش بـوون، وەك خـوای زانـا دەفـەرموێ: ﴿ ... ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا ... ﴿١١﴾ ﴾ فـصلت، واتـە: (بـە ئاسـمانەکانو زەوی فەرموو:) دروست بن، پـێتان خۆش بـێ، یان پـێتـان ناخـۆش بێ.

(**وَكَرْهًا**): (كَره: قِيلَ الكَرْهُ وَالكُرْهُ وَاحِدٌ نَحوُ: الضَّعْفُ وَالضُّعْفُ)، دەگوترێ، وشەی: (كَرْه، كُرْه) كە بەمانای پێناخۆشبوون دێن، هەردووكیان یەكن، وەك وشەی: (ضَعْفُ، ضُعْف) كە بەمانای بێهێزیی دێن، (وَقِيلَ الكَرْهُ: الْمَشَقَّةُ الَّتِي تَنَالُ الإِنسانَ مِنْ خَارِجٍ فِيمَا يُحْمَلُ عَلَيْهِ بِإِكْراهٍ، وَالكُرْهُ: مَا يَنَالُهُ مِنْ ذَاتِهِ وَهُوَ يَعافُهُ) واتە: هەندێكیش گوتوویانە: وشەی (كَرْه) بریتیە لەو نارەحەتییەی كە تووشی ئینسان دێ، بە هۆی ئەوەوە كە شتێكی لە دەرەوەی خۆی بە زۆر لەسەر پێویست دەكرێ، وە (كُرْه)یش ئەوەیە كە ئینسان لە خودی خۆیدا شتێكی پێناخۆشبێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾.

أ- ((عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: {مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ هُوَ فِيهَا فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ}، فَقَالَ: الأَشْعَثُ بن قَيْس فِيَّ وَاللَّهِ كَانَ ذَلِكَ، كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنْ الْيَهُودِ أَرْضٌ، فَجَحَدَنِي، فَقَدَّمْتُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لِي رَسولُ اللَّهِ ﷺ: {أَلَكَ بَيِّنَةٌ}؟، قُلْتُ: لا، فَقَالَ: لِلْيَهُودِيِّ {احْلِفْ}، فَقُلْتُ: يَا رَسولَ اللَّهِ! إِذَنْ يَحْلِفُ فَيَذْهَبُ بِمَالِي، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾، إِلَى آخِرِ الآيَةِ))، رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٣٥٩٧)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٣٥٦)، وَمُسْلِم بِرقم: (٣٥٣)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٢٤٣)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٢٦٩)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢٣٢٢)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا

ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك سوێندێك بە درۆ بخواتو تێیدا گوناهباربێ، بۆ ئەوەی ماڵی ئینسانێکی مسوڵمان پێ ببچڕێ، کاتێك دەگاتە خوای زاڵی پایەدار، خوا لێی تووڕەیە، ئەشعەثی کوڕی قەیس گوتی: وەڵلاهی ئەم ئایەتە لەبارەی منەوە هاتە خوار، لە نێوانی منو کابرایەکی جوولەکەدا زەوییەك هەبوو، کابرای جوولەکە نکووڵیی کرد (کە ئەو زەوییە هی من بێ)، منیش بردم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، شکاتم لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: بەڵگەت هەیە، (شایەدت هەیە)؟ گوتم: نەخێر، بە جوولەکەکەی فەرموو: سوێند بخۆ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! کەواتە: سوێند دەخواو ماڵەکەم دەڕوا، (من ڕاست دەکەم ماڵەکە هی منە) دەڵێ: خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە.

ب- هەروەها لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەش گێڕراوەتەوە: ((عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَقَامَ سِلْعَةً وَهُوَ فِي السوقِ فَحَلَفَ بِاللَّهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا مَا لَمْ يُعْطَ، لِيُوقِعَ فِيهَا رَجُلاً مِنْ الْمُسْلِمِينَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴾)) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٥٥١)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئەوفا - خوا لێ ڕازی بێ-، دەڵێ: پیاوێك کەلوپەلێکی هەبوو لە بازاڕ ڕاینوواند بوو، سوێندی بە خوا خوارد گوتی: ئەوەندەم پێی دراوەتێ (نرخێکی زۆری گوت) کە پێی نەدرابوو، (بۆیە ئەو نرخەی گوت) تاکو پیاوێك لە مسوڵمانان بخاتە تەڵەوە (وەك بڵێین: گوتوویەتی: ئەوەندەیان پێی داومێ، تاکو یەکێکیش بڵێ: دەی باشە بەوەندە لێت دەکڕم، سەرەنجام ئەو کەلوپەلەی خۆی بە نرخێك کە زۆر لە قیمەتی خۆی زیاترە، ساغی بکاتەوە)، بەو بۆنەوە ئەم ئایەتە هاتە خوار.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتەی، کە تێیاندا دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَـٰكِن كُونُوا۟ رَبَّـٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾. دوو گێڕانەوە لەوبارەوە هەن:

أ- ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: قَالَ أَبُو رَافِعٍ القُرَظِي، حِيْنَ اجْتَمَعَتِ الأَحْبارُ مِنَ اليَهُودِ وَالنَّصَارَى مِنْ أَهْلِ نَجْرَان، عِنْدَ رَسولِ اللهِ ﷺ وَدَعَاهُمْ إِلى الإِسْلاَم: أَتُرِيدُ يَا مُحَمَّدُ أَنْ نَعْبُدَكَ كَمَا تَعْبُدُ النَّصَارَى عِيْسَى ابْنُ مَرْيَمْ؟ فَقَالَ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ نَجْرَانَ نَصرانِيٌّ، يُقَالُ لَهُ الرَئِيسْ: أَوَ ذَاكَ تُرِيدُ مِنَّا يَا مُحَمَّد، وَإِلَيهِ تَدْعُونَنَا؟ أَوْ كَمَا قَالَ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: {مَعَاذَ اللهِ أنْ نَعْبُدَ غَيْرَ اللهِ، أَوْ أَنْ نَأْمُرَ بِعِبَادَةِ غَيْره، مَا بِذَلِكَ بَعَثَنِي، وَلا بِذَلِكَ أَمَرَنِي}، أَوْ كَمَا قَالَ، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ فِي ذَلِكَ مِن قَوْلِهِمَا: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ .. ﴾، إلى قوله: ﴿ .. بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾)) رَوَاهُ الطَّبَرِي فِي (تفسيرهِ) برقم: (٧١٨٥)، وَابْنُ إِسحاق، وَابْنُ المُنذِر، وَابْنُ أَبي حَاتِم، والبَيْهَقيُّ، وَالشوكَاني[١]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: (أَبُو رَافِعِ القُرَظِي) گوتی: دوای ئەوەی زانایانی جوولەکە، وە نەصرانیی یەکان لە ئەهلی نەجران کۆبوونەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە بانگی کردن بۆ ئیسلامەتیی، (أَبُو رَافِعِ القُرَظِي) گوتی: ئەی موحەممەد! ئایا دەتەوێ ئێمەش بتپەرستین، وەك چۆن نەصرانیی یەکان عیسای کوڕی مەریەم دەپەرستن؟ پیاوێکیش لە ئەهلی نەجران کە نەصرانیی بوو، پێیان دەگوت: ڕەئیس، (واتە: سەرۆك،

---

١) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٥٤٨).

یاخود هەر ناوەکەی ڕەئیس بووە) گوتی: ئەوەت لە ئێمە دەوێ ئەی موحەممەد، وە بۆ ئەوە بانگمان دەکەی (کە بتپەرستین)؟ یاخود قسەیەکی لەم جۆرەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەنا بە خوا کە جگە لە خوا شتێکی دیکە بپەرستین، یاخود پەنا بە خوا کە فەرمان بکەین بە پەرستنی غەیری خوا، خوا منی بۆ ئەوە نەناردووە فەرمانیشی بەوە پێنەکردووم، یاخود شتێکی بەو شێوەی فەرموو، ئیدی بەو بۆنەوە خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ... ﴾، تا دەفەرموێ: ﴿ ... بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾.

ب- هەر لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەش هاتوە: ((عَنِ الحَسَنِ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسولَ اللهِ ﷺ! نُسَلِّمُ عَلَيْكَ كَمَا يُسَلِّمُ بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ، أَفَلاَ نَسْجُدُ لَكَ؟ فَقَالَ: {لا، يَنْبَغِي أَنْ يُسْجَدَ أَحَدٌ لاحَدٍ مِنْ دُونِ اللهِ، وَلَكِنْ أَكْرِمُوا نَبِيَّكُمْ، وَاعْرِفُوا الْحَقّ لأهْلِهِ}، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ .. ﴾))[1]، واتە: حەسەنی بەسرایی دەڵێ: پێمگەیشتوە کە پیاوێك (دیارە پیاوێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ،) گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئێمە سڵاو لە تۆ دەکەین وەك چۆن هەندێکمان سڵاو لە هەندێکمان دەکەین، (واتە: ئەوەی پێ کەم بووە) ئایا کڕنووشت بۆ نەبەین؟ فەرمووی: نەخێر، دروست نیە یەکێك کڕنووش بۆ یەکێکی دیکە ببات، بێجگە لە خوا، بەڵام ڕێزی پێغەمبەری خۆتان بگرن، وە هەقی خاوەن هەقان بزانن، ئیدی بەو بۆنەیەوە، خوا ئەمەی نارده خوار.

١) فتح القدير للشوكاني برقم: (٥٤٨)، ج(١)، ص(٤٥٨) عَن عَبد بْنُ حُمَيد.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار هەر لە درێژەی ئەو ئایەتانەدا کە باسی خاوەن کتێبەکان دەکەن، واتە: جوولەکەو نەصرانیی یەکان، چونکە سەرجەم ئەو ئایەتانە تا کۆتایی ئەم دەرسەش لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، واتە: تاکو ئایەتی ژمارە: (٨٣) کە پێشتریش باسمان کردوە، بەو بۆنەوە هاتوونە خوار، کە وەفدێکی نەصرانیی یەکان لە نەجرانەوە هاتوون وتووێژیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا کردوە، چەند ڕۆژێك لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ ماونەوە، جا خوا ﷻ لە درێژەی ئەو ئایەتانەدا باسی پۆلێنکردنی خاوەن کتێبەکان دەکات، واتە: چ جوولەکەکان، چ نەصرانیی یەکان، چ ئەوانەی دیکەی کە خۆیان بە خاوەن کتێبی ئاسمانیی دەزانن، هەموویان وەك یەك نین، دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ﴾، لە خاوەن کتێبەکان هەیە، ئەگەر (قِنطار)ێك (قِنطار: واتە: سەروەت و سامانێکی زۆر، جا هەندێك گوتوویانە: هەزار دینارە، هەندێك گوتوویانە: پڕی پێستی گایەکە لە زێڕو زیو، هەندێك گوتوویانە: پڕی پێستی مەڕ یان بزنە، بە هەر حاڵ ئەندازەیەکی زۆری ماڵ)ی پێبسپێری بە ئەمانەت، دوایی بۆت دێنێتەوەو ئەمانەتەکەت دەپارێزێ، واتە: بە ماڵی زۆریش خیانەت ناکەن، چونکە ئینسان ئەگەر خیانەت بکات لە ماڵی زۆردا دەیکا، ﴿وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ﴾، بەڵام هەشیانە هەر لە خاوەن کتێبەکان، کە ئەگەر بیکەیە ئەمیندارو دینارێکی پێبسپێری، ناتداتەوە، جا ئەوە توێژەرەوانی قورئان باس دەکەن و دەڵێن: کابرایەك هەبوو لە جوولەکەکان مسوڵمانێك پارەیەکی زۆری بە ئەمانەت لەلا دانا، دوایی بۆی هێنایەوە، یەکێکی دیکەشیان هەبوو (ناوی ویش دێنن) کە یەکێك لە هاوەڵان دینارێکی بە ئەمانەت وێداوە، دوایی کابرا گوتوویەتی: وێت نەداوم، واتە: هەیانە لە گچکەترین شتدا خیانەت دەکات، وە هەیانە لە گەورەترین شتیشدا خیانەت ناکات و ئەمانەت پارێزە، جا ئەوجار دەفەرموێ: وە هەیانە کە خیانەت

لە دینارێكیش دەكاتو نایداتەوە ﴿إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ﴾، مەگەر هەمیشە رژدبی لەسەری‌و زۆر بەسەریەوە چاودێربی، ئەگەرنا ناتداتەوە، هەر دەرفەتی هەبێ ناتداتەوە، ئنجا بیانووو پاساویان بۆ ئەوە چییە؟ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ ﴾، ئەوەی كە پاڵیان پێوەدەنێ خیانەت بكەن، ئەوانەیان كە خیانەت دەكەن، بریتیە لەو بیروبڕواو بۆچوونە هەڵەیەی كە هەیانە، دەڵێن: ئێمە بەرانبەر بە نەشارەزایەكانی كتێبی خوا، هیچ ڕێی گلەییمان نایەتەوە سەر هەرچی بكەین، ﴿ٱلْأُمِّيِّـۧنَ﴾، واتە: نەشارەزا لە كتێبی خوا، كە لە ڕاستیدا جوولەكەكان غەیری خۆیان هەموو بە (أُمّي) ناودەبەن، واتە: لە زاراوەی خۆیاندا (جوویم)، واتە: ئەوانەی كە غەیری جوولەكەن، غەیرە جوولەكە هەموویان بە (أُمّي)و نەشارەزا ناودەبەن، ئەوە بەنسبەت جوولەكەكانەوە، دیارە هەندێك نەصرانیی یەكانیش[1] دەڵێن: ئەوەی غەیرە نەصرانیی بێ سەرو ماڵی حەڵاڵە، چۆنت زەفەر پێبرد قەیدێ ناكات، ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، دیارە ئەوەش بە عینوانی دین وا دەڵێن، بۆیە خوا دەفەرموێ: بەڵام بە ناوی خواوە درۆ دەكەن لە حاڵێك دا كە دەشزانن درۆیە، دینی خوا، هیچ شەریعەتێكی خوا، ماڵی هیچ كەسێكی بۆ هیچ كەس حەڵاڵ نەكردوە بە ناهەق، ئنجا خوای كاربەجێ لە بەرپەرچدانەوەی ئەو جۆرە ڕەفتارو پاساو هێنانەوەیاندا دەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، با، هەر كەسێك وەفا بە پەیمانی خۆی بكاتو پارێز بكات، بێگومان خوا پارێزكارانی خۆش دەوێن، واتە: وانیە كە خیانەتو ئەمانەت وەك یەكبن، دەستپاكیی‌و دزیی وەك یەك بن، بەڵكو هەر كەسێك پەیمانی خۆی بەرێتە سەرو پارێز بكات، ئەوە خوا خۆشی دەوێ، چونكە پارێزكارە، وە لە ڕاستیدا پارێزكار كەسێكە وەك چۆن لە مامەڵەی لەگەڵ خوادا سنوورەكانی

١) ئەوانیش هەموویان وانین‌و پەرگیرو تێپەڕێنەرەكانیان وان.

خوا نابەزێنێ، فەرمانەکانی خوا ناچووێنێ، بە هەمان شێوە لە مامەڵەشی لەگەڵ خەڵکیدا، لە شیرازەی شەرع ناچێتە دەر، وە سەروماڵیان لە دەستی سەلامەت دەبێ، پاشان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی بە پەیمانی خواو بە سوێندەکانیان نرخێکی کەم دەکڕن، (واتە: پەیمانێك کە لەگەڵ خوا دەیبەستن، دەیشکێنن، وە سوێندێکی خۆیان کە دەیخۆن، دوایی دەیشکێنن، لە بەرانبەر بەهایەکی کەمداو لەبەر دەستکەوتو نرخێکی کەم)، ئا ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا هیچ پشك‌و بەشێکیان نیە، (چاویان بە بەهەشت ناکەوێ)، وە خوا نایاندوێنێ، وە تەماشایان ناکات، (واتە: بە چاوی بەزەیی‌و لوطف تەماشایان ناکات) لە ڕۆژی قیامەتدا، وە پاك‌و چاکیان ناکات، وە ئازارێکی بەئێشیان هەیە، ئنجا دیارە خاوەن کتێبەکان هەیانبووە خیانەتی ماڵیی هەبووە، بەڵام وە نەبێ تەنیا خیانەتی ماڵییان بووبێ، بەڵکو خیانەتی مەعنەوییشیان هەر هەبووە، کە دوای باسکردنی خیانەتی مادییان ئنجا باسی خیانەتی مەعنەوییان دەکات، کە چۆن ناپاکییان کردوە لەگەڵ پەیام‌و کتێبەکانی خواش دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنۡهُمۡ لَفَرِيقٗا يَلۡوُۥنَ أَلۡسِنَتَهُم بِٱلۡكِتَٰبِ ﴾، وە دەستەیەك لە خاوەن کتێبەکان هەن، کە لەکاتی خوێندنەوەی کتێبی خۆیاندا زمانیان لار دەکەن، مەبەست لە زمان لار کردن، یاخود زمان بادان، بریتیە لە گۆڕینی کتێبەکە، جا چ گۆڕینی ڕواڵەتیی بێژە (لفظ)ەکانی کتێبەکە، چ ماناو واتاکەی، دەفەرموێ: هەیانە کتێبی خوا بە جۆرێك دەخوێنێتەوە کە واتاکەی بگۆڕدرێ، ﴿ لِتَحۡسَبُوهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، تاکو ئەو مەبەستە ناهەقەی کە ئەو دەیەوێ ئایەتەکە بیگەیەنێ، وا بزانن ئەو کتێبە ئەو مەبەستە بەدەستەوە دەدا، ﴿ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەو مەبەستە لە کتێبی خوادا نیەو کتێبی خوا ئەو مەبەستە

ناگەیەنێ ﴿ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، وە بۆ پاساودانەوەی شتەکانی خۆیان دەڵێن: ئەوە لە لایەن خواوەیە ﴿ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، لە حاڵێکدا کە لە لایەن خواوە نیە، وە درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، دەشزانن (کە وانیە)، هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ باسی خاوەن کتێبەکان دەکات بە تایبەتی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، بەڵام زمانی خۆ بادان‌و گۆڕینی ئایەتەکانی کتێبی خوا، دیارە شتێك نیە لەسەر جوولەکەو نەصرانیی یەکان تاپۆ کرابێ، مسوڵمانانیش ئەگەر وابکەن بەهەمان شێوە، ئەوانیش هەر دەگرێتەوە، وە لە ڕاستیدا وەك دوایش باسی دەکەین لەنێو کەسانێکدا کە لەسەر ئیسلام حیسابن، وە لە بەرگو پۆشاکی زانایان دان، لەنێو وانیش کەسانی تێکدەرو لادەر (محرِّف‌و مُنحرف) هەن، کە ئایەتەکانی خوا دەگۆڕن، پاشان دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ بەشەرێك بۆی نیە خوا کتێب‌و حیکمەت‌و پێغەمبەرایەتی پێبدا، دوایی بە خەڵکی بڵێ: ببنە بەندەی من لە جیاتی خوا، من بپەرستن لە جیاتی خوا ! هەرگیز هیچ کەسێك ئەو هەقەی نیە، ﴿ وَلَـٰكِن كُونُوا۟ رَبَّـٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴾ بەڵکو دەبێ بڵێ: ببنە کەسانی ڕەببانیی بە هۆی ئەوەوە کە کتێب فێر (ی خەڵك) دەکەن، وە بە هۆی ئەوەوە کە کتێب دەخوێنن‌و شارەزاییتان هەیە، واتە: هیچ کام لە پێغەمبەران خەڵکیان بانگ نەکردوە بۆ ئەوەی کە بەندایەتی ئەوان بکرێ لە جیاتی خوا، بەڵکو هەمیشە خەڵکیان بانگ کردوە بۆ بەندایەتییکردن بۆ خوا، وە فەرمانیان بە خەڵك کردوە کە ببن بە کەسانی ڕەببانیی، واتە: سەر بە پەروەردگار بن، هەموو شتێکیان لە پێناوی خوادابێ، وە تەنیا پەروەردگاری خۆیان بپەرستن، بەپێی بەرنامەی پەروەردگاری خۆیان بەڕێوەبچن ﴿ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا ﴾، وەك فەرمانتان پێناکات ئەوان بپەرستن، هەروەها فەرمانیشتان پێناکات کە فریشتەکانی،

یاخود پێغەمبەرانی دیکە بگرن بە پەروەردگارو بیانپەرستن ﴿أَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡكُفۡرِ بَعۡدَ إِذۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾، ئایا دەگونجێ فەرمانتان پێبکات بە کوفرو دوای ئەوەی کە مسوڵمانبوون؟! واتە: شتێکی دوورو بێ جێیە، دیارە ئەوە لە بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتەیە کە هەندێك لە زانایانی جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئەی موحەممەد! تۆ دەتەوێ بەندایەتیی بۆ تۆ بکەینو تۆ بپەرستین؟! کە دیارە پێغەمبەر ﷺ بەرپەرچی دانەوە، خوای پەروەردگاریش ئەوەتا بەرپەرچیان دەداتەوە کە لە ڕاستیدا هیچ کەسێك بۆی نەبووەو بۆی نیە، کە خەڵك بۆ بەندایەتییکردن، بۆخۆی بانگ بکات، ئنجا خوای زاناو شارەزا بۆمان باسی ڕاستییەکی دیکە دەکات، کە لە مێژووی هەموو پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) ئەو ڕاستییەی درەوشاندۆتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ﴾، وە یادبکەوە کاتێك خوا پەیمانی پتەوی لە پێغەمبەران وەرگرت (پێی فەرموون): بەهۆی ئەوەوە کە من کتێبم پێداون، (واتە: بەرنامە)، وە حیکمەتم پێداون (واتە: دانایی‌و کارامەیی)، وە پاشان هەر پێغەمبەرێك هات ئەوەی کە بە ئێوەیە بەڕاستی دەزانی، [ کە دیارە پێغەمبەران ( علیهم الصلاة والسلام ) هەموویان پێغەمبەرانی دیکەیان بەڕاست زانیوەو پێغەمبەران وەك چەند ئەڵقەی زنجیرەیەك وابوون هەموویان یەکدیان بەڕاست زانیوە]، ﴿لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ﴾، دەبێ بە تەئکید بڕوای پێ بێنن، وە دەبێ سەریشی بخەن، ﴿قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِي﴾، فەرمووی: ئایا دانتان پێداهێنا، وە پەیمانی منتان لەسەر ئەوە وەرگرت؟ ﴿قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَا﴾، ﴿پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)﴾ گوتیان: دانمان پێداهێنا ﴿قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾، فەرمووی: دە شایەدبن، وە منیش لەگەڵ ئێوەدا شایەدیی دەدەم

(کە ئەو پەیمانم لە ئێوە وەرگرتوە)، جا دیارە توێژەرەوانی قورئان لێرەدا دەڵێن: مەبەست لەمە ئەوەیە خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە لە ئادەمەوە هەتا عیسا (علیهم الصلاة والسلام)، مەگەر پەیمانی لێ وەرگرتوە، کە دەبێ بڕوا بە پێغەمبەری دوای خۆی بێنێنێت، چۆنی بڕوا پێبێنێ؟ خۆ ئەو پێغەمبەرە کە دوایی دێ، دیارە ئەوەی پێشێیان وەفات دەکات؟ واتە: فەرمان بە شوێنکەوتووانی خۆی بکاو ئامۆژگارییان بکاو پەروەردەیان بکات، کە لە دوای من پێغەمبەرێك دێ، بڕوای پێبێنن، وە بۆ زانیارییتان ئەو زانایانەی جوولەکەو نەصرانیی کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا ئیمانیان پێهێناوە، هەموویان لە تەوراتو ئینجیلو کتێبەکانی خۆیاندا گوتوویانە: ئێمە دەماو دەمیش پێمانگەیشتوە، وە لە کتێبەکانیشماندا هەیە کە پێغەمبەری کۆتایی دێو دەبێ بڕوای پێبێنن، ئنجا دیارە بە نسبەت جوولەکەکانەوە مووساو، بە نسبەت نەصرانیی یەکانەوە عیسا، واتە: ئەو پەیمانە لە هەموو پێغەمبەران وەرگیراوە، جا لێرەدا خوای پەروەردگار ئەم حەقیقەتە ڕوون دەکاتەوە، کە: ئەی خاوەن کتێبەکان! ئێوە پێغەمبەرەکانتان پەیمانیان لێتان وەرگرتوە کە دەبێ ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی بێنن، کەواتە: ئێستا کە ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی ناهێنن، مانای وایە لە پێغەمبەرانی خۆشتان هەڵدەگەڕێنەوەو وەصیەتی ئەوانیش دەشکێنن، وە پەیمانی خواش ﷻ کە لە پێغەمبەرانو شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیشی وەرگرتوە، ئەو پەیمانەش دەشکێنن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾، جا هەر کەسێك دوای ئەوە پشتی هەڵکردو ڕووی وەرچەرخاند، ئا ئەوانە لە ڕێ دەرچووانن، یانی: ئەوانە لە حوکمی عەقڵو فیطرەتو شەریعەتو هتد، دەرچوون، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ﴾، ئایا ئەو جوولەکەو نەصرانیی یانەو ئەو خاوەن کتێبانە، بەرنامە (دین)ی غەیری خوا دەخوازن؟! واتە: ئەگەر بەرنامەی خوایان دەوێ، ئەوە ئەوەی بۆ موحەممەد ﷺ هاتوە کۆتا بەرنامەی خوایە، کەواتە: ئەگەر ڕاست دەکەن، ئەوەتا کۆتا کتێب کە قورئانەو کۆتا پێغەمبەر

کە موحەممەدە ﷺ، بەڵام ئەگەر ئیمانیان پێ نەهێنن، مانای وایە بەرنامەی غەیری خوا دەخوازن، ﴿وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا﴾، لە حاڵێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، (هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەن بە فریشتەو جندو مرۆڤ و ... هتد)، هەموویان ملکەچن بۆ خوا چارو ناچار ﴿طَوۡعٗا﴾، واتە: بە خۆشحاڵییەوە، ﴿وَكَرۡهٗا﴾، واتە: بە ناخۆشحاڵیی، یاخود ئەوانەی کە بە هەڵبژاردنی خۆیان، یاخود بە ناچاریی بۆ خوا ملکەچن ﴿وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ﴾، بۆ لای خواش دەگێڕرێنەوە، جا توێژەرەوان دەڵێن: ئەوەی کە بە خۆشحاڵیی‌و ئیختیاریی خۆی بۆ خوا ملکەچە، بریتیە لە فریشتەکانو ئیماندارانی جندو ئینسان، ئەدی ئەوەی بە ناخۆشحاڵیی‌و بە ناچاریی ملکەچە؟ دەڵێن: کافرەکانن، چونکە ئەوانیش لە ڕووی دەروونییەوە نا، بەڵام لە ڕووی ڕواڵەتییەوە، ئەوانیش هەر ملکەچن بۆ یاساکانی خوا، ئایا کافرەکانیش دەتوانن نەخەون، نەخۆنو نەخۆنەوە، لە ژێر سێبەری ئاسمان بچنە دەرێ؟ بە دڵنیایی ناتوانن، کەواتە: ئەوانیش بۆ ئەم یاسایانەی خوای زاڵو توانا هەر ملکەچن، وە تەنیا ئەوەی کە پێیان دەکرێ سەرپێچیی تێدا بکەن، بریتیە لەو بوارە تەسکە مەعنەوییەو دەروونییەی کە ئینسانی پێ تاقی دەکرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە لە ئیمان بە خوا بهێنن یان نەهێنن، ئەگەرنا لە بوارو لایەنەکانی دیکەی ژیانو گوزەرانیان دا وەك سەرجەم دروستکراوەکان ملکەچو مەحکوومی یاسا گەردوونیی‌و سروشتییەکانی خوای زاڵو کاربەجێن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

<u>**مەسەلەی یەکەم**</u>: کە خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ

قَآئِمًا ﴾، ئەو ڕاستییەمان دەست دەکەوێت، کە ئیسلام ئایینی ئینصافو دادگەریی‌و واقیع بینییەو، ئایینێکی دەمارگیر نییە، ئەوەتا کە باسی خاوەن کتێبەکان دەکات، هەموویان وەك یەك تەماشا ناکاتو بەڵکو پۆلێنیان دەکاتو دەفەرموێ: هەیانە ئەمینە، هەیانە خائینە، کەواتە: مسوڵمانینە! دینەکەتان دینی ئینصافو عەدلە، ئێوەش دەبێ وابن، ئنجا تەنیا لێرەدا نا، بەڵکو خوای دادگەر لە شوێنی دیکەشدا باسی ئەوە دەکات کە خاوەن کتێبەکان هەموویان وەك یەك نین، وەك هەر لە سوورەتی (آل عمران)دا لە ئایەتەکانی (١١٣و ١١٤و ١١٥)دا باسی کۆمەڵێك لە خاوەن کتێبەکان دەکاتو بە نۆ سیفەت مەدحیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ لَيْسُواْ سَوَآءً مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُوْلَـٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾، لێرەدا نۆ سیفەتیان لێ هەڵدەدا، کە بریتین لە:

١- ﴿ قَآئِمَةٌ ﴾، شەو هەڵدەستنەوەو بێدار دەبن‌و شەونوێژ دەکەن.

٢- ﴿ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ ﴾، ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە لە کاتەکانی شەودا.

٣- ﴿ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴾، کڕنووش بۆ خوا دەبەن.

٤- ﴿ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴾، بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی دێنن.

٥- ﴿ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾، فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە دەکەن.

٦- ﴿ وَيُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾، پێشبڕکێ دەکەن لە ئەنجامدانی چاکەکان دا.

٧- ﴿ وَأُوْلَـٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾، وە ئەوانە لە چاکانن.

٨- ﴿ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ﴾، پاداشتی ئەو چاكانەی كە دەیانكەن، لێیان بزر ناكرێ.

٩- ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴾، وە خوا بە پارێزكاران زانایە، واتە: ئەوانە كەسانێكی پارێزكارن، دوای ئەوەی كە بە (صلاحو إصلاح) ناوزەدیان دەكات، بە پارێزكاریش وەسفیان دەكات، كەواتە:

یەكەم: مسوڵمانان دەبێ ئەهلی ئینصاف بن لەگەڵ غەیری خۆیان داو، وە هەمیشە بە چاویلكەی ڕەش تەماشای خەڵك نەكەن، بۆ وێنە: كاتێ تەماشای دەوڵەتانی دنیا دەكەن نەڵێن: هەموویان وەك یەكن، نەخێر، ئەمریكا جیایە، فەڕەنسا جیایە، ڕووسیا جیایە، چین جیایە،... هتد، بۆیە دەبێ پۆلێن (تصنیف)یان بكەن، پاشان حكوومەتەكانیان جیان لە میللەتەكانیان، ئنجا خەڵكی باشیان هەیەو خەڵكی خراپیان هەیە، هەروەها حیزبە عەلمانییەكانی دەوروبەرمان، بەهەمان شێوە، ئینسان دەبێ ئینصافی هەبێو هەر كەسە وەك خۆی هەڵیسەنگێنێ، ئەوە یەك.

دووەم: وە پاشان ئەم ئایەتە مسوڵمانان فێری هۆشیارییو وریاییش دەكات، كە بە هۆی ئەوە كە هەندێ خەڵكی چاك هەیە لەنێو جوولەكەو نەصرانیی یەكان دا، نابێ ئێمە بەهۆی كەسە چاكەكانیانەوە بە خراپەكانیان هەڵبخەڵەتێین، بەڵكو چاكیان وەك چاك مامەڵەی لەگەڵدا بكەینو ببینینو، خراپیشیان وەك خراپ !!

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، باسمان كرد كە جوولەكەو نەصرانیی یەكانو خاوەن كتێبەكان، كە خیانەت دەكەن لە ئەمانەت، بەچی پاساوی دەدەنەوە؟ دەڵێن: ئێمە هەرچی بكەین دەربارەی نەشارەزایان نەشارەزایانیش لە لای جوولەكە واتە: هەموو كەس غەیری جوولەكە، یاخود غەیری جوولەكەو نەصرانیی، واتە: غەیری خۆیان، وەك چۆن ئێمە بە

غەیری مسوڵمان دەڵێین: كافر، ئاوا ئەوانیش بە غەیری خۆیان گوتوە (أُمِّيِّن)، جا گوتوویانە: هەرچی دەربارەیان بكەین، ڕێی گلەییمان نایەتەوە سەرێ، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە لە ڕاستیدا هەمیشە فیكرو بۆچوونیی هەڵە، هەڵسوكەوتی لار لە ئینساندا پەیدادەكات، دیارە ئەوەش تایبەت نیە بە جوولەكەو نەصرانییانەوە، بەڵكو هەر ئینسانێك موعتەقەدو بۆچوونیی هەڵەی هەبوو، چاوەڕێی ڕەفتارو هەڵسوكەوتی هەڵەی لێ بكە، بۆیەش دەڵێین: تایبەت نیە بە جوولەكەو نەصرانییانەوە، چونكە دیارە ئەگەر بابای مسوڵمانیش بیرو بۆچوونێكی هەڵەی بۆ پەیدابوو، جاری وایە بە ناوی دینیشەوە كابرا دەچێ خوێنی خەڵك بە ناهەق دەڕێژێ، ماڵی خەڵك بە ناهەق دەخوا، پرسیاریشی لێبكەی دەڵێ: من جیهادێ دەكەم !! باشە كێ گوتی: ئەوە جیهادە؟! خوێنی خەڵك بە ناهەق بڕێژی، ماڵی خەڵك بە ناهەق بستێنی، بشڵێی من جیهادێ دەكەم، ڕاستە جیهاد ئەركێكی گرنگو بەرزە، بەڵام ئەو وەسیلەیەش كە بۆ ئەو كارە بەرزە بەكاری دێنی، دەبێ وەسیلەیەكی بەرزو شەرعیی بێ، جا لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە گێڕدراوەتەوە، وەك (شوكاني) لە (فتح القدير)دا هێناویەتی: ((أَخْرَجَ ابْنُ جَرِيرٍ، وَابْنُ الْمُنذِرِ، وَابْنُ أَبِي حَاتِمٍ عَنْ صَعْصَعَةَ أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّا نُصِيبُ فِي الغَزْوِ مِن أَمْوَالِ أَهْلِ الذِّمَّةِ الدَجَاجَةَ وَالشَّاةَ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَقُولُونَ مَاذَا ؟ قَالَ: نَقُولُ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي ذَلِكَ مِنْ بَأْسٍ قَالَ: هَذَا كَمَا قَالَ أهل الكتاب: ﴿لَيْسَ عَلَيْنَا فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ﴾، إِنَّهُم إِذَا أَدُّوا الْجِزيَةَ لَمْ تَحِل لَكُمْ أَمْوَالُهُم إِلاّ بِطِيبِ نفُوسِهِم))[1]، واتە: ئیبنو جەریرو ئیبنو مونذیرو ئیبنو ئەبی حاتیم لە صەعصەعەوە دەگێڕنەوە، كە پرسیاری لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس كردوە، خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، گوتوویەتی: ئێمە جاری وایە لە جەنگدا ماڵی ئەهلی كیتاب (أَهْلِ الذِّمَّةِ)مان دەكەوێتە بەردەست، مریشكێك، مەڕێك، سەری دەبڕینو دەیخۆین، عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٤٥٦).

گوتی: جا دەڵێن چی؟! گوتی: دەڵێین: هیچ گوناهمان ناگاتێ (هی نامسوڵمانانە) عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: ئەوە وەك قسەی ئەهلی کیتابە کە دەڵێن: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ﴾، واتە: (وەك خائینەکانی ئەهلی کیتاب دەیانگوت:) هەرچی بکەین دەربارەی غەیری خۆمان هیچ گلەییمان نایەتەوە سەرێ، جا پێی گوتن: بەڵکو ئەوانە مادام سەرانەیاندا هیچ شتێك لە ماڵی وان بۆ ئێوە حەڵاڵ نابێ، مەگەر بە ئارەزووی خۆیان پێتان بدەن، ئەگەرنا لە ڕاستیدا بۆتان ڕەوا نیە.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾، با، هەرکەسێك وەفاداربێ بە پەیمانەکەیو پارێز بکات، بێگومان خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن، لێرەدا لەم ڕستە قورئانییە، سێ ڕاستیی گرنگمان دەستگیر دەبن:

**ڕاستیی یەکەم**: پەیمان بردنە سەر، خەسڵەتێکی زۆر گەورەو گرنگە، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار ئەوەی بە تەقوا داناوە، وە دواییش دەفەرموێ: خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن، کەواتە: خوای بەرز کەسێکی خۆشدەوێ کە پەیمانی خۆی بەرێتە سەر.

**ڕاستیی دووەم**: هەروەها ئەوەشمان دەستگیر دەبێ کە وشەی (تقوى) واتاو چەمکەکەی زۆر فراوانەو، پەیمان بردنە سەرو پەیمان نەشکاندنیشی، بەشێکە لە تەقوا.

**ڕاستیی سێیەم**: وە پاشان ئەو ڕاستییەشمان دەستگیر دەبێ، کە ئایا خوا کێی خۆشدەوێ؟ خوا ئەهلی تەقوای خۆشدەوێ، خوا پارێزکارانی خۆشدەوێ، خوای کاربەجێ لە گۆترە کەسی خۆشناوێ، وە ڕقیشی لە کەس هەڵناستێ، ئەگەر تەماشا بکەن خوا هەرگیز لە قورئاندا نەیفەرمووە: کوردم خۆشدەوێ، عەرەبم خۆشدەوێ، فارسم خۆشدەوێ، دەوڵەمەندم خۆشدەوێ، فەقیرم خۆشناوێ، یاخود سپی پێستم خۆشدەوێ، ڕەش پێستم خۆشناوێ... هتد، بەڵکو هەمیشە خوای

کاربەجێ خۆشەویستی خۆی، وە بوغزی خۆی دەبەستێتەوە بە کردارو ئاکارەوە، بەو شتەوە کە ئینسان بۆخۆی وەدەستی دێنێ، کەواتە: ئێمە دەبێ ئەگەر بمانەوێ ببینە خۆشەویستی خوا، هەوڵبدەین خۆ برازێنینەوە بەو سیفەتانەی مایەی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوان، وە ئەگەر بمانەوێ خوا ڕقی لێمان هەڵنەستێو نەمانبوغزێنێ، دەبێ خۆ لەو شتانە بپارێزین کە خوای دادگەر خاوەنەکانیان دەبوغزێنێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُو۟لَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، هەرچەندە ئێمە پێشتر ئەم ئایەتە موبارەکەمان تەفسیر کرد، بەڵام لێرەدا سەرنجێکی زیاتری لێ دەدەین، خوا دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی کە بە پەیمانی خواو بە سوێندەکانی خۆیان، نرخێکی کەم دەکڕن، واتە: پەیمانێك کە لەگەڵ خوا بەستوویانە دەیشکێنن‌و سوێندێك کە بە ناهەق دەیخۆن بۆ ئەوەیە کە شتێکیان دەستکەوێ، ئنجا ئەوەی کە دەستیان دەکەوێ هەرچەندە زۆریش بێ، هەر کەمە، چونکە ئەوەی کە بەهۆی پەیمان شکاندن لەگەڵ خوادا وەدەست دێ، وە بەهۆی سوێند خواردنی درۆ دەستگیر دەبێ، هەرچەندبێ ئەو نرخو بەهایە هەر کەمە، جا دەفەرموێ: ئەوانە لە دوارۆژدا هیچ بەشیان نیە، وە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا نایاندوێنێ‌و تەماشایان ناکات‌و پاکیان ناکاتەوەو چاکیان ناکات، وە ئازارێکی بەئێشیان هەیە، کەواتە: پەیمان شکێنیی‌و سوێندی بە درۆ خواردن، تاوانێکی زۆر گەورەیە، چونکە خوا زاڵی پایەدار پێنج جۆرە سزای بۆ داناون کە دیارە هەر یەکێك لەو پێنج سزایانە سزایەکی گەورەیە، چ جای هەر پێنجیان پێکەوە !! بۆیە بەڕاستی ئینسان دەبێ هەڵوەستەیەکی زۆر بکات لە بەرانبەر ئەم ئایەتە موبارەکەدا، کە خوای کاربەجێ زۆر بە تەئکیدو جەخت لەسەر کردنەوە دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی کە پەیمان لەگەڵ خوا دەبەستن‌و دەیشکێنن،

وە سوێند دەخۆن لەسەر شتێكو سوێندەكە بە ناهەق دەخۆن، یاخود دوایی سوێندەكە دەشكێنن لە بەرانبەر دەستكەوتێكی دنیاییدا، كە خوا بە (ثَمَنَاً قَلِيلاً) نرخێكی كەم ناوی دەنێ، چونكە هەرچی دەستكەوێ بە پەیمان لەگەڵ خوا شكاندنو، سوێندی بە درۆ خواردن، هەركەمە، ئەوە ئەم پێنج سزای هەن:

**سزای یەكەم:** دەفەرموێ: ﴿ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ ﴾، واتە: لە دوارۆژدا هیچ بەشیان نیە، واتە: كەمو زۆر خوای پەروەردگار پاداشتیان ناداتەوەو چاویان بە بەهەشت ناكەوێ، (خلاق) بە مانای (نصیب) دێ، واتە: پشكو بەش.

**سزای دووەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ ﴾، واتە: وە خوا قسەیان لەگەڵ ناكاتو نایاندوێنێ.

**سزای سێیەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، واتە: وە تەماشاشیان ناكات، دیارە خوای بەرز ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا تەماشای كەسێك بكات، نیشانەی ڕازی بوونیەتی، چونكە خوای زاناو شارەزا هەر بەپێی عورفو باوو عەقڵی ئێمە، ئێمە دەدوێنێ، بۆ وێنە: ئەگەر كەسێك حەز لە چارەی كەسێك نەكاتو خۆشی نەوێ، دەڵێ: حەز بە چارەی ناكەم، نامەوێ بیبینمو گوێم لە قسەی بێ، وە پێی خۆشە هەر باسی نەكرێ! بۆیە خوا سبحانەو تعالی دەفەرموێ: ئەو جۆرە كەسانە نەدەیاندوێنێو نە تەماشاشیان دەكات.

سزای چوارەم: دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُزَكِّيهِمْ ﴾، واتە: وە پاكیشیان ناكاتەوە، لە ڕۆژی دواییدا كێ دەچێتە بەهەشتێ؟ كەسێك كە خوای پاكو تاك پاكیی بكاتەوە، دیاریشە كە بەهەشت شوێنێكی پاكە، وە بەكەڵك خەڵكی پاك نەبێ نایەتو خەڵكی پیسو پۆخڵ شایستەی چوونە بەهەشت نین،

ئەوانیش خوای بەخشندە لەو گوناحو تاوانانە پاكیان ناكاتەوەو شایستەی پاككرانەوە نین!

سزای پێنجەم: دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، واتە: وە سەرەڕای هەموو شتێكیش ئازارێكی بە ئێشیان هەیە، كە خوا (عَزَّ وَجَلَّ) ئەو ئازارەی دیاری نەكردوە، ئایا ئازاری جەستەییە یان دەروونییە، ماددییە یاخود مەعنەوویيە؟ بۆیە هەمووی دەگرێتەوە.

**مەسەلەی پێنجەم**: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، وە دەستەیەك لە خاوەن كتێبەكان جوولەكەو نەصرانیی یەكانو هەموو ئەوانەی كە خۆیان بە خاوەن كتێب دەزانن، كۆمەڵێكیان لە نێواندا هەن، زمانیان بە كتێب بادەدەن، كاتێك كتێبی خوا دەخوێننەوە زمانی خۆیانی پێ بادەدەن، واتە: دەیگۆڕن، جا یان ڕواڵەتیی وشەكەی دەگۆڕن، یاخود واتاو ماناكەی دەگۆڕن، دیارە ئەگەر وشەكە بگۆڕن ماناكەشی دەگۆڕێ، وە ئەگەر ماناشی بگۆڕن یانی: بە شێوەیەك واتای لێدەدەنەوەو تەئویلی دەكەن كە خۆیان مەبەستیانە، وە ئامانجێكی خراپی ئەوان بپێكێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە ئەو كەسانەی خیانەتی ماددیی دەكەن خیانەتی مەعنەوییش دەكەنو هەرواشە، زانایان دەڵێن: گوناح هەندێكی هەندێكی ڕادەكێشێ، ئەوەی كە خیانەت لە ماڵو سامانی خەڵك دا بكاتو، خیانەتی ماددییان پێ بكات خیانەتی مەعنەوییشیان پێ دەكات، ئەوانە خوای پەروەردگار پێشێ باسی خیانەتی ماددییان دەكاتو دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانە شتێكیان پێبسپێردرێ ئەمانەتەكە زایە دەكەن، وەختێ پەیمانێك دەدەن پەیمانەكە دەشكێنن، وەختێ سوێند دەخۆن دەشكێنن، یان سوێندی بەدرۆ دەخۆن بۆئەوەی كە نرخێكی كەمیان دەستكەوێ، بەهایەكی كەمیان دەستكەوێ، ئنجا ئەوانە كە خیانەتی ماددیی دەكەن، خیانەتی مەعنەوییش هەر دەكەن، كە بریتییە لە

چی؟ بریتیە لە خیانەتیان بە كتێبی خواو بە گۆڕینی كتێبی خواو گۆڕینی یاساكانی خوای پەروەردگار، وەك پێشتر باسمانكرد، دەفەرموێ: ﴿ يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ ﴾، (يَلْوُنَ) یانی: (يَفتِلُونَ) (فَتْل) یانی: بادانی شتێكو سووڕاندنی، كە لێرەدا مەبەست پێی گۆڕینی كتێبی خوایەو مەبەست پێی درۆكردنیانە، بۆیە لێرەدا پێویستە ئێمە ئەوە بزانین كە خوا باسی سیفەتی خراپی هەندێ لە خاوەن كتێبەكان دەكات، جوولەكەو نەصرانیی یەكان، تاكو ئێمەش پەندی لێوەربگرین، واتە: ئەوان بەو شێوەن بیانناسە، باشە، بەڵام بۆ ئەوەشە كە ئێمەش پەندی لێ وەربگرینو ئێمەش وەك وان نەكەین، چونكە هەركەسێك سیفەتی خراپی ئەوان لە خۆیدا بێنێتەدی، حوكمی ئەوانی هەیە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٥١)دا فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! جوولەكەو نەصرانیی یەكان مەگرن بە دۆستو خۆشەویستو یارو یاوەری خۆتان، ئەوان هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن، وە هەر كەسێك لە ئێوە بە دۆستیان بگرێ، ئەوە وەك ئەوانە، وە بێگومان خوا ڕێنمایی كۆمەڵی ستەمكاران ناكات.

ئنجا لە ڕاستیدا جوولەكەو نەصرانیی لەبەر سیفەتە خراپەكانیان خراپ بوو ون، كەواتە: هەر كەسێك لە مسوڵمانانیش سیفەتی خراپی ئەوان بكاتە پیشە، هەمان حوكمی ئەوان وەردەگرێ لەو سیفەتەدا، بۆیە من كاتی خۆی وشەیەكم بەكاردەهێنا بۆ ئەو بەناو زاناو مامۆستایانەی بە حیساب جێگرو میراتگری پێغەمبەرن ﷺ، بەڵام دینی خوا دەگۆڕنو فەتوا بە شێوەیەك دەدەن، كە مل بە ئایەتو فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەسووڕێنن، تاكو لەگەڵ ئارەزووو ڕەغبەتی دەسەڵاتداران بگونجێن، وە دەشزانن ئەمە

خیانەتـە، نـاوم لێنـابوون (كۆلكـە مـەلای دیـن فـرۆش)، وە لـە ڕاسـتیدا دیـن فرۆشـتنو دیـن گـۆڕین شـتێك نیـە تـاپۆ كرابـێ لەسـەر زانایـانی جوولەكـەو نەصرانیی، بەڵكو هـەر كەسـێك تەقـوای خـوای نـەبێو لـە خـوا نەترسـێ، وە هـەر كەسێك بەڕاستی دنیا بەسەر دیـن دا زاڵ بكـات، وە خەڵـك بەسـەر خـوا دا هەڵبـژێرێ، لـە زانایـان، ئەوانـەی كـە خۆیـان بـە میـراتگری پـێغەمبەر ﷺ دادەنێن، تووشی ئەو دەردە دەبن، جا مـسوڵمان بـن، یـان جوولـەكە بـن، یـاخود نەصرانیی بن، یان هەر كەسانێكی دیكەبن.

مەسـەلەی شـەشـەم: كـە دەفـەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ كەسێك بۆی نیە خوا كتێبی پـێبداتو حیكمـەتو پـێغـەمبەرایەتی پـێبـدات، دوایـی بە خەڵك بڵێ: بەندەی من بن لەجیاتـی خـوا، ئەمـە ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ كـە نـەك هـەر پـێغەمبەران (علـیهم الـصلاة والـسلام) بەڵـكو زانایـانی ڕاستەقینەش كە جێگرو میـراتگریی پـێغەمبەرانن، لـە هەموو كـەس دوورتـرن لە خۆ بەزلـگـریی، وە لە ئیـستیغلال كردنـی خەڵـك بـۆ مەبەسـتی تایبـەت، بـە نـاوی ئـایینو بەرنامـەی خـوای پـەروەردگارەوە، بـە ڕاسـتی كەسـێك خۆشـەویستی خوا سبحانەو تعالـی، وە تـرسو سـامو هـەیبەتی خـوا، لـە دڵو دەروونیـی دا هـەبێ، ئەوە ئەو تـرسو سـامو هـەیبەتەی بەرانبـەر بـە خـواو، ئـەو خۆشـەویستییەی بەرانبـەر بـە خـوا سبحانەو تعالـی، وای لێدەكـات خـۆی دوور بگـرێ لە:

١- خۆ بەزلـگـریی (التَّكَبُّر).

٢- چەوسـاندنەوەی خەڵـكی، یـاخود بـەكارهێنانی خەڵـكی بـۆ مەبەسـتو مەرامـی تایبەت. كەواتە: هەركەسێك ئەوەی تێدا بینـرا، مانـای وایـە لەسـەر ڕێـی پـێغەمبەری خـوا ﷺ نیە، چونكە خـوا زاڵـی پایەدار دەفەرموێ: هیـچ ئینـسانێك بـۆی نیـە، وە هـەرگیز ناگونجـێ خـوا كتـێبی پـێبـدا، واتـە:

شـــارەزایی کتێبـــی خـــۆی فێربکـــات، وە حیکمـــەتی فێـــر بکـــاتو پـێغەمبـــەرایەتی پـێ بـدات، یـاخود بیخـاتە سـەر ڕێـی پـێغەمبەری خـوا ﷺو میـراتگرو جێگـری پـێغـەمبەر بـێ، کەچـی بـێ بـە خەڵکـی بڵـێ: وەرن بەندەی من بن لە جیاتی خوا، واتە: لە جیـاتی ئـەوەی خـەڵك بکـا بە خواپەرست، خۆیان لـێ بکـات بـە پەرسـتـراو!! هەرکەسـێ وا بکات ئـەوە بـە دڵنیـایی لەسـەر ڕێبـازو ڕێو شـوێنی پـێغـەمبەران (علیهـم الـصلاة والسلام) نیـە.

**مەسـەلەی حەوتـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ﴾، بەڵکو هەر کام لە پـێغەمبەران (علیهم الـصلاة والـسلام)، وە میـراتگرانو جێگرانـی پـێغەمبەران، لـە جیـاتی ئـەوەی بڵێـن: وەرن بەندەی ئێمـە بـن، ئێمـە بپەرسـتن! دەڵێن: وەرن ببنـە ڕەببـانیی، بەهـۆی ئەوەوە کـە کتێـب فێـری خـەڵکی دەکەن، وە بەهـۆی ئـەوەوە کـە کتێبـی خـوای زانــاو شـــارەزا دەخـوێنن، ئێمـە پـێـشـتـر وشـەی (ڕەببـانیی)مـان تۆزێـك شـیکردۆتەوە بـەڵام ئێـستا زیـاتر شـیدەکەینەوە، شـایانی باسیـشە یـەکێك لـە زانایانمـان بـە نازنـاوی (الإمـام الربّـاني) مەشـهوور بـووە، کـە (سـەید ئەحمـەدی سـەرهەندی)ە، وە لـە ڕاسـتیدا نازنـاوی ڕەببـانیی نازنـاوێکی گـەورەیەو شایـستەی هـەموو کـەس نیـە، ئنجـا بـا بـزانین زانایـان لـەوبارەوە چـی دەڵێن؟! ئێمە قسـەی دوو لە زانـایان لەوبـارەوە دێنینـەوە:

**یەکـەمیان:** (الطَّبَري)یـە، ڕەحمـەتی خـوای لـێبـێ، کـە بەڕاسـتی پێناسـەکی جـوان دەکات بۆ وشـەی: (ربّـاني) دەڵـێ: (وَأَوْلَى الأَقْوَال عِنْدِي بالصَّوَابِ فـي (الرَّبَّـانيين) أَنَّهُـمْ جَمْـعُ (ربّـاني)، وَأَنَّ (الربّـانيّ) الْمَنْـسوبٌ إلـى (الرَّبَّـانِ)، الَّـذِي يـربُّ النَّـاسَ، وَهُـوَ الَّـذِي يُـصْلِحُ أُمُـورَهُمْ، وَ(يَرُبُّهـا)، وَيَقُـومُ بِهَـا، فَالرَّبَّـانيون إذاً هُـمْ عِمـاد النَّـاسِ فـي الفِقـه وَالعِلْـم وَأُمـور الـدِّين والـدّنيا، وَلِـذَلِكَ قَـالَ مُجَاهِـد: وَهُـمْ فَـوْقَ الأَحْبَـارِ، لأن الأَحْبَـار هُـم العُلَمَـاءُ،

وَالرَّبَّانيُّ الْجَامِع إِلى العِلْمِ وَالفِقه: البَصَرَ بِالسيَاسَةِ وَالتدبيرِ وَالقِيَام بِأُمُورِ الرَّعيةِ وَمَا يُصلِحهم في دنياهُم ودينهم)[1]، واتە: كەوابێ لە پێشترین قسە لە ڕاستییەوە لەلای من لە پێناسەكردنی ڕەببانیی‌یەكان دا، ئەوەیە كە وشەی (ربَّانيين) كۆی (ربَّاني)یە، وە وشەی: (ربَّاني)یش پاڵدەدرێتە لای (الرَّبَّان) كە بە كەسێك دەڵێن: خەڵك پەروەردە دەكاتو كاروباریان ڕێك دەخات وە سەرپەرشتییان دەكات، واتە: مشوور خۆر، كەواتە: ڕەببانییەكان بریتین لە كەسانێك كە خەڵك پشتیان پێ دەبەستێ هەم لە بواری شارەزایی لە شەرعدا، وە لە بواری زانیاریی كاروباری دینو دنیادا، بۆیە موجاهید گوتوویەتی: (ربَّانيون) لە سەرووی (أَحْبَار)ەوەن، ﴿(أَحْبَار) واتە: زانایان﴾، چونكە (أَحْبَار) زانایانن، بەڵام (ربَّاني) وێڕای شارەزاییو زانیاریی لە ئاییندا، لە كاروباری سیاسیو لە مشوور خواردنو لە بەڕێوەبردنی كاروباری خەڵكو كۆمەڵگاشدا، وە لەوەدا كە بۆ كاروباری دنیایانو دینیان چاك دەكات، شارەزان، كەواتە: ئینسانی ڕەببانیی، واتە: كەسی مشوور خۆر، كە مشووری دنیاو دواڕۆژی خەڵك دەخوا، لە ڕووی ڕووحییو سیاسییو كۆمەڵایەتییەوە، مشووریان دەخۆنو سەرپەرشتییان دەكەن.

**دووەمیان:** (الشوكاني)یە، ڕەحمەتی خوای لێبێ، ئەویش دەڵێ: (وَالرَّبَّاني مَنْسوبٌ إِلى الرَّبِّ بِزِيَادَةِ الأَلِفِ وَالنُونِ للمُبَالَغَةِ كَمَا يُقَالُ لِعَظِيم اللحيةِ لحيانِيٌّ وَلِعَظِيمِ الْجُمَّةِ: جُمّانِي وَلغَلِيظ الرقَبةِ: رَقْبانِي فَمَعْنَى الرَّبَّانِي: العَالِمُ بدِين الرَّبّ القَوِي الْمُتَمَسِّكُ بِطَاعَةِ الله)[2]، واتە: وشەی (ربَّاني) كە پاڵ دەدرێتە لای (رَبِّ) بە زیادكردنی ئەلیفو نوون بۆ ڕەببانیی بۆ زێدەڕۆییكردنە لەوەدا كە زۆر سەر بە خوای

١) جامع البيان عن تأويل آي القُرآن، ج: (٣)، ص: (٣٥١، ٣٥٢).
٢) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٢٥٧).

پەروەردگـارنو، زۆر شـارەزانو زۆر لـە پـەروەردگاریان نیـزیكن، وەك چـۆن كەسێك كە ڕیشێكی گەورەی هەیە پـێی دەڵـێن: (لحیانِي) یـان كەسـێك كـە پـێشـە سەرێكی گـەورەی هـەیە پـێی دەڵـێن: (جُمّانِي)، یـاخود كەسـێك كە ملی ئەستوور بێ پێی دەڵێن: (رقبـانِي) كەواتـە: ڕەببـانیی كەسـێكە كـە لە دینـی خـوای پەروەردگـاردا شـارەزایەو، زۆربـاش بـە فەرمانبـەریی بـۆ خـوا كردنەوە، پابەنـدە.

**مەسـەلەی هەشـتەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۦنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ﴾، پـێشـتـر باسـمان كـرد خـوا دەفـەرموێ: خـوا پـەیمانی پتـەوی لـە پـێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەرگرتـوەو پـێـی فـەرموون لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە مـن كیتـابو حیكمـەتم پێـداون، هـەر پـێغـەمبەرێك هـات بـۆ لاتـانو ئـەوەی بەڕاسـت زانـی كـە پێتـانە ئیمـانی پـێـبێننو پـشتی بگـرنو سـەری بخـەن، حیكمەتی دەرخستنی ئەم ڕاستییەش ئەوەیـە كـە پـێغەمبەران (علیهم الصلاة والـسلام) هـەموویان لـە یـەك سەرچـاوەوە هـاتوون، وە لـە یـەك سەرچـاوە هەڵیانهێنجـاوەو، هـەموویان یەكـدی بەڕاسـت دادەنێـن، وە هـەموویان تەواوكـەری كـاری یەكـدین، كەواتـە: جوولەكـەكانو نەصـرانیی یـەكانو مەجووسییەكانو صـابیئەكانو هەموو ئەوانـەی كـە خۆیـان بـە خـاوەن كتێـب دەزانـن، ئەگـەر لەگـەڵ پـێغەمبەرانی خۆیانـدا ڕاسـت دەكـەن، دەبـێ بـڕوا بـە پـێغەمبەری كۆتـایی موحەممـەد ﷺ بێـنن، چونكـە لـە دوای ئـەو پێغەمبەرێكـی دیكـە نایـەت كـە، وە درێـژترین مـاوە لـە نێـوانی دوو پـێغـەمبەران دا بووبـێ، ئـەو ماوەیـە بـووە كـە لـە نێوانی موحەممەدو عیـسا (علیهما الـصلاة والـسلام) بـووە، كـە كەمتـر لـە (٥٧٠) سـاڵە، چونكـە پێغەمبـەری ئێمە لە ساڵی (٥٧١)ی زایینی لە دایك بووە، وە (عیـسا)ش دەبـێ لە سـاڵی (١)ی زایینی لە دایك بووبێ، كە دیارە بـەلای كەمـەوە تەمـەنی سـی

چل ساڵ بووە کە بۆتە پێغەمبەر، مانای وایە نیزیکەی (٥٣٠) (٥٤٠) ساڵێك ئەندازەی ئەو ماوەیە بووەو ئەوەش درێژترین ماوە بووە، چونکە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ ... قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ... ١٩ ﴾، واتە: دوای دابڕانێك لە ناردنی پێغەمبەران، پێغەمبەری ئێمەتان بۆ هات، بەڵێ، ماوەی نێوان عیساو پێغەمبەری کۆتایی درێژترین ماوە بووە، چونکە هیچ دوو پێغەمبەرێکی دیکە نیزیکەی پێنج سەد ساڵیان نەکەوتۆتە بەینێ، ئێستا لە دوای پێغەمبەری کۆتایی ئەوە چەند ساڵە؟ ئێستا ئێمە لە ساڵی (١٤٣٣)ی کۆچی داین، ئەگەر دە (١٠) ساڵی مەدینەی لێ دەربکەی، ئەوە دەکاتە (١٤٢٣) ساڵ پێغەمبەر ﷺ وەفاتی فەرمووەو هیچ پێغەمبەریش نەهاتوون، مانای وایە تازە پێغەمبەرێکی دیکە نایەت، خوای بەرزیش کە فەرموویەتی: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ...٤٠ ﴾الأحزاب، واتە: موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە (چونکە بە زەیدی کوڕی حاریسەیان دەگوت: زەیدی کوڕی موحەممەد) بەڵام نێرراوی خوایەو کۆتایی پێغەمبەرانە، کەواتە: بە هاتنی موحەممەد ﷺ دەرگای پێغەمبەرایەتی داخراوەو، دەرگای وەحی پێوەدراوە، کەواتە: کۆتا پێغەمبەری خوا موحەممەدە، وە کۆتا کتێبی خوا قورئانەو، ئەی خاوەن کتێبەکانو ئەی خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان! ئەگەر ڕاست دەکەن لەگەڵ بەرنامەکانی خۆتانداو، لەگەڵ کتێبەکانی خۆتانداو، لەگەڵ پێغەمبەرانی خۆتاندا، دەبێ بڕوا بێنن بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، چونکە سەروەری هەموو پێغەمبەرانەو کۆتایی هەموویانە، وە هەمووشیان بەڕاست دادەنێ، کەواتە: هەرکەسێك بڕوا نەهێنێ بە پێغەمبەری کۆتایی، لەڕاستیدا بڕوای بە هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا نەهێناوە، وە هەر کەسێك بڕوا نەهێنێ بە قورئان بڕوای، بە هیچ کام لە کتێبەکانی خوای پەروەردگار نەهێناوە، وە لە ڕاستیدا بەشەرییەت بێجگە لە قورئان، کتێبێکی دیکەی خوایی لەبەر دەستدا نیە کە

دڵنیاو مسۆگەربێ ئەوە کتێبی خوایە، ئنجا بێجگە لەم قورئانە هەر کتێبێکی دیکە بگرە، تەوراتم هەموو خوێندۆتەوە، ئینجیلەکانم هەموو خوێندوونەوە، زەبوورم خوێندۆتەوە، ئەو کتێبانەی کە بە کتێبی ئاسمانیی دادەنرێت هەمووم تەماشا کردوون، کاتێك لەگەڵ قورئاندا بەراوردیان دەکەی، لەچاو قورئان وەك حیکایەتی بەر ئاگردان وان، دیارە ئەو کتێبانەی کە خوا ناردوونی، وەك تەوراتو ئینجیلو زەبوورو ... هتد، لە ئەسڵدا ئەوانیش وەك قورئان فەرمایشتی خوا بوونو، ڕێكو ڕاست بوونو، پڕ بە پێستی واقیعی خۆیان بوون، چونکە فەرمایشتی خوای بەرز ئەوەی ملیۆنێك ساڵ لەمەوپێش فەرمووبێتی، وە ئەوەی بۆ سەردەمی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ فەرمووبێتی، وەك یەکن، لەبەر ئەوەی فەرمایشتی خوا هەر فەرمایشتی خوایەو، هەمووی هەر لە یەك ئاست دایە! بەڵام بەدڵنیایی تاکە کتێبێك سەلامەت مابێتەوەو، دەستکاریی نەکرابێ‌و، پارێزراوبێ لە گۆڕانو لە دەستکاریی کران، تەنیا قورئانە، کەواتە: بێجگە لە قورئان ئێمە کتێبێکی دیکەمان لەبەر دەستدا نیە، کە دڵنیاو مسۆگەر بین بڵێین: ئەوە فەرمایشتی خوایە، ئەوانی دیکە ڕەنگە هەندێکی فەرمایشتی خوا بێ ئەویدیکەش گۆڕدرابێ، وە هەر کەسێك کە تەماشای ئەوەی کردبێ کە پێی دەگوترێ: پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێ، واتە: تەوراتو ئەو کتێبانەی کە لەگەڵیدان، وە ئینجیلەکانو ئەو کتێبانەی کە لەگەڵیاندان، تەماشایان بکات، زۆر چاك دڵنیا دەبێ کە هەتا ڕستەیەکی خوای زانایان تێدابێ، دە ڕستەی غەیری خوای بەرزو مەزنیان تێدا هەیە[1].

---

١) هەندێك کەس وادەزانێ کتێبەکانی جوولەکە و نەصرانییەکان بەس تەوراتو چوار ئینجیلەکانن! بەڵام وانیەو بەم شێوەیەن.

پەیمانی کۆن (العهد القديم) لە (٣٩) سیفر پێك دێ کە تەورات بەشێکی کەمی ئەو سیفرانە پێك دێنێ، وە پەیمانی نوێ (العهد الجديد)، وێڕای چوار ئینجیلەکانی (مَتَّى) و (مرقس) و (لوقا) و (يوحَنَّا) لە بیستو سێ بەشی دیکەش پێك دێ، شایانی باسیشە کە بە هەردووکیان (٢٨٠٢) لاپەڕەیان گرتوە ! بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)، ط ٢٠٠٢ م.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾، واتە: ئایا بەرنامەو ئایینی غەیری خوا دەخوازن، لە حاڵێکدا کە هەرچی، وە هەر کەسێك لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، چاروناچار بۆ خوا ملکەچە؟! ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە ئەم ئیسلامەی خوا بە پێغەمبەراندا ناردوویەتیو دوایین نوسخەی بە پێغەمبەری کۆتاییدا نێرراوە ئایینی خوای پەروەردگارە، بۆ هەموو پێغەمبەران، وە هەر یەك دین بووە، ئەویش بریتیە لە ئیسلامو ملکەچیی بۆ خوا، بەڵێ ئەم ملکەچکردنە بۆ خوای پەروەردگار، کە ئایینی خوایەو بە هەموو پێغەمبەراندا ناردوویەتی (علیهم الصلاة والسلام) بۆ هەموو بەشەر، لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی بەشەردا، ئەوە نەك هەر بەرنامەی خوایە بۆ بەشەر، بەڵکو بەرنامەی خوایە بۆ هەموو بونەوەر، ﴿وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾، هەموو کائیناتی نێو ئاسمانەکانو زەوی چاروناچار بۆ خوا ملکەچنو بۆ لای ویش دەگێڕرێنەوە، بۆیەش خوا سبحانەو تعالی ئەو بەرنامەو ئایینەش کە بۆ ئێمەی ناردوە، ناوی لێناوە: (ئیسلام) وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَـٰمُ ﴾، واتە: بێگومان بەرنامەی ڕاست لەلای خوا بەس ئیسلامە، چونکە ئیسلام واتە: ملکەچیی و فەرمانبەریی بۆ خوا سبحانەو تعالی، چونکە هەموو کائینات بۆ خوا فەرمانبەرو ملکەچن، جا ئەوەی بە خۆشیی ملکەچبێ و ئەوەی بە ناچاریی ملکەچبێ، گرنگ ئەوەیە هیچ دروستکراوێكو هیچ کائینێك بەگشتی ناتوانێ لە فەرمانی خوای زاڵو باڵادەست دەربچێ، وەك پێشتر باسمان کرد، ئایا هیچ کەسێك دەتوانێ لە ژێر گومبەزی ئاسمان بچێتە دەرو سەر زەوی بەجێبێڵێ؟ یان هیچ کەسێك دەتوانێ نەخواو نەخواتەوەو نەخەوێ؟ یان هیچ کەسێك دەتوانێ پابەندی ئەو یاسا بیۆلۆجیی و فیزیایی و کیمیاییو ... هتدانە

نەبۆ لێیان لابدات، کە خوای بەرزو بێ هاوتا لە ژیانی بەشەردا داینـاون؟!
بێگومـان نـەخێر، ئـەوە سیستەم (نظـام)ەی خـوای کاربـەجێ داینـاوە، هـەر
کەس پـێی خۆشبێ یان پـێی ناخۆشبێ بۆی ملکەچە !!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە دەرسی دەیەمینە، تێیدا لە ئایەتی (٨٤) تاکو (٩٧) لە سوورەتی ئالی عیمران تەفسیر دەکەین، واتە: چواردە ئایەت، لەم ئایەتانەدا خوای پەروەردگار باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، وە مسوڵمانان ئیمانیان هێناوە بە هەموو کتێبەکانی خوا، وە بە سەرجەم پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەبێ جیاوازیی، وە ئەو حەقیقەتەش ڕاگەیەنراوە کە خوا تەنیا ئیسلام وەك بەرنامەی ژیان بۆ مرۆڤەکان بە ڕەوا دادەنێ، وە ئەوەی دوای غەیری ئیسلام بکەوێ، لێی وەرناگیرێ، پاشان خوای بە بەزەیی باسی کەسانێك دەکات، کە لە ئیسلام هەڵگەڕاونەوەو سزای سەختیان باس دەکات، بێجگە لەوانەی کە دوایی پەشێمان دەبنەوەو چاکسازیی دەکەنو دەگەڕێنەوە، وە پاشان بۆمان باسی کەسانێك دەکات کە هەڵدەگەڕێنەوەو لە کوفریان زیاد دەکەن، کە ئەوانە تۆبەیان لێ قبووڵ ناکرێ، یان تۆبەیەك ناکەن کە شایستەی قبووڵ کردن بێت، وە دوایی باسی کەسانێك دەکات کە بە کافریی دەمرن، کە ئەگەر پڕی دنیا زێڕو زیو بکەنە فیدیەو قەرەبوو، لێیان وەرناگیرێ، ئنجا باسی ئەوە دەکات کە ئینسان بە چ شتێك لەلای خوا دەبێتە چاکەکار، دەفەرموێ: بەوە کە چ شتێکی زۆر خۆشدەوێ بتوانێ لێی ببەخشێ، وە باسی ئەوە دەکات کە هیچ خۆراکێك لە بەنی ئیسرائیل قەدەغە نەبوو، مەگەر ئەوەی کە یەعقووب پێش ئەوەی تەورات بێتە خوار، لەسەر خۆی قەدەغە کردبێ، وە دوایی بۆمان باسی شوێنکەوتنی ئیبراهیمو، باسی کەعبەو مەقامی ئیبراهیمو، باسی حەجی ماڵی خوای پەروەردگار دەکات.

﴿قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ
وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ
أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ
فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟
أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ
جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ
عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ
وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم
مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾ لَن
تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾ ۞ كُلُّ
ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ
ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ
مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا
كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ
﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ
مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((بلّـێ: بڕوامـان بـە خـوا هێنـاوەو بـەوەی کـە دابەزێنراوەتـە سـەرمان (واتـە: قورئـان) وە بـەوەی کـە دابەزێنراوەتـە سـەر ئیبـڕاهیمو ئیـسماعیلو ئیـسحاقو یـەعقووبو ئەسـباط (نـەوەکانی یـەعقووب)، وە بـەوەی کـە بـە مووسـاو عیـساو پـێغەمبەران دراوە لە پەروەردگاریانەوە، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیـچ کامیانـەوە، وە ئێمە بۆی ملکەچین ﴿٨٤﴾ وە هەر کەسێك جگـە لـە ئیـسلام بەرنامەیـەکی دیکە بخـوازێ، لێی وەرناگیـرێو، لـە دواڕۆژیـشدا لـە زیانبارانـە ﴿٨٥﴾ چۆن خـوا ڕێنمـایی کۆمەڵـێك دەکـات، کـە پـاش بـڕوا هێنانیـان کافـر بـوون، وە پـاش ئـەوەی کـە شـایەدیی یانـدا، کـە پـێغـەمبەر هەقـەو بەڵگـە ئاشکرایەکانیان بـۆ هـاتن! خـواش کۆمەڵی ستەمکاران ڕێنمایی ناکات ﴿٨٦﴾ ئەوانە سزایان ئەوەیە کە نـەفرینی خـواو فریشتەکانو تێکڕای خەڵکیان لێیـە ﴿٨٧﴾ لە دۆزەخدا هەمیشـەیی دەبن، ئازاریـان لەسـەر سـووك نـاکرێو مۆڵـەتیش نـادرێن ﴿٨٨﴾ بێجگـە لەوانـەی دوای ئـەوە گەڕاونەوەو چاکەکارییان کردوە، ئەوە بێگومان خـوا لێبـوردەی بـە بـەزەیی یـە ﴿٨٩﴾ بێگومـان ئەوانـەی پـاش بـڕوا هێنانیـان کـافر بـوون، پاشـان کوفریـان زیـاد کـرد، ئەوانـە هـەرگیز تۆبەیـەك ناکـەن لێیـان قبـووڵ بکـرێ، (یـاخود ئەگـەر تۆبـەش بکـەن لێیـان قبـووڵ نـاکرێ)، وە هـەر ئەوانـەن گومڕایـان ﴿٩٠﴾ بێگومـان ئەوانـەی کـافر بـوونو بـە کـافریی مـردوون، ئەگـەر پـڕی زەمینـیش زێـڕ بکەنـە قـەرەبوو (فِدیـة) لێیـان وەرناگیـرێ، ئەوانـە ئـازارێکی بـە ئێـشیان هەیـەو هـیچ یاریدەدەرێکیشیان نین ﴿٩١﴾ چاکیی دەستگیـر ناکەن، هـەتا لـەوەی خۆشتان دەوێ نەبەخـشن، وە هەرشتێکـیش ببەخـشن، ئـەوە مـسۆگەر خـوا پـێی زانایـە ﴿٩٢﴾ هەموو خۆراکێك بۆ وەچەی ئیسڕائیل (واتـە: نـەوەکانی یەعقـووب)، حـەڵاڵ بـوو جگە لـەوەی کە ئیسڕائیل (یەعقـووب) پـێش هاتنـە خـوارەوەی تـەورات لـە خۆی

قەدەغە کردبوو، بڵێ: دە تەورات بێنن‌و بیخوێننەوە، ئەگەر ڕاست دەکەن ﴿٩٣﴾ دیارە هەر کەسێکیش دوای ئەوە، درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستێ، ئەوە لە ستەمکارانە ﴿٩٤﴾ بڵێ: خوا ڕاستی فەرمووە، دەجا شوێن ڕێبازی ئیبراهیم بکەون بە پاکیی‌و ساغیی، وە ئەو لە هاوبەشدانەران نەبوو ﴿٩٥﴾ بێگومان یەکەمینماڵێك (ی خوا) کە (لەسەر زەوی) بۆ خەڵکی دانرا، ئەوەیە کە لە مەککەیە خێردارو (مایەی) ڕێنمایی یە بۆ جیهانییان ﴿٩٦﴾ چەندان نیشانەی ڕوونی تێدان (یەکیان) شوێنی لەسەر وەستانی ئیبراهیمە (ئەو بەردەی ئیبراهیم لەسەری وەستا بۆ دانانی دیواری کەعبە) وە هەر کەسێك بچێتە نێوی (واتە: ئەو ماڵەی خوا) دڵنیاو هێمن دەبێ، وە حەجی ماڵی خوا بۆ خوا لەسەر خەڵکی پێویستە، هەر کەسێك بتوانێ بۆی بچێ، هەر کەسێکیش کافربێ، بێگومان خوا لە هەموو جیهانییان بێنیازە ﴿٩٧﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**وَٱلْأَسْبَاطِ**): کۆی (سِبْط)ە، (سِبْط) واتە: نەوە (السِّبْطُ: وَهُوَ وَلَدُ الوَلَدِ) بریتیە لە کوڕی کوڕ، وە (أَسْبَاط) واتە: نەوەکان، (والأسْبَاطُ: قَبَائِلُ كُلُّ قَبِيْلَةٍ مِنْ نَسْلِ رَجُلٍ) واتە: (أَسْبَاط) بە تیرەو هۆزەکانیش دەگوترێ، کە هەر هۆزە دەچێتەوە سەر پیاوێك، واتە: وەچەی پیاوێکە، لێرەدا خوای پەروەردگار وە لە هەموو قورئاندا کە وشەی: (أَسْبَاط) بەکاردێنێ مەبەست پێی دوازدە تیرەو هۆزەکانن، کە هەموو گەلی وەچەی ئیسرائیل پێکدێنن، کە دیارە ئەو دوازدە تیرەو هۆزە دەچنەوە سەر دوازدە کوڕەکانی یەعقووب ﷺ، کە یەعقووب کوڕی ئیسحاقە ئیسحاقیش کوڕی ئیبراهیمە، وە یەعقووب ناوی یەعقووب بووەو نازناوەکەشی (ئیسرائیل) بووە، وە وشەی: (ئیسرائیل) واتە: بەندەی خوا، کە ئێستا لە قورئاندا دەفەرموێ: (بَنِي إِسْرَائِيل) واتە: کوڕانی، یاخود نەوەی ئیسرائیل، یان وەچەی یەعقووب.

(وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ): واتە: چاوەڕوانییان ناکرێ، یاخود مۆڵەت نادرێن، (النَظَرُ: الإنتِظَارُ، يُقَالُ: نَظَرتُهُ وَانتظَرتُ وَأَنظرَتُهُ) هەرسێکیان بەمانای چاودێرییکردن دێن، وە (أَنظَرتُهُ): بە مانای: (أخَّرتُهُ) دێن، واتە: دوامخست.

(وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦ ): واتە: ئەگەر بیشیکاتە بەلاگێڕی خۆی، یان بیشیکاتە قەرەبووی خۆی، دەڵێ: (الفِدَى وَالفِدَاءُ: حِفْظُ الإنسَانِ عَن النّائبَةِ بِمَا يبْذُلُهُ عَنْهُ) واتە: (فِدَى وَفِدَاءُ): بریتیە لەوەی کە ئینسان خۆی بپارێزێ لە بەلایەك بەهۆی پارەیەکەوە، کە سەرفی دەکاو دەیکاتە بەلاگێڕی خۆیو دەیکاتە قەرەبووی خۆی، (وافْتَدى: إذَا بَذَلَ ذَلِكَ عَنْ نَفْسِهِ)، (افْتَدى) واتە: پارەیەکی سەرف کرد خۆی بکڕێتەوە، وەك چۆن کاتی خۆی خەڵك لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا کە نەدەچوون بۆ سەربازیی، دەبوو پارەیان دابایەو پێیان دەگوت (فدية) یان (بَدَلْ).

(ٱلْبِرَّ): (البَرّ: خِلافُ البَحْرِ، وَتُصوِّرَ مِنْهُ التَوَسُّعُ، فَاشْتُقّ مِنْهُ البِرّ أَي التَوَسُّعُ في فِعْلِ الْخَيْرِ)، (بَرّ) واتە: زۆر چاکەکار، یەکێك لە ناوەکانی خوا (بَرّ)ە وەك دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ ﴾الطور، واتە: خوا زۆر چاکەکارە، زۆریش بە بەزەیی یە.

(بِبَكَّةَ ): واتە: مەککە، هەردوو وشەکە هەن: بەککەو مەککە هەر یەکن، ناوی ئەو شارەیە کە لە دەوری ماڵی خوای پەروەردگارە (وَسُمِّيت مَكَّةُ بَكَّةَ لأنَّهَا تَدُقُّ أَعْنَاقَ الْجَبَابِرَة) واتە: مەککە بۆیە ناوی لێنراوە بەککە، چونکە هەر ستەمکارێك ویستبێتی بیڕووخێنێو ستەم بکات، خوای زاڵ ملی شکاندوە، وەك ئەبرەهەو سوپایەکەی کە لە مێژوودا بەسەرهاتەکەیان زانراوە.

(مُبَارَكًا ): (مبارك) واتە: بەپێز، سەر بە خێر (البَرَكَةُ: ثُبُوتُ الْخَيْرُ الإلهي) (بَرَكَةُ) بریتیە لە چەسپاندنی خێرو چاکەی خوا (البِرْكَةُ: مَحْبَسُ الماءِ)، (بِرْكَةُ) بە گۆمێك دەڵێن کە ئاوی تێدا حەپس کرابێو تێیدا

قـەتیس مابـێ، چـونکە لەوێـدا ماوەتـەوە کەواتـە: (بَرَكَـةُ) بەمانـای خێـرو پـێزی خـوایی دێ.

(حِجٌّ): (الحَـجّ والحِـجّ) هەردووکیـان یـەك مانـان (أَصْلُ الْحِـجِّ القَـصْدُ لِلزِّيـارَةِ) واتە: لە ڕیشـەدا وشـەی (حِجّ) بـە مەبەسـتی سـەردان دێ (وَخُـصَّ فـي تَعَارُفِ الشَّرْعِ بِقَصْدِ بَيْتِ اللهِ إِقَامَةً لِلنُّسُك) مانـای هـەردوو وشــەی (حَـجّ وحِـجّ) لــە زاراوی شــەرعدا بریتیـە لـە مەبەسـتی هـەبوونی ســەردانی مـاڵی خــوای بــەرز، بـۆ خــواپەرستیی لەبـەر ئـەوەی کـە حــەج کۆمـەڵێك خـواپەرســتیی دەگرێتە خـۆی.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١/ هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتە موبارەکەی کـە دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، ئەم بەسـەرهاتە هەیە: (عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنْ الأَنْصَارِ أَسْلَمَ، ثُمَّ ارْتَدَّ وَلَحِقَ بِالْمُشرِكِينَ ثُمَّ نَدِمَ وأَرْسَلَ إِلَى قَوْمِهِ سَلُوا لِي رَسولَ اللَّهِ ﷺ هَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَجَاءَ قَوْمُهُ إِلَى رَسولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: إِنَّ فُلاَنًا قَدْ نَدِمَ وَإِنَّهُ أَمَرَنَا أَنْ نَسْأَلَكَ هَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ... ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ ... فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِ قَومُهُ فَأَسْلَمَ،) أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ بِرقم: (٤٠٦٨)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤٤٧٧)، وَالحَاكِمُ بِرقم: (٢٦٢٨) وَصَحَّحَهُ، وَوَافَقَهُ الذَّهبيّ وَالبَيْهَقِيُّ، وَقَالَ الشَيخ الألباني: صحيح الإسناد، واتـە: عەبدوڵــڵای کـوڕی عەببــاس خــوا لــە خــۆی و بــابی ڕازی بــێ دەڵــێ: پیــاوێك لـە ئەنـصارییەکان (واتـە: پـشتیوانەکانی مەدینــە) مــسوڵمان بــوو، دوایــی هەڵگــەڕایەوەو، وە پەیوەسـت بـوو بـە هـاوبەش بـۆ خــوا دانەرانــەوە،

دوایـی پەشێمان بۆوەو، وەڵامی نارد بۆ خزمو خەڵكەكـەی خۆی، گـوتی: وەڵام بنێـرن بـۆ لای پـێغەمبەری خـوا ﷺ ئایـا بگـەڕێمەوەو پەشـێمان ببمـەوە، (خـوا) تۆبـەم لـێ قبـووڵ دەكـات؟ خـزمو خەڵـكەكەی هـاتن بـۆ خزمـەت پـێغەمبەری خـوا ﷺ گوتیـان: فـلان كـەس پەشـێمان بۆتـەوەو داوای لێـكردووین وەڵامت بۆ بنێرین: ئایـا پەشـێمان بوونـەوەو تۆبـەی بـۆ هەیـە؟ خـوای بەرزو مـەزن ئەم ئایەتانـەی نـاردە خـوار كـە دەفـەرمویٚ: هەركەسێك لـە ئیسـلام هەڵگەڕاوەیە، بەڵام دووبـارە پەشـێمان بـۆوەو گەڕایـەوە بـۆ باوەشـی پـڕ سـۆزو بـەزەیی دینـی خـوا، ئـەوە خـوا تۆبـەی لـێ قبـووڵ دەكـات، دەڵـێ: دوایـی قەومەكـەی وەڵامیـان بـۆ نـارد، ئـەویش هاتـەوەو مسـوڵمان بـوو (واتـە: دووبارە مسـوڵمان بۆوە).

ئنجـا زانایـانی (أصـول الفقـه) گوتوویانـە: (إِنَّ خُصُوصَ السَبَبِ لا يَمْنَعُ شُمُولَ الْمَعْنَى) واتـە: تایبەتمەنـدبوونی هۆكـاری هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتێك نابێتـە هـۆی ئـەوە كە ڕێبگـرێ لـە گشتگیـریی بـوونی ماناكەی، كەواتـە: ئـەم ئایەتـە كـە دەربـارەی هاوەڵـێك بـووە كـە لـە ئیسـلام هەڵـگەڕاوەتەوەو دوایـی دووبارە مسوڵمان بۆتەوە، هاتۆتە خـوارێ، بـەڵام وەنەبـێ هـەر تایبـەت بـێ بـە ئەوەوە، بەڵكو هەركەسێكی دیكە لە ئیسـلام هەڵـگەڕێتەوەو دوایـی پەشـێمان ببێتـەوەو بێتـەوە نێو ئیسـلام، ئەوە مانای وایـە ئەم ئایەتـانە دەیگـرنەوە.

٢/ هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەكـە كـە دەفـەرموێ: ﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۗ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾، لـەوبارەوە ئـەم دوو بەسـەرهاتە گێڕدراوەنەوە:

أ- {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ قَالَ: أَن اليَهُودَ قَالُوا: لِلْنَّبِيِّ ﷺ فَأَخْبِرْنَا عَمَّا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ؟ قَالَ: (كَانَ يَسْكُنُ البَدْو، فَاشْتَكَى عِرْقَ النَّسَا، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا يُلاَئِمُهُ إِلاّ لُحُومَ الإِبِلِ، وَأَلْبَانَهَا فَلِذَلِكَ حَرَّمَهَا)، قَالُوا:

صَـدَقْتَ} رَوَاهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٤٨٣)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣١١٧) وَقَـالَ: هَـذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيـبٌ، وَالنَّسَائيُّ فـي (الكُبرى) بـرقم: (٩٠٧٢)، وَالطَّبَـرِي مِـن وَجـهٍ آخـر،[1] وَصَـحَّحَهُ الألبـاني فـي (السلسلة الصحيحة) بـرقم: (١٨٧٢) واتــه: عەبدوڵـڵای کـوڕی عـەبباس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ دەڵـێ: جوولەکـەکان بـە پێغـەمبەری خـوا ﷺ یـان گوتـوە: ئایـا ئـەو خۆراکـەی ئیـسرائیل (واتـە: یەعـقووب) لەسـەر خـۆی قەدەغــە کـرد چـی بـوو؟ پێغـەمبەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ئیـسرائیل (واتـە: یەعقـووب) لـە بیـابان، (یـان لـە دەشـت) دادەنیـشت، وە تووشـی نەخۆشـیی (عِرْقَ النَّسَـا)، بـوو (کـە دەمارێکـە لـە کۆڵـمتی ئینـسانەوە کـە لـە دیـوی پـشتەوە دێ تـا لای ڕان، ئێـستاش ئـەو نەخۆشـییە هەیـە، وە ئـازارێکی زۆری هەیـە، ئنجـا دەڵـێ:) یەعقووب بیـری کردەوە چ خواردنێکی زۆر پـێخۆشـە، تەماشای کـرد گۆشـتی حوشتـرو شیـری حوشتـرە، گوتی:) خـوایە لەسـەرم نـەزر بـێ کـە مـن لـە گۆشتی حوشتـرو لە شیـری حوشتـر نەخۆم (شـیفام بـدەی) ئەوانـەی لـەخۆی قەدەغـە کـرد، (ئەگـەرنا خـوا لێـی قەدەغـە نـەکردبوو کـە نەیخـوا، بەڵکـو نـەزری کردبـوو، خـوای شیفابەخـشیش شـیفای بـۆ نـارد) جوولەکەکـان گوتیـان: ڕاسـت دەکەی وابـوو.

ب– ئـەم بەسـەرهاتەش هـەیە کـە دەڵـێ: جوولەکـەکان گوتیـان: ئـەی مسـوڵمانینە! ئێـوە بۆچی گۆشـتی حوشتـرو شیـری حوشتـر دەخۆن، کـە خوا لـێی قەدەغە کردوون؟! خواش ئەم ئایەتـەی نـاردە خـوارێ، کە نـەخێر خوا گۆشـتی حوشتـرو شیـری حوشتـری لـە کـەس قەدەغـە نەکـردوە، ئـەوە یەعـقووب ﷺ بـووە کـە لەسـەرخۆی قەدەغـە کـردوە، ئـەویش وەك نـەزر کـردن، بۆ ئەوەی کە خـوای شـیفادەر لەو نەخۆشـییە چاکی بکاتەوە، واتە: لـە ئەسـڵـدا ئەوانـە قەدەغـەنین، بۆیـە مـسـوڵمانان ئەگـەر گۆشـتی حوشتـرو شیـری حوشتـر بەکاربێنن، هیچ ناشەرعییەکیان نەکردوە.

---

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٤٦٦).

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، واتە: (لە کۆتایی ئەو وتووێژەدا ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ پێیان بڵێ: ئێمە ئیمانمان هێنا بە خوا، وە بەوەی بۆ سەرمان دابەزێنراوە (کە قورئانە)، وە بەوەی کە دابەزێنراوەتە سەر ئیبراهیم (واتە: صحف)ە، وە بەوەی کە دابەزێنراوەتە سەر ئیسماعیل (کە خوای بەرز ناوی نەهێناوە چ کتێبێك بووە، چ پەیامێك بووە؟) وە بۆ سەر ئیسحاق وە بۆ سەر یەعقووب، وە بۆ سەر (أسباط) (واتە: نەوەکانی یەعقووب ئەوانەیان کە پێغەمبەر بوونو وەحییان بۆ هاتوە)، وە ئەوەی کە دراوە بە مووسا (کە تەوراتە)و عیسا (کە ئینجیلە)، وە ئەو کتێبو بەرنامانەی کە بە هەموو پێغەمبەران دراون، لە پەروەردگاریانەوە، ئیمانمان بە هەموویان هێنا ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کامێکیان، وە ئێمە بۆ خوا ملکەچین، کەواتە: ئەوە دینی ئێمەیە ئەی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، ئەی خاوەن کتێبەکان ! ئێمە ئیمانمان هێناوە بە خوا ﷻ وە بە هەر کتێبێك کە خوا ناردوویەتی، وە بە هەر پێغەمبەرێك کە خوا ڕەوانەی کردوە.

من لە زیندانی ئەمریکییەکان، جارجار لەگەڵ ئەمریکییەکان وتووێژی فیکرییمان دەبوو، جا هەیانبوو جوولەکە بوو، هەیانبوو نەصرانیی بوو، دەیانگوت: ئەگەر ئێوە ببن بە جوولەکە یان ببن بە نەصرانیی چییە، خۆ تەوراتو ئینجیلیش کتێبی خوان، چ فەرقیان هەیە لەگەڵ قورئان؟! ئێمە بڕوامان بە قورئان نیە، بەڵام خۆ ئێوە بڕواتان بە تەوراتو ئینجیلیش هەیە، کەواتە: ئێمە ئەگەر ئیمانیش بە قورئان بێنین بۆمان باش نیە، چونکە

ئیمانمان پێی نیە کە خوا ناردوویەتی، بەڵام ئێوە ئیمانتان بەوە هەیە کە تەوراتو ئینجیل خوا ناردوونی، منیش پێم دەگوتن: ئەگەر ئێمە ببینە جوولەکە یان ببینە نەصرانیی بەرەو دوا دەگەڕێینەوە!! دەیانگوت: چۆن؟! دەمگوت: چونکە تەورات سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا دابەزێنراوە، ئینجیلیش نیزیکەی دوو هەزار ساڵ زیاتر لەمەو پێش دابەزێنراوە، هەرچەندە ئەو تەوراتو ئینجیلەی کە خوا دایبەزاندوون غەیری تەوراتو ئینجیلی بەردەستی ئێوەن، ئەوەی ئێوە وەك حیکایەتی بەر ئاگردانێیە، سەد هەڵەو ئەفسانەیان تێدایەو، بە دڵنیاییی ئەوەنین کە خوا ناردوونی، ئەگەرنا ئێمە بڕوامان بە تەوراتو ئینجیلی ڕاستەقینەی مووساو عیسا هەیە، بەڵام ئەگەر ئیمان بێنن بەو تەوراتو ئینجیلەی لەبەر دەستی ئێوە دانو ببینە شوێنکەوتووی ئەو جوولەکایەتییو نەصرانییەتەی ئێوە، ئەوە ئێمە گەڕاوینەوە بۆ دواوە ! بەڵام ئەگەر ئێوە ببنە مسوڵمان بەرەو پێش دێن، دەیانگوت: چۆن؟ دەمگوت: چونکە قورئان لە دوای تەوراتو ئینجیلی ئێوە هاتوە، بۆیە ئێوە بەرەو پێش دەچن، پاشان کەسێك کە ئیمان بە ئیسلام دێنێ، جوولەکایەتییو نەصرانییەتیی خۆی لە دەست نادات، ئیمان بە تەوراتو ئینجیلو مووساو عیسا لەدەست نادات، بۆچی؟ چونکە مسوڵمان بوون لەسەرت پێویست دەکات، کە بڕوات بە هەموو پێغەمبەران بێو لە نێوانیاندا مووساو عیسا (علیهما السلام) وە بڕوات بە هەموو کتێبەکانی خوابێ، لە نێوانیاندا تەوراتو ئینجیل، بەڵام ئێوە کە دەبنە جوولەکە، بڕواتان نەك بە قورئان، بەڵکو بە ئینجیلو عیساش نیە، وە نەصرانیی یەکانیش بڕوایان بە موحەممەد ﷺ نیە، کەواتە: ئەگەر ئینسان مسوڵمان بێ، بڕوای بە هەموو پێغەمبەرانی خوا هەیە، وە بڕوای بە هەموو کتێبەکانی خواش هەیە، وە جیاوازییشیان ناخاتە نێوان، وە ڕێزی هەمووانیش دەگرێ، وە هەر ئەوەش دینی تەواوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، وە هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، لێی

قبوولْ ناکرێو لە دوارۆژیشدا لە زیانبارانە، واتە: ئیسلامێك کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە، ئەوە واتایەکیەتی، یاخود غەیری ملکەچبوون بۆ خوا بە ڕەهایی، چونکە ئیسلام وەك چۆن واتایەکی عورفیی هەیە بۆ ئێمە، کە بریتیە لەو دینەی کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە، واتایەکی دیکەشی هەیە کە بریتیە لە ملکەچیی بۆ خوا، جا جوولەکەیەك، نەصرانییەك، یەزیدییەك، مەجووسییەك، صابیئەیەك...هتد بۆی هەیە بڵێ: منیش ملکەچم بۆ خوا، دەڵێین: نەخێر، ئەگەر ملکەچبی بۆ خوا، دەبێ بڕوات بە هەموو کتێبەکانی خوا هەبێ، وە بڕوات بە هەموو پێغەمبەرانی خوا هەبێ، بە تایبەتی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کە سەروەری هەموو پێغەمبەرانە، وە بەڕاستدانەری هەموویانە، وە بە تایبەتی قورئان کە چاودێرە بەسەر هەموو کتێبەکانەوە، وە خوای بەرز پاراستوویەتی، ئێمە کتێبێکی سەلامەتمان لە بەردەستدانیە، کە بزانینو دڵنیابین کتێبی خوایە جگە لە قورئان، واتە: هەر کەسێك بڕوا بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ نەهێنێ، وە ئیمان بە قورئان نەهێنێ، ناتوانێ بڵێ: بۆ خوا ملکەچم، جا خوا دەفەرموێ: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، لێی قبوولْ ناکرێ، وە لە دوارۆژیشدا لە زیانبارانە، جگە لە ئیسلام جا هەر بەرنامەیەك لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتبێ، لە ڕۆژئاواوە هاتبێ، هەموو ئەو بیردۆزە ئیزمدارانەی وەك: مارکسیزم، لینینیزم، سیکۆلاریزم، لیبراڵیزم، کاپیتالیزم، سۆسیالیزم، ... هتد، هەموو ئەوانە لە ڕاستیدا دینن، بەرنامەن، وە تەنیا بەرنامەیەك لای خوا قبوولْبێ، ئیسلامە، پاشان خوا ﷻ بەبۆنەی هەڵگەڕانەوەی یەکێك یاخود زیاتر لە مسوڵمانان لە ئیسلام، کە پاشان هەیانبووە پەشێمان بۆتەوەو گەڕاوەتەوە، هەشیانبووە کە لە ئاخرو ئۆخری سەرەمەرگدا تۆبەی کردوە، وە هەشیانبووە تۆبەی نەکردوەو بە کافریی مردوە، واتە: باسی سێ جۆرە کەسمان بۆ دەکات لەم ئایەتانەدا:

**جـــۆری یەكـــەم:** دەفـــەرموێ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، چـۆن خـــوا ڕێنمـــایی كەســـانێك دەكـــات كـــە دوای ئـــەوەی ئیمانیـــان هێنـــاوە، كـافربوونەتەوە، وە شـایەدییان داوە كـە پـێغەمبەر هەقـەو ڕاسـتە، وە بەڵـگە ڕوونو ئاشـكراكـانیان بـۆ هـاتوون؟! وە خـوا ڕێنمـایی كەسـانی سـتەمكار ناكـات، ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾، ئەوانـــــە سـزایان ئەوەیـە كـە نـەفرینی خـواو نـەفرینی فریـشتەكانو نـەفرینی تێكـڕای خەڵـــكیان لەســـەرە ﴿ خَـٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾، وە بە هەمیشەیی دەمێننەوەو لە لەعنەتی خوادا، یاخود لـە شـوێنێك كـە جێگـای لەعنــەتی خــوایە كــە ئاگــری دۆزەخــە، ســزایان لەســـەر ســـووك نـــاكرێ، وە مۆڵـەتیش نـادرێن (دواش نـاخرێن) ئنجا ئایـا هـەموویا وان؟ بەڵـێ، جگـە لـە: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، جگـــە لەوانـــەی دوای ئـەوە، گەڕاونـەوەو پەشـێمان بوونەتـەوەو چاكەكارییـشیان كـردوە، ئـەوە بێگومـان بـۆ ئەوانـە خـوا لێبـوردەی بـە بەزەییـە، ئـەوە جـۆری یەكـەمیان كـە مسولْمان بوون، دوایـی كـافر بوونەتـەوە، دوایـی دووبـارە مـسوڵمان بوونەتـەوەو چاكەكارییـشیان كردۆتـە پیـشە، ئەوانـە، ئـەوە خـوای پەروەردگـار لەگـەڵیان لـێبوردەی بە بەزەیـی یە.

**جـــۆری دووەم:** دەفـــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴾، بێگومـان ئەوانـەی كـە دوای ئـەوەی ئیمانیان هێنـاوە، كافر بوونەتـەوەو دوایـی لـە كوفر زیادیـان كـردوەو بـەردەوام هـەر لـە كـوفردا ڕۆچـوون، ئەوانـە پەشـێمان بوونـەوەیان لـێ قبـووڵ نـاكرێ، ئـا ئەوانـەن ڕێ لـێ تێكـچووانو سـەرگەردانان، یـانی چـی؟ یـانی: ئـەوانە تۆبـە ناكـەن مەگەر كاتێك كە نائومێد دەبن لە ژیـان لـە سەرەمەرگـدا، لـەو كاتەشدا

تۆبە قبوول ناكرێ، واتایەكی دیكەشی هەیە ئەوەیە كە ئەوانە تۆبە دەكەن لە گوناهەكانیان، واتە: كابرا جوولەكەیە تۆبە دەكات لە گوناهەكەی كە كردوویەتی، بەڵام خوا تۆبەكەی لێ قبوول ناكات، چونكە لە ئەسڵی گوناهەكان كە كوفرەكەیەتی، تۆبەی نەكردوە، واتایەكی دیكەشی هەیە كە ئەوانە خوای پەروەردگار یارمەتییان نادات تۆبە بكەن، واتە: تۆبەیەك ناكەن لێیان قبوول بكرێ، یاخود تۆبەكەیان تۆبەیەكی بێ نێوەرۆكە، دیارە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم ئایەتە موبارەكە.

**جۆری سێیەم:** دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾، بێگومان ئەوانەی كافر بوونو بە كافرییش مردوون، ئەگەر پڕی زەمینیش زێڕ بكەنە قەرەبووو بەلاگێڕەوە (فدیة)، لێیان وەرناگیرێ، ئا ئەوانە ئازارێكی بە ئێشیان هەیە، وە هیچ یاریدەدەرێكیشیان نیە.

كەواتە: یەكیان كافرەو دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، یەكیان لە كاتێكدا تۆبە دەكات كە كاتی وەرگیرانو قبوول بوونی تۆبە نیە، ئەوەی سێیەمیان هەر تۆبە ناكاو بە كافریی دەمرێ، ئنجا خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴾، ناگەنە پلەی چاكەكاریی تاكو چ شتێكتان زۆر خۆشدەوێ لێی نەبەخشن، وە هەر شتێكیش ببەخشن بێگومان خوا پێی زانایە، بەڕاستی ئەوە سەنگی مەحەكە شتێك كە زۆرت خۆشبوێ لێی ببەخشی، بەڵام شتێك كە لێت زیادە، بەخشینی زۆر هونەرو ئازایەتیی نیە، كە دوایی زیاتر ڕوونی دەكەینەوە، ئنجا خوای زاناو شارەزا دێتە سەر بەرپەرچدانەوەی دوو قسەی جوولەكەو نەصرانیی یەكان، یەكیان دەربارەی خواردن، ئەویدیكەیان دەربارەی ڕووگە

(قبلــة)، دەفــەرموێ: ﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، هـەموو خۆراکێـك حـەڵاڵ بـوو بـۆ وەچـەی ئیـسرائیل جگـە لـەوەی ئیـسرائیل (واتـە: یـەعقووب) لەسـەر خـۆی قەدەغـەی کـرد، پـێش ئـەوەی تـەورات بێتـە خـوارێ، (دەفەرموێ:) بڵـێ: تـەورات بێـنن‌و بیخوێننـەوە ئەگەر ڕاسـت دەکـەن (داخـۆ وایــە یـان نـا؟!) واتـە: یەعقــووب بۆخـۆی گۆشــتی حوشتــرو شیــری حوشتــری لەسـەر خـۆی قەدەغـە کـردوە، نـەك خـوای پـەروەردگار قەدەغـەی کردبێ، تاکو ئێستا لەبـەر ئـەوەی مـسوڵمانان گۆشـتی حوشتـر دەخـۆن‌و شیـری حوشتـر بەکاردێنـن، جوولەکەو نەصـرانیی یـەکان ڕەخنـەیان لێبگـرن‌و بڵێن: ئێـوە شتێکی قەدەغەکـراو دەخـۆن، کـە لـە شـەریعەتی خـوادا قـەدەغە کــراوە، نـەء خــوا قەدەغـەی نـەکردبوو، بەڵـکو یـەعقووب وەك نـەزر لەسـەر خـۆی قەدەغــەی کردبـــوو ﴿ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، هەرکەســێك دوای ئـەوە درۆ بکــات بـە نـاوی خــواوە، ئـا ئەوانـە ستـەمکـــارن، ﴿ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، بڵـێ: خـوا ڕاسـت دەکـات، کەواتە: شـوێن ڕێبـازی ئیبـراهیم بکـەون بـە پاکـیی‌و ساغیی، وە ئیبــراهیم لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران نەبـوو، ئنجـا دێتـە سـەر باســی بەرپەرچــدانەوەی قــسەی دووەمیـــان، ئــەوان دەیانگـــوت: بۆچــی ڕووناکەیــە (بیـت المقدس) کـە مزگـەوتی ئەقـصا (بیـت الأقصى)ی لێیـەو ئەوێش هـەر قیبلـەیەو ئـەوێش مـاڵی خـوایە، خـوا ﷻ لـە وەڵامـی ئـەوەدا کـە بۆچــی مـاڵی خـۆی کـە لـە مەککەیـە ئـەوێی کـردوە بـە ڕووگـە بـۆ ئۆمـمـەتی موحەممـەد ﷺ، دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ ﴾، یەکـەمین ماڵێــك بــۆ خــەڵك کــە لەســەر زەوی دانــدرا، (واتــە: یەکــەمین ماڵێــك بــۆ خــواپەرستیی) ئـەو ماڵەیــە کـە لـە بەککەیـە (واتـە: مەکـکە) ﴿ مُبَارَكًا وَهُدًى

﴿لِّلْعَٰلَمِينَ﴾، خێرداره پڕ پیتو پیرۆزەو مایەی ڕێنمایی یە بۆ جیهانییان، واتە: بۆیە خوای کاربەجێ کردوویەتی بە ڕووگە (قبلة)ی مسوڵمانان، چونکە یەکەمین ماڵێکی خوا لەسەر زەوی دانرا بۆ خواپەرستیی، ئەو کەعبەیە بوو، ﴿فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٌ﴾، چەند نیشانەی ئاشکرای تێدان: ﴿مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾، یەکێك لەو نیشانانە شوێنی وەستانی ئیبراهیمە عليه السلام ئەو بەردەی کە ئیبراهیم عليه السلام لەسەری وەستاوە بۆ ئەوەی دیواری کەعبەی لەسەر دابنێ و، وەك هەویر هەردوو پێیەکانی پێدا چوونە خوار، ئێستاش شوێن پێیەکانی لێماون، کە لە مەککەدا قەفەزێکی زێڕیان بۆ دروستکردوە، وە کاتی خۆی بە دیواری کەعبەوە نووسابوو، بەڵام عومەری کوڕی خەتتاب - خوا لێی ڕازی بێ-، لەوێی دوورخستەوە، بۆ ئەوەی ڕێ لە طەوافی خەڵك نەگرێ، ئەوە یەکێکە لەو نیشانانەی کە لە مزگەوتی حەرامدا هەن، بەڵام چەندان نیشانەی دیکەشی تێدا هەن وەك: صەفاو مەروەو ئاوی زەمزەمو... هتد، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾، هەرکەسێك بچێتە ئەو ماڵەی خواوە، هێمنیی و ئاسایشیی هەیەو دڵنیا دەبێ، جا لە سەردەمی نەفامییشدا وابووە، دەڵێن: ئەگەر یەکێك کەسێك بابی کوشتبایە، چووبایە مزگەوتی حەرامەوە، کەس بۆی نەبوو دەستی لێبداتو دەیانگوت: تازە چۆتە ماڵی خوا، کەواتە: لە سەردەمی نەفامییشدا ئەو ماڵی خوایە حورمەتو ڕێزی خۆی هەر هەبووەو، هەموو کەسێکی تێدا پەنادراوە ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾، وە بۆ خوا هەیە لەسەر خەڵك زیارەتو سەردانی ئەو ماڵەی، بۆ کەسێك کە بتوانێ بیگاتێو ئیمکانیەتی هەبێ، کە دوایی بە تەفصیلْ باسی دەکەین ئەوە چۆنە؟ ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، هەر کەسێکیش بێبڕوابێ، بێگومان خوا لە جیهانییان بێنیازە، ئەوە کە خوا بە خەڵك دەفەرموێ: ئیمان بێنن، بۆ ئەوەیە کە خۆیان لە ئیمانی خۆیان بەهرەمەندبن، وە بۆیەش دەفەرموێ:

ئیمان بێنن، چونکە خوا بەندەکانی خۆی خۆشدەوێ، ئەگەرنا بە کافر بوون، هەر بۆ خۆیان لە کوفرەکەیان زەرەرمەندنو خوای بە بەزەییو بەخشندە، بێنیازە لە خەڵكو نە سوود لە ئیمانیان دەکات، وە نە زەرەر لە کوفریان دەکات، هەر بۆخۆیان لە ئیمانیان بەهرەمەندنو، لە کوفریشیان زەرەرمەندن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾، کە پێشتر تەفسیرمان کرد، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ وە ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی، کراوەو گشتگیرن بە ڕووی سەرجەم کتێبەکانی خوا، وە بە ڕووی سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)وەو، بەبێ جیاوازیی بڕوا بە هەموویان دێنن، وە ڕێز لە هەموویان دەگرن، وە جیاوازیی ناخەنە نێوانیانەوە، لەو ڕووەوە کە هەموویان پێغەمبەری خوان، وە هەموو کتێبەکان کتێبو بەرنامەی خوان، بۆ ڕێنماییو، ڕێکخستنی ژیانی بەشەر نێرراون، ئەوەش تایبەتمەندییەکی ئیسلامە، وە تایبەتمەندییەکی ئەهلی ئیسلامە، چونکە خاوەن کتێبو بەرنامەکانی دیکە، هیچ کامیان وا بە گشتگیریی تەماشای هەموو کتێبەکانی خواو هەموو پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) ناکەن، بەڵکو بڕوا بە هەندێکیان دێنن، وە بڕوا بە هەندێکیان ناهێنن، وە بڕوا بە هەندێکیشیان دیسان بەو شێوەیە نیە کە خوای تاكو پاك دەیەوێ، چونکە لەڕاستیدا جیاوازیی لە نێوان چەند شتێکی یەکسان دا زوڵمە، وەك چۆن یەکسانکردنی چەند شتێکی لە یەکدی جیاوازیش زوڵمە، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) مادام لەو ڕووەوە وەك یەکن، کە پێغەمبەری

خوان، وە كتێبەكانی خوا مادام لەو ڕووەوە وەك یەكن، كە هەموو فەرمایشتی خوان، عەدلو ئینصاف وا دەخوازێ كە جیاوازییان نەخرێتە نێوان، بۆیە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: ئیمانمان بە هەموویان هەیە، چونكە خوا دەفەرموێ: بڵێ: ئێمە ئیمانمان هێنا بە خوا وە بەوەی بۆ سەرمان دابەزێنراوە (كە قورئانە)، وە بەوەی كە دابەزێنراوەتە سەر ئیبراهیمو سەر ئیسماعیل سەر ئیسحاقو سەر یەعقووب، وە سەر (أسباط) (واتە: نەوەكانی یەعقووب) وە بەوەی كە بە مووسا دراوەو، بە عیسا دراوەو بە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دراوە، لەلایەن پەروەردگاریانەوە، ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾، واتە: جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ كامیان لەوەدا كە ئیمانیان پێ بهێنین، ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی ئیسلامو ڕاستیی دوایین نوسخەی هیدایەتی خوا بۆ بەشەر.

__مەسەلەی دووەم:__ كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، واتە: هەر كەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەكی دیكە بخوازێو، بە دوای بەرنامەیەكی دیكەدا بڕوا، ئەوە لێی وەرناگیرێو، لە دواڕۆژیشدا لە زیانبارانە، دیارە مەبەست لە ئیسلام واتە: ئیسلامی بەرجەستە لە قورئانو سوننەتدا، بە مانا عورفییەكەی ئەگەرنا وشەی: (ئیسلام) مانای ڕاستەقینەكەی بریتییە لە ملكەچیی بۆ خوا، یانی: تاكە بەرنامەیەك لە لای خوا قبووڵ بێ، بریتییە لە ملكەچیی بۆ خوا، جا ملكەچیی تەواو بۆ خوا لە چیدا دێتە دی؟ لە بڕواهێنان بە قورئانو بە پێغەمبەری كۆتاییدا، ئەم قورئانەی كە هەموو كتێبەكانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، وە ئەو پێغەمبەرە كۆتاییەی ﷺ كە هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، كەواتە: ملكەچیی تەواوی مرۆڤەكان بۆ خوا، تەنیا كاتێك دێتەدی كە بڕوا بە قورئانو بە موحەممەد ﷺ بێنن، ئەو

قورئـانو موحەممـەدەی کـە هـەموو کتێبـەکانی پـێش خۆیـان، وە هـەموو پـێغـەمبەرانی پێـش خۆیـان بەڕاسـت دەزانـن، جـا ئـایا جوولـەکەیەك، نەصـرانییـەك، مەجووسـییەك، یەزیدییـەك، صـابیئەیەك، بـوذاییـەك، یـان کۆنفۆشیۆسـییەك، یـاخود هـەر خـاوەن کـتێبێکـی دیکـە، ئەگـەر خۆیـان بـە خـاوەن کـتێـب بـزانن‌و خۆیـان بـە خـاوەنی بەرنامەیـەکی ئاسـمانیی بزانـن، ئایـا دەگونجـێ بڕوا بە ئیسلام‌و قورئـان‌و موحەممـەد نەهێنـن‌و بڵـێن: ئێمـە بۆ خـوا ملکـەچین؟ لە وەڵامـدا دەڵـێین: نـەخێر، بۆچـی؟ چونکـە ملکەچیی بـۆ خـوا ئەوەیـە کـە هـەرچـی خـوا فەرموویـەتی وەریبگـری، وە هـەموو ئـەو پـێغـەمبەرانەی کە خـوا نـاردوونی ڕێزیان بگری‌و ئیمانیان پـێبێنی، کەواتە: لە ڕاسـتیدا تەنیـا ئۆممـەتی ئیسـلام دەتـوانن بڵـێن: ئێمـە بـۆ خـوا ملـکـەچین، بـەڵام ئۆممەتـەکانی دی ناتوانـن وابڵـێن: بۆچـی؟ چونکـە ئۆممـەتی ئیسـلام بـڕوا بە هـەموو کتێبـەکانی خـوا دێنن، وە ڕێـز لـە هـەموو پـێغـەمبەرانی خـوا دەگـرن‌و ئیمانیـان بـە هەموویـان هـەیـە، وە جیـاوازیی ناخـەنە نێـوان هـیچ کامیانـەوە، بۆیـەش خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾، واتـە: هـەر کەسـێك جگـە لـە ئیسـلام بەرنامەیـەکی دیکـە بخـوازێ، واتـە: جگـە لـە ملکـەچیی تـەواو کـە خـۆی لـە قبووڵـکردنی قورئـان‌و قبووڵـکردنی موحەممـەد ﷺ دا دەنوێنـێ، ئـەوە لێـی وەرناگیـرێ، لـێرەدا ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێ کـە هـەموو بەرنامەکـان، چ لـە ئەسڵدا هی خـوا بووبن‌و دوایی گـۆڕدرابن، وەك: یەهوودییـەت‌و نەصـرانییەت‌و زەردەشـتایەتیی‌و بـاقی ئەوانـەی کـە خۆیـان بـە خـاوەن بەرنـامەی خـوایی دەزانن، وە چ لە ئەسـڵدا مرۆڤ داینـابن، وەك: هـەموو ئەو بەرنامانـەی کە لـە ڕۆژهـەڵات‌و ڕۆژئـاواوە هـاتوون، یـاخود لـەنێو خـۆدا هەڵدەقووڵـێن‌و، وەك بەرنامـەی ژیـان مامەڵـەیان لەگەڵـدا دەکـرێ، هـەموو ئەوانـە لـە ڕوانگـەی ئیسـلامەوە بـە پـووچ لەقەڵـەم دەدرێـن، لـەو ڕووەوە کـە بکرێنـە بەرنامـەی ژیـان، جـا هـەر لـە سەرمایەداریـی (کاپیتالـیزم)ەوە بیگـرە تـا سۆسـیالیزم‌و

لیبــڕالیزمو ســیکۆلاریزم ... هتــد، هــەموو ئــەو بەرنــامەو ئایدۆلۆژیــاو ڕێبــازانەی کە زادەو هەڵـقوولاوی عەقـڵو ئـەزموونی ئینسانن، بـۆ مـسوڵمانان قەدەغـەیە کە وەك بەرنامەی ژیان تەبەننــی یـان بکـەنو شـوێنیان بکـەون، وە کەسـێك وابکـات لـە دوارۆژدا نابــێ بـە تـەمای ئەوەبــێ کـە خــوا لــێی قبـووڵ بکـاتو پاداشــتی لەسـەر بداتـەوە، لـێرەدا یـەکێك بـۆی هــەیە بڵـێ: باشـە ئـەو بەرنامانە، بۆ وێنـە: سۆسیالیزم کە بـە لای بەرژەوەنـدیی خـەڵكو جـەماوەردا دەشـکێتەوە، یاخود لیبـڕالیزم کە ئازادیی تاکیی تێدا هەیـە، یـان سیکـۆلاریزم کە هـەندێ ئیجابیاتی تێدا هــەیە، هەروەهــا هەرکــام لـەو بەرنــامانەی دیکــە کــە هەنــدێ خــاڵی ئیجــابییو چــاکیان تێــدان، ئایــا ئــەوە مانــای وایــە خــاڵە ئیجابییەکانیشـیان بەکەڵك نایەن؟! لە وەڵامدا دەڵێین: نـەخێر، بـەڵام کۆی ئـەو بەرنامەیـە بـە باطیــڵو پـووچ لەقەڵـەم دەدرێ، بـەڵام ئـەوە مانــای وانیـە کـە هیــچ شــتێکی باشــیان تێــدا نیــە، بۆیــە خــوا ﷻ بــە خــاوەن کتێبـەکــان دەفــــەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ ... ﴿٧١﴾﴾ آل عمــــران، واتـە: ئەی خــاوەن کتێبـینە! بۆچی هـەق تێکەڵی باطیڵ دەکەن، هـەقو ناهـەق تێکـەڵ دەکـەن؟ واتـە: هەقــتان پـێــیە لەگــەڵ کۆمـەڵێك ناهەقیــدا تێکەڵــی دەکـەن، لـە ڕاسـتیدا هـەموو ئـەو بەرنامـانەش هـەقو ناهەقیــان تێدا تێکەڵە، بەڵام هەقی دوور لـە باطیـڵ هەقێکە هیـچ ناهـەقی تێکـەڵ نـەبووبێ، کـە تـەنیا بریتیــە لــە ئیــسلام، ئیــسلامی بەرجەســتە لــە قورئــانو ســوننەتی ڕاســتو تـەواویی پـێغەمبەردا ﷺ، کەواتـە: دەگونجــێ ئـەو بەرنامانـەی دیکە هەنـدێك لایـەنی باشیان تێدابن، وە هەنـدێ لایـەنی هەقیــان تێــدابن، بـەڵام بـە تەئکـید هـەر لایەنێکی باش لـە هـەر بەرنامەیەکـدا هـەبێ، ئـەو لایەنـە بـە شـێوەیەکـی زۆر باشتــر لـە ئیـسلامدا هــەیە، بۆیـە مـسوڵمانان کاتێـك کـە شـوێنی ئیـسلام دەکەون، ئیسـلام بێنیازو بـێ ئیحتیاجیان دەکـات لـە هـەر بەرنامەیـەکی دیکە، کە هەندێك لایەنی چاکەو لایەنی باشی تێدا هەیە، دیارە پـێشـتـریش باسـمان کرد، ئەو بوارانـەی کـە شـەریعەت بـە بۆشـایی (فـراغ، عـفو) بەجـێیهـێشتوونو

نوختــەی تێـدا نەخـستوونە سـەر پیت، وەك بوارەكـانی حـوكمو سـیاسـەتو ئیـدارەو ئـابووریی و ... هتـد، ئـەوە دەسـتی مـسوڵمانان كراوەیـە كـە لـە زادەو بەرهـەمی فیكـرو ئـەزموونی بەشـەر بەهرەمەنـدبن و، لـە چـوارچـێوەی فراوانی شـەریعەتـدا ژیـاون و گوزەرانی خۆیانی پـێ بەهێزو پێـز بكـەن و بـەرەو پێـشی بەرن.

**مەسـەلەی سێیەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، باسـی بابـەتێك دەكات كـە چـەند ئایـەتێكی بـۆ تەرخـان كـردوون ئایەتـەكـانی ژمـارە: (٨٦) تـاكو (٩١)ن، واتـە: شـەش ئایـەت، وە ئـەو شـەش ئایەتـە باسـی سـێ جۆرە ئینسان دەكەن:

جـۆری **یەكـەمیان**: چـوار ئایـەتی یەكـەم لەبارەیانـەوە دەدوێـن كـە خـوا ﷻ دەفـــەرموێ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾، ئـەم چـوار ئایەتـە دەربـارەی جـۆرە كەسـێك دەدوێـن كـە دوای ئـەوەی مـسوڵمان بـووەو، بـۆی دەركـەوتوە، كـە پـێغـەمبەر ﷺ هەقـەو بەڵـگە ڕوون و ئاشـكراكانی بـۆ هـاتوون، لـە ئیـسلام هەڵدەگەڕێتەوە، جا خوا دەفەرموێ: چۆن خـوا ڕێنمـایی كەسـانێك دەكات كـە دوای ئـەوەی ئیمانیـان هێنـاوە، كـافربوونەتەوە، وە شـایەدییان داوە كـە پـێغـەمبەری خـوا هەقـە، وە دوای ئـەوەی بەڵـگە ڕوون و ئاشـكراكانیان بـۆ هـاتوون، وە بێگومـان خـوا ڕێنمـایی كەسـانی سـتەمكار ناكـات، ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ

﴿ جَزَآؤُهُمۡ أَنَّ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةَ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴾، ئەوانە بە نەفرینی خواو فریشتەکانو تێکڕای خەڵکیان لێیەو هەموویان لەعنەتیان لێدەکەن ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾، لەو لەعنەتو نەفرینەدا (یاخود لە سزای ئەو نەفرینەدا لە بەرهەمی ئەو نەفرینو لەعنەتەدا کە بریتیە لە دۆزەخ) بە هەمیشەیی دەمێننەوە، سزایان لەسەر سووك ناکرێ، وە مۆڵەتیشیان نادرێو چاوەڕوانیش ناکرێن، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، مەگەر ئەوانەیان، واتە: ئەوانە جیادەکاتەوە لەو مسوڵمانانەی کە کافربوونەتەوە کە دوایی چی دەکەن؟ دوای ئەوە پەشێمان دەبنەوەو چاکەکارییش دەکەن، ئەوە بێگومان بۆ ئەوانە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، هەموو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەم جۆری یەکەمە خوا لێیان خۆشدەبێ، واتە: کەسێك مسوڵمان بووەو بۆی دەرکەوتوە کە پێغەمبەر ﷺ هەقە، وە ئایەتەکانی خوای بۆ هاتوون، کەچی دوایی کافر بۆتەوە، بەڵام دوایی وەڵامی ناردوە بۆ قەومەکەی کە ئایا ئەگەر دووبارە بێتەوە نێو ئیسلام، خوا تۆبەی لێ قبوول دەکات؟ خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارێ، ئەوانیش وەڵامیان بۆ ناردوەو مسوڵمان بۆتەوە، ئەوە جۆری یەکەمی ئەو کەسانەی کە دوای ئەوەی مسوڵمان بوون، کافر دەبنەوە، بەڵام دوایی پەشێمان دەبنەوەو دووبارە دەگەڕێنەوە نێو ئیسلام، خوا لێیان خۆشدەبێ.

جۆری دووەمیان: کە زۆرترین مشتومڕی لەسەرە لە نێوان توێژەرەوانی قورئاندا ئەوەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴾، بێگومان ئەوانەی کە دوای ئەوەی ئیمانیان هێناوە، بێبڕوا بوونەوە، دوایی لەسەر بێبڕوایی بەردەوام بوونو، لێیان زیاد کردو زیاتر بە بێبڕواییدا چوونە خوار، ئا ئەوانە

تۆبەو پەشێمانبوونەوەیان لێ قبووڵ ناکرێ، ئا ئەوانە گومڕان، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ئەوانە تۆبەیان لێ قبووڵ ناکرێ، کەچی لە چەندان ئایەتی دیکەدا فەرموویەتی هەرکەسێك بگەڕێتەوە تۆبەی لێ قبووڵ دەکرێ، بۆ وێنە: لە ئایەتی (٢٥)ی سووڕەتی (الشورى)دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە گەڕانەوەو پەشێمان بوونەوە لە بەندەکانی وەردەگرێ، وە لە خراپەکانیان دەبوورێ، وە دەزانێ چی دەکەن، کە دیارە لە چەند شوێنی دیکەشدا بەم شێوەیە هاتوە، جا بەڕواڵەت ئەم ئایەتە، لەگەڵ ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ئەوانەی کە دوای ئەوەی ئیمانیان هێناوە بێبڕوا بوونەوە، دوایی لەسەر بێبڕوایی بەردەوام بوونو لێیان زیاد کردو زیاتر بە بێبڕواییدا چوونە خوار، ئا ئەوانە تۆبەو پەشێمان بوونەوەیان لێ قبووڵ ناکرێ، تێکدەگیرێن!! بۆیە توێژەرەوانی قورئان لەوبارەوە کەوتوونەتە ڕاجیاییو مشتومڕەوە، بەم شێوەیە:

١- هەندێکیان دەڵێن: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ﴾، مەبەست پێی جوولەکەکانە، کە کاتی خۆی ئیمانیان هەبووە بە مووسا عليه السلام بەڵام دوایی کە عیسا عليه السلام هاتوە کوفریان پێکردووەو ئیمانیان پێی نەهێنانەوە، کەواتە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ﴾، یانی: (إنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بعِيسَى بَعْدَ إِيْمانِهِمْ) واتە: ئەوانەی کوفریان بە عیسا کرد دوای ئەوەی ئیمانیان بە مووسا عليه السلام هێنابوو، وە بڕوایان پێنەکرد کە پێغەمبەری خوایە، ﴿ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا ﴾، ئنجا دوای ئەوەی کە موحەممەد ﷺ یش هاتوە، کوفرەکەیان زیادی کردووەو ئیمانیان بە موحەممەد ﷺ یش نەهێناوە، واتە: پێشێ ئیمانیان بە عیسا عليه السلام نەهێناوە، دوایی ئیمانیان بە موحەممەد ﷺ یش نەهێناوە، ئا ئەوانە

﴿لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ﴾، خـوا تۆبـەیان لـێ قبـووڵ ناكـات، واتـە: پەشـێمان بوونـەوەیان لـێ قبـووڵ ناكـات لـەو گوناهانـەی كـە دەیكـەن، یـانی: ئـەو جوولەكانـەی كـە ئیمانیـان بـە عیسـاو موحەممـەد (علیهمـا الـصلاة والـسلام) نـەهێناوە، هەرچـەندە لـە گوناهـەكانیان تۆبـە بكـەن، خـوا تۆبەیـان لـێ قبـووڵ ناكـات، بۆچی؟ چونكە خـوا تۆبەی كەسێك قبـووڵ ناكـات، كـە لـە ئەسـڵی گوناهـەكان كـە كوفـرو بێبـڕوایی یـە، تۆبـەی نەكردبێ.

٢- هەنـدێكی دیكـەیان دەڵـێن: كـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ﴾، مەبەسـت پێـی ئـەو كەسـانەیە كـە تۆبەیـەكی ڕووكەشـیی و ڕواڵەتیی دەكـەن، نـەك تۆبەیەكـی ڕاسـتەقینە، بۆیـە خـوا لـێیان قبـووڵ ناكـات.

٣- هەنـدێكی دیكـەیان دەڵـێن: كـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ﴾، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە كاتێـك كـە تۆبـە دەكـەن لـە كـاتی نائومێـدیی دان، لـە سـەرەمەرگ دان، وەك خـوای پـەروەردگار لـە ئایـەتی (١٨)ی سـوورەتی (النـساء)دا فەرموویـەتی: ﴿ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، واتـە: وە تۆبـە بـۆ ئـەو كەسـانە نیـە كـە خراپەكـاریی دەكـەن، هەتـا كـاتێ یەكێكـیان مردنـی لـەلا ئامـادە دەبـێ (واتـە: دەگاتـە حاڵـەتی سـەرەمەرگ و گیـانەڵا) دەڵـێ: ئێستا تۆبە دەكەم، ئەوانە تۆبەیـان لـێ قبـووڵ ناكـرێ، وە ئەوانـەش كـە بـە كـافریی دەمـرن تۆبـەیان لـێ قبـووڵ نـاكرێ، ئـا ئەوانـە ئازارێكـی بەئێشمان بۆ دانـاون.

کەواتە: ئەوانە تۆبەیان لێ قبووڵ ناکرێ، کە کاتێ نائومێدو بێ هیوا دەبن لە ژیانو دەزانن تازە دەمرن، تۆبە دەکەن چونکە پێغەمبەری خواش ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ} (رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٦٤٠٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٣٧)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٥٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٨)، وَالْحَاكِمُ برقم: (٧٦٥٩) وَقَالَ: صَحِيح الإسْنَاد، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، واتە: بێگومان خوا تۆبەو گەڕانەوەی بەندەی خۆی قبووڵ دەکات، مادام ڕووحی نەگەیبێتە گەرووی، (واتە: نەکەوتبێتە حاڵەتی گیان کێشران).

٤– هەندێکی دیکەیان دەڵێن: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ﴾، مەبەست پێی ئەو کەسانەیە کە واز لەو کوفرەی پێشێیان دێنن، بەڵام دەگوازنەوە بۆ کوفرێکی دیکە، بۆ وێنە: جوولەکەن، دەبن بە نەصرانیی، یان نەصرانیین، دەبن بە جوولەکە، یاخود دەبن بە جۆرە کافرێکی دیکە، واتە: تۆبە دەکەن، بەڵام دەگوازنەوە بۆ کوفرێکی دیکە، ئەوانە خوا تۆبەیان لێ قبووڵ ناکات.

وە ئەوەی کە بەلای منەوە زیاتر دێتە عەقڵەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ لێرەدا مەبەستی لەو کەسانەیە کە تۆبە دەکەن، لە کاتێکدا لە ژیان نائومێد بوو ون، واتە: تۆبەیەکی ناچاریی، تۆبەیەك کە لە حاڵەتی گیانەڵادایە، بۆیە خوای دادگەر ئەو جۆرە تۆبەیە قبووڵ ناکات، وەك لە ئایەتی ژمارە (١٨)ی سووڕەتی (النساء)دا فەرموویەتی، ئەوە جۆری دووەمی ئەو کافرانەی کە تۆبە دەکەن، بەڵام تۆبەکەیان لێ قبووڵ ناکرێ !

جۆری سێیەمیان: بریتین لەو کافرانەی کە هەر بە کافریی دەمرن، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾،بێگومان

ئەوانەی کافر بوون وە دوایی بە کافریش مردوون، ئەگەر پڕی زەوی زێڕ بکەنە قەرەبووو بەلاگێڕەوە، لێیان وەرناگیرێ، ئەوانە ئازارێکی بەئێشیان هەیە، وە هیچ یارمەتیدەدەرێکیشیان نیە، ئەوە دیارە کە ئەوەی بە کافریی بمرێ، - ئەگەر گریمان - کە بە دڵنیاییی لە قیامەتێ هیچ کەس هیچ شتێکی نیە، بەلام ئەوە لێرەدا وەك گریمان گوتراوە - ئەوانە پڕی زەوی زێڕیان هەبێو بیانەوێ خۆیان پێ بکڕنەوەو بیکەنە قەرەبووی خۆیان، لێیان وەرناگیرێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَیۡءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِیمٌ﴾، واتە: ناگەنە پلەی چاکەکاریی هەتا لەوەی کە خۆشتان دەوێ نەبەخشن، (چ شتێك زۆرت حەز لێیەتیو، زۆرت خۆشدەوێو، زۆرت دڵ پێوەیە بیبەخشە، ئنجا دەگەیە پلەی چاکەکاریی)، وە هەر شتێکیش خەرج بکەنو ببەخشن خوا پێی زانایە، لەم ئایەتە دەردەکەوێ کە سەنگی مەحەكو تەرازووی چاکەکاریی، بریتیە لە بەخشینی شتی خۆشویستراو، وە بەخشین ئەو بەخشینەیە شتێك ببەخشی کە حەزت لێیەتیو خۆشدەوێو دڵت پێوەیە، چونکە کە شتێك دەبەخشیو پێت هیچ نیە، یاخود لە ماڵێکی زۆر کەمێکی دەبەخشی، ئەوە لەڕاستیدا ئازایەتییو هونەری تێدانیە، ئەوە هونەرە ئینسان شتێك ببەخشێ، کە زۆر دڵی پێوەیەتی، وە بۆ خۆی زۆر پێویستی پێیەتی وشەی: (بِرّ) هەندێکیان ئاوا لێکیانداوەتەوە، واتە: چاکەکاریی، هەندێکیشیان گوتوویانە: مەبەست لە وشەی: (بِرّ) واتە: چوونە بەهەشت، کە بەرهەمی چاکەکاریی یە، واتە: ئێوە بەهەشت وەدەست ناهێنن، تاکو لەوەی کە زۆر حەزتان لێیەتی نەبەخشن، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین کە ئایا هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ چۆن لەو تاقیکردنەوەو ئەزموونە دەرچوونە؟! با تەماشای ئەم دوو فەرمایشتە بکەین:

فەرمایشتی یەکەم: {عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ أَنْصَارِيٍّ بِالْمَدِينَةِ مَالاً، وَكَانَ أَحَبُّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرَحَاءَ، وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْخُلُهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهِ طَيِّبٍ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾، قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾، وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرَحَاءُ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ، أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ حَيْثُ أَرَاكَ الله، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: بَخْ بَخْ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ فِيهَا، إِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَسَّمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ} رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (١٤٦١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٢١٢)، واته: ئەنەسی کوڕی مالیك - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: ئەبو طەڵحە لە هەموو ئەنصارییەکان (پشتیوانەکان) دەوڵەمەندترو ساماندارتر بوو لە مەدینەدا، وە خۆشەویستترین ماڵیشی ئەو باغە بوو کە پێی دەگوترا: بەیرەحاء، کە ڕووبەڕووی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بوو، وە پێغەمبەر ﷺ جارجار دەچووە نێو ئەو باغەوە، ئاوێکی شیرن و خۆشیی تێدابوو لە ئاوەکەی دەخواردەوە، ئەنەس دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾، ئەبو طەڵحە هەڵسا چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا! ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! خوا دەفەرموێ: ناگەنە پلەی چاکەکاریی تاکو لەوەی خۆشتان دەوێ نەبەخشن، وە خۆشەویستترین ماڵی منیش (بەیرەحاء)ە، وە ئەوە من کردم بە خێر لە پێناوی خوادا، دەمەوێ پاداشتەکەیم دەستکەوێ، وە بۆم ببێتە زەخیرە لە لای خوای بەرز، جا ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ چۆنت پێ چاکەو خوا چۆنت پێشان دەدات، تۆ بەو شێوەیە

تەصەڕڕوفی تێدا بکەو بەکاری بێنە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەخ بەخ ! (وەك چۆن لە کوردەواریی دەڵێین: تیاح، واتە: وشەی ئیعجابو سەرسام بوون) ئەوە ماڵو سامانێکی بە قازانجە، ئەوە ماڵو سامانێکی بە قازانجە، کە بەخشیوتە بە خوا، وە من گوێم لە قسەکەت بوو کە گوتت، وە پێم وایە کە بیدەی بە خزمەکانت باشە، ئەبو طەڵحەش گوتی: پێغەمبەری خوا وادەکەم، وە ئەو باغەی دابەشکرد لەنێو خزمەکانی ئەوانەی کە لە پشتدا پێی دەگەنەوە.

فەرمایشتی دووەم: {قَالَ عُمَرَ ﷺ: يَا رَسولَ اللَّهِ ﷺ، لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ هُوَ أَنْفَسُ عِنْدِي مِن سَهْمِي الَّذِي هُوَ بِخَيْبَرَ، فَمَا تَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ: (حَبِّسِ الأَصْلَ وَسَبِّلِ الثَّمَرَة) رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣٩٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٦٠٤)، وَالدَّارقُطنِيُّ برقم: (٤٣٦٢)، واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دوای ئەوەی ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ هیچ سامانو ماڵێکم نیە لەو پشكو بەشەی کە لە خەیبەر پێم بڕاوە، لەلام خۆشەویستتر بێ، جا بە چی فەرمانم پێدەکەی ؟ (واتە: چی لێبکەمو بیدەم بە کێ، بۆ ئەوەی ئەو ئایەتە جێبەجێ بکەم ؟) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەسڵەکەی لە وەقف بکەو بیهێڵەوە، بەڵام بەرهەمەکەی بکە بە خێر، (یانی: هەرکەسێك پێویستی پێ بێ، با میوەکەی بەرێ، بەڵام با ئەسڵەکەی لای خۆت بمێنێتەوەو سەرپەرشتی بکە کە پێی دەگوترێ وەقف).

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۗ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، واتە: هەموو خۆراکێك بۆ وەچەی ئیسرائیل حەڵاڵ بوو مەگەر ئەوەی ئیسرائیل (واتە: یەعقووب) لەسەر خۆی قەدەغەکردبێ، پێش

ئـەوەی تـەورات بێتـە خـوارێ، بەپێـی سـیاقی ئایەتـەکان دەردەکـەوێ کـە جوولەکـەکان ڕەخنـەیان لـە پێغـەمبەری خـوا ﷺو مـسولّمانان گرتـوە، کـە بۆچی ئەو خواردنانە دەخۆن، کە بە ڕای زۆربـەی توێـژەرەوان بریتـی بـووە لـە گۆشتی حوشتـرو شیـری حوشتـر ؟ هەندێکـیش دەڵێن: هەنـدێ خـواردنی دیکـە بـوون، گوتوویانـە: ئـەوە چـۆن ئێـوە ئەوانـە دەخـۆن، خـۆ ئەوانـە قەدەغـەن؟! دیـارە لـەلای ئـەوان قەدەغـە بـوون، ئـەوانیش پێـیان وابـووە هـەرچی لـەلای وان قەدەغـەبێ، ئـەوە لـە هـەموو کتێبـەکانی خـوای بـەرزدا قـەدەغـە کـراوە، دیـارە پێـغەمبەری خـوا ﷺو مـسولّمانانیش گوتوویـانە: ئـەوانە قەدەغـەنین لە ئەسڵـدا، بەڵـکو کاتی خۆی یەعقـووب ؑ ئـەو جۆرە خـواردنەی لەسـەر خـۆی قەدەغـە کـردوە، وەك: نـەزر، کـە ئەگـەر خـوای میـهرەبان شیفای نەخۆشییەکەی بدات، ئەوە ئـەو خـواردنە لـە خۆی قەدەغە دەکـات، یـان دوای ئـەوەی کـە خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ ﴾النساء، واتـە: بـەهۆی ستەمـکردنی ئەوانـەی جوولەکـە بـوون هەنـدێك خـواردنی خـۆش و بەلـەززەت کـە حـەڵاڵ بـوون، لێمـان قەدەغـە کـردن، دیـارە جوولـەکەکان نکووڵـییان کـردوەو گوتوویـانە: نـەخێر هـیچ زوڵممـان نـەکردوە، وە هـیچ شتێکمان بە زوڵم و خراپە لـێ قەدەغـە نـەکراوە، بۆیـە خـوای زانـاو شـارەزا کـە دەفـەرموێ: بـا، کـاتی خـۆی یەعقـووب ئـەو شـتانەی لەسـەر خـۆی قەدەغـە کـردبوون، وە خۆشـتان بەهـۆی هـەندێ گونـاح و زوڵمـەوە، هـەندێ شـتتـان لـێ قەدەغـە کرابـوو، دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، بڵـێ: تـەورات بێـنن بیخوێننـەوە، ئەگـەر ڕاست دەکـەن، کـە هـەم باسـی یەعقـووبی تێدایـە، کـە تووشـی نەخۆشـی (عِـرْقُ النَّسَـا) بـووە، وە گوتوویـەتی: خـوایە ئەگـەر شـیفام بـدەی چ شـتێکم زۆر پێـخۆشـە لـە خـۆمی قەدەغە دەکەم، کە گۆشـتی حوشتـرو شیـری حوشتـرە، وە هەم باسی ئەوەشی

تێدایە کە بەهۆی سەرپێچیی‌و لاملیی‌و ئەو هەڵەو گوناهانەوە، کە خوا لە سوورەتی (النساء)دا ئاماژەی پێکردوون، کۆمەڵێك شتی لە جوولەکەکان قەدەغە کردوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ صَدَقَ اللَّهُ فَاتَّبِعُوا مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾، واتە: خوا ڕاست دەفەرموێ، بە دوای ڕێبازی ئیبراهیم بکەون بە ساغیی‌و بە پاکیی، وە ئیبراهیم لە هاوبەش دانەران نەبوو، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە دینداریی ڕاست ئەوەیە، کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ دەیکات، بۆچی؟ چونکە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لەسەر ڕێبازی ئیبراهیم بووە، ئیبراهیمیش هەموو خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان‌و خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان ڕێزی دەگرن، جوولەکە، نەصرانیی، صابیئە... هتد، هیچ خاوەن بەرنامەیەکی ئاسمانیی نیە کە ڕێز لە ئیبراهیم نەگرێ‌و بە پێشەوای خۆی نەزانێ، وە لەنێو هەموو خاوەن بەرنامەکاندا کۆدەنگیی (اتفاق)ی لەسەرە، جا ئایا کێ بەڕاستیی بە دوای ئیبراهیم ﷺ دەکەوێ؟ دیارە موحەممەد ﷺ، کەواتە: ئەگەر ئێوەش ڕاست دەکەن، بە دوای پێغەمبەری کۆتایی بکەون‌و ئیمانی پێبێنن، چونکە لەڕاستییدا هەر ئەو بەڕاستیی بە دوای ڕاستە شەقامو ڕێبازێك دەکەوێ، کە ئیبراهیم ﷺ لەسەری بووە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴾، بەپێی سیاقی ئایەتەکە دەردەکەوێ کە لەسەر ڕووگە (قبلة) مشتومڕیان بووە، لەوبارەوە کە کامیان پێشتر بنیاتنراوە، دروستکراوە؟! چونکە خوا دەفەرموێ: یەکەمین ماڵێك بۆ خەڵکی لەسەر زەوی دانراوە، واتە: وەك پەرستگا کە خەڵك خواپەرستیی تێدا بکات، ئەو ماڵەیە کە لە مەککەیە کە خێردارو پڕ پیت‌و پێزە، وە مایەی ڕێنمایی یە بۆ جیهانییان، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: {عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ قُلْتُ:

يَا رَسولَ اللَّهِ! أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: (الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ)، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (الْمَسْجِدُ الأَقْصَى)، قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: (أَرْبَعُونَ سَنَةً)} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢١٣٧١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٣٦٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١١٦٢)، والنَّسائي برقم: (٦٨٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٧٥٣)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ في (صحيحه) برقم: (٧٨٧)، واتە: ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! چ مزگەوتێك یەكەم مزگەوت بوو لەسەر زەوی دروستكرا ؟ فەرمووی: مزگەوتی حەرام (واتە: ئەوەی لە مەككەیە)، گوتم: دوای وی كامەیە؟ فەرمووی: مزگەوتی: ئەقصا، گوتم: چەندە ماوەیان كەوتۆتە نێوانی؟ فەرمووی: چل ساڵ، ﴿واتە: چل ساڵ مەسافەی زەمەنی هەبووە لە نێوان دروستكرانی مزگەوتی حەڕامو مزگەوتی ئەقصا كە لە (قودس)ە﴾، جا دیارە وا باوە كە داوودو سولەیمان (علیهما الصلاة والسلام)، مزگەوتی ئەقصایان دروستكردوە، بەڵام لە ئەسڵدا ئەوان دروستیان نەكردوە، بەڵكو نۆژەنیان كردۆتەوە، بۆچی؟ چونكە ئەگەر لە نێوانی دروستكرانی مزگەوتی حەڕامو مزگەوتی ئەقصادا، چل ساڵ بووبێ، ناگونجێ داوودو سولەیمان (علیهما الصلاة والسلام)، بنیاتنەری مزگەوتی ئەقصا بووبن، چونكە بەلای كەمەوە داوودو سولەیمان لەگەڵ ئیبراهیم (علیهم الصلاة والسلام)، كە دروستكەری مزگەوتی حەڕامە، هەزار ساڵیان بەینە، كەواتە: لە ئەسڵدا مزگەوتی حەڕامیش بە ماوەیەكی كورت كە چل ساڵە دروستكراوە، كە ئەویش وەك مێژوونووسانو توێژەرەوان دەڵێن: یەعقووب دروستی كردوە، كە یەعقووب كوڕی ئیسحاقە، ئیسحاقیش كوڕی ئیبراهیمە، بەڵام دیارە جوولەكە شوێنەكەیان داگیر كردوەو شەڕوشۆڕیان بەسەرهاتوەو تێكچووە، وە دوایی لە سەردەمی داوودو سولەیمان دا (علیهما الصلاة والسلام) كە پادشاو دەستەڵاتدار بوون وێڕای پێغەمبەرایەتیی، دروست كراوەتەوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە خوا ﷻ باسی كەعبە دەكات حەوت سیفەتی لێ هەڵدەدات، تاكو بزانرێ بۆچی یەكەمین ڕووگەی مسوڵمانانە؟ وە بۆچی

خوای پەروەردگار هێندە گرنگیی پێداوە؟ دیارە لەبەر ئەو حەوت سیفەتەیە کە تێیدا هەن‌و کە هەموویان یان زۆربەیان نە لە مزگەوتی ئەقصاو نە لە هیچ پەرستگایەکی دیکەدا نین، سیفەتەکان بە ڕیزبەندیی ئەمانەن:

یەکەم: دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ ﴾، کەواتە: یەکەمین ماڵ بووە، کە بۆ خوا دروستکراوە.

دووەم: دەفەرموێ: ﴿ وُضِعَ لِلنَّاسِ ﴾، بۆ خەڵك دانراوە، یانی: بۆ تێکڕای خەڵك، بەڵام بۆ وێنە: مزگەوتی ئەقصا زیاتر بۆ جوولەکەکان بووە، کەچی کەعبە ماڵی خوا بووە بۆ تێکڕای خەڵکی.

سێیەم: دەفەرموێ: ﴿ مُبَارَكًا ﴾، خێردارو بە بەرەکەت بووە، پڕ پیت‌و پێز بووە.

چوارەم: دەفەرموێ: ﴿ وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴾، مایەی ڕێنمایی بووە بۆ هەموو جیهانییان، وە بەهۆی زیارەتی ئەو ماڵەوە، خەڵك کۆبوونەوەو تێیدا لە هیدایەتی خوا بەهرەمەند بوون.

پێنجەم: دەفەرموێ: ﴿ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ ﴾، چەند نیشانەی ڕۆشنی تێدان، کە یەکێکیان شوێنی وەستانی ئیبراهیمە ﴿ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ ﴾، واتە: ئەو شوێنەی کە ئیبراهیم (علیه السلام) لەسەری وەستاوە، کە بریتیە لە بەردێکی گەورە کاتێك کە دیواری کەعبەی بەرز کردۆتەوەو دەستی نەگەیوەتێ، بەردێکی گەورەی هێناوە دایناوەو چۆتە سەر ئەو بەردە، ئیسماعیلی کوڕی بەردی وێداون‌و ئەویش دایناون، وە شوێن پێیەکانی ئیبراهیم لەسەر ئەو بەردە دەرچوو ون، وەك چۆن ئینسان لەسەر قوڕێك ڕادەوەستێ، ئاوا پێیەکانی پێیدا قووڵبوونەتەوە، بەڵام ئێستا شوورەو قەفەزێکی بۆ کراوەو دوورخراوەتەوە لە دیواری کەعبە، جا ڕەنگە هەندێ کەس لەوانەی کە دەچن بۆ حەج بڵێن: جا باشە

عەجەبا ئێستا ئەو بەردە كە مەقامی ئیبراهیمە، چەند مەترێك دوورە لە دیواری كەعبە! ئیبراهیم چۆن ئەوەندە دوور وەستاوە لە دیوارەكەو بەردیشی لەسەر داناوە؟! ڕاستییەكەی ئەوەیە كە عومەری كوڕی خەتتاب - خوا لێی ڕازی بێ-، ئەو بەردەی دوور خستۆتەوە لە دیواری كەعبە، لەبەر ئەوەی ڕێی لە طەوافكەران دەگرت، وە بۆ ئەوەش كە لە مەقامی ئیبراهیم نوێژ بكەن، چونكە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ ... وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ... ﴿١٢٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە شوێنی لێوەستانی ئیبراهیم بكەنە نوێژگە، تاكو ئەوانەی كە نوێژ لە پشت ئەو بەردەوە دەكەن ڕوو بە كەعبە، ئەوانەی كە طەواف دەكەن، نوێژیان لێ تێكنادەن.

شەشەم: دەفەرموێ: ﴿ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ﴾، هەر كەسێك چووبێتە ئەو بەیتەوە، یاخود ئەو مزگەوتەی لە دەوری ئەو بەیتەیە، ئەوە هێمن و دڵنیا بووە، كە ئەگەر دوژمنی بابە كوشتەشی لەڕاستی ڕا هاتبێ، لە سەردەمی نەفامییشدا كەس دەستی بۆ نەبردوە، تا لەوێ نەچووبێتە دەرێ.

حەوتەم: دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ ﴾، وە خوای كاربەجێ لەسەر هەموو خەڵكێكی مسوڵمانی فەرز كردوە، كە ئەگەر لە توانایاندا هەبێ سەردانی ئەو ماڵە بكەن، دیارە بۆ كەسێك كە ڕێی هەبێ و بتوانێ بیگاتێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ ﴾، بۆ خوا هەیە لەسەر خەڵك سەردانی ماڵ، واتە: سەردانی ماڵی خوا، (حِج) واتە: سەردان و زیارەت، خوای بە بەزەیی لێرەدا بە ڕەهایی فەرموویەتی: كە لەسەر خەڵكی بەگشتی فەرزە سەردانی ئەو ماڵەی بكەن، كە لە مەككەیە، دیارە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ ڕوونكراوەتەوە كە لە تەمەندا یەكجار

فەرزە، نەك هەموو ساڵ جارێك، وە پاشانیش تەنیا لەسەر ئەوانەی كە باڵغن، وە دوایيش دەبێ بتوانێ بچێ ﴿مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗا﴾، واتە: هەموو مسوڵمانێك، وەك دواتر باسی دەكەین، لە ئەسڵدا لەسەری فەرزە، بەڵام كە توانای نەبوو فەرزەكەی لەسەر لادەچێ لەبەر بێ توانایی، ئنجا بەڵگەی ئەو قسەیەش كە حەج لە هەموو تەمەندا یەكجار فەرزە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: خَطَبَنَا رَسول اللَّهُ ﷺ فَقَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ! قَدْ فُرِضَ عَلَيْكُمْ الْحَجّ فَحُجُّوا) فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسولَ اللَّهِ؟! فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثًا، فَقَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ (لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ) ثُمَّ قَالَ: (ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ)} رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (١٠٦١٥) وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٠٦٦) وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٦١٩) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٧٠٤)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ - دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین، فەرمووی: ئەی خەڵكینە! حەجتان لەسەر پێویست كراوە، حەج بكەن، پیاوێك گوتی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خوا ؟! پێغەمبەری خوا بێدەنگ بوو، هەتا پیاوەكە سێ جار قسەكەی دووبارە كردەوەژ، فەرمووی: ئەگەر گوتبام: بەڵێ، لەسەرتان فەرز دەبوو، وە نەشتان دەتوانی بچن، دوایی فەرمووی: هەرشتێك كە خۆم بۆم باسنەكردن لێمگەڕێنو لێم مەپرسن، چونكە ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە فەوتان كە زۆر پرسیاریان دەكرد، وە زۆر لەگەڵ پێغەمبەرەكانیاندا دەكەوتنە ڕاجیایيو مشتومڕیان زۆر لەگەڵدا دەكردن، ئنجا فەرمووی: وە هەر كاتێك فەرمانم بە شتێك پێكردن، ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە لێ جێبەجێ بكەن، هەر كاتێكیش شتێكم لێ قەدەغە كردن، خۆتانی لێ دوور بگرن.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾، لە هەندێك فەرموودانـدا باسی (الزاد والراحِلَة) کراوە واتە: خۆراكو ولاّخ، ولاّخی سواریی کەوابێ: ئایا ﴿ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾، کێیە؟ ئەوەیە کە دەتوانێ بیگاتێ، کەسێکە خواردنو خۆراکی ڕێی پێ بێ، وە وەسیلەیەکی هەبێ پێی بگاتێ، بەلاّم لەڕاستیدا ئەم دووە بەس نین، وە ئەو فەرموودانەش کە لەوبارەوە هاتوون سەنەدەکەیان بەهێزو صەحیح نیە، وەك: (طبري) لەوبارەوە دەڵێ: (فَأَمَّا الأَخْبَارُ الَّتِي رُوِيَت عَن رَسول اللهِ ﷺ في ذَلِكَ بِأَنَّهُ: الزادُ وَالرَاحِلَة، فَإِنَّهَا أَخْبَارٌ: فِي أَسَانيدِها نَظَرٌ، لاَ يَجُوزُ الإحتِجَاجُ بِمِثلِها فِي الدِّين)[1]، واتە: ئەو هەواڵانەی کە لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕدراونەتەوە کە مەبەست لە ﴿ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾، بریتیە لە بژیوو خۆراك لەگەڵ ولاّخی سواریی، یاخود وەسیلەی سواریی، ئەوانە چەند هەواڵێکن کە زنجیرەی ڕاوییەکانیان (کە دەچێتەوە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ) جێی تێبینییە، وە لە دینداریدا دروست نیە، بەو جۆرە هەواڵانە بەڵگە بهێنرێتەوە، دوایی (طبري) دەڵێ: (فَمَنْ كَانَ وَاجِداً طَرِيقاً إِلى الحَجِّ لا مَانِعَ لَهُ مِنْهُ مِن زَمَانَةٍ، أَوْ عَجْزٍ، أَوْ عَدُوٍّ، أَوْ قِلَّةِ مَاءٍ فِي طَرِيقِهِ أَوْ زَادٍ، وَضُعْفٍ عَنِ الْمَشِي، فَعَلَيْهِ فَرْضُ الحَجّ، لا يُجزِيهِ إلاّ أَدَاؤُه، فَإِنْ لَمْ يَكُن وَاجِداً سَبِيلاً - أَعنِي بِذَلِكَ: فَإِن لَمْ يَكُن مُطِيقاً الحَجَّ، بِتَعَذُّرِ بَعْضِ هَذِهِ الْمَعَانِي الَّتِي وَصَفْنَاهَا عَلَيْهِ - فَهُوَ مِمَّنْ لا يَجِدُ إِلَيهِ طَرِيقاً وَلا يَستَطِيعُهُ..)[2]، واتە: ڕای ڕاست ئەوەیە کە هەرکەسێك ڕێی بەرەو حەجی هەبێو هیچ بەربەرچێکی نەیەتە پێش، وەك ئەوە کە زۆر کەوتبێتە تەمەنەوە، یاخود نەخۆشییەکی هەبێ، کە نەتوانێ، یاخود هەر جەستەی وابێ کە نەتوانێ بڕوا، یاخود دوژمنێك لەڕێی هەبێ کە جێی مەترسی بێ،

١) جامع البيان، ج: (٤)، ص: (٢٢).
٢) جامع البيان، ج: (٤)، ص: (٢١).

یاخود لەبەر ئەوە کە ئاوی کەمی پێیە، یاخود توێشووو زادو زەخیرەی پێ نیە لە ڕێیەکەیدا، یاخود ناتوانێ بڕوا، یاخود وەسیلەی نیە، (ئەوانەی نەیەتە پێش) ئەوە حەجی لەسەر پێویستەو دەبێ جێبەجێی بکات، بەڵام ئەگەر ڕێی چوونە حەجی نەبوو، مەبەستم ئەوەیە کە نەیدەتوانی بگاتە حەج بەهۆی هەبوونی یەکێك لەو پەرچو ڕێگیرانە کە باسمان کردن، ئەوە لەو کەسانەیە کە توانای چوونی نیە، واتە: لەسەری فەرز نیە.

قسەکەی (طبري) زۆر جوانە ! جاری وایە کەسێك خواردنو خۆراکیشی هەیەو وەسیلەو پارەشی هەیە، بەڵام نەخۆشە، یان لە خۆی دەترسێو ڕێیەکە سەلامەت نیە، بە هەر حاڵ دەبێ هیچ پەرچو ڕێگرێك لە ڕێگادا نەبێو تواناشی هەبێ، ئەوجار حەجی لەسەر فەرز دەبێ، ئەگەرنا لەسەری فەرز نابێ.

**مەسەلەی یازدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، وە هەرکەسێك بێبڕوابێ، ئەوە خوا لە هەموو جیهانییان بێنیازە، کە دوایی لە درێژەی باسی چوونە حەجدا وا دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئەوە سێ واتایان هەڵدەگرێ:

١– وە هەرکەسێك بڕوای بە خواو بەڕۆژی دوایی نەبێ، ئەوە خوا بێنیازە. (كَفَرَ باللهِ وَاليَومِ الآخر).

٢– وە هەرکەسێك بڕوای بە فەرز بوونی حەج نەبێ، ئەوە خوا بێنیازە. (جَحَدَ وجُوَب الْحَجّ).

٣– وە هەرکەسێك حەج نەکات، ئەوە خوا بێنیازە. (لَمْ يَحجّ).

هەندێکیان وایان لێکداوەتەوە، دەڵێن: لێرەدا کوفر بە مانای حەج نەکردنە، دیارە لەوکاتەشدا دەبێ بەو جۆرە تەئویلی بکەین بڵێین:

مەبەسـت لـە کـوفر کـوفرانی نیعمەتـە، یـاخود مەبەست ئەوەیـە کردەوەیەکـی وەك هـی کافرانـی ئەنجامداوە، کە بریتیـە لـە سەرپـێچییکردنی فـەرمانی خـوا، واتە: نەك بـچـێتە خـانەی کافرانـەوەو لـە بازنـەی ئیـسلام چووبێتە دەر، ئنجا دەگونجـێ بڵـێین: ئـەم ئایەتـە یەکێکـە لـە ئایەتەکـانی موتەشابیهـات، ئـەو ئایەتانـەی کـە چـەند واتایـەك هەڵدەگرن، یـاخود مانایـەك زیـاتر هـەڵـدەگرن‌و ماناکانیان وێکدەچن، کە ئەوە پێویستی بە گێـڕانەوە هەیـە بـۆ ئەسـڵ، یـانی: ئـەو ئایەتـانەی کـە موحکـەماتن، ئەگـەرنا بڵـێی: هەرکەسێك حـەجی نەکـرد پـێـی کـافر دەبـێ ! زانایـان وایـانـەگوتوە، وە یەکـێ لـە ماناکـانی ئـەوە دەگـەیەنێ، کەواتـە: دەبـێ ئـەو ئایەتـە بگێڕینـەوە بـۆ ئایەتـە موحکەمەکـانی دیکە، کە خـوای پەروەردگار حەج نەکردنی بە کوفر دانەنـاوە، کەواتـە: لێرەدا مەبەست لـەو کوفرە، یـان کوفرە بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایی، یاخـود کوفرە بـە واجب بوونی حەج، چونکە هەر کەس کە بڕوای بە فـەرز بـوونی حـەج نەبـێ، وە بـڕوای بـە هـەر کـام لـە فەرزەکـان نەبـێ، ئـەوە پێـی کـافـر دەبـێ، یـان مەبەست لە کوفر کوفرانی نیعمەتە، یان مەبەست ئەوەیە کە هەرکەس حـەج نەکـات، ئەوە سیفەت‌و کردەوەیەکی کافرانی تێدا هاتۆتـە دی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا لە ئایەتی (٩٨) تاکو (١٠٩) لە سوورەتی ئالی عیمران تەفسیر دەکەین، واتە: دوازدە ئایەت، کە لەم دوازدە ئایەتەدا خوای پەروەردگار سەرەتا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە لۆمەو سەرزەنشتی خاوەن کتێبەکان بکات، واتە: ئەو جوولەکەو نەصرانیی یانەی کە خەڵکیان لەڕێ لادەدا، وە بڕوایان بە ئایەتەکانی خوای بەرزو مەزن نەدەکرد، وە پاشان ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانان کە ئەگەر بە قسەی هەندێك لە خاوەن کتێبەکان بکەن، کافریان دەکەنەوەو لە ئیسلام هەڵیان دەگێڕنەوە، بابەتێکی دیکەیە کە لەم ئایەتانەدا خراوەتەڕوو، ئنجا فەرمانکردن بە مسوڵمانان بەوە کە پارێزکاریی بکەن، وە بە مسوڵمانەتیی نەبێ نەمرن، واتە: لەسەر ئیسلام بژین بۆ ئەوەی بەپێی ئیسلامەتییش گیانەکەیان بسپێرن، وە فەرمان پێکردنیان بە دەستگرتن بە ڕێسمانی خواوە، واتە: قورئان، یان ئیمان، یان ئیسلام، وە خۆپاراستنیان لە پەرتەوازە بوون، وە یادکردنەوەی چاکەو نیعمەتی برایەتیی کە بەهۆی ئیمانەوە دەستگیریان بووە، پاشان فەرمان پێکردنیان کە کۆمەڵە کەسێکی بانگخوازو فەرمان بە چاکەکەرو ڕێ لە خراپەگریان تێدابن، دوایی وریاکردنەوەیان لە پەرتەوازەیی وە ڕاجیایی‌و ناکۆکیی، کە سەرەنجامی شوومی لە دوارۆژدا لێدەکەویتەوە، وە تێگەیاندنیان لەو ڕاستییە کە ئەمانە ئایەتی خۆیینی دەخوێندرێنەوە، وە خوا خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەوییە، وە سەرەنجامیش هەر بۆ لای وی دەگەڕێینەوە.

﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ
ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ
عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ
إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ وَمَن
يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٠١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا
تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ
عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ
ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ
يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا
تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٥﴾
يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ فَذُوقُواْ
ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ
﴿١٠٧﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿١٠٩﴾ ﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئـایەتەكـان

((بڵێ: ئەی خاوەن كتێبینە! بۆچی بە ئایەتەكانی خوا بێبڕوان، وە خواش شایەدە لەسەر ئەوەی كە دەیكەن ﴿٩٨﴾ ئەی خاوەن كتێبینە! بۆچی كەسێك كە بڕوا دێنێ، لەڕێی خوا لایدەدەنو، دەتانەوێ ڕێی خوا خوارو خێچ بكەن، لە حاڵێكدا كە خۆتان شایەدن (وانیە)، وە خواش لەوەی دەیكەن بێئاگانیە ﴿٩٩﴾

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر گوێڕایەڵیی دەستەیەك لەوانەی كتێبیان پێدراوە بكەن، پاش بڕوا هێنانتان كافرتان دەكەنەوە ﴿١٠٠﴾ جا چۆن بێبڕوا دەبن، لە حاڵێكدا كە ئێوە ئایەتەكانی خواتان بەسەردا دەخوێندرێنەوەو پێغەمبەرەكەیشتان لەنێو دایە؟ وە هەركەسێك توند دەست بە (ڕێسمانی) خواوە بگرێ، ئەوە بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنمایی كراوە ﴿١٠١﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەك بۆ خوا شایستەیە پارێز لە خوا بكەن، وە بە مسوڵمانەتیی نەبێ مەمرن ﴿١٠٢﴾ وە تێكڕا توند دەست بە ڕێسمانی خواوە بگرنو پەرتەوازە مەبن، وە یادی چاكەی خوا بكەن بەسەر خۆتانەوە، بیهێننەوە یاد، كاتێ كە پێكەوە دوژمن بوون، كەچی خوا دڵتانی پێكەوە بەستو لە سایەی چاكەی ئەوەوە پێكەوە بوونە برا، وە لەسەر قەراغی چاڵێكی ئاگر بوون، بەڵام دەربازی كردن لێی، ئاوا خوا ئایەتەكانیتان بۆ ڕوون دەكاتەوە، بەڵكو ڕێی ڕاست بگرن ﴿١٠٣﴾ وە با كۆمەڵێكتان هەبن بانگەواز بۆ چاكە بكەنو، فەرمان بە شتە پەسندەكان بكەنو، ڕێگریی لە شتە ناپەسندەكان بكەن، هەر ئەوانەش سەرفرازن ﴿١٠٤﴾ وە وەك ئەوانە مەبن كە پەرتەوازەو ناكۆك بوون، پاش ئەوەی بەڵگە ڕوونەكانیان بۆ هاتن، وە ئەوانە ئازارێكی مەزنیان بۆ دانراوە ﴿١٠٥﴾ لە ڕۆژێدا كە هەندێك ڕوو سپیو گەش دەبن، وە هەندێك ڕووش تاڵو ڕەش دەبن، جا ئەوانەی ڕوویان تاڵو ڕەش هەڵگەڕاوە، پێیان دەگوترێ: ئایا دوای بڕوا هێنانتان، بێبڕوا بوون؟! دە ئازار بچێژن بە هۆی ئەوەوە كە بێبڕوا بوون ﴿١٠٦﴾ بەڵام ئەوانەی كە ڕوویان سپیو گەش بووە، ئەوە لەنێو بەزەیی خوادا دەبن، وە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿١٠٧﴾ ئا ئەوانە ئایەتەكانی خوان بە هەق بەسەرتیاندا دەخوێنینەوە، وە خوا نایەوێ ستەم لە جیهانیيان بكات ﴿١٠٨﴾ وە هەرچی لە ئاسمانەكانو زەوی دایە هی خوایە، وە كاروبارەكانیش هەر بۆ لای خوا دەگێڕڕێنەوە ﴿١٠٩﴾)).

## شیكردنـەوەی هـەندێك لە وشـەكان

(عِوَجًا): (وَالعَـوْجُ: العَطْـفُ عَـنْ حَـالِ الإنْتِـصابِ، وَالعَـوَجُ: مَـا يُـدْرَكُ بِالبَـصَرِ كَالْخَـشَبِ، وَالعِـوَجُ: مَـا يُـدْرَكُ بِالبَـصِيرَةِ والفِكْـرِ)، (عَـوَج) بـە نوشـتاندنەوە دەگوترێ، واتە: وشەی: (عَوَج) لارییەكە كە بەچاو ببینـرێ، وەك: دیـواری لار، دارێكـی لار، بـەڵام (عِـوَج) شـتێكە كە بـە دڵو بـە عەقـڵ هەسـتی پـێبكـرێ، وەك: بگـوترێ: فـلان كـەس بیــروبڕوایەكی لاری هەیــە، ئــەوە لەبــەر ئــەوەی بیـروبڕوا بە فیكرو دڵ هەسـتی پـێدەكرێ.

(يَعۡتَصِم ): واتە: توند دەست بگرێ، (العَصْمُ: الإمْسَاكُ، وَالإعْتِصَامُ: الإسْتِمْسَاكُ) (عَصْمُ) واتە: دەست گرتن، (إعْتِصامُ)یش، واتە: توند دەست پـێوە بگـری.

(بِحَبۡلِ ٱللَّهِ ): (حَبْل) بـە مانـای ڕێـسمان دێ، بـەمانای پـەت دێ، (الْحَبْلُ: مَعْرُوفٌ، قَـالَ عَـزَّ وَجَـلَّ: ﴿ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۢ ۝٥ ﴾المـسد، وَاسْـتَعِيْرُ لِلوُصـل وَلِكُـلّ مَـا يُتَوَصَّـلُ بِـهِ إلى شَـيءٍ) وشـەی: (حَبْـلُ) ناسـراوە وەك: خـوای زاڵـی پایەبــەرز دەفــەرموێ: ﴿ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۢ ۝٥ ﴾المـسد، واتــە: لــە گەردنیدا پەتێكـی هۆنراوە هـەیە، بەڵام لێـرەدا خـوازراوەتەوەو بەكـارهێنراوە بـۆ هۆكـار، بـۆ هـەر شـتێك كە پـێـی بگـەی بـە شـتێك، كـە لـە ئایەتەكـەدا مەبەسـت پـێـی ئایینـی خوایـە، یان مەبەسـتی قورئانـە، یـاخود مەبەسـت پێـی ئیمـانو ئیسلامە.

(فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ): واتــە: دڵتــانی پــێكەوە گرێــداوە، بەیەكــەوە جۆشــی داون، چونكــە: (الإلْـفُ: اجْتِمَـاعٌ مَـعَ إلتئـامٍ، يُقَـالُ: أَلَّفْـتُ بَيْـنَهُمْ، وَمِنْـهُ الأُلْفَـة)، (إلْفُ) واتە: كۆبوونەوە لەگەڵ پێكەوە لكان، وە دەگوترێ: پـێكەوەم لكـاندن، یان پـێكـەوە تەبـام كردن، وە (أُلْفَـة)یش، واتە: پـێكەوە هۆگـر بوون.

(شَفَا): بە مانای قەراغ دێ، (شَفَا البِئْرِ وَالنَّهْرِ وَغَيْرِهِمَا: طَرَفُهُ، ويُضْرَبُ بِهِ الْمَثَلُ في القُرْبِ مِنَ الْهَلاَكِ، وَأَشْفَى فُلانٌ عَلَى الْهَلاكِ: أَي حَصَلَ عَلَى شَفَاهُ) بۆ بیرو بۆ ڕووبار دەگوترێ: (شَفَا) واتە: قەراغەکەیان، وە وێنەی پێ دەهێنرێتەوە بۆ نیزیك کەوتنەوە لە لەنێوچوون، وە دەگوترێ: (أَشْفَى فُلانٌ عَلَى الْهَلاَكِ) واتە: فلان کەس چۆتە قەراغی سەر بە فەتارەت چوون.

(ٱلْخَيْرِ): (الْخَيْرُ: مَا يَرغَبُ فِيهِ الكُل، وَالشَّيءُ النَافِع، وَضِدُّهُ الشَرُّ) وشەی: (خَيْر) هەرشتێکە هەموو کەس ئارەزووی دەکاتو پێی چاکە، وە بە هەرشتێکی سوودبەخش دەگوترێو، پێچەوانەی باش (خَيْر) بریتیە لە (الشَّر) واتە: زیانبەخشو خراپ.

(بِٱلْمَعْرُوفِ): (الْمَعْرُوفُ: اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْرَفُ بِالشَّرْعِ وَالعَقْلِ حُسْنُهُ) واتە: (مَعْرُوفُ) ناوە بۆ هەر شتێك کە بە عەقڵو بە شەرع چاکییەکەی دەزانرێ.

(ٱلْمُنكَرِ): (الْمُنْكَر: اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْرَفُ بِالشَّرْعِ وَالعَقْلِ قُبْحُهُ) واتە: (مُنْكَر) ناوە بۆ هەر شتێك کە بە عەقڵو بە شەرع خراپییەکەی دەزانرێ، جا قسەبێ، یان کردەوە.

(ٱلْمُفْلِحُونَ): واتە: سەرفرازان، (الفَلاحُ: الظَّفَرُ وَإِدرَاكُ بُغْيَةٍ) (فَلاح)، واتە: بە ئامانج گەیشتنو سەرکەوتن ئەویش لە (فَلْح)ەوە هاتوە (الفَلْحُ الشَقُّ) واتە: لەت کردنو شەق کردن، وە جوتیار بۆیە پێی دەگوترێ: (فَلاَّح) چونکە زەوی دەکێڵێتو لەتی دەکات، (مُفْلِح)یش کەسێکە کۆسپەکانی بەردەمی خۆی دەبڕێ، تا دەگاتە ئەو ئامانجەی کە دەیەوێ.

(وَٱخْتَلَفُوا۟): (وَالإِخْتِلاَفُ وَالْمُخَالَفَةُ أَنْ يَأْخُذ كُلُّ وَاحِدٍ طَرِيقاً غَيْرَ طَرِيقِ الآخَرِ فِي حَالِهِ أو قَوْلِهِ واستعِيرَ للمُنَازَعَة والْمُجَادَلَة) واتە: (إخْتِلاَفُ)

ئەوەیە کە هەرکامێك لەو دوو تەرەفە، رێگایەك بگرێ پێچەوانەی ئەوی دیکەبێ، لە حاڵ یان لە قسەکردنیدا، (وَالْخِلاَفُ أَعَمُّ مِنَ الضدِّ لأن كُلَّ ضِدَّين مُخْتَلِفَانِ وَلَيْسَ كُلَّ مُخْتَلِفِينَ ضِدَّين، وَاستَعِيرَ الإِخْتِلافُ لِلْمُنَازَعَةِ والْمُجَادَلَةِ) وە وشەی: (خِلاَف) لە (ضِدّ) گشتی ترە، (خِلاَف) واتە: پێچەوانە، بەلام (ضِدّ) واتە: دژ، هەموو دوو شتی پێکەوە دژ لێك جیان، بەلام هەموو دوو شتی لێك جیا دژ نین، وە وشەی: (إِخْتِلاَفُ) خوازراوەتەوە بۆ ناکۆکییو دووبەرەکییو شەڕە قسە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

((أَخْرَجَ ابْنُ جَرِير وَابْنُ إِسْحَاق وَابْنُ الْمُنْذِر وَابْنُ أَبي حَاتِم وأَبو الشيخ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمْ قَالَ: مَرَّ شَاسُ بْنُ قَيْسٍ، وَكَانَ شَيْخًا قَدْ عَسَا فِي الجَاهِلِيَة، عَظِيمَ الْكُفْر شَدِيدَ الطَعنِ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، شَدِيدَ الْحَسَدِ لَهُمْ، عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسولِ اللّهِ ﷺ مِنْ الأوْسِ وَالْخَزْرَجِ، فِي مَجْلِسٍ قَدْ جَمَعَهُمْ يَتَحَدّثُونَ فِيهِ فَغَاظَهُ مَا رَأَى مِنْ أُلْفَتِهِمْ وَجَمَاعَتِهِمْ وَصَلاَحِ ذَاتِ بَيْنِهِمْ عَلَى الإِسْلاَم، بَعْدَ الَّذِي كَانَ بَيْنَهُمْ مِنْ الْعَدَاوَةِ فِي الْجَاهِلِيّةِ. فَقَالَ: قَدْ اجْتَمَعَ مَلأُ بَنِي قَيْلَةَ بِهَذِهِ الْبِلادِ، لاَ وَاللّهِ مَا لَنَا مَعَهُمْ إِذَا اجْتَمَعَ مَلَؤُهُمْ بِهَا مِنْ قَرَارٍ، فَأَمَرَ فَتًى شَابّا مَعَهُ مِنْ يَهُودَ فَقَالَ: إِعْمِدْ إِلَيْهِمْ فَاجْلِسْ مَعَهُمْ، ثُمَّ ذَكِّرهُمْ يَوْمَ بُعَاثَ وَمَا كَانَ قَبْلَهُ وَأَنْشِدْهُمْ بَعْضَ مَا كَانُوا يَتَقَاوَلُون فِيهِ مِنْ الأَشْعَارِ، وَكَانَ يَوْمُ بُعَاث يَوْماً اقْتَتَلَت فِيهِ الأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ، وَكَانَ الظفرُ فِيهِ لِلأَوْس عَلَى الْخَزْرَجِ، فَفَعَل، فَتَكَلَّم القَوْمُ عِنْدَ ذَلِكَ وَتَنَازَعُوا وَتفَاخَرُوا، حَتَّى تواثب رَجُلان مِن الْحيَّين عَلَى الرُّكَب: أَوْسُ بْنُ قَيْظي، أَحَدُ بَنِي حَارِثَةَ مِنَ الأَوْس، وَجَبَّار بْن صَخر، أَحَد بَنِي سَلَمَة مِنَ الْخَزْرَج، فَتَقَاوَلا، ثُمَّ قَالَ أَحَدُهُمَا لصَاحِبِهِ: إِنْ شِئْتُمْ وَاللّٰهِ رَدَدْناها الآن جَذَعَةً! وَغَضِبَ الفَرِيقَان جَمِيعَاً، وَقَالُوا: قَدْ فَعَلْنَا، السلاحَ السلاحَ!! مَوْعِدُكُم الظاهِرَة (وَالظاهِرةُ: الحَرَّة) فَخَرَجُوا إِلَيْهَا، وتحاوزوا وَانْضَمَّت الأَوْسُ بَعْضُهَا إِلى بَعْضٍ، وَالْخَزْرَج بَعْضُهَا إِلى بَعْضٍ عَلَى دَعْوَاهُم الَّتِي

كَانُوا عَلَيْهَا فِي الْجَاهِلِيَةِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسولُ اللهِ ﷺ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فِيمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُهَاجِرِين مِنْ أَصْحَابِهِ حَتَّى جَاءَهُمْ فَقَالَ: {يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ! اللهَ اللهَ أَبِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ وَأَنَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ بَعْدَ إِذْ هَدَاكُمُ اللهُ إِلى الإِسْلاَمِ وَأَكْرَمَكُمْ بِهِ، وقَطَعَ بِهِ عَنْكُمْ أَمْرَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَاسْتَنقذكُمْ بِهِ مِنَ الكُفْرِ وَأَلَّفَ بِهِ بَيْنَكُمْ، تَرْجِعُونَ إِلَى مَا كُنْتُمْ كُفَّاراً؟!} فَعَرَفَ القَوْمُ أَنَّهَا نَزْغَةٌ مِنَ الشَّيْطَان، وَكَيْدٌ مِنْ عَدوِّهُمْ، فَأَلْقَوا السلاح مِنْ أَيْدِيهم، وبَكَوْا، وَعَانَقَ الرِّجَال بَعْضُهُم بَعْضاً، ثُمَّ انْصَرَفُوا مَعَ رَسول الله ﷺ سَامِعِينَ مُطِيعِينَ، قَدْ أَطْفَأَ الله عَنْهُمْ كَيْدَ عَدوِّ الله (شَاس)، وَأَنْزَلَ اللهُ فِي شَأْن شَاسُ بْنُ قَيْسٍ وَمَا صَنَعَ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾، وَأَنْزَلَ فِي أَوْس بن قَيْظِيّ وجبّارٍ بن صخر ومَنْ كَانَ مَعَهُمَا مِن قَوْمِهما الَّذِينَ صَنَعُوا مَا صَنَعُوا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴾، إلى قوله: ﴿ ...وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ ﴾))[١]،

واتە: ئیبنو جەریرو ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو لمونذیرو ئیبنو ئەبی حاتیمو ئەبو شەیخ لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویانە، کە دەڵێ: شاسی کوڕی قەیس کە پیاوێکی پیر بوو (جوولەکە بوو) وە لە سەردەمی نەفامییدا تەمەنێکی زۆری گوزەراند بوو، وە پیاوێکی زۆر کافر بووو زۆر تانەی لە مسوڵمانان دەدا، وە زۆر حەسوودیی بە مسوڵمانان دەبرد، (ئەم شاسی کوڕی قەیسە) ڕۆژێك بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج، (واتە: لە پشتیوانان) لە کۆڕێکدا کە کۆی کردبوونەوە قسەیان تێدا دەکرد بە تەبایی و برایانە، زۆر پەست بوو، ڕقی هەڵسا لەوەی کە تەبایی و کۆبوونەوەو خۆشەویستی و برایەتیی لەسەر ئیسلامی لەنێودا بینین،

---

١) جامع البيان للطبري برقم: (٧٥٢٢)، و فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٤٧٤- ٤٧٥) برقم: (٥٧١).

دوای ئـــەوەی کـە دەیزانــی کـاتی خـۆی لـە سـەردەمی نەفامییــدا هـەردوو تیــرە دوژمنایەتیو دووبەرەکیی زۆریان لەنێواندا هەبووە، (پـێی ناخۆشبووە کـە بـەهۆی ئیـسلامەوە بوونەتـە بـراو ئـاوا کۆبوونەتـەوە) جـا لەبـەر خۆیــەوە گـوتی: گـەورە گەورەکانی بەنـی قەیلە لەم ولاّتەدا کۆبوونەتەوە (قەیلە: واتـە: ئـەوسو خـەزرەج، چونکە ئەوسو خەزرەج هەموویان چوونەتە سەر ئافرەتێك کە نـاوی قەیلـە بـووە، واتە: نەنکی پـێشوویان، هەموویان چوونەتەوە سەر دایکێك) ئەگەر بێـتو ئەوانـە ئــاوا پــێکەوە تەبــاو رێکــبن، ئێمـە نـاتوانین لەگەڵیانــدا بـژین، (لەبـەر ئـەوەی دەستەڵاتیــان دەبــێ، وە ئـەوەی کـە لـە رابـردوودا بـەهۆی دووبـەرەکیی نێوخـۆی ئەوسو خەزرەجەوە بۆیان کراوە لەمـەودوا بۆیان ناکرێ)، بۆیە فەرمـانی کـرد بـە گەنجێکی تازە پـێگەیشتوو کە لەگـەڵی بـوو لـە جوولەکەکـان، گـوتی: بـڕۆ بـۆ لای ئـەم کۆمەڵــەو لـەم کـۆڕەدا لەگــەڵیان دابنیـشە، پاشـان ڕۆژی (بُعَــاث)یـان بیــر بخــەرەوەو هەنــدێك لــەو شـیعرانە بڵــێ، کـە ئـەوان لـە دژی یـەك لـەو ڕۆژەدا گوتوویــانە، کـە لـەو ڕۆژەدا ئـەوسو خـەزرەج تێیـدا بەشـەڕ هـاتوونو جـەنگیان پـێکەوە کردوە، وە ئەوس بەسەر خەزرەجدا زاڵ بـووەو زۆریـان خەڵـك لـە یەکدی کوشــتوە، ئـەو گەنجـە چـوو دانیـشتو (وەك: شاسـی کـوڕی قـەیس ئامۆژگــاریی کردبـوو، کۆمەڵـە شـیعرێکی بـۆ خوێندنـەوە کـە ئـەوس بـە خـەزرەجی گوتـوە، وە خــەزرەج بــە ئەوســی گوتــوە) ئـەوانیش کەوتنـە شــەڕە قـسەو لـەو حاڵـەتــەدا قســەیان لێك هەڵبـەزیەوەو، ئەوانیش شـانازییان بەسەر یەکدیدا کرد، هـەتا دوو کەس لە ئەوسو خەزرەج یەکیان نـاوی (أَوْسُ بْنُ قَيْظي) بوو ئەوی دیکـەیان کــە لە بەنی حاریسە بـوو لـە ئـەوس، ئەویدیکەشیان نـاوی (جَبَّار بن صخر) بـوو، لـە بەنی سەلەمە لە خەزرەج بـوو، ئـەو دووانـە بـۆ یـەك هەڵسانە سـەر ئـەژنۆیان، وە قـسەیان بـە یەکــدی گــوت (یــانی: جنێویــان بەیەکــدی گــوتو هەڕەشـەیان لـە یەکـدی کـرد) وە یـەکێکیان بـەوی دیکـەی گـوت: ئەگـەر دەتانـەوێ شـەڕەکە تـازە دەکەینەوەو، ئەوەی ســەردەمی نەفامــیی دەست پـێدەکـەینەوە لـە سەرەتـاوە ! وە هەردووکیــان توڕەبـوون لـە یەکـدیو گوتیــان: باشـە ئـەوە بڕیارمانـدا (ئـەو شـەڕە دەبێ بکرێتەوە، شەڕی سەردەمی نەفامیی کە ئیسلام کۆتایی پـێهێنـاوە) ئیـدی

هەركامێــك لەوانــە كــە كۆبــوو بوونــەوە، بــانگی خەڵــكی خۆیانیــان كــرد، گوتیــان: چــەك بێنن، چەك بێنن، كۆدەبینـەوە لە (الظاهِرَة) (كە ئەو بەردە ڕەشــانەن كــە لــە دەوروبــەری مەدینــەن، گوتیــان: ئــەوێ دادەنــێین بــە شـــەڕگەو لەوێـــدا كۆدەبینـــەوەو چـەك بێـنن و لـەوێ شـەڕەكە دەست پێدەكـەینەوە) ئیدی چوون بەرەو ئەوێ، وە هۆزی ئـەوس هەنـدێكیان پێیـانەوە نیشتن (ئەوانـەی كـە هاتن)، هەروەهـــا خـــەزرەجیەكانیش هەنـــدێكیان بـــە هەندێكیانـــەوە نیـــشتن، (واتـــە: كۆبوونەوە لەسەر ئەو بانگهێشتەی یەكدییان، بۆ لێكدەركردنی ئـەو شـــەڕەی كـــە لــە ســەردەمی نەفامیـــدا تێیـــدا نەگەیـــشتوون بـــە ئـــەنجام) ئـــەم هـــەواڵـــە بـــە پـێغـــەمبەری خـوا ﷺ گەیشت، یەكسەر پـێغەمبەر ﷺ بە پەلە لەگـەڵ كۆمـەڵێك لە كۆچكەران لە هـاوەڵان كـە لـە خزمەتیـدا بـوون چوون بـۆ لایـان، وە فـەرمووی: ئەی كۆمەڵی مسـوڵمانان! بۆ خاتری خـوا، بـۆ خـاتری خـوا، ئایـا دوای ئـــەوەی كـە مـن لـە نێوتـانم بانگەشـەی نەفامێتـیی زینـدوو دەكەنـەوە، دوای ئـەوەی كـە خـوا هیدایەتی داون بۆ ئیسلام، وە ڕێزی گرتوون بەهۆی ئیـسلامەوە، وە شـەڕو شۆڕی سەردەمی نەفامیـی لـە كۆڵ كردوونەتـەوە، وە ڕزگاری كـردوون لـە كوفرو، وە دڵـی بەیەكـەوە گرێـداون، دەگەڕێنـەوە سـەر ئـەو كـوفرەی كـە لەسـەری بـوون لـەكاتی خۆیـدا؟! (كە دیارە بە تەئكید ڕەنگە پێغـەمبەر ﷺ بـە تەفصیلتـر فەرمایشتی بۆ كردوون، بەڵام بە كورتیی نەقـڵ كـراوە، دەڵـێ:) ئـەوانیش یەكسـەر زانیـان كـە ئـــەوە خوتخوتەیـــەكی شـــەیتانی بـــووە، وە فێڵـــێكە لـــە دوژمنـــەوە بۆیـــان، بۆیـــە چەكەكانیان فڕێدا، وە گریان، وە پیاوەكان دەستیان لەملی یەكـدی كـردو دەســـتیان لە ئەستۆی یەكدی كردو پەشـێمان بوونەوە، دوایی لەگـەڵ پـێغەمبەری خـوا ﷺ گوێیان بۆ گرت، وە فەرمانبـەریی بـوون و بـە قسـەیان كـرد، وە خـوا ﷻ فێڵـی ئـەو دوژمنـە (شـاسی كـوڕی قەیـسی) كوژانـدەوە، وە خـوا بـەو بۆنـەوە ئـەم ئایەتـەی نارده خـوارێ كـە دەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾، وە دەربـــــارەی هەڵوێـــستەكەی

(أَوْسُ بْنُ قَيْظي)و (جَبَّار بن صخر) ﴿واتە: ئەو پیاوەی ئەوسو ئەو پیاوەی خەزرەج کە بۆ یەك هەڵسانە سەر چۆكو قسەیان بەیەكدی گوت، وە ئەوانەی كە لەگەڵیاندا بوون لە هۆزەكەیان وە ئەوەی كە كردیان﴾ لەبارەی وانیشەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ، كە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴾، تاكو دەگاتە: ﴿ ... وَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ ﴾.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم دوازدە ئایەتەدا ڕوو لە پێغەمبەری خوا ﷺو بڕواداران دەكاتو ئامۆژگاریی یان دەكات، كە لە فێڵو پیلانی خاوەن كتێبەكان وریابنو پەیوەندیی نێوان خۆیانو خوا ﷻو پابەندیی بە ئیسلامەوەو، یەكڕیزیی نێوان خۆیان پتەوو مەحكەم بكەن، سەرەتا ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەكاتو پێی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴾، بڵێ: ئەی خاوەن كتێبینە! بۆچی بە ئایەتەكانی خوا بێبڕوان، وە خواش چاودێرە لەسەر ئەوەی كە دەیكەن دەزانێ، ئنجا دووبارە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، لە ئایەتی یەكەمدا دەفەرموێ: سەرزەنشتیان بكەو سەركۆنەیان بكە لەسەر ئەوە كە بە ئایەتەكانی خوا بێبڕوان، لە حاڵێكدا كە دەزانن خوای پەروەردگاریش ئاگاداری كردەوەو هەڵوێستەكانیانە، وە خۆشیان دەزانن ئەو ئایەتانەی كە بەرانبەریان بێبڕوان، هی خوانو لە خواوە هاتوون، وە نیشانەكانی پێغەمبەری كۆتایی ﷺ لە كتێبەكانی واندا هەن، وە دەشزانن كە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، وە لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێ: بڵێ: ئەی خاوەن كتێبینە! بۆچی خەڵك لەڕێی خوا لادەدەن؟ (ئەوە بۆخۆتان ئیمان

ناهێنن جارِ بە جەهەندەم، بەلاَم بۆچی ئەوانەی ئیمان دێنن دەتانەوێ ئەوانیش لەڕێی خوا لابدەن؟) ﴿تَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾، وە دەتانەوێ ئایەتەكانی خوا لار بكەن، وە ڕێبازی خوا لارو خوار بكەن، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو لاریی و خوارییەی خۆتانی بگونجێنن، یاخود دەتانەوێ ئایەتەكانی خوا لار بكەن، بۆ ئەوەی خەڵك لەبەر چاوی بكەون، ﴿وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ﴾، وە خۆشتان شایەدن، دەزانن كە دینی خوا ڕاستەو هیچ لارییەكی تێدانیە، ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾، وە خواش بێئاگانیە لەوەی كە دەیكەن، ئەوە وەك سەرزەنشتكردنی خاوەن كتێبەكان، كە دیارە مەبەست پێی جوولەكەكانە، بەلاَم دیارە هەر جوولەكە وایان نەكردوە، نەصرانیی یەكانیش ئەو پیلانو فێلاَنەیان هەر هەبووەو ئێستاش هەر هەیانە، جا ئەوە یەكێك لە لایەنەكانی ئیعجازی قورئانە كە خوا ﷻ ئەو كاتە چەند ئایەتێكی ناردوونە خوار دەربارەی ڕووداوێك، بەلاَم وەنەبێ ئەو ئایەتانە كاریگەرییان بەسەرچووبێ‌و تەنیا بەكەڵكی ئەوكاتە بێن، كە ئەو ڕووداوەی تێدا بووەو تێپەڕیوە، بەڵكو كە تۆ تەماشا دەكەی لەبەر ئەوەی ئەو ئایەتانە بە زانیاریی بێ سنووری خوای زاناو شارەزا هاتوون، دەربارەی هەر شتێك هاتبن، با ڕووداوێكی بچووكیش بووبێ، بەلاَم خوا یاسایەك‌و بنچینەیەكی گشتی بۆ داناوە، كە بەكەڵكی دوای ئەو ڕووداوەش هاتوەو، تاكو دنیاش كۆتایی دێ هەر كاریگەرن، تۆ تەماشا بكە ئێستاش جوولەكەو نەصرانیی یەكان هەمیشە كوفر بە ئایەتەكانی خوا دەكەن، وە هەمیشە دەیانەوێ مسوڵمانان بخەنە گومانەوەو پڕوپاگەندەی خراپ لە دژی ئیسلام دەكەن، وە ئیسلام خوارو لارو دەخەنەبەر چاوی خەڵك، واتە: بۆیەش زانایان گوتوویانە: (إنَّ خصُوصَ السَبَبِ لا يَمْنَعُ شُمُولَ الْمَعْنَى) واتە: تایبەتمەندبوونی هۆكاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان، ڕێگا ناگرێ لە بەردەم گشتگیریی ماناكەیدا، ئەو ئایەتانە زۆریان بەهۆی ڕووداوێكەوە هاتوونە خوار، وەلاَمی پرسیارێكن، چارەسەری گرفتێكن، بەلاَم واتاكەیان گشتییە، دیارە ئەوەش تەنیا بە خوای زاناو توانا دەكرێ، ئەگەرنا هەركەسێ

قسەیەك بكات بۆ مەسەلەیەكی تایبەت هەر بە كەڵكی ئەو مەسەلە تایبەتە دێ، وە قسەیەك بكات بۆ ڕووداوێكی تایبەت، هەر بە كەڵكی ئەوە دێو، بە كەڵكی دوای ئەوە نایە، بەڵام فەرمایشتی خوای كاربەجێ وانییە، ئنجا دوای سەرزەنشتكردنی جوولەكەو نەصرانیی یەكان، یان ئەو خاوەن كتێبانەی بەو شێوەیە ڕەفتار دەكەن، ئنجا دێتە سەر ئاگاداركردنەوەی مسوڵمانانو سەرزەنشتكردنی ئەو بڕوادارانەی كە ئەگەر لە خۆیان وریانەبن، كڵاوی ئەهلی كوفریان دەچێتە سەر، وە بە تەڵەو داوی ئەوانەوە دەبن، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ﴾،

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر فەرمانبەریی دەستەیەك لەوانە بكەن كە كتێبیان پێدراوە، (ئەگەر بە قسەیان بكەن) ئەوە دوای ئیمانەكەتان، دەتانكەنەوە بە كافرو هەڵتاندەگێڕنەوە، ئەوەش دیسان ڕاستییەكی مێژووییەو هەموو ئەوانەی كە لە ژێر كاریگەریی جوولەكەو نەصرانییان دان، بەرەو كوفر دەچن، ئێستاش ئەو عەلمانیەتەی ئەمڕۆ كە لە عالەمی ئیسلامی دا هەیە (سیكۆلاریزم)، وە كاتی خۆی فیكرەی (ماركسیزم)و ئەو فیكرانەی دیكە، یان جوولەكەیەك سەرچاوەكەیانە، یاخود نەصرانیی یەك، ڕۆڵەی مسوڵمانان بەچی لە دین هەڵگەڕاونەوە؟ بە شوێن كەوتنی ئەو فیكرانە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر بە قسەی ئەوانە بكەن كە كتێبیان پێدراوە، لە دوای ئەوەی ئیمانتان هێناوە، دەتانكەنەوە بە كافر، هەرواشەو زۆر لە ڕۆڵەی مسوڵمانانیان كافر كردوە، بە هۆی ئەو بیردۆزەو ڕێچكەو ڕێبازانەوە، كە بێجگە لە بەدبەختیی بۆ مسوڵمانان، هیچیان پێنەبوو، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥ ﴾، خوای زاناو شارەزا وەك بڵێی بە سەرسوڕمانەوە دەفەرموێ: جا چۆن دەبێ بێبڕوابنەوە، چۆن دەبێ كافر بنەوە، لە حاڵێكدا كە ئێوە ئایەتەكانی خواتان لەسەر دەخوێندرێنەوەو پێغەمبەری خواشتان ﷺ لەنێودایە، یانی: شتێكی زۆر سەیرو بێجێیە! كەسانێك كافربن كە ئایەتی خوایان بۆ دەخوێندرێتەوە بەیانیانو ئێواران، وە

پـێغەمبەری خـوایان لـە نێودایـە، کەسێك کـە ئایـەتی خـوای لەدەسـتدا نەبـێ، وە پێغـەمبەری خـوای ﷺ لـە نیزیکـەوە نەبـێ، ڕەنگـە بیـانووی هەبـێ کـە ئەگـەر ئیـسلامیش نەناسـێو ئیمـانیش نەناسـێ، بـەڵام سـەیرە بـۆ کەسـانێك کـە ئایـەتی خـوایان بەسـەردا دەخوێندرێتـەوەو، پـێغـەمبەری خـوایان لـە نێودایـە بێبـڕوابن!

ئنجـا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، وە هـەر کەسـێك دەست بە خـواوە بگـرێ، واتە: هەرکەسێك دەست بە دینـی خـواوە بگـرێ، دەسـت بە ڕێسمانی خـواوە بگـرێ، ئەوە بە تەئکیـد ڕێنمـایی کـراوە بـەرەو ڕێیـەکی ڕاسـت، جـا ڕەنگـە یـەکێك بپرسـێ بڵـێ: باشـە کـاتی خـۆی ئایەتـەکان خوێندراونـەوەو ئێـستاش ئایـەتمان بەسـەردا دەخوێنرێتـەوەو دەیخوێنینـەوە، بـەڵام پـێغـەمبەری خـوا ﷺ کە کـاتی خۆی لە نێو هاوەڵانی بەرێزدا بووە، خۆ ئێستا پـێغەمبەر ﷺ لـە نێـو ئێمـەدا نیـە؟ لـە وەڵامـدا دەڵـێین: بـا، ئێـستاش پـێغـەمبەری خـوا ﷺ لەنیـو ئێمـە دایـە، چـونکە مەبەسـت لـە بـوونی پـێغـەمبەر، وجـودی جەسـتەو خوێنو گۆشتەکەی نەبووە، بەڵکو مەبەست پێـی ئەو ئیمانو هیدایەتـە بووە، کـە پـێغـەمبەر ﷺ لـە خـواوە هێنـاویەتی، کـە قورئـانو فەرمایـشتو کردەوەکـانی بـوون، کـە دوایـی بوونـە سـوننەت، کەواتـە: ئێـستاش ئـەوە سـوننەتی پـێغەمبەری خـوا ﷺ کـە دیـارە ئـەویش ڕوونکردنـەوەی قورئانـەو چـۆنیەتی کارپێـکردنو پراکتیزەکـردنی قورئـانە، ئـەو سـوننەتە لـە نێـو ئێمـەدا هەیـە، ئنجـا دووبـارە خـوا ﷻ بانگی ئەوانە دەکات کە ئیمانیان هێنـاوەو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! وەك بۆ خـوا شایـستەیەو وەك لـە خـوا دەوەشـێتەوە، پـارێز لـە خـوا بکـەن، وە بـە مـسوڵمانەتییش نەبـێ مەمـرن، لـە سـیاقی ئایەتەکـان بۆمـان دەردەکـەوێ کـە تەقـوای خـوا لێـرەدا یـانی: خۆپاراسـتن لـە شـوێنکەوتنی غـەیری ئیـسلامو خۆپاراستن لـە کەوتنـە ژێـر کاریگـەریی جوولەکەو نەصـڕانیی یـەکانو ئەوانـەی وەك وانـن، چونکـە لێـرەدا تـەقوا، واتـە: خۆپاراسـتنو تـەقوا لـە خـوا، واتـە: خۆپاراستن لە هەرشتێك کـە خـوا پـێی ناخۆشـە، بەپێـی سـیاقی ئایەتـەکـەش

بۆمان دەردەکەوێ کە لێرەدا مەبەست پێی خۆپاراستنە لە سزای خوا، بەهۆی نەکەوتنە ژێر کاریگەریی جوولەکەو نەصرانیی یەکانو شوێنکەوتنی ڕێچکەو بیردۆزەکانیان، کەواتە: تەقوا تەنیا بریتی نیە لە حاڵەتێکی شەخصیی یان حاڵەتێکی ئەخلاقیی، بەڵکو تەقوا ڕەهەندی سیاسیی هەیە، ڕەهەندی ئابووریی هەیە، وە ڕەهەندی کۆمەڵایەتیی هەیە، ڕەهەندی فیکریی هەیە... هتد، تەقوای سیاسیی ئەوەیە، کە جگە لە ئیسلام بە دوای هیچ ڕێبازێکی دیکە نەکەوی، وە تەقوای فیکریی ئەوەیە، کە غەیری قورئانو سوننەت بەهاکانو تێڕوانینەکانی خۆت لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە وەرنەگری، وە تەقوای کۆمەڵایەتیی ئەوەیە، کە خۆت بپارێزی لە هەموو ئەو شتانەی کە قورئان قەدەغەی کردوون لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، وە تەقوای ئابووریی ئەوەیە، کە خۆت بپارێزی لەو گوناهانەی کە لە بواری ئابوورییدا ئیسلام قەدەغەی کردوون، وەك: دزیی و سوود خۆریی و ڕێگریی و ... هتد، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾، وە بە مسوڵمانەتییش نەبێ مەمرن، واتە: بە دوای ڕێبازی غەیری ئیسلام مەکەون، چونکە کێ بە مسوڵمانەتیی دەمرێ؟ کەسێك کە پابەندبێ بە ئیسلامەوە، وە ژیانەکەی بەپێی ڕێبازو بەرنامەی ئیسلام بگوزەرێنێ، کە دیارە سەرەنجامەکەشی مردنێکی مسوڵمانانە دەبێ، ئەگەرنا ئایا کەسێك بە کافرێتیی بژی، دەبێ بەتەمابێ بە مسوڵمانەتیی بمرێ؟! هەرگیز شتی وانابێ، چونکە ئینسان لەسەر چی بژی لەسەر ئەوەش دەمرێ، ئەگەر بە مسوڵمانەتیی بژی، دەبێ زۆر دڵە ڕاوکەی نەبێ، بڵێ: دەبێ خاتیمەم چۆن بێ؟!! نا، ئومێد وایە کە خاتیمەی خێربێ، کەواتە: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾، خۆ ئینسان مردنەکەی بە دەستی خۆی نیەو، بە دەست خوایە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە بە شێوەیەك بژیێن کە کۆتایی ژیانەکەتان مسوڵمانانە بێو، بە مسوڵمانەتی بمرن، ئینسان ژیانەکەی بەدەست خۆیەتی، بەڵام مردنەکەی بە دەست خۆی نیە، چۆن دەمرێ؟ بەڵام ژیانەکەی بە دەست

خۆیەتی، کەواتە، کە دەفەرموێ: بە مسوڵمانەتیی مەمرن، واتە: بە مسوڵمانەتیی بژین، تاکو بە مسوڵمانەتی بمرن، ئنجا دووبارە خوا فەرمان بە ئیمانداران دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾، تێکرا دەست بە ڕێسمانی خوا بگرنو پەرتەوازە مەبن، (وَاعْتَصِمُواْ) توند دەست پێوە بگرن، چونکە (عَصْمُ) واتە: دەست پێ گرتن، (إعتِصَام) واتە: توند دەست پێوە گرتن، (حَبْل)یش بەمانای پەتو گوریسو ڕێسمان دێ، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ ڕێبازی خوا، یان بۆ کیتابی خوا یان بۆ بەندایەتیی کردن بۆ خوا ﷻ، چونکە وەك چۆن ئینسان کاتێك دەکەوێتە چاڵێکەوە، دەبێ دەست بە پەتێکەوە بگرێ تا بێتە دەرێ، پەتێکی بۆ دادێڵنە بیرێ، دەستی پێدەگرێو هەڵیدەکێشنەوە، واتە: ئێوەش لەم بیری ژیانی دنیایەدان، ژیانی دنیا وەك بیرێك وایە کە ئێمەی کەوتوونیەتێ، چۆن دەتوانین بەرەو بەهەشت بچینەوە؟ چۆن دەتوانین بەرەو خوا هەڵکشێین؟ کاتێك ئەوە دەتوانین کە دەست بە ڕێسمانی خواوە بگرین، خوای پەروەردگار قورئانی وەك ڕێسمانو گوریسێك کە لە ئاسمانەوە بۆ ئێمە بەربۆتەوە، یاخود پەتێکی قایمو قوڵفەیەك ناودەنێ، وەك لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦ ﴾البقرة، واتە: هەرکەسێك کوفر بە طاغووت بکاو ئیمان بە خوا بێنێ، ئەوە دەستی بە هەنگڵ یاخود قوڵفەیەکی قایم گرتوە کە ناپسێ، وە خوا بیسەری زانایە، لێرەدا خوای کاربەجێ دینی خۆی، کیتابو بەرنامەی خۆی، بۆ ئێمە بە قوڵفەیەکی قایمو مەحکەم دەچوێنێ کە دەستی پێدەگرین، بۆ ئەوەی پێی هەڵکشێینەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾، وە یادی چاکەو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەر خۆتان، دیارە ئەوە بە پلەی یەکەم مەبەستی پێی هاوەڵانە، بەڵام ئێمەش دەگرێتەوە، چونکە ئەم ئیسلامە بۆ هەموو لایەك نیعمەتەو، بۆ هەموو لایەك چاکەیەو خێرو خۆشییە ﴿ إِذۡ

كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ ﴾، كاتێك كە پێش ئەوەی ئیسلامتان بۆبێ ئەی ئەوس‌و خەزرەج، ئەی مسوڵمانانی یەكەم! پێكەوە دوژمن بوون، بەڵام خوا دڵی بەیەكەوە گرێدان ﴿ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا ﴾، بەهۆی چاكەو نیعمەتی خواوە كە ئیسلامە، لە دوژمنایەتییەوە بوون بە برا، ﴿ وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ﴾، وە ئێوە لەسەر لێوارو قەراغی چاڵێكی ئاگر بوون‌و خوا ئێوەی دەرباز كرد، خەریك بوو بكەونە نێوی، خوا دەربازی كردن، بەڵێ ئەگەر ئیسلامیان نەگەیبایە گەلی عەرەب یەكدیان دەبڕاندەوە، جاری وابووە لەسەر چاوی مانگایەك شەڕی چل ساڵەیان پێكەوە كردوە، بە سەدان كەسیان لە یەكدی قەتڵ عام كردوە، لەسەر شتی زۆر بچووك، وەك خوا دەفەرموێ: لەسەر قەراغی چاڵێكی ئاگر بوون كە بە تەئكید شەڕو كوشتاری نێوخۆ، ئاگرە، ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾، ئاوا خوا ئایەتەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕۆشن دەكاتەوە، بۆ ئەوەی ڕێی ڕاست بگرن، ئنجا فەرمان دەكات بە مسوڵمانان كە سێ ئەرك لەنێو خۆیاندا بێننەدی، دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾، وە با لە ئێوە كۆمەڵێك هەبن، بانگەواز بكەن بۆ چاكەو فەرمان بكەن بە هەرچی شتی پەسندەو، ڕێگریی لە هەرچی شتی ناپەسندە، بكەن، وە هەر ئەوانەشن سەرفرازان، وشەی (خیر) هەر شتێكە كە سوودی بۆ خەڵك هەبێ، ئێمە دەبێ خەڵكی بۆچی بانگ بكەین: دیارە بەر لە هەموو شتێك بۆ كیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ كە پڕن لە خێرو خۆشیی‌و سوودی دنیاو دوارۆژ بۆ خەڵكی، وە فەرمان بە شتی پەسند ﴿ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، وشەی: (الْمَعروف) (ال)ی تەعریفی لەسەرە، واتە: هەرچی پەسندە، جا لە ڕووی فیكریی‌و عەقیدەیی یەوە بێ، لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە بێ، لە ڕووی سیاسییەوە بێ، لە ڕووی ئەخلاقییەوە بێ، لە ڕووی خێزانییەوە بێ، لە ڕووی ئیعلامییەوە بێ، لەهەر

ڕوویەکەوە بێ، ئەو شتانەی پەسندن دەبێ بچەسپێنرێن، چ شتێك پەسندە؟ ئەوانەی کە شەریعەت بە پەسندی داناون، وە عەقڵی سەلیمیش بە پەسندیان دەزانێ، پێویستە لە نێو مسوڵماناندا کۆمەڵێك هەبن، فەرمان بە شتە پەسندەکان بکەن، وە ڕێگریی بکەن لە شتە ناپەسندەکان، شتە ناپەسندەکان چین؟ هەموو ئەو شتانەن کە شەریعەتی خواو عەقڵی سەلیمی ئینسان بە خراپیان دەزانێ، جا چ پەیوەندییان بە لایەنی فیکرو بیروبڕواوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە لایەنی عیبادەتەوە هەبێ، لایەنی ئەخلاقیی، لایەنی کۆمەڵایەتیی، لایەنی خێزانیی، لایەنی ئابووریی، لایەنی سیاسیی، کەواتە: مسوڵمانان دەبێ لە نێویاندا کەسانێك هەبن هەمیشە خەریکی پاکسازیی و چاکسازیی بن، خەریکی بژارکردنی کۆمەڵگابن لە شتی خراپ، وە ڕازاندنەوەی بە شتی باش، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخْتَلَفُواْ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَأُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، وەك ئەوانە مەبن دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هاتن، پێکەوە پەرتەوازەو ناکۆك بوون، دووبەرەکییان هەبوو، وە ئەوانە ئازارێکی گەورەیان بۆ دانراوە لە ڕۆژی دوایی دا، کەواتە: پەند لەوانەی پێش خۆتان وەربگرن لە جوولەکەکانو نەصرانیی یەکان، پەند لە سەردەمی نەفامیی خۆتان وەربگرن، با ناکۆکیی و دووبەرەکییتان نەبێ، پێکەوە پەرتەوازە مەبن، هەڵبەتە ڕاجیایی لەو شتانەدا کە شەریعەت بواری ڕاجیایی تێدا هێشتوونەتەوە، ئاسایی یە، وەك چەند جۆرە تەحییاتێك هەن، یان بە چەند جۆرێك دەست دەگیرێ، یان سێ جۆرە حەج کردن هەیە، حەجی: (قِرانو إفرادو تمتع)، یان بە چەند جۆرێك بانگ دەدرێ، یان بە چەند جۆرێك قامەت دەکرێ، یاخود لە مەسەلەیەکی شەرعییدا ئەم ڕایە هەیەو ئەوەشیان هەیە، ئەوەش هەڵدەگرێ ئەمەش هەڵدەگرێ، ئەوە پێی ناگوترێ ناکۆکیی و دووبەرەکیی، بۆچی؟ چونکە ئەوانە شتی گچکەن، ناکۆکیی و دووبەرەکیی ئەوەیە کە لە ئەصڵی دینداو لە شتە بنچینەیی یەکاندا مسوڵمانان ناکۆك و

ناتەبابن، هەر بۆیە ئەهلی سوننەتو جەماعەت بەوانەیان گوتووە: (أهل البدعة)، (الفِرَقْ) كە لە شتی بنچینەیی دا لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ لایانداوە، وەك: بواری عەقیدەو بنچینە گەورەكانی ئایین، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾، ئەوانەی كە دوای هاتنی ئایەتو بەڵگە ڕۆشنەكانی خوا، پەرتەوازە دەبن، وە دووبەرەكیی و ناكۆكیی یان لە نێودا دەبێ، ئازارێكی مەزنیان بۆ دانراوەو، لەو ڕۆژەدا هەندێك ڕوو گەشو سپی دەبنو درەوشاوە دەبن، وە هەندێك ڕوو ڕەشو تاڵ دەبن، ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ ﴾، جا ئەوانەی كە ڕوویان ڕەش هەڵگەڕاوەو تاڵ بووە، پێیان دەگوترێ: ﴿ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾، ئایا دوای ئەوەی ئیمانتان هێناوە، كوفرتان كردو خۆتان تووشی بێبڕوایی كردەوە؟! دە ئازار بچێژن بەهۆی ئەوەوە كە بێبڕوابوون ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، بەڵام ئەوانەی كە ڕوویان گەشو درەوشاوەیە، ئەوە لەنێو بەزەیی خوادانو هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، بەزەیی خواش لە بەهەشتی خوادا بەرجەستە دەبێ، هەروەك چۆن تووڕەیی خواش لە دۆزەخدا بەرجەستە دەبێ ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئەوانە ئایەتەكانی خوان بەهەق بەسەر تۆدا دەیانخوێنینەوە (ئەی موحەممەد! ﷺ)، وە خوا نایەوێ ستەم لە جیهانییان بكات، واتە: خوای دادگەر هیچ ئیشێكی بەوە نیە زوڵمو ستەم لە بەندەكانی بكات، بەڵكو خوای پەروەردگار لەوە بە بەزەییترە، وە لەوە گەورەترە كە زوڵمو ستەم لە بەندەكانی بكات، بەڵام بۆ خۆیان زوڵم لە خۆیان دەكەن، واتە: كاتێك خوای پەروەردگار لەسەر خراپەكاریی سزایان دەدات، زوڵمیان لێناكات، بەڵكو خۆیان زوڵمیان لە خۆیان كردوە، چونكە خوای دادگەر وەك بۆ خۆیان شایستەیە ئاوا مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات، كە سزایان دەدات ئەوە كردەوەكانی خۆیانە دێنەوە ڕێیان، كەواتە: ئێوە خۆ بپارێزن لەوەی كە دووچاریی سزاو جەزرەبەی خوای باڵادەست بن، بە هۆی

لادانەوە لە ئیسلام، دوای ئەوەی کە ئیمانتان هێناوەو، بەهۆی لادانەوە لە برایەتیی و یەکڕیزیی دوای ئەوەی کە ئیسلام دڵی بەیەکەوە گرێداون، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴾، وە هەرچی لە ئاسمانەکانو لە زەوی دا هەیە، هەمووی هی خوایە، خوا خاوەنی هەموو شتێکەو کاروبارەکانیش هەر بۆ لای وی دەگێڕرێنەوە لە دواڕۆژدا، لە دنیادا خوا خاوەنی هەموو شتێکە، لە دواڕۆژیشدا خوا خاوەنی هەموو کاروبارێکەو هەموو سەرەنجامێك دەچێتەوە بۆ لای خوا، کەواتە: هەتا دەتوانن ئاگاتان لە خوابێو لە ڕێسمانی خوابێو ئاگاتان لە ڕێبازی خوابێ، چونکە لە دنیادا هەر ئەو خاوەنەو، لە دواڕۆژیشدا هەر ئەو هەمەکارەیەو، هەر ئەو خاوەنی سزاو پاداشتە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

مەسەلەی یەکەم: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾، پێشتر ئێمە ئەم دوو ئایەتە بەپێزەمان تەفسیرکردن، کە خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەری خۆی دەکات، کە بانگی خاوەن کتێبەکان بکاتو بە گلەییو سەرزەنشتەوە پێیان بڵێ: بۆچی بەرانبەر بە ئایەتەکانی خوا بێبڕوان؟ وە بۆچی خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، وە ڕێی خوا ﷻ خوارو خێچ دەکەن، یانی: دەتانەوێ بە خوارو خێچیی بیخەنە بەرچاوی خەڵك، لەم دوو ئایەتەوە وەردەگیرێ کە کوفر بە ئایەتی خوا، سەردەکێشێ بۆ ئەوە کە ئینسان خەڵك لە ڕێی خوا لابدات، هەرکەسێك هەڵگری هەر بیروبڕوایەك بێ، پێی خۆشە خەڵکی دیکەش هەڵگری ئەو بیرو بڕوایەی ئەو بێ، سروشتی ئینسان وایە، کاتێك کە ئینسان کوفری لە دڵدا دەچەسپێ، دیارە پێی خۆشە هەموو

خەڵـکی دیکـەش وەك وی بـێ، هـەروەك ئینـسانی ئیمانـدار کـە ئیمـانی لـە دڵـدا دەچەسپـێ، پێـی خۆشـە خەڵـکی دیکـەش وەك ئـەو ئەهلـی ئیمـان بـن، ئـەوە یـەك، پاشـان کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، تویژەرەوانی قورئـان ئەم ئایەتـەیـان بە دوو واتایـان لێکداوەتەوە:

**یەکەم:** ئەوانـە دەیانـەوێ ڕێبـازی خـوا خـوارو خێچو لار بخەنـە پـێش چاوی خەڵك، بۆ ئەوەی لەبەر چاوی خەڵکی بیبیێـزێنن.

**دووەم:** یـاخود دەیانـەوێ ڕێبـازی خـواو دینـی هـەقو ڕاسـتی خـوا لەگـەڵ ئـەو لاریـیو خـوارییەی کـە بـۆ خۆیـان لەسـەرینی بیگـونجێنن، دیـارە ئێـستاش لەگـەڵدابـێ هـەم جوولەکـەو نەصـڕانیی یـەکان، هـەم ئەوانـەی وەك وانـو ئەهلی کوفرن، هەردوو شێوەکە بەکاردێنن، هـەم لـە لایەکـەوە دەیانـەوێ کـە ئـایینو بەرنامـەی ڕاسـتو تـەواویی خـوا، ناشیـرین بکـەنو لەبەرچـاوی خەڵکی بخـەن، بۆیە تانەی لێدەدەنو ڕەخنـەی لێـدەگرن، ڕەخنـەی بێجـێ، وە پڕوپاگەندەی ژەهراویی لە دژ دەکەن، ئەوە لەلایەك، وە هەم دەشیانەوێ کە ئایەتـەکان مـل پـێ بـسووڕێننو یاساو حوکمـەکانی ئیـسلام بـە جۆرێـك لێبکـەن، کـە لەگـەڵ خـوارییو لاریـی ئەوانـدا بگونجـێ، واتـە: لەگـەڵ ئـەو ڕێبـازە لارەی کە ئـەوان لەسـەرینی، یـاخود ئـەو مەبەسـتە لارەی کـە خۆیـان دەیانـەوێ تـەحقیقی بکـەن، دەیـانەوێ مـل بـە حوکمـەکانی شـەریعەتی ئیـسلام بـسووڕێنن، بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ ئـەو لاریـیو خـوارییەی ئەوانـدا بگونجـێ، وە سـەرەنجام وای بخەنـە بەرچـاوی خـەڵك کـە ئـەوە ئـەوانیش کردەوەکانیان شـەرعیین، وە لەگەڵ فلانە ئایەت دەگونجێن !!

**مەسـەلەی دووەم:** کە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴾، کـە پێـشتر تەفـسیرمان کـرد، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! ئەگـەر گوێڕایـەڵی کۆمـەڵێك لەوانـەی

کتێبیان پێدراوە، بکەن، (واتە: لە پێش ئێوەدا کتێبیان پێدراوە) لە دوای ئیمانتان، دەتانکەنەوە بە کافر، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە مسوڵمانان ئەگەر لە خۆیان وریانەبن، وە بکەونە ژێر کاریگەریی جوولەکەو نەصرانیی یەکان بەتایبەتی، وە باقی ئەوانەی دیکە کە خۆیان بە خاوەن کتێبو بەرنامە دەزانن، بەگشتی، سەرەنجام بەرەو کوفریان دەبەن، وە ئەمەش حەقیقەتێکی درەوشاوەیە لە مێژووی کۆنو نوێدا، کە هەرکاتێك مسوڵمانان کەوتبنە ژێر کاریگەریی بیرو بۆچوونو رێبازو رێچکەکانی کە کەسانی جوولەکەو نەصرانیی دایاننـاون، ئەوە بەرەو کوفریان بردوون، وە لە ڕاستە شەقامی خوای پەروەردگار وەدووریان خستوون، دیارە ئەم مەسەلەیە جیایە لە بەهەرەمەندبوونی مسوڵمانان لەو زانیاریی و ئەزموونەو لەو شتە بەسوودانەی کە خەڵکی، کافر جا جوولەکەبن یان نەصرانیی یان هەر کەسێکی دی، وەدەستی دەهێنن، ئێمە شەریعەت ڕێی لێنەگرتووین کە سوود وەربگرین لە شتە بە سوودەکانیان، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿... فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾﴾ الزمر، واتە: مـوژدە بدە بەو بەنـدانەم، کە گوێ لە هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام دوایی شوێن چاکترینی دەکەون، ئا ئەوانەن کە خوا ڕێنمایی کردوون، وە هەر ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

مسوڵمان کراوەیە بە ڕووی هەموو فیکرەیەکدا، بە ڕووی هەموو کەسێکدا، بە ڕووی هەموو بیروبۆچوونو ئەزموونێکدا، بەڵام بە تەئکید هیچ شتێك وەرناگرێ کە لەگەڵ شەریعەتداو عەقیدەدا، وە لەگەڵ نەگۆڕەکانی ئیسلام دا دژ بوەستێ، وە بە دڵنیایی هیچ کاتێکیش شەریعەتی ئیسلامیی و عەقیدەی ئیسلامیی و نەگۆڕەکانی ئیسلام، لەگەڵ هیچ شتێکی سوودبەخش و بەکەڵك دژ ناوەستن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ

﴿ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، واتـــە: وە چـــۆن ئێوە بێبڕوا دەبن لە حاڵێکدا ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، وە پێغەمبەری خواتان لەنێودایە؟! وە هەرکەسێك دەست بە خوا بگرێ ئەوە بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنمایی کراوە، پێشتریش باسمان کرد کە کاتی خۆی ئایەتەکانی خوا خوێندراونەوە، ئێستاش ئایەتەکانی خوا لەنێو ئێمەدا دەخوێندرێنەوە، بەڵام کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو هاوەڵانی بەڕێزی دابووە، کە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوار، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بەگشتی قسە لەگەڵ ئیمانداران دەکاتو نەیفەرموە: ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر ! ﷺ، یان نەیفەرمووە: ئەی کۆچەرو پشتیوانەکان ! بەڵکو دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! واتە: لەگەڵ ئیمانداراندا دەدوێ، کە ئێمەش ئیمانداراین، جا ئایا لە نێوان ئێمەدا بوونی پێغەمبەر ﷺ بە چ واتایەکە؟ کوا پێغەمبەری خوا لەنێو ئێمە دایە؟! کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ﴾، ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێنەوەو پێغەمبەری خواشتان لە نێودایە، ئایەتەکان ئەوە دیارن کە بەسەرماندا دەخوێنرێنەوە، بەڵام چۆن پێغەمبەر ﷺ لەنێو ئێمە دایە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوو واتا لەنێو ئێمە دایە:

**یەکەم**: ڕێبازو بەرنامەکەیو سوننەتەکەی لەنێو ئێمە دایە.

**دووەم**: جێنشینەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە زانایانی ڕاستەقینەن، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٤١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٨٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٨)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ، واتە: بێگومان زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن (عليهم الصلاة والسلام)، کەواتە: هەبوونی زانایانو پێشەوایانی ڕاستەقینەو شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەر ﷺ، لەنێوماندا، وەك هەبوونی پێغەمبەری خوایە لەنێو

هاوەڵانیـــدا، چونكـــە ئـــەوانیش خـــاوەنی هـــەمان ڕێبـــازو ڕەوشـــتن كـــە پـێغەمبەری خـوا ﷺ لەسەری بووە، دیـارە زانایـانی ئیـسلامیش ئەوانەیـان كـە ڕەسـەنو ڕاسـتەقینەن، كـەمو زۆر هـەمان ڕێبـازو ڕەوشـت لـە خۆیانـدا بەرجەسـتە دەكەن.

**مەسـەلەی چـوارەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾، ئـەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە ! وەك بـۆ خـوا شایـستەیە پـارێزی لێبكـەن، یـان وەك پـێویستە پارێزی لە خوا بكەن، ﴿حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾، ئاوایان لێكداوەتەوە: (أَي التَّقوَى الَّتي تَحِقُّ لَـهُ) واتـە: ئـەو تەقوایـەی كـە بـۆ خـوا شایـستەیە، ئنجـا عەبدوڵـلای كـوڕی مەسـعوود - خــوا لێـی ڕازی بــێ- كـە یەكێكـە لـەو هاوەڵـە بەڕێزانـەی پـێغـەمبەر ﷺ كـە زۆر شـارەزا بـووە لـە قورئـان، لـە تەفـسیری: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾، گوتوویـــەتی: (أَنْ يُطَـاعَ فَـلاَ يُعْـصَى، وَيُـذْكَرَ فَـلاَ يُنْسَى، وَيُشْكَرَ فَلاَ يُكْفَرَ)، (أَخْرَجَـهُ عَبْـد الـرزاق، وَابْـنُ أَبِـي شَـيْبَةَ، وَعَبْـدُ بْـنُ حُمَيْـد، وَابْـنُ جَرِيـر، وَابْـنُ الْمُنْـذِر، وَابْـنُ أَبِـي حَـاتِم، وَالطَّبَرَانِـي، وَالْحَـاكِمُ وَصَحَّحَهُ، وَابْنُ مُرْدَوِيَـه)[1]، واتـــە: فەرمانبــەریی بـۆ بكـرێو سـەرپـێچیی لـە فەرمـانی نەكـرێ، وە یادی بكرێو لەبیـر نـەكرێ، وە سـوپاسی بكـرێو سـپڵـەیی بەرانبەر نەكرێ، ئنجـا هەنـدێك لـە توێـژەرەوانی قورئـان دەربـارەی ئـەم ڕستە قورئانییـە كـە دەفـەرموێ: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾، وەك بـۆ خـوا شایـستەیە پارێزی لێبكـەن، گوتوویانە: نەسخ كراوەتەوە، بەڵام بێگـومان مەنـسووخ بـوونی ئەم ئایەتەو هەڵوەشێنرانەوەو ئـیش پـێ نـەكرانی، شـتێكی بـێ بنەمایـە، ئنجا دەڵێن: گوایـە بە ئەم ئایەتە بەو ئـایەتە نەسخ بۆتـەوە كە دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ... ﴿١٦﴾﴾التغابن، واتە: ئەوەندەی لە تواناتان دایـە پـارێز لـە خـوا بكەن، بەڵام لەڕاستیدا كاتێك ئایەتێك بە ئایەتێك نەسخ دەبێتـەوە كە پـێكـەوە

1) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٤٧٥) برقم: (٥٧٢).

نـاكۆك بـن‌و تێكبگیـرێن، واتـە: نـەگونجێ بەیەكـەوە كۆبكرێنـەوە، بـەڵام ئایەتەكەی پـێشێ كە دەفەرموێ: وەك بۆ خـوا شایـستەیە پارێـزی لێبكـەن، وە ئەم ئایـەتەیان كە دەفەرموێ: ئەوەندەی كـە لـە تواناتانـدا هەیـە پـارێز لـە خـوا بكـەن، تێك ناگیـرێن، چونكە ئەوە بۆ خـوا شایـستەیە كـە بەپـێی توانـا پـارێز لە خـوا بكـەی، مانـای وایـە هەریەكن، واتـە: ئـەو تەقوایـە بـۆ خـوا شـایـستەیە كە لە توانای ئینسان دایە، وە خـوای زاناو شـارەزا شـتێك كـە لـە توانـای ئینـسان بەدەرە، لێی داوا ناكات، كەواتە: ئـەوە كـە دەفـەرموێ: ﴿ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ ﴾، لەگەڵ ئەو ئایەتەی دیكە كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ...﴿١٦﴾ ﴾ التغـابن، تێك ناگیـرێن، چونكە خـوا زیاد لـە توانـای ئینـسان فـەرمان بـە ئینـسان ناكـات، ئنجـا وەك پـێشتـریش باسـمان كـردوە، بـە بۆچـوونی ئێمـە هـیچ ئایـەتێك لـە قورئاندا نیە كە نەسخ بووبێتەوەو ئیشـی پـێنەكرێ، وە هـەندێك لـە زانـایانی پـێشین كـە وشـەی (نسخ)یـان بـەكارهێناوە مەبەسـتیان پـێـی ئەوەبـووە كـە ئـایـەت هـەبووە بەگشتی هاتوەو مانایـەكی گـشتی هـەبووە، بـەڵام ئایـەتێك لـە دوای وی ماناكـەی تایبـەت كـردوە، یـان ئایـەتێك بـە كـورتی (مجمـل)ی هـاتوە، ئایەتێكی دیكەی دوای وی هاتوە ماناكەی زیـاتر ڕۆشـن كردۆتـەوە، یـان ئایـەتێك حـوكمێكی بـە ڕەهـایی فـەرمووە، بـەڵام ئایـەتێك دوای وی هـاتوە حوكمەكـەی بەنددار (مُقیّد) كردوە، وەك زانایان دەڵێن: (تخـصیص العـام، تبیـین الـمجمل، تقییـد الـمطلق) ئـا ئـەوە هەیـە لـەنێو ئایەتـەكانی قورئـاندا، بـەڵام ئایـەتێك هـاتبێ‌و ئایەتێكی دیكەی نەسخ كردبێتـەوەو حوكمەكـەی نەهێـشتبێ، شـتی وا لە كـەلامی خـوای پەروەردگـاردا نیە.

<u>مەسـەلەی پـێنجـەم</u>: كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾، وە مـەمرن مەگـەر لە حاڵێكدا ئێوە مسوڵمان بن، پـێشتـریش باسـمان كرد كە چۆن مرۆڤ دەتوانـێ مردنێكی مـسوڵمانانە بمـرێ، خـۆ مـردن بەدەسـت مرۆڤ نیـە؟ وەڵام ئەوەیـە كـە: بـە شـێوەیەك بـژین كـە هـەموو ژیانتـان بەپـێی ئیـسلام بـێ، بـۆ

ئـەوەی کۆتـایی ژیانەکەشـتان کۆتاییـەکی مـسولّمانانە بـێ، وە لـە ڕاسـتیدا هەرکەسێك لەسەر چ بژیێ لەسەر ئەوەش دەمرێ، جا ئینـسان بەدەست خۆی نیە کەی دەمرێو لە کوێ دەمرێ، وە چۆن دەمـرێو بـە چـی دەمـرێ ؟ بـەڵام بەدەسـت خۆیـەتی چـۆنو بـە چ شـێوەیەك دەژیـێ، کەواتـە: ئەگـەر ئینـسان ئاگای لە ژیانەکەی بووو، ژیانێکـی مـسولّمانانەی بەڕێکـردو، بەشـێوەیەك ژیـا کە پابەند بوو بە شەریعەتەوە، ئەوە بە تەئکید کۆتایی ژیانەکەشی هەر بـەو شێوەیە دەبـێ.

**مەسەلەی شـەشەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾، هـەمووتان دەسـت بـە ڕێـسمانیی خـواوە بگـرنو پەرتـەوازە مـەبن، وشـەی: (عصم) واتە: (مَسْك) یانی: دەست پـێگرتن، وە (اعتصام) واتە: توند دەسـت پـێگرتن، وە (الإستعصام و الإستمساك)، واتـە: تونـد تونـد دەستی پێبگـری، وە وشـەی: (حبـل) لـە ئەسڵـی زمـانی عەرەبییـدا بـە گـوریسو بـە پـەت دەگوترێ، وە پاشان خـوازراوەتەوە بۆ هەرشتێك کە وەك هـۆکارێك پێـی بگـەی بە ئامانجێك، لێرەشدا لەم ئایەتـە قورئانییـەدا مەبەسـت پێـی خـودی قورئانـە، یاخود مەبەست پێـی پـێغەمبەری خـوایە ﷺ، یـان مەبەسـت پێـی ئیـسلامە، دیـارە ئیـسلامیش بریتیـە لـە کـۆی قورئـانو پـێغەمبەر ﷺ، وە هەندێکـیش گوتوویانـە: (حبـل الله) واتـە: دینـدایی ڕاسـتەقینە، یـاخود خـوا بەیـەکگرتن (التوحیـد)، یـان ئیخـلاصو سـاغ بوونـەوە بـۆ خـوا، هەمـوو ئـەو واتایـانەش لێك نیزیکـن، ئنجـا لێـرەدا بۆمـان دەردەکـەوێ کـە دەسـتگرتن بـە ڕێـسمانی خـوا، دەسـتگرتن بـە بەرنامـەی خـوا، ڕێگـا دەگـرێ لـە پەرتـەوازەبوونی مـسولّمانان واتـە: ئەگـەر ئێمـە هـەموو دەسـت بـە ڕێـسمانی خـواوە بگـرینو دەست بە بەرنامەی خـواوە بگرین، لە پەرتەوازەبوونو لە بـڵاوبوونو لـە بـەش بەش بوون دەپارێزرێـین، جارێك من لە مەجلیـسێك بـووم کـە باسـی تەبـاییو کوردایـەتییو یەکڕیـزیی نێوخـۆ دەکرا، مەلایـەکی سـەر بـە یەکـێ لـەو حیزبـە

عەلمانییانە کە لەوێ بوو، هەر دەیگوت: ئەوە نیە لە قورئاندا خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾، منیش گوتم: مامۆستا جا پێش ﴿وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾ش، وشەیەکی دیکە هەیە دەبێ ئەویش بڵێی، گوتی: کوا ؟! گوتم: خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾، هەمووتان دەست بە ڕێسمایی خواوە بگرن‌و پەرتەوازە مەبن‌و بڵاو مەبن، کەوابێ هەتا دەست بە ڕێسمانی خواوە نەگرین، هەر بڵاودەبین‌و دەپرژێین‌و پەرتەوازە دەبین.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾، وە چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، کە پێکەوە دوژمن بوون، بەڵام خوا دڵی بەیەکەوە گرێدان، وە بەهۆی نیعمەتی خواوە بوونە برا، وە لەسەر کەناری چاڵێکی ئاگر بوون، خوا ئێوەی دەرباز کرد، ئێمە میصداقی ئەم ئایەتە، هاتنەدی‌و بەرجەستەبوونی ئەم ئایەتە، لە ژیانی گەلی عەرەبدا زۆر بە ڕۆشنی دەبینین، عەرەب پێش ئەوەی ئیسلام بێت، وەك گەل (شعب) بوونیان نەبوو، بەڵکو وەك چەند تیرەیەکی پێکەوە ناکۆك‌و پێکەوە بەشەڕهاتوو بوونیان هەبوو، ئیسلام عەرەبی کۆکردەوەو لە چەند تیرەیەکی پەرش‌و بڵاوی بێسەروبەرەی پێکەوە ناکۆك‌و پێکەوە دژو بەشەڕهاتوو لەسەر شتی بچووکەوە، کردنی بە یەك میللەت، لە کاتێکدا کە پێش ئیسلام لەسەر شتی بچووك بچووك پێکەوە ناکۆکیی‌و نارێکیی یان دەبوو، ئیسلام وای لێکردن کە بۆ یەك ئامانجی گەورە بژین، کە بریتیە لە ڕەزمەندیی خوا، وە بەسەربردنی ژیان بەپێی شەریعەتی خوا، وە گەیاندنی پەیامی خوا بە مرۆڤایەتی، واتە: ئێمە ئەم ئایەتە موبارەکە میصداقەکەی، هاتنە دییەکەی‌و بەرهەم‌و بەرەکەتەکەی، لە ژیانی گەلی عەرەبدا زۆر ئاشکرا دەبینین، هەروەها لە دوای گەلی عەرەب، لە ژیانی تورك‌و فارس‌و کوردیشدا بەهەمان شێوە

دەیبیـنین، بـەڵام دیـارە کـە لـەنێو عەرەبـدا ئـەم ئایەتـە بەرجەسـتەبوونەکەی زیاترە، چونکە قورئـان یەکەمجـار لـەنێو ئەوانـدا هاتـە خـوار، وە بەڕاسـتی وەك ئەوانیش باش دەستیان پـێوە گرتبوو، کەسـی دیکە بەگشـتی ئـاوا دەسـتی پـێوە نـەگرتوە، واتـە: هاوەڵانــی بـەڕێزی پـێغـەمبەر ﷺ وەك ئـەوان ئـەو ئیمـانو ئیسلامەیان وەرگرتبوو، وەك تێگەیشـتن بـاش لێـی تێگەیشـتبوون، بـە قووڵـیی بـە فراوانیــی بـە چاکــیی، وە وەك پابەنـدبوونیش بـاش پــێوەی پابەنـدبوون، ئیـدی لـە دوای وانـیش هـەر میللـەتو گـەلێك بـە ئەنـدازەی ئـەوە کـە بـاش لـە قورئـانو ئیـسلام تێگەیـشتوەو بـاش پــێوەی پابەنــد بــووە، ئــەو بەرەکـەتو بەرهـەمو خێـرو بێـرە، ئـەوە وەحـدەتو برایـەتیىو دڵ پـێکەوە جۆشـدرانو کۆبوونەوەیە، کە خوای پەروەردگار ئاماژەی پـێدەکات، لە ژیانیاندا بەرجەستە بـووە، ئنجا لێـرەدا یەکێـك بـۆی هـەیە بپرسـێ: ئایـا ئێـستا ئـەم قورئـانە، وە ئـەم ئیمـانو ئیسلامە دەتوانێ چیمان بۆ بکـات؟! لـە وەڵامـدا دەڵێین: خـوا ﷻ هەر دوا بەدوای ئەو ئایەتەو لە کۆتاییـدا فەرموویـەتی: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾، واتـە: ئـاوا بـەو شـێوەیە خـوا ئایەتـەکانیتان بـۆ ڕۆشـن دەکاتەوە، بەڵکو ڕێـی ڕاست بگرن، کەواتـە: بـۆ ئـەو کـات ئیـسلام بـەو شـێوەیە ژیـانی عـەرەبی گـۆڕی، بـەڵام ئێـستاش بـۆ ئێمـە کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾، واتــە: بەڵــکو ڕێــی ڕاســت بگــرن، کەواتــە: ئــەم قورئانــە ئــەو گۆڕانکارییـەی کـرد، ئـەو وەرچـەرخانەی لـە ژیـانی عەرەبـدا کردوویـەتیو، لـە ژیـانی میللـەتانی دیکـەدا کردوویـەتی، بـە هەمـان شـێوە ئـەم قورئانـە هەمـان هـێزو پێـزو توانـای هەیـە کـە هـەمان گۆڕانکـاییو وەرچـەرخانو پاکـسازییو چاکسازیی دووبارە بکاتەوە، هەروەها لە سووڕەتی (الإسـراء) لـە ئایـەتی ژمـارە (٩)دا فەرموویـــــەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَبِيرٗا﴾، واتە: ئەم قورئانـە ڕێنمـایی دەکـات بۆ ڕێبـازێك یاخود بەرەو شێوە ژیانێك کە چاکتـرینە، ڕاستتـرینە، ئـەوە دیـارە

خوا بە ڕەهایی فەرموویەتی، واتە: لە هەموو چاخو سەردەمێکدا، لە هەموو قۆناغێکدا، قورئان ئەوەی لەتوانادایە، جا ئەمەشە کە وادەکات قورئانو ئیسلام کۆن نەبێ، چونکە ئەوەی ئەو کاتە کردوویەتی، ئێستاش لە توانای دایە، چونکە قورئان کتێبێك نیە زادەی بیرو هۆشی ئینسانێك بێ، تەنیا ئەو هەلومەرجەی کە ئەو کاتە تێیدا ژیاوە، لەبەرچاوی گرتبێ، بەڵکو قورئان وەك خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾الفرقان، واتە: بڵێ: کەسێك قورئانی ناردۆتە خوار، کە نهێنی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێ، وە بێگومان ئەو لێبوردەی بە بەزەیی یە، واتە: خوا ئێستاشی لێ دیار بووەو ئەو قورئانەی کە وەختی خۆی ناردوویەتە خوار، ئێستاشی لەبەرچاو بووە، گرفتو کێشەکانی کە ئێستاش بۆ بەشەر دێنە پێش، لەبەر چاوی کتێبی خوا ﷻ بوون، وە ئەو قورئانەی وا نازڵکردوە کە ئێستاش بتوانێ گرفتو کێشەکانی مرۆڤایەتی چارەسەرە بکاتو، خەڵکی ئێستاش بەختەوەر بکاتو، نەخۆشیی و دەردەکانی ئێستاش چارەسەر بکات، کە دیارە ئەوەش تەنیا کتێبی خوا لەبارانیدا هەیە، هەروەها خوای بێهاوتا لە سوورەتی (النور) لە ئایەتی (٥٤و ٥٥) دا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ... ﴾، واتە: بڵێ: فەرمانبەریی خوا بکەنو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، (واتە: پابەندبن بە قورئانەوەو پابەندبن بە سوونەتو ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ)، جا ئەگەر بە دەنگتەوە نەهاتنو پشتیان هەڵکرد، ئەوە پێغەمبەری خوا ئەوەی کە خراوەتە سەر شانیو پێی

سپێرراوە جێبەجێ کرد، (هەر ئەوەندە بەرپرسیارە، وە ئێوەش ئەو ئەرکەی دەخرێتە سەر شانتان لە بەرانبەریدا بەرپرسیارن، ئنجا ئایا ئەرکی پێغەمبەر ﷺ چییە؟)، ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾، لەسەر پێغەمبەر نیە مەگەر گەیاندنێکی ڕوونو ئاشکرا، بە ئاشکراو بە ڕوونیی ئەم پەیامە بە خەڵك بگەیەنێ، ئنجا ئایا بەرپرسیارێتی خەڵك چییە؟ بەرپرسیارێتی خەڵکیش ئەوەیە ئەو پەیامەی پێغەمبەر ﷺ پێیان دەگەیەنێ، جێبەجێی بکەنو پێوەی پابەندبن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْ﴾، دیارە کە بەگشتی فەرموویەتی: ئەگەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکەن پابەندبن بە قورئانو سوننەتەوە، ئەوە ڕێی ڕاست دەگرن، دەکەونە سەر ڕێی ڕاست ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾، وە لەسەر پێغەمبەری خوا نیە جگە لە گەیاندنێکی ڕوونو ئاشکرا، دوای ئەم ئایەتە یەکسەر دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، خوا بەڵێنی داوە بەوانەتان کە ئیمانیان هەیەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، کە بیانکاتە جێنشین، وەك چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی کردبوو بە جێنشین، وە ئەو دینەی کە بۆی هەڵبژاردوون بۆیان بچەسپێنێ، وە ترسیان بۆ بگۆڕێ بۆ هێمنییو ئاسایش، واتە: ئەو بەڵێنو موژدەیەی خوا لە جێی خۆیەتی، وە تەنیا بۆ هاوەڵانی بەرێزیش نەبووە، خوا لێیان ڕازی بێ، بەڵکو بۆ هەموو ئەوانەیە کە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەون.

**مەسەلەی هەشتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، کە پێشتر باسمان کرد، لێرەدا خوا سبحانەو تعالی فەرمان دەکات بە ئوممەتی ئیسلام، چونکە ئەو (لام)ەی سەر: (ولتكن)، لامی ئەمری پێ دەڵێن: واتە: پێویستە لەنێو ئێوەدا

ببێ، چی ببێ، وە کێ ببێ؟! ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ ﴾، با لە ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن، چونکە ئۆممەت، واتە: کۆمەڵ، جا ئەو کۆمەڵە چی دەکەن؟ بانگەواز دەکەن بۆ چاکەو، فەرمان دەکەن بە شتی پەسندو، ڕێگریی دەکەن لە شتی ناپەسند، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن، لێرەدا ئەم ئایەتە موبارەکە چەند شتێك دەگەیەنێ:

١) دەربارەی وشەی: (خَيْر) پێشتریش باسمان کرد، (الخَيْرُ: مَا يَرغَبُ فِيهِ الكُل، وَالشَّيءُ النَافِع، وضِدُّهُ الشَرُّ) وشەی: (خَيْر) هەرشتێکە هەموو کەس ئارەزووی دەکاتو پێی چاکە، وە (طبري) - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەربارەی پێناسەی وشەی: (خَيْر) دەڵێ: (اسْمٌ جَامِعٌ لِكُلّ مَا يُقَرِّبُ إِلى اللّهِ وَيُبْعِدُ مِن سَخَطِهِ) واتە: وشەی (خَيْر) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەر شتێك کە خەڵك لە خوا نیزیك دەکاتەوەو لە تووڕەیی خوا دووریان دەخاتەوە، کە دیارە بەو شتانە دەتوانین لە خوا نیزیك بینەوە کە بەکەڵكو سوودبەخشنو چاکن، وە بەو شتانەش دەتوانین تووڕەیی خوا لە خۆمان دووربخەینەوە، کە ئەوا شتانەی خوا فەرمانی پێکردووین، ئەنجامیان بدەین، جێبەجێیان بکەین.

٢) وشەی: (الْمَعْرُوفُ) واتە: زانراو یاخود ناسراو، وە (الْمُنكَر) واتە: نەزانراو یاخود نەناسراو، دەڵێ: (الْمَعْرُوفُ: اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْرَفُ بِالشَّرْعِ وَالعَقْلِ حُسْنُهُ)، واتە: (مَعْرُوفُ) ناوە بۆ هەر شتێك کە بە عەقڵو بە شەرع چاکییەکەی دەزانرێ، کەواتە: (مَعْرُوفُ) هەر شتێکە کە عەقڵ، واتە: عەقڵی سەلیم، وە شەرع، واتە: شەرعیی ڕاست، ئایەتو فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ، عەقڵو نەقڵ هەرشتێکیان بە چاك زانیبێ، ئەوە چاکە، وە بەتەئکید هەر شتێك قورئانو سوننەتی ڕاستو دروستی پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێکردبێو بە چاکیان زانیبێ، عەقڵی سەلیمو فیطرەتی ساغیش بە چاکی دەزانێ، ئەوە هیچ گومانی تێدانیەو هیچ

کاتێك عەقڵی ساغ لەگەڵ شەرعی ڕاستدا تێك ناگیرێ، ئەوەی کە تێك دەگیرێ یان عەقڵەکە ناتەواوە، یان شەرعەکە گۆڕدراوە، ئەگەرنا شەرعەکە، فەرمایشتی خوابێو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بێ، یاخود کردەوەی پێغەمبەر ﷺ بێو ڕاستبێ، بە تەئکید عەقڵی سەلیمیش پشتگیریی دەکاتو لەگەڵیدا تەبایە، بەڵام کە تێکگیرانمان بینی لە نێوان عەقڵو نەقڵدا، یاخود عەقڵو شتێك کە پێی دەگوترێ شەرع، وەك ئێستا لە تەوراتو ئینجیلەکاندا زۆر شت هەیە کە پێچەوانەی عەقڵو واقیعەو پێچەوانەی ئەزموونە، هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەوەی لەو تەوراتو ئینجیلانەدا هەیە هی خوا نیە، فەرمایشتی خوا نیە، ئەگەرنا موستەحیلە فەرمایشتی خوا لەگەڵ عەقڵ، لەگەڵ عیلم، لەگەڵ ئەزموون، تێکبگیرێ، کەواتە: هەرشتێك کە شەرع بە پەسندی بزانێ، عەقڵیش بە پەسندی دەزانێ.

٣) وشەی: (الْمُنْكَر): یانی چی؟ واتە: نەزانراو، نەناسراو، نامۆ، دەڵێ: (الْمُنْكَر: اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْرَفُ بِالشَّرْعِ وَالعَقْلِ قُبْحُهُ)، واتە: (مُنْكَر) ناوە بۆ هەر شتێك کە بە عەقڵو بە شەرع خراپییەکەی دەزانرێ، جا قسەبێ یان کردەوەبێ، بەڵێ دەبێ ئەو کۆمەڵە لە نێو مسوڵماناندا هەبن، کە بانگەواز بکەن بۆ هەر شتێك کە سوودو بەرژەوەندیی خەڵکی تێدایەو فەرمان بکەن بە هەرچی پەسندەو، ڕێگریی بکەن لە هەرچی ناپەسندە، وەك پێشتریش باسمان کرد کە هەرچی پەسندە، چ پەیوەندیی بە لایەنی عەقیدەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی عیبادەتەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ئەخلاقو ڕەوشتەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی کۆمەڵایەتییو خێزانەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی سیاسییو ئابوورییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی جەنگو ئاشتییەوە هەبێ ... هتد، پەیوەندیی بە هەرکام لەو لایەنانەوە هەبێ، ئەوە بەو پەسند (معروف)ە دادەنرێ، کە دەبێ فەرمانی پێبکرێو هەوڵی هێنانەدی بدرێ.

هەروەها (الْمنكر)یش واتە: شتی ناپەسند، شتی نامۆ، ئنجا ئایا شتی خراپو ناپەسند چییە؟ بریتیە لە هەر شتێك كە خراپو زیانبەخشە، چ پەیوەندیی بە لایەنی فیكرو عەقیدەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ڕەوشتو هەڵسوكەوتەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە بواری كۆمەڵایەتیی و خێزانەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ئابووریی و لایەنی سیاسییەوە هەبێ، وە چ پەیوەندیی بە لایەنی ئاشتیی و جەنگەوە هەبێ، هەر شتێك نامۆ بوو بەكەڵك نەهاتوو بوو، خراپ بوو، ئەوە لەسەر مسوڵمانان فەرزە ڕێگریی لێبكەن، هەڵبەتە ئەمەش شتێكی زۆر زۆر گەورەیە، بۆیەش خوا ﷻ دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾، هەر ئەوانە سەرفرازن، لەنێو مسوڵماناندا كێ سەرفرازو بەختەوەرە، كێ بە ئامانج دەگات؟ ئەوانەی كە هەمیشە خەریكی چاكسازیی و پاكسازیی كۆمەڵگاكەیانن، هەمیشە فەرمان بە چاكە بكەن، ئەوە چاكسازییە، وە ڕێگریی لە شتی ناپەسند بكەن، ئەوەش پاكسازییە، ئنجا فەرمان كردن بە هەر شتێكی باش، دیارە فەرمان كردنە بە خودی ئەو شتەو ئەو شتانەش كە پەكی لەسەریان كەوتوە، وە زانایان لەوبارەوە بنچینەیەكی شەرعییان داناوە دەڵێ: (الأمرُ بالشَّيءِ أمرٌ بهِ، وَبِمَا لا يَتمُّ إلاّ بهِ، والنَّهيُّ عَنِ الشَّيءِ نَهيٌ عَنْهُ وَعَمَّا يُؤَدِّي إلَيْهِ) واتە: فەرمان بە هەر شتێك، فەرمانە بە خودی خۆی وە فەرمانیشە بەو شتانەی كە پەكی لەسەریان كەوتوە[1]، هەروەها ڕێگریی لە هەر شتێكی ناپەسندو خراپ، ڕێگرییە لە هۆكارو پێشەكییەكانیشی، كە دەبنە هۆی هاتنەدی و پەیدابوونی بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: نوێژ بكە، نوێژ هەر لەخۆڕا دەكرێ؟! نەء، پێشتر دەبێ شارەزاییت هەبێ، كەواتە: فەرمان بە نوێژكردن فەرمانیشە بە شارەزایی هەبوونیش لەبارەی نوێژكردنیشەوە، وە نوێژ پێویستی بە دەستنوێژ نیە؟!

---

١) بڕوانە: (تیسیر الكریم الرّحمن في تفسیر كلام المنّان) عبدالرحمن بن ناصر السَّعدي، ص: (١٤٢).

کەواتە: خوا کە دەفەرموێ: نوێژ بکەن، واتە: دەستنوێژیش بگرن، وە نوێژ بە بەرگی پاکەوە نەبێ ناکرێ؟! کەواتە: فەرمان بە نوێژ، فەرمانە بەوەش کە دەبێ بەرگو پۆشاکی پاك لەبەربکەی، ئایا هەتا ڕوو لە قیبلە نەکەی نوێژ دەکرێ؟! نەخێر، کەواتە: دەبێ بە قیبلەش بزانی، لە کوێیە، نوێژ لە شوێنی پاك نەبێ دەکرێ؟! نەخێر، کەواتە: دەبێ شوێنێکی پاکیش هەڵبژێری، کەواتە: فەرمان بەهەر شتێك فەرمانە بە خۆیو بە هەموو ئەو شتانەی کە پەکی لەسەریان کەوتوە، یان کە خوا دەفەرموێ: شەریعەتی خوا پیادە بکەن﴿ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ ...(١٣) ﴾ الشورى، ئایا شەریعەتی خوا چۆن پیادە دەکرێ؟ دەبێ دەستەڵاتت هەبێ، دەستەڵات چۆن پەیدادەبێ؟ دەبێ مسوڵمانان تێبگەیەنیو هۆشیاریان بکەیەوە، لێکیان ببەستیەوەو بیانهۆنیەوە، کەواتە: چۆن دەتوانی فەرمان بە چاکە بکەیو ڕێگریی لە خراپە بکەی؟! دەبێ دەستەڵاتو قوەتێکت هەبێ، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ ﴾، چونکە دەزانێ بە تەنیا ناکرێ، دەفەرموێ: با کۆمەڵێك لەنێو ئێوەدا هەبن، کەواتە: ئایا ئێستا بوونی ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی، یان هەر لایەنێکی دیکەی ئیسلامیی فەرزە یان سوننەتە؟ بێگومان فەرزە، بۆچی؟ چونکە بە کۆمەڵو کاری هەرەوەزیی نەبێ، ناتوانی فەرمان بە شتە پەسندەکان بکەی، کە شەریعەت پەسندی کردوون، وە ڕێ لە شتە ناپەسندەکان بگری کە شەریعەت بە ناپەسندی داناون، باباى تاك هەر دەبێ ئامۆژگاریی خەڵکی بکاتو بڕوا، بەڵام بە کاری هەرەوەزیی شەریعەت پیادە دەکرێ، بۆیە کۆمەڵ بوونی مسوڵمانانو پێکەوە هاوکاریی کردنیانو پشتی یەکدی گرتنیان، فەرزە، ئنجا لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمایشتی زۆرن، بەڵام یەك فەرمایشت بە نموونە دەهێنین: (عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ عِنْدِهِ، ثُمَّ لَتَدْعُنَّهُ، فَلا يُسْتَجَابُ لَكُمْ} رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٣٣٤٩)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢١٦٩)

وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان) برقم: (٧٥٥٨)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٨٦٨)، واتە: حوزەیفە - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، دەبێ فەرمان بە شتە پەسندەکان بکەنو ڕێگریی لە شتە ناپەسندەکان بکەن ئەگەرنا نیزیکە خوا سزایەکتان بۆ بنێرێ لەلایەن خۆیەوە، پاشان هەرچەندە لێی بپاڕێنەوە، وەڵامتان ناداتەوە.

کەواتە: چ کاتێك مسوڵمانان تەکلیفو دوعایان لای خوا گیرا دەبێت؟ کاتێك گیرا دەبێ کە ئەوان بەدەم بانگی خواوە بچن، کە خوا دەفەرموێ: دەبێ لەنێو ئێوەدا کەسانێك هەبن فەرمان بە شتی پەسند بکەن، وە ڕێ لە شتی ناپەسند بگرن، جا ئەگەر ئەوان ئەو ئەرکەیان جێبەجێ کرد، ئەوە فەرمانی خوایان جێبەجێ کردوەو، ئنجا خوای پەروەردگاریش دوعای ئەوان دەگرێتەوە، ئەوانیش ئەوکاتە ڕێزو حورمەتی ئەوەیان دەبێ کە داوایان وەربگرێ، ئێستا چ کەسێك داوای کەسێك وەردەگرێ؟ دیارە کەسێك کە ئەوەی داوای لێ دەکات بیناسێو ڕێزو حورمەتی لای هەبێ، ئێمە کەی لای خوا ڕێزو حورمەتمان دەبێ؟ کاتێك کە دینی خوای بە بەزەیی جێبەجێ بکەین، شەریعەتی خوای پەروەردگار لە ژیانی خۆماندا بەرجەستە بکەین، بە ئەندازەی ئەوە لای خوا ڕێزمان دەبێو حورمەتمان دەبێ، چ وەك هەموو لایەك بە کۆمەڵ، چ وەك تاك تاکیشمان، بۆیە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە کە فەرموویەتی: {رُبَّ أَشْعَثَ مَدْفُوعٍ بِالأَبْوَابِ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٨٤٨)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتە: کەسانێکی وا هەن کە سەر قژنو ئاڵۆزن (دیارە نەك لەبەر ئەوە پاكو خاوێنیی نەکردوە، بەڵکو لەبەر هەژاریی پۆشاکەکەی شڕەو ناڕێك دیارە)، وە دەرکراوە لەبەر دەمی دەرگاکان، ئەگەر سوێند بە خوا بخوات خوا سوێندی لێناخات، واتە: ئەگەر بڵێ: خوایە بە عیززەتو گەورەیی تۆ دەبێ ئەو شتەم بۆ بکەی، خوا سوێندی لێ ناخات، هێندە لای خوا سبحانه وتعالى

ڕێــزو حورمــەتی هەیــە، ڕێــزو حورمــەتی ئێمــەی مــسوڵمانان لای خــوای پەروەردگار بە چییـەوە بەندە؟ بە جێبەجێکردنی ئەو فـەرزەوە، فـەرمان بـە شـــتە پەسـندەکانو ڕێگــریی لــە شـتە ناپەسـندەکان، هـەرکاتێ مـسوڵمانان ئەوەیان لەنێودا هـەبوو، ئەوە دوعـایان لای خـوا قـبووڵ دەبـێ، وە ئەگـەر بـە پـێچەوانەوە بن، خـوا سزایان بۆ دەنێـرێو هەرچـەندە لێـی بپاڕێنەوە، بـایی پووڵێکە ! چونکە پـێشتـر ئـەوان ڕێزیـان لـە خـواو لـە دینـی خـوا نـەگرتوە، تاکو ئێستا شایستەی ئەوەبن خوا ڕێزیان لێ بگـرێ !

**مەسـەلەی نۆیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، وەك ئەوانــە مــەبن کــە پەرتــەوازە بـوونو ناکـۆك بـوون، دوای ئـەوەی بەڵـگە ڕوونو ئاشــکراکانیان بـۆ هـاتن، وە ئەوانــە ئازارێکــی مــەزنیان بــۆ دانــراوە، دیــارە وشــەی: (تفــرق) واتــە: پـەرتەوازەیی‌و بـەش بەشـی، بـەڵام لـێرەدا خـوای پـەروەردگار (تفرُّق)ی پـێش (إخـتلاف)ی خـستوەو فەرموویـەتی: ﴿كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ ﴾، بۆچـی وایـە؟ لەبەر ئـەوەی خـوای کاربـەجێ زیـاتر ڕقـی لـە (تفرق)ە، بۆیـە پـێشی خـستوە، چونکە لێرەدا کە خـوا ﷻ نـەهی دەکـات لـە ئێمــەی مـسوڵمانان، دەفـەرموێ وەك ئەوانە مەبن کە پەرتـەوازە بوونو ناکـۆك بوون، ئنجـا ئایـا لـە ناکۆکـیی‌و لـە پەرتـەوازەیی کامیـان لـەلای خـوا ناخۆشەویـستترە؟ دیـارە پەرتـەوازەیی، بـەڵام پەرتەوازەیی لـە چی پەیـدادەبێ ؟ هـەڵبەتە لـە نـاکۆکیی‌و دووبـەرەکیی، هـەر میللـەتێك نـاکۆکیی‌و دووبـەرەکیی هەبـێ، پەرتـەوازە دەبـن، بـەش بـەش‌و تاقم تاقـم دەبن، بۆیە لە ئایەتەکەی پـێشووتردا خوا فـەرمووی: ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ﴾، هـەمووتان دەسـت بـە ڕێـسمایی خــواوە بگـرن‌و پەرتـــەوازە مــەبن‌و بـــڵاوەمەبن، کەواتــە: لێــرەدا پەیـداکراو (مُـسَبَّب) پـــێش پەیداکەر (سـبب) خـراوە، چونکە هۆکاری پەرتـەوازەیی بریتیـە لـە ناکۆکـیی‌و دووبەرەکیی، خـوا لێرەدا ئەوەی کە بەرهەم‌و ئەنجـامی ناکۆکییەکـەیە، پـێشـی

خستوه، وە ناکۆکیی‌و دووبەرەکییەکەی دواخستوه، وەك گوتمان لەبەر گرنگیی پێدان، لەبەر ئەوە بەلای خواوە پەرتەوازەیی خراپترە لە ناکۆکیی، بەلاّم لێرەدا پێویستە بزانین کە ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی، کە لێرەدا بە (إختلاف) تەعبیری لێکداوە، کە ئیختیلاف وەك چۆن حاڵەتی ناپەسندو خراپی هەیە، حاڵەتی باشیشی هەیە، ئیختیلاف کەنگێ خراپە؟ ئیختیلاف بەمانای: ناکۆکیی‌و ڕاجیایی، لە ڕاستییدا کاتێك خراپە کە لە بنەماو بنچینەکاندا بێ لە بنەماو بنچینەکانی دیندا، بەلاّم وەختێك کە لە لق‌و پۆپەکانی دابێ، ئەوە ئەو ڕاجیاییە ناپەسند نیە، بۆیە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز - خوا لێی ڕازی بێ- کە بە پێنجەمین خەلیفەی ڕاشید بەناوبانگە لێی گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: (مَا وَدِدتُ أَن أَصْحَابَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَخْتَلِفُوا) واتە: من حەزم نەدەکرد کە هاوەلاّنی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ڕاجیایی یان نەبێ، بۆچی؟ چونکە دەڵێ: بەهۆی ڕاجیایی ئەوانەوە دین بۆ ئێمە فراوانبووە، ئەو هاوەڵە وا لەو ئایەتە تێگەیشتوە، ئەوەی دیکە وای تێگەیشتوە، ئەوەیان دەڵێ واباشە، ئەویش دەڵێ واباشە، ئەویدیکەش دەڵێ واباشە، سەرەنجام ڕێ بۆ خەڵك فراوانبووە، لەچییدا؟ لە شتە جوزئییەکاندا، چونکە لە شتە بنەڕەتییەکاندا دەبێ موسڵمانان یەك بن، بەلاّم لە لق‌و پۆپو شتە جوزئییەکاندا قەیناکات، چونکە ڕێ فرەوان دەبێ، بۆ وێنە: لەو دوعایانەدا کە لە پێش سوورەتی (فاتیحة)دا دەخوێندرێن، کە پێیان دەگوترێ: (أَدْعِيةُ الإستفتاح) واتە: ئەو دوعایانەی کە نوێژیان پێ دەکرێتەوە، سەرەتای نوێژ یەکێك پێی خۆشە ئەو دوعایە بخوێنی: ((اللهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً)) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٣٨٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٩٢) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، دەڵێ: ئەوە کورتەو، زوو فێری دەبی، یەکێکی دیکە پێی خۆشە ئەو دوعایە بخوێنێ: (اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ؛ اللَّهُمَّ نقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ

مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالماءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧١٦٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٧٤٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٣٥٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٧٨١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٦٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٨٠٥)، وَالدّارمي برقم: (١٢١٨)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٤٦٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٧٧٥)، وە یەکێکی دیکەش پێی خۆشە ئەم دوعایە بخوێنێ کە دەفەرموێ: ((وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا إِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلا أَنْتَ، وَاهْدِنِي لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ لا يَهْدِي لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لاَ يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ، أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٢٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٧١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٧٦٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٢١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٨٩٧)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٤٦٢)، پێغەمبەر ﷺ چەند جۆرە دوعایەکی فەرموو ون، هەر کەسێك لە ڕەغبەتی لە چ دوعایەك هەیە بۆی هەیە بیخوێنێ، یاخود جارێکیان ئەوەیان دەخوێنی، جارێکی دیکە ئەوە دەخوێنێ، هەروەها لە جۆرەکانی تەحییاتدا، وە لە شێوەکانی دەست گرتندا، لە شێوەکانی بانگداندا، بانگدانی بە (ترجیع) هەیە، بانگدانی بێ (ترجیع) هەیە، یاخود مەسەلەی دەستنوێژ، ئەگەر مێرد دەست لە خێزانی خۆی بدات، یان ئافرەت دەستی بە پیاوەکەی بکەوێ، دەستنوێژی دەشکێ یان ناشکێ؟ یەکێك دەڵێ: بە ڕەهایی دەشکێ، شافیعیی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ: هەر دەستی پێی بکەوێ دەشکێ، مالیك - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ: بە ئارەزووەوە بێ دەشکێ بەبێ ئارەزووبێ ناشکێ، ئەبو حەنیفە دەڵێ: بە هیچ شێوەیەك ناشکێ، مەگەر بە هۆی ئارەزوو جووڵانەوە مەذیی بێ، دیارە بەوەش ڕێ

بۆ مسوڵمانان فـراوان دەبـێ، لـە شـوێنێك بـەفرو بەسـتەڵەكو سـەرمایەو، ژنو مێردێكـن پـێكەوە دەسـتیان بەدەسـتی یـەك دەكـەوێ، ئەگـەر بێـتو بەپـێـی مەزهـەبی شـافیعیی بـێ دەسـتنوێژیان بـشكێ، ڕەنگـە زۆر قـورس بكـەوێ لەسـەریان، بـا بـچنە سـەر مەزهـەبی ئـەوەی كـە دەبـێ بـە ئـارەزووەوە نەبـێ ناشكێ، یاخود مەزهەبی ئـەبو حەنیفـەو شـتەكەیان بـۆ ئاسان دەبـێ، كەواتـە: ڕاجیـایی لـە لـقو پۆپەكـانی شـەریعەتدا دەبێتـە هـۆی فراوانبـوون، دەبێتــە هـۆی ئاسان بـوون، بـەڵام بـۆ زانیارییتـان شـتێك دەگێڕنـەوە كـە ئـەوە ناگونجـێ بڵێین: فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ، لەبەر ئەوەی لـە ڕووی سـەنەدەوە ڕاسـت نیـە، كە دەڵێ: {اخْتِلافُ أُمَّتِي رَحْمَةٌ}، قَالَ الشيخ الألبـاني: لا أَصْلَ لَهُ في (السلـسلة الـضعيفة) بـرقم: (٥٧)، واتـە: ڕاجیـایی ئۆممـەتم ڕەحمەتـە ! هەڵبەتـە ئەگـەر ئـەوە بـچەسپێ كـە حەدیـسە، دەڵـێین: دیـارە مەبەسـتی پـێغـەمبەر ﷺ، واتـە: ڕاجیـایی ئۆممـەتم لـە شـتە وردەكانـدا، لـە وردە بابەتەكاندا، بـەڵام بە تەئكیـد لـە شـتی بنەڕەتییـدا، ئـەوە دیـارە نـەك ڕەحمـەت نیـە، بەڵكو غەزەبەو زەحمـەتە، وە (ابـن تیمیـة) - ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ- دەربـارەی ڕاجیـایی زانـایانو پـێشـەوایانی ئیـسلام لـە وردە بابەتەكانـدا كتێبێكی هەیە زۆر جوان ڕوونی كردۆتـەوە، كـە ئـەو پـێشـەوایانەی ئێمـە ئـەو زانایانـەی ئیـسلام هـەر لـەخۆوە ڕاجیاییـان نـەبووە، بەڵـكو ڕاجیاییـەكانیان لـە ئەنجامی جیاوازیی بەڵگەكانیـاندا بـووە، كـە پـشتیان پـێ بەسـتوون، كتێبەكـەی بەنـاوی (رَفْـعِ الْمَـلاَمِ عَنْ الأئِمَّـةِ الأعْلامِ) واتـە: لابردنـی لۆمـەو سـەركۆنە لـە پـێشەوایانی پایـە بەرزمـان، پـێشەوایان هـەر لـە سـوفیانی ثـەوریی، سـەعیدی كوڕی موسەییبو ئەوانە بگرە تا دوایی ئەبو حەنیفەو زەیدو مالیكو شافیعییو ئەحمەدو جەعفـەری صادیقو، ئنجا ئەبوو داوودی ظاهیـرییو ئەبو جەعفـەری تەبـەرییو هـەموو پـێشـەوایانی ئێمـە، هـەتا دەگاتـە ئەوانـەی دوایـی، وەك شـەوكانییو ئیبنـو تەیمییـەو صـەنعانییو بـاقی زانایـان، هیـچی نەچـووە بـە ئارەزوو ڕای جیابـێ لـەوی دیكـە، بەڵـكو لەبـەر ئـەوە بـووە كـە بەڵگەكانیـان

لێك جیابوون، لەبەر ئەوەی یەكیان ئاوا لەو ئایەتە تێگەیشتوەو، ئەوەی دیكە بە جۆرێكی دیكە لێی تێگەیشتوە، وە ئەوەیان ئەو فەرمایشتەی بە دڵە لە ڕووی سەنەدەوەو دەڵێ: ئەوە بەهێزترە، ئەوەی دیكە دەڵێ: من زیاتر متمانەم بەو فەرمایشتەی دیكەی پێغەمبەر ﷺ هەیە.

**مەسەلەی دەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾، ئەو ڕۆژەی كە هەندێك ڕوو سپیو گەش دەبن، وە هەندێك ڕووش ڕەش تڵخ دەبن، هەندێكیان گوتوویانە: واتە لەڕۆژی دواییدا، دیارە ئەوە هیچ مەبەست پێی ئەوەیە، كە ئەهلی ئیمان ڕوویان سپیو گەشاوە دەبێ، وە ئەهلی كوفر ڕوویان ڕەشو تڵخو ناشیرین دەبێ، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست پێی تەنیا مانا ڕواڵەتییەكەیەتی، واتە: بەڕواڵەت ئەهلی كوفر ڕوویان تڵخو ڕەش هەڵدەگەڕێ، وە ئەهلی ئیمان ڕوویان سپیو درەشاوەو جوان دەبێ، وەك لە سووڕەتی (عبس) لە ئایەتی (٣٨ تا ١٤١)دا دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا هەندێك ڕوو سپیو گەشن، وە دەم بە پێكەنینو دڵخۆشن، وە هەندێك ڕوو لەو ڕۆژەدا غوبارو تڵخییان لێ نیشتوەو، ڕەشایەتیی دایپۆشیون، هەندێكیشیان گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە كە كەسانێك هەن لە دەروونەوە دەروونیان ڕەش دادەگەڕێ، دەروونیان پەستەو پڕە لە خەفەتو نارەحەتیی كە ئەهلی كوفرن، وە ئەهلی ئیمانیش دڵیان پڕە لە شادیو خۆشیی.

بەڵام دەڵێین: هەردووكیان ڕاستن، ئەهلی كوفر هەم ڕواڵەتیان ڕەشو تڵخ دادێ، هەم دەروونیشیان پڕ دەبێ لە خەفەتو مەینەتیو نارەحەتیی، وە ئەهلی ئیمانیش هەم دەمو چاویشیان دەگەشێتەوەو دەدرەوشێتەوە، وە هەم دەروونیشیان پڕە لە شادیو بەختەوەریی، خوای پەروەردگار لەو كەسانەمان بگێڕێ كە لەو ڕۆژەدا هەم دڵمان پڕ لە خۆشیو شادیی بێ، وە هەم دەمو چاو ڕووشمان گەشو درەوشاوەبێ، ئامین.

**مەسـەلەی یازدەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾، ئنجـا ئەوانـەی ڕوویـان ڕەش هەڵگـەڕاوە، پـێیان دەگـوترێ: ئایـا لـە دوای ئیمـان کوفرتـان کـرد، دە ئـازار بـچێژن بـەهۆی کـافر بوونـەوە، ئایـا مەبەسـت پـێی ئەوانـەن کـە لـە ئیمـان هەڵگەڕاونەوەو کافربوون، یاخود مەبەست ئەوەیە: دوای ئـەوەی کە دەتانتوانی ئیمـان بێـنن، کوفرتـان هەڵبـژارد؟ هـەردوو واتایەکـەی هـەر ڕاسـتن، واتـە: دەگونجێ مەبەست پـێی لەوانە بێ، کە ئیمانیان هەبووەو دوایـی هەڵـگەڕانەوەو کـافر بوونەتـەوە ﴿ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ﴾، دەشـگونجێ مەبەسـت لەوانەبـێ، کـە ڕۆژێ لـە ڕۆژان ئیمانیـان نەهێنـاوە، ئـەدی بۆچـی خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ﴾، واتـە: دوای ئـەوەی کـە دەتـانتوانی ئیمـان بێـنن، ئیمانتـان نەهێنـاو کوفرتـان هەڵبـژارد، کەواتـە: وەك ئـەوە وایـە ئیمانەکـەتان هـەبووبـێ، چـونکە لەبەردەسـتتان بـووە، هەنـدێکێش دەربـارەی ﴿ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ﴾، گوتوویـانە: ئایـا دوای ئـەوەی کـە خـوا کردبـوونی بـە بـراو پـێکەوە بـوون؟ پەرتـەوازە بوون !! بۆچـی ؟ چونکە پەرتەوازە بوون جاری وایـە سـەردەکێـشێی بۆ کوفرو مسـوڵمانان کە پـێکـەوە دەبنـە دژو ناکۆك، جـاری وایــە سەردەکێـشێ بۆ ئەوەی کـە هەندێکـیان لـە بازنـەی ئیـسلام بـچنـە دەرێ، یەکـدی بـە کـافر دادەنێنو دەستیان دەچێتـە خوێنـی یەکدی، دەسـتیان دەچێتە مـاڵی یەکدیو ئەمـەش سـەر دەکێـشێی بـۆ کـوفر، یـاخود لەبـەر ئـەوەی کـە پەرتـەوازە بـوون نیشانەو سیفەتی کافرانەو لە مسوڵمانان ناوەشـێتەوە.

**مەسـەلەی دوازدەیەمو کۆتـایی:** کە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، وە خـوا سـتەمی ناوێ بۆ جیهـانییان، لـێرەدا ناگونجـێ بڵێیـن: ئـەو ئیـرادەیەی خـوا، لێرەدا ئیـرادەی هێنانـەدی (تکوینـي)یـە، چونکـە: ئەگـەر ئـاوابێ: خـوا نایـەوێ زوڵـم لـە جیهانییـان بکـرێ، کەچـی لـەنێو خۆیانـدا زوڵـم لـە یەکـدی بکـەنو زوڵمیـان لـێ بکـرێو زوڵـمیان لـەنێودا هەبـێ، ئـەوەیان ناگونجـێ،

چونکە ئەگەر خوا نەیویستبا زوڵم هەبێ، زوڵم نەدەبوو، کەواتە: ئەگەر مەبەست زوڵمی نێو جیهانییان خەڵکەکە خۆی بێ، دەبێ لێرەدا بڵێین: مەبەست لە ئیرادە ئیرادەی بەرنامەڕێژیی (تشریعي)یە، واتە: لە شەریعەتی خوادا زوڵمی تێدانیە بۆ بەندەکان، ئەگەر خەڵك بەدوای شەریعەتی خوا بکەوێ، زوڵمیان لەنێودا نابێو کەس زوڵم لە کەس ناکات، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە خوا نایەوێ زوڵم لە بەندەکانی بکات، بە تەئکید خوای پەروەردگار بە ئیرادەی تەکوینییو تەشریعیی خۆی نەیویستوە زوڵم لە بەندەکانی بکات، وە خوای بەرز زۆر لەوە بەرزترە ستەم لە بەندەکانی بکا، لە سووڕەتی (البقرة)ش لە ئایەتی (١٨٥)دا کە خوا دەفەرموێ: ﴿... يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ...﴾، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێو زەحمەتو سەغڵەتیی بۆتان ناوێ، لێرەدا دیسان ئەو ئیرادەیەش ئیرادەی (تشریعي)یە، واتە: شەریعەتی خوا وایە، ئەگەر پێوەی پابەندبن کاروبارتان ئاسان دەبێ، وە لە زەحمەتی بەدوور دەبن، کەواتە: هەر شتێك سەر بکێشێ بۆ سەغڵەتکردنی خەڵكو بۆ ئیش وەزەحمەت خستنیان، ئەوە لە ڕاستییدا پێچەوانەی ڕووحی شەریعەتە، شەریعەتی خوای پەروەردگار، بەڵێ ئینسان پێوەی ماندوو دەبێ، بەڵام قەت وانیە ئینسان عاسێ بکا، وە ئینسان وا سەغڵەت بکات کە بۆی جێبەجێ نەکرێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان یازدە ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی (١١٠) تاکو (١٢٠)، لەم یازدە ئایەتەدا خوا سبحانەو تعالی پێناسەی ئۆممەتی ئیسلام دەکات، سیفەتە سەرەکییەکانی ئۆممەتی ئیسلام دەخاتە ڕوو، پاشان باسی هەڵوێستی خاوەن کتێبانی ناحەز دەکات، واتە: جوولەکەو نەصرانیی یەکانو ئەوانی دیکە، کە دژایەتی ئەهلی ئیسلامو مسوڵمانانیان کردووەو دەکەن، هەڵوێستی ئەوان دەخاتەڕوو، وە دوایی خوای پەروەردگار دەیخاتە ڕوو کە خاوەن کتێبەکان وەك یەك نین، بەڵکو هی خراپو کەسانی باشیشیان تێدا هەن، وە کۆمەڵێك سیفەتی باش لە جوولەکەو نەصرانیی یەکان دا، کە هەڵوێستی باشیان هەیە دەخاتە ڕوو، وە پاشان باسی سەرەنجامی کافران، وە ماڵ خەرج کردنیان دەکات کە هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ لە دوارۆژدا، وە دوایی خوا ﷻ بڕواداران ئاگادار دەکاتەوە، لەوە کە پشت بە غەیری خۆیان ببەستن، وە ڕازو نیازیان لەگەڵدا بکەنو نهێنییەکانی خۆیانیان لەلا ئاشکرا بکەن، وە هەڵوێستی ئەو جۆرە کەسانە کە هەندێك لە مسوڵمانان جاری وایە بە نەزانیی یاخود بەهۆی ئیمان لاوازییەوە، پشتیان پێ دەبەستنو ڕازو نیازیان لەگەڵدا دەکەن، هەڵوێستی دەروونییان وە بوغزو حیقدو دژایەتییان بۆ مسوڵمانان دەخاتە ڕوو.

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ
وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ
وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ (١١٠) لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّا أَذًى ۖ وَإِن يُقَاتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الْأَدْبَارَ ثُمَّ
لَا يُنصَرُونَ (١١١) ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوا إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ
وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الْمَسْكَنَةُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ
بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ (١١٢) ۞ لَيْسُوا
سَوَاءً ۗ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ (١١٣)
يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ
فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَٰئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ (١١٤) وَمَا يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَاللَّهُ
عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ (١١٥) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ
اللَّهِ شَيْئًا ۖ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۚ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (١١٦) مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ الْحَيَاةِ
الدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ
اللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ (١١٧) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا
يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ۚ قَدْ
بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ (١١٨) هَا أَنتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ
بِالْكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ ۚ قُلْ
مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (١١٩) إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ
سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا ۖ وَإِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا ۗ إِنَّ اللَّهَ بِمَا
يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ (١٢٠) ﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ خەڵکی وەدیهێنراون: فەرمان بە هەموو پەسندێك دەکەن‌و، ڕێگریی لە هەموو ناپەسندێك دەکەن‌و، بڕوا بە خوا دێنن، وە ئەگەر خاوەن کتێبەکانیش بڕوایان هێنابایە، ئەوە مسۆگەر بۆ خۆیان چاکتربوو هەندێکیان بڕوادارن‌و زۆربەیان لەڕێ دەرچوون ﴿١١٠﴾ جگە لە ئازاردان هیچ زیانێکتان پێناگەیەنن، وە ئەگەر لەگەڵتان بجەنگن پشتتان تێدەکەن، پاشان یارمەتی نادرێن ﴿١١١﴾ لە هەر شوێنێك بەرپەل بکەون، زەبوونیی یان پێوە چەسپێنراوە، مەگەر بە هۆکارێك لەلایەن خواوە، وە هۆکارێك لەلایەن خەڵکەوە لەو زەبوونییە دەربازبن، وە تووڕەیی خوایان پێبڕاوەو هەژاریی یان پێوە چەسپێنراوە، ئەوەش لە ئەنجامی ئەوەوە کە بە ئایەتەکانی خوا بێبڕوان‌و، بە ناهەق پێغەمبەران دەکوژن، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەدا کە سەرپێچیی یان دەکردو سنوور شکێنیی یان دەکرد ﴿١١٢﴾ بەڵام هەموویان لەوبارەوە وەك یەك نین، بەڵکو لە خاوەن کتێبان کۆمەڵێك ڕاست وەستاو هەن، لە کاتەکانی شەودا ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە، وە ئەوان کڕنووش دەبەن ﴿١١٣﴾ بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی دێنن‌و، فەرمان بە هەرچی بە پەسند زانراوە دەکەن‌و، ڕێگریی لە هەرچی بە ناپەسند زانراوە دەکەن، وە پێشبڕکە لە چاکەکاندا دەکەن، وە ئەوانە لە چاکانن ﴿١١٤﴾ وە هەر چییەك کە لە چاکە دەیکەن، ئەوە مسۆگەر لێیان نادیدە ناگیرێ (و پاداشت دەدرێنەوە) وە خوا بە پارێزکاران زانایە ﴿١١٥﴾ بێگومان ئەوانەی بێبڕوان، بە هیچ شێوەیەك نە سامانەکانیان نە منداڵەکانیان لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکیان پێناگەیەنن، وە ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن‌و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿١١٦﴾ وێنەی ئەوەش کە لەم ژیانەی دنیادا خەرجی دەکەن، وەك ئەوە وایە بایەك کە سەرماو زوقمێکی زۆری تێدایە، لە کشتوکاڵی کۆمەڵێك بدات کە ستەمیان لە خۆیان کردوەو بیفەوتێنێ، دیارە خواش ستەمی

لێنەکردوون، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوە ﴿١١٧﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هیچ کەس جگە لە خۆتان مەکەنە جێی ڕازو نیاز، چونکە ئەوان (واتە: نامسوڵمانان) لە خراپەتاندا کەمتەرخەمیی ناکەن، سەغڵەتییتان بە ئاوات دەخوازن، ڕقو کینەیان بەرانبەرتان لە زاریان دەرکەوتوەو، ئەوەی سینەشیان شاردوویەتەوە (بەرانبەرتان) گەورەتریشە! ئەگەر بفامن ئەوە باش ئایەتەکانمان بۆتان خستەڕوو ﴿١١٨﴾ ئەوەتا ئێوە ئەوانتان خۆشدەوێ، بەڵام ئەوان خۆشیان ناوێن، وە بڕواشتان بە تێکڕای کتێبەکانی (ی خوا) هەیە، وە کاتێك پێتان دەگەن دەڵێن: بڕوامان هێنا، بەڵام کاتێك تێپەڕین، بەهۆی پەستییانەوە لە دژتان قامکان دەگەزن، بڵێ: دەك بمرن بەو پەستییەتانەوە ! بێگومان خوا بە نهێنیی سینەکان زانایە ﴿١١٩﴾ هەر کات خێرو خۆشییەکتان بێتە ڕێ، نارەحەتیان دەکات، وە هەر کات ناخۆشییەکتان تووش بێ، پێی دڵخۆش دەبن، بەڵام ئەگەر خۆڕابگرنو پارێز بکەن، ئەوە فێڵو پیلانیان هیچ زیانێکتان لێنادات، بێگومان خوا دەوردەری ئەوەیە کە دەیکەن (دەرباز نابن)﴿١٢٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**أُمَّةٍ**): واتە: کۆمەڵ، (الأُمَّةُ: كُلّ جَمَاعَةٍ يَجْمَعُهُم أَمْرٌ مَا إِمَّا دِينٌ وَاحد، أَوْ زَمَانٌ وَاحِد، أَوْ مَكَان وَاحِد، ... وَجَمْعُهَا أُمَم)، واتە: (أُمَّة) هەر کۆمەڵە خەڵکێکە کە کارێك کۆیان بکاتەوە، یان یەك دین کۆیان بکاتەوە، یاخود لە کاتێکدا یان لە شوێنێکدا کۆببنەوە بۆ مەبەستێ، کۆیەکەی (أُمَم)ە.

(**اَلذِّلَّةُ**): (الذُّلُّ: مَا كَانَ عَنْ قَهْرٍ، يُقَالُ: ذَلَّ يَذِلُّ ذُلاًّ، وَالذِّلُّ: مَا كَانَ بَعْدَ تَصَعُّبٍ: ذَلَّتْ تَذِلُّ ذِلاًّ فَهِي ذَلُولٌ) واتە: (ذلُّ) بریتییە لە ملکەچیی یەك، کە لە ئەنجامی دەستەڵات بەسەر ڕانواندندا پەیدابووبێ، وە دەگوترێ: (ذَلَّ يَذِلُّ ذُلاًّ) بەڵام وشەی: (ذِلّ) بۆ وڵاخ بەکاردێ، کە پێشێ چەمووش بووبێ، دوایی ملکەچ بووبێ، ناوەکەشی (ذلول)ە، واتە دەستەمۆ.

(ثُقِفُوٓاْ): (الثَّقِفُ: الحِذق في إدرَاكِ الشَيءِ، وفِعلِهِ)، وشەی (ثَقِف) واتە: شتێك بە وریاییو بە لێزانیی وەدەستی بخەی، چونکە ئەسڵی وشەی (ثَقِف): بریتیە لە وردەکارییکردن لە دەست گەیاندنە شتێك، یاخود ئینسان بە وردەکاریی شتێك بەدەست بێنێ (وَمِنْهُ استُعِيرَ الْمثاقفةُ: الْملاعبةُ بالسّلاحِ)، (مثاقفةُ) واتە: یاریی کردن بە چەك، کە کابرا بە کارامەیی چەکەکەی بەکاربهێنێ.

(بَآؤُا): واتە: گەڕانەوە، ﴿ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: تووڕەیی خوایان لەگەڵ خۆیان بردەوە، دەگوترێ: (بَوَّأْتُ الرَّمْحَ: هَيَّأْتُ لَهُ مَكَانَاً، ﴿ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، أي: حَلَّ مُبَّوءاً وَمَعَهُ غَضَبُ اللهِ)، دەگوترێ: (بَوَّأْتُ الرَّمْحَ)، واتە: شوێنی ڕمەکەم دیاریکرد، خۆشکرد، وە ﴿ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: نیشتەجێ بووە لە شوێنێكو تووڕەیی خوای لەگەڵ دایە.

(قَآئِمَةٌ): واتە: ڕاوەستاوە، دەگوترێ: (قَامَ يَقُومُ قِيَاماً فَهُوَ قَائمٌ، وَالقِيَامُ عَلَى أَضْرِبٍ: قِيامٌ بالشخْصِ، وَقِيامٌ لِلشَّيءِ مُرَاعَاةً لَهُ)، (قَآئِمَةٌ بأَمْرِ اللَّه) واتە: فەرمانی خوا بەڕێوە دەباو ئەنجامی دەداو ڕاوەستان چەند جۆرێکە: ڕاوەستان بەهۆی کەسێکەوە وە ڕاوەستان بۆ چاودێریی کردنی شتێك.

(ءَانَآءَ): واتە: کاتەکان، ﴿ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ ﴾، واتە: کاتەکانی شەوگار، وە (ءَانَآءَ) کۆی (إِنْيٌ)ە، یاخود (أَنـاً)ە، یان (إِنـىً)ە.

(صِرٌّ): (الصَّرُّ أَي الشّدُّ، وَالصُّرَّةُ: ما تُعْقَدُ فِيهِ الدَّرَاهِمُ، ورِيْحاً صَرْصَرَاً: بَارِدَةً)، (صَرّ) واتە: بەستن، (صُرَّة) ئەو پرێسکەیە کە پارەو شتی تێدەبەسترێ، وە (رِيْحاً صَرْصَرَاً)، واتە: بایەکی زۆر ساردو بە زوقم.

(بِطَانَةً): واتە: کەسێك کە بە پەنهانیی تۆ دەزانێ، بە شتە شێردراوەکانی تۆ دەزانێ، دەڵێ: (البَطْنُ خِلاَفُ الظَّهْرِ) وشەی: (بَطْنُ) واتە: سك پێچەوانەی پشتە، (وَالبِطَانَةُ: خِلاَفُ الظِّهَارَةِ) ئەگەر شتێك دیوی دەرەوەی هەبێو

دیـوی نێـوەوەی هــەبێ، ئـەوە دیـوی نێـوەوەی پێــی دەگـوترێ: (بِطَانَـة)، (وَتُسْـتَعَارُ البِطَانَـةُ: لِـمَنْ تَخْتَـصُّهُ بِالإِطِّـلاَعِ عَلَـى بـاطِنِ أَمْـرِك)، وە وشـەی (بِطَـانَة) خـوازراوەتەوە بۆ کەسێك کە تـۆ نهێنییەکـانو شـتە شـێردراوەکانی خۆتی پـێ دەڵـێی، خـوا دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ ﴾، واتــە: ئــەی ئیمانداریـنـــە! غــەیری خۆتــان مــەگرن بــەوە کــە نهێنیـیەکانی خۆتـانی پـێ بڵێـن.

(لَا يَأۡلُونَكُمۡ ): یـانی (لا يُقَـصِّرونَ) واتـە: کەمتەرخەمیـی تـان تێـدا ناکەن، (أَلَـوْتُ فِـي الأَمْـرِ: قَـصَّرْتُ فِيـهِ) واتـە: کەمتەرخـەمیــیم تێــدا کــرد، ﴿ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا ﴾، واتە: لە خراپەکردن لە دژتـان، کەمتەرخەمیـی ناکـەن.

(خَبَالٗا): (الْخَبَـالُ: الفَـسَادُ) واتــە: خراپــە، ( وَيُقَـالُ: خَبَلَـهُ وَخَبَّلَـهُ فَهُـوَ خَابِـلٌ وَالْجَمْـعُ: الْخُبْـلُ)، (خَبَلَـهُ وَخَبَّلَـهُ)، واتـە: تێکیــدا (أَفْـسَدَهُ) (خَابِـل) واتـە: (فَاسِد) وە کۆیەکەشی (الْخُبْلُ)ە.

(عَنِتُّمۡ ): (عَنِتَ فُـلاَنٌ: إِذَا وَقَـعَ فِـي أَمْـرٍ يُخَـافُ مِنْـهُ التَّلَـفُ، يَعْنَـتُ عَنَتَـاً)، واتـــە: ئەگــەر بکەوێتــە وەزعێکــەوە کــە مەترسـیی ســەر بــە فــەتارەت چــوونی لێبکـرێ، (عَنَتَـاً)، واتـە: کەوتنە نێو شـیددەتو نارەحـەتیـی یەوە.

(ٱلۡأَنَامِلَ ): کۆی (أُنْمـلَـة)یە، (أُنْمـلَـة) واتە: ســەرەپەنجــە.

(ٱلۡغَيۡظِ ): (الغَـيْظُ: أشـدُّ الغَـضَب) واتـە: تووڕەییــەکی تووند، (والتَّغَـيُّظُ: إِظهَـار الغَيْظِ)، (تغيُّظُ) واتـە: دەرخسـتنی تووڕەییـەکی زۆر.

(كَيۡدُهُمۡ ): (الكَيْـدُ: ضَـرْبٌ مِـنَ الإحتِيَـالِ، وَقَـدْ يَكُـونُ مَـذْمُوماً، وَمَمْـدُوحاً، وَفِـي الْمَذْمُومِ أَكْثَـر)، واتـە: (كَيْدُ) لـە زمـانی عەرەبـی دا جۆرێکـە لـە فێـڵ، جا جاری وایـە بۆ خراپە بەکـاردێ، هـەندێ جـاریش بۆ چاکـە، بـەڵام بـە زۆریــی بۆ خراپە بەکـاردێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرمویٚ: ﴿لَيْسُواْ سَوَآءً مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾﴾، (عَنْ عَبْدِاللهِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: وَلَمَّا أَسْلَمَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ سَلامٍ، وَثَعْلَبَةُ بْنُ سَعْيَةَ، وَأُسَيْدُ بْنُ سَعْيَةَ، وَأَسَدُ بْنُ عُبَيْدٍ، وَمَنْ أَسْلَمَ مِنْ يَهُودَ مَعَهُمْ، فَآمَنُوا وَصَدّقُوا وَرَغِبُوا فِي الْإِسْلامِ، وَقَالَتْ: أَحْبَارُ يَهُودَ وَأَهْلِ الْكُفْرِ مِنْهُمْ مَا آمَنَ بِمُحَمّدٍ وَلا اتّبَعَهُ إلا شِرَارُنَا، وَلَوْ كَانُوا مِنْ أَخْيَارِنَا مَا تَرَكُوا دِينَ آبَائِهِمْ وَذَهَبُوا إلَى غَيْرِهِ، فَأَنْزَلَ اللّهُ تَعَالَى فِي ذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِمْ: ﴿لَيْسُواْ سَوَآءً ...﴾) (أَخْرَجَ ابْنُ إِسْحَاق، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ الْمُنْذِر، وَابْنُ أَبِي حَاتِم، وَالطَّبَرَانِي، وَابْنُ مَنْدَه، وَأَبُو نعيم في (المعرفة) وَالبَيْهَقِي في (الدلائل)[1]، واته: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: دوای ئەوەی کە عەبدوڵلای کوڕی سەلامو، ثەعلەبەی کوڕی سەعیەو، ئوسەیدی کوڕی سەعیەو، ئەسەدی کوڕی عوبەیدو، ئەوانەی لەگەڵیان بوون لە جوولەکەکان مسوڵمان بوون، وە ئیمانیان هێناو، پێغەمبەری خوایان بە ڕاست زانیو، ئیسلامیان هەڵبژارد، زانایانی جوولەکەو ئەوانەی کە کافر بوون لە جوولەکەکان، گوتیان: ئەوانەمان بڕوایان بە موحەممەد هێناوەو شوێنی کەوتوون، کە خراپەکانمانن، وە ئەگەر ئینسانی باش بوونایە دینی باب و باپیری خۆیان واز لێ نەدەهێناو بە دوای دینێکی دیکە نەدەکەوتن، لەوبارەوە خوای بەرز ئەم ئایەتەی نارده خوارێ، وەك دوایی تەفسیری دەکەین، مەدحی ئەوانە دەکات لە خاوەن کتێبەکان کە مسوڵمان بوون، وە سیفەتە پەسندەکانیان دەخاتەڕوو.

---

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٤٨٣).

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾، (عَنْ عَبْدِاللهِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يُواصِلُونَ رِجَالاً مِنْ يَهُود، لَما كَانَ بَيْنَهُمْ مِن الْجِوَارِ وَالْحِلْفِ فِي الْجَاهِلِية، فَأَنْزَلَ اللهُ فِيهِمْ يَنْهَاهُمْ عَنْ مُبَاطَنتِهِمْ لِخَوْفِ الفِتْنَةِ عَلَيْهِمْ مِنْهُمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا ... ﴾) (أَخْرَجَ ابْنُ إِسْحَاق، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ الْمُنذِر، وَابْنُ أَبِي حَاتِم)[1]، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: پیاوانێك لە مسوڵمانان هەبوون پەیوەندییان لەگەڵ پیاوانێك لە جوولەکەکاندا هەبوو، لەبەر ئەوەی دیارە دراوسێ بوون، یان لە سەردەمی نەفامییدا پێکەوە هاوپەیمان بوو بوون، جا خوا لەبارەی ئەوانەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە قەدەغەی کردن لەوەی نهێنییەکانی خۆیانیان پێ بڵێن، ئەگەرنا پەیوەندیی هەبوونی ڕواڵەتیی قەیناکا، بەڵام نابێ نهێنییەکانی خۆیانیان پێبڵێنو ئاگاداریان بکەنەوە لە شتە شێردراوەکانی خۆیان، بۆچی؟ لە ترسی ئەوەی نەوەك ئەوە ببێتە زەرەرو زیان بۆیان، کە ئەوان ئاگاداری نهێنیی مسوڵمانان بن، چونکە خاوەنی ئەمانەت نینو نهێنیی ناپارێزن، ئیدی خوا تبارك‌و تعالی ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٦٨٦).

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەکانی ڕابـردوودا باسـی ئـەوەی کـرد کـە مسـوڵمانـان دەبـێ تـەنیا فەرمانبـەری خـواو پـێغەمبەری خـوابن ﷺ، وە دەبـێ وریـابن لەوەی کە بکەونە ژێر کاریگەریـی جوولەکەو نەصرانیی یەکـان، فەرمـانی پـێکردن بەوە کە هـەموو دەست بە ڕێسمانی خـواوە بگرن، وە فـەرمانی پـێکردن کە فەرمان بـە چاکـەو ڕێگـریی لـە خراپـە بکـەن، وە بانگـەواز بـۆ چاکە بکـەن، وە پاشان سـەرەنجامی ئیمانـداران‌و سـەرەنجـامی کـافرانـی خسـتەڕوو، ئنجـا خـوای بـێ وێنـە لـەم ئایەتانـەدا ڕوو دەکاتـە ئۆممـەتی پـێغەمبەر ﷺ، دیـارە یەکـەمین دوێنـدراوێك لـەم ئایەتانـە کـێ بـوون؟ هـاوەڵانی بەڕێـزی پـێغەمبـەر ﷺ بـوون، بـەڵام بـەدڵنیایی مەبەسـت پـێیـان تـەنیا ئـەوان نـین، بـە بەڵـگەی ئـەوە کـە خـوا سبحانەو تعالـی نافـەرموێ: ئـەی هـاوەڵانی پـێغەمبـەر ! ﷺ، بەڵـکو دەفەرمـوێ: ئـەی ئیمانداریـنـە! وە هـەموو ئـەو سیفەتانەی کـە باسـیان دەکـات، دیـارە بـە پلـەی یەکـەم بە باشـترین شێوە لە هاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەردا ﷺ بـوون، بـەڵام لە دوای هـاوەڵانیشـەوە - خـوا لێیان ڕازی بـێ-، لە هـەر کۆمـەڵێك لـە مسـوڵمانان دا هـەن، کە بەڕاسـتیی ئەهلـی ئیمان بن‌و شوێنکەوتووی پـێغەمبـەری خـوا ﷺ بـن، خـوا دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾، ئێوە چاکتـرین کۆمەڵـن بـۆ خـەڵك، واتـە: بـۆ مرۆڤایـەتی وەدیهێنـراون، ﴿ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾، لەبەرچی ئۆممەتی پێغەمبـەر ﷺ باشـترین کۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتیی؟ هـەروا بە گۆترەیـە؟! بـە دڵنیـایی نـەخێر، چونکە ئیشـی خـوای کاربـەجێ هیـچی بـە گـۆترە نیـە، بڕیـاری خـوا هـەمووی لـە جێـی خـۆی دایـە، بۆیـە هۆکارەکـەی بـاس دەکات، کە سێ هۆکاری هـەن:

١– فەرمان بە هـەموو شـتە پەسندەکان دەکـەن.

٢– ڕێ لە هەموو شتێکی ناپەسند دەگرن.

٣– وە ئیمـان بە خـوا دێنـن.

واتە: لەبەر ئەو سێ هۆکارە سەرەکییەیە، کە ئێوە چاکترین کۆمەڵن، کە بۆ مرۆڤایەتیی هێنراونەتە دی، پێشتر باسمان کرد کە فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، هەموو بوارەکانی دینو ژین دەگرێتەوە، واتە: فەرمان بە هەر شتێکی پەسند دەکەن، چ پەیوەندیی بە لایەنی عەقیدەوە هەبێ، بە لایەنی خواپەرستییەوە، بە لایەنی ڕەوشتو ئەخلاقەوە، بە لایەنی خێزانییو، کۆمەڵایەتییو، سیاسییەوە، وە بە لایەنی ئابووریی و جەنگو ئاشتیو ... هتدەوە هەبێ، لە هەموو بوارەکانی دینو ژیندا ئێوە فەرمانی پێدەکەن، واتە: دەیچەسپێنن، وە هەروەها ڕێگرییش لە شتە ناپەسندەکان دەکەن، بە هەمان شێوە پەیوەندیی بەهەر کام لەم بوارو لایەنانەوە هەبێ، کەواتە: ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ بۆیە باشترین ئۆممەتن، چونکە هەوڵدەدەن خۆیان بە هەرچی شتی باشو پەسندە برازێننەوە، هەرچی شتی پەسندە فەرمانی پێبکەنو خۆی پێ برازێننەوەو، وە خۆشیان بڕار بکەنو پاك بکەنەوە لە هەرچی شتی ناپەسندو خراپە، بە واتایەکی دی: بۆیە چاکترین کۆمەڵن، چونکە لەنێو خۆیاندا چاکسازییو پاکسازییەکی باشو گشتگیر ئەنجام دەدەن، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾، وە ئیمانیش بە خوا دێنن، دیارە بڕوا هێنان بە خوا، بناغەی پاکسازییو چاکسازییە، بەڵام خوا ﷻ بۆیە خستوویەتە دوایی، لەبەر گرنگیی پێدانو بایەخ پێدانی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە، تاکو بزانن کە ئیمان بە خوا بوونێك بەڕاستی ئیمان بە خوا بوونەو ئیعتیباری پێ دەکرێ، کە وا لە خاوەنەکەی بکات لەگەڵ چاکە دابێو فەرمان پێ بکاو، دژی خراپە بێو ڕێی لێ بگرێ، ئنجا دێتە سەر باسی خاوەن کتێبەکانو دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۚ ﴾، وە ئەگەر خاوەن کتێبەکانیش بڕوایان هێنابایە، بۆ وان چاکتر بوو، هەڵبەتە ئەوەی ئیمان بێنێ بۆخۆی چاکترە، ئەگەرنا خوا ﷻ زۆر لەوە بەرزترو گەورەترە، کە لە چاکەی چاکەکاران بەهرە وەربگرێ، یان لە خراپەی خراپەکان زیانێکی پێبگا، ئنجا خوای کاربەجێو دادگەر دەفەرموێ: ﴿ مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَأَكۡثَرُهُمُ

ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾، خاوەن کتێبەکان، جوولەکەو نەصرانیی یەکان ئەوانی دیکەش، هەموو وەك یەك نین، بڕوادارییان تێدا هەن، بەلاَم زۆربەیان لارێو لە ڕێ دەرچوون، ئنجا باسی ئەوە دەکات کە ئایا ئەو خاوەن کتێبانە، ئەو جوولەکەو نەصرانیی یانە، دەتوانن زیان لە مسوڵمانان بدەن؟! باس دەکات دەفەرموێ: ﴿ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ﴾، ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن، مەگەر ئازار پێگەیاندن، واتە: ناتوانن پەکی ئێوە بخەن، ناتوانن وا بکەن کە ئیشەکەتان هەڵبوەشێتەوەو ببنە ڕێگرتان، بەلاَم دەتوانن ئازارتان پێ بگەیەنن، تووشی نارەحەتییو ئازارتان بکەن، یانی: قسەتان پێ دەڵێن، پڕوپاگەندەتان لە دژ دەکەن، خەفەتتان دەدەنێ، یان ئەگەر لەگەڵیشتان بەشەڕ بێن، دیارە ئەوانیش بەشی خۆیان زەبرتان لێ دەدەن، بەلاَم سەرەنجامیان تێکشکانە، ﴿ وَإِن يُقَـٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾، وە ئەگەر لەگەڵتان بجەنگن پشتتان تێدەکەن، وە پاشانیش یارمەتی نادرێن، دیارە ئەوە خوا ﷻ بۆ هاوەڵانی بەڕێزی فەرمووە خوا لێیان ڕازی بێ، بە پلەی یەکەم، بەلاَم غەیری ئەوانیش لە مسوڵمانانو بڕواداران هەر دەگرێتەوە، بە مەرجێ بڕواداری تەواوبن ! قەت جوولەکەو نەصرانیی خۆیان لەبەردەم دا ناگرن، وەختی خۆی نە جوولەکە، نە نەصرانیی یەکانیان خۆیان لە بەرانبەر سوپای پێغەمبەردا ﷺ کە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێکهاتبوو، نەدەگرت، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەگەر لەگەڵتان بجەنگن پشتتان تێدەکەن، وە یارمەتی نادرێن، واتە: بە کەسیش سەر ناخرێن، ئەدی ئێستا بۆچی مسوڵمانان لەبەردەم جوولەکەدا بە چۆکدا هاتوون؟ لە ڕاستیدا لەبەر ئەوەیە کە ئەوانە مسوڵمانانی ڕاستەقینە نین، بەڵکو دەتوانین بڵێین: ئەوە گەلی عەرەبە، ئەو عەرەبانەی کە بەداخەوە وازیان لە ئیسلامی خۆیان هێناوەو، چوونەتە سەر ڕێچکەو ڕێبازەکانی ئەهلی کوفر، بۆیە بە جوولەکەکان ناوێرن، هەروەها بۆیە ئەوەتا ئەمریکا عالەمی ئیسلامیی داگیر دەکات، لە ڕاستیدا ئەمریکا عالەمی ئیسلامیی لە مسوڵمانانو بڕوادارانی ڕاستەقینەی

داگیر نەکردوە، بەڵکو لە زۆرە مسوڵمانانی داگیر کردوە، مسوڵمانانێك کە وەك پێویست لەگەڵ دینەکەیاندا ڕاست ناکەن، ئەگەرنا بەڵێنی خوا ڕاستە، چونکە خوا هەر تەنیا بۆ جوولەکەکانیشی نەفەرمووەو بە گشتی دەفەرمویٚ: ﴿وَإِن يُقَـٰتِلُوكُمۡ يُوَلُّوكُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ﴾، ئەگەر لەگەڵتان بجەنگن (خاوەن کتێبەکان، جوولەکەو نەصرانیی یەکان ئەوانی دیکەش کە خۆیان بە خاوەن کتێب دەزانن)، ئەوە پشتتان تێدەکەن، بە مەرجێ ئێوە ئیمانداری بە ڕاستی بن، ﴿ضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيۡنَ مَا ثُقِفُوٓاْ﴾، زەبوونییان پێوە چەسپێندراوە، لە هەر شوێنێك بەرپەل بکەون ئەوانە زەبوونن، بێدەستەلاتن، تەنیا بە دوو هۆکار ئەو زەبوونییەیان لەسەر لادەچێ ﴿إِلَّا بِحَبۡلٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، (حبل) واتە: هۆکار، کە لێرەدا هۆکارێك لەلایەن خواوە کە بریتیە لەوەی ملکەچ بکەن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا ڕێزیان دەگیرێ، عیززەتیان دەپارێزرێ، کەسایەتییان دەپارێزرێ، موڵكو ماڵیانو نامووسیان دەپارێزرێو، لە زەبوونیی قوتار دەبن، ﴿وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، یان بە هۆی خەڵکییەوە، واتە: ئەگەر پەیمان ببەستن لەگەڵ خەڵکێکی دیکەی غەیری خۆیان، دەگونجێ بە هۆی پەیمان بەستن لەگەڵ غەیری خۆیاندا، دیسان ئەو زەبوونیی و بێ دەستەلاتییەیان لەسەر لابچێ، واتە: بە هۆی حوکمی دینی خوای پەروەردگارەوە کە ئیسلامە زەبوونییان لەسەر نامێنێو، بە هۆی هاوپەیمانێتی لەگەڵ نامسوڵماناندا، زەبوونییان لەسەر نامێنێ، تەماشا دەکەی جوولەکەو نەصرانیی یەکان کاتی خۆی کە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بوون، بۆ خۆیان دان پێدا دێنن کە: هیچ کاتێك وەك ئەو کاتانەی کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بوو ون، ئاوا کەرامەتمان پارێزراو نەبووە، وە هەستمان بە عیززەتو بەختەوەریی و بە ماف و ئازادییەکانی خۆمان نەکردوە، مێژوونووسەکانیان وا دەڵێن: بۆ وێنە: (کارل بروکلمان) لە کتێبی (تأريخ الشعوب الإسلامية)داو (جۆلتسهیر)، وە

زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسەکان دان بەوە دادێنن، کە جوولەکەو نەصرانیی یەکان، تەنیا لە کاتێکدا بەڕاستی ژیانێکی شەرافەتمەندانەیان گوزەراندوە، کە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا بوون، ئەوە هۆکاری یەکەمی دەباز بوون لە زەبوونیی .

دووەم: وە ﴿ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ ﴾، وەك ئێستا دیارە، ئایا جوولەکەکان ئێستا بە هۆی چییەوە جۆرێك لە قووەتو هێزوپێزیان هەیە ؟! بە هۆی ئەوە کە لەگەڵ دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا بە تایبەت ئەمریکادا، هاوپەیمانن، ﴿ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، وە تووڕەیی خوایان پێبڕاو لەگەڵ خۆیان بردەوە، ﴿ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ ﴾، وە هەژاریی‌و نەدارییان پێوە چەسپێنرا ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوەش بە هۆی ئەوەوە کە هەر لە سەرەتاوە بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانی خوا، ﴿ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ﴾، وە لەبەر ئەوە کە کاتی خۆی پێغەمبەرانی خوایان (علیهم الصلاة والسلام) دەکوشت، کە (زەکەرییاو یەحیا)یان بە ئاشکرا کوشتوە، وە پێغەمبەرانی دیکەشیان کوشتوە، وەك لە تەورات دا باس دەکات، بە تایبەت جوولەکەکان دەستیان چۆتە خوێنی پێغەمبەرانی خواوە (علیهم الصلاة والسلام) ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴾، ئەوەش بە هۆی ئەوەوە کە سەرپێچیی یان کرد، وە دەستدرێژییان کرد، جا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە جا خۆ ئەو جوولەکەو نەصرانیی یانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ هیچ پێغەمبەریان نەکوشتوون، چونکە هەر موحەممەد ﷺ هەبوو کە پێغەمبەری خوابێ‌و ئەویشیان نەکوشتوە؟! وەڵامەکەی ئەوەیە:

یەك: بە تەئکید بەتەما بوون پێغەمبەری خواش ﷺ بکوژن‌و پیلانیشیان بۆ گێڕا، بەڵام خوای پەنهانزان قوتاری کرد.

دوو: ئەو جوولەکەو نەصرانیی یانەی ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ ڕازی بوون بەو ڕێبازو بەرنامەیەی کە پێشینەکانیان لەسەری بوون‌و بەڕائەتیان لێ

نەکردوە، بەڵکو دیفاعیان لێ کردوە، بۆیە وەك بۆ خۆیان ئەو کەتن‌و خراپانەیان کردبێ، وایە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی کۆمەڵێکی دیکە لە خاوەن کتێبەکان کە ئەوانە وانین خراپەکارنین، بەڵکو چاکەکارن، دەفەرموێ: ﴿لَيْسُواْ سَوَآءً﴾، وەك یەك نین، هەموویان یەکسان نین، وە بە دڵنیایی ئەوە ئێمەش فێری ئینصاف‌و دادگەریی دەکات کە لەگەڵ نەیارەکانی خۆمان لەگەڵ بەرانبەرەکانی خۆمان دا، کە هەموویان وەك یەك نین‌و نابێ بە یەك چاو تەماشایان بکەین، بەڵکو دەبێ پۆلێن‌و دابەشیان بکەین، چاکیان بە چاك دابنێین‌و خراپیان بە خراپ، وە مام نێوەندییان بە مام نێوەندیی، ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾﴾، خوا لێرەدا ﷻ نیزیکەی یازدە سیفەت لەو خاوەن کتێبانەی کە چاکن، هەڵدەدات، واتە: بە یازدە سیفەت مەدحیان دەکات‌و دەفەرموێ:

**سیفەتی یەکەمیان:** ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ﴾: لە خاوەن کتێبەکان کۆمەڵێك هەن، (قائمة) واتە: لەسەر ڕاستە شەقامی خوا ڕاوەستاون، لێرەدا بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان وایە - کە هەر ئەو ڕایەش پەسندو ڕاستە - کە لێرەدا مەبەست پێی ئەو خاوەن کتێبانەن کە ئیمانیان بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ هێناوەو مسوڵمان بوون، چونکە ئەو سیفەتە باشانە لە ڕاستییدا تەنیا لە کەسانێکدا پەیدادەبن، کە بڕوایان بە دینێکی ڕاست‌و دروست هەبێت‌و پێوەی پابەندبن، ئەویش بەس ئیسلامە، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست لەو کۆمەڵە ئەوانەن کە لەگەڵ دینەکەی خۆیاندا ڕاستیان کردوە، وە سیفەتی باشیان هەبووە، بەڵام ئەو واتایە

ناگونجێو ڕاست نیە، بۆچی ؟ چونکە ناگونجێ خوای پەروەردگار کەسێك بە ئیماندار بە خوا، بە ئیماندار بە دوارِۆژ لە قەڵەم بدات، کە ئیمانی ڕاستو دروستی نیە، بەپێی ئیسلام ئیمانی نیە، یاخود ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ نیە، کەواتە: یەکەمین سیفەتی ئەو کۆمەڵە ئەوەیە: ﴿أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ﴾، ڕاوەستاون لەسەر ڕاستە شەقامی خوا.

**سیفەتی دووەمیان:** ﴿يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ﴾، ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە، چ وەختێك؟ لە کاتەکانی شەودا، واتە: بەڕۆژ ئەوە هیچ کە دەخوێنن، بە شەویش کە خەڵك خەوتوەو ئیسراحەتی کردوە، ئەوانە لەو کاتەدا ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە، کە ئەوەش ئاماژەیە بە شەونوێژکردنیان چونکە ئینسان چ کاتێك شەوێ ئایەتەکان دەخوێنێتەوە؟ لە شەونوێژدا.

**سیفەتی سێیەمیان:** ﴿وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾، وە ئەوانە کڕنووش دەبەن، کە هەندێك دەڵێن: ئاماژەیە بە شەونوێژ کردنیان، وە هەندێکیش دەڵێن: ئەوە ئاماژەیە کە زۆر کڕنووش دەبەنو لە کڕنووشدا دەمێننەوە،

**سیفەتی چوارەمو پێنجەمیان:** ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾، دوو سیفەتی دیکەیان، ئەوەن کە: ئیمان بە خوا دێنن، ئیمانێکی ڕاستو دروست، وە ئیمان بە ڕۆژی دواییش دێنن.

**سیفەتی شەشەمو حەوتەمیان:** ﴿وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾، فەرمان بە شتی پەسند دەکەن، وە ڕێگریی لە شتی ناپەسند دەکەن.

**سیفەتی هەشتەمیان:** ﴿وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ﴾، وە پێشبڕکە دەکەن لە چاکەکاندا، لە هەر چاکەیەکدا پێشبڕکێی تێدا دەکەنو دەیانەوێ پێش یەکدی بکەونەوە.

**سیفەتی نۆیەمیان:** ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، وە ئەوانە لە صاڵحانن، لە مرۆڤە چاکەکانن.

**سیفەتی دەیەمیان:** ﴿ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ﴾، هەر چاکەیەك بکەن نادیدە ناگیرێ، واتە: لێیان ناپۆشرێ، بەو مانایەی لێیان بزر ناکرێ‌و پاداشتیان دەدرێتەوە.

**سیفەتی یازدەیەمیان:** ئنجا لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴾، وە خوا بە پارێزکاران زانایە، کەواتە: صالّحن، وە پارێزکارن، ئەهلی تەقوان، ئەها ئەو هەموو مەدحانە: بە ئیماندار، بە صالّح، بە پارێزکار، بە فەرمان بە چاکەکەرو ڕێگا لە خراپەگر، بە کڕنووش بەر، بە خوێنەرەوەی ئایەتەکانی خوا لە کاتەکانی شەودا، بەو هەموو سیفەتە بەرزانە وەسفیان دەکات.

ئنجا خوا ﷻ جارێکی دیکە دێتە سەر باسی ئەوانەی بێبڕواو کافرن، وە لە دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان پیلان دەگێڕن‌و، ماڵ‌و سامانی خۆیان خەرج دەکەن بۆ دژایەتیی ئیسلام‌و مسوڵمانان، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان، سامانەکانیان وە منداڵەکانیان لە لایەن خواوە هیچ سوودیان پێ‌ناگەیەنن، واتە: هیچ سوودێکیان پێ‌ناگەیەنن، کە سزاو ئازاری خوا، کە لە ڕۆژی دواییدا بۆی داناون، لێیان دووربخاتەوە، یاخود سزاو ئەشکەنجەیەك کە بەدەستی مسوڵمانان دەیاندا لە دنیادا، لێیان دووربخاتەوە، ماڵ‌و سامانەکەیان نابێتە بەرگریی کارو نابێتە هۆی ئەوە کە دەربازیان بکات، ﴿ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾، وە ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، یاخود خاوەنی ئاگرن، (أصحاب) کۆی (صاحب)ە، (صاحب)یش، هەم بە مانای هاوەڵ دێ، هەم بە مانای خاوەن دێ، ئەوانیش هەم هاوەڵایەتیی دۆزەخ دەکەن، واتە: ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا ڕەفیقێك‌و هاوەڵێکیان هەبێ بریتیە لە ئاگری دۆزەخ، یاخود ئەگەر خاوەنداریێتی شتێك بکەن، ئەوە دۆزەخ‌و ئاگری دۆزەخە، ئەگەرنا هیچ شتێکی دیکەیان نیە، ﴿ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، کە ئەوان تێیدا

بـە هەمیـشەیی دەمێننـەوە، ﴿ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ ﴾، دەفەرموێ: وێنـەی ئـەوە کە لـەم ژیـانی دنیـایەدا خـەرجی دەکـەن، ئـەو مـاڵو سامانە کـە خـەرجی دەکـەن، کـافرەکان مـاڵو سـامانی دنیـا بۆچـی خـەرج دەکـەن لـە ژیـانی دنیـادا؟ یـان بـۆ دژایەتیـی ئەهلـی ئیـسلامە، یـان بـۆ ڕابواردنی ناشـەرعییە، یـان بـۆ تیـرکردنـی غەریزەکانە بە شێوەیەکی ناشەرعیی، بۆیـە هیـچ سـوودو کەڵکـێکی لـێ نابینـن، دەفەرمـوێ: ئەو ماڵ سامانەی کە لەم ژیانی دنیایـەدا خـەرجی دەکـەن ﴿ كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ ﴾، وەك بایـەك وایـە کـە سـەرماو زوقمێـکی زۆری تێدابـێ بـێو بـایەکـی بەهێـزو سـارد بـێ، وەك کـوردەواریی خۆمـان دەڵـێن: (بـای صـەرصـەر) واتـە: ســارد، ﴿ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ ﴾، ئـەو بایـە کـە سـەرماو زوقمێکـی زۆری تێدایە، وە بە تونـدییش دێـت لـە کێڵگـەو لـە کشتوکاڵی کۆمەڵـێك خەڵـك دەدات، کە زوڵمیـان لـە خۆیـان کـردوە، لـە بەینـی دەبـا، واتـە: ئـەو ماڵو سامانەی ئەوانـە کـە سـەرفی دەکـەن، وەك ئـەوە وایـە کۆمـەڵێك باغێـك بێـستانێکیان هـەبێ، بایـەکی سـاردی بـە زوقـم لـێی بـداو، هیـچی نەهێڵـێ، ئەوانیـش کوفرەکـەیان ئـاوا پـارەو سـامانەکەیان بەربـاد دەکـات، ئـەو مـاڵو سامانەیان کە خەرجی دەکەن، بەنسبەت قیامەتیانەوە دەبـن بـە خـاوەنی دەستی خاڵـیی، بـە خاوەنـی هیـچ، چونکـە لەپـێناو خـوادا، وە لـە پـێناوی ئامانـجی شـەرعیی دا، ماڵەکـەیان خـەرج نـەکردوە بۆیـە لـە قیـامەتیَ هیـچ هەڵـناگرنەوە، ﴿ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، وە خـواش زوڵمـی لێنـەکردوون، خـوا زوڵـم لـە کـێ دەکـات؟ ئایا خـوا پـێویستیی بەوە هەیـە زوڵـم لـە خەڵـك بکـات؟! لـە ئەسڵـدا خـوای بـە بــەزەیی ڕقــی لـە مرۆڤەکـان نیـەو خۆشیدەوێـن، ﴿ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾، بەڵام خۆیان زوڵم لە خۆیان دەکـەن، ئنجـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر باسـی ئـەوە کە ئیمـانداران دەبـێ غەیـری خۆیان نەکـەنە جێگـای ڕازونیـاز، پـشت بـە غـەیری خۆیـان نەبەسـتن، بـۆ ئـەوە کـە نهێنیـیەکانی خۆیانیـان لـەلا بـدرکێنن، وە شتی

پەنهانی خۆیانیان لەلا ئاشكرا بكەن، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمۡ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! كەسانی دیكەی غەیری خۆتان، واتە: ئەوانی دیكەی كە نامسوڵمانن مەكەن بە جێگای ڕازونیازی خۆتان، ﴿ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا ﴾، ئنجا كۆمەڵێك سیفەت هەڵدەدا لەوانەی كە قەدەغەیەو نابێ مسوڵمانان بیانگرن بە دۆست، واتە: كافرو بێبڕوایەكان، جا هەندێك دەڵێن مەبەست پێی موناFیقەكانە، وە هەندێك دەڵێن مەبەست پێی جوولەكەكانە، بەڵام لە ڕاستیدا هەم جوولەكەكانو هەم نەصرانیی یەكانو هەم موناFیقەكانیشو هەم هەر كافرێكی دیكەش مەبەستە، چونكە ئەهلی كوفر بەگشتی حەز لە ئیسلامو حەز لە چارەی ئەهلی ئیسلام ناكەن، وە قازانجو خۆشییان بە ئاوات ناخوازن، بەڵكو هەمیشە لە خراپەو زیانیان دەخەفتێن، وە بە ناخۆشییو بە نارەحەتییو گرفتارییەكانیان دڵخۆشن، وەك ئایەتەكان باسی دەكەن، ئنجا ئایا بۆچی خوا دەفەرموێ: غەیری خۆتان جگە لە مسوڵمانان مەگرن بە دۆستو ڕازونیاز ؟ لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ﴿ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا ﴾، كەمتەرخەمیی ناكەن لە خراپە لەگەڵ كردنتان دا، هەر شتێك بۆتان خراپ بێ، ئەوان كەمتەرخەمیی تێدا ناكەن، واتە: ئەوان لە زیان پێگەیاندنتان دەخەفتێن، بە پێی توانایان.

٢- ﴿ وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ ﴾، هەرچی ئێوەی پێ تووشی نارەحەتییو گرفتاریی ببێ، بە ئاواتی دەخوازن، ئەوەی بۆیان بكرێ دەیكەن ئەوەی نەشیكەن، ئەوە لەبەر ئەوەیە بۆیان نەكراوە، ئەگەرنا چی ئێوە دەخاتە مەشەققەتو نارەحەتییو سەغڵەتیی یەوە، ئەوانە هەوڵی بۆ دەدەن، ئەوەی بۆشیان نەكرێ، ئەوە لەبەر بۆ نەكرانە، ئەگەرنا بە ئاواتی دەخوازن.

٣- ﴿ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ ﴾، سێیەمین نیشانەیان ئەوەیە كە ڕقو كینەی ئەوان بەرانبەر بە ئێوە لە زاریان ئاشكرا بووە، واتە: قسەی وا

دەکەنو هەڵسوکەوتی وا دەکەن، کە بۆ خۆتان بە ئاشکرا دەزانن کە ئەوانە ڕقیان لە ئێوەیە.

٤– ﴿وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾، وە ئەوەی کە لە سینەشیاندا هەیە گەورەترە، ئەوەی کە دەریدەبڕن ئەوە لای کەمیەتی، بەڵام لای زۆری ڕقو کینەو بوغزو حەسەدو نیاز خراپییان لە بەرانبەر ئێوەدا، ئەوە هەر لە دەروونیادایەو پەنهانیان کردوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾، ئەوە ئایەتەکانمان بۆ ڕۆشنکردنەوە ئەگەر بفامن، واتە: ئەگەر بفامن بۆمان ڕوونکردنەوەو پێمان ناساندن کە دوژمنانی ئێوە: ئەهلی کوفر بەو شێوەیەن لەگەڵتان، کەواتە: چۆن دەچن پشتیان پێ دەبەستن‌و، ڕازو نهێنییەکانی خۆتانیان لەلا دەدرکێنن؟ ئنجا دووبارە خوای زاناو شارەزا باسدەکاو دەفەرموێ: ﴿هَا أَنتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ﴾، ئەوەتا ئێوە ئەوانتان خۆشدەوێ، کەچی ئەوان ئێوەیان خۆشناوێ، مسوڵمان لەبەر ئەوەی دڵسافو بێ غەرەزە، چاکەی بۆ هەموو کەس خۆشدەوێو، چاکەی بۆ هەموو کەس پێ چاکە، بەڵام ئەوان وانین، ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ﴾، بڕواتان بە هەموو کتێبەکانی خوا هەیە، کەچی ئەوان بڕوا بە کتێبەکانی ئێوە ناهێنن، دیارە خاوەن کتێبەکانیان، مونافیقەکانیش ئەگەر بڵێن: ئیمانمان هێناوە، درۆ دەکەن، ﴿وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ﴾، وە کاتێک پێتاندەگەن، دەڵێن بڕوامان هێناوە، بەڵام کە تێدەپەڕنو ڕەتدەبن، ئەوە سەرە پەنجەکانیان دەگەزن[1] لە پەستیی‌و لە ڕقو تووڕەییەکی زۆر کە لە دڵیاندا هەیە بەرانبەر بە ئێوە، هەر لە کوردەواریی خۆشماندا هەیە دەگوترێ: (فلان کەس پەنجەی

---

١) (أَنَامِل) کۆی (أُنْمِلَة)یە، ئەمیش یانی: سەرە پەنجە.

خۆی دەكرۆژێ لە ڕقی فلان كەس)! ﴿ قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ﴾، تۆ بڵێ: بمرن بەو تووڕەییەی خۆتانەوە، ئەو تووڕەییە هەر لە دڵتاندابێو نەتوانن دەری ببڕن، نەتوانن بیڕێژن بە مسوڵمانان ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، بێگومان خوا زانایە بە نهێنییەكانی نێو دڵان، (ذات) بەمانای (صاحب) دێ، (ذات الصدور) واتە: ئەو نهێنییانەی پەنهان كراون لە سینەكاندا، وەك بڵێی بوون بە خاوەنی ئەو سینانە، كەواتە: (ذات الصدور) یانی: ئەو نهێنییانەی كە لە دڵو دەروونـدا لە سینەدا دەشاررێنەوە، تەنیا خوای پەروەردگاریش دەزانێ لە دڵو سینەكاندا چی هەیە؟! ﴿ إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ﴾، ئەگەر چاكەیەكتان تووشبێ پێی ناڕەحەت دەبن، هەر خێرو خۆشییەكتان تووشبێ، هەر شتێك كە بۆ ئێوە باشبێو بێتە ڕێتان، ئەگەر بە كەمییش بێ، (تَمْسَسْكُمْ) واتە: بە عاستەمیش چاكەیەكتان بێتەرێ خێرو خۆشییەكتان بێتە ڕێ، ئەوان پێی ناڕەحەت دەبن، ﴿ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا ﴾، بەڵام ئەگەر خراپەیەكتان زۆر باش بە ملەوە بێتو تووشبێت، پێی دڵخۆش دەبن، واتە: بە تۆزە چاكەیەكتان ناڕەحەتن، بەڵام ئەگەر بەڵای زۆرتان تووشبێ، ئەوجار دڵخۆش دەبن! ﴿ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ﴾، وە ئەگەر خۆڕاگربنو پارێزكاربن، پیلانو فێڵی ئەوان هیچ زیانێكتان لێنادا، كەواتە: قەڵغانی ئێوە لە بەرانبەر ئەهلی كوفردا، بۆ ئەوەی كە لێیان تووشی زیان نەبنو، بۆ ئەوەی پیلانو نەخشەكانیان زیانتان لێنەدا، بریتیە لە چی؟ بریتیە لە پارێزكارییو خۆڕاگریی كە دوایی لە مەسەلە گرنگەكەكاندا زیاتر باسی دەكەینو پێناسەی تەقوا دەكەین، كە پێشتریش پێناسەمان كردوە، پێناسەی (صبر)یش دەكەین، كە ئەو صەبرو تەقوایە چیین، كە دەبن بە قەڵغانو بەڵاگێڕەوە بۆ مسوڵمانان، وە زەرەرو زیانو پیلانو فێڵی كافرانیان لێ دەگێڕنەوە؟! ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴾، بێگومان خوا دەورەدەری ئەوەیە كە دەیكەن، یانی: دەرباز نابن، ئەگەر كەسێك

دەوری شتێكی دابێ، مانای وایە لە دەستی قوتار نابێ، واتە: خوای پەروەردگاریش دەوری ئەوانی داوە، وە پیلانو فێڵەكانی ئەوان لە ژێر ڕكێفو كۆنترۆڵی خوای بالادەست دایە، كەواتە: ئێوەش بۆ خوا صولْحاوبن بۆ ئەوەی كە خوا ﷻ بە دەستەلاتی خۆی بە قەهرو جەبرو عیززەتی خۆی پشتتان بگرێ، وە سەرەنجام پیلانو فێڵی ناحەزەكانتان بەسەر خۆیاندا بشكێتەوەو، زیانی بۆ ئێوە نەبێ.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم**: خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾، كە پێشتر تەفسیرمان كرد، واتە: ئێوە باشترین كۆمەڵن ئەی ئوممەتی پێغەمبەر! ﷺ بۆ خەڵك، بۆ مرۆڤایەتیی وەدیهێنراونو پەیداكراون، كە فەرمان بە شتە پەسندەكان دەكەنو، ڕێ لە شتە ناپەسندەكان دەگرن، وە ئیمان بە خوا دێنن، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، كە ئوممەتی ئیسلام ئەركەكەی تەنیا بریتی نیە، لەوەی بۆخۆی دینداریی بكات، بە واتایەكی دی خێرو بەرەكەتی ئوممەتی ئیسلام تەنیا بۆخۆی نیە، بەڵكو بۆ سەرجەم مرۆڤایەتییە، ئاوا دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾، ئێوە باشترین كۆمەڵن بۆ خەڵك، واتە: بۆ مرۆڤایەتیی، بەگشتی پەیداكراون، ئەم حەقیقەتە لە چەند شوێنێكی دیكەش لە قورئاندا دووبارە كراوەتەوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (البقرة)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ ...﴿١٤٣﴾ ﴾، واتە: ئاوا ئێوەمان كردوە بە چاكترین كۆمەڵ، یاخود كۆمەڵێكی میانجیی بێ لادان بەملاولادا ﴿لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ ﴾، تاكو ببنە شایەد بەسەر خەڵكەوە، واتە: چاودێربن بەسەر مرۆڤایەتییەوە،

یاخود شایەدیدەربن، گەواهیدەربن لەسەر مرۆڤایەتیی، گەواهیی‌و شایەدیی چی بدەن؟ شایەدیی ئەوە بدەن کە ئایین‌و بەرنامەی خوای پەروەردگار، کۆتا بەرنامەی خوا، کە لە قورئانداو لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەیە، ڕاستترین بەرنامەی ژیان‌و گوزەرانە، هەروەها لە ئایەتی (٧٨)ی سووڕەتی (الحج)دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ... ﴾، خوا ﷻ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەدوێنیٚ‌و دەفەرمویٚ: خوا ئێوەی هەڵبژاردوە، وە لە دین دا مایەی سەغڵەتیی لەسەرتان دانەناوە، (واتە: دینەکەتان سەغڵەتتان ناکات ئەگەر پێوەی پابەندبن)، چونکە بەپێی فیطرەت‌و سروشتتانە، وە هەمان ڕێبازە کە ئیبراهیمی بابتان لەسەری بووە، خوا ناوی لێناون مسوڵمان لە پێشدا، وە لەم قورئانەشدا، بۆچی؟ ﴿لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾، تاکو پێغەمبەر ﷺ بەسەر ئێوەوە شایەد بیٚ، وە ئێوەش شایەدبن بەسەر مرۆڤایەتییەوە، بەسەر خەڵکەوە، جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەو شایەدییدانەی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە لە قیامەتیٚ شایەدیی دەدات بۆ پێغەمبەران، بۆ وێنە: نووح عليه السلام وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ يُدْعَى نُوحٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ لَهُ هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُدْعَى قَوْمُهُ، فَيُقَالُ لَهُمْ هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ مَا أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ، قَالَ فَيُقَالُ لِنُوحٍ: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ، قَالَ فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا ﴾، قَالَ الْوَسَطُ الْعَدْلُ، قَالَ: فَتَدْعَوْنَ فَتَشْهَدُونَ بِالْبَلاَغِ وَأَشْهَدُ عَلَيْكُمْ} رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (١١٣٠١)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٣٣٩)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٩٥٩)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكُبرى) بِرقم: (١١٠٠٧)، وَابْنُ مَاجَهْ

برقم: (٤٢٨٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٤٧٧)، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژی قیامەتێ، نووح ﷺ بانگ دەكرێو پێی دەگوترێ: ئایا تۆ پەیامی خوات ڕاگەیاندوە ؟ دەڵێ: بەڵێ، گەلەکەی بانگ دەکرێن، پێیان دەگوترێ: ئایا نووح پەیامو بەرنامەی خوای پێ ڕاگەیاندوون؟ دەڵێن: هیچ (پێغەمبەرو) ترسێنەرێکمان بۆ نەهاتوە، بە نووح دەگوترێ: کێ شایەدییت بۆ دەدا ؟ کە تۆ پەیامی خوات پێ ڕاگەیاندوون؟ ئەویش دەڵێ: موحەممەدو ئۆممەتەکەی، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، واتە: ئاوا بەو شێوەیە ئێوەمان گێڕاوە بە کۆمەڵێکی هەڵبژاردەو میانجیی، تاکو ببنە بەڵگەو شایەد بەسەر خەڵکەوە، کە پێغەمبەران پێیان ڕاگەیاندوون، ئنجا فەرمووی: (الوَسَطُ العَدْلُ) واتە: ڕێكو پێك، کۆمەڵێکی ڕێكو (دادگەر)ن‌و شایەدییتان لێ وەردەگیرێ (فَتَدعُونَ فَتَشْهَدُونَ بِالبَلاغِ) ئنجا بانگ دەکرێن‌و شایەدیی بۆ دەدەن، کە پەیامی خوای پێڕاگەیاندوون. (دەڵێن ئێمە شایەدین‌و ئیسپاتکەری ئەوەین کە نووح بە گەلەکەی خۆی ڕاگەیاندوە، (وأَشهَدُ عَلَيكُم) وە منیش شایەدییتان لەسەر دەدەم کە پێم ڕاگەیاندوون، واتە: پێغەمبەر ﷺ شایەدە بەسەر ئۆممەتەکەی خۆیەوەو، ئۆممەتەکەیشی شایەدن بەسەر ئۆممەتەکانی دیکەوە.

چۆن شایەدن؟ چونکە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: خوا لە ڕێگای موحەممەدەوە پێی ڕاگەیاندووین لە ڕێی قورئانەوە، کە نووح ﷺ گەلی خۆی ئاگادار کردۆتەوە، هەروەها هەموو پێغەمبەران گەلانی خۆیانیان ئاگادار کردۆتەوە، پێغەمبەری خواش ڕاستی فەرمووە، کەواتە: پێغەمبەران (علیهم السلام) کە دەڵێن: میللەتانی خۆمان ئاگادار کردۆتەوە، ڕاست دەکەن‌و ئێمە شایەدیی دەدەین کە پێغەمبەران (علیهم السلام) ڕاستگۆن.

بەم شێوەیە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەبن بە شایەدیی هەموو پێغەمبەران لەسەر گەلە کافرەکانیان، کە پەیامی خوایان بەو گەلانە گەیاندوە، بەلاَم ئەوان ئیمانیان پێنەهێناون، ئێمەش دەڵێین: لە ڕاستیدا ئەوە جۆرێکە لە شایەدییدانی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ قیامەت، بەلاَم لە دنیاشدا ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ، ئۆممەتی ئیسلام، بەڵگەو شایەدیی ڕاستیی‌و تەواویی دینی خوای پەروەردگارن بەسەر مرۆڤایەتییەوەو، هەتا مسوڵمانەتییەکەیان تەواوتربێ، شایەدیی دانەکەیان باشترە، چونکە ئینسان تا دادگەر (عادل)تربێ، شایەدیی چاکتر لێوەردەگیرێ، دیارە (شُهَدآء) کۆی (شاهد) یان (شَهید)ە، (شاهیدو شەهید)یش هەر کامێکیان هەم بەمانای کەسێکە کە شایەدیی‌و گەواهیی دەدا بەسەر کەسێکداو، هەم بە مانای چاودێریش دێ، دیارە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ وێڕای ئەوە کە شایەدن، چاودێریشن بەسەر مرۆڤایەتییەوەو، ئەوەش لە حاڵێکدایە کە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەستەلاَتیان هەبێ‌و چاودێربن بەسەر مرۆڤایەتییەوە، کە نەهێڵن بەملاولادا لابدات، یاخود هەندێکی ستەم لە هەندێکی بکا، وەك ئێستا لە دنیادا هەیە بەلاَم لەم ڕۆژگارەدا، لەبەر ئەوەی کە ئۆممەتی ئیسلام بێ دەستەلاَتە، تەماشا دەکەی دنیا بۆتە مەیدانی تەراتێنی زلهێزان‌و، ئەوانەی کە دەستەلاَتیان زیاترە، بۆ چەوساندنەوەی میللەتانی کەمدەست‌و بێدەستەلاَت.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾، تەماشا دەکەین خوا ﷻ، بە سێ سیفەتان ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ پێناسە دەکات:

١– فەرمان بە شتە باش‌و پەسندەکان دەکەن.

٢– ڕێگریی لە شتە ناپەسندو خراپەکان دەکەن.

٣– وە ئیمان بە خوا دێنن، کەواتە: خوا ﷻ بە گۆترە کەس بە چاك دانانێ، وە کەسیش بە خراپ دانانێ، بۆیە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ باشترین

کۆمەڵن، لەبەر ئەو سێ سیفەتە گەورەو گرانە: هەرچی شتی پەسندو چاکە، فەرمانی پێدەکەن، واتە: ئەوە هیچ کە بۆ خۆیان دەیکەن و ئەنجامی دەدەن، فەرمان بە غەیری خۆشیان دەکەن، کە شتە پەسندەکان ئەنجام بدەن، وە هەرچی ناپەسندو خراپە، ڕێگریی لێدەکەن، واتە: بۆخۆیان دەستیان لە شتی خراپ هەڵگرتوەو خۆیان لێ بژار کردوەو، دەیانەوێ دەوروبەریشیانی لێ بژار بکەن، وە ئیمانیشیان بە خوا هەیەو، هەر ئیمان بە خوای بێوێنەش وای لێکردوون فەرمان بکەن بە چاکەو ڕێ لە خراپە بگرن، لەگەڵ شتی پەسند دابن و، دژی شتی ناپەسندبن، بەڵام بۆیە ئیمان بە خوای خستۆتە دوای فەرمان بە چاکەکردن و ڕێگریی لە خراپەکردنەوە، تاکو بزانین کە ئیمان بە خوا بوونێك ئیعتیباری پێدەکرێ و بە ئیمانی ڕاستەقینە لەقەڵەم دەدرێ، کە خاوەنەکەی وا لێبکات لەگەڵ شتی پەسند دابێ و فەرمانی پێبکات، وە دژی شتی ناپەسندو خراپ بێ و ڕێی لێبگرێ، هەروەك وەسفکردنی ئوممەتی ئیسلام بەو سێ سیفەتە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ، کە دەبێ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێو مرۆڤایەتییدا، هەڵسن بەچی؟ بە ڕەواج پێدان و بڵاوکردنەوەی: شتە پەسندەکان و، ڕێگرییکردن لە شتە ناپەسندەکان، وە ئیمانهێنان بە خوا ﷻ.

(ابن جریر) خاوەنی تەفسیری (جامع البیان) ئەم دەقەی هێناوە: ((عَنْ ابْنِ جَرِيرٍ عَنْ قَتَادَةَ: ذُكِرْنَا أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَرَأَ هَذِهِ الآيةَ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ...﴾، ثُمَّ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَكُونَ مِنْ تِلْكَ الأُمَّةِ فَلْيُؤَدِّ شَرْطَ اللهِ فِيهَا))[1]، واتە: قەتادە دەڵێ: بۆمان باسکرا کە عومەری کوڕی خەتتاب - خوا لێی ڕازی بێ-، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾، دوایی گوتی: ئەی خەڵکینە! هەر کەسێك پێی

---

١) (جامع البيان، ج: (٤)، ص: (٤٧).

خۆشە لەم ئۆممەتەبێ (کە خوا بەوە مەدحی کردوە چاکترین ئۆممەتن، چاکترین کۆمەڵن)، با مەرجی خوای تێدا جێبەجێ بکات، ئەو مەرجە چییە؟ لەخۆدا هێنانەدی ئەو سێ سیفەتەیە کە باسمان کردن.

**مەسەلەی سێیەم**: خوا ﷻ بە ئیماندااران دەفەرموێ: ﴿ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾، کە پێشتر تەفسیرمان کرد، واتە: خاوەن کتێبەکان جوولەکەو نەصرانیی یەکانو ئەوانی دیکەش زیانتان پێناگەیەنن، مەگەر ئازار پێگەیاندن، یانی: ناتوانن پەکیی ئیشتان بخەن، ناتوانن ببنە پەرچو کۆسپ لەبەر دەمتاندا، بەڵام دەتوانن تووشی ئازار نارەحەتییتان بکەن، وە ئەگەر لەگەڵتان بجەنگێنو جەنگتان لە دژ بکەن، ئەوە پشتتان تێدەکەن، وە دوایی سەرناخرێنو هیچ کەسێك نیە یارمەتییان بدات، توێژەرەوانی قورئان هەندێکیان گوتوویانە: لێرەدا مەبەست پێی تەنیا هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەرە ﷺ، واتە: ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر! ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، هەر کاتێك جوولەکەو نەصرانیی یەکان لەگەڵتان ڕووبەڕووبوونەوە، تەنیا دەتوانن تووشی ئازارو نارەحەتییتان بکەن، بەڵام ناتوانن لەبەینتان ببەنو پەکتان بخەن، ئەوە لەلایەك .

وە هەرکاتێك لەگەڵیشتان بەشەڕ بێن، پشتتان تێدەکەن، واتە: گوتوویانە: ئەوە تایبەتە بە هاوەڵانی بەرێزەوە، وە بە کردەوەش وا بووەو هەرکاتێك جوولەکەو نەصرانیی یەکان لەگەڵ سوپای ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ڕووبەڕوو بووبنەوە، وە دوای پێغەمبەریش ﷺ ئەوە هەر هاوەڵانی بەرێز ئەوانیان شکاندوە، ئەمە وەك واقیعی مێژوویی ڕاست هاتۆتەدی، بەڵام لە ڕاستییدا ئێمە دەڵێین: ئەوە وانیەو ئەم قورئانە تەنیا بۆ سەردەمی هاوەڵانی بەرێز نەهاتۆتە خوار، بەڵکو خوا ﷻ چونکە دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ... ﴾، بەڵێ، بە پلەی یەکەم هاوەڵان دەگرێتەوە، بەڵام دوای وانیش هەموو ئۆممەتی ئیسلام هەر دەگرێتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە

ئەو مەرجانە کە خوای پەروەردگار ئۆممەتی ئیسلامی پێ وەسف کردوون، ئەو وەسفانە هەبن، هەرکاتێك ئەو سیفەتانە هەبوون، ئەوە ئەو دەرەنجامەشی لێ دەکەوێتەوە، کەواتە: کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ﴾، واتە: زیانتان پێناگەیەنن، جگە لە ئازاردان، وە هەر کاتێك لەگەڵتان بەشەڕ بێن، پشتتان تێدەکەن، ئەوە لە ڕاستیدا بۆ هەموو قۆناغەکانی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ڕاست دەردەچێ، بەڵام بە مەرجێك ئیمانداران ئیمانداری ڕاستەقینەبن، هەرکاتێك ئیمانداران ڕازاوەبن بەو سیفەتانەی کە خوای پەروەردگار بۆی بە مەرج گرتوون، ئەوە جوولەکەو نەصرانیی یەکان لەبەردەمیاندا هەمیشە شکست دەخۆن، ئەدی ئێستا بۆچی وانیە؟! لە ڕاستیدا ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئیمانداران مەرجەکەنیان تێدانین، وەك خوێندوومەتەوە لە گۆڤارێکدا دەڵێ: لە دوای شەڕی ساڵی (٦٧) کە لە نێوان جوولەکەو عەرەبدا، ڕوویدا، نەك جوولەکەو مسوڵمان!! بەڵکو لە نێوان جوولەکەو گەلی عەرەب دەوڵەتانی عەرەبیی بە پاڵنەری عەرەبایەتییو فیکرەی ناسیۆنالیزمیی لەگەڵ جوولەکەدا بەشەڕهاتن، جا دەڵێ: یەکێك لە عەلمانییەکان بە زانایەکی مسوڵمانانی گوت: ئەدی باشە ئێوە ناڵێن: ئەگەر مسوڵمانان لەگەڵ کافران بەشەڕ بێن فریشتە دێن یارمەتییان دەدەن؟! گوتی: با، کابرای عەلمانییش گوتی: ئەدی باشە کوا !! یان فریشتەش پێیان نەوێران (بە جوولەکەکان) یان ئەوەتە ڕاست نیە، چونکە ئێمە لەگەڵ جوولەکە بەشەڕ هاتین کەچی لە بەرانبەریاندا شکستمان هێنا، یان فریشتە نەهاتوون، یان هاتوونو بە جوولەکەکان نەوێراون؟! ئەو زانا مسوڵمانەش پێی دەڵێ: با، فەرمایشتی خوای پەروەردگار ڕاستە، خوا فریشتەی ناردن، بەڵام فریشتەکان کە هاتن بۆیان لێك نەکرانەوە، کامە جوولەکەو کامە مسوڵمانە! ئەوان شەرابیان دەخوارد هی ئێمەش دەیانخوارد، ئەوان چییان دەکرد هی ئێمەش دەیانکرد، هەرچەندە تەماشیان کرد بۆیان لێك نەبوونەوە!! هەڵبەتە قسەکەی جوان

بووە، خوا عزّوجل فریشتەکان بۆ یارمەتی مسولّمانان دەنێرێ، کاتێك کە مسولّمانی ڕاستەقینەبن، ئەگەرنا تەنانەت سوپاکەی پێغەمبەریش ﷺ وەك دوایی دەیگەینێ لە جەنگی (ئوحود)دا، چونکە سەرپێچییان لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کرد، نەك لە هەموو شتێکدا بەڵکو یەك فەرمانیان شکاند، فریشتەکان یارمەتییان نەدان، کەواتە: بەڵێ خوا لەگەڵ ئیمانداراندایە، بەڵێ فریشتە پشتی ئیمانداران دەگرن، بەلاّم دەبێ ئیمانداران ئیمانداری ڕاستەقینەبن، وە ئەو مەرجانەی کە خوا بۆی بەمەرج گرتوون، لە خۆیانیاندا بێننە دی، وە ئەو وەسفانەی کە خوای پەروەردگار پێی وەسف کردوون لەواندا بەرجەستەبن، کەواتە: ئەوەی کە دەڵێ: ئەم ڕستە قورئانییە تەنیا مەبەستی پێی ڕۆژگاری پێغەمبەرو ﷺ هاوەلاّنی بەڕێزە، ئەوە وانیە، هەروەها تێگەیشتنێکی دی هەیە ئەویش هەڵەیە، ئەویش ئەوەیە کە بگوترێ: ئەم ڕستە قورئانییە مەبەست پێی مسولّمانانە هەر چۆنێکی بن، واتە: چاك بن یان خراپ ! جوولەکەو نەصرانیی یەکان لە بەرانبەریاندا خۆیان ناگرن‌و پشتیان تێدەکەن ئەوەش وانیە، بۆچی وانیە؟ چونکە ئەوەتا لە واقیعیی مێژووییدا دیارە، کە چەند ملیۆن جوولەکەیەك لە بەرانبەر ئەو هەموو مسولّمانانەدا توانیویانە خۆڕابگرن، وە تا ئێستا بەو شێوەیە تێنەشکاون کە ئەم ئایەتە بێتە دی، کەواتە: ئەوەش ڕاست نیە، کە هەرکەسێ لە مسولّمانان لەگەڵ جوولەکەکان‌و نەصرانیی یەکاندا ڕووبەڕوو بێتەوە، حەتمەن مسولّمانان سەردەکەون، کاتی خۆی (صدام)یش لەگەڵ سوپای ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیدا ڕووبەڕوو بۆوە، هەروەها (طالیبان)یش لەگەڵ ئەمریکا ڕووبەڕوو بووتەوە، بەلاّم هەردووك لایان شکستیان هێنا، کەواتە: ئەو تێگەیشتنەش ڕاست نیە.

بەڵکو تێگەیشتنی ڕاست ئەوەیە، کە هەر کاتێك مسولّمانانی ڕاستەقینە لەگەڵ خاوەن کتێبەکان، لەگەڵ جوولەکەو نەصرانیی یەکاندا، ڕووبەڕوو ببنەوە، بە تەئکید ئەو خاوەن کتێب‌و جوولەکەو نەصرانیی یانە لە

بەرانبەریاندا تێکدەشکێن، لەبەر ئەوەی مسوڵمانانی ڕاستەقینەن‌و خوایان لەگەڵ دایە، پێویستە ئەو شتانە ڕوون بکەینەوە بۆ ئەوەی کە خەڵك لە ئایەتەکانی خوای بێ هاوەڵ نەکەوێتە گومانەوەو، تێگەیشتنی هەڵەی لەبارەیانەوە نەبێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، واتە: خاوەن کتێبەکان، بەڵام بە سیاق دەردەکەوێ کە مەبەست پێی جوولەکەکانە، یانی: زەبوونییان بەسەردا سەپێنراوە، بێدەستەڵاتیان پێوە چەسپێنراوە، مەگەر بەهۆی خواوە، یاخود بەهۆی خەڵکەوە، لەو زەبوونیی‌و لەو بێ دەستەڵاتییە ڕزگاربن، واتە: ئەوانە هەمیشە زەبوون‌و بێ دەستەڵات دەبن، مەگەر لە سێبەری حوکمی خواو لە سێبەری حوکمی ئیسلامییدا هەست بە عیززەت‌و سەربەخۆیی‌و هەست بە بەختەوەریی بکەن، یاخود بەهۆی هاوپەیمانێتیی لەگەڵ خەڵکی دیکەدا، ئەوەش وایە: جوولەکەکان کاتی خۆی هەتا دەوڵەتی ئیسلامیی هەبووە، زۆر بە عیززەت‌و کەرامەت ژیاون، هەروەها ئێستاش کە دەستەڵات‌و عیززەتێکیان هەیە زەبوونییان لەسەر لاچووە، بە هێزی خۆیان نیە، بەڵکو بە هۆی هاوپەیمانێتییانەوەیە لەگەڵ دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا بەگشتی‌و لەگەڵ ئەمریکادا بەتایبەت، کە بۆخۆتان دەبینن هەموو جارێ ئەمریکا (ڤیتۆ) بەکاردێنێ لە ئەنجوومەنی ئاسایش، کاتێك بڕیارێك بدرێ دژی قەوارەی زایۆنی‌و بەرگرییان لێدەکات، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: زەبوونییان لەسەر فەرز کراوە، مەگەر بەهۆی خواوە ﷻ، واتە: بەهۆی دینی خواوە، کە لە سایەی دینی خوای بەرزدا وەك هاوولاتیی ژیانی ئاسوودەو بەختەوەرانەیان هەبێ، یاخود بەهۆی خەڵکەوەو بە هۆی هاوپەیمانێتییەوە لەگەڵ خەڵکدا.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾، کە لێرەدا مەبەست پێی جوولەکەکانە، ئەوەش

جوولەکەکان زۆر پێی ناسراون کە پێغەمبەرانی خۆیانیان (علیهم الصلاة والسلام) کوشتوە، بە تایبەتی زەکەریاو یەحیا، کە دوو پێغەمبەری خوا بوو ون (علیهما الصلاة والسلام)، وە بابو کوڕ بوون، جا لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە خوا دەفەرموێ: ئەوانە لەبەر ئەوە تووشی ئەو وەزعەبوون، چونکە بێبڕوابوون بەرانبەر بە ئایەتەکانی خواو، وە پێغەمبەرانی خۆیانیان بەبێ هەق کوشتوە، بەلاَم خۆ جوولەکەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ هیچ پێغەمبەریان نەکوشتوون! بەڵێ بەرانبەر بە ئایەتەکانی خوا بێبڕوا بوون، بەلاَم چۆنە خوای پەروەردگار هەموویان بەوە وەسف دەکا ؟! وەلاَمەکەی ئەوەیە:

یەکەم: ئەوانیش بە تەمابوون پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژن و پیلانیان گێڕا، بەلاَم بۆیان نەکوژرا، جارێك بە ژار خواردکردن و، جارێك ویستیان بەردداشێکی بەسەر بەردەنەوە، وە پیلانی دیکەشیان بۆ گێڕاوە.

دووەم: بۆیەش ئەوانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو گوناحو تاوانانەیان لە مل پێچراوە، چونکە هەر لەسەر ڕچەی ئەو بابو باپیرانەیان ڕۆیشتوون، وە بەرائەتیان لێ نەکردوون، کەواتە: وەك لەو تاوانانەیاندا بەشدار بووبن وایە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾، واتە: ئەوەشیان بۆیە کرد بەهۆی ئەوەوە کە سەرپێچییان دەکرد، وە دەستدرێژییان دەکرد، واتە: سەرپێچیی و دەستدرێژیی وای لێکردن بێبڕوابن، وای لێکردن دەستیان بچێتە خوێنی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەش ئەو حەقیقەتەی لێوەردەگیرێ، کە گوناحەکان هەندێکیان هەندێکیان پەلکێش دەکەن، هەروەك چاکەش وایە، (الحَسَنَاتُ يَجرُّ بَعْضُهَا بَعْضاً، وَالسَّيِّئَاتُ يَجرُّ بَعْضُهَا بَعْضاً)، واتە: چاکەکان هەندێکیان هەندێکیان ڕادەکێشن، وە خراپەکانیش هەندێکیان هەندێکیان ڕادەکێشن، یانی: ئینسان چاکەیەك دەکات ئەو چاکەیە وای لێدەکا چاکەیەکی دیکەش بکاتو،

ئەویدیکەش وای لێدەکا چاکەیەکی دیکەش بکاتو...هتد، وە بە پێچەوانەوە بۆ خراپەش هەروایە، ئینسان گوناهێك دەکات، وای لێدەکا گوناهێکی دیکەش بکات، ئنجا گوناهێکی دیکەش بکاو ... هتد، بۆیە یەکێك لە زانایان دەڵێ: هەر کات چاکەیەکت لە کەسێکدا بینی، بزانە چاکەی دیکەشی هەن، وە هەرکاتێك خراپەیەکت لە کەسێکدا بینی، ئەوە بزانە خراپەی دیکەشی هەن، بە زۆریی وایە، ئیدی خۆ جاری واش هەیە کابرا لێی غەڵەت دەبێ خراپەکەیەك دەکا، یاخود بابایەکی خراپ لە دەستی دەردەچێ چاکەیەك دەکا! بەڵام ئەوە دەگمەنە، بە زۆریی وایە ئەوەی چاکە بکات، بە یەكو دووانەوە ڕاناوەستێو ئەوەی خراپەش بکات، بە یەكو دووانەوە ڕاناوەستێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾، پێشتریش باسمان کرد، خوای دادگەر دەیەوێ مسوڵمانان فێر بکات کە هەرگیز بە یەك چاو تەماشای بەرانبەرەکانیان نەکەن، کاتێك کە بەرانبەرەکانیان جۆراوجۆر بوون، بە یەك چاو تەماشایان نەکەن، وە یەك حوکم بەسەر هەموویاندا نەدەن، لێرەدا خوا دەفەرموێ: خاوەن کتێبەکان هەموویان یەکسان نین، هەموویان وەك یەك نین، واتە: بە یەك چاو تەماشایان مەکەنو وەك یەك حیسابیان بۆ مەکەن، بەڵکو وەرن پۆلێنیان بکەن، لێرەدا خوا ﷻ پۆلێنیان دەکات، کۆمەڵێکیان لێ جیادەکاتەوە، کە یازدە سیفەتی گەورەو گرنگیان لێ هەڵدەدا، پێشتریش ئاماژەمان بە سیفەتەکان کرد، کەواتە: ئێمەش دەبێ هەوڵبدەین ئاوا دادگەر بینو ئەهلی ئینصاف بین لەگەڵ غەیری خۆمان دا، کاتێك کە بەرانبەرەکانمان جۆراوجۆرنو یەك جۆر نین، بە یەك چاو تەماشایان نەکەین، وە یەك حوکمیشیان بەسەردا نەدەین،

بۆ ئەوەی تووشی بێ ئینصافیی نەبین، ئنجا ئایا لێرەدا مەبەست لەو خاوەن کتێبانە ئەوانەن کە هەر لەسەر دینی خۆیان ماونەوە، بەڵام لەگەڵ دینی خۆیاندا ڕاستیان کردووە، ئەو سیفەتە چاکانەیان تێدا پەیدابوون، یاخود مەبەست ئەوانەن کە مسوڵمان بوون هاتوونە نێو ئیسلامەوە؟! لە ڕاستیدا ڕای بەهێزتر وەك پێشتریش گوتمان، ئەوەیە کە دوای ئەوەی هاتوونە نێو ئیسلامەوە، ئەو سیفەتە باشانەیان تێدا پەیدابوون، کە یازدە سیفەتی گەورەو گرنگن، چونکە بەڕاستی ئەو سیفەتانە لەسەر بناغەی پابەندیی بە دینێکی تێکدراوەوە پەیدانابن، کە بریتیە لە دینی جوولەکایەتیی و نەصرانییەت، ئەو سیفەتە باشانە تەنیا کاتێك پەیدادەبن، کە ئینسان پابەندبێ بە قورئانەوەو شوێنکەوتووی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بێت، چونکە خوا ﷻ مەدحیان دەکات بەوەی کە: ﴿أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ﴾، واتە: ڕاوەستاون لەسەر دینی خوا، ئنجا ﴿يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾، ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە، ناگونجێ خوا ﷻ مەدحی جوولەکەو نەصرانیی یەکان بکا، بەوەی کە ئایەتە موحەڕڕەفو تێکدراوەکان دەخوێننەوە، چونکە ئەوانە ئایەتی خوا نین، ئەوەی لە چوار ئینجیلەکاندا هەیە، وە ئەوەش کە لە تەوراتی تێکدراودا هەیە، زۆری ئایەتی خوا نیە، تێکدراوە بە دەقی قورئان، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ... ﴿٤٦﴾﴾ النساء، واتە: وشەکان دوای دانرانیان لە شوێنەکانیان، دەگۆڕن. کەواتە: ئەوەی کە بەڕاستیی ئایەتی خوایەو دەخوێنرێتەوە، بریتیە لە قورئان، هەروەها کە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾، ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی دێنن، ئیمان بە خوا هێنانێكو، ئیمان بەڕۆژی دوایی هێنانێك، بە ئیمان لەقەڵەم دەدرێ، کە بەپێی قورئان بێ، ئەگەرنا وەختێك بابای نەصرانیی دەڵێ: ئیمانم بە خوا هەیە، بەڵام عیسا کوڕی خوایە، ئەوە چ ئیمانێکە؟! یان جوولەکە کە دەڵێن: ئیمانمان بە خوا هەیەو عوزێریش بە کوڕی خوا

دەزانن، ئەوە چ ئیمانێکە؟! وەك خوای پەنهانزان لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ ... ﴿٣٠﴾ ﴾التوبة، واتە: جوولەکەکان گوتیان: عوزێر کوڕی خوایە (پاکیی بۆ خوا)، وە دەربارەی نەصرانیی یەکان، دەفەرموێ: ﴿ ... وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ... ﴿٣٠﴾ ﴾التوبة، واتە: نەصرانییەکان گوتیان: مەسیح کوڕی خوایە، کەواتە: ناگونجێ خوا مەدحی ئەو زانایانەی جوولەکەو نەصرانیی بکات، کە لەسەر نەصرانییەتو جوولەکایەتیی مابنەوە، چونکە ئیمان بە خوا بوونەکەیان، ئیمان بە خوا بوونێکی تەواو نیە، وە هەر کاتێك وازیان لەو عەقیدە پووچەیان هێنا، مانای وایە ئەوە هاتوونە سەر ئیمانی ڕاستەقینەو خوا بە یەکگرتن (توحید)، کەواتە: ئەوکاتەش جوولەکەو نەصرانیی نەماون، هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾، فەرمان بە شتە پەسندو چاکەکان دەکەنو، ڕێگریی لە شتە خراپو زیانبەخشەکان دەکەن، بێگومان چاکەو خراپە، پەسندو ناپەسند، بە تەرازوویەکی ڕاست دیاری دەکرێن، کە قورئانە، ئەگەرنا بەپێی ئینجیلو تەوراتی گۆڕدراو، چاکەو خراپە دیاری ناکرێن، تەوراتو ئینجیل باسی چەندان شتی غەڵەتو پەڵەت دەکەن، بۆ وێنە: بەپێی دینی تێکدراوی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، ئەگەر گۆشتی بەراز بخۆن، ئەگەر شەراب بخۆنەوە، چیو چی بکەن، لێیان قەدەغە نیە، کەواتە: ناگونجێ ئەوانە فەرمان بە چاکەکەرو ڕێ لە خراپەگر بن، مەگەر مسوڵمان ببن، دیسان کە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾، وە پێشبڕکێ دەکەن لە کاری چاکەدا، هەروەها دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَـٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾، وە ئەوانە لە چاکەکانن، ناگونجێ مرۆڤ جوولەکە یان نەصرانیی بێو، بە گوێرەی تەرازووی کۆتا شەریعەتی خوا، صاڵح بێ !! هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ

﴿ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، دیسان ناشگونجێ پارێزکاربێ‌و نەبووبێتە مسوڵمان، چونکە پارێزکردن‌و پارێز لە خوا کردن، تەنیا لە کاتێکدا پەیدادەبێ، کە ئینسان پابەندبێ بە دینێکی ڕاست‌و دروست بە شەریعەتێکی ڕاست‌و دروستەوە، کە ئەویش تەنیا ئیسلامە.

کەواتە: مەبەست لەو کەسانەی ئاوا خوا وەسف‌و پێناسەیان دەکات لە خاوەن کتێبەکان، ئەوانەیانن کە مسوڵمان بوون‌و هاتوونە نێو ئیسلامەوە[1].

**مەسەلەی هەشتەم:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٧﴾﴾، خوای پەروەردگار لەم دوو ئایەتە بە پێزەدا، وێنەیەکی بەرهەستمان دەخاتە بەرچاو، واتە: وێنەیەك کە بتوانین تەماشای بکەین‌و بە خەیاڵ بیهێنینە بەرچاوی خۆمان، بۆچی؟ بۆ سەرەنجامی ماڵ سەرفکردنی بێبڕوایەکان لە دژایەتییکردنی ئیسلام‌و مسوڵمانانداا، یاخود لە شتی گوناح‌و ناشەرعییدا کە وەك ئەوەیە کەسێك باغ‌و بێستانێکی هەبێ، پڕ بێ لە میوەی جۆراوجۆرو بەروبوومی جۆراو جۆری باش، بەڵام لەنەکاو بایەکی زۆر توندی پڕ لە زوقم لێی بداتو، هیچ بەروبووم‌و میوەی پێوە نەهێڵێ، یاخود هەر درەختەکانیشی نەهێڵێ‌و تەخت ببێ، کەواتە: خوا ﷻ لێرەدا دەیەوێ بیخاتە بەرچاوی ئێمە کە ئەوانەی

---

١) بۆیەش بە داکۆکیکردنەوە ئەم مەسەلەیم خستەڕوو، چونکە لە هەندێك کتێب و تەفسیردا بینیوومە کە ڕایەکەی دیکە پەسندو تەبەنیی کراوە، کە بێگومان هەڵەیەو ڕەنگە هاندەرەکەیشی جۆرێك لەخۆبردنە پێش‌و ماستاوکردن (تملّق) بێ بۆ جوولەکەو نەصرانییەکان!

ئنجا ئەگەر کەسێکیش بپرسێ: ئەدی بۆچی ئەو جۆرە کەسانە پاڵدراونە لای خاوەن کتێبەکان ﴿... مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ ... ﴿١١٣﴾﴾ آل عمران؟! وەڵامەکەی ئەوەیە ئینتیمای ڕابردوویان لەبەرچاو گیراوەو، دیارە کاتی خۆی لە بازنەی خاوەن کتێبەکان دا بوو ون.

بێبڕوان، لە قیامەت هیچ هەڵناگرنەوەو هیچ بەرهەمێکیان دەستگیر نابێ، لەو پارەو سامانە کە خەرجی دەکەن، لە دنیادا، چونکە لە ڕێیەکی ناشەرعییەوە بووە، یاخود بۆ دژایەتی ئیسلامو مسوڵمانان بووە، بەڵێ ئەوانە لە دوارۆژدا دەستیان خاڵییە، مەگەر بە ئەندازەی ئەوە کە کابرایەك باغێکی هەیە، بایەکی بە سەرماو زوقم، یان گەردەلولێك کە سەرمایەکی زۆری تێدایە، لە باغەکەی دەداو هیچی بۆ نامێنێ، ئەو چەندەی بۆ دەمێنێتەوە، ئەو کافرانەش لەو ماڵ خەرج کردنە لە قیامەتدا، هەر ئەوەندە ئیستیفادە دەکەن، واتە: هیچ !!

**مەسەلەی نۆیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هیچ کەس جگە لە خۆتان مەکەنە جێگای ڕازونیاز، (بِطانة) واتە: کەسێك کە تۆ شتە نهێنییەکانی خۆتی بۆ باس بکەی، خوا دەفەرموێ: ئەی ئیماندارینە! غەیری خۆتان (واتە: ئەوەی کە مسوڵمان نەبێ، ئیماندار نەبێ) مەیکەنە جێگای ڕازو نیاز، نهێنیی خۆتانی لەلا مەدرکێنن، کەواتە: کاتێك کە مسوڵمان متمانەو باوەڕ دەکات بە کەسێك کە نامسوڵمانەو نهێنیی خۆی لەلا دەدرکێنێ، ئەوە لەڕاستیدا شتێکی حەڕامی کردوە، گوناهێکی کردووەو دیارە ئەو گوناهەش بە ئەندازەی ئەو زەرەرو زیانانەیە کە بە مسوڵمانان دەگات، لە ئەنجامی درکاندنی ئەو شتە نهێنیيانەدا، جاری وا هەیە مسوڵمانێك شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ، نهێنییەك دەدرکێنی بۆ کەسێکی بێبڕوا، بەڵام زەرەرێکی وای نابێت، ئەوە بەقەدەر ئەوە کە زەرەرو زیانی هەبووە گوناهبارە، وە جاری وا هەیە کۆمەڵە مسوڵمانێك نهێنییو پەنهانیی خۆیان بۆ دوژمنانیان ئاشکرا دەکەن، وە بەهۆیەوە مسوڵمانان تووشی زیانێکی زۆر دێن، ئەوە لە ڕاستیدا بە ئەندازەی ئەوە کە مسوڵمانان بەهۆی درکاندنی ئەو نهێنییەوە زەرەریان کردوە، ئەو کەسانە گوناهەکەیان گەورەیە، بەڵکو جاری وا هەیە کە بابای سیخوڕ (جاسوس)و نهێنیی درکێنەری مسوڵمانان، پێشی

لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەر، مادام بە پاڵنەری خۆشویستنو بە پاڵنەری ئەوە کە ئەوان سەربکەون، نهێنییەکانی لەلا درکاندبن، ئەوکاتە مانای وایە بەو ڕەفتارو هەڵوێستەی لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەر، چونکە تەنیا کەسێك ڕەفتاری وای لێ دەپشکوێتەوە، کە دۆستایەتیی ڕەها (الموالاة المطلقة)ی بۆ ئەهلی کوفر هەبێ.

**مەسەلەی دەیەم**: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾، تا کۆتایی، واتە: ئایەتەکانی: (١١٨و ١١٩و ١٢٠)، خوای پەروەردگار لەو سێ ئایەتەدا بە نۆ سیفەتی خراپ وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە نابێ مسوڵمانان بیانکەن بە جێگای ڕازونیازی خۆیان، وە نهێنییەکانی خۆیانیان لەلا بدرکێنن، دیارە ئێمە لێرەدا ئەو پەندەی لێ وەردەگرین، کە دوژمنانی ئیسلامو ناحەزانی ئیسلام، هەمیشە بەو سیفەتە خراپانە وەسف دەکرێن، وە ئەو سیفەتانە ئاوێنەی ناحەزانی ئیسلامو مسوڵمانان، کەوابێ با بزانین چیو چین؟

**یەکەم**: ﴿لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا﴾، واتە: کەمتەرخەمیو درێغیی ناکەن لە خراپەی ئێوەدا، هەرچی بۆ ئێوە خراپ بێ، ئەوان وا دەکەن.

**دووەم**: ﴿وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ﴾، واتە: چی بۆ ئێوە گرفتارییو نارەحەتییو مەینەتیی بێ، بە ئاواتی دەخوازن، ئەوەی کە پێیان بکرێ دەیکەن، ئەوەش کە پێیان نەکرا، ئەوە بۆتان بە ئاوات دەخوازن.

**سێیەم**: ﴿قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾، واتە: ڕقو کین لە زاریان ئاشکرا بووە، واتە: لە تەعبیری زمانیان لە دەربڕینەکانیان ئاشکرا بووە، بەڵام هەر ئەوەندە نیە.

**چـوارەم:** ﴿ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُ ﴾، واتـە: ئـەوەی کـە سـینەکانیان شـاردوویەتەوە بەرانبەرتـان لـە کینـەو بـوغزو دژایـەتیی‌و دوژمنایـەتیی گەورەترە، واتـە: ئەوەنـدەی کە لێیـان دەبیـستن، بەشـێکی کەمـە، لـەوەی کـە پێـیانەو لـە سینەکانیاندا شـاردوویانەتەوە، لـە دڵیـاندا پـەنهانییان کـردوە بەرانبەرتان.

**پێنجـەم:** ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ ﴾، واتە: ئێوە ئەوانتان خۆشـدەوێ، دوایـی باسـی دەکـەین ئـەو خۆشویـستنە چۆنــە؟ بـەڵام ئـەوان ئێوەیــان خۆشـناوێ، زۆر مـسوڵمان بـە دڵ سافیی لەوانەیـە خەڵـکی کـافرو خراپیـشی خۆشـبوێ، بـەڵام ئـەوان بـەو گـرێ‌و گۆڵـەی دەروونیـانەوە، قـەت مسوڵمانانیـان خۆشـناوێ.

**شـەشـەم:** ﴿ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ ﴾، واتە: ئێـوە بڕواتـان بـە هـەموو کتێبـەکانی خـوا هەیـە، کەچـی ئـەوان بڕوایـان بـە کتـێبی ئێوەنیـە، ئـەوە جوولەکـەو نەصـڕانیی یـەکان، بـەڵام هەیانـە بـڕوای بـە هـیچ کتێبێـك نیـە، کـە ئەوانـە بێبـڕوان‌و خـاوەن کتێـب نـین‌و بڕوایان بـە هـیچ کتێبێـك نیـە، ئەوانـەی کە بەڕاسـتی عەلـمانیــی (سیکۆلاریـست)ن بڕوایـان بـەوە نیـە، کـە خـوا هـەر دەسـتی هەبــێ لــە ژیـانی بەشــەردا، چـونکە لەڕاسـتیدا عەلــمانییەت (سیکۆلاریــزم) کرۆکەکـەی ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ دەسـت وەرنەداتـە ژیـانی بەشــەر، وە بەشــەر بۆخــۆی ژیـانی خـۆی ڕێـك بخــات، ئـەوە کاکڵـەی عەلـمانییەتە، ئیـدی کە کۆلکە عەلـمانییەکانی کوردسـتان بـۆ چەواشـەکردنی خەڵـکی دەڵـێن: عەلـمانییەت دژی دیـن نیـەو بێلایـەنە !! ئـەوە هـەمووی درۆو دەلەسـەیەو لەڕاسـتیدا سیکۆلاریزم کـاتی خـۆی بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو بۆشـاییە پەیـدابوو، کــە خــەڵك لــە وڵاتــانی ڕۆژئــاوا دینێکــی ڕاسـتیان لەبەردەسـتدا نەبوو، بۆ ڕێکخستنی ژیـانی خۆیان‌و گوتیـان: دەبـێ بەرنامـەو دینێـك پەیـدا بکـەین، وە عەلـمانییەتیش جـۆرە دینێکـە، بـەڵام زادەی بیـرو هۆشی ئینسانە، بەبـێ حیسابـکردن بۆ خـواو بـۆ قیامـەت‌و، سیکۆلاریستەکان،

ژیـانی خۆیـان ڕێكـدەخەن بـەو شـێوەیەی كـە خۆیـان پـێـیان خۆشـە، بەبـێ لەبەرچاوگرتنی ئـەوە كـە داخـۆ خـوا چی فـەرمووە؟ وە دین چی دەڵـێ؟ وە پـێغەمبـەران چییـان فەرمووە؟ ئـەوە كاكڵـەو بناغـەی عەلـمانییەتە، كەواتـە: ئێـوە بڕوا بـە هـەموو كتێبـەكانی خـوا دێـنن، بـەڵام ئـەوان هـەیانە بـڕوا بـە هیـچ كتێبێـك ناهـێنێ، وە جوولەكـەو نەصرانیی یـەكانیش بـڕوا بـە كتێبـی ئێـوە ناهێنـن.

**حەوتــەم:** ﴿ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا ﴾، واتـە: كاتێـك پێتــان دەگـەن دەڵـێن: ئیمانمـان هێنـا ! ئەوانەی كە بە ڕواڵەت خۆیـان بـە مـسوڵمان پـێـشان دەدەن، ﴿ وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِ ﴾، وە كاتێك كە لێتـان تێدەپـەڕن واتـە: بـۆ خۆیـان جیادەبنــەوەو لـە ئێـوە دوور دەكەونــەوە، پەنجـەتان لـە بەرانبەردا دەگـەزن، پەنجەی خۆیان دەگەزن لە ڕقـان.

**هەشـتەم:** ﴿ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَا ﴾، واتـە: ئەگـەر بـە عاسـتەم چاكەیەكتــان تــووش بـێ، پـێـی نارەحـەت دەبـن، بــەڵام ئەگـەر گـەورەترین بــەڵاو خراپـەتان بەسەربـێ، ئـەوە پـێی دڵخـۆش دەبـن، واتـە: بـە تـۆزە چاكـەیەكو بـە تـۆزە خێـرو خۆشـییەكـی ئێـوە دڵتـەنگـن، بەڵام هـەتا بەڵای گەورەترتان بۆ بـێ، زیاتر پـێـی دڵخـۆش دەبـن.

**نـۆیــەم:** ئنجـا لــە كۆتـــاییدا خـــوا دەفــەرموێ: ﴿ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴾، وە ئەگــەر ئەهـــلی خۆڕاگــریی بـن، وە ئەهـلی پارێزكـاریی بـن، پیــلانو فێڵــی ئـەوان هیـــچ زیـانتان لێنــادات، كەواتـە: ئـەم سیفەتانە خـوای پـەروەردگار كەسانێكی پـێ پـێناسـە كـردوون كـە ئەهلی كوفـرنو، دژی ئەهلـی ئیمـانن، ئێـستا ئێمـە دەبـێ تەماشا بكەین ئەو سیفەتانە لەكێـدا هـەن؟ كـێن ئەوانـەی كـە كـەمێك لــە ڕقو كینــەیان ئاشــكرا كــردوەو، بەشــی گــەورەتریان لــە ســینەیاندا شــاردۆتەوە؟ وە كـێن كـە دژی ئەهلـی ئیـسلامن؟ وە كـێن كـە پـارە خـەرج

دەکەن بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام‌و مسولْمانان؟ وە کێن ئەوانەی بەڕواڵەت خۆ بە مسولْمان پیشان دەدەن، بەلاّم دوایی لە کۆبوونەوە تایبەتییەکانی خۆیاندا، پەنجەیان لە بەرانبەرماندا دەگەزن؟ دەبێ تەماشا بکەین، تۆ کە لە ڕۆژگاری خۆتدا ئەو ئایەتانە بکەیە ئاوێنە، یەك یەك ئەو کافرانەی تێدا دەبینی، حیکمەت‌و گەورەیی قورئان لێرەدایە، لە کاتێکی دیاریکراودا، ئەو کاتەی کەسانێکی دیاریکراو لەو کۆمەڵگایەدا هەبوون، گونجاوو پڕ بەپێست بووە، بەلاّم خوای پەروەردگار سیفەتەکانی وا پێناسە کردوون، کە تەنیا خەڵکی ئەو کاتە نەگرێتەوەو، ئێستاش ئێمە کافرەکانی ڕۆژگاری خۆمان، یەك بە یەك بەهۆی ئەو سیفەتانەوە کە خوا بەیانی کردوون، دەتوانین دەستنیشان بکەین.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ ﴾، ئەوەتا ئێوە ئەوانتان خۆشدەوێ، بەلاّم ئەوان ئێوەیان خۆشناوێ، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە جا چۆن، کوا خۆ مسولْمان کافری خۆشناوێ؟ یان بڵێ: باشە ئەوە گریمان مسولْمانێك لێی تێکچوو، مسولْمانێك هەڵە بوو یان ئیمانەکەی لاواز بوو کافری خۆشویست؟ بەلاّم ئایا هەموو مسولْمانان کافریان خۆشدەوێن؟!

توێژەرەوانی قورئان ئەم ئایەتەیان بە چەند مانایەك لێکداوەتەوە، (فخر الدين الرازي)[1] گوتوویەتی: خۆشویستنی مسولْمانان بۆ ئەوان‌و ناخۆشویستنی ئەوانیش بۆ مسولْمانان، یاخود ڕق لێبوونەوەیان، ئەم شەش واتایە دەگرێتەوە:

**یەکەم:** ئێوە ئیسلامتان بۆ ئەوان دەوێ، کە چاکترین شتە، واتە: حەز دەکەن ئەوان بێنە نێو ئیسلامەوە، بەلاّم ئەوانیش کوفریان بۆ ئێوە دەوێ کە خراپترین شتە، کەواتە: ئێوە ئەوانتان خۆشدەوێ، چونکە شتی چاکتان بۆ ئەوان دەوێ، کە باشترین شت بریتیە لە ئیسلام، بەلاّم ئەوان ئێوەیان خۆشناوێ، چونکە خراپترین شتیان بۆ ئێوە دەوێ کە کوفرە.

---

١) التفسير الكبير، ج: (٨)، ص: (١٨٦).

**دووەم:** ئێوە لەبەر خزمایەتیی و پەیوەندیی شیریی خۆشتان دەوێن، ئەوانیش لەبەر ئیسلام ڕقیان لێتانە، چونکە لە ئیسلامدا پەیوەندیی شیریی و خزمایەتیی بەهۆی ژن و ژنخوازییەوە پێگەیەکی گرنگی هەیە، دەبینی کابرا مسوڵمانەو خێزانەکەی جوولەکەیە، یاخود خێزانەکەی نەصرانیی یە، کە دیارە ئەوە دروستە، بەڵام دروست نیە ئافرەتی مسوڵمان مێرد بە پیاوی جوولەکەو نەصرانیی بکات، بەڵام دروستە مسوڵمان ئافرەتی خاوەن کتێب بێنێ، جا کاتێك کابرای مسوڵمان خێزانەکەی جوولەکەیە، یاخود نەصرانیی یەو خێزانەکەی خۆی خۆشدەوێ، وە پاشان دەبینین جۆرێك لە خۆشەویستی هەیە لەگەڵ خەسووو خەزورییدا، وە دوایی برای ئەو ئافرەتە دەبن بە خاڵی منداڵەکانی، خوشکەکانیشی دەبن بە پلکی منداڵەکانی، کەواتە: جۆرێك لە خۆشەویستی بە هۆی خزمایەتییەوە پەیدادەبێ و لە شەرعیشدا جێگای دەبێتەوە، مادام لەسەر حیسابی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی نەبێ، ئنجا مانای ئایەتەکە ئاوای لێدێ: ئێوە لەبەر خزمایەتیی و دراوسێیەتیی و ... هتد، ئەوانتان خۆشدەوێ، لەبەر ئەوەی ئیسلام فەرمانی پێکردوون کە صیلەی ڕەحم جێبەجێ بکەن، یان کابرا باب و دایکی کافرن خۆ دەبێ، وەك دایك و باب خۆشی بوێن و ڕێزیشیان لێ بگرێ، یان بۆ وێنە: کابرا برایەکەی کافرە، یان خوشکەکەی یان خزمێکی دیکەی کافرە، بەڵام پەیوەندیی خزمایەتییان هەر لەگەڵ جێبەجێ بکات، بەڵام دەبێ ڕقی لە کوفرەکەیان ببێتەوە، واتە: ئیسلام ڕێگای لێ ناگرێ کە وەك خزم پەیوەندیی لەگەڵیان باشبێ، وە لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە: کە ئەسمائی کچی ئەبو بەکری صیددیق - خوا لێیان ڕازی بێ، دایکی هات بۆ لای دایکی واتە: خێزانی ئەبو بەکر – خوا لێی ڕازی بێ-، بەڵام هەر موشریك و کافر بوو، لە مەککەوە هاتبوو بۆ لایان لە مەدینە، کە ئەو کات ماڵیان لە مەدینە بوو دیاریشی بۆ هێنا بوون، ئەسماء - خوا لێی ڕازی بێ- چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: دایکم هاتوە بۆ لام و دیارییشی بۆ هێناوم، ئایا منیش

ڕێزی لێ بگرەو دیاریی بدەمێ ؟ فەرمووی: {نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ} مُتَّفَقٌ عَلَيهِ، البُخَارِيُّ بـرقم: (٢٥٩٢)، وَمُسْلِمٌ بـرقم:(٩٩٩)، واتـە: بەڵێ لەگەڵ دایکت چاکبە، ئەو هاتوە بۆ لات، ڕێزی بگرە، بەخێری بێنە، ئەو دیاریی هێناوە بۆ تۆ، تۆش دیاریی بدەیە، کەواتە: ئەوەش واتایەکی دی: ئێوە لەبەر خزمایەتیی‌و لەبەر ئیسلام ئەوانتان خۆشتان دەوێ، ئەوانیش لەبەر ئیسلام ڕقیان لێتانە.

**سێیەم:** ئێوە ئەوانتان خۆشدەوێ لەبەر ئەوەی خۆیان بە ئەهلی ئیسلام پێشان داوە، ئەوانیش لەبەر کوفرێك کە لە دڵیاندا هەیە، خۆشیان ناوێن، کەواتە: لەبەر ئەوەی خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن، بۆیە ئێوە خۆشتان دەوێن، واتانزانی ڕاست دەکەن، بەڵام ئەوان لەبەر ئەو کوفرەی کە لە دڵیاندا هەیە، هەر ڕقیان لە ئێوەیە.

**چوارەم:** ئێوە خۆشتان دەوێن، واتە: ناتانەوێ تووشی گرفتاریی یان بکەن، ئەوانیش بە پێچەوانەوە دەیانەوێ گرفتارتان بکەن، مسوڵمان پێی خۆش نیە کەس تووشی گرفتاریی بکات، تەنانەت مسوڵمان پێی خۆش نیە کافریش تووشی گرفتاریی بکات، مەگەر لەگەڵی ڕووبەڕوو بێتەوەو لەگەڵی بەشەڕ بێ، ئەگەرنا لە بواری هەڵسوکەوتدا، مسوڵمان چاکەی بۆ هەموو کەس پێ چاکە، پێشتر باسمان کرد خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿... وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝١٩٥﴾ البقرة، واتە: چاکەکاربن، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، وە فەرموویەتی: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ... ۝٨٣﴾ البقرة، واتە: قسەی باش لەگەڵ خەڵکیدا بکەن، مسوڵمان هەمیشە چاکە دەڵێ‌و چاکە دەکات لەگەڵ کافرو مسوڵماندا، دیارە بە مەرجێك دژایەتیی نەکەن‌و سەنگەری لێنەگرن، بەڵام ئەهلی کوفر وانین.

**پێنجەم:** ئێوە خۆشتان دەوێن، لەبەر بە ڕواڵەت پێغەمبەری خوا خۆشویستنیان، ئەوانیش هەر لەبەر ئەوەی ئێوە پێغەمبەری خواتان خۆشدەوێ‌و ئەوانیش ڕقیان لێیەتی، خۆشیان ناوێن، یانی: ئەوانە

بەڕواڵەت وا خۆ پیشان دەدەن کە پێغەمبەری خوایان خۆشدەوێ، ئێوەش لەبەر ئەوە ئەوانتان خۆشدەوێ، وەك گوتراوە: (مُحِبُّ الْمَحبوبِ مَحْبوبٌ)، واتە: کەسێك کە خۆشەویستەکەی خۆشدەوێ، تۆش خۆشتدەوێ، بەڵام ئەوانیش هەر لەبەر ئەوەی ئێوە پێغەمبەری خواتان خۆشدەوێو ئەوانیش ڕقیان لێیەتی، بۆیە ئێوەیان خۆشناوێ، وەك گوتراوە: (مُحِبُّ الْمَبغوضِ مَبغوضٌ)، واتە: کەسێك بوغزێنراوی تۆی خۆشبوێ، تۆش دەیبوغزێنی.

**شەشەم:** مەبەست لەو خۆشویستنەی ئێوە بۆ ئەوانو لەو ناخۆشویستنەی ئەوان بۆ ئێوە، ئەوەیە کە ئێوە نهێنیی خۆتانیان پێ دەڵێنو ئەوان نهێنیی خۆیانتان پێنالێن.

بەم شەش واتایە دەگونجێ ئەم ئایەتە تەفسیر بکرێ، جا ئایا بۆچی زانایان ئاوا لێی وردبوونەتەوە ؟

چونکە ناگونجێ مسوڵمانان بەگشتی ئەهلی کوفریان خۆشبوێ، مەگەر بە یەکێك لەو شەش واتایەی کە باسمکردن.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ ﴾، واتە: ئەوان کاتێك بە ئێوە دەگەن دەڵێن: ئێمە بڕوامان هێنا، بەڵام کاتێك خۆیان تەنیا دەبنەوە، یاخود کە لێتان ڕەت دەبن، پەنجەیان لە بەرانبەرتان دەگەزن، پەنجەتان لە بەرانبەردا دەکرۆژن، لێرەدا مەبەست ئەوەنیە کە هەرکات پێتگەیشت بڵێ: ئیمانم هێنا، یان بڵێ: من مسوڵمانم ! نەء، بەڵکو مەبەست ئەوەیە هەر کاتێك پێتان گەیشتنو بە پێویستیان زانی دڵنیاتان بکەنەوە، ئەوە بەو شێوەیە قسە دەکەن، ئەگەرنا مەرج نیە هەموو ڕۆژێ بڵێ: ئیمانم هێناوە، ئایەتەکەش وانافەرموێ: چونکە نەیفەرموە: (کُلَّما لقُوكُم قالوا آمنّا) هەموو جارێ کە پێتان گەیشتن دەڵێن: ئیمانمان هێنا، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا لَقُوكُمْ ﴾،

واتە: جاروبار کە پێتان دەگەن، ئەگەر بە پێویستیان زانی ئەوە خوا ﷻ بۆ کافرانی ئەو کاتی وایفەرموە، بەلاّم ئێستاش هەروایە، نابیستن کابرا بەقەد نووکی دەرزی ئیمانو بڕوای بە ئیسلام نیە، وە تروسکایی ئیمانی لەدلّدا نیە، چونکە هەموو ئیشی ئەوەیە خەلّك لە دین دووربخاتەوەو دەیەوێ ئیسلام بنەبڕ بکات، وە لە دژی هەر کەسێکە کە بەڕاستی مسولّمان بێ، کەچی دەلّێ: من مسولّمانم، وە خۆشی لە مسولّمانەتییدا بە نۆو نیو دەزانێ!!

دەلّێن: کاتی خۆی لە گوندی (وەرتێ) یەکێك لەو حیزبە عەلمانییانە قسەی بۆ خەلّك کردوە، کابرایەکی عەشایەری (وەرتێ) گوتوویەتی: کاکە من پێتان دەلّێم ئەو حیزبە چی دەلّێ؟! دەلّێ: حوکمی زاتیی (دیارە ئەو کاتە باسی حوکمی زاتی بووە) لەبن بناغەی مزگەوتێ دایە، دەبێ بناغەکەی بڕووخێنن‌و مزگەوتەکە تێکبدەن، ئنجا دەریبێنن!! وە لە ڕاستییدا ئێستاش ئەوانە هی وایان هەیە دەلّێن: ئەو ولاّتەی ئێمە بەرەو پێشەوە ناچێ، مەگەر ئیسلامەتیی نەمێنێ، کابرا عەقیدەو فیکرەکەی ئاوایە، کەچی بە جۆرێکی دی خۆی پێشانی مسولّمانان دەدا، کە ئەوە ئیغفالکردن‌و کلاّو لەسەر نانە، بەلاّم دیارە ئەوەی کە چ بڕ لە دین‌و لە ژین حالّی بووبێ، ئەو کلاّوەی ناچێتە سەر.

<u>**مەسەلەی سێزدەیەم‌و کۆتایی:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا﴾، وە ئەگەر ئێوە خۆڕاگربن‌و پارێزکاربن، فێلّی ئەوان هیچ زیانتان لێنادات، جا ئایا خۆڕاگریی (صبر)و پارێزکاریی (تقوی) یانی چی؟ (راغب الأصفهاني) ئاوا پێناسەی (صبر)ی کردوە: (الصَّبر: الإمْسَاكُ فِي ضِيْقٍ، يُقَالُ: صَبَرْتُ الدَابَّةَ: حَبَسْتُهَا بِلا عَلَفٍ، وَالصَّبرُ: حَبْسُ النَّفْسِ عَلَى مَا يَقتَضِيهِ العَقْلُ وَالشَّرْعُ، أَوْ عَمَّا يَقْتَضِيَانِ حَبْسَهَا عَنْهُ)، دەلّێ: (صبر) لە زمانی عەرەبیدا گرتنی شتێکە بە شێوەیەکی سەغلّەتیی، دەگوترێ: (صَبَرْتُ الدَابَّةَ) یانی ڕێگرییم لە لێکرد کە ئالیك بخوات، ئنجا دوایی لە زاراوی شەرعییشدا پێناسەی دەکات‌و دەلّێ:

(وَالصَّبرُ: حَبْسُ النَّفْسِ عَلَى مَا يَقتَضِيهِ العَقْلُ وَالشَّرْعُ)، واتە: وشەی: (صبر) بریتیە لەوەی کە تۆ خۆت حەبس بکەی لەسەر شتێك کە عەقڵ دەیخوازێو شەرع دەیخوازێ، بۆ وێنە: نوێژ بکەی سەرمابێ، یان گەرمابێ نوێژەکەت هەر بکەی، چونکە عەقڵو شەرع دەیخوازن، ئیسلام پێویستی بە ژیانو سامانت هەیە کە بیبەخشی، واتە: عەقڵو شەرع چی دەخوازن تۆ نەفسی خۆت لەسەر ئەوە حەبس بکەی نەهێڵی پاشەکشە بکا، (أَوْ عَمَّا يَقْتَضِيَانِ حَبسها عَنْهُ)، یاخود نەفسی خۆت لە شتێك بگێڕیەوە کە عەقڵو شەرع دەیخوازن، بۆ وێنە: نەفست دەیەوێ شەراب بخواتەوە، بەڵام عەقڵو شەرع دەڵێن خراپە بیخۆیەوە، نەفست دەیەوێ زینا بکات، یان قەتڵو دزیی بکات.. هتد، عەقڵو شەرعیش ئەو شتانە بە خراپ دەزانن، جا ئەگەر تۆ نەفسی خۆتیان لێبگێڕیەوە، واتە: صەبرت گرتوە، کەواتە: هەم باری ئیجابیی هەیەو هەم باری سەلبیی هەیە، زۆر کەس وادەزانن صەبر تەنیا بارە سەلبییەکەی هەیە، واتە: وا دەزانێ صەبر بریتیە لە حەرام نەخواردن، غەیبەت نەکردن، درۆ نەکردن، دزیی نەکردن، بەڵام وا نیە، بەڵکو صەبر:

یەکەم: بریتیە لەوەی کە نەفسی خۆت حەبس بکەی، لەسەر ئەوەی کە شەرع دەیخوازێو بیکەی.

دووەم: نەفسی خۆت بگێڕیەوە لەوە کە شەرعو عەقڵ دەڵێن: دەبێ نەکرێو نەیکەی.

ئەدی (تقوى) یانی چی؟ (التَّقْوَى: جَعْلَ النَّفْسِ فِي وِقَايَةٍ مِمَّا يُخَافُ)، واتە: (تقوى) بریتیە لەوە کە خۆت بخەیە ژێر چاودێریێکەوە، ژێر قەڵغانێکەوە لەوە کە جێگای مەترسییە، یانی: شتێك کە جێگای مەترسیی بێ، خۆتی لێ بپارێزی، (وَصَارَ التَّقْوَى فِي تَعَارف الشَّرْعِ حِفْظُ النَّفْسِ عَمَّا يُؤْثِم)، واتە: وە پارێزکاریی لە زاراوی شەرعدا، بریتیە لە خۆپاراستن لە هەر شتێك کە مایەی گوناهباریی بێ، هەر شتێك کە پێی گوناهباربی، خۆتی لێ بپارێزی، جا ئایا ئینسان بە چی گوناهبار دەبێ ؟ بە دوو شتان:

١– چواندنی فەرمانەکـان.

٢– شـکاندنی قەدەغەکـان، کەواتـە: پارێزکـاریی دیـسان وەك صـەبر هـەموو شتێك دەگرێتـەوە، (تقـوی) ئەوەیـە کـە تـۆ هەرچی کـە پـێی گوناهبـاربی خۆتی لێ بپـارێزی، جا ئینسـان بە دوو شـتان گونـاهبـار دەبـێ:

١/ ئەوەی کە خـوا فەرمانی پـێکـردوە، بیچـووێنـێ.

٢/ ئەوەی کە خـوا لـێی قەدەغـە کـردوە، بیشکـێنـێ.

کەواتە: تەقـوا هەموو ئیـسـلام دەگرێتـەوەو، پابەنـدیی بـە هـەموو شـەریعەتەوە دەگرێتـەوە، چونکە دەبـێ هەرچی شـەریعەت بە پەسـندی دەزانێ، بیکـەی بەپـێی توانا، وە هەرچی شـەریعەت بە پەسـندی نازانێ، خۆتی لێ دوور بگـری، ئـەو کاتـە دەبـی بـە ئەهلـی تەقـوا، جـا خـوا سـبحانەو تعالـی دەفـەرموێ: ئەگـەر ئێـوە خـاوەنـی (صبـر)بـن، وە خـاوەنی (تقـوی)بـن، بـەو پـێناسـەیەو بـەو شـێوەیەی کـە باسـمانکردن، ئەوە پیـلانو فێڵـی دوژمنـان زەفەرتان پـێنابـاتو زیانتـان لێنـادات، چونکە کـاتێ کـە ئەهلـی صـەبرو ئەهلـی تـەقوا دەبـن بـەو شـێوەیە، مانـای وایـە هـەموو شـەریعەت جێبـەجێ دەکـەن لـە ژیـانی تاکـییو خێزانیـیو کۆمەڵایەتیـی خۆتـانداو، کاتێکـیش بەڕاسـتیی پابەند دەبـن بە شـەریعەتـەوە، بـە دەرو دەروون (ظـاهر و باطـن)ەوە لە هەموو لایەنەکـانی ژیانتانـدا، ئـەوە بەهـۆی پابەنـدیی بـە شـەریعەتـەوە، تۆکمـەو پتەو دەبـنو، دوژمنتـان زەفەرتـان پـێنابـات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆ ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی (١٢١) تاکو (١٢٩)، لەم نۆ ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی سەرەتای دەستپێکردنی جەنگی (ئوحود)مان بۆ دەکات، وە پاشان یادکردنەوەی جەنگی (بەدر)، وە سەرکەوتنی گەورەو پشتیوانیی گەورەی خوای بالآدەستو زاڵ بۆ مسوڵمانان لە جەنگی (بەدر)دا، وە پاشان باسی پشتگیرییکردنی سوپای ئیسلام بە پێنج هەزار فریشتە لەلایەن خوای کاربەجێوە، دەکات، وە باسی ئەو ڕاستییە دەکات، کە سەرکەوتن تەنها لەلایەن خوای بەرزو مەزنەوەیە، وە باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری سزادان یان سزانەدانی کافراندا، هیچی بە دەست نیە، بەڵکو بڕیار لەوبارەوە تەنیا بە دەست خوایە، وە باسی خاوەنداریێتی خوا بۆ ئاسمانەکانو زەوی دەکات، وە باسی سزادانو لێخۆشبوونی هەر کەسێك کە بیەوێ، دەکات.

﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾ إِذْ
هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾
وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن
يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟
وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا
جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ

﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ
شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ
يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە یادبکەوە کاتێك لە بەرەبەیاندا لە ماڵەوەتان بەڕێ کەوتی، بڕوادارانت بۆ جەنگ لە شوێنەکانیان دادەمەزراند، وە خوا بیسەری زانایە﴿١٢١﴾ کاتێك دوو کۆمەڵ لە ئێوە بە دڵیان داهات کە لە ترسان پاشەکشە بکەن، خواش پشتیوانیان بوو، وە بابڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن﴿١٢٢﴾ وە بێگومان لە حاڵێکدا کە کەمدەستو بێدەستەڵات بوون، خوا لە (جەنگی) بەدردا سەریخستن، دەجا پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن ﴿١٢٣﴾ کاتێك کە بە بڕوادارانت دەگوت: ئایا بۆ ئێوە بەس نیە کە پەروەردگارتان بە سێ هەزار لە فریشتانی دابەزێنراو بەهێزتان بکات؟ ﴿١٢٤﴾ با، ئەگەر ئێوە خۆڕابگرنو پارێز بکەن، ئەوانیش بەم تووڕەییو هەڵچوونەیانەوە بە پەلە بێنە سەرتان، ئەوە پەروەردگارتان بە پێنج هەزار لە فریشتانی خۆنیشانەدارکەر هاوکارییتان دەکات ﴿١٢٥﴾ وە خوا ئەوەشی تەنیا بۆ ئەوە کردوە (واتە: دابەزینی فریشتەکان) کە مایەی دڵخۆشییتان بێو هۆکاریی ئارامگرتنی دڵەکانتان بێ، ئەگەرنا سەرکەوتن تەنیا لەلایەن خوای زاڵی کاربەجێی وەیە﴿١٢٦﴾ تاکو بەشێك لەوانەی بێبڕوان بفەوتێنێ، یان زەبوونیان بکاتو بەبێ ئاکامیی بگەڕێنەوە (ئەوە حیکمەتی جەنگو جیهادە)﴿١٢٧﴾ تۆ (ئەی موحەممەد!) هیچ شتێکت بەدەست نیە لە بواری بڕیاردانەدا لەبارەیانەوە (کە ئایا بێبڕواکان سزا بدرێن، یان نا لە دواڕۆژدا؟) وە چ (خوا) لێیان خۆشبێ یان ئازاریان

بـدات، بێگومان ئـەوان سـتەمکارن، وە هەرچی لـە ئاسـمانەکانو لـە زەویدایـە هـی خـوایە ﴿١٢٨﴾ هەرکەسێکی بـوێ لـێی دەبووریو هەرکەسێکیشی بـوێ ئـازاری دەدا، وە خـوا لـێبوردەی بە بەزەیی یە﴿١٢٩﴾)).

## شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەکان

(غَدَوْتَ ): ﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ ﴾، واتـە: وە یـاد بکـەوە کاتێـك لـە بەرەبەیانـدا دەردەچـووی، وشـەی: (غَـدا) لـە زمـانی عەرەبیـدا واتـە: بەرەبـەیانی زوو دەرچـوو، (الغُـدْوَةُ وَالغَـدَاةُ: أَوَّلُ النَّهَـارِ)، واتـە: (غُـدْوَةْ وغَـدَاةْ) بـە سـەرەتای ڕۆژ دەڵـێن، (وَالغَـدَاءُ: طَعَـامٌ يُتَنَـاوَلُ فِـي ذَلِـكَ الوَقْـتِ)، وشـەی (غَـدَاءُ) بریتیـە لە خـواردنێك کە لە سـەرەتای ڕۆژەوە دەخـورێ.

(تُبَوِّئُ ): (أَصْـلُ: البَـوَاءِ مُـسَاوَاةُ الأَجْـزَاءِ فِـي الْمَكَـانِ، خِـلاَفُ النُّبـوِّ، وَبَـوَّأْتُ لَـهُ مَكَانـاً: سوَّيْتُهُ)، وشـەی: (بَوَاء) لـە ئەسـڵدا بریتیـە لـە شـوێنێك، کـە هـەموو بەشـەکانی وەك یەکـبن، بـە پـێچەوانەی (نُبـوُّ)، (نُبـوُّ) واتـە: بـەرزییو نزمیـی هـەبێ، وە دەگوترێ: (وَبَـوَّأْتُ لَهُ مَكَانـاً)، واتە: شـوێنەکەم بۆ خـۆشـکـرد، بـۆم تەخـت کـرد.

(مَقَاعِدَ ): (مَقَـاعِـد) کـۆی (مَقْعَـد)ە، ئـەویش (مَكَـانَ القُعُـود)، واتـە: شـوێنی دانیشـتن، (مَقَاعِدَ للقِتَالِ) واتـە: شـوێنی نیـشتەجێ بـوون بـۆ کـاتی جـەنگ، ئـێمە پـێی دەڵـێین: سـەنگـەر، یان شـەڕگـە.

(هَمَّت ): (الْهَـمُّ: الْحَـزَنُ، الَّـذِي يُـذِيبُ الإِنْـسَانَ، وَالْـهَمُّ: مَـا هَـمَمْتَ بِـهِ فِـي نَفْـسِـكَ) وشـەی (هَـمُّ) بـە دوو واتـا دێ، یەکـەم: بـە مانـای غـەمو پـەژارەیەك کـە ئینـسان دەتوێنێتـەوە، دووەم: بـەو مەبەسـتەش دێ کـە تـۆ دەتەوێ لە دڵی خۆتـدا، بیکەی دەگوترێ: (أَهَمَّنـي كَذَا حَمَـلِي عَلَى أَنْ أَهْتَـمَّ بِهِ)، واتـە: ئەو شـتە وای لێکـردم کە خەفەتی لـێ بخـۆمو بیـری لـێ بکەمـەوە.

(تَفْشَلَا): (الفَشَلُ: ضَعفٌ مَعَ جُبْنٍ)، وشەی: (فَشَل) لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لە بێهێزییەك كە ترسنۆكیی لەگەڵ دابێ، كەواتە: (أَن تَفْشَلا) واتە: بترسێنو بێهێزبن، كە ڕووبەڕووی دوژمن نەبنەوە.

(يُمِدَّكُمْ ): واتە: ئیمدادتان بكات، هاوكاریتان بكات، (أَصْلُ الْمَدِّ الْجَرُّ، وَمِنْهُ الْمُدَّةُ لِلْوَقْتِ الْمُمْتَدِّ، وَأَكْثَرُ مَا جَاءَ الإِمْدَادُ فِي الْمَحْبُوبِ، وَالْمَدُّ فِي الْمَكْرُوهِ)، وشەی (مَدّ) لە ئەسڵدا واتە: درێژكردنەوە، ڕاكێشان، بۆیە بە كاتێكی درێژكراوە دەگوترێ: (مُدَّة) وە (إمدَاد) بە زۆری بۆ هاوكارییكردن بۆ كاری خێرو چاكەیە، بەڵام ئەگەر بگوترێ: (مَدّ) واتە: بۆ كاری خراپ هاوكاریی كرد.

(فَوْرِهِمْ ): (الفَوْرُ: شِدَّةُ الغَلَيَانِ، وَيُقَالُ ذَلِكَ فِي النَارِ نَفْسِهَا إِذَا هَاجَتْ وَفِي القِدْرِ وَفِي الغَضَبِ، وَهُنَا استُعَيرُ لِلْسُرْعَةِ)، وشەی: (فَوْر) بریتیە لە گەرمەی كوڵینی شتێك، جا ئەوە بە ئاگریش دەگوترێ كە هەڵدەچێو خۆش دەبێ، یاخود مەنجەڵ كە دەكوڵێ، وە تووڕەیی زۆر، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی خێراییكردنە، واتە: بە پەلە بێن، بە خێرایی بێن.

(مُسَوِّمِينَ ): واتە: نیشانەداركەر، وە خوێندراویشەتەوە (مُسَوَّمِينَ) واتە: نیشانەدار كراو، (السیماء والسیمیاء: العَلامَةُ، وسوَّمتُهُ أَعْلَمْتهُ)، (السیماء والسیمیاء) واتە: نیشانە، (سومتُهُ: أَعْلَمْتهُ) واتە: نیشانەدارم كرد، (مُسوَّمِينَ) واتە: نیشانەدار كراون، (مُسوِّمِينَ) واتە: خۆیان نیشانەدار كردوە.

(يَكْبِتَهُمْ ): (الكَبْتُ: الرَّدُّ بِعُنْفٍ وَتذْلِيلٍ)، وشەی: (كَبْت) لە زمانی عەرەبیدا واتە: بەرپەرچدانەوەیەك بە توندییو زەبوونیی كردنەوە.

(خَآئِبِينَ ): (الْخَيْبَةُ: فَوْتُ الطَلَبِ)، وشەی: (خَيْبَة) بریتیە لەوەی كە ئینسان ئامانجێك نەپێكێ، شتێك كە مەبەستی بێ لەدەستی بچێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرمویٚ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾﴾، (عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: فِينَا نَزَلَتْ فِي بَنِي حَارِثَةَ وَبَنِي سَلِمَةَ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا﴾، وَمَا يَسُرُّنِي أَنَّهَا لَمْ تَنْزِلْ لِقَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ...﴾) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٥٨)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٥٠٥)، وَابْنُ حِبَّان بِرقم: (٧٢٨٨)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: دەربارەی ئێمە لە بەنی حاریسەو بەنی سەلەمە، هاتە خوار (کە دوو تیرە بوون لە ئەوسو خەزرەج)، دەڵێ: وە پێشم ناخۆش نیە کە هاتۆتە خوار، (واتە: پێم خۆشنەدەبوو ئەگەر نەهاتبایە خوار) چونکە خوا دەفەرمویٚ: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ...﴾، خوا سەرپەرشتیاریانەو دۆستو پشتیوانیانە، یانی: لەبەر ئەوەی ئەو مەدحەی تێدایە بۆ ئێمە، قەیناکا کە ئەو خاڵە لاوازەشمان بووە، بەنی حاریسەو بەنی سەلەمەش دوو تیرە بوون، یان دوو بەرە باب بوون، لە پشتیوانەکان.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرمویٚ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾﴾، دوو گێڕانەوە هەن لەوبارەوە:

أ- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ عَنْ أَبِيهِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: يَوْمَ أُحُدٍ، اللَّهُمَّ الْعَنْ أَبَا سُفْيَانَ، اللَّهُمَّ الْعَنْ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ الْعَنْ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو، اللَّهُمَّ الْعَنْ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ، فَنَزَلَتْ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ ...﴾} رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٠٧٠)، عَنْ سَالِمٍ مُرْسَلاً، وَمَوْصُولاً: (٤٠٦٩)، (٧٣٤٦) بدون ذكر الأسماء، وَالتِّرمِذِيُّ

برقم: (٣٠٠٤)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی ئوحوددا فەرمووی: خوایە! لەعنەت لە ئەبو سوفیان بكە، خوایە! لەعنەت لە حاریسی كوڕی هیشام بكە، خوایە! لەعنەت لە سوهەیلی كوڕی عەمر بكە، خوایە! لەعنەت لە صەفوانی كوڕی ئومەییە بكە، بەو بۆنەیەوە خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ: ﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، واتە ئەوە كە خوا لەعنەتیان لێبكا یان لەعنەتیان لێنەكا، ئیشی تۆ نیە، ئەو بڕیارە هی خوای كاربەجێیە، چونكە ئەوانە دوایی مسوڵمان بوونە، ئەبو سوفیانو سوهەیلی كوڕی عەمرو صەفوانی كوڕی ئومەییە، مسوڵمان بوون، وە پێم وایە حاریسی كوڕی هیشامیش هەر مسوڵمان بووە.

ب- هەروەها لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەش هەیە: {عَنْ أَنَسٍ ﵁ أَنَّ رَسولَ اللَّهِ ﷺ كُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ يَوْمَ أُحُدٍ، وَشُجَّ فِي وَجَهِهِ حَتَّى سَالَ الدَّمُ، فَقَالَ: (كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ فَعَلُوا هَذَا بِنَبِيِّهِمْ وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ)، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ﴾} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١١٩٧٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٠٦٩) تَعْلِيقاً، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٦٢١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٠٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٢٧)، وَابْنُ حبَّانَ برقم: (٦٥٧٤)، واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی (ئوحود)دا ددانی موبارەكی شكا، وە دەموچاوی بریندار بوو، (خودەكەی چووبووە نێو كوڵمەی) هەتا خوێن بەسەر دەموچاویدا هات، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چۆن خەڵكێك سەرفراز دەبن (واتە: وەك بڵێی چۆن دەربازیان دەبێ لە قیامەت؟!) كە ئاوایان لە پێغەمبەرەكەیان كردوە، لە حاڵێكدا كە ئەو بانگیان دەكات بۆ لای پەروەردگاریان؟! خوا ﷻ بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی نارده خوار، كە خوا لێیان خۆش دەبێ، یان لێیان خۆشنابێ؟! ئەو بڕیارە بەدەست تۆ نیە.

## چەند زانیارییەکی پێویست دەربارەی جەنگی ئوحود

پێش ئەوەی بێینە سەر مانای گشتی ئەم ئایەتە موبارەکانە، سەرەتا بە پێویستی دەزانم چەند شتێك دەربارەی جەنگی ئوحود باس بکەم، کە پێویستە بیانزانین، هەڵبەتە بە کورتیی‌و پوختیی، چونکە لە ئایەتی ژمارە: (١٢١)ەوە هەتاکو ژمارە: (١٨٠) لە سووڕەتی (آل عمران)، واتە: شەست ئایەت دەربارەی جەنگی ئوحود هاتۆتە خوارێ، کە دوایی بە درێژیی قسەیان لەسەر دەکەین، دیارە من لە کتێبی: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ) دەوری (٣٠) لاپەڕەم دەربارەی جەنگی ئوحود نووسیوە[1]، بەڵام ئێستا هەروا لە چەند خاڵێکدا بە کورتیی، ڕووداوە سەرەکییەکانی جەنگی ئوحود باس دەکەین:

**یەکەم:** جەنگی ئوحود لە مانگی شەووالی ساڵی سێیەمی کۆچیدا ڕوویداوە، وە بۆیەش ناوی لێنراوە جەنگی ئوحود، چونکە ئەو جەنگە لە شەڕگەیەکدا ڕوویدا کە دەکەوێتە دامێن (چیای ئوحود)ەوە، کە چیایەکی بەرزەو بەسەر شاری مەدینەدا دەڕوانێ.

**دووەم:** هۆکارو سەرەتای دەستپێکردنی جەنگی ئوحود، ئەوە بوو کە دوای ئەوەی کافرەکانی مەککە لە جەنگی (بەدر)دا تێشکان‌و حەفتا کەسیان لێ کوژران‌و حەفتا کەسیشیان لێ بە دیل گیرا، وە ئەبو سوفیان‌و کاروانەکەشی دەرباز بوون، کۆمەڵێك لەوانەی کە بابیان یاخود خزمیان لە جەنگی (بەدر)دا کوژرابوو، لەوانە: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعە، عیکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل، صەفوانی کوڕی ئومەییە، وە کۆمەڵە خەڵکێکی دیکە، چوون بۆ لای ئەبو سوفیان کە بەشیان لەو کاروانەدا بوو، گوتیان: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش! موحەممەد زەبرێکی گورچك بڕی لێداون، پیاوە چاکەکانتانی کوشتوە بۆیە بە ماڵی ئەو کاروانە یارمەتیمان بدەن، با جەنگ لە دژی موحەممەدو هاوەڵانی بکەین، بەو بۆنەیەوە خوای پەروەردگار

---

١) بڕوانە: چاپی دووەم، لاپەڕە (٤٨١ تا ٥١١).

ئایەتی ژمارە: (٣٦)ی سوورەتی (الأنفال)ی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان ماڵی خۆیان خەرج دەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی لە ڕێی خوا لابدەن، ماڵەکەیان خەرج دەکەن، دوایی بۆیان دەبێتە مایەی خەمو پەژارە، ئنجا سەرەنجام تێکدەشکێن، وە ئەوانەی بێبڕوان بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوە.

**سێیەم:** ژمارەی سوپای کافرانی قورەیش سێ هەزار (٣٠٠٠) کەس بوو، هەزار (١٠٠٠) سواریان لەگەڵ بوو، وە چەكو جبەخانەی باشیان هەبوو، وە فەرماندەی لای ڕاستی سوپای سوارە (واتە: میمنة)، خالیدی کوڕی وەلید بوو، وە فەرماندەی لای چەپ (واتە: میسرة) عیکرِمەی کوڕی ئەبو جەهل بوو، وە کافرەکانی قورەیش ئافرەتیشیان لەگەڵ خۆیان بردبوو، کە لە دوای پیاوەکان دەفو تەپڵیان لێدەداو پیاوەکانیان هاندەدا، وە هیندی کچی عوتبە کە خێزانی ئەبو سوفیان بوو سەرپەرشتی ئافرەتەکانی دەکرد، یاخود ئەو دیارترینیان بوو.

**چوارەم:** هۆکارەکانی ڕوودانی جەنگی ئوحود، واتە: ئەوەی پاڵی بە قورەیشەوەنا جەنگی ئوحود لە دژی مسوڵمانان بکەن، هەم هۆکاریی فیکریی هەبوو، کە دەیانویست ڕێ بە بانگەوازی ئیسلامیی بگرن، هەم هۆکاری ئابووریی هەبوو، کە مەفرەزەکانی سوپای ئیسلام ڕێیان بە کاروانەکانیان دەگرت، وە ئابووریی یان کەوتبووە مەترسییەوە، هەم هۆکاری کۆمەڵایەتیی هەبوو، کە دوای تێشکان لە جەنگی بەدر، لە نیوە دوورگەی عەرەبیو لە دەوروبەریشدا، هۆزی قورەیش زۆر لووتی شکابوو، وە هەم هۆکاری سیاسییش هەبوو، لەبەر ئەوەی قورەیشییەکان بەراستی پێگەی سیاسیی خۆیانیان دوای دۆڕانی جەنگی بەدر، لەدەست دابوو.

**پێنجەم**: یەکێك لەو شتانەی کە پێویستە باسبکرێن، ئەوەیە کە (جوبەیری کوڕی موطعیم)، مامێکی بە ناوی (طُعَیْمَةَ بْنَ عَدِيٍّ) دەکوژرێ، بۆیە بۆ تۆڵەستاندنەوەی مامی غولامێکی دەبێ بە ناوی (وەحشیی)، پێی دەڵێ: ئەگەر مامی موحەممەدم بۆ بکوژی لە تۆڵەی مامی خۆمدا، ئازادت دەکەم، (وەحشیی)یش کابرایەکی نێزە (رمح) وەشێنی، زۆر کارامە بووە، کە کەم وا هەبووە نێزە بهاوێ‌و نیشانە نەپێکێ،

**شەشەم** : ئنجا پێغەمبەر ﷺ کە دەبیستێ سوپای قوڕەیشییەکان وا بەڕێکەوتوون بە سێ هەزار کەسەوەو، دەیانەوێ بەسەر مەدینەدا بدەن، وەك عادەتی خۆی ڕاوێژ بە هاوەڵانی بەڕێزی دەکا، وە دوای ڕاوێژو پرس‌و ڕا، پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ڕای وابووە، وە (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیەی کوڕی سەلولیش) ڕای وابووە، کە لە شاری مەدینە نەچنەدەر، بەڵام زۆربەی گەنجەکان کە بەشێکیان لە جەنگی بەدردا بۆیان نەکرابوو بەشداریی بکەن، واتە: زۆرینەی خەڵکەکە، ڕایان وا دەبێت کە بچنە دەرێ، وە دەڵێن: با دوژمن وا هەست نەکات کە ئێمە بێهێزین، بۆیە بۆیان دەچینە دەر، نەك بێنە سەرمان لە ماڵێ، دوایی کە دەبێتە مشتومڕ لە نێوانیاندا، زۆرینە لە ڕایەکەی خۆیان پەشیمان دەبنەوەو دەڵێن: ئەی پێغەمبەر! ﷺ تۆ ڕات وا بوو نەچینە دەر، ئێستا ئێمە لەسەر ڕای خۆمان نەماوین‌و بۆ ڕای تۆ گەڕاوینەوە، پێغەمبەر ﷺیش دەرسێکی باشیان دادەداو دەفەرموێ: {مَا يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ إِذَا لَبِسَ لَأْمَتَهُ أَنْ يَضَعَهَا حَتَّى يُقَاتِلَ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٤٨٢٩)، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ الشيخ شعيب الأرناؤوط: صَحِيح لغيرِهِ، وَهَذَا إِسناد عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە کە زرێی جەنگی پۆشی (واتە: بەرگی جەنگی پۆشی) زرێیەکەی دابنێ، هەتاکو جەنگ نەکات، واتە: زۆرینەتان بڕیارتان داوە بچنە دەر، منیش تازە خۆم ئامادە کردووەو دەچینە دەر، وە ناکرێ ئەو بڕیارەی داویەتی لەسەر بناغەی ڕاوێژ کە ڕای زۆرینەشە، دوایی لێی پاشگەزبێتەوە، ئەوە بێهێزییە، واتە:

ئەگەر بۆ ڕاوێژکردنەکە فێری ئەوەی کردن کە خوا دەفەرموێ: ﴿...وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...(٣٨)﴾ الشورى، واتە: کاروباریان بە ڕاوێژە، ئەمجارە فێری ئەوەی کردن، کە دەبێ ئیش بە عەزیمەت بکرێ و، دوای ئەوە بڕیاردرا، نابێ هەڵبوەشێنرێتەوە.

**حەوتەم** : شەڕگەی سوپای ئیسلام کەوتبووە دامێن چیای (ئوحود)ەوە، واتە: سوپای قورەیش کەوتبووە نێوان سوپای ئیسلام و شاری مەدینەوە، دیارە پێغەمبەر ﷺ بە خۆو بە هەزار کەسەوە دەردەچێ، بەڵام لە نیوەی ڕێگا، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلول بە خۆی و بە سێ سەد کەسەوە دەگەڕێتەوە، بە بیانووی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بە قسەی ئەوانی کردوە بە قسەی ئەوی نەکردوە، لە حاڵێکدا بە ڕاوێژیش بڕیارەکە درابوو، بە هەر حاڵ هەقی نەبووە، بەس دیارە کە دڵنەخۆش و مونافیق بووە، وە ئەوانەش کە مونافیق بوون، یاخود دڵ نەخۆش و ئیمان لاواز بوون، دەوری سێ سەد کەسێك لەگەڵی گەڕانەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ هێزەکانی خۆی لە شیوەکانی کێوی ئوحود دامەزراند، وە پشتی دایە چیایەکە، وە ڕووی لە مەدینە کرد، وە یەکێك لە فەرماندەکانی خۆیشی بەناوی (عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر)ی بە پەنجا کەسەوە کە تیر هاوێژی باش بوون، لەسەر شاخۆلکەیەکی بچووکی دانان، کە لە دامێن چیای (ئوحود)ە، پێی دەگوترێ: (جبل الرّماة) وە پێی فەرموون: {انْضَحْ الْخَيْلَ عَنّا بِالنّبْلِ، لا يَأْتُونَا مِنْ خَلْفِنَا، إنْ كَانَتْ لَنَا أَوْ عَلَيْنَا، فَاثْبُتْ مَكَانَكَ لاَ نُؤْتَيَنّ مِنْ قِبَلِكَ}[1]، واتە: ئەو سوارانەی کە دەیانەوێ هێرشمان بکەنە سەر تۆ بە تیر لێیان بدە، مەهێڵە بێن، با لە پشتەوەڕا بۆمان نەیەن، ئەگەر جەنگ بە قازانجی ئێمە بوو، یان نا، سەرکەوتین یاخود تێشکاین، ئێوە هەر لە شوێنی خۆتان بن و شوێنی خۆتان چۆڵ مەکەن.

---

١) سيرة ابن هشام، ج: (٢٢)، ص: (٦٥).

**هەشتەم** : ئیدی پێغەمبەر ﷺ سەرەنجام سوپاكە ڕێك دەخاتو ئاڵای گەورە دەداتە دەست (موصعەبی كوڕی عومەیر) كە لە هۆزی بەنی (عبد الدار) بووە - خوا لێی ڕازی بێ-، وە كۆمەڵێك گەنج كە هەرزەكار بوونو جارێ باڵغ نەبوو ون دێن بۆ ئەوەی بەشداریی جەنگ بكەن، لەوانە: (عەبدوڵڵای كوڕی عومەر، زەیدی كوڕی سابیت، ئوسامەی كوڕی زەید، عەمری كوڕی حەزم، بەرائی كوڕی عازیب، ئوسەیدی كوڕی زەهیر، ڕافیعی كوڕی خەدیج)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی كە باڵغ نەبوون ڕێگای پێنەدان، جگە لە ڕافیعی كوڕی خەدیج، چونكە تیرهاوێژێكی زۆر دەست ڕاست بووە، ڕێگا بەو دەدا.

**نۆیەم** : سەرەنجام جەنگ دەست پێدەكاتو پێغەمبەر ﷺ تەعلیمات دەنێرێ، وە وەحشی كە لە حەمزە - خوا لێی ڕازی بێ-، دەخەفتێ لە گەرمەی جەنگدا كە كافرەكان بەرەو تێشكان دەچن، زەفەر بە حەمزە - خوا لێی ڕازی بێ- دەباو، ڕمێكی لە پشتەوەڕا لێدەدا، وە (موصعەبی كوڕی عومەیر)یش كە ئاڵا هەڵگری مسوڵمانان بووە، شەهید دەكرێ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ئاڵاكە دەداتە دەست عەلی كوڕی ئەبی طالیب، بەڵام تا ئەوكاتەش جەنگ هەر بە قازانجی مسوڵمانانە.

**دەیەم** : بەڵام دوایی هەتا تیر هاوێژەكان ئەو تەپۆلكەیە چۆڵ دەكەن، كە پێغەمبەر ﷺ لەوێ دایناون، دیارە فەرماندەكەیان كە عەبدوڵڵای كوڕی جوبەیرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لێرە مەجووڵێن! دەڵێن: ئاخر تازە ئەوە كافرەكان تێشكان، با بچین غەنیمەت كۆبكەینەوە، ئەویش دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوان تێشكان یاخود ئێمە تێشكاین، ئێرە چۆڵ مەكەنو لە قسەی دەرمەچن، سەرەنجام بە قسەی ناكەنو چل كەسێكیان دەڕۆن، ئەویش بەخۆو بە دە كەسەوە دەمێنێتەوە، ئنجا خالیدی كوڕی وەلید كە ئەمە دەبینێ، یەكسەر بەخۆیو پەنجا سوار یاخود سەد سوارەوە، هێرش دەكاتو ئەو هەشت نۆ دە كەسەی كە لەگەڵ عەبدوڵڵا مابوون شەهیدیان دەكەن، وە پشت لە مسوڵمانان دەگرن، ئیدی سەرەنجام لەوێوە جەنگ بەرەو

قۆناغێكی دیكە دەچێ، كە بریتیە لە تێشكانی مسوڵمانان، وە سەرەنجام مسوڵمانان جەنگەكە دەدۆڕێنن، ئەوە كورتەیەك بوو دەربارەی جەنگی ئوحود، هەڵبەتە تەفاصیلی زیاتری هەیە، كە لە سەرچاوەكانی سیرەدا باسكراوەو، ئێمەش لە میانەی تەفسیركردنی ئایەتەكاندا، ئاماژەیەك بە هەندێك لە ڕووداوەكان دەكەین.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، ئەم ئایەتانە دوای جەنگی ئوحود هاتوونە خوار، پاش ئەوەی جەنگی ئوحود تێپەڕیوەو گوزەراوە، دەفەرموێ: یادبكەوە كاتێك كە لە بەرەبەیاندا دەرچووی لە لای خێزانتەوە، كە دەڵێن: ئەو شەوە لە ژووری عائیشە بووە - خوا لێی ڕازی بێ‌و نۆرەی ئەو بووە، بۆچی دەرچووە؟ دەفەرموێ: ﴿ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ﴾، ئیماندارانت دادەمەزراند لە سەنگەرەكاندا، پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی نەخشەی جەنگی كێشاوە، وە بۆخۆی شوێنەكانی بۆ جەنگاوەرەكان دیاری كردوون، ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا بیسەری زانایە، دەیبیست چی دەڵێن، وە زانا بوو كە هەركەسە چی لە دڵدایەو چۆنە؟ جا وەك پێشتر باسم كرد، لەم ئایەتەوە واتە: لە ئایەتی ژمارە: (١٢١ تاكو ١٨٠) هەمووی دەربارەی جەنگی (ئوحود)ە، یانی شەست ئایەت، دیارە خوا ﷻ بە شێوازی خۆی باسی ئەم جەنگە دەكات، وە لەبەر ئەوەی ئەمە یەكەم جەنگ بووە كە مسوڵمانان تێیدا بشكێن، وە گەورەترین خەسارەتیشیان تێدا بینیوەو حەفتا (٧٠) شەهیدیان داوە[1]، زۆر پێی نارەحەت بوون، بۆیە خوای كاربەجێ سەرەتا چەند شتێكیان دێنێتەوە بیرو

---

١) بەڵام بە پێچەوانەی كافرەكانەوە كە لە جەنگی بەدردا حەفتا دیلیان بوو، مسوڵمانان لە جەنگی ئوحود دا یەك تاكە دیلیشیان نەبوو !.

دڵیان دەداتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا ﴾، یادبكەوە كاتێك دوو كۆمەڵ لە ئێوە بە دڵیان دا هات، ویستیان بترسێن‌و پاشەكشە بكەن، واتە: نەیەن بەشداریی جەنگ بكەن ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ﴾، بەلاّم خوا سەرپەرشتیارو دۆست‌و پشتیوانیان بوو، بۆیە هەرچەندە ئەو وەسوەسەو خوتخوتەیەی شەیتان بە دڵیشیان داهات، بەلاّم خوا نەیهێشت لە دڵیاندا ببێتە بڕیار، هەر وەسوەسە بوو، ڕەنگە لەنێو خۆیان دا باسیان كردبێ: بگەڕێنەوە نەگەڕێنەوە؟! ئەویش بە تایبەتی دوای ئەوەی كە عەبدوڵلای كوڕی ئوبەییەی كوڕی سەلول بەخۆو بە سێیەكی سوپایەكەوە گەڕاوەتەوە، كەواتە: سوپای پێغەمبەر ﷺ هەزار كەس بوون، حەوت سەد كەس ماوەتەوە، واتە: حەوسەد لە بەرانبەر سێ هەزار، یانی: ئەوان چوار بەرانبەر زیاتر بوون، سەرەنجام دیارە ئەو خوتخوتەو خەیاڵە خراپەی كە بە دڵیاندا هاتوە نەبووە بڕیار ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، وە با بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، نەك بە زۆریی ژمارە، چونكە دیارە ئەوان لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو خوتخوتەو خەیاڵە خراپەیان بۆ دروست بووە، كە عەبدوڵلای كوڕی ئوبەییەی كوڕی سەلول بە خۆو بە سێیەكی سوپاكەوە كشاوەتەوە، بۆیە خوا لێرەدا دەفەرمویٚ: با ئیمانداران پشت بە زۆریی ژمارەیان نەبەستن، بەڵكو تەنیا پشت بە خوا ببەستن، ئنجا سەركەوتنی جەنگی (بەدر)یان دێنێتەوە یادو دەفەرمویٚ: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ﴾، وە بێگومان خوا ئێوەی سەرخست لە جەنگی بەدردا، كە ئێوە كەمدەست‌و بێ دەستەلاّت بوون، چونكە (أذلة) كۆی (ذلیل)ە، (ذلیل)یش واتە: زەبوون‌و كەمدەست‌و بێدەستەلاّت، لەچاو لایەنی بەرانبەر ئاوابوون ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، دەجا پارێز لە خوا بكەن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاربن، واتە: پارێز لە خوا بكەن، جارێكی دیكە بێ فەرمانیی خوا مەكەن، كەسێك پارێزكاربێ ئەوجار مانای وایە سوپاسگوزارەو شوكرانە بژێرە بۆ خوا، ئەوجار خوا ﷻ باسی جەنگی بەدریان بۆ دەكات‌و دەفەرمویٚ: ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەڵبەتە

هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: ئەوە باسی جەنگی (ئوحود)ە، بەڵام لە ڕاستیدا هەر باسی جەنگی (بەدر)ە، ﴿ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: یادبکەوە کاتێك تۆ بە بڕوادارانت دەگوت: ﴿ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُنزَلِينَ ﴾، (کاتێك کە تۆ لە سەرەتای جەنگی بەدر بە بڕوادارانت دەگوت:) ئایا بەس نیە بۆ ئێوە کە پەروەردگارتان بە سێ هەزار لە فریشتە دابەزێنراوەکانی هاوکارتان بێ؟ ئاوات پێدەگوتن، ﴿ بَلَىٰ ﴾، خوا دەفەرموێ: با، ﴿ إِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا ﴾، ئەگەر ئێوە خۆڕاگربنو پارێزکاربن ﴿ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا ﴾، ئەوانەش ئاوا دەستبەجێ بە هەڵچوونەوە بە پەلە بێنە سەرتان ﴿ يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴾، پەروەردگارتان بە پێنج هەزار لەو فریشتانەی کە خۆیان نیشانەدار کردبوو، پشتتان دەگرێ، وە هەروەها خوێندراویشەتەوە (مُسوَّمِينَ) واتە: ئەو فریشتانەی کە نیشانەدار کرابوون، نیشانەیان هەبوو، وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا ﴾، زانایان دەڵێن: ئەوە کاتێك بوو کە مسوڵمانان هەواڵیان پێگەیشت، کە هۆزێکی کافر بە ژمارەیەکی زۆرەوە دەیانەوێ بێن بۆ پشتگیرییکردنی قورەیشییەکان لە جەنگی (بەدر)دا، کە بۆخۆیان هەزار کەس بوون، بە هەزاری دیکە یاخود بە چەند هەزاری دیکەش بێن پشتگیرییان بکەن، ئیدی مسوڵمانان جۆرێك لە دڵەڕاوکەو ترسیان بۆ دروست بوو، خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە ئەگەر ئەوانە بێنو کافرەکان ئیمدادیان بۆبێ، ئێمەش ئیمدادتان بۆ دەنێرین، کە دیارە خوای بێوێنە ئیمدادیشی هەر نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی، هەر چەند کافرەکان ئەو ئیمدادو هاوکارییەیان بۆ نەهات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ ﴾، خوا ﷻ ئەوەی تەنیا بە مایەی دڵخۆشیی بۆ ئێوە کرد، بۆ ئەوەی کە دڵتان ئارام بگرێ، واتە: بەشدارییکردنی فریشتەکان بۆ دڵخۆشیی ئێوەو بۆ دڵ ئارامگرتنی ئێوەیە،

ئەگەرنا سەرکەوتن بە چییە؟ ﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾، سەرکەوتن تەنیا لەلای خوای زاڵی کاربەجێ وەیە، سەرکەوتن بە فریشتان نیە، ئەگەر خوا بیەوێ بەبێ فریشتەش سەردەکەون، وە ئەگەر خوای کاربەجێ نەیەوێ، فریشتەشتان لەگەڵدابن هەر سەرناکەون، کەواتە: هەموو شتێك بگێڕنەوە بۆ خوا، سەرکەوتن لە خواوەیە، بڕیار لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە بۆ ئەوەی کە مسوڵمانان فێربن پشت بە فریشتانیش نەبەستن، تەنیا پشت بە خوا ببەستن، پشت نە بە زۆریی خۆیان، نە بە چەكو جبەخانەیان، نە بە ئیمکانیەتیان، نە بەشداریی فریشتان نەبەستن، بەڵکو پشت تەنیا بە خوا ببەستنو، بزانن کە بڕیار لەوێوە دەردەچێ، ئنجا خوا ﷻ باسی حیکمەتی ئەو جەنگو جیهادە دەکاو دەفەرموێ: ﴿ لِيَقۡطَعَ طَرَفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، خوای باڵادەست ئەو جەنگو جیهادە دێنێتە پێش یان هێنایە پێش، تاکو ئەوانەی بێبڕوان بەشێکیان لێبکاتەوە، وەك بڵێی پارچەیەکیان لێبکاتەوە، ﴿أَوۡ يَكۡبِتَهُمۡ ﴾، یاخود بۆ ئەوەی لووتیان بشکێنێو زەبوونییان بکات، ئەگەر لێشیان نەکوژرێ، زەبوونییان بکات، وەك لە جەنگی ئەحزاب (خەندەق)دا ئەوە ڕوویدا، ژمارەیەکی وا نە کوژران، بەڵام بە زەبوونییو بە تێشکاویی گەڕانەوە، ﴿فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴾، بەبێ مورادییو بەبێ ئاکامو بەبێ ئەوەی ئامانجیان هێنابێتە دی، بگەڕێنەوە، ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ﴾، بڕیار هیچی بەدەستی تۆ نیە، واتە: بڕیار بۆ ئەوە کە کافرەکان سزا بدرێن، یان سزا نەدرێن، چییان لێ بکرێ، یان چییان لێ نەکرێ، لە دنیا یان لە قیامەت، بڕیار بەدەست خوایە، ﴿أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ ﴾، خوایان لێیان خۆشبێ، یاخود سزاو ئازاریان بدا، لە دنیادا لێیان خۆشبێ، یاخود لە دنیادا سزایان بدات، یان لە قیامەتێ لێیان خۆشبێ، یان لە قیامەتێ ئازاریان بداو سزایان بدات، ﴿فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴾، ئەوە ئەوان ستەمکارن، ئێستا لەو کاتەدا شایستەن کە خوا سزایان بدات، بەڵام دەبینی واز لەو کوفرەو ستەمەی خۆیان دەهێننو خوا

هیدایەتیان دەدا، ئەو کاتە شایستەی لێخۆشبوونی خوای بە بەزەیی دەبن، ئەوەش دیسان جەخت کردنەوەیەکی دیکەیە لە سەر خوا بەیەکگرتن، کە لە ڕاستیدا هەموو شتێك بەدەستی خوای پەروەردگارە، تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ لەو ڕووەوە کە ئایا خوا چی لە کافران دەکا؟ هیدایەتیان دەدا، یان هیدایەتیان نادا، دەیانباتە بەهەشت، یاخود دەیانباتە دۆزەخ ... هتد، بەدەستی وی نیە، بەڵکو ئەو بڕیارانە هەموویان بەدەستی خوان، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان زەوی دا هەیە، هی خوایە، هەر کەسێکیشی بیەوێ لێی دەبووڕێ، وە هەر کەسێکیشی بیەوێ ئازاری دەدا، وە خوا لێبوردەی بە بەزەییو میهرەبانە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

<u>**مەسەلەی یەکەم**</u>: خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِ ﴾، وەك پێشتر باسمان کرد، لێرەدا مەبەست دانانی نەخشەی جەنگە جا لە تەفسیرەکاندا باسکراوە: لە ڕۆژی جومعەدا بوو کە کافرەکان هاتنە پشتی مەدینە، دامێنی چیای ئوحود، وە پێغەمبەر ﷺ دوای نیوەڕۆی ڕۆژی جومعە دەرچوو، ئنجا لێرەدا یەکێ بۆی هەیە بڵێ: باشە ئەدی بۆ خوا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذۡ غَدَوۡتَ ﴾، واتە: کە بەرەبەیان دەرچووی؟! زانایان ئاوا تەفسیریان کردوە، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ لە بەرەبەیانەوە دەرچوو لە ماڵ، بەڵام دوای نیوەڕۆی ڕۆژی جومعە بۆ شەڕگە دەرچوو، وە جەنگەکەش ڕۆژی شەممە دەستی پێکردوە، پێش نیوەڕۆ، وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆی نەخشەی جەنگی داناوە، وە بۆخۆی شوێنی جەنگاوەرەکانی دیاری کردوە، هەم تیرهاوێژەکان کە پەنجا نەفەر بوون، لەوێی جێگیرکردن، وە دیاری کردوە کێ ئاڵای گەورەی

بەدەست بێ، کێ لای ڕاست بێ، کێ لای چەپ بێ، وە کێ لە پێشەوە بێ، کێ لە کوێ بێ... هتد؟ کەواتە: بۆخۆی نەخشەی جەنگی داناوە، ئەوە نەبووە کە هەر لە دووروا بە دووربین تەماشا بکات !!

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ أَن تَفۡشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، ئەو دوو طائیفەیە (بەنی سەلەمە) بوو لە هۆزی خەزرەج، وە (بەنی حاریسە) لە هۆزی ئەوس، دیارە شتێك بوو هەر بە دڵیاندا هاتوەو، ڕەنگە لەنێو خۆیاندا باسیان کردبێ، بەڵام نەبووە بە بڕیار، بۆیە خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ هَمَّت ﴾، کاتێك ویستیان، یاخود خوتخوتەیەکیان بە دڵدا هات، ئنجا دیارە بەڕاستی ئینسان لە تەنگانانەدا حەقیقەتی خۆی بۆ دەردەکەوێ، ئیمانی چەندە، چۆنە؟ وەك کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (لە بواریێ دا لاقی ڕەش و سپی دەردەکەوێ)، وە لە شێنەیی هەموو کەس ئازایە، بەڵام کە سەغڵەتیی و تەنگانە دێتە پێش، بە حەقیقەت لەوکاتەدا ئینسان لە خۆی حاڵی دەبێ، چۆنەو چەندە؟! دیارە ئەوانە کە ڕۆیشتوون لە سەرەتاوە هیچ کێشەیەکیان نەبووە، بەڵام لە ڕێگادا بە تایبەتی دوای ئەوەی کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلول بە خۆو بە سێیەکی سوپاکەوە گەڕاوەتەوە، لەو حاڵەتەدا شەیتان خوتخوتەو وەسوەسەی بۆ کردوون، بەڵام سەرەنجام بەسەر وەسوەسەی شەیتاندا زاڵ بوون، وە خوا پشتی گرتوون، وە بەشداریی جەنگەکەیان هەر کردوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾، ئەم چەند ئایەتە واتە: ئایەتەکانی: (١٢٣) تاکو (١٢٧) بۆ دڵدانەوەی مسوڵمانانن، کە خوا سەرکەوتنی جەنگی (بەدر)یان دێنێتەوە یاد، تاکو شەیتان خوتخوتەیان بۆ نەکات کە خوا پشتگوێی خستوون، لەبەر ئەوەی کە لە جەنگی (ئوحود)دا تێشکاون، وەك بڵێی خوا پێیان دەفەرموێ: ئێوە لە جەنگی (بەدر)دا لە کافران کەمتر بوونو، زۆر کەمدەست بوون

زەبوون‌و بێدەسـتەڵات بوون، بەڵام خـوا سـەری خسـتن، ئـەو خـوایەی کە ئـەو کـات ئێـوەی سەرخسـت، ئێسـتاش ئێـوە هـەر سـەردەخا، ئەگـەر ئێـوە لەگـەڵ خـوای بـە بـەزەیی‌و زاڵـدا ڕاسـت بـن، وە پابەنـدبن بـە شـەریعەتەوە، وە مەرجـەکانی سـەرکەوتن لـە خۆتانـدا بێننـەدی، واتـە: ئـەم ئایەتانـە سارێژکردنێکـی باشـن بـۆ برینـی مـسولمانان، کـە بـەهۆی تێشکان لـە جـەنگی ئوحـوددا تووشـیان بووە.

**مەسـەلـەی چـوارەم**: ئنجـا لێـرەدا خـوا ﷻ کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴾، دوایـــی دەفـــەرموێ: ﴿ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴾، ئایا مەبەسـت پـێی جـەنگی (بـەدر)ە، یـان جـەنگی (ئوحـود)؟ وە بۆچـی پـێـشێ باسـی سـێ هـەزار فریـشتە دەکـات، دوایـی باسی پێنج هەزار فریشتە کراوە؟ وە بۆچی سێ هەزارەکە بـە (مُنزَلِينَ ) وەسف دەکات، واتـە: دابەزێنراوەکان، بەڵام پێنج هەزارەکە بە (مُسَوِّمِينَ) وەسـف دەکـات، واتـە: خـۆ نیـشانەدارکەر، یاخـود بـە (مُسَوَّمِين) واتـە: نیـشانەکراو؟ ئنجا ئەگـەر بگوترێ: مەبەست پـێی جەنگی بـەدرە، خۆ لـە جەنگـی بـەدردا بـە دەقی ئایـەت تـەنیا هـەزار فریـشتە بەشدارییان کردوە، وەك خـوای زانـاو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ ... أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ٩ ﴾الأنفال، واتە: من ئیمدادتان دەکەم بە هـەزار لە فریشـتان؟!

لە وەڵامـدا دەڵـێین: مەبەسـت لـەو بەشدارییەی فریـشتان جـەنگی (بـەدر)ە، بۆچـی؟ چـونکە لـە جـەنگی ئوحـوددا ئەگـەر فریـشتەکان بەشـدار بوونایـە تێنەدەشکان، ئەوە یـەك.

هـەروەها لـە جـەنگی (ئوحـود)دا مەرجەکـەیان نەهێنایـە دی، خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ ﴾، ئەگـەر خـۆڕاگربن‌و پارێزکاربن، بـەڵام

ئەوانە نە خۆڕاگر بوون لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ﷺ، وە نە پارێزکاریش بوون، ئەوە بوو لەبەر غەنیمەتو دەستکەوت، فەرمانی پێغەمبەر ﷺ یان شکاند، واتە: هەموویان وەك پێویست صەبرو تەقوایان تێدانەبوو، مەرجەکەیان نەهێنایە دی، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴾، با ئەگەر ئەو دوو مەرجەتان تێدا هەبن، خوا ئیمدادتان دەکات، بەڵام مەرجەکانتان نەهێنایە دی، دیارە خوای پەروەردگاریش ئیمدادی نەکردن، ئنجا بۆچی لە جەنگی (بەدر)دا خوا باسی هەزار فریشتە دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ ... أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ٩ ﴾الأنفال، وە دوایی باسی سێ هەزارو، پاشان باسی پێنج هەزار فریشتە دەکات؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: لە سەرەتاوە خوا ﷻ هەزار فریشتەی ناردوە، کە هێزی دیکەشیان بەدوای خۆیان خستوە، بۆیە بە ﴿ مُرۡدِفِينَ ﴾، وەسفی کردوون ! ﴿ مُرۡدِفِينَ ﴾یش واتە: هێزی دیکەیان بەدوادا دێ، دوای ئەو هەزارە بوونە سێ هەزار، خوای پەروەردگار دوو هەزاری دیکەشی ناردوە، وە دوای ئەو سێ هەزارەش بوونە پێنج هەزار، حیکمەتی ئەوە چییە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە کە: ئەگەر هێزێك ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵ دوژمندا، ئەگەر پێشێ هێزێکی بۆبێ، دوایی هێزێکی دیکەی بۆبێ، دوایی ئیدیکەی بۆبێ، وردە وردە زیاتر هەست بە مەعنەوییات دەکات، نەك بە هەموو هێزەکەوە بچێتە مەیدان، چونکە بە لە ڕووی هونەرو تەکتیکی جەنگییەوە، هێز ئەگەر هێزی دیکەی بۆبێ، زیاتر هەست بە پشت ئەستووریی‌و هەست بە مەعنەوییات بەرزیی دەکاتو کاریگەریی زیاترە، نەك هەموو هێزەکە پێکەوەبێ، ئنجا بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەوە مەبەست پێی جەنگی بەدرە، نەك جەنگی ئوحود، چەند شتێکە:

١) لەوبارەوە ئەمە گێڕراوەتەوە: (أَخْرَجَ ابْنُ أَبِي شَيبَة وَابْنُ جَرِير وَابْنُ الْمُنذِر وَابْنُ أَبِي حَاتِم عَنِ الشَعْبِي: أَن الْمُسْلِمِينَ بَلَغَهَمْ يَوْمَ بَدْرٍ أَنَّ كُرْزَ بْنُ جَابِر الْمُحَارِبِي يُمِدُّ الْمُشْرِكِينَ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَأَنْزَلَ اللّٰهُ: ﴿ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴾، إِلى قَوْلِهِ: ﴿ مُسَوِّمِينَ ﴾)[1]، واتە: ئیبنو ئەبی شەیبەو، ئیبنو جەریرو، ئیبنو مونذیرو، ئیبنو ئەبی حاتیم لە شەعبیی گێڕاویانەتەوە گوتوویەتی: مسوڵمانان لە جەنگی (بەدر)دا بیستیان کە کورزی کوڕی جابیری موحاریبی ئیمدادی موشریکەکان دەکاتو هاوکارییان دەکات بە ژمارەیەك، مسوڵمانان ئەوەیان لەسەر دڵ قورس بوو، خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، دوای ئەوەی ئەو کابرایە ئەو هەواڵەی پێگەیشت کە خوای بەرزو مەزن ئایەتی ناردۆتە خوار کە ئەگەر ئەوان بێن، ئەوە خوای بێهاوتا پشتگیریی لە ئێوە دەکات بە فریشتەکانی، بۆیە ئەویش پاشگەزبۆوەو نەهات.

٢) وە بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەیەوە ئەوەیە: (أَخْرَجَ عَبْدُ بْنُ حُمَيد وَابْنُ جَرِير وَابْنُ الْمُنذِر عَن قَتَادَةَ فِي الآية قَالَ: أُمِدّوا بِأَلْفٍ، ثُمَّ صَارُوا ثَلاَثَة آلاَفٍ، ثُمَّ صَارُوا خَمْسَةَ آلاَفٍ، وَذَلِكَ يَوْمَ بَدْرٍ)[2]، واتە: عەبدی کوڕی حومەیدو، ئیبنو جەریرو، ئیبنو لمونذیر لە قەتادە دەگێڕنەوە، کە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی: پێشیێ بە هەزار لە فریشتەکان پشتگیریی کران، دوایی بوونە سێ هەزار، دوایی بوونە پێنج هەزار، ئەوەش هەمووی لە جەنگی (بەدر)دا بوو.

٣) بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە: (أَخْرَجَ ابْنُ جَرِير عَنْ عِكْرَمَةَ فِي قَوْلِهِ: ﴿ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ ﴾، الآيَةَ قَالَ: هَذَا يَوْمَ أُحُدٍ فَلَمْ يَصبِرُوا، وَلَمْ

١) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٤٨٨).
٢) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٤٨٩).

يَتَّقُواْ، فَلَمْ يُمَدُّوا يَوْم أُحُدٍ وَلَوْ أُمِدُّواْ لَمْ ينهزِمُواْ يَوْمَئِذٍ)[١]، واتە: ئیبنو جەریر لە عیکرِمەوە - رِەحمەتی خوایان لێ بێ- دەگێڕێتەوە، کە خوا فەرموویەتی: ﴿ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ ﴾، لەوبارەوە گوتوویەتی: ئەوە لە جەنگی (ئوحود)دا کە صەبریان نەبوو، تەقواشیان نەبوو، (هەڵبەتە هەموویان نا، بەڵکو هەندێکیان)، بۆیە ئەگەر لە جەنگی ئوحوددا لەلایەن خواوە بە فریشتەکان هاوکاریی کرابان، بە تەئکید تێنەدەشکان لەو رِۆژەدا.

بەنسبەت وەسفکرانی سێ هەزارەکە بە دابەزێنراوان (مُنْزَلِین)و پێنج هەزارەکە بە نیشانەدارکەرەکان یان نیشاندارکراوەکان (مُسوِّمِین، مُسَوَّمِین)، پێم وایە هۆکاری بەکارهێنانی هەردووک وەسفەکە بۆ ئەوەیە کە بزانرێ ئەو فریشتانە چ سێ هەزارەکەو چ پێنج هەزارەکەش، هەم لە ئاسمانەوە دابەزێنراونو بەتایبەتی هاتوونو هەم نیشانەدارکەرو نیشانەدارکراویش بوو ون، نەك وەسفی (مُنْزَلِین) دابەزێنراون تایبەت بێ بە سێ هەزارەکەو، وەسفی (مُسوِّمِین)یش تایبەت بێ بە پێنج هەزارەکە.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴾، توێژەرەوانی قورئان رِاجیاییان هەیە کە ئایا فریشتەکان بەشداریی جەنگیان کردوە بە کردارییو بە کوشتار، یاخود هەر تەنیا بۆ دڵ بەهێزکردنی ئیماندارانو بەهێزکردنی مەعنەوییاتیان بووە، وە دڵی کافرەکانیشان بێهێز کردوونو ترسیان خستوونە دڵ؟

رِواڵەتی ئایەتەکان وا دەگەیەنێ کە فریشتەکان تەنیا بۆ مەعنەوییات بەرزکردنەوەی مسوڵمانانو بۆ مەعنەوییات بێهێزکردنی کافرەکان بەشدارییان کردبێ، چونکە ئایەتەکان ئاوا دەفەرموون: ﴿ إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ۝٩ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ

---

١) جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص(٨٢).

﴿وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ١٠﴾ الأنفال، دوایی لە ئایەتی (١٢)ی سووڕەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ١٢﴾ الأنفال، کە تەماشای ئەو ئایەتانە دەکەین، خوا ﷻ دەفەرموێ: کاتێك ئێوە هاوارتان دەکردە پەروەردگارتان، ئەویش وەڵامی دانەوە، کە من بە هەزار لە فریشتان کە هێزی دیکەیان بەدوا دادێ، پشتگیرییتان دەکەم، وە دوایی دەفەرموێ: وە خوا ئەو بەشدارییکردنەی فریشتەکانی نەگێڕا تەنیا بۆ دڵخۆش بوون، نەبێ، بۆ ئەوەی دڵتان ئارام بگرێ، ئەگەرنا یارمەتی تەنیا لە لای خوایە، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە، ئنجا دوای ئەوە دەفەرموێ: کاتێك پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرموو: من لەگەڵتانم، ئێوە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بیانچەسپێنن (واتە: دڵیان بچەسپێنن)، من لەمەودوا ترس دەخەمە دڵی ئەوانەوە کە بێبڕوان لە ڕێی فریشتەکانەوە، کەواتە: لە گەردنیان بدەن، وە لە هەموو سەرە پەنجەکانیان بدەن، (ئەی سوپای ئیسلام) ! وە ئەوانەی کە ڕایان وایە فریشتەکان بە کردەوە بەشداریی کوشتاریان کردوە دەڵێن: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بە کردوە فریشتەکان بەشداریی کوشتاریان کردوە، چونکە ئەوەتا خوای پەنهانزان فەرموویەتی: ﴿فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ﴾، دەڵێن: مەبەست پێی فریشتەکانە، بەڵام بەهەر حاڵ لە ئایەتی (١٢٦)ی سووڕەتی (آل عمران)یشدا کە باسی بەشداریی فریشتەکان دەکات دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾، واتە: وا پێدەچێ زیاتر بەشدارییکردنێکی مەعنەویی بووبێ، هەڵبەتە لەلای خوای پەروەردگار ئاسانە کە بەشداریی کردەییش بووبێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە زانایان دەڵێن: لە جەنگی بەدردا کافرەکان ئەوەی کە کوژرا، هەرکەسە

بکوژی خۆی دیاربووە، وە لە جەنگی (ئوحود)یشدا دیسان هەرکەسە بکوژی خۆی دیارە، هەڵبەتە لە جەنگی (ئوحود)دا کە فریشتە بەشداریی یان نەکردوە، لە سەرەتای جەنگەکەشدا هەر بەشدارییان نەکردوە، بەڵام لە جەنگی (بەدر)دا هەرکەسە دیار بووە کە کێ کێی کوشتوە؟! کەواتە: هیچ کوژراوێك نەبووە کە بێ خاوەن بێ، بێ بکوژ بێ، لە نێو بەشەراندا، تا بڵێین: فریشتە کوشتوویانە! لەبەر ئەوە زیاتر واپێدەچێ لە بەشداریی فریشتان زیاتر شتێکی مەعنەویی بێ، بەڵام دیارە لەلای خوا ئاسانە ئەگەر مسوڵمان پێویستیان پێ بێ، فریشتەش بەشداریی کوشتار بکەن.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴾، حیکمەتو ئامانجی جەنگو جیهاد دەردەخات، دیارە ئەویش لە جەنگی (بەدر)دا هاتەدی، کە خوا بەشێك لەوانەی بێبڕوان دایبڕینو بەدەستی ئیمانداران حەفتای لێ کوشتن، وە حەفتای لێ بەدیل گرتن، کەواتە: ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوە هەمووی باسی جەنگی (بەدر)ە، خوای پەروەردگار دەیخاتەوە بیر مسوڵمانان، لە کاتێکدا کە هەست بە تاڵاویی تێشکان لە جەنگی ئوحود دەکەن، تۆزێك بەرەو دوا بگەڕێنەوەو هەست بە شیرنایەتی سەرکەوتنی جەنگی (بەدر)یش بکەن، وە کۆمەكو پشتیوانیی خوای پەروەردگار ببینن، بۆ ئەوەی زۆر مەعنەوییاتیان دانەبەزێ، وە لە بەرانبەر کافرەکاندا نەترسێن، دیارە خوا ﷻ حیکمەتی جەنگ لە دوو شت خوڵاصە دەکاتەوە، واتە: حیکمەتی زەربەدان لە ئەهلی کوفر لە دوو خاڵدا کورت دەکاتەوە:

**یەکەم:** یان ئەوەتا بەشێك، پارچەیەکیان لێببێتەوەو خەڵکێکیان لێ بکوژرێ.

**دووەم:** یان ئەوەتا سەرکوت بکرێن، وەك گوتم لە جەنگی خەندەق (ئەحزاب)دا ژمارەیەکی وایان لێ نەکوژرا، بەڵام گرنگ ئەوەیە بە ئامانج نەگەیشتن.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾، واتە: تۆ هیچت بەدەست نیە، یانی هیچت بەدەست نیە بۆ بڕیاردان بۆ سەرەنجامی ئەهلی کوفر، کە ئایا خوا لەسەر کوفر، دەیانمرێنێ، وە پاشان دەیانخاتە دۆزەخ، یاخود هیدایەتیان دەداو دەیانباتە بەهەشت ؟ ئەوە بە دەست خوایە، بۆچی؟ چونکە پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی لە ژمارەیەك لە کافران کردوە، دوایی خوای پەروەردگار هیدایەتی داون، بۆیە خوای پەنهانزان ئەوە وەك بلێی ئینزارێکە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە لەبەر ئەوەی نازانێ سەرەنجامیان چۆن دەبێ، تۆ بە ڕواڵەت مامەڵەی دنیاییان لەگەڵدا بکە، بەڵام ئەوە کە خوای کاربەجێ چییان لێ دەکات لە قیامەتدا بۆ خوای لێبگەڕێ، ئەم ئایەتە وەك هەندێك ئایەتی دیکە وایە، بۆ وێنە: کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ ﴾ الرعد، واتە: تۆ گەیاندنت لەسەرەو ئێمەش لێپرسینەوەمان لەسەرە، تۆ ئیشی خۆت بکە، ئێمەش ئیشی خۆمان دەکەین، هەروەها لە ئایەتی (٢٧٢)ی سووڕەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ... ﴾، واتە: ڕێنمایی کردنو خستنە سەر ڕێی ڕاستی ئەوان لەسەر تۆ نیە، بەڵام خوا هەر کەسێکی بیەوێ ڕێنمایی دەکات، تۆ لەسەرتە تێیان بگەیەنی، هەروەها کە لە سووڕەتی (الغاشیة)دا دەفەرمویٚ: ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: تۆ بیریان بێنەوە، یادیان بخەوە کە تۆ تەنیا بیرخەرەوەی، بەڵام تۆ دەستەڵاتت بەسەریادا نیە، واتە: دەستەڵاتت بەسەر دڵو دەروونیاندا نیە، کە بە زۆری ئیمانیان پێ بێنی، جا (طبري و ابن كثير) هەردووکیان دەڵێن: مانای ئەم ئایەتانە ئاوایە: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الْحُكْمِ شَيءٌ فِي عِبَادِي، إلاّ مَا أَمَرْتُكَ

بِهِ فِيهِمْ) (جـامع البيـان، برقـم: (٧٦٩٢) والتِّرمِذِيّ بـرقم: (٣٠٠٢)[1]، واتــه: هیچ شتێك بۆ بڕیاردان دەربارەی بەندەکانمان بەدەست تۆ نیـە، مەگەر ئـەوەی فەرمانم پـێـکردووی، ئـەوەت بەدەستە، ئـەوەی دیکـە کـە فـەرمانت پـێنەکراوە، ئـەوە عائیـدی خـوای پـەروەردگارە، دیـارە وەك گـوتم: ئـەوەش بەڕاستیی خـوا بەیەکگـرتن (توحید) فێری مـسولمانان دەکات، کـە دیـارە جگـە لـە خـوا هیـچ کەس خاوەنو بەدیهێنـەری خەڵك نیـەو، تەنانەت پـێغـەمبەری خـواش ﷺ، وە هیچ کەس بڕیـاری کۆتایی بۆ خـەڵك بەدەست نیـە، ئایا هیدایـەتیان دەدات یـان نادات؟ دەیانخـاتە بەهەشـت، یـان دەیانخـاتە دۆزەخ؟ بۆیـە مـسولمان پـێویـستە هەمیشـە ئەو ئەدەبـە بەکاربێنێ لەگەڵ خوای بێوێنەدا، هەتـا یەقینمان نەبـێ کەسێك کافرە، نەڵێین ئەوە کـافرەو حەتمـەن دۆزەخییـە، ئـەوەتا خـوای زانـاو توانا گلەیی لە پـێغـەمبەر ﷺ دەکات، بۆیـە وا باشـە مـسولمان زمـانی خـۆی بـە لەعنەتـەوە ڕانەهێنـێ، چـونکە لەعنـەت واتـە: دوورخـستنەوە لـە ڕەحمـەتو بـەزەیی خـوا، چـونکە هـەر خـوا بۆخـۆی دەزانـێ کـێ لـە ڕەحمـەتی خـۆی دووردەخـاتەوە، وەبا هەنـدێ کـەس بـە کـافریش تێبگـەی، یـاخود بـە خراپـی تێبگەی، بەڵام باسی سەرەنجامی قیامـەتی نەکـەی باشـە بەڵـێ دەتـوانی بڵـێی: ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتە کوفرەت بمری، تۆ دۆزەخـی، بـەڵام نـازانم سـەرەنجامت چۆن دەبێ، چونکە دەبینی خـوای پـەروەردگار هیدایـەتی دەدا، ئـەو شـتانەی کـە پەیوەنـدییان بـە پەنهانـەوە هەیـە، ئینـسان حەواڵـەی لای خـوای پـەنهانزانیان بکاتـەوە، ئێمـە تـەنیا لـە سـنووری ئاشـکراو بینـراودا، هەنـدێك شـت دەزانـینو دەزانـینو عـەقڵو زانـستی ئێمـە هـەر لـەو سـنوورەدا بـڕ دەکـەنو، هـەر لـەو قەڵەمڕەوەشـدا قسـە بکـەین باشـە، ئـەوەی دیکـە کە نادیارەو پەنهـانە، ئەوە بـۆ خوای کاربەجێی لێ بگەڕێین، چونکە هەر خوا غەیبـزانە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص: (٢٤٥).

# دەرسی چواردەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆزدە ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی: (١٣٠) تاکو (١٤٨) لەم نۆزدە ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی قەدەغەکردنی خواردنی سوود (ڕیبا)، وە خۆ پاراستن لە ئاگری دۆزەخ، دەکا، وە پاشان فەرمان دەکا بە فەمانبەرییکردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پاشان خوا فەرمان دەکات بە بڕواداران کە خێرایی بکەن بەرەو وەدەستهێنانی لێبوردنو وەدەستهێنانی بەهەشتی فراوانی خوا، کە بۆ پارێزکاران ئامادە کراوە، وە دوایی پێناسەی پارێزکاران دەکات بە گرنگترین سیفەتەکانیان وەك بەخشینو، ڕقی خۆ قوتدانەوەو، لێبوردنو، چاکەکارییو، داوای لێبوردن لە خوا کردن پاش گوناحکردن، وە بەردەوام نەبوون لەسەر گوناح، وە باسی پاداشتی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، کە لێبوردنێکە لە خواوەو بەهەشتی بەرینە، ئنجا ئاماژە دەکات بە یاسایەکی خوا لە ژیانی بەشەردا کە بریتیە لە دەستاو دەستپێکردنی سەرکەوتنو دەستەلات، وە دوایی باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان دەکات، وە ئامۆژگاریی بڕواداران دەکات کە بێهێزو خەمبار نەبن بەهۆی تێشکانەوە، واتە: تێشکانیان لە جەنگی ئوحوددا، وە موژدەیان پێدەدا ئەگەر بێتو ئیمانی باشیان هەبێ، هەر سەرکەوتوون، وە پاشان باسی یاسای دەستاو دەستپێکرنی سەرکەوتنو بردنەوە دەکات، وە حیکمەتی جەنگو جیهاد دەخاتەڕوو، کە دەرکەوتنی بڕوادارانو، هەڵبژێررانی شەهیدانو، پالاوتنی بڕوادارانو، کزکردنی چرای کوفرە، ئنجا باسی سەرکۆنەکردنی مسوڵمانان دەکات، لەسەر هەندێ بیرو بۆچوونو هەڵوێستی هەڵەیان، وە لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار دێتە سەر خستنە ڕووی هەڵوێستی کەسانی ڕەببانیی کە لەگەڵ پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) بوونو، چەند وەسفێکی گەورەو گرنگیان لێ دەخاتەڕوو.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ
تُفۡلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ
تُرۡحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ
أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ
عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ
ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ
وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ
خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ
﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ
فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ
وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ
تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ
عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ
﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا
نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن
نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا

ٱسْتَكَانُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! سوودی چەندان جار بەرانبەر بووەوە مەخۆن، وە پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو سەرفرازبن ﴿١٣٠﴾ وە خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە بۆ کافران ئامادە کراوە ﴿١٣١﴾ وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، بەڵکو (لە لایەن خواوە) بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ ﴿١٣٢﴾ وە خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك (ی ناوازە) لە پەروەردگارتانەوەو، بەهەشتێك کە پانییەکەی هێندەی ئاسمانەکانو زەوی یە، بۆ پارێزکاران ئامادە کراوە ﴿١٣٣﴾ ئەوانەی کە لە کاتی خۆشیی‌و سەغڵەتییدا (ماڵو سامانی خۆیان لە پێناوی خوادا) دەبەخشن، وە قوتدەرەوانی ڕقو تووڕەیی‌و، چاوپۆشییکەران لە خەڵکی، وە خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن ﴿١٣٤﴾ وە ئەوانەی هەر کات کارێکی ناقولایان کرد، یان ستەمیان لە خۆیان کرد، یادی خوا دەکەنو یەکسەر بۆ گوناهەکانیان داوای لێبوردن دەکەن، جا ئایا جگە لە خوا کێ لە گوناهان دەبووری؟ وە لە کاتێکدا کە دەزانن (گوناهو خراپە چەند زیانبەخشن) لەسەر ئەو (خراپەی)ەی دەیکەن، پێداگیریی ناکەن ﴿١٣٥﴾ ئەوانە پاداشتیان لێبوردنە لە پەروەردگاریانەوەو، چەند بەهەشتێك کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆنو تێیاندا هەمیشەیین، وە باشترین پاداشت پاداشتی ئەنجامدەرانی کردەوە باشەکانە ﴿١٣٦﴾ بێگومان لە پێش ئێوەدا چەند یاساو بڕیارێك (ی خوا لە ژیانی بەشەردا) جێبەجێ بوون، دەجا بەزەوییدا بڕۆنو سەرنج بدەن داخۆ سەرەنجامی بە درۆ دانەران (ی پێغەمبەرانو کتێبەکانی

خوا) چۆن بووە؟ ﴿١٣٧﴾ ئەمە ڕوونکردنەوەیە بۆ خەڵکیو ڕێنماییو ئامۆژگاریی یە بۆ پارێزکاران ﴿١٣٨﴾ وە بێهێز مەبنو خەمبار مەبن لە حاڵێکدا کە هەر ئێوە بەرزو سەرکەوتوون، ئەگەر بڕوادارین ﴿١٣٩﴾ ئەگەر زەبرتان پێکەوتوە، ئەوە بێگومان ئەو کۆمەڵەش وەك ئەوە زەبریان پێکەوتوە، ئەو ڕۆژانەش (کە سەرکەوتنیان تێدادەبێ) لە نێو خەڵکیدا دەستاو دەستیان پێ دەکەین، وە بۆ ئەوەی خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوە بیانزانێو، چەند شەهیدێکتان تێدا هەڵبژێرێ، وە خوا ستەمکارانی خۆشناوێن ﴿١٤٠﴾وە بۆ ئەوەی خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوە بپاڵێوێو، کافرانیش بێهێزو پێز بکات ﴿١٤١﴾یان ئایا پێتان وابوو (شایستەی ئەوەبن) بچنە بەهەشت، هەرچەندە جارێ خوا لە واقیعدا ئەوانەتانی نەزانیوە کە تێکۆشاونو خۆڕاگرانی نەزانیون ؟ ﴿١٤٢﴾ ئنجا بێگومان ئێوە بەر لەوەی بگەنە (هۆکارەکانی) مەرگ، مردنتان بە ئاوات دەخواست، دەجا خۆ بینیتانو ئێوە تەماشاتان دەکرد ! ﴿١٤٣﴾ وە موحەممەد بەس ڕەوانەکراوێکە کە لە پێش ویدا ڕەوانەکراوانی دیکە تێپەڕیون، جا ئایا ئەگەر هاتو مرد، یان کوژرا، لەسەر پاژنە پێیەکانتان هەڵدەگەڕێنەوە ! دیارە هەرکەسێك لەسەر دوو پاژنەکەی هەڵگەڕێتەوە، ئەوە هیچ زیانێك لە خوا نادات، وە لەمەو دوا خوا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە ﴿١٤٤﴾ وە هیچ کەسێك بەبێ مۆڵەتی خوا، لە کاتێکی دیاریکراودا، بۆی نیە بمرێ، وە هەر کەسێك بەرهەمی دنیای بوێ لێی پێی دەدەینو، هەرکەسێکیش پاداشتی دواڕۆژی بوێ، لێی پێی دەدەین، وە لەمەودوا پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە ﴿١٤٥﴾ وە زۆرێك لە پێغەمبەران، کەسانی ڕەببانیی زۆر جەنگیان لە خزمەتدا کردن؛ وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە ڕێی خوادا بەسەریان هات، نەترسانو بێهێز نەبوونو (لەبەر دوژمن) نەلالانەوەو زەبوون نەبوون، وە خوا خۆڕاگرانی خۆشدەوێن ﴿١٤٦﴾ وە قسەیان هەر ئەوە بوو کە گوتیان: پەروەردگارمان ! لە گوناهەکانمان بمانبوورە،

هـــەروەها لـــە زێدەڕۆییـــمان لـــە کاروبـــارماندا، (بمـــانبوورە) وە پـێـیەکانمـــان بچەسپـێـنەو بەسەر کۆمەڵی کافرانـدا سـەرمان بخـــە ﴿١٤٧﴾ خـواش پاداشـتی دنیـــاو پاداشـتی چاکی دواڕۆژی پـێـدان، وە خـوا چاکەکارانی خۆشـدەوێ ﴿١٤٨﴾)).

## شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشــەكان

(ٱلرِّبَوٰٓاْ): وشـەی: (ربـا) واتـە: سـوود، لـە زمـانی عەرەبیـدا دەڵـێ: (ربـا: زادَ وَعَـلا)، واتە: زیـادی کـردو بـەرزبۆوە، وە لـە زاراوی شەرعــدا مانایـەکی تایبـەتی هەیـە وەك لە (أثـر)دا هاتوە، (کُـلُّ قَـرْضٍ جَـرَّ نَفْعَـاً فَهُـوَ رِبـاً)، واتـە: هـەر قەرزێـك سـوودێك ڕابکێشێ ئەوە ڕیبـایـە.

(أَضۡعَـٰفٗا): (أَضْعَــاف) کــۆی (ضِــعْف)ە، (ضِــعْف)، واتـــە: دوو چەنــــدانە، جـــا (أَضْعَـافَاً مُضَاعَفَة) واتە: شتێك کە چەندجار وەك خـۆی دووبـارە کرابێتـەوە، (أَضْـعَفْتُ الـشَّيءَ، وَضَـعَّفْتُه، وَضَـاعَفْتُهُ، ضَـمَمْتُ إِلَيْــهِ مِثْلَـــهُ فَـصَاعِداً) هەرسێکیان واتـە: وێنــەی خـۆی یـان چـەند وێنەیـەکی خـۆیم خسـتە گـەڵی، واتە: بەرانبـەرم کردەوە، یان چەند بەرانبـەرم کـردەوە.

(عَرۡضُهَا): لـــە (عُـرْض)ەوە هـــاتوە، (العُـرْضُ: مَقَابِـلُ الطُّـولِ، والعَـرْضُ خُـصَّ بالْجَانِبِ)، (عُرْض)، واتـە: پانـایی بەرانبـەری درێــژیی یـە، وە بـەڵام (عَرْض) واتـە: لاتەنیـشت، لایـەك، هــەموو شــتێك بـاری درێــژیی هەیــە، بـاری پـانیی هەیە، مەگـەر چوارگۆشـەبێ کە هەموو لایەکانی وەك یەکن.

(ٱلسَّرَّآءِ): (السرورُ: مَـا يَنْكَـتِمُ مِـن الفَـرَحِ والـسَّرَّاءُ: اليُـسْرِ والرَّخَـاءِ)، (سُرور) ئـەو دڵخۆشییە کە ئینسان لەدڵیدا پەنهانی دەکات، بەڵام (سَرَّاء) بەمانای خۆشـیی‌و هەرزانیی‌و فەرحانییش دێ، یاخود دەوڵەمەندیی‌و دەسـترۆیشـتوویـتی .

(وَٱلضَّرَّآءِ): لـە (ضَـرّ)ەوە هـاتوە، یـانی: (العُـسْرُ والـشِدَّةُ والفَقْـرُ)، واتـە: تـەنگ دەسـتیی‌و سەغڵەتیی‌و هـەژاریی.

(وَٱلْكَٰظِمِينَ ): واتە: ئەوانەی کە ڕقی خۆیان قوتدەدەنەوە، وشەی: (كَظْم) لە ئەسڵدا بەمانای ئەو شوێنەیە کە هەناسەی لێوە دێ، (الكُظُومُ: إِحْتِبَاسُ النَّفْسِ وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ السُكُوتِ)، (كُظُومُ) بریتییە لە هەناسەی خۆ گرتن، کە مەبەست پێی بێدەنگییە.

(ٱلْغَيْظَ ): (أَشَدُّ الغَضَبِ)، (غَيْظِ) بریتییە لە تووڕەیی یەکی زۆر، کەواتە: (كَظْمِ الغَيْظِ) واتە: ڕقی خۆت بگریو نەهێڵی بێتەدەر، بە کوردیی پێی دەڵێن: ڕقی خۆ قوتدانەوە.

(فَٰحِشَةً ): (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفاحِشَةُ: مَاعَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ والأَقْوَالِ)، وشەی (الفُحْشُ)و (الفَحْشَاءُ)و (الفاحِشَةُ) هەر قسەیەکەو هەر کردەوەیەکە کە زۆر ناقوڵاو دزێوو ناڕێك بێ.

(وَلَمْ يُصِرُّواْ ): واتە: سوورنەبوون لەسەری، یاخود بەردەوام نەبوون، (الصرّ: أي الشدّ)، (صرّ) بەمانای گرێدانو توونکردنی شتێکە، (الإِصْرَارُ: التَعَقُّدُ فِي الذَّنْبِ) ئەوەیە ئینسان لەسەر گوناح بەردەوام بێو توند بیگرێ.

(أَجْرُ ): (الأَجْرُ وَالأُجْرَةُ: مَا يَعُودُ مِنْ ثَوَابِ العَمَلِ، دُنْيَوِيّاً أَوْ أَخْرَوِيّاً)، هەردوو وشەی: (أَجْرُ)و (أُجْرَةُ) کە ئێستا بە کرێ لێکدەدرێتەوە، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە پاداشتی کردەوە، جا پاداشتی دنیایی بێ، یاخود پاداشتی دواڕۆژیی، کە بە هۆی کردەوەیەکەوە دێتە دەستی ئینسان.

(سُنَنٌ ): (سُنَنُ) کۆی (سُنَّة)یە، (السُنَّة: الطَرِيقَة) واتە: ڕێباز، یاخود یاسایەك کە دووبارە بێتەوە (السُنَّةُ: السيرةُ حَمِيدَةً كَانَتْ أَوْ ذَمِيمَةً، سُنَّةُ الله حُكْمُهُ فِي خَلقهِ) بە واتای شێوەی بەرێوەچوون دێ، جا چ باشبێ، چ خراپبێ، وە کە دەگوترێ: (سُنَّةُ الله) واتە: بڕیاری خوا، یاخود یاسای خوا لە دروستکراوەکانیدا.

(وَلَا تَهِنُوا ): (الوَهْنُ: ضَعْفٌ مِنْ حَيْثُ الْخَلْقِ أَوْ الْخُلُقِ)، وشەی: (وَهْنُ) واتە: بێهێزیی، جا بێهێزیی لەڕووی جەستەییەوە، یاخود لەڕووی ئەخلاقو ڕەوشتەوە، وە (وَهْنُ) جاری وایە بەمانای ترسانیش دێ، کە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ لایەنی خولقیی، کەواتە: (وَلاَ تَهِنُوا) یانی: بێهێز مەبن، یان مەترسن.

(وَلَا تَحْزَنُوا ): (الْحَزَنُ وَالْحُزْنُ: خُشونَةٌ فـي الأرْضِ وَخُشونَةٌ فـي الـنَّفْسِ لِما يَحْصُلُ فِيهِ مِن الغَمِّ)، وشەی: (حَزَن وَحُزْن) بەمانای زبرییەك دێ کە لە زەویدا هەبێ، یاخود زبرییەك کە لە نەفسدا پەیدادەبێ، بە هۆی خەمو خەفەتەوە، کەواتە: (وَلا تَحْزَنُوا) واتە: دڵتان توونـد نەبێو دڵتان نەیەتەوە یەك، بە هۆی ئەو شکستەوە کە تووشتان بووە.

(قَرْحٌ ): بەمانای برین دێو بەمانای ئازاریش دێ، هەندێکیش دەڵێن: (قَـرْح) بەمانای برینە، بەڵام (قُرْح) واتە: ئەو ئازارەی کە بە هۆی ئەو برینەوە لە ئینساندا پەیدادەبێ.

(نُدَاوِلُهَا ): واتە: نۆرەی پێ دەکەین، یاخود دەستاو دەستی پێ دەکەین، دەگوترێ: (تَـدَاولَ القَـوْمُ كَـذَا، أَي: تَنَاوَلُوهُ مِـنْ حَيْثُ الدَّولَـة) واتە: هەر کامێکیان لە نۆرەی خۆیدا ئەو شتەی وەرگرت.

(وَيَتَّخِذَ ): واتە: (يَصْطَفَي) هەڵدەبژێری، (الأَخْذَةُ: حَوْزُ الشَّيءِ وتَحْصِيلُهُ والإِتِخَاذُ، افْتِعَالُ مِنْهُ)، (إتِخَاذُ) ئەوەیە کە تۆ شتێك پەیدابکەی، یاخود شتێك هەڵبژێری.

(وَلِيُمَحِّصَ ): واتە: بپاڵێوێ، یاخود لە بێژینگ بداو پاك بکاتەوە، (أَصْلُ الْمَحْص: تَخْلِيصُ الشَّيءِ مِما فِيهِ مِن عَيْبٍ كَالفَحْصِ)، وشەی: (مَحْص) واتە: ڕزگارکردنی شتێك لەو کەموکووڕییانەی کە تێیدان، یاخود ژەنگو ژارەکەی لێ لابەری.

(وَيَمۡحَقَ): (الْمحقُ: النُّقْصَانُ) به مانای کەمکردنەوه دێ، (وَمِنْهُ الْمَحَاقُ لآخِرِ الشّهْرِ إِذَا انْمَحَقَ الْهِلاَلُ)، (محاقُ) بە شەوەکانی کۆتایی مانگ دەڵێن، کە وردە وردە مانگ وەك دەمە داسێك دیار دەبێت.

(تَمَنَّوۡنَ): واته: به خۆزگه دەخوازن، به ئاوات دەخوازن، (الأُمنيَّةُ: البُغَيْة) واته: (أُمنيَّة) شتێکه ئینسان به ئاواتی بخوازێ، (تَمَنَّى الشَّيءَ قَدَّرَهُ وأَحَبَّ أَنْ يَصِلَ إِلَيْهِ) واته: شتێکی ئەندازەگیریی کرد، وه حەزی پێکرد که بۆی بێت.

(أَعۡقَٰبِكُمۡ): (أَعْقَاب) کۆی (عَقِب)ە، (عَقِب) به پاژنه پێ دەگوترێ، وەك له فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوه، فەرموویەتی: {وَيْلٌ لِلاعْقَابِ مِنْ النَّارِ} رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٩٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١١١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٥٥) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنه، واته: وەیل بۆ ئەوانەی کە پاژنە پێیان ناشۆن (له کاتی دەستنوێژگرتندا).

(ثَوَابَ): (الثَوَابُ: مَا يرجعُ إِلى الإِنْسَان مِن جزاءِ عَمَلِهِ)، (ثَوَابُ) ئەوەیە کە بۆ ئینسان دێتەوە لە پاداشتی کردەوەکەیدا، وە له خێرو شەڕدا بەکاردێ، بەڵام زیاتر بۆ خێرو چاکەدا بەکاردێ.

(وَكَأَيِّن): واته: زۆر.

(رِبِّيُّونَ): کۆی (رِبِّيٍّ)یە، (رِبّيٍّ) ڕەببانیی، واته: کەسانێك سەر بە خوای پەروەردگارنو بەپێی ڕەزامەندیی پەروەردگاریان بەڕێوە دەچن.

(ٱسۡتَكَانُواْ): (السكُونُ: ثُبُوتُ الشَّيءِ بَعْدَ تَحَرُّكِ)، (سكون) بریتیە له وەستانی شتێك دوای ئەوە کە پێشتر جووڵەی هەبووە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٣٠ ﴾، (عَنْ عَطاءٍ قَالَ: كَانَتْ ثَقِيفُ تُدايِنُ فِي بَنِي الْمُغَيْرَة فِي الْجَاهِلِيَةَ، فَإِذَا حَلَّ الأَجَلُ قَالُوا: نُزِيدُكُمْ وَتُؤخِّرُونَ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗ ... ﴾)[١]، واتە: عەطاء دەڵێ: هۆزی ثەقیف قەرزیان دەدا بە بەنی موغەیرە (ئەوانیش هۆزێکی دیکە بوون) لە سەردەمی نەفامییدا، کە کاتی دانەوەی قەرزەکە دەهات (بەنی موغەیرە) دەیانگوت: بۆتان زیاد دەکەین، ئێوەش قەرزەکەمان بۆ دوابخەن، ﴿بۆ وێنە: ئەگەر سەد (١٠٠) دینار بایە بۆ ساڵی داهاتوو دەبوو بە دوو سەد (٢٠٠) دینار، وە ئەگەر بۆ ساڵی داهاتوو نەیانتوانیبا، ئەو دوو سەد (٢٠٠) دینارە دەبوو بە چوار سەد (٤٠٠) دینار، وە چوار سەد (٤٠٠)ەکە دەبوو بە هەشت سەد (٨٠٠) دینار ... بەو شێوەیە، بۆیە خوای دادگەر قەدەغەی کرد، چونکە دیارە کە پێشتر لە سەردەمی نەفامییدا ڕیبا قەدەغە نەبوو، مامەڵەیان پێوە دەکرد، بەو هۆیەوە قەدەغە کرا﴾، ئیدی بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗ ... ﴾.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣٩ ﴾، (عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: كَثُرَ فِي أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ القَتْلَ وَالْجِرَاح، حَتَّى خَلُصَ إِلى كُلِّ امرِيءٍ مِنْهُمْ اليَأْسُ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ القُرآن، فَآسَى فِيهِ الْمُؤْمِنِينَ بِأَحْسَنَ مَا آسَى بِهِ قَوْمَاً مِنَ الْمُسْلِمِين كَانُوا قَبْلَهُمْ مِنَ الأُمَمْ الماضِيَّة، فَقَالَ: ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ

---

١) (جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٧١١).

﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ۝١٣٩﴾، إلى قوله: ﴿لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ...۝١٥٤﴾)[1]، واتە: زوهریی دەڵێ: دوای ئەوەی کە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ - خوا لێیان ڕازی بێ-، زۆریان لێ کوژراو بریندار بوو لە جەنگی (ئوحود)دا، (کە هەندێك دەڵێن: شەستو پێنج کەسو هەندێك دەڵێن: حەفتا کەسیان لێ کوژراوە، وە ئەوەندەو ڕەنگە زیاتریشیان لێ بریندار بووبێ)، لە ئەنجامی ئەوەدا هەموویان جۆرێك لە نائومێدیی یاخود دڵتەنگییان بۆ پەیدابوو خوا قورئانی ناردە خوارەوەو دڵی ئیماندارانی دایەوە، بەچاکترین شێوە کە دڵی کەسانێکی مسوڵمانی پێ بدرێتەوە، (واتە: بە باشترین شێوە) کە هیچ کاتێك بۆ ئۆممەتانی پێشوو ئاوا دڵی نەداونەوە، وە خوا ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار لەو شوێنەوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ۝١٣٩﴾، هەتا ئەو شوێنەی کە دەفەرمووێ: ﴿لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ...۝١٥٤﴾.

٣/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ۝١٤٣﴾، (عَنِ الْحَسَنِ بَلَغَنِي أَنَّ رِجَالاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ كَانوا يَقُولُونَ: {لَئِنْ لَقِينَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ لَنَفْعَلَنَّ وَلَنَفْعَلَنَّ}، فَابْتَلوا بِذَلِكَ، فَلاَ وَاللّهِ مَا كُلُّهُم صَدَق الله، فَأَنْزَلَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ

١) (جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٧٧٣).

نَنظُرُونَ ﴾)[1]، واتە: حەسەنی بەصرایی - خوا لێی ڕازی بێ- (کە لە تابعینە، واتە: جیلی دوای هاوەڵان) دەڵێ: پێمگەیشتوە کە پیاوانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەیانگوت: (واتە: پێش جەنگی ئوحود) ئەگەر ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە دوژمن بگەیشتباین، ئاوامان دەکردو ئاوامان دەکرد، (یانی: شەڕی باشمان دەکرد)، جا تاقیکرانەوە بەوە (کە جەنگی ئوحود هاتە پێش) بەڵام سوێند بە خوا هەموویان ڕاستیان نەکرد، (بێگومان زۆربەیان ڕاستیان کرد، بەڵام هەموویان ڕاستیان نەکرد، وە ئەوانەی کە ڕاستیان نەکرد، خوا سەرکۆنەی ئەوانی کردوە، بۆ ئەوەی گومانی خراپ بە هەموو هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبەین، خوا لە هەموویان ڕازی بێ).

٤/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾، (قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: قَالَ: أَهْلُ المرضِ وَالإرتِيَابِ وَالنِّفَاقِ: حِيْنَ فَرَّ النَاسُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: {قَدْ قُتِلَ مُحَمَّدٌ، فَالْحَقُوا بِدِينِكُمُ الأَوَّلِ}! فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ)[2]، واتە: ئیبنو جورەیج (کە ئەویش یەکێکە لە زانایانی تابعین، - خوا لێی ڕازی بێ-)، دەڵێ: ئەوانەی کە نەخۆشییو گومانو دەغەڵییان لە دڵدا هەبوو، کاتێك کە خەڵك دەوری پێغەمبەر ﷺیان چۆڵکرد (دیارە زۆربەی هاوەڵان، ڕەنگە وایانزانیبێ کە پێغەمبەریش ﷺ کشاوەتەوە،) یەکێك (لەو دڵنەخۆشو دەغەڵانە، کە دیارە کەسانێك هەر هەبوون لەوێ) گوتی: موحەممەد کوژرا، بگەڕێنەوە بۆ سەر دینی پێشێتان، (واتە: بگەڕێنەوە سەر بتپەرستیی) ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ... ﴾.

---

١) (جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٨٢٤).
٢) جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٨٢٤).

## مانـای گـشـتـی ئـایـەتـەکـــان

دیارە لە ئایەتەکانی پێشوودا خوا ﷻ باسی سەرەتای جەنگی (ئوحود)ی کرد، پاشان جەنگی (بەدر)ی هێنایەوە بیری مسوڵمانان، وەك سارێژکردنی ئەو زامو برینەی کە لە دڵو دەروونیاندا هەبوو، بە هۆی ئەو شکستەوە کە لە جەنگی (ئوحود)دا بەسەریان هاتوە، کە ئەویش خەتای خۆیان بووە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار لەگەڵ ئیمانداران دایە، وە بەرگرییان لێدەکاتو پشتیان دەگرێ، وە ئەوانە بە هۆی هەڵەو کەموکووڕیی خۆیانەوە خوای کاربەجێ پشتی بەردان، جا دوای ئەوەی باسی جەنگی ئوحودی کردو جەنگی بەدریشی بیرخستنەوە، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! سوود مەخۆن بە قازانجی چەند بەرانبەر دووبارە بووەوەو کەڵەکە بوو، وە پارێز لە خوا بکەن بۆ ئەوەی سەرفرازبن، توێژەرەوانی قورئان زۆریان قسە لەسەر کردوە، کە لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: خوا ﷻ لێرەدا باسی ڕووداوەکانی جەنگی ئوحود دەکا، عەجەبا لەو ئایەتانەدا باسی ڕیباو سوود خواردن دەکا، وە باسی سیفەتی پارێزکاران دەکات، ئەوە چۆنە ؟! ئایا هیچ پەیوەندییان پێکەوە هەیە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: پەیوەندییان پێکەوە هەیە، ئەوەیش ئەوەیە کە مسوڵمانان لە جەنگی (ئوحود)دا خاڵی لاوازیان ئەوە بوو: کاتێك تیرهاوێژەکان دیتیان هاوەڵانی بەڕێزی دیکەی پێغەمبەریش ﷺ کافرەکانیان تێشکاندوونو خەریکی کۆکردنەوەی دەستکەوتو غەنیمەتن، گوتیان: با ئێمەش زوو بچینە خوار، تاکو بەشمان لەو دەستکەوتو غەنیمەتەدا هەبێ، کەواتە: ئەوەی وایلێکردن جەنگەکە بدۆڕێنن، خۆشەویستیی پارەو سامانو ماڵی دنیا بوو، ئنجا یەکێك لەو ڕێیە ناشەرعییانەی کە ماڵو سامانیان پێ وەسەریەك دەنرا بریتی بوو لە سوودخۆریی، بۆیە خوای کاربەجێ ئاگاداریان دەکاتەوە کە مامەڵە بە ڕیبا نەکەن، چونکە ئەویش جۆرێکەو ڕێیەکە لە ڕێیەکانی

وەدەستهێنــــانو كۆكردنــــەوەی مــــاڵو ســــامانی ناشــــەرعیی، ئــــەوە چــــۆنیەتی پەیوەستبوونی ئایەتەکانە، ئنجا مسوڵمانان هەمیشە لە ئەنجامی پابەندیی بە شــەریعەتەوە، ســەرکەوتوو دەبــن، وە لــە ئــەنجامی لادانیــان لــە شەریعەتــدا ژێردەکــەون، ڕیبــاش یەکێکە لە گوناهــە هــەرە گەورەکــان کە لەنێو کۆمەڵــگای مــسوڵماناندا نابــێ مامەڵە بــە ســوود هــەبێ، وە کە دەشفەرموێ: ﴿لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗ﴾، وەك دوایی باسی دەکەین لەبەر ئەوەی واقیعی ڕیبــاو ســوود خــۆریی ئــەو ســەردەمە وا بــووە، بــۆ نــموونە: کەسێك ســەد (١٠٠) دینــاری قــەرزی لەسەر بووە، ئەگەر نەیتوانیبــێ بیداتــەوە، بۆ ساڵی دووەم بۆیان کردۆتە دوو ســــەد (٢٠٠) دینــــار، وە ســــاڵی ســــێیەم دەبــــووە چــــوار ســــەد (٤٠٠) دینــــارو هــەروەها...، وە ئەگەر کەسێك دە (١٠) سەر حوشتری لەسەر بووبــێو نەیتوانیبــێ بیداتــەوە، بــۆ ساڵی داهــاتوو ژمــارەی حوشتــرەکان هــەروەك خــۆی بــووە، بــەڵام تەمەنی حوشتــرەکان زیادی کردوە، بۆ نموونە: ئەگەر حوشتــری دوو ساڵە قەرزار بووبــێ، بۆیــان کردۆتــە حوشتــری ســێ ســاڵە، یــان چــوار ســاڵە، بۆیــە خــوای پــەروەردگار بەمــشێوە باســی ڕیبــا دەکــا، کــەواتە: مــەرج نیــە هەمیــشە ســوود چەندجار دووبارە بێتەوە، ئنجا حەرام بێ، بەڵکو ڕیبــا کــەمو زۆری هەر حەرامــە، ئەگــەر دینــارێکــیش بــێ، ئنجــا دەفــەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾، وە پارێز لە خــوا بکــەن، واتــە: لــە ســوود خــۆرییو لــە هــەر گوناهێکی دیکەش، بــۆ ئەوەی سەرفرازبنو ئەگەر دەتانەوێ هەمیشە سەرکەوتووبن، ﴿وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾، وە خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە بــۆ کافران ئامادەکراوە، واتــە: لــە ئەسڵدا ئــەو ئاگرە بــۆ کافران ئامادەکــراوە، بــەڵام مــسوڵمانانیش ئەگــەر بێــتو گیــــرۆدەبن بــە گوناهــە گەورەکــانەوە، ئــەوە بــە ئەنــدازەی گوناهــەکانیان لــەو دۆزەخەدا دەسووتێن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا بــۆ کافران ئامادە کراوە ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾، وە فەرمانبــەریی خــواو پــێغــەمبەر ﷺ بکــەن،

بۆ ئەوەی بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ، واتە: بۆ ئەوەی خوا بەزەیی پێدابێنەوە، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، بۆ ئەوەی هەم لە دنیادا خوا بەزەییتان لەگەڵ بنوێنێ‌و، قەت نەهێڵێ دوژمن بەسەرتاندا زاڵبێ‌و، نەهێڵێ تووشی گرفتاریی‌و نسکۆبن، وە هەم لە دوارۆژیشدا نەهێڵێ تووشی سزاو جەزرەبەی خوای دادگەر بن، جا خوا دووبارە ڕوو لە ئیمانداران دەکا، ئیماندارانی ئەوکات کە هاوەڵانی بەڕێز بوون، وە ئێمەو دوای ئێمەش‌و دەفەرموێ: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾، وە خێرایی بکەن، پەلە بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، واتە: خێرایی بکەن لە ئەنجامدانی ئەو کاروکردەوە باشانەدا کە واتان لێ دەکەن شایستەی لێبوردنی خوای بەبەزەیی بن، ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ﴾، وە خێرایی بکەن بۆ وەدەستهێنانی بەهەشتێك کە پانیی‌یەکەی بەقەد ئاسمانەکان‌و زەوی یە، واتە: خێرایی بکەن لەو کاروکردەوە پەسندانەدا کە نرخو بەهای بەهەشتن لە لای خوای کاربەجێ ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾، ئەو بەهەشتەی کە بۆ پارێزکاران ئامادەکراوە، جا ئێمە پێشتر لە پێناسەی تەقوادا باسی سیفەتی پارێزکارانمان کرد، پارێزکاران ئەوانەن کە خۆ دەپارێزن لە هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە، جا خوا پاك‌و تاك بەگشتی دوو شتی پێناخۆشە:

یەکەم: واجبەکانی بچووێنرێ‌و پشتگوێ بخرێن.

دووەم: قەدەغەکانی بشکێنرێن.

بەگشتی خوای بەرزو مەزن ئەو دوو شتەی پێناخۆشە، بۆیە یەکێك لە زانایان لە پێناسەی وشەی: (التَّقوى)دا دەڵێ: (التَّقوى: هُوَ أَنْ لا يَرَاكَ حَيْثُ نَهَاكَ، وَلا يَفْقِدُكَ حَيْثُ أَمَرَكَ)، واتە: تەقوا ئەوەیە کە خوا تۆ نەبینێ لە هەر شوێنێك کە لێی قەدەغە کردووی، وە تۆ غایب نەبی لە هەر شوێنێك کە فەرمانی پێکردووی، واتە: هەر شتێکی کە لەسەری فەرز کردووی بەپێی توانا هەوڵبدەی بیکەی، وە هەر شتێك کە لێی قەدەغە کردووی، هەوڵبدەی بەپێی

توانا خۆتی لێ دوور بگری، ئەوە تەقوایە، جا خوای پەروەردگار لێرەدا بە چەند سیفەتێکی گەورە، پێناسەی پارێزکارانمان بۆ دەکات:

**یەکەم**: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾، ئەوانەی کە ماڵی خۆیان خەرج دەکەن، دەبەخشن، بۆ خۆیان بۆ ماڵو خێزانیان، بۆ خزمانیان، بۆ هەر کەسێکی موستەحەق، خوای بەخشەر بەگشتی فەرموویەتی: دەیبەخشن بەو کەسانە، وە بەو شێوەیەش دەبەخشن کە شەرع فەرمانی پێکردوە، جا ماڵەکە چۆن دەبەخشن؟ دەفەرموێ: ﴿ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾، لە کاتی خۆشیی‌و لە کاتی ناخۆشییدا، لە کاتی دەوڵەمەندیی‌و لە کاتی نەدارییدا، ئەگەر کەمی هەبوو کەم ببەخشێ، ئەگەر زۆری هەبوو زۆر ببەخشێ، واتە: لەو کاتەدا کە دڵیان خۆشە بە هۆی دەوڵەمەندیی یەوە، وە لەو کاتەدا کە دڵیان ناڕەحەتە بە هۆی نەداریی یەوە، دیسان سیفەتی بەخشندەیی‌و ماڵ خەرجکردنیان هەر هەیە.

**دووەم**: ﴿ وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ ﴾، وە ئەوانەی کە ڕقی زۆری خۆیان قوتدەدەنەوە، باسمان کرد کە (كَظْم) ئەوەیە کە تۆ هەناسەی خۆت بگری، دەگوترێ: (كَظَمَ القربة)، (قربة) ئەو کوندەو مەشکەیە کە ئاوی تێدەکرێ، یانی: (كَظَمَ القربة) سەرەکەیان گرێدا، ئەدی (كَظَمَ الغَيْظ) یانی چی؟ واتە: نەفسی خۆت بگری‌و نەهێڵی ڕقەکەت دەربچێ، جا ڕقەکە چۆن دەردەچێ؟ یان بە جنێودان، یان بە هەڕەشەکردن، یان بە پەلاماردان، وە وشەی: (غَيْظ)یش بەمانای ڕقی زۆر دێ، واتە: نەك تووڕەییەکی کەم، بەڵکو هەرچەندەش زۆریش تووڕە دەبن، بەڵام دەتوانن خۆیان کۆنتڕۆل بکەن.

**سێیەم**: ﴿ وَٱلْعَـٰفِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ﴾، وە ئەوانەی کە لە خەڵکی دەبوورن‌و چاوپۆشییان لێ دەکەن، یانی: نەك هەر تووڕەیی خۆیان قوتدەدەنەوە، بەڵکو تووڕەیی خۆیان قوتدەدەنەوەو دواییش نایکەنە کینەو بوغز، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (لە دڵی خۆیدا پەچنی)، یان دەڵێن: (لە نێو دوو

نانی گەرم دا بۆی هەڵگرە)، نا، ئەو كەسەی كە ڕقەكەی خۆیانی لە بەرانبەردا قوتدەدەنەوە، چاوپۆشیی لێ دەكەن و لێی دەبوورن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، وە خوا ئەو كەسانەی خۆشدەوێن كە چاكەكارن، كە خۆی لە خۆیدا تووڕەیی قوتدانەوە لە كاتی تووڕەیی زۆردا، وە لێبووردن لە خەڵكی، ئەوە چاكەكاریی یە، بەڵام ئەوەشی لێ وەردەگیرێ كە نەك هەر لێیان دەبوورن، بەڵكو هەوڵدەدەن كە چاكەشیان لەگەڵ بكەن، وەك دەگێڕنەوە: یەكێك لە پیاوچاكان غوڵامێكی ئاوی لەدەست دەكا، (دیارە ئاوەكەش دەبێ گەرم بووبێ) ئەو دەفرەی كە ئاوەكەی تێدایە لەدەستی غولامەكە دەكەوێتە خوار بەسەر پیاوچاكەكەداو، دەفرەكە دەشكێ و ئاوەكەش دەڕژێ، وە ئەویش تۆزێك ئازار پێدەگات، ئیدی پیاوچاكەكە زۆر تووڕە دەبێ و نارەحەت دەبێ، غوڵامەكەش ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوەو دەڵێ: خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ ﴾، دەڵێ: ڕاستە، ئەوە منیش ڕقی خۆم قوتدایەوە، پاشان دەڵێ: وە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ﴾، دەڵێ: جا ئەوە عەفووشم كردی، دوایی دەڵێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، (دیارە كۆیلە دەبێ)، دەڵێ: دە بڕۆ ئەوە ئازادیشم كردی، مادام خوا وای فەرمووە، دەبێ ئایەتی خوا جێبەجێ بكەین، بەڵام ئەوەش دیارە بە هەموو كەس ناكرێ.

**چوارەم:** ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ ﴾، وە ئەوانەی هەر كات كارێكی ناقوڵایان كرد، یان ستەمیان لە خۆیان كرد، یادی خوا دەكەن و یەكسەر بۆ گوناهەكانیان داوای لێبوردن دەكەن، واتە: وەنەبێ كە پارێزكاران هەرگیز تووشی هەڵەو گوناح نەبن، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (نەكەوتن ئازایەتی یە، بەڵام هەڵسانەوەی دوای كەوتن ئازایەتی ترە)، بۆیە خوای بەخشندە وا دەفەرموێ، جا ئەو كردەوە

هەڵـەیە هـەر چییەك بـێ کـە بەرانبـەر بـە خەڵـکی کردبیـان، ﴿ أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ﴾، یـاخود بەرانبــەر بـە خۆیـان، جـاری وایـە مرۆڤـ گوناهێـك دەکـات زەرەری بەس بۆ خۆی هەیە، وە وشەی: (فاحِشة) واتە: ئەو گوناحو خراپانـەی کـە بـۆ خەڵـك زەرەریـان هـەیە، قـسەیەك، کردەوەیـەك کـە بـۆ غـەیری خـۆی زەرەری هــەبێ، هــەر چـۆن بــێ هــەر گوناهێـك بکـەن ﴿ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ ﴾، دوای ئـەوەی کـە هەڵـە دەکـەنو گونـاح دەکـەن، خـوایان دێتـەوە یـاد، ﴿ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ ﴾، بـۆ گوناهـەکانیان داوای لێبـوردن لـە خــوا دەکـەن، ﴿ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾، بێجگە لە خـواش کێ لە گوناهـان دەبووری، کەس هـەیـە؟ نـــــەخێر، ﴿ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴾، وە (پارێزکـــــاران ئەوانـەن کە) لەسەر ئەو گوناهەی کە دەیانکـرد، لە کاتێـك کە دەزانن گوناهــەو خراپەو زەرەری هەیە، بەردەوام نابن، کەواتە: بەردەوام نەبوون لەسەر گونــاحو زوو گەڕانەوە بـۆ لای خـوا سـیفەتی پارێزکارانـە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴾، ئـا ئەوانـە پاداشـتیان لێبـوردنێکی گەورەیـە لـە پەروەردگاریانــەوە، وە چــەند باغێـك کـە ڕووباریـان بـەژێردا دەڕۆن، تێیانـدا هەمیـشەیین، وە باشتـــرین پاداشـــت پاداشـتــی ئەوانەیـە کـە کـاری بـاش دەکـەنو ئەنجامـدەرانی کـارە چاکەکانن، ئنجا دوای ئـەوەی ئـەو ئامۆژگارییانەیـان دەکات کـە: ئێوە ئەگـەر ئـاوا ئەهلی تەقـوابنو خۆ لە گوناهـان بپـارێزنو چاکەکاربن، خـوا لەگەڵـتانە، ئنجا دێتـە سـەر باسـی ڕووداوەکانی جـەنگی ئوحـودو دەفـەرموێ: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، لــە پـێش ئێوەدا یاسـاو بڕیـارەکانی خــوا لـە ژیـانی زۆر لـە میللـەتاندا تێپەڕیـون، واتە: ئێوە یەکەم کەس نین کە تێدەشکێن لە جەنگدا، کە پـێشتـر لـە جـەنگی

(بەدر)دا سەرکەوتنو ئەمجارە تێشکان، یاسای خوا لە ژیانی میللەتانو لە ژیانی ئۆممەتانی دیکەشدا، بەو شێوەیە جێبەجێ بووە، ئایا یاسای خوا چییە؟! یاسای خوا ئەوەیە کە هەر کەسێك هۆکارەکانی سەرکەوتن دەستەبەر بکات، سەردەکەوێ، وە هەر کەسێك هۆکارەکانی سەرکەوتن دەستەبەر نەکات، ژێر دەکەوێ، قانوونی خوا وایە، ئیدی هیچ کەس مافی (ڤیتۆ)ی لە بەرانبەر یاسای خوادا نیە، ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾، بە زەوی دا بڕۆنو سەرنج بدەن، بزانن سەرەنجامی ئەوانەی کە پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ زانیوە، کتێبەکانی خوایان بە درۆ زانیوە، پەیامەکانی خوایان بە درۆ زانیوە، چۆن بووە؟ ئنجا دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ﴾، ئەمە ڕوونکردنەوەو بەرچاو ڕوونییەکە بۆ خەڵك، بەڵام بۆ پارێزکاران ڕێنماییو ئامۆژگارییە، واتە: ئەو ڕاستییانەی کە ڕووندەکرێنەوە بۆ خەڵکی بەگشتیو بەرچاو ڕوونیینو، بۆ ئیماندارانیش بەتایبەتی ڕێنمایی ئامۆژگاریین، ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾، ئنجا دەفەرموێ: ئێوە بێهێز مەبن، یانی: خۆتان پێ بێهێز نەبێ، وە دڵتەنگو خەمباریش مەبن، وە هەر ئێوە سەرکەوتوونو لەسەرەوە دەبن، ئەگەر بڕواداربن، کەواتە: دیارە ئێوە خەلەل لە ئیمانتاندا هەبووە، خەلەل لە پابەندییتان بە شەریعەتەوەدا هەبووە، بێگومان خەلەل لە پابەندیی بە شەریعەتو لە کردەوەشدا، دەگەڕێتەوە بۆ خەلەلو کەموکووڕیی لە ئیماندا، ئەگەرنا ئینسان مادام ئیمانی باشی هەبێ، کردەوەی باشیشی دەبێ، بەڵام وەختێك ئیمانەکەی خەلەلی تێدا پەیدادەبێ، کردەوەکانیشی خەلەلیان تێدا پەیدادەبێ، کەواتە: ئێوە لەسەرەوەن ئەگەر ئیمانداری باش بن، بۆیە موڕاجەعەی خۆتان بکەنەوە، تاکو پابەندییتان باشتربێ، ئەوکاتە سەرەنجامیشتان باشتر دەبێ، پاشان دەفەرموێ: ﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥ﴾، ئەگەر ئێوە برینێکتان تێبووەو ئازارێکتان

پێگەیشتوە، ئەو خەڵکەی کە ئێوە لەگەڵیان بەشەڕ هاتوونو لەگەڵیان ڕووبەڕوو بوونەوە، کە کافرە بتپەرستەکانن، ئەوانیش وەك ئێوە برینیان تێبووە، ئەوانیش لە جەنگی (بەدر)دا حەفتایان لێ کوژراو حەفتاشیان لێ بە دیل گیرا، ئەگەر ئێوە حەفتاتان لێ شەهید بووە، حەفتاشتان لێ بریندار بووە، ئەوانیش حەفتایان لێ کوژراو، حەفتاشیان لێ بە دیل گیرا، بۆ زانیارییتان یەك مسوڵمانیش لە جەنگی ئوحوددا بە دیل نەگیراوە، دیارە ئامادە نەبوون خۆ بەدەستەوە بدەن، ئینسانی مەبدەئیی خۆ بەدەستەوە نادات، ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ﴾، وە ئەو ڕۆژانەش، واتە: ئەو ڕۆژانەی کە سەرکەوتنیان تێدادەبێ، نۆرەیان پێ دەکەین، دەستاو دەستیان پێ دەکەین لە نێو خەڵکدا، جارێك ئەم، جارێك ئەو، بەلاّم دیارە جارێك ئەم لەبەر ئەوەی کە هۆکارەکانی سەرکەوتنی باشتر دابین کردوون، وە جارێك ئەویدیکەیان لەبەر ئەوەی، ئەمجارە ئەویان هۆکارەکانی سەرکەوتنی باشتر دابین کردوون، ئەگەرنا خۆ هەر لە گۆترە نیە، خوا بفەرموێ: با لەبەر عەینی نۆرە، نۆرەیان پێ بکەم !! نەء، بەڵکو ئەگەر مسوڵمانان هەمیشە هۆکارەکانی سەرکەوتن دەستەبەر بکەن هەمیشە هەر سەرکەوتوونو، ئەگەر واش نەبن، هەمیشە ژێر کەوتوون، ئنجا باسی حیکمەتی ئەو ئازارو نارەحەتییە دەکات کە لە جەنگی (ئوحود)دا بە هۆی شکستو تێشکانەوە بەسەریان هات، دەفەرموێ: ﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ﴾، وە بۆ ئەوەی خوا ئیمانداران بزانێ، جا ئایا خوا ئیمانداران نازانێ، نایانناسێ؟ با، ئەدی مەبەست پێی چییە؟ واتە: بە زمانی کردەوەو لە مەیدانی واقیعدا حاڵی خۆیان بناسێنن، چونکە خوای زاناو شارەزا بە عیلمی ئەزەلیی خۆی هەموو شتێك دەزانێ ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە خوا ستەمکارانی خۆشناوێن، جا ستەمکاران چ بەهۆی کوفرو شیرکەوە، چ بە هۆی لادانو سەرپێچییەوە لە شەریعەت، هەردووکی دەگرێتەوە، ﴿ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ

ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، حیكمەتێكی دیكەی ئەو جەنگە كە ئێوە تێیدا تووشی شكست بوون، ئەوەیە كە خوا ئیمانداران بپاڵێوێ، واتە: ئەو ژەنگو ژارو كەموكوورییو خڵتەو خاڵەی كە لە سینەو دڵیاندا هەیە، لایبەرێ، ئەوانە دیارە هەندێكیان خۆشەویستی دنیایان زۆر بووە، وەك دوایی باسی دەكات، ﴿ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا ﴾، وە بە هۆی ویستنی دنیاوە فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ شكاندو سەرەنجام جەنگەكەیان دۆڕاند، كەواتە: با بە هۆی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنەوە، مسوڵمانان چاو بە خۆدا دەگێڕنەوە، وە خۆیان لەو خڵتەو كەموكووڕییو ژەنگو ژارە پاك دەكەنەوە، ﴿ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، وە بە هۆی ئەوەوە كە كافرانیش كز دەبنو بێهێز دەبن، لە ئەنجامی ئەوەدا كە زەبری ئەهلی ئیمانیان پێدەكەوێ، واتە: حیكمەتو هۆكارێكی دیكەی جەنگی ئوحود ئەوەبوو، كە بە هۆی زەبر لێدرانەوە چرای ئەهلی كوفر خەفەو بێ شۆق ببێ.

ئنجا خوا ﷻ بە سەرزەشتكردنو لۆمە كردنەوە هەندێ بیروبۆچوونی هەڵەی مسوڵمانانی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەر كەسێكی دیكەش كە ئاوا بیر بكاتەوە دەخاتەڕووو، دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، یان ئایا پێتان وابوو، خەیاڵتان وابوو كە بچنە بەهەشت، بەر لەوەی خوا ئەوانەتانی بۆ دەركەوێ كە تێدەكۆشن، وە بەر لەوەی خوا خۆڕاگرانتانی بۆ دەركەوێ ؟ واتە: هەتا خوا لە بێژینگتان نەداو لە مەحەكتان نەدا، وە بە زمانی حاڵ، واقیعی خۆتان نەناسێنن، كە كامەتان بەڕاستی تێكۆشەرن لە ڕێی خواداو، كامەتان خۆڕاگرن، وە سەرەنجام كامەتان شایستەی چوونە بەهەشتن، هەتا ئەوە نەبێ، ڕێی چوونە بەهەشتتان نابێ، دەبێ لە مەحەك بدرێنو لە ڕێ خوادا صەبرو خۆڕاگریی لە خۆتاندا پێشان بدەن، ئنجا شایستەی ئەوە دەبن كە بچنە بەهەشت، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە

ئینسان بەبێ تێکۆشان لە ڕێی خواداو، بەبێ خۆڕاگریی لە پێناوی خوادا، شایستەی چوونە بەهەشت نیە، ئنجا خوای پەروەردگار سەرزەنشتێکی دیکەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ ٱلْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾، وە ئێوە بەرلەوەی بە هۆکارەکانی مردن بگەن، (جەنگ بکەنو خەڵك لە پێش چاوتان بکوژرێ، لە کافران بکوژرێو لە مسوڵمانانیش شەهید بێ)، مردنتان بە ئاوات دەخواست، (دەتانگوت: وادەکەین، وادەچین) ﴿ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾، ئەوە بینیتانو چاك تەماشاتان دەکرد، بەڵام هەمووتان ئەوە نەبوون کە لەپێناوی خوادا گیان فیدایی‌و فیداکاریی بکەن، دیارە خوای زاناو شارەزا نافەرموێ: فلانو فلان ! هەر بەگشتی قسە دەفەرموێ، بەڵام ئەوانیدی کە دیارە ئەوە جارێ حەفتایان هەر لێ شەهید بووە، ئەوەش مانای وایە موقاوەمەو شەڕی باشیان کردوە، وە حەفتایان لێ بریندار بووە مانای وایە ئەوانیش بە هەمان شێوە، ئیدی جاری وایە کابرا شەڕی باشیش دەکا، بەڵام بریندایش نابێ، دیارە کەمێك بوون کە ئەو سەرزەنشتەیان ئاراستە کراوە.

ئنجا شتێکی دیکەشیان دەخاتەوە بیر، ئەویش هەڵویستێکی هەڵەیان بوو کە پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا باسمان کرد، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ﴾، واتە: وە موحەممەد ﷺ تەنیا ڕەوانەکراوێکی خوایەو لە پێش ئەویشدا ڕەوانەکراوانێکی دیکە بووون، پێغەمبەرانی دیکە هاتوونو ڕۆیشتوونو هیچیان نەماون، تاکو موحەممەد بمێنێتەوە، مانای وایە ئێوە پێشبینیی‌و چاوەڕێی ئەوە بکەن کە موحەممەد ﷺ وەفات دەکا، بە مردنی خۆی، یاخود بکوژرێ، ﴿ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ﴾، جا ئایا ئەگەر بۆ خۆی مرد، یاخود کوژرا، لەسەر پاژنە پێیەکانتان هەڵدەگەڕێنەوە؟! ئنجا ئایا بۆچی خوا وا

دەفەرموێ ؟! چونكە هەندێكیان كە بیستیان، گوترا: (ألا إنَّ مُحَمَّداً قَدْ قُتِلَ) ئاگاداربن ! موحەممەد كوژرا، وە دیاریشە ئەوەی كە وایگوتوە مونافیق بووە لەنێو سوپای ئیسلام دا، یان كافرو موشریكێك بووە لە لایەنی بەرانبەر، یاخود شەیتان بووە، ئەو دەنگەی بە گوێی مسوڵمانان داداوە، ئەگەرنا مسوڵمان ناڵێن موحەممەد، دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ، (رسول الله) یان دەڵێن: (نبيّ الله)، جا دەفەرموێ: ئایا ئەگەر مرد یان كوژرا لەسەر پاژنە پێیەكانتان هەڵدەگەڕێنەوە؟! واتە: خۆ بڕیار نیە پێغەمبەر ﷺ هەتا هەتایە بمێنێ، ئەو دنیایە هەر بەجێ دێڵێ، یان بە كوژران یان بە مردن، ﴿ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ﴾، وە هەر كەسێك لەسەر دوو پاژنەكەی هەڵگەڕێتەوە، لێرەدا خوای تاكو پاك گەڕانەوە بۆ نێو كوفر، وەك ئەوە وێنا دەكات، كە كەسێك دەڕوات دوایی پاشەو پاش دەكشێتەوە، واتە: لەسەر پاژنە پێیان بۆ لای كوفر دەگەڕێتەوە ﴿ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ﴾، هەر كەسێك لەسەر دوو پاژنە پێیەكانی بگەڕێتەوە، هیچ زیانێك لە خوا نادات، (زیان هەر لە خۆی دەدات) ﴿ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾، وە بێگومان خوا شوكرانەبژێران‌و سوپاسگوزاران پاداشت دەداتەوە، ئنجا بێگومان ئەوانەی كە ترساون‌و ڕایان كردوە، لە مردنێ ترساون، بۆیە پێیان دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾، وە هیچ نەفسێك بۆی نیە بمرێ (ئەگەر بشیەوێ بمرێ)، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، هەتا خوا مۆڵەت نەداو خوا نەیەوێ، هیچ كەس نامرێ، ﴿ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾، (كاتی مردنی هەركەسێك) نووسراوە بە دیاریكراویی، واتە: كاتێكی دیاریكراویی بۆ دانراوە، دەبێ هەر ئەو كاتە دیاری كراوەبێ، وە خواش مۆڵەت بدا، ئنجا ئەو كەسە دەمرێ، كەواتە: بۆ لە مردن دەترسێن؟! بۆیە من زۆرجار دەڵێم: بە قەرز لە مردنێ مەترسێن، كەسی وا هەیە لە ترسی

مردنێ مردوە، هی وا هەیە لە ترسی هەژاریی هەژارە، هی وا هەیە لە ترسی گیران و زیندانیکرانێ خۆی زیندانی کردوە، ناجوولێ !! ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْأَخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا﴾، وە هەر کەسێك پاداشت و بەرهەمی دوارۆژی بوێ، پێی دەدەین ﴿وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، وە ئێمە لەمەو دوا سوپاسگوزاران پاداشت دەدەینەوە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا باسی مسوڵمانە ڕاستەقینەکان دەکات ئەو بڕوادارانەی کە لە خزمەت پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)دا بوون و فیداکارییان کردوەو خۆڕاگر بوون و نەلەخشاو بوون و دامەزراو بوون واتە: ئێوەش وەك وان بکەن، دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾، وە زۆر لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بوون کە کەسانێکی ڕەببانیی لە خزمەتیاندا بوون و، جەنگیان کردوە لەگەڵ دوژمنانیاندا ﴿فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟﴾، نە بێهێز بوون لەسەر ئەوەی کە تووشیان بوو لە ڕێی خوادا، نە بێهێزیی ڕووی تێکردن، یاخود نە ترس ڕووی تێکردن، نە بێهێزیی ڕووی تێکردن، وە دەشگونجێ (وهن) بێهێزیی مەعنەویی بێ، (ضُعْف)یش مەبەست پێی بێهێزیی جەستەیی بێ ﴿وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟﴾، وە لەبەر دوژمنیشیان لالانەوەو پاڕانەوەیان نەکرد ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾، وە خوا خۆڕاگرانی خۆشدەوێن، ئەوانیش خۆڕاگربوون، ئێوەش ئەو جۆرە کەسانە بکەنە سەرمەشقی خۆتان، ئەدی ئەوان چییان گوت کاتێك تووشی نارەحەتیی و گرفتاریی بوون لە جەنگ و جیهاددا ؟ وەك دەڵێ: (کەس لە شەڕێ شەکری نەبەخشیوەتەوە) دەکوژێ دەکوژرێ، بریندار دەکا بریندار دەکرێ، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ﴾، وە هیچ قسەیەکیان نەبوو، مەگەر ئەوە نەبێ ﴿إِلَّآ أَن قَالُوا۟﴾، جگە لەوە کە گوتیان: ﴿رَبَّنَا

اَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾، پەروەردگارمان ! لە گوناهەکانمان بمانبوورە، وە لە زێدەڕۆییکردنمان لە ئیشوکارماندا بمانبوورە، وە پێیەکانمان بچەسپێنە، وە بەسەر کۆمەڵی کافران سەرمانبخە، کە ئەو دوعایەیان کرد ﴿ فَـَٔاتَىٰهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا ﴾، خواش بەرهەمی دنیای پێدان، پاداشتی دنیای پێدان، کە سەرکەوتنە، وە سەربەرزیی‌و عیززەتە، ﴿ وَحُسْنَ ثَوَابِ الْآخِرَةِ ﴾، وە پاداشتی چاکی دواڕۆژیشی پێدان، کە بەهەشتە ﴿ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾، وە خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، کەواتە: ئێوەش وەك ئەوان خۆڕاگرو چاکەکاربن، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەڕاستی بەدوای ئەو ئینسانە ڕەببانییانە دەکەونو لە حاڵەتی شێنەییو، لە جەنگو لە ئاشتیو، لە هەموو هەڵسوکەوتێکدا، نەلەخشاو دامەزراو دەبن، ئامین.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ الرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً ۖ وَاتَّقُوا۟ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە سوود مەخۆن بە چەندان جار دووبارە بووەوە، وە پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو سەرفرازبن، توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: لێرەدا خوای پەروەردگار فەرمان بە مسوڵمانان دەکا کە سوود نەخۆن، بەڵام ئەم وەسفەی کە سوودی پێ وەسف دەکا، ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً ﴾، چەند جار دووبارە بووەوە، ئەمە مەبەست پێی ئەوە نیە کە هەتاکو ڕیبا بەم شێوەیە نەبێ قەدەغە نیە، چونکە جاری وایە ڕیبا سەدا دووە (٢٪)، یان سەدا سێیە (٣٪)، یاخود سەدا پێنجە (٥٪) یان زیاتر، ئیدی مەرج نیە سەدا سەد (١٠٠٪) بێت، چ جای سەدا دووسەد (٢٠٠٪)و سەدا (٣٠٠٪) بێت!! واتە: چەندجار، وەك

خۆی دووبـارە ببێتـەوە، ئـەدی بۆچـی خـوای زانـاو توانـا وایفەرمـوە؟ لەبـەر ئـەوەی ئەو کات لـە سـەردەمی نەفامییـدا جۆرێك مامەڵەکردنی سـوودخۆریی هەبووە کە بەو شێوەیە بووە، واتە: خـوای کـاربەجێ ئـەو قەیدو وەسـفەی کە بۆ ڕیبا خـواردن بـاس کـردوە، لەبـەر ئەوەیـە کـە ئـەوکات حـاڵەکە بـەو شێوەیە بـووە، ئنـجا زانـایان دەڵـێن: ئـەوە وەسـفـو قەیـدێکی واقیعیـی یـە، نـەك ئیحتیـرازیی واتە: ئەگەر ڕیـبا بـەو شـێوەیە نـەبوو ئـەوە مانـای وایـە حەڵاڵـە! چونکـە ڕیبـا کـەم بـێ یـان زۆر، هـەر حەڕامـە، جا لـەوبـارەوە (طبري) ئـەم دەقـــە دێنـــێ: (عَـنِ ابْـنِ زَيْـدٍ فـي قَوْلِـهِ: ﴿ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ﴾، قَـالَ: كَـانَ أَبِـي يَقُـولُ: إِنَّمَـا كَـانَ الرِّبَـا فِـي الجَاهِلِيَـةِ فِـي التَضَعْيْفِ وَفِي السِّنِ، يَكُونُ لِلْرَّجُلِ فَضْلُ دَيْنٍ، فَيَأْتيهِ إِذَا حَلَّ الأَجَلُ فَيَقُولُ لَـهُ: تَقْضِينِي أَوْ تُزِيـدُنِي؟ فَإِنْ كَـانَ عِنْـدَهُ شَيءٌ يَقْضِيهِ قَضَى، وَإِلا حَوَّلَهُ إِلـى السنِ الَّتِي فَوْقَ ذَلِكَ، إِنْ كَانَتْ ابنَـة مَخَاضٍ يَجْعَلُهَا ابنـة لبـون فـي السَنَة الثـانية، ثُمَّ حِقَّةً، ثُمَّ جَذَعَـةً، ثُمَّ رَبـاعِيًا، ثُمَّ هَكَذَا إِلـى فَـوْقَ، وَفِي العَيْنِ يَأْتيهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ أَضْعَفَهُ فِي العَامِ القَابِل، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ أَضْعَفَهُ أَيْضًا، فَتَكُونَ مِئَةً فَيَجْعَلَهَا إِلى قَابِل مِئَتَين، فَإِنْ لَمْ يَكُن عِنْدَهُ جَعَلَهَا أَرْبَعَمِئَةً، يُضْعِفُهَا لَـهُ كُلّ سَنَة أَوْ يَقْضِيهِ، قـال: فهـذا قولـه: ﴿ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ﴾)[1]، واتـە: ئیبنـو زەیـد دەربـارەی ئـەم ئایەتـە موبارەکە دەڵـێ: بابـم دەیگـوت: لـە سـەردەمی نەفامییـدا سـوود خـۆریی چەند قـات دەکرایەوە، چ لە ڕووی تەمـەنی ئـەو ئاژەڵانـەوە کـە کابرا لەسـەر یەکێکـی دەبوون، وە چ لە ئەندازەی ماڵی نەغدینـەدا دەڵـێ: ئەگەر پیاوێك قەرزی لەسـەر یـەکێك بووایـە کـە کـاتی دانـەوەی قەرزەکـە هـاتبـا، دەهـاتە لای پێـی دەگـوت: قەرزەکەم دەدەیـەوە یاخـود بۆم زیاد دەکەی؟ ئەگـەر هیـچی لـەلا بووایـە (واتـە: پـارەو سـامانی هەبووایـە) قەرزەکـەی دەدایـەوە، وە ئەگـەر قەرزەکـەی بـۆ

١) جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٧١٤).

نەدرابایەوە، ئەوە قەرزەکەی بۆ دەگواستەوە، ئەگەر ئاژەڵێك بووایە بۆی دەگواستەوە بۆ تەمەنی پشت ئەوە، بۆ وێنە: ئەگەر حوشترێکی دوو ساڵە بووایە، ساڵێکی تەواو کردباو پێی لە دوو ساڵ نابا، کە پێی دەگوترێ: (ابنَة مَخَاضٍ) لە ساڵی دووەمدا بۆی دەکردە حوشترێکی سێ ساڵە (ابنة لبونٍ)، وە لە ساڵی سێیەمدا ئەگەر هەر بۆی نەدرابایە بۆی دەکردە (حِقَّةً) واتە: حوشترێکە چوار ساڵە، دوایی ساڵێکی دیکە بۆی دەکردە (جَذَعَةً) واتە: حوشترێکە پێنج ساڵە، دوایی بۆی دەکردە (رَبِاعِي)، واتە: حوشترێکی شەش ساڵە، وە بەم شێوەیە هەموو ساڵێك کە کاتی دەهات ئەگەر دابایەوە ئەوە باش بوو، ئەگەرنا بۆی زیاد دەکرد، هەروەها لە ماڵی نەغدینەدا دیسان کە کاتی دانەوەی قەرزەکە دەهات، دەهاتە لای، ئەگەر هەیبا دەیدایەوەو، ئەگەر نەیبایە لە ساڵی داهاتوودا بۆی دەکردە دوو هێندە، وە هەروەها بەم شێوەیە بۆ نموونە: ئەگەر سەد بایە بۆی دەکردە دوو سەد، بۆ ساڵی دواتر دووسەدەکە دەبوو بە چوار سەد، دوایی چوار سەدەکە دەبوو بە هەشت سەد، (ئیدی بابای قەرزار وای لێ دەهات هەر لەبنی نەدەهاتە دەرێ، بەم شێوەیە پێکەوە مامەڵەیان دەکرد ئەگەر قەرزیان لەسەر یەکدی بووایە یان قەرزەکەی دەدایەوە یان بۆی دوو قات دەکردەوە)، وە خوای بە بەزەیی وەك لەو واقیعەدا هەبووە، سوودخۆریی وەسفی دەکاتو دەفەرموێ: ﴿أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً﴾، وە زانایان بۆیەش وادەڵێن، تاکو هیچ کەس پێیوانەبێ کە خوای کاربەجێ بەس ڕیبای چەندبارەبووەوەی قەدەغە کردوە، واتە: ئەگەر سەدا دوو (٢٪)بێ، یان سەدا سێ (٣٪)بێ، یاخود سەدا پێنج (٥٪)بێ، ئەوە ئەندازەیەو ڕێژەیەکی کەمە، کەواتە: قەدەغە نیە، نەخێر، چونکە وەك لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)دا باسمان کرد، خوا لەبارەی سوودخۆرییەوە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو ئەوەندە سوودەی (لەسەر

قەرزدارەکان) ماوە وازی لێ بێنن، ئەگەر ئێوە بەڕاستی بڕوادارن! یان دەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ﴿٢٧٥﴾﴾ البقـرة ، واتە: خوا کڕین‌و فرۆشتنی حەڵاڵکردوەو ڕیبای قەدەغە کردوە، ئیدی بە موتڵەقیی فەرموویەتی، کەم بێ یان زۆر، ڕیبا قەدەغەیە، وە لەڕاستییدا مەسەلەی مامەڵە بە سوودیش، سەرەنجام هەر وای لێدێ‌و ماڵی دەوڵەمەندەکان چەند قات دەبێتەوەو، نەداریی‌و هەژاریی هەژارەکانیش، ڕۆژ بە ڕۆژ دەچێتە خوارتر، بەڵێ بەهۆی سیستەمی سوود خۆریی یەوە، هەمیشە ئەوەی دەوڵەمەندە دەوڵەمەندتر دەبێ‌و، ئەوەی نەدارو هەژارە نەدارترو هەژارتر دەبێ، وەك ئێستا لە سایەی سیستەمی سەرمایەدارییدا دەیبینین‌و ئێستاش سیستەمی سەرمایەداریی لە قەیرانێکی گەورەی ئابووریی دایە، بەتایبەت ئەمریکاو ئەورووپا.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾، واتە: خۆ لە ئاگرێك بپارێزن کە بۆ کافران ئامادە کراوە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە مسوڵمانانی گوناهبار، ئەگەر لە گوناهەکانیان تۆبە نەکەن‌و وەبەر لێبوردن‌و عەفووی خوای بەخشندە نەکەون، ئەوە لە دواڕۆژدا بە ئەندازەی گوناهەکانیان دەسووتێنرێن‌و دەچنە دۆزەخ، وە ئەگەر وانەبوایە خوای دادگەر نەدەگونجا هەڕەشە لە بڕواداران بکا بە ئاگرێك، کە لە ئەسڵدا بۆ کافران ئامادە کراوە، بۆیەش ئەم مەسەلەیە دەورووژێنین، چونکە کاتی خۆی (خەواریج) کە دەستەیەك بوون گوتوویانە: ئەوەنیە خەڵکێك بچنە دۆزەخ لە ئەهلی ئیمان‌و دوای پاکبوونەوە ئنجا بچنە بەهەشت، بەڵکو هەر لە ڕێوە یان دەچن بۆ بەهەشت، یان دەچن بۆ دۆزەخ، (خەواریج) کاتی خۆی فیکرەیەکی وایان هەبووە، وە لە ڕۆژگاری خۆشماندا کەسی وا هەبووە کە فیکرەی وای هەبووە، بۆ وێنە: کاك (ناصری سوبحانیی) ڕەحمەتی خوای لێبێ، کە من خۆم گوێم لێ بووە لە وتارو دەرسیدا،

ئەویش بۆچوونێکی وای هەبووە، کە مرۆڤ هەر لە ڕێوە یان دۆزەخییە، یان بەهەشتی، ئیدی ئەوەنیە بچێتە دۆزەخو دوایی بچێتە بەهەشت، بەلاّم لە ڕاستییدا ئەم بیرۆکەیە هەڵەیەو، وە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، وە دیارە ئایەتی دیکەش هەن[1]، وە واش نیە کە خوای کاربەجێ خەڵکی دابەش کردبێ، یەکسەر یان بەهەشتی یان دۆزەخی بێ، بەڵکو بۆ وێنە: ئایەتێك هەیە لە سوورەتی (فاطر)دا ئیمانداران دابەش دەکات بۆ سێ بەش‌و دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ ...﴿٣٢﴾ ﴾فاطر، واتە: دوایی کتێبی خۆماندا بەو بەندانەی کە هەڵمانبژاردوون، جا هەیانە ستەمی لەخۆی کردوەو، هەیانە میانجییە (واتە: زۆر خراپ نیە، بەلاّم زۆریش چاك نیە)، وە هەشیانە پێشکەوتۆتەوە لە چاکەکاندا، کەواتە: وانیە مسوڵمانانیش هەمووی یەك شێوەبن، ئەوانیش پۆلێن دەکرێن‌و خراپیان هەیە، کە موستەحەقی سزایە، مام نێوەندییان هەیە کە وەك لە ئایەتەکانی (الواقعة)دا بە (أصحاب اليمين) ناویان دەبا، وە زۆر چاکیشیان هەیە کە لێرەدا بە (سابق الخيرات)و لە (الواقعة)شدا (مقرّبين) ناویان هاتوە، واتە: زۆر لە خوا نیزیکان.

<u>**مەسەلەی سێیەم:**</u> خوا پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، وە فەرمانبەریی خوا بکەن‌و فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، بەڵکو ڕەحمتان پێبکرێ‌و بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ، لەلایەن

---

١) دەقی سوننەتیش لەوبارەوە زۆر زۆرن بۆ نموونە :

{عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه، قال: قال رسول الله ﷺ: يَخْلُصُ المؤمنون من النّار فَيُحْبَسُون على قنطرةٍ بين الجنّة والنّار، فَيُقَصُّ لبعضهم من بعض مَظَالِمَ كانت بينهم في الدنيا، حتى إذا هُذِّبوا ونُقُّوا أُذن لهم في دخول الجنّة، فوالّذي نفسُ محمدٍ بيده لأَحَدهُم أهدى بِمَنْزِلِهِ في الجنّة منه بِمَزِلِهِ في الدنيا}، رواه البخاري: (٦٥٣٥).

خوای پەروەردگارەوە، ئەم ئایەتە زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنێ، کە ئینسان بە ئەندازەی فەرمانبەریی بۆ خوا، کە پابەندیی یە بە قورئانەوەو فەرمانبەریی بۆ پێغەمبەر ﷺ کە پابەندیی یە بە سوننەتەوە، شایستەی ئەوە دەبێ کە خوا بەزەیی لەگەڵدا بنوێنێو ڕەحمی پێ بکات، هەم لە دنیاو هەم لە دوارِۆژدا، جا دیارە ڕەحمەتی خوای بە بەزەیی لە دنیادا دەبێتە هۆی ئەوەی کاری بۆ ئاسان بکرێو زیاتر یارمەتی بدرێ بۆ طاعەتو لە گوناح دووربێ، وە کاتەکەی بەرەکەتی هەبێو تەمەنی بەرەکەتی هەبێ، وە لە دوارِۆژیشدا ڕەحمەتو بەزەیی خوای بەخشەر لە بەهەشتی خواو ڕەزامەندیی خوادا بەرجەستە دەبێ، ئنجا ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، وەك ئایەتی ژمارە (٧١)ی سووڕەتی (الأحزاب)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾، واتە: هەرکەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، بە سەرکەوتنێکی مەزن سەرکەوتوە، هەروەها وەك ئایەتی ژمارە (٦٩و ٧٠)ە، لە سووڕەتی (النساء)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا ﴾، واتە: وە هەرکەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکات (واتە: پابەندبێ بە قورئانو سوننەتەوە) ئەوە لەگەڵ ئەو کەسانە دایە کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، لە پێغەمبەرانو صیددیقانو شەهیدانو صالحان، وە ئەوانە باشترین هاوەڵن، ئەوە بەخششێکە لە خواوە. وە بەسە خوا زانابێ بە بەندەی خۆی، واتە: خوا لە هەموو کەس زاناترە، هەموو ئەو ئایەتانەو دیارە ئایەتی دیکەش هەن، ئەوە دەگەیەنن کە بەڕاستی بناغە بۆ سەرفرازییو بەختەوەریی ئینسان، بریتیە لە فەرمانبەریی بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو ئەویش لە پابەندیی بە قورئانو سوننەتەوەدا بەرجەستە دەبێ.

**مەسەلەی چوارەم:** خوای بە بەزەیی کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾، واتە: خێرایی بکەن بۆ دەستەبەرکردنی هۆکارەکانی لێبوردنو چوونە بەهەشت، چونکە ئایەتەکە دەفەرمویٚ: خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، وە بەهەشتێك کە بە قەدەر ئاسمان زەوی پانە، لێرەدا لێبوردنی خوای لێبوردە شوێنێکی دیاریکراوی نیە تاکو بۆی بچی، دیسان بەهەشتیش ئینسان ناتوانیٚ بۆی بچیٚ، بە مانا ڕواڵەتییەکەی، کەواتە مەبەستی چییە؟ واتە: خێرایی بکەن بۆ دەستەبەرکردنی ئەو هۆکارانەی کە لێبوردنی خوای بەخشندەتان بۆ مسۆگەر دەکەن، وە بەهەشتی خوای بە بەزەییتان بۆ مسۆگەر دەکەن، جا وەك لە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە: {عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٣٦٩٦)، وَمُسْلِمُ برقم: (٧٠٦١)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٣١١)، وَالدَارَمِي برقم: (٢٧٣٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥٥٩) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَأَبُو يَعَلَى برقم: (٣٢٧٥)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٧١٦)، واتە: بەهەشت بە ناڕەحەتییان پەرژین کراوە، دۆزەخیش بە ئارەزووەکان پەرژین کراوە، واتە: کەسێك بیەویٚ بەرەو بەهەشت بڕوا، دەبیٚ تەحەمولی سەختییو ناڕەحەتییان بکات، کە لە جێبەجێکردنی واجبەکانو دووریی گرتن لە قەدەغەکانو لە پابەندیی بە قورئانو سوننەتەوەدا، خۆی دەنوێنیٚ، کە دیارە ئینسان دەبیٚ تەحەمولی سەختییو ناڕەحەتییان بکات، بەڵام کەسێك بە دوای ئارەزووەکانی بکەویٚ ئەوە شووراو پەرژینی دۆزەخ دەبڕیٚو دەچێتە نێو دۆزەخەوە، خوا پەنامان بدات، ئنجا کە خوا ﷻ لێرەدا لێبوردنی پێش چوونە بەهەشت خستوە، لەبەر ئەوەیە هەرکەسێك کە خوا لێی ببووریٚ، بە گوناهەوەو بە پیسو پۆخڵیی ڕێی چوونە نێو بەهەشتی نیە، بەهەشت بۆ کێیە ؟ بەهەشت بۆ کەسانی پاکە، بۆیە کەسانێك کە بە چڵكو چەپەری تاوانو گوناهو خراپە خۆیان پیسو پۆخڵ کردبیٚ، هەتا پاك نەبنەوە، بە

کەڵکی چوونە بەهەشت نایەن، جا ئەوەی کە لە دنیا تۆبەی کردبێ‌و طاعەتی کردبێ، ئەوە خۆی پاککردۆتەوە، ئەگەرنا ئەوەی بە سزای نێو گۆڕ، واتە: ئەشکەنجەی دوای مردن پاك بێتەوە، یاخود بە ناڕەحەتییەکانی ڕۆژی دوایی پاك بێتەوە، یان خوای پەروەردگار بە شێوەیەکی تایبەت عەفووی بکات، ئەگەرنا ئەوەی بە چڵکی گوناهو تاوان پیس بووبێ، دەبێ بچێتە دۆزەخ‌و لەوێ سزا بدرێ‌و پاکبێتەوە، ئنجا بە کەڵکی چوونە بەهەشت دێ، وەك خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە: (٧٣)ی سووڕەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾، واتە: ئەوانەی لە پەروەردگاری خۆیان پارێزیان کردوە، بەرەو بەهەشت بەڕێخران، هەتا کاتێك کە چوونە لای بەهەشت، وە پێشتر دەرگاکانی کرابوونەوەو خرابوونە سەر پشت، بەهەشتەوانەکان (واتە: ئەو فریشتانەی بەسەر بەهەشت ڕادەگەن‌و سەرپەرشتیی بەهەشت دەکەن) پێیان گوتن: سەلامتان لێبێ، ئاشتییتان لەسەر بێ، ئێوە پاك‌و چاكن بچنە نێو بەهەشتەکانەوە بە هەمیشەیی، کەواتە: هەتا ئینسان پاك نەبێ‌و خاوێن نەبێتەوە، شایستەی چوونە بەهەشت نیە.

**<u>مەسەلەی پێنجەم</u>**: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾، بەهەشتێك یاخود باغێك، چونکە وشەی: (جنة) واتە: باغ، پانییەکەی بەقەدەر ئاسمانەکان‌و زەوییە، ئەمە دوو واتای هەن:

هەندێك دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە وشەی: (عَرْض)، واتە: پانییەکەی ئەوەندەیە، کەواتە: درێژییەکەی زیاترە.

هەندێکیش دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە وشەی: (عَرْض)، واتە: پانتایی (مساحة)ەکەی بەقەدەر ئاسمانەکان‌و زەوییە، دیارە لەوبارەوە کاتی خۆی جوولەکەکان ئیشکالیێکیان لەسەر ئەو ئایەتە دروست کردوە، ﴿عَنْ طَارِقِ بْنِ

شِهابٍ: أَنَّ نَاسًا مِنَ اليَهُود سَأَلُوا عُمَرَ بْن الخَطَاب عَن: (جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ)، أَيْنَ النَّارُ؟ قَالَ: أَرَأَيْتُمْ إِذَا جَاءَ اللَّيلُ، أَينَ يَكُونَ النَّهَارُ؟ (فَقَالُوا: اللَّهُمَّ نَزَعْتَ بِمِثْلِهِ مِنَ التَّورَاةِ!)﴾[1]، واتە: هەندێك لە جوولەکەکان پرسیاریان لە عومەری کوڕی خەتتاب کرد - خوا لێی ڕازی بێ-، (کە دیارە ئەوکاتە خەلیفەی مسوڵمانان بووە) بەهەشتێك کە پانییەکەی بەقەدەر ئاسمانەکانو زەوی یە، ئەدی دۆزەخ (ئاگر) لە کوێیە؟! ئەویش پێی گوتن: باشە وەختێك کە شەو دێ، ڕۆژگار لە کوێ دەبێ ؟ گوتیان: ئەوە تۆ ئەوەت لە تەوراتەوە وەرگرتوە.

بەڕاستی وەڵامەکەی زۆر بەجێیە، چونکە ئەوکاتەی کە شەو دنیا دادەپۆشێ، لەلای ئێمە ئەوە نیوەی دووەمی دنیا ڕۆژە، واتە: ئەگەر بوونەوەریش بەم شێوەیە تەماشا بکەی، ئەگەر لای سەرێی بەهەشتە لای خوارێی دۆزەخە، خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتدا ئاماژە بەوە دەکات کە بەهەشت، لەلای سەرەوەی کائیناتە، هەرچەندە دوایی خوای پەروەردگار بە جۆرێکی دیکە تەشکیلی دەکاتەوە، وە لای خوارێشی دۆزەخە، کەواتە: بەرانبەری یەکدین، بەهەشت لە بەرزییەو، دۆزەخ لە نزمییە، هەرچەندە خوای پەنهانزان لە سووڕەتی (إبراهیم)دا بۆمان باس دەکات کە لە ڕۆژی دوایی دا ئاسمانەکانو زەوی وەك ئێستا نامێنن، دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ...﴿٤٨﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: ئەو ڕۆژەی کە زەوی‌و ئاسمانەکان وەك خۆیان نامێنن‌و هەموویان دەگۆڕێن‌و بە جۆرێکی دیکە دروستیان دەکاتەوە، ئەگەر ئێستا بەم شێوەیەن، ئەوکاتە جۆرێکی دیکە بە جۆرێکی دروست دەبنەوە، هەڵبەتە زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە ئێستا بەهەشت‌و دۆزەخ هەن، چونکە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ وێڕای ئایەتەکانی قورئان، کە لە زۆر شوێنان خوای بێ وێنە لەبارەی بەهەشتەوە دەفەرموێ: (أعدت للمتقين) وە بۆ دۆزەخ دەفەرموێ: (أعدت للكافرين)،

---

١) (جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٧٢٠).

كەواتە: دەبێ ئێستا ئامادە كرابن، وە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ، بە تایبەتی دەربارەی (میعراج)[1]، كە دەفەرموێ: بەهەشتم بینی، دۆزەخم بینی، مانای وایە دەبێ ئێستا هەم بەهەشتو هەم دۆزەخ هەبن، دیارە ئەو دروستكراوانەی خوای پەروەردگاریش زۆر فراوانن و، دەگونجێ بەهەشتو دۆزەخ هەر لە دەرەوەی چوارچێوەی ئاسمانەكان وە زەویش دا بن، چونكە لە فەرمایشتێكی (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، كە فیردەوس بەرزترین پلەی بەهەشتە، وە سەقفی فیردەوس عەرشی خوای پەروەردگارە[2].

**مەسەلەی شەشەم:** خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾، جا كە وەسفی پارێزكاران دەكا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥ ﴾، خوای بێوێنە لەم دوو ئایەتە موبارەكەدا چەمكو واتای پارێزكردن (تقوى)مان بۆ فراوان دەكاو شیدەكاتەوەو دەفەرموێ: بەهەشت بۆ پارێزكاران ئامادە كراوە، واتە: شایستەی هەموو كەس نیە، بەڵكو شایستەی ئەو كەسانەیە كە خۆیان پاراستوەو بە هۆشیاریەوە ژیاون، بە وریاییەوە ژیاون، بەو شێوەیە ژیاون كە شەریعەتی خوا دەیخوازێ، نەك بەو شێوەیەی كە نەفسو ئارەزوویان داوایان لێ دەكات، وە نەك بەو شێوەیەی كە نەفسو شەیتان دەیخوازن، جا خوا ﷻ پێناسەی پارێزكارانمان بۆ دەكات لە حەوت بڕگەدا، واتە: بە حەوت سیفەت پێناسەیان دەكات:

**سیفەتی یەكەم:** ﴿ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾، لە كاتی خۆشیو ناخۆشییدا دەبەخشن، جا بەخشین لە كاتی خۆشییداو لە كاتی

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ، برقم: (٩٦٠).
٢) أَخْرَجَهُ الترمذي، برقم: (٢٥٣١)، وصحَّحهُ الألبانيِّ.

هـەرزانییو دەوڵەمەنـدییـدا، ئاسـانە، بـەڵام بەڕاسـتی لـە كـاتی نارەحـەتیی‌و گرفتارییـــدا، بەخـــشین ئاســـان نیـــە، بـــەڵام پارێزكـــاران ئەوانـــەن لـــە كـــاتی خۆشـیی‌و ناخۆشییـدا، وە لـە كـاتی دەوڵەمەنـدیی‌و هەژارییـدا، دەبەخـشن، ئیـدی لـە زۆری زۆرو لـە كـەمی كـەم دەبەخـشن، واتـە: سـیفەتی بەخـشین‌و كـەرەم‌و سـەخاوەت سـیفەتێكی بنەڕەتییانـەو، تەنانـەت كەوتنـە حاڵـەتی تەنگانەو هـەژاریی‌و نـەدارییش، ئەو سیفەتەیان لـێ ناستێنێتەوە.

سـیفەتی دووەم: ﴿ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ ﴾، ئەوانـــەی ڕق‌و تـــووڕەیی زۆری خۆیـان كـپ دەكـەنەوە، چونكـە (الغَيْظُ: أَشَدُّ الغَضَب)، (غَيْظِ) بریتیـە لـە تـووڕەیی یەكـی زۆر، كەواتـە: (كَظْم الغَيْـظِ) واتـە: ڕقـی خـۆت بگـری‌و نەهێڵـی بێتـەدەر، جـا ئینـسان بتوانـێ تـووڕەیی زۆر قـوت بداتـەوەو كپـی بكاتەوە، مانای وایە تووڕەیی كەم ئاسانتـرە، چونكە هەمیـشە بـەردی سـووك ئاسانتــر هەڵدەگیــرێ لـە بـەردی قـورس، وە هەمیـشە ئەگـەر ئینـسان كـاری قورسـی بـۆ كـرا، هـی سووكیـشی بـۆ دەكـرێ، لـەوبارەوە فەرمایـشتێكی پـێغـەمبـەر ﷺ هەیـە دەربارەی ئـەوە كـە ڕقـی خـۆ قوتـدان‌و تووڕەیـی خـۆ كـپ كـردن، سـیفەتێكی چـەند گەورەیـە دەفـەرموێ: {مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ قَـادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ، دَعَـاهُ اللَّـهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رُءُوسِ الْخَـلاَئِقِ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ اللَّـهُ مِنَ الْحُورِ مَا شَـاءَ } أَخْرَجَـهُ أَحْمَد بـرقم: (١٥٦٥٧)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٧٧٧)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٢٤٩٣)، وَابْـنُ مَاجَـه بـرقم: (٤١٨٦)، وَالطَّبَرَانِـي (فـي الكـبير) بـرقم: (٤١٧)، عَـنْ سَـهْلِ بْـنِ مُعَـاذٍ عَـنْ أَبِيـهِ ﷺ، وَحَـسَّنَهُ الألبـاني فـي (صـحيح ابـن ماجـه)، واتـە: هەركەسێك تووڕەییـەكی زۆری خـۆی كـپ بكـاتەوە، لـە حاڵێكـدا كـە بـشتوانێ جێبەجـێی بكـات (لـە كەسـێك تـووڕە بـێ بـشتوانێ تووڕەییەكـەی خـۆی جێبـەجێی بكـات)، لـە ڕۆژی دواییـدا خـوا لـە سەرووی هـەموو خەڵـكی یـەوە بانگـی دەكـا، هەتاكـو سـەر پشكی دەكا لە نێوان هەر حۆرییەكـی كە دەیـەوێت لێـیان هەڵبـژێرێ‌و گوڵبژێـری بكات، لە پاداشـتی ئەو ڕقـەی خۆیـدا كە قووتی داوەتـەوە.

**سیفەتی سێیەم:** ﴿وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾، ئەوەنیە هەر ڕقی خۆیان کپ بکەنەوە قوتی بدەنەوە، بەڵام دوایی بیکەنە بوغزو کینە لە دڵیانداو، چاوەڕێی دەرفەتێك بکەن بۆ تۆڵە ستاندنەوە ! نەخێر، ﴿وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾، کە ڕقی خۆیان قوتدەدەنەوە بە تەمای تۆڵە ستاندنەوەش نین نایکەنە کینەو بوغز، بەڵکو هیچ لە دڵی خۆیاندا ناهێڵن‌و لە خەڵك دەبوورن، ئەو خەڵکەی لێیان تووڕە بوون، یاخود خراپەیەکیان لە بەرانبەردا کردوون.

**سیفەتی چوارەم:** ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، واتە: هەر ئەوە نیە کە لە خەڵکی ببوورن، بەڵکو هەوڵدەدەن ئەوەی کە خراپەیان لەگەڵ دەکات چاکەشی لەگەڵدا بکەن، وەك دەفەرموێ: ﴿... ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾﴾فصلت، واتە: بە سیفەتی هەرە چاك سیفەتی خراپ پاڵ پێوەبنێ، (واتە: یەکێ خراپەی لەگەڵدا کردی، تۆ هەوڵبدە چاکەی لەگەڵدا بکەی) ئەو کاتە دەبینی ئەوەی کە لە نێوانی تۆو ئەودا دوژمنایەتیی‌و ناحەزیی‌و ڕق‌و بوغز هەیە، دەبێتە دۆستێکی زۆر نزیك، ئەوە هەڵبەتە بۆ کەسێك جوامێر بێ‌و بۆ کەسێك کەریم بێ، وەك (المُتَنَبِّي) دەڵێ :

إذَا أَنْتَ أَكْرَمْتَ الْكَرِيمَ مَلَكْتَهُ
وَإِنْ أَنْتَ أَكْرَمْتَ اللَّئِيمَ تَمَرَّدَا

واتە: ئەگەر تۆ ڕێزی ئینسانی بەڕێزو بە حورمەت‌و سەنگینت گرت، ئەوە دەیکەیە موڵکی خۆت (واتە: بە چاکەو فەزڵی تۆ دەزانێ)، وە هەتا ڕێزی ئینسانی بودەڵەو بێڕێز بگری، ئەوە زیاتر لێت هەڵدەگەڕێتەوە، دەڵێ: ئەوە لە ترسانە، لەبەر ئەوە ئەو جۆرە مامەڵەیە دیارە دەبێ لە شوێنی خۆیدا، وە لەگەڵ کەسی خۆیدا بکرێ.

**سیفەتی پێنجەم:** ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ ﴾، وە ئەوانەی كاتێك كە كردەوە، یان قسەیەكی ناقۆڵاو ناشیرینیان لێ دەپشكوێتەوەو، قسەیەكی خراپ دەكەن‌و كردەوەیەكی خراپ دەكەن، یاخود ستەم لە خۆیان دەكەن، واتە: بەرانبەر بە كەسێك قسەیەكی خراپ دەكەن، یان ڕەفتارێكی ناشایستە دەكەن، یاخود خراپەیەك دەكەن، كە هەر زەرەری بۆ خۆیانە، خوایان دێتەوە بیر، كەواتە: ئەهلی تەقواو پارێزراونین لە هەڵەو گوناح، بەڵام دوای ئەوەی كە گوناح دەكەن، پەروەردگاریان دێتەوە بیر، واتە: بەردەوام نابن‌و یادی خوا دەكەنەوە، ئەوە وەك ئەو ئایەتەی ژمارە (٢٠١) سووڕەتی (الأعراف)ە، كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی پارێزكارن، كاتێك دەستێكیان دەگەیەنرێتێ لەلایەن شەیتانەوە، یاخود شەیتان هەستێكی بەلایاندا دەڕوا، یەكسەر هۆشیار دەبنەوە، وە بەرپێی خۆیان دەبینن‌و بەرچاویان ڕوون دەبێتەوە، هەست بە فێڵ‌و پیلانی شەیتان دەكەن، وە واز لەو هەڵەیە دێنن كە خەریك بووە تووشی بن، یاخود تووشی بوون، كەواتە: مەرجی ئینسانی پارێزكار، ئەوە نیە كە هیچ گوناحێك نەكا، بەڵكو مەرجی ئەوەیە كە كاتێ گوناح دەكا، بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری.

**سیفەتی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ ﴾، وە داوای لێبوردن دەكەن بۆ گوناحەكانیان، دوای ئەوەی كە هەڵە دەكەن، هۆشیار دەبنەوەو داوای لێبوردن دەكەن، چونكە داوای لێبوردن كردن لە گوناح‌و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار، وەك چۆن قوماشێك پیس دەبێ، بەڵام دوایی بە ئاوو تایت‌و سابوون جوان دەیشۆی‌و پاك دەبێتەوە، بەهەمان شێوەش گەڕانەوە بۆ لای خوای بێ‌وێنەو، داوای لێبوردن كردن لە خوا، ئینسان پاك دەكاتەوە، جا زانایان دەڵێن: وەك چۆن ئەگەر دەستت بە شتێكی سادە پیس بووبێ،

هەروا ئاوێکی پێدابکەی پاك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر خراپ پیس بووبێ، یاخود ئەو ماددەیەی کە پیسی کردوە بە ئاسانیی لانەچێ، ئەوکاتە تۆ دەبێ وێڕای ئاو، شتی دیکەشی لەگەڵ بەکاربێنی بۆ وێنە: صابوونی لەگەڵ بەکاربێنی، یاخود ئاوەکە دەبێت گەرم بێت، یان جاری وایە بە ئاو هەر لاناچێو ماددەیەکی دیکەی پێویستە! کەواتە: گوناهەکانیش وانو هەموو گوناحێك بە هەموو داوای لێبوردنێك، یاخود بە هەر جۆرە تۆبەیەك لاناچێ، بەڵکو هەر گوناحەو داوای لێبوردنێکی تایبەتی خۆی دەوێ، وە گەڕانەوەو پەشێمانبوونەوەیەکی تایبەتی خۆی دەوێت.

**سیفەتی حەوتەم:** ﴿ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴾، وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کە کردوویانە، لە حاڵێکدا کە دەزانن بەردەوام بوون لەسەر ئەو گوناحە چەند خراپە، بەڵکو زوو دەستی لێ هەڵدەگرن.

**مەسەلەی حەوتەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ﴾، وە ئەوانەی کە ئەگەر فاحیشەیەکیان ئەنجامدا، کە وەك پێشتر باسمان کرد ئەنجامدانی فاحیشە بە قسەش دەبێو، بە کردەوەش دەبێ، بە بەڵگەی ئەوە دەڵێین: بە قسە دەبێ، چونکە خوا ﷻ دوای بڵاوبوونەوەی بوختانی داوێن پیسیی بۆ دایکمان عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ-، ئەو ئایەتانەی کە لە سووڕەتی (النور) ناردنیە خوار، لە میانەی ئایەتەکاندا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ١٩ ﴾، واتە: ئەوانەی پێیان خۆشە فاحیشە لە نێوان مسوڵماناندا بڵاوبێتەوە (کە لێرەدا مەبەست لە بڵاوبوونەوەی فاحیشە قسەی خراپو بوختانی داوێن پیسی بۆ یەکدی کردنو قسەی ناقۆڵایە) کەواتە: قسەی خراپیش فاحیشەی پێ دەگوترێ وەك چۆن کردەوەی خراپ فاحیشەی پێ دەگوترێ.

وە بەکارهێنرانی وشەی (فاحشة) بۆ کردەوەی خراپ لە قورئانێ دا زۆرە بۆ نموونە: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الإسراء.

**مەسەلەی هەشتەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ ﴾، بۆ گوناهەکانیان داوای لێبوردن دەکەن، واتە: لە پەروەردگار، وە چەند فەرموودەیەك دەربارەی داوای لێبوردنکردنو تۆبەکردن هەن، کە ئێمە هەندێکیان بە نموونە لێ دەهێنینەوە:

**فەرموودەی یەکەم:** {عَنْ أَبُو بَكْرٍ ﷺ قَالَ سَمِعْتُ رَسولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ ثُمَّ يُصَلِّي ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلاّ غَفَرَ لَهُ} رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٤٠٦)، وابن ماجه برقم: (١٣٩٥)، وَحَسَّنَهُ العلامة الألباني في (المشكاة) برقم: (١٣٢٤)، واتە: ئەبو بەکری صیددیق - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: هیچ پیاوێك (ی مسوڵمان) نیە گوناهێك بکات، دوایی دەستنوێژ بگرێو پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، ئنجا داوای لێبوردن بکات، (لە دوای ئەم دوو ڕکات نوێژە داوای لێبوردن بکات بۆ گوناهەکەی) مەگەر خوا لە گوناهەکەی دەبوورێ.

**فەرموودەی دووەم:** {فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ} رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم:(٣٩١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم:(٢٧٧٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣١٨٠)، وَالنَّسَائِي في (الكُبرى) برقم: (٨٩٣١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٢١٢)، واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندە کاتێك دانی بە تاوانو هەڵە کەموکووڕیی خۆی داهێنا، پاشان گەڕایەوە بۆ لای خوا، خوا دەگەڕێتەوە سەری بە بە بەزەییو، تۆبەو گەڕانەوەو پەشێمانبوونەوەکەی قبووڵ دەکا، هەر گوناهێك بێ[1].

---

١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە قسەی خۆمەو بەڵگەکەشی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بە ڕەهایی باسی گوناهی کردوە.

**فەرموودەی سێیەم:** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ، يُذْنِبُونَ، فَيَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٨٠٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٤٩)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان) برقم: (٧١٠٢)، واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ئێوە گوناهان نەکەن، خوا ئێوە لادەبا، وە کۆمەڵێکی دیکە دێنێ کە گوناح بکەن، ئنجا داوای لێبوردن بکەن، خواش لێیان ببوورێ، واتە: ئەگەر ئێوە واتان لێبێ هیچ گوناهتان نەبێ، خوا ئێوە لادەبا، چونکە پێی خۆشە لە بەندەکانی ببوورێ، مادام هیچ گوناهان نەکەن‌و لێتان نەبوورێ، ئێوە لادەبات‌و کەسانێکی دیکە دێنێ کە گوناهان بکەن‌و داوای لێبوردن بکەن، ئەویش لێیان ببوورێ، لێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا پێی خۆشە لە بەندەکانی ببوورێ، یانی: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتەکەدا ئەوەیە، دیارە ئێمە دەبێ وەك خۆی ڕێك‌و چاك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ حاڵی بین، واتە: پێچەوانەی مەبەستەکەی خۆی لێی تێنەگەین، ئەوەی چاك لەو فەرموودەیە تێنەگات، پێی وایە پێغەمبەر ﷺ مسوڵمانان هاندەدات لەسەر گوناهان، بۆ ئەوەی گوناهان بکەن، پاشان داوای لێبوردن بکەن!! نەخێر، خوا پێی خۆش نیە بەندەکانی گوناهان بکەن، بەڵام خوا پێی خۆشە لێیان ببوورێ، وە بەشی ئەوەندەش گوناهان هەر دەکەن، بۆیە پێویست ناکات بە ئەنقەست بیکەن، بەڵام ئەگەر بەندە گوناهێکی لەدەست قەوماو لێی پشکووتەوە، ئەوە نابێ لەخۆی بێئومێد بی، با بزانێ خوا پێی خۆشە داوای لێبوردنی لێ بکات‌و تۆبە بکات، ئەویش لێی خۆشبێ، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئا ئەوەیە، ئەگەرنا مەبەستی ئەوە نیە کە دەی مسوڵمانان زۆر گوناهان بکەن، بۆ ئەوەی داوای لێبوردن بکەن، تاکو خوای پەروەردگار لێتان خۆشبێ !!

**مەسـەلەی نۆیـەم:** خـوا ﷻ کـە دەفـەرموێ: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، واتە: لە پـێش ئێوەدا چەند یاسایەك تێپـەڕیون، چەند بڕیارێك لەلایەن خـواوە، دراون، بـە زەوی دا بـڕۆن سـەرنج بـدەن، سـەرەنجامی بەدرۆدانـەران چـۆن بـووە؟! واتـە: ئەوانـەی پـێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆ دانـاوە، کتێبەکانی خۆیان بە درۆ دانـاوە، لێرەدا ئەم ئایەتە ئەوەی لـێ وەردەگیـرێ کە خـوای کاربـەجێ دروستکراوەکانی خـۆی بەپـێی چـەند یاسـایەك بـەڕێوە دەبـا، (سُنَن) کـۆی (سُنَّة)، (سُنَّة)یـش واتـە: یاسـا، بڕیـار، چونکـە (طبري) لـەبارەی چـەمكو واتـای وشـەی: (سُنَن)ەوە، گوتوویـەتی: (وَأَمَّـا"«السُّنَن» فَإِنْهَـا جَمْـعُ «سُـنَّةٍ»، «وَالسُّنَّةُ»: هِـيَ الْمِثَـالُ الْمُتَّبَـع، وَالإِمَـامُ الْمُؤتَمُّ بِـهِ. يُقَـالُ مِنْـهُ: «سَنَّ فُلانٌ فِينَـا سُنَّةً حَسَنَةً، وسـنّ سُـنة سيئة»، إذا عمـل عمـلاً اتبِّـع عليـه مـن خـير وشـر)، واتـە: (سُنَن) کـۆی (سُنَّة)ە، (سُنَّة)ش شـتێکە کـە چـاوی لـێ کرابـێو دووبـارە کرابێتـەوە، وە پـێشەوایەك کـە ئیقـتیدای پـێ کرابـێو کرابێتـە سـەرمەشـق، دەگـوترێ: (سَنَّ فُلانٌ فِينَـا سُنَّةً حَسَنَةً) واتـە: فـلان کـەس ڕێیەکـی باشـی لـەنێودا دانـاین یاخـود (سنّ سُنة سيئة) ڕێیـەکی خراپـی لـەنێودا دانـاین، لـە کاتێکـدا کـە کـارێك دەکاو خەڵکی دیکە بە دوای ئەودا ئەو کـارە دەکات، جا چ کارەکە خێـر بـێ، چ خـراپ بـێ، کەواتـە: (سُـنَّةِ) یـانی: یاسـا، وە (قـانون) بـە زاراوی ئەمـڕۆمـان، ئنجا لێرەدا خـوای زانـاو توانا بۆمـان دەردەخـاتو دیـاریی دەکـات کە دەبـێ ئێمە یاساکانی خـوا لە ژیـانی بەشـەردا چۆن بدۆزینـەوە؟ دەفـەرموێ: ﴿ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ ﴾، بـە زەوییـدا بـڕۆنو سـەرنج بـدەن، کەواتـە: گـەڕان بە زەوییـداو گـەڕان بـە شـوێنەواریی میللـەتانی پـێشوودا، دەبێتـە هـۆی ئەوە کە یاسـاکانی خـوا بدۆزینەوە، جا ئەو گەڕانـە چ گـەڕانی جەسـتـەیی بـێ، چ مەعنـەویی و زەینـیی بـێ، بـە شـوێنەوارەکـاندا بـڕۆ، تەماشـای شـوێنەواری عـادو سـەموود بکـە، تەماشـای شـوێنەواریی ڕۆمو فـارس بکـە، وە تەماشـای

شـوێنەواریی فیـرعەونییەکان بکـە، کـاتی خـۆی چ دەسـتەڵاتێکیان هـەبووە، هەرەمـەکانی میـسر، دەبـێ چەند کەسی هەژارو نەدارو کەسانی ژێردەستو زەبوون دروسـتیان کردبـێو لـە سـوخرەو بێگاردا فەوتـابن؟! وە ئەوانە چەند دەسـتەڵاتداربوون! کەچـی کـوا ئێـستا چـییان لـێهات؟ نـە ناویـان مـاوە، نـە نیـشانەیەکیان مـاوە، ئـەوە هـەمووی دەرسـی لـێ وەردەگیـرێ، جا خـوا بۆمـان دیاری دەکات کە بە زەوییدا بڕۆین چ گـەڕانی جەسـتەیی، چ گـەڕانی زیهـنیی، کە مێژوو بخوێنیـنەوەو سەرنج بدەین، ئـەوەش هەر گەڕانـە، کە بـە تەئکید ئەگـەر بگونجـێ گـەڕانی جەسـتەیی گـەڕانی زیهـنیـشیی لەگەڵدایـە، وە زۆر کاریگەرتریـشە، کاتێـك ئینسان تەماشـای شـوێنەواریی پێشووەکان دەکات، وە خـوای زانـاو شـارەزا لە قورئانـدا ئاماژەی کـردوە بـە زۆر لـە یاساکانی خـۆی، بـۆ وێنـە: یـەکێك لـەوانە لـە ئایـەتی (١٦)ی سـوورەتی (الإسـراء)دا دەفـەرموێ:

﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ ﴾، واتـە: هـەر کاتێـك ویـستمان شارێـك (وڵاتێـك) لەبەیـن بەریـن، فەرمـان دەکـەین بـە خۆشـگوزەرانەکان کـە چاکەی تێدا بکـەن، کەچـی ئـەوان خراپـەی تێـدا دەکـەنو، سـەرەنجام بڕیـاری خـوایان لەسـەر دێتـە دیو کاولـی دەکـەین، واتـە: یەکێـك لـە هۆکارەکـانی کاولـبوونی وڵاتـان بریتیـە لـە چـی؟ بریتـیە لە تێپەڕانـدنی خۆشـگوزەرانان لە فیسقو فوجورو خراپـەدا.

هەروەها یەکێکی دیکە لـە یاساکانی خـوای بـێوێنـە ئەوەیـە کـە لـە ئایـەتی ژمـارە: (٢٧)ی سـووڕەتی (إبـراهیم)دا دەفـەرموێ: ﴿ ... وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ... ﴿٢٧﴾ ﴾، لـە شـوێنێکی دیکـەی قورئانـدا خـوای دادگـەر دەفـەرموێ: ﴿ ... يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ... ﴿٨﴾ ﴾فاطـر، واتـە: هەرکەسێکی بیەوێ گومڕای دەکـات، وە هەرکەسـێکی بیـەوێ ڕێنمـایی دەکات، باشـە خـوا کـێ گومڕا دەکـات، هـەر لەگـۆترە خەڵـکی گـومـڕا دەکـاتو سـەری لـێ دەشـێوێنـێ؟! نـەء، لـەم ئایەتـەی سـەرەوە بۆمـان دەردەخـات کـە خـوای

داداگەر کێ گومڕا دەکات، دەفەرموێ: ﴿... وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ... ﴿٢٧﴾﴾ إبراهيم، واتە: وە خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، کەواتە: خوا هەر لەخۆڕا خەڵکی گومڕا ناکات، ئەوەی ستەمکاربێو خراپەکاربێ خوا گومڕای دەکات، هەروەها ئایا خوا کێ هیدایەت دەدا؟ کە دەفەرموێ: ﴿... يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ ... ﴿٨﴾﴾ فاطر، واتە: هەرکەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات، وە هەرکەسێکی بیەوێ ڕێنمایی دەکات، ئێستا ئەوە زانیمان کێ گومڕا دەکات، کە زاڵمانو ستەمکارانو خراپەکاران، بەڵام ئەدی کێ ڕێنمایی دەکات؟ لە ئایەتی (٢٧)ی سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ: ﴿... وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴾، واتە: خوا ڕێنمایی کەسێك دەکات بەرەو لای خۆی کە بەرەو لای خوا گەڕابێتەوە، کەواتە: خوای بەرز کەسانێك کە لەدڵەوە بەرەو خوا دەگەڕێنەوە، ڕێنمایی یان دەکات، کەسانی ستەمکارو خراپەرکاریش گومڕا دەکات.

**مەسەلەی دەیەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، دوای ئەوەی چەند ڕاستییەك ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ئەوە ڕوونکردنەوەیە بۆ خەڵك، وە ڕێنمایيو ئامۆژگارییە بۆ پارێزکاران، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە هەرکەسە بەقەدەر تواناو ئامادەیی خۆی لە قورئان بەهرەمەند دەبێ، هی وا هەیە تەنیا بەرچاوڕوونییەك لە قورئان وەردەگرێ، بەڵام هی وایە ڕێنماییشی لێ وەردەگرێ، ئامۆژگاریشی لێ وەردەگرێ، لەڕاستییدا ئینسان لەقەدەر توانای خۆی، وە لەقەدەر چوونە پێشی خۆی لە قورئان، لێی بەهرەمەند دەبێ، وە بە ئەندازەی ئەوەی کە خۆی لێ بەدوور دەگرێ، کەمتر لێی بەهرەمەند دەبێ.

**مەسەلەی یازدەیەم:** خوای پەروەردگار لە ئایەتەکانی ژمارە: (١٣٩و ١٤٠و ١٤١)دا دڵی ئیمانداران دەداتەوەو بەرچاویان ڕووناك دەکاتەوە، بە چەند ڕاستییەك لە دە بڕگەدا، کە ئاوا دەست پێدەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟

وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾﴾، بابزانین خوا چۆن لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا دڵی ئیمانداران دەداتەوە:

**بڕگەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُواْ﴾، واتە: مەترسێن یاخود بێهێز مەبن، (وهن) هەم بە بێهێزیی مەعنەویی دەگوترێ، هەم بە بێهزیی ڕواڵەتیی‌و جەستەیی دەگوترێ.

**بڕگەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحۡزَنُواْ﴾، واتە: خەمبار مەبن، خەم مەخۆن، دڵتەنگ مەبن، یانی چی؟ ئینسان دڵتەنگ‌و خەمبار هەر دەبێ، بەڵام یانی با هێندە خەم‌و ماتەمینیی داتاننەگرێ، لە پەلوپۆتان بخات‌و ئەژنۆتان بشکێنێ، تازە تێپەڕیوە، پەندی لێ وەربگرن، بەڵام ڕابردوو مەهێنەوە ئێرەو وات لێ بکات کە دەستت ئیش نەگرێ، وات لێ بکات لە پەلوپۆت بخات، تازە ئەوە تێپەڕیوە دەرسی لێ وەربگرە، جارێکی دیکە دووبارەی نەکەیەوە، بەڵام ڕابردوو واتە: تاڵییەکان‌و ناخۆشییەکانی ڕابردوو مەهێنەوە ئێرە، با ئێستاشت لێ تێک نەدەن تازە تێپەڕیوە، ئاگات لە ئێستابێ، ئەوەی ڕۆیوە لێی گەڕێ، ئەوەی ماوە ئاگات لێی بێ.

**بڕگەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾، واتە: وە ئێوە لەسەرەوە دەبن، ئەگەر ئیمانداربن، بەڵێ ئەم جارە کەوتوونە خوارێ‌و ژێرکەوتوون، ئەوە دیارە، بەڵام ئەو کەوتنە لەبەر ئەوە بووە کە کەموکووڕیی هەبووە لە ئیمانەکەتاندا، بە بەڵگەی ئەوە کە کەموکووڕییتان هەبووە لە ئیلتزام‌و پابەندییتاندا بە فەرمان‌و

تەوجیهاتی پێغەمبەرەوە ﷺ، هیچ کاتێکیش ئینسان لە کردەوەدا کەموکووڕیی نابێ ئەگەر لە ئیمان دا کەموکووڕیی نەبێ، وەك کوردەواریی دەڵێن: (ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە)، ئاو کە لە سەرچاوە لێڵ بوو، لە جۆگایەش لێڵ دەبێ، ئەگەر خەلەل لە ئیماندا هەبوو لە ئیلتزامو کردەوەکانیشدا دەبێ، بەڵام ئەگەر ئێوە ئیمانداری باش بن، هەر ئێوە لەسەرەوە دەبن.

**بڕگەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە برینێکتان تێبووەو ئازارێکتان پێگەیشتوە، ئەو خەڵکەش، واتە: خەڵکەکەی بەرانبەرتان، دوژمنەکانیشتان ئەوانیش برینیان تێبووە، برینەکەش ئەوەیە کە هەر لە جەنگی ئوحودیشدا، ئەوانیش بیست، سی کەسیان لێ کوژرا، وە لە سەرەتای جەنگەکەوە شکستیان هێنا، ئەگەر مەبەست پێی هەر جەنگی ئوحود بێ، ئەگەر مەبەستیش پێی جەنگی (بەدر)بێ، لە جەنگی (بەدر)یشدا (٧٠)یان لێ کوژرا (٧٠)شیان لێ بە دیل گیرا، ئەوە وەك ئایەتی ژمارە (١٠٤)ی سووڕەتی (النساء)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ ....إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە ئازارو ئێشتان پێبگات، ئەوە دوژمنەکانیشتان ئێشیان پێدەگات، وەك چۆن ئێوە ئێشتان پێدەگات، بەڵام جیاوازییتان هەیە، ئێوە ئومێدێك لە خوا دەکەن، شتێك لە خوا چاوەڕێ دەکەن، کە ئەوان ئەو چاوەڕوانییەشیان نیە، وە خوا زانای کاربەجێیە.

**بڕگەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ﴾، لێرەشدا دیسان خوا ڕاستییەکی دیکە دەخاتە بەرچاوی ئیمانداران، کە دەستاودەست پێکردنو نۆرە کردن هەیە لە مەسەلەی بردنەوەی جەنگو دۆڕاندندا، واتە: ئەگەر جارێك جەنگت دۆڕاند، مانای وانیە کە تۆ ناهەقی، وە ئەگەر جارێك جەنگت بردەوە، مانای وانیە کە هەمیشە

جەنگ دەبەیتەوە، ئەو جارەی جەنگت بردۆتەوە، لەبەر ئەوە بووە کە هۆکارەکانی بردنەوەی جەنگت دەستەبەر کردوون، وە ئەو جارەی کە دۆڕاندووتە، لەبەر ئەوە بووە کە هۆکارەکانی بردنەوەت دەستەبەر نەکردوون، یانی: خەلەل‌و کەموکووڕیی‌و کەلێن هەبووە، بۆیە ئەو جەنگە دۆڕاوە، جا ئینسان ئەگەر ئەو حەقیقەتەی زانی، کە تووشی نسکۆیەك بوو، ئەژنۆی ناشکێ‌و دەڵێ: سوننەتی خوایەو دیارە کەموکووڕییم هەبوون، لە جیاتی ئەوەی ئەژنۆی بشکێ، چاو بەخۆیدا دەگێڕێتەوە، بزانێ خەلەل‌و کەموکووڕییمان لە کوێدا هەبووە، پڕی بکەینەوەو جارێکی دیکە تووشی ئەو شکست‌و تێشکانە نەبینەوە.

**برگەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، وە بۆ ئەوەی خوا ئیمانداران بزانێ، خوا ئەوانە بزانێ کە ئیمانیان هێناوە، واتە: بۆ ئەوەی بە کردەوەو بە زمانی حاڵ ئیمانداران بزانرێن‌و بناسرێن، ئەگەرنا خوا هەر دەیانناسێ، ئایا پێش ئەوەی جەنگی ئوحود بکرێ، خوای پەنهانزان نەیدەزانی کێ ئیمانی چەندەو، چۆنە؟ با، ئەدی لێرەدا مەبەست چییە؟ واتە: بە زمانی حاڵ‌و واقیع، دەنا خوا ﷻ دەیتوانی خەڵك هەر نەهێنێتە دنیاو هەر یەکسەر لە ڕێوە هەندێکیان بەرێتە بەهەشت‌و هەندێکیان بەرێتە دۆزەخ‌و، بفەرموێ: دەمزانی ئەگەر بشمبردبای بۆ دنیا، هەر چاکەکار دەبووی، بەوی دیکەش بفەرموێ: تۆ هەر خراپەکار دەبووی ! بەڵام نا، دەبێ بە زمانی حاڵ‌و واقیعی خۆیان، کوفرو ئیمان لەخۆیاندا بەرجەستە بکەن، بۆ ئەوەی کە هیچ کەس بەڵگەو بیانووی نەبێ، ئەگەرنا خوای پەروەردگار هەموو شتێکی لە ئەزەلەوە زانیوە.

**برگەی حەوتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَ ﴾، ئەوەش دڵدانەوەیەکی دیکەیە، واتە: ئەگەر جەنگو جیهاد نەیەتە پێش، خوای کاربەجێ چۆن ئەو شەهیدانەتان لەنێودا هەڵدەبژێرێ، چۆن گوڵبژێرتان بکات؟ ئەوانەی شایستەی ئەوەن خوای پەروەردگار پلەی

بەرزی شەهیدییان بە قسمەت بكات، ئەگەر جەنگو شەڕو كوشتار نەبێ، شەهیدتان چۆن لەنێودا پەیدادەبن؟!

**بڕگەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە خوا ستەمكارانی خۆشناوێن، جا ئەوە هەردووكی دەگرێتەوە، واتە: ئەو كافرە ستەمكارانەی خۆشناوێ، بۆیە دەفەرموێ: جەنگو جیهادیان لەگەڵدا بكەن، وە ئەگەر مەبەستی ئەو مسوڵمانانەبێ، كە هەڵەو كەموكوڕییان بووە، واتە: ئەو مسوڵمانانەی زوڵمیان كردوە، خوا خۆشی ناوێن، بۆیە ئاوا تووشی ئازارو نارەحەتییو خەفەتی كردوون، یانی: لەو هەڵوێستەیاندا خۆشی ناوێن، نەك بە ڕەهایی، بەڵام مانای یەكەم بەهێزترە.

**بڕگەی نۆیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوەش حیكمەتێكی دیكەی جەنگو جیهادە، كە خوا دەیەوێ ئیمانداران لە بێژینگ بداو بیانپاڵێوێ، واتە: ئەو خڵتەو خاڵەی لە دەروونیاندا هەیە، وە ئەو كەموكوڕییانەی كە تێیاندان، لایانبەرێ، دیارە كاتێكیش ئینسان خۆی بۆ دەردەكەوێ، كە دەكەوێتە تەنگانەو سەغڵەتیی، ئەگەرنا لە شێنەییدا هەموو كەس ئازایەو هەموو كەس مرۆڤی چاكە، بەڵام كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (تینی یەكانەو قسەی بەر ئاگردانی زۆر لەیەك جیان)، ئەو قسانەی كە ئینسان لەبەر ئاگردانێ دەیانكات، لەگەڵ ئەوەی كە یەكانە هێرشی بۆ بكات، زۆر لێك جیان.

**بڕگەی دەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، بۆ ئەوەی بیبڕوایان لەبەین بەرێ، كزو بێ شەوقیان بكات، ئەوەش دیارە بەوە دەبێ كە جەنگو جیهاد هەبێ، ئەگەرنا كافران هەر لە خۆڕا لەبەین ناچن.

**مەسەلەی دەیەمو كۆتایی:** خوا ﷻ لە حەوت ئایەتی كۆتاییدا لە حەوت خاڵاندا، سەركۆنەی بڕواداران دەكات، وە هەڵەو كەموكوڕییەكانی خۆیانیان دەخاتە بەرچاو:

**خاڵی یەکەم:** دەفەرمویٚ: ﴿ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، ئایا پێتان وابوو بچنە بەهەشتی بەرلەوەی خوا ئەوانەتان کە تێدەکۆشن لە ڕێی خوادا، وە ئەوانەتان کە خۆڕاگرن، بۆی دەرکەون ؟! یانی: بە زمانی حاڵو کردار بۆی دەربکەون، واتە: هەرکەسێك پێی وابێ بەبێ جەنگو جیهاد بەبێ خۆڕاگرییو تێکۆشانو بەبێ فیداکاریی دەچێتە بەهەشت، خەیاڵ پلاوی کردووە با مسوڵمانان جارێکی دیکە خەیاڵ پلاو نەکەن، تا ئاوا خوای پەروەردگار تووشی سەختییو نارەحەتییان نەکات، وە سەرەنجام تێکۆشەرانو خۆڕاگران جیانەبنەوە، لەوانەی کە ئامادەنین فیداکاریی بکەنو خۆڕاگر نابن، وە شایستەی چوونە بەهەشت نابن.

**خاڵی دووەم:** ﴿ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴾، ئێوە مردنتان بە خۆزگە دەخواست پێش ئەوەی پێی بگەن، دەی ئەوە بینیتانو تەماشاتان دەکرد، لێرەدا خوای بەرزو بێ وێنە سەرزەنشتێکی دیکەیان دەکات، کە جارێکی دیکە لەقەدەر خۆیان قسە بکەن، ئینسانی وا هەیە لە شێنەییدا بەرەی دادەڕێ، بۆیە کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ئەوەی زۆر بخوڕێ کەم دەبڕێ)، ئینسان وا باشە زۆر نەخوڕێو زۆر هەڕەشەو گوڕەشە لە شێنەییدا نەکا، نەوەك کە کەوتە تین، وا دەرنەچێ، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (لە ئاوی مەند بترسێ)، هەمیشە ئاوی خوڕ تەنکەو، ئەو ئاوانەی خوڕە خوڕیان دێ، تەنکن، ئاو کە قووڵ بێ دەنگی نایەتو بە وشە وشێکەوە دەڕوا، ئینسان بۆیە لە شێنەییدا زۆر قسە نەکا باشە، تاکو لە تینو تەنگانەدا ئەگەر باشیش دەرنەچوو، دوایی قسەکانی بەچاودا نادرێنەوە، دیارە هەندێك لە هاوەڵانی بەرێز - خوا لێیان ڕازی بێ- وەك بڵێی زۆر بەرەیان دادڕیوە، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا باسمان کرد، گوتوویانە: وا دەکەینو وا دەچینو وا

دەبــێ !! دوایــی واش دەرنەچــوون، بــەڵام ئــەوە بــۆ زانیارییتــان کــەمێك وا بــوونو ئــەو ســەرزەنــشتە ڕوو لــە کــەمێکیان دەکــات، ئەگــەرنا زۆربــەی هــاوەڵان - خــوا لــێیان ڕازی بــێ- بــەو شــێوەیە بــوون، کــە لــە ئایەتــەکــانی دیکــەدا خوا مــەدحیــان دەکات.

**خاڵی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ﴾، ئەوەش سەرزەنـشتێکی دیکـەیانە کـە دەفـەرموێ: موحەممـەد ﷺ پـێغـەمبەرێکە لە پـێشیـدا پـێغـەمبەرانی دیکە بوون، ئایا ئەگـەر مـرد یاخـود کـوژرا، هەڵدەگـەڕێنەوە؟ هەر کەسـێك لەسـەر دوو پاژنـە پـێیەکـەی هەڵبگەڕێتـەوە، ئـەوە هـیـچ زیانێـك لـە خـوا نـادات، وەك لـە هـۆی هاتنـە خـوارەوەکەیدا باسـمان کـرد، کـە یەکێـك لـە گەرمـەی جەنگەکـەدا گـوتی: (ألا إنَّ مُحَمَّداً قَدْ قُتِلَ) ئاگاداربن موحەممـەد کـوژرا، وە دیاریشـە ئـەوەی کە وایـگوتوە مونافیـق بـووە لەنێـو سـوپای ئیـسلامـدا، یـان کافرێـك بـووە، یان شـەیتانێك بـووەو، ئـەو قـسـەیەی بەگوێدا داون، وە کاتێـك ئـەو قـسـەیە کرا، هەندێ لە هـاوەڵان ئەژنـۆیـان شکا، هەتا دەڵێن: هەندێکیان چەکەکانیان دانـاو مـامی ئەنەسـی کـوڕی مالـیك (أنس بن النَّضْر) بـەلایانـدا تێپـەڕی گوتی: ئەوە بۆ وا دانیشـتوون، گوتیان: دەڵێن پـێغـەمبـەر ﷺ کـوژراوە، جا لەدوای وی بۆ بژین وە چی بکەین ! ئەویش گـوتی: هەڵـسن دەسـت دەنـەوە چەکەکانتان لەوڕێیەدا شەهیدبن کە ئەو لەسـەری کـوژراوە[1].

وە (أنس بن مالـك) گێـڕاویەتەوە کـە کاتێـك مـامی (أنس بن النّضْر) (سعد بن معاذ) پـێی گەیشت، گوتی: ها سـەعد بۆ کوێ دەچـی؟ من بـۆنـی بەهەشـتێ دەکەم لەلای چیای ئوحـود، ئیدی چوو جەنگا تا شـەهید کـرا[2].

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج: (٣)، ص: (٢٨).
٢) سەرچاوەی پێشوو، ج: (٣)، ص: (٢٨).

دەڵــێ، بــەڵام دوایــە خوشــکەکەی ناســیەوە، کــە حــەفتا هەشــتا برینــی پــێوەبوو، برینــی ڕم‌و شیــرو تیــر! ئنجـا ئــەوە لێــرەدا هــەر مەبەسـت پـێغەمبەر ﷺ نیـە، واتە: ئەو کەسەی کە بـەرپرس‌و فەرماندەیە، ئەگـەر هـات‌و کوژراش، نابـێ خەڵکەکە ئەژنۆی بشکێ، چونکە تۆ خـواپەرستی نەك شـەخص پەرسـت، ئێمـە لـە دەوری مەبـدەء کۆبووینــەوە، نـەك کـەس (شـخص)، وە ئێمـە خـوا دەپەرسـتین، نـەك ئەوانـەی کـە سەرپەرشـتییمان دەکــەن، ئــەو دەڕوا یەکێکــی دیکــە دێ، ئـەویــش دەڕوا، تــۆ بـۆخــۆت خەمـت لەبـەربێ.

**خـاڵی چـوارەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾، واتـە: خـوا پاداشــتی سوپاســگوزاران دەداتــەوە، یــانی سوپاســگوزاران ئەوانــەن کــە خـۆڕاگرن، هـەر کەسـێك صـەبری نەبــێ شــوکری نابــێ، (شـاكر)، واتـە: شـوکرانەبژێـر، وە بـەبـێ خۆڕاگـرتن شـوکرانە بژێـریی‌و سـوپاسگوزاریـی بـۆ خــوا پەیـدا نابـێ، دیـارە ئێـوەش خـۆڕاگر بـوون، بـەڵام ئەوانـەتان کـە خۆڕاگرنـەبوون‌و ئەهلـی سوپاسـگوزاریی‌و پـێـزانین نـەبوون، لـە پاداشـتی خـوا بێبەشـن.

**خـاڵـی پـێنجـەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلًا ﴾، هیچ کەسێك بـۆی نیـە بمـرێ، ئەگـەر بـشیـەوێ بمرێ، بـۆی نیـە بمـرێ مەگــەر بـە مۆڵـەتی خـواو بـە ویـستی خـوا، وە نووسـراویـشەو کاتەکەشـی دیـاری کـراوە، واتـە: مـادام وایــە ئێـوە بـۆ لـە مردنــێ ترسـان‌و پشتتان لە دوژمن کرد؟ لە ڕاستییدا نـە ئـازایەتیی تەمـەنی ئینسان کورت دەکاتەوەو، نە ترسنۆکیی تەمەن درێژ دەکات، چەندە هەر ئەوەنـدە، ئنجا وەك کـوردەواریی خۆمـان دەڵـێن: (هـەتا ئازایـەك دەمــرێ سـەد ترسـنۆك دەمرێ) یان دەڵێن: (ئـازا لـە تەمەنیـدا جارێك دەمـرێ، بـەڵام ترسـنۆك لـە ڕۆژێکدا سـەد جار دەمرێ)، وە بەڕاسـتی وایـەو زۆرکـەس لـە ترسـی مردنـێ مـردوە، هـەر بە زینـدوویی مـردوە !!

**خاڵی شەشەم**: كە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الْآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ﴾، وە هەر كەسێك بەرهەمی دنیای بوێ، بەشی دەدەین، وە هەركەسێك بەرهەمی دوارۆژی بوێ، بەشی لێدەدەین، وە پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە، واتە: ئێوە هەمووتان دوارۆژ ویست نەبوونو، هەتان بوو مەبەستیان زیاتر دنیا بوو، وە نیەتەكەیان ساغ نەبوو، چونكە جەنگو جیهاد نابێ بە نیەتی دنیاوە بێ، بەڵكو دەبێ بە نیەتی وەدەستهێنانی دوارۆژەوە بكرێ، بە نیەتی وەدەستهێنانی بەهەشتو ڕەزامەندیی خوا، بەڵام ئەگەر نیەتی دنیای تێكەڵ بوو، خڵتەی تێكەڵ بووە، ئەو خڵتە تێكەڵ بوونە، بەرەكەتی لێ لادەباو، نە كەڵكی قیامەتی دەگرێو نە لە دنیاشدا بەرهەمو بەرەكەتو سەركەوتنی بەدوادا دێ، وەك لە ئایەتی ژمارە (١٥٢)دا كە دوایی دەیگەینێ دەفەرموێ: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ ...﴿١٥٢﴾﴾، واتە: هەتانە دنیای دەوێ، وە هەشتانە دوارۆژی دەوێ، كەواتە: لەنێو هاوەڵانی بەڕێزدا هەبووە كە نیەتەكەی تەواو نەبووە، جا یەكێك لە هاوەڵان - وەك دوایی باسی دەكەین- دەڵێ: تا ئەوكاتە من نەمدەزانی لەنێو هاوەڵاندا هی وا هەیە دنیای مەبەستە، وامدەزانی هەمووی هەر دوارۆژی مەبەستە، دەڵێ بەڵام دوایی بۆم دەركەوت، كەسی وامان لەنێودا هەبووە، هەڵبەتە ژمارەیان زۆر كەمبووە ئەوانەی كە زیاتر بە پاڵنەرو هاندەری دنیایی هاتبوون، بۆ ئەو جەنگو جیهادە، وە ئەوانە دوایی ئیشیان لەوانی دیكەش تێكدا.

**خاڵی حەوتەمو كۆتایی**: كە ئەویش هەر بۆ سەرزەنشتە، دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾، خوا ئەوەیان دەخاتەوە بیرو دەفەرموێ: ئێوە دەبوو وەك ئەوانەبن، ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة

والسلام) کەسانی ڕەببانیی لە خزمەتیاندا بوون، کە جەنگیان دەکرد لەگەڵ دوژمناندا، دەبوو ئەوانەتان کردبایە بە سەرمەشق، جا ئەوانە چۆن بوونە؟ شەش سیفەتیان لێ هەڵدەدا، پێشێ دەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ ﴾، خوێنراویشەتەوە (قُتِلَ) واتە: جەنگیان لەگەڵ کردوە، یان لەگەڵی کوژراون (رِبِّيُّونَ كَثِيرُ) واتە: کەسانێکی ڕەببانیی زۆر، کە زۆر سەر بە خوا بوون، یانی: ئێوەش وەك وان بن، شەش سیفەتەکانیش بریتین لە:

**سیفەتی یەکەم:** ﴿ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، نەترسان لەسەر ئەوەی کە لەپێناوی خوادا تووشی بوون، ترسیان نەچووە دڵ.

**سیفەتی دووەم:** ﴿ وَمَا ضَعُفُواْ ﴾، بێهێز نەبوون.

**سیفەتی سێیەم:** ﴿ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْ ﴾، لاڵانەوەو پاڕانەوەو کڕوزانەوەیان نەبوو، وەك بڵێی ملکەچبن بۆ دوژمنو، لە بەرانبەر دوژمندا هەست بە دەستەپاچەییو زەبوونیی بێدەستەڵاتیی بکەن، ئاوە نەبوون.

**سیفەتی چوارەم:** ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، وە خوا خۆڕاگرانی خۆشدەوێن، واتە: خۆڕاگر بوون.

**سیفەتی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ ﴾، واتە: لەکاتی نارەحەتییو ڕووبەڕووبوونەوەو کوژرانو گرفتارییدا، قسەیان هەر ئەو بوو کە دەیانگوت:

أ- ﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا ﴾، پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان بمانبووره.

ب- ﴿ وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا ﴾، وە لە زێدەڕۆییمان لە ئیشو کارماندا بمانبووره.

ج- ﴿ وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا ﴾، وە پێیەکانمان بچەسپێنە.

د- ﴿وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، وە سەرمان بخە بەسەر کۆمەڵی بێبڕواياندا، ئەوە وەك توانجێكيش وايە لەو هاوەڵانە، كە قسەی بێهێزيان كرد، واتە: ئەوان ئەوە قسەيان بووە، ئێوەش جارێكی دی لەكاتی ڕووبەڕووبوونەوەو تەنگانەو سەغڵەتييدا، وەك وانبن و قسەی بێهێز مەكەن، قسەی بێهێز زۆر خراپە، جاری وايە يەك قسەی بێهێز مەعنەوياتی سوپايەك دەشكێنێ، من بۆ خۆم تەجرەبەم هەيە، جاری وايە كەسێك قسەيەكی بێهێز دەكات، كاريگەريی دەكاتە سەر مەعنەوياتی خەڵكێكی زۆر، جاری واش هەيە قسەيەكی بەهێز كاريگەريی ئيجابيی لە مەعنەوياتی خەڵكێكی زۆر دەكات، بنيادەم خوێن و گۆشتە، بۆيەش پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٨١٦٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٥٨٥) وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (١٤٩٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٢)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، واتە: قسەيەكی خۆش، قسەيەكی باش خێرە، هەروەك قسەيەكی خراپيش گوناهە، بۆچی؟ چونكە جاری وايە بە قسەيەك خەڵكی دڵی بەهێز دەبێ، وە جاری واشە بە قسەيەك خەڵكی دڵی بێهێز دەبێ، كەواتە: ئێوەش نەدەبوو ئەو جۆرە قسانە بكەن، كە كردتانن، بە پێچەوانەی قسەكانی ئەو ڕەببانييانەوە بوو.

**سيفەتی شەشەم:** دەفەرموێ: ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، خوا بەرهەمی دنياشی دانێ، وە باشترين بەرهەمی دوارۆژيشی دانێ، واتە: ئەوانە كە خۆيان بۆ خوا يەكلا كردبۆوەو تەنيا مەبەستيان دوارۆژ بوو، وە نەبێ بەرهەمی دنياشيان نەبێ، لە دنياشدا سەريخستن، وە لە دوارۆژيشدا بەرهەمی چاكی دانێ ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، واتە: خوا چاكەكارانی خۆشدەوێن، كەواتە: ئەوانە ئەهلی ئيحسان و چاكەكار بوون، وەك چۆن ئەهلی صەبرو خۆڕاگريی بوون،

وەك چۆن ئەو سیفەتە بەرزانەیان هەبوون، ئێوەش ئەی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر! ﷺ ئەو جۆرە کەسانە بکەنە سەرمەشقی خۆتان لە جەنگو جیهاددا.

دیارە جەنگی ئوحود لە ساڵی سێیەمی کۆچی دا بووە، واتە: سێ ساڵ بووە هەندێك لەو هاوەڵانە هاتوونە نێو ئیسلامەوە، بەڵکو هەندێکیان ڕەنگە تازە هاتبە نێو ئیسلامەوە، وە دووەمین جەنگیان بووە، بەڵام دوایی بە تەئکید هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ کە لە قوتابخانەی قورئان دەرچوون، وە بە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردە کراون، چوونەتە ئاستی زۆر بەرزی ئیمانییەوە، بەڵام ئەوە جارێ سەرەتایان بووە، بۆیە خوای پەروەردگار ئاوا خاڵە بێهێزەکانیان بۆ دەست نیشان دەکات، وە پەنجەیان دەخاتە سەر، تاکو کەموکووڕییەکانی خۆیان بزانن، وە جارێکی دیکە ئەو هەڵەو کەموکووڕییانەیان لێ نەپشکوێتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان تەفـسیری ئایەتـەکانی: (١٤٩) تـاکو (١٥٥) دەگرێتـە نێوخـۆی، واتە: حـەوت ئایەت، کە لەم ئایەتـانەدا خـوای پەروەردگـار فـەرمان بـە مـسوڵمانان دەکـات بـە قـسەی کـافران نەکـەنو، ئەگـەر بێـتو بـە قـسەیان بکـەن، پاشـگەزیان دەکەنـەوە، وە پـێـیان ڕادەگەیـەنێ کـە تـەنیا خـوا پـشتیوانیانە، وە خـوا پـێـیان ڕادەگەیـەنێ کـە بەڵـێنی پـێـداون بـەوە کـە ترسـیان بخـاتە دڵـی دوژمـنو بێبـڕوایانەوە، وە باسـی ڕاسـتبوونی بەڵـێنی خـۆی لەگـەڵ بڕوادارانـدا دەکـات، وە سەرکەوتنیان لە جەولەی یەکەمی جەنگی ئوحـود دا، هەتا ئـەو کـاتەی گیـرۆدە بـوون بـە سەرپـێـچییکردن لـە فـەرمانی پـێغـەمبەرەوە ﷺ، وە پاشـان چۆنیەتی پاشەکشەو هەڵاتنیان دەخـاتەڕوو، وە حیکمەتی ئەو تێشکانە بـاس دەکـات، دوایـی باسـی دابەزانـدنی ئـارامیی‌و سـووکە خـەوێك بەسـەرداهێنانیان، وە بـاسـی هەڵوێـستی ئیمـان لاوازەکـانو دڵنەخۆشـەکان، دەکـات، وە جـارێکی دیکـە باسـی حیکمـەتی ئـەو تێـشکانەی جـەنگی ئوحـود دەکـات، وە پاشـان باسـی هۆکـاری ئـەو تێـشکانەیان دەکـات کـە بریتـی بـوو لـەوەی: شـەیتان بەهـۆی کـردەوەی پـێشوویانەوە هەندێکیانی خلیـسکاندبووو لـە خـشتەی بردبـوون، وە لـە کۆتاییـدا باسی لـێبوردنی خـۆیو چاوپۆشییـکردنی خـۆی لـێیـان دەکـات.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ
فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى فِى
قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًاۖ
وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ
إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ
بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ
ٱلْءَاخِرَةَۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْۗ وَٱللَّهُ ذُو
فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ
يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا
فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم
مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ
يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍۗ قُلْ إِنَّ
ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ
شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَاۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ
مَضَاجِعِهِمْۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ
بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ
بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە! ئەگـەر بێـتو فەرمانبـەریی ئەوانـەی بێبــڕوان بکەن لەسـەر پاژنـە پـێـیەکانتان دەتانگێڕنـەوە (بـەرەو کوفر)و سەرەنجـام زیانبار دەبــن ﴿١٤٩﴾، (پـشت بـە غـەیری خـوا مەبەستن)بەڵـکو هـەر خـوا پـشتیوانتانە، وە ئـەو باشتـرینی وەسەرخەرانە ﴿١٥٠﴾ بە زوویی تـرسو بـیم دەخەینـە دڵی ئەوانـەی بێبــڕوان، لـە سۆنگەی ئـەوەوە کـە شــتانێکیان کردۆتـە هاوبەشـی خــوا، کـە هـیچ بەڵگـەی لەسـەر نەناردونـە خــوار، وە جێـی حەوانـەوەیان ئـاگرە، ئـەو (ئـاگر)یـش خراپتــرین نـشینگەی ستـەمکارانە ﴿١٥١﴾ وە بێگومـان خــوا بەڵـێنی خـۆی لەگـەڵ ڕاست بردنەسـەر، ئـەوە بـوو کـە (لـە سـەرەتاوە) بـە مۆڵـەتی خــوا بێهەســتتان دەکـردن، (وە ئـەوە بـەردەوام بـوو) هـەتا کاتێـك بێهـێزبوونو لـە کاروبـاردا ناکـۆك بـوونو پـاش ئـەوەی، ئـەوەی پـێشاندان کـە حـەزتان لـێ دەکـرد (کـە سـەرکەوتنو دەسـتکەوت بـوو) هـی واتـان هەیـە دنیـای مەبەستەو، هـی واتـان هەیـە (پاداشـتی) دواڕۆژی مەبەسـتە، دوایـی ئێـوەی لــەوان لادا، تـاکو تاقیتـان بکاتـەوە، وە بێگومـان لێتــان بـورد، وە خــوا خـاوەن بەخشـشە بەسـەر بڕوادارانـەوە ﴿١٥٢﴾ (یادبکـەنەوە) کاتێـك (بـۆ خـۆ قوتـارکردن) دوور دەڕۆیـشتنو ئاوڕتـان لـە کـەس نەدەدایـەوەو پـێغـەمبەریش لـە دوای دواوەتـان بانگـی دەکـردن! ئیـدی خــوا (لـە تۆڵـەی ئـەوەدا) خەفەت لەسەر خەفەتی تووشکردن، بۆ ئەوەی (بـەو ئـێشو ژانـانە ڕاتانـبهـێنـێو) خەمبـارنەبن، نە لەسەر ئەوەی کە لـە دەستتان چووەو، نـە بـەهۆی ئەوەشـەوە کـە بەسەرتان هـاتوە، وە خـوا بەوەی دەیکـەن شارەزایە ﴿١٥٣﴾ ئنجا (خــوا) لـە دوای ئـەو خــەمو خەفــەتە، وەنەوزێکــی هێمنکــەرەوەی نــاردە ســەرتان، کۆمەڵێکتــانی داپۆشــیو کۆمەڵـێکیش بــەس خــەمی خۆیانیــان بــوو، گومــانی ناهــەق، گومــانی نەفامیی یان بە خــوا دەبرد، دەیانگوت: ئایـا ئێمە هـیچ شـتێکمان بەدەستـە؟ بڵـێ:

بێگومان ئیش هەمووی هی خوایە، ئەوەی لە دەروونیان دەیشارنەوە بۆ تۆی ناخەنەڕوو، دەیانگوت: ئەگەر شتێکمان بەدەست بووایە، لێرە نەدەکوژراین! بڵێ: ئەگەر هاتباو لە ژوور ماڵەکانیشتان بوونایە، ئەوانەی کوشتنیان لەسەر نووسرابوو، دەهاتنە شوێنی پاڵکەوتنیان، وە خوا (بۆیە وایکرد) تاکو ئەوەی لە سینەکانتان دایە تاقی بکاتەوەو، ئەوەی لە دڵەکانتان دایە بیپاڵێوێ، وە خوا بە نهێنیی سینەکان زانایە ﴿١٥٤﴾ بێگومان ئەوانەتان کە ڕۆژی پێکەوە بەرەنگاربوونەوەی دوو کۆمەڵەکە، پشتیان کرد(ە دوژمن) ئەوە هەر شەیتان بەهۆی هەندێك لەوەی ئەنجامیان دابوو (لە کردەوەی خراپ) خلیسکاندنی، وە بێگومان خوا لێیان بورد، بەڕاستی خوا لێبوردەی هێدی یە ﴿١٥٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مَوْلَىٰكُمْ): واتە: دۆستتان، سەرخەرتان، پشتیوانتان، (الوَلاءُ وَالتَّوالِي: أَنْ يَحْصُلَ شَيْئَانِ فَصَاعِداً حُصُولاً لَيْسَ بَيْنَهُمَا مَا لَيْسَ مِنْهُمَا، وَيُسْتَعارُ ذَلِكَ لِلْقُرْبِ مِنْ حَيْثُ الْمَكَانُ، وَمِنْ حَيْثُ النِّسبةُ، وَمِنْ حَيْثُ الدِّينُ)، وشەی (وَلاءُ وتَوالِي) مانایان ئەوەیە کە دوو شت بەدوای یەکدی دابێن، وە هیچ شتێکی دیکەیان نەکەوێتە نێوانەوە، وە دەخوازرێتەوە بۆ نیزیکیی لە ڕووی شوێنەوە، یاخود لە ڕووی سەرپێی بوونێکەوە، یاخود لە ڕووی دینو مەزهەبو بڕواوە. وشەی: (وِلايَة) بەمانای سەرپەرشتیکردن دێ، یاخود کار بە ئەستۆوە گرتن دێ، وە وشەی: (وَلايَة)ش بەمانای یارمەتییدان دێ، وە وشەی: (الوَلِيُّ والْمَوْلَى: يُستعملان في كُلّ ذلك) هەرکام لە (وَلِيُّ)و (مَوْلَى) بەیەك واتا بەکاردێن، واتە: سەرپەرشتییکردن یاخود سەرپەرشتییکران.

(ٱلرُّعْبَ): واتە: ترس، (الإِنْقِطَاعُ مِنْ امْتِلاَءِ الْخَوْفِ) واتە: ترسێکی وا کە دڵی ئینسان پڕ بکاتو پەکی بخات.

(**سُلْطَـٰنًا**): واتــە: بەڵگــە، (السَّلاَطَةُ: التَّمَكُّنُ مِنَ القَهْرِ... وَسُمِّيَ الْحُجَّةُ سُلْطَانَاً لِسُلْطَتِهِ عَلَى العقُول)، وشەی (سَلاطَةُ) واتــە: کەسێك بتوانێ کەسێکی دیکە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، وە بۆیە (سُلْطَانْ) حوکمڕان پێی دەگوترێ: (سُلْطَانَ) هەروەها بەڵگەش پێی دەگوترێ: (سُلْطَانْ)، چونکە حوکمڕان دەستەڵاتی بەسەر خەڵکدا هەیە، بەڵگەش دەستەڵاتی بەسەر عەقڵی خەڵکدا هەیە، عەقڵی ئینسان ئیقناع دەکات.

(**مَثْوَى**): بەمانای شوێنی حەوانەوە دێ، وشەی (الثَّوَاءُ: الإِقَامَةُ مَعَ الإستقرَار: يُقَالُ ثَوَى يَثْوي ثَوَاءً) وشەی: (ثَوَاء) بەمانای شوێنی جێی نیشتەجێبوونو ئارامگرتن دێ لە شوێنێکدا.

(**تَحُسُّونَهُم**): (حَسَسْتُ، وَحَسَيْت، وَأَحْسَسْتُ: (أ): أَصَبْتُهُ بِحِسِّتِي. (ب): أَصَبْتُ حَاسَّتَهُ. وَعُبِّر بهِ عَنِ القَتْل)، وشەی (تَحُسُّونَهُمْ) لێرەدا بەمانای (تَقْتلُونَهُمْ) دێ، واتە: دەتانکوشتن، چونکە دەڵێ: (الْحَاسَّةُ: القُوَّةُ الَّتِي بِهَا تُدْرَكُ الأَعْرَاضُ الحِسِّيَّة)، (حَاسَّةُ) واتە: هەستەوەر، ئەو هێزەی کە ئینسان شتە بەرهەستەکانی پێ دەزانێ، وەك: هەستی دیتن، هەستی بیستن، هەستی چێژتن، هەستی بۆنکردن، هەستی دەست لێدان، (وَحَسَسْتُ، وَحَسَيْت، وَأَحْسَسْتُ، (أ): أَصَبْتُهُ بِحاسَّتِي؛ (ب): أَصَبْتُ بحَاسَّتَهُ؛ وَعُبِّر بهِ عَنِ القَتْل) ئەم سێ (فعل)ە (حَسَسْتُ، وَحَسَيْت، وَأَحْسَسْتُ) کە بەکاربێن، بەمانای هەستم پێکرد بە هەستەوەرەکانم، وە بەمانای هەستەوەرەکەیم لەکارخست، واتە: کوشتم، دێن.

(**فَشِلْتُمْ**): وشەی (الفَشَلُ: ضَعْفٌ مَعَ جُبْنٍ) بریتییە لە بێهێزیی لەگەڵ ترسان، کەواتە: (فَشِلْتُمْ) واتە: بێهێزبوونو ترسان.

(**صَرَفَكُمْ**): واتە: ئێوەی لادا، (الصَّرْفُ: رَدُّ الشَّيءِ مِنْ حَالَةٍ إِلى حَالَةٍ، أَوْ إِبدَالُهُ بغَيْرهِ، وصَرَفْتُهُ فانْصَرَف)، وشەی: (صَرْفْ) بریتییە لە گۆڕینی شتێك

لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك، یاخود گۆڕینی بە شتێکی دیکە.

(تُصْعِدُونَ ): واتە: دووردەکەوتنەوە، چونکە دەڵێ: (الصُّعُودُ: الذَّهَابُ فِي الْمَكَانِ العَالِي، وَالإِصْعَادُ: الإِبْعَادُ فِي الأَرْضِ، سَواءٌ كَانَ فِي صُعُودٍ أَوْ حُدُورٍ)، (صُعُودُ) واتە: ڕۆیشتن بەرەو شوێنی بەرز، بەڵام (إِصْعَادْ) واتە: بە زەوییدا ڕۆیشتن، جا چ بەرەو هەوراز بچی، چ سەرەو ژێر بچی، فەرق ناکات.

(وَلَا تَلْوُنَ ): واتە: ئاوڕتان نەدەدایەوە، (اللَّيُّ: فَتْلُ الْحَبْلِ، وَلَوَى رَأْسَهُ: أَمَالَهُ، لاَ يَلْوِي عَلَى أَحَدٍ: إِذَا أَمْعَنَ فِي الْهَزِيْمَةِ)، (لَيُّ) بەمانای ئەوەیە کە گوریسێك یان پەتێك بنوشتێنیەوە یان گرێی بدەی، وە دەگوترێ: (لَوَى رَأْسَهُ) واتە: سەری بادا، یان: خوارکردەوە، کە دەفەرموێ: (لا يَلْوِي عَلَى أَحَدٍ) ئەوە بۆ ئەوە بەکاردێ، کە کەسێك وابشکێ و دووركەوێتەوە، کە ئاوڕ لە کەس نەداتەوە.

(غَمًّا ): لە کوردیشدا هەر بەکاری دێنین، دەڵێین: خەم، یان جاری وایە غەمیشی بۆ بەکاردێ، کە بەمانای خەفەت و داخ و حەسرەت بەکاری دێنین، لەچییەوە هاتوە؟ دەڵێ: (الغَمُّ: سَتْرُ الشَيءِ، وَمِنْهُ الغَمَامُ لِكَوْنِهِ سَاتِرًا لِضَوْءِ الشَّمْسِ... وَغُمَّةً: كُرْبَةً، غَمَّ يَغُمُّ غُمَّةً)، وشەی: (غَمٌّ) بریتیە لە داپۆشینی شتێك، هەور پێی دەگوترێ: (غَمَامُ) لەبەر ئەوەی تیشکی خۆر دادەپۆشێ، وە (غُمَّة) بەمانای خەفەت دێ، دەگوترێ: (غَمَّ، يَغُمُّ، غُمَّةً).

(أَمَنَةً ): (أَصْلُ الأَمْنِ طَمْأَنِينَةُ النَّفْسِ، وَ زَوَالُ الْخَوْفِ وَأَمَنَةَ: أَمْن)، وشەی (أمَنةَ: أَمْن) لە بنچینەدا بریتیە لەوە کە نەفسی ئینسان ئارامبگرێ، وە ترسی نەمێنێ، واتە: ئارامیی یان هێمنیی.

(نُعَاسًا ): (النَّوْمُ الْقَلِيلُ) بریتیە لە خەوێکی کورت، وەنەوزیشی پێ دەڵێن، واتە: پێشەکی خەوتن، یاخود خەوێکی سووك.

(أَهَمَّتْهُمْ ): (الْـهَمُّ: الْحَـزَنُ الَّـذِي يُـذِيبُ الإِنْـسَانَ... وَالْهَـمُّ مَـا هَمَمْـتُ بِـهِ فِـي نَفْـسِكَ، وَأَهَمَّنِـي كَـذَا: أَي حَمَلَنِـي عَلَـى أَنْ أَهُـمَّ بِـهِ)، (هَـم) بـەو خـەمو پـەژارەیە دەگـوترێ: کـە ئینـسان بتوێنـێتەوە، وە (هَـمّ) بـەو نیـازو مەبەسـتەش دەگـوترێ کـە بـە دڵـت دابـێ، (أَهَمَّـنِي) واتـە: ئـەو شـتە وایلێکـردم کە بیری لێ بکەمەوەو خەمی لێ بخۆم.

(لَبَرَزَ ): واتـە: دەهاتنـە دەرێ، (البَـرَازُ: وَهُـوَ الفَـضَاء، وَبَـرَزَ: حَـصَلَ فِـي بَـرَازٍ، وَالْمُبَارَزَةُ: الظُهُورُ مِنَ الصَّف)، وشـەی: (بَـرَاز) بەمانـای دەشـتو بیابـان دێ، وە دەگوتـرێ: (بَـرَزَ) واتـە: هاتـە دەشـتەوەو هاتـە گـۆڕێ، (مُبَـارَزَةُ) واتـە: بـۆ یەکدی چوونە مەیدان، لەبەر ئەوەی لە ڕیـزەکان بۆ یەکدی هاتوونە دەر، کـە ئەوە کاتی خۆی هەبووە.

(مَضَاجِعِهِمْ): (مَـضَاجِعَ) کـۆی (مَـضْجِعَ)، (ضَـجَعَ ضَـجْعَاً وَضُـجُوعَاً واضْـطجَعَ: وَضَـعَ جَنْبَـهُ عَلَـى الأَرْضِ الـضَاجِعْ: الكـسْلان)[1]، وشـەی: (مَـضْجِعْ) واتـە: شـوێنی پاڵـکەوتن، جـا چ وەك خـەوتن بـێ، چ وەك پاڵـدانەوەو ئیـسراحەت بێ، چ وەك شـوێنی مـردن بـێ، دەگوترێ: (وَضَـعَ جَنْبَـهُ عَلَـى الأَرْضِ) ئەگـەر ئینسان تەنیـشتی بخـاتە سـەر زەوی، پـێـی دەگوترێ: (ضَـجَعَ)، وە (ضَـاجِعْ) بە ئینسانی تەنبەڵ دەگوترێ، کە هەڵدەخزێو لەسەر کەلەکەی پاڵدەداتەوە.

(ٱسْتَزَلَّهُمُ ): واتـە: خلیـسکاندنی، (الزَّلَّـةُ: اسْتِرْسَـالُ الرِّجْـلِ مِـنْ غَيْـرِ قَـصْدٍ، وَالْمَـزِلَّةُ: الْمَكَـانُ الزَّلِـقُ، وَاسْـتَزَلَّهُ الـشَّيْطَانُ: اسـتجرّهُ الـشَّيْطَانُ حَتَّـى زَلَّ)، وشەی (زَلَّـة) لە کوردیشدا بەکاردێ، دەڵێن: شەیتان زەللەی پێکرد، لـە زمـانی عەرەبیدا بریتیە لەوەی کە ئینسان بـێئەوەی بیەوێ، پـێی بخلیسکێ بـڕوا، وە (مَزِلَّـةُ) بـە شـوێنی لـووس دەگـوترێ، کـە ئینـسان پـێـی لـێ دەخلیـسکێ، (وَاسْتَزَلَّهُ الشَّيْطَانُ) واتە: شـەیتان ڕایکێشاو خلیسکاندی، هەڵیخەڵەتاند.

---

١) المعجم الوسيط، ص: (٥٣٤).

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ (١٥١) ﴾، {عَنْ السُّدِيِّ قَالَ: لَمَا ارتَحلَ أَبُو سُفيانُ وَالْمُشْرِكُون يَوْمَ أُحُدٍ مُتَوجِّهين نَحْو مَكّة، انْطَلَقَ أَبُو سُفيان حَتَّى بَلَغَ بَعض الطّريق، ثُمَّ إنَّهُمْ نَدمُوا فقَالُوا: بِئْسَ مَا صَنَعْتُمْ، إنَّكُمْ قَتَلْتمُوهُمْ، حَتَّى إذَا لَمْ يَبْق إلاّ الشَرِيد تَرَكْتُموهُم! ارْجِعُوا فاستأصِلوهُمْ! فَقذف اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي قُلُوبِهِم الرُّعْبَ، فَانْهَزَمُوا، فَلَقُوا أَعْرَابيّاً، فَجَعَلُوا لَهُ جَعْلاً وَقَالُوا لَهُ: إنْ لَقيتَ مُحَمَّدَاً فَأَخبرهُ بِمَا قَدْ جَمعنا لَهُمْ، فَأَخْبَرَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ رَسولَهُ ﷺ، فطلبهُمْ حَتَّى بَلَغَ حَمْرَاءِ الأسَدِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي ذَلِكَ، فَذَكَرَ أَبَا سُفيانَ حِينَ أَرَادَ أَنْ يرجعَ إلى النَّبِيِّ ﷺ، وَمَا قَذَفَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الرُّعْب قَالَ: ﴿ سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ ﴾}[1]، واتە: سودیی (کە یەکێکە لە زانایان) دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك هاوبەش بۆ خوادانەرەکان ڕۆژی ئوحود (واتە: جەنگی ئوحود) گەڕانەوە بەرەو مەککە (واتە: دوای ئەوەی کە جەنگ کۆتایی پێ هات)، ئەبو سوفیانو ئەوانەی کە لەگەڵی بوون ڕۆیشتن تاکو بەشێك لە ڕێگایان بڕی، دوایی خۆیان لەنێو خۆیاندا پەشێمان بوونەوەو گوتیان: شتێکی خراپتان کرد، ئێوە ئەوانەتان کوشت هەتا تەنیا چەند کەسێکیان لێ مایەوە کە ڕایانکرد، ئنجا وازتان لێ هێنان! بابگەڕێینەوەو یەکجاریی بنەبڕیان بکەین (ئەوان ئاوا تەگبیرێکی ئاوایان بەدڵدا هات) بەڵام خوا (عَزَّ وَجَلَّ) ترسی خستە دڵیانەوە، وە ئەو بڕیارەیان گۆڕیو گەڕانەوە، گەیشتنە عەرەبێکی خێڵەکیی دیارییو خەڵاتێکیان دایە، وە گوتیان: ئەو دیارییو خەڵاتەت دەدەینێ، بەڵام کە گەیشتیە موحەممەد ﷺ هەواڵی

---

١) جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٨٩٢).

پێبدە، کە ئێمە کۆبووینەتەوەو دەمانەوێ دووبارە هێرشیان بکەینەوە سەر، خوا (عَزَّ وَجَلَّ) پێغەمبەری خۆی ئاگادار کردەوەو خۆیو حەفتا لە هاوەڵانی بەڕێزی کە بەشێکیشیان بریندار بوون، بە دوایان کەوتن هەتا ناوچەیەك کە پێی دەگوترێ: (حَمْرَاءِ الأَسَدِ)، ئنجا خوا لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، کە باسی هەڵوێستی ئەبو سوفیانی کرد، کاتێك ویستی بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وە ئەو ترسەی خستە دڵییەوە.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا ﴿١٥٢﴾ ﴾، {قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ كَعْبِ القُرَظِيّ: لَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَصْحابُهُ إِلى الْمَدِينَة، وَقَدْ أُصِيبُوا بِمَا أُصِيبُوا يَوْمُ أُحُدٍ، قَالَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: مِنْ أَيْنَ أَصَابْنَا هَذَا، وَقَدْ وَعَدَنَا اللهُ بِالنَّصْرِ؟! فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ ... ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا ﴾، يَعْنِي الرّمَاة الَّذِينَ فَعَلُوا مَا فَعَلُوا يَوْمُ أُحُدٍ}[1]، واتە: موحەممەدی کوڕی کەعبی قوڕەظیی (کە یەکێکە لە تابعین) دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی بەڕێزی گەڕانەوە بۆ مەدینە، وە ئەوەی تووشیان بوو تووشیان بوو بوو (واتە: ئەوەی کوژرا بوو، ئەوەی بریندار بوو) لە ڕۆژی (ئوحود)دا هەندێك لە هاوەڵانی - خوا لێیان ڕازی بێ- گوتیان: ئەوەمان چۆن تووش بوو، ئەدی خوا بەڵێنی پێ نەدابووین سەرمانخات؟! خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار لە وەڵامیاندا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ ... ﴾، واتە: خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵتان ڕاست بردە سەر، ئەوەبوو کە دەتانکوشتن تا ئەو کاتەی کە تووشی فەشەل (بێهێزیی) بوون بەهۆی

١) أسباب النزول للواحدي، ص: (٧٢).

ئەوەوە کە ناکۆکییتان لە نێوان پەیدابوو (تیرهاوێژەکان زۆربەیان گوتیان: دەچینە خوار، کەمێکیان گوتیان: بابمێنینەوە لەگەڵ فەرماندەکەیان)، وە دوایی سەرپێچییتان لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کرد، دوای ئەوەی خوا شتێکی پێشاندان، کە حەزتان لێ دەکرد (کە سەرکەوتن یاخود دەستکەوت بوو)، جا دەفەرموێ: هەتانبوو دنیای دەویست (واتە: هەندێ لە تیرهاوێژەکان یاخود زۆربەیان) هەشتانبوو دوارۆژی دەویست، ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا تێشکانتان هاتەسەر، نەك خوای بەرزو مەزن بەڵێنی خۆی لەگەڵدا نەبردبنەسەر.

٣/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ﴾، {عَنْ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ رضي الله عنه قَالَ: رَفَعْتُ رَأْسِي يَوْمَ أُحُدٍ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ، وَمَا مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ إِلاَّ وَهُوَ يَمِيلُ تَحْتَ حَجَفَتِهِ مِنْ النُّعَاسِ وَتَلا هَذِهِ الآيَةَ} رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ وَابْنُ جَرِيرٍ وَأَبُو الشيخ وَالبَيْهَقِي في الدلائل[1]، واتە: زوبیری کوڕی عەوام - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: لە جەنگی ئوحود سەرم بەرزکردەوە، تەماشام کرد هیچ کام لەوان (ئەوانەی کە ئەو بینیونی) نەبوو، کە ئاوا سەری لار نەبوبێتەوە لەژێر خودەکەیدا، (یانی: خەویان لێ دەکەوت و وەنەوزیان دەهات)، ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە (کە بەو بۆنەیەوە هاتۆتە خوار)، کەواتە: دیارە هەموویان ئەو سەرخەوەیان شکاندوەو ئەو خەوەیان بەسەر هاتوە، وەك: خوا ﷻ هەر لە دەقی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾، ئەو سەرخەو شکاندنە کۆمەڵێکتانی گرتەوە،

---

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٥٩٦).

ئەوانەی کە ئیماندارى باشبوون، بەلام ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾، کۆمەڵێك بەس لە خەمی خۆیان بوون، ئەوانەی بەس لە خەمی خۆیان بوونو زۆر لە مردنێ ترساون، دیارە خەویشیان لێ نەکەوتوە لە ترسان.

٤/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾، واتە: دەیانگوت: ئەگەر هیچمان بەدەست بووایە لێرە نەدەکوژراین، ئەوانە کێ بوون؟ هەندێك دەڵێن: مونافیق بوون، بەلام من وام بۆ دەردەکەوێ کە ئەوانە مونافیق نەبوون، بەڵکو مسوڵمانی دڵنەخۆش بوون، دڵیان نەخۆشی تێدابووە، نەك نیفاقو نەخۆشیی گەورە، بەلام دیارە گومانیشیان لەدڵدا هەبووە، لەوبارەوە ئەم گێڕانەوەیە هەیە: {رَوى ابْنُ إِسحاق عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: قَالَ الزُّبَيْر ﷺ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي مَعَ رَسولِ اللهِ ﷺ حِيْنَ اشْتَدَّ الْخَوْفُ عَلَيْنَا، أَرْسَلَ اللهُ عَلَيْنَا النَّومَ، فَمَا مِنَّا مِنْ رَجُلٍ إِلاّ ذِقْنَهُ فِي صَدْرِهِ، قَالَ: فَوَاللهِ إِنِّي لأَسْمَعُ قَوْلَ مُعْتِّبِ بْنِ قُشَيْرٍ، مَا أَسْمَعَهُ إِلاّ كَالْحُلْمِ، يَقُولُ: ﴿لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾، فَحَفِظْتُهَا مِنْهُ، وَفِي ذَلِكَ أَنْزَلَ اللهُ: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾، لِقَوْلِ مُعتِّب}[1]، واتە: ئیبنو ئیسحاق ﴿خاوەنی کتێبی (السيرة النبوية)﴾ دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبێر دەڵێ: زوبێرەوە (واتە: بابی) - خوا لێیان ڕازی بێ-، گوتی: خۆمم بینی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە ئەو ترسو هەژمەتەمان لەسەر توونـد بوو لە جەنگی ئوحوددا، (ئەو حەفتا هاوەڵە بەرێزە شەهید کراونو برینداربوون !) نووستن (خەو)یّکی بەسەر داهێنایـن، هیچ کام لە ئێمە نەبوو، مەگەر چەنەگەی بە سینگی دەکەوتەوە، (ئینسان کە دابنیشێو خەوی بێ، سەری شۆڕ دەبێتەوە) دەڵێ: وەڵلاهی من گوێم لە قسەی

---

١) الْمِصباحُ الْمُنير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير، ص: (٢٥٣).

موعەتتیبی کوڕی قوشەیر بوو، کە وەك خەو دێتەوە یادم کە دەیگوت: ئەگەر هیچمان بەدەستی بووایە لێرە نەدەکوژراین (واتە: بەقسەی ئێمە ئەو جەنگە دروست نەبوو، بەقسەی ئێمە نەکرا، ئاوا گلەییان دەکرد) دەڵێ: من قسەکەم لەبەر کرد لەوبارەوەش خوا تبارك وتعالى ئەم ڕستەیەی ناردە خوارەوە، کە دەفەرموێ: هی وایان هەیە دەڵێ: ئەگەر هیچمان بەدەست بووایە، لێرە نەدەکوژراین، خواش بەرپەرچیان دەداتەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هەر لە درێژەی باسکردنی ڕووداو پێشهاتەکانی کە لە جەنگی (ئوحود)دا هاتوونە پێش، ڕوو لە ئیمانداران دەکات، دیارە ئەو کاتە ڕووی لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ کردووە، لە دوای ئەوانیشەوە تێکڕای مسوڵمانان لەبەر ئەوەی خوا ﷻ قورئانی ناردوە بۆ هەموو بەشەر بە پانایی زەمینو بەدرێژایی زەمان، بۆیە نەیفەمووە: (یا صحابة الرسول) یاخود (یا أصحاب الرسول) ئەگەر وای فەرمووبایە، هەر ئەوانی دەگرتەوە، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کەواتە: هەر کەسێك ئیمانی هەبێو بڕواداربێ، ئەم دواندن (خِطاب)ە، دەیگرێتەوە، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر بە قسەی ئەوانە بکەن کە بێبڕوان، وە فەرمانبەرییان بکەن ﴿يَرُدُّوكُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ﴾، هەڵتاندەگێڕنەوە لەسەر پاژنە پێیەکانتانو سەرەنجام زیانبار دەبن، لێرەدا خوای کاربەجێ وەك یاسایەکی گشتی دەیفەرموێ: کە هەر کاتێك مسوڵمانان بکەونە ژێر ڕکێفی کافرانو بەقسەیان بکەن، کافریان دەکەنەوە، وە لە سوورەتی (البقرة)شدا دەفەرموێ: ﴿... وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْ ...﴿٢١٧﴾﴾، واتە: بە بەردەوامیی کافرەکان لەگەڵتان جەنگ دەکەن،

هەتاکو ئەگەر بتوانن هەڵتان بگێڕنەوە لە دینەکەتان، کەواتە: لەم ئایەتە موبارەکەی (البقرة)و لەو ئایەتەی سووڕەتی (آل عمران) کە خەریکی قسە لەبارەوە کردنینی، وە لە ئایەتی دیکەش هەن، بە ئاشکرا ئەوە دەزانرێ، کە مسوڵمانان کاتێك دەکەونە ژێر کاریگەریی کافران، جا کاریگەریی فیکرییان، کاریگەریی فەرهەنگییان، کاریگەریی سیاسییان، لە ڕووی سەربازییەوە، لە هەر ڕوویەکەوە بە قسەیان بکەنو لەگەڵیان دابنو لەژێر ڕکێفیان دابن، ئەوە کەمو زۆر کاریگەرییان بەسەریانەوە دەبێ، وە ئەوەی زیاتر بکەوێتە ژێر کاریگەرییان، دیارە زیاتر لە ئیسلام دووری دەخەنەوە، هەتا ئەگەر بۆیان بکرێ، بە یەکجاریی لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەیبەنە دەر، وە ئەم حەقیقەتە لە ژیانی مسوڵمانانندا ئێستا زۆر بە ڕوونیی‌و بەرجەستەیی دیارە، ئەو شوێنانەی کە کافرانی زلهێز خستوویاننە ژێردەستی خۆیانەوە، وە ئەو کەسانەی کە لە سووڕگەی ئەواندا دەسووڕێنەوەو بە قسەی ئەوان دەکەن، دەبینین کەمو زۆر لە ئیسلام دووردەکەونەوەو، هەیانە یەکجاریی لە بازنەی ئیسلام براوەتە دەرو ئیسلامو ئیمانی لێ داڕنراوە، کەواتە: ئەوە ئاگادارکردنەوەیەك‌و هۆشیارکردنەوەیەکە لەلایەن پەروەردگارەوە، بۆ ئێمە کە لە خۆمان وریابینو بە قسەی کافرەکان نەکەین، وە بە قسەکردنیشیان هەر ئەوەنیە کە سوغرەو بێگارت پێ بکەن، بەڵکو وەختێك دەکەویە ژێر کاریگەریی بیردۆزەکانیانو، دەکەویە ژێر کاریگەریی سیاسەتو دابو، نەریتو ئەو بەهاو ڕەوشتانەی کە هەڵقوڵاوی کوفرەکەیانە، وە لە خولگەی واندا دەسووڕێیەوە، ئەوە هەمووی بە فەرمانبەریی‌و گوێڕایەڵیی کردن بۆ ئەهلی کوفر، لەقەڵەم دەدرێ.

پاشان دەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ﴾، واتە: پشت بە کەس مەبەستنو کەس بە دۆستو پشتیوانی خۆتان مەزانن، بەڵکو بەس خوا دۆستو پشتیوانی ئێوەیەو خوا یارمەتیدەری ئێوەیە، ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلنَّٰصِرِينَ﴾، وە خوا باشترین سەرخەرو باشترین پشتیوانە، ئنجا خوای بێهاوتا ڕاستییەکی گەورە دەخاتە ڕوو، سەبارەت بە مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەهلی کوفردا، لە کاتێکدا کە

لەگەڵ ئەهلی ئیمان ڕووبەڕوو دەبنەوە، دەفەرموێ: ﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا﴾، ئێمە بە تەئكید ترسێكی زۆر دەخەینە دڵی ئەوانەی بێبڕوان، بە هۆی ئەوەوە كە شتێكیان كردۆتە هاوبەشی خوا، كە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوە، واتە: لەبەر ئەو بیروبڕوا پووچەی خۆیان كە بریتیە لە مامەڵەكردن لەگەڵ هەندێك شتدا وەك خوا، كە ئەوە شیركە، چونكە شیرك بریتیە لە چی؟ ئەوەیە كە غەیری خوا وەك خوا تەماشا بكەی، جا چ لەڕووی بەدیهێنەرایەتییەوە، بە دیهێنانی (خلق)ی پاڵدەیەلا، چ لەڕووی یاسا دانانەوە، چ لەڕووی پێشكەشكردنی دروشمەكان (شعائر)ی خواپەرستییەوە، هەر كەسێك وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا بكەی، ئەوە بەشەریكی خوات داناوە، جا لەبەر ئەوەی بێبڕوایەكان هەڵگری بیرۆكەی شیركن، خوا دەفەرموێ: ترسیان دەخەمە دڵ، لەم ئایەتە وەردەگیرێ كە شیرك‌و بێبڕوایی، هۆكاری پڕبوونی دڵی ئینسانە لە ترس، وە بە پێچەوانەوە خوا بەیەكگرتن (توحید)یش مایەی ئازایەتیی‌و بوێریی ئینسانە، چونكە هەر كەسێك بە ڕاستی خواپەرست‌و خواناس بێ، وە بەڕاستی خوا بەیەكگربێ‌و تەنیا خوا بە بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوو پشت پێ بەستراوی خۆی بزانێ، لە هیچ شتێك ناترسێ‌و شتەكانی دیكە هەموو وەك خۆی، كە ئینسانەكانن، یاخود لە خوار خۆیەوە، كە شتەكانی دیكەن، تەماشا دەكات، ﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ﴾، وە جێگاو شوێنی حەوانەوەی بێبڕوایان ئاگرە، (واتە: ئاگری دۆزەخە)، وە خراپترین شوێنی ستەمكارانیش ئاگری دۆزەخە، واتە: بێبڕوایان نە دنیایان هەیە، نە دوارۆژیان هەیە، ئنجا خوا ﷻ لێرەدا وەڵامی پرسیارێك دەداتەوە كە ڕەنگە لە بیرو زەینی هەندێك لە هاوەڵانی بەڕێزدا - خوا لێیان ڕازی بێ-، پەیدابووبێ، وە بۆ ئێمەش كە ئێستا قورئان دەخوێنینەوە پەیدا ببێ، كە خوا دەفەرموێ: ترس‌و بیم دەخەمە دڵی هاوبەش بۆ خوادانەرانەوە، وە دۆست‌و یارمەتیدەری ئیماندارانم، ئێمەش ڕەنگە ئەو پرسیارەمان بۆ دروست بێ: باشە بۆچی

مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا تێشكان؟ وە بۆچی لە گەڵێ ڕووبەڕووبوونەوەی دیکەدا، جاری وا بووە مسوڵمانان تێشكاون؟ خوای زاناو شارەزا، وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥٓ ﴾، وە بێگومان خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ ئێوە ڕاست بردە سەر، دیارە ڕووی دواندن لە هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ، كە لە سەرەتای جەنگەكەوە بەڵێنی خوایان زۆر بە دروشاوەیی‌و بە بەرجەستەكراویی بینی‌و ڕاست دەرچوو، بۆ ئێمەش بە هەمان شێوە، هەموو ئەوانەی كە لە جەنگ‌و جیهاددا بوو ون، بۆیان شتێكی سەلمێنراوە، كە هەتا ئێمە لەگەڵ خوادا ڕاست بوو بین، خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ ئێمەدا ڕاست بردۆتە سەر، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ﴿٧﴾ ﴾ محمد، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر ئێوە خوا سەربخەن، خوا سەرتان دەخات، وە پێیەكانتان دەچەسپێنێ، بەڵام هەمیشە خەڵەل‌و كەموكووڕیی لە ئێمەوە دەبێ، ئەوجار بەڵێن‌و گفتی خوا نایەتە دی، ئنجا ئایا بۆچی بەڵێنی خوا بۆ ئێمە نایەتە دی؟ لەبەر ئەوەی خوا ﷻ لەگەڵ مسوڵمانانیشدا بەپێی یاسا مامەڵە دەكات، مامەڵەی خوای دادگەر لەگەڵ بەشەردا بەگشتی‌و لە نێویشیاندا لەگەڵ ئیمانداران بەتایبەتی، بەپێی یاسایە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ...إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ ... ﴿٧﴾ ﴾ محمد، واتە: ئەگەر خوا سەربخەن، خوا سەرتاندەخات، ئەدی ئەگەر خوا سەر نەخەین؟! وە لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾البقرة، واتە: یادم بكەن، یادتان دەكەم، ئەدی ئەگەر تۆ خوات لەبیر بچێ؟ ئەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ ... نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡ ... ﴿٦٧﴾ ﴾التوبة، واتە: خوایان لەبیرچوو، خواش ئیهمالیكردن، دیارە خوا كەسی لەیاد ناچێ، وەك لێ بێئاگا بوون، ئەدی لێرەدا مەبەستی چییە كە

دەفەرموێ: ﴿فَنَسِيَهُمْ﴾؟ واتە: ئیهمالیکردن، کەسێك کە کەسێکی لەبیرچۆوە واتە: پشتگوێی خستوە، کەواتە: خوا لەگەڵ ئیماندارانیشدا بە یاسا مامەڵە دەکات، بۆیە دەبێ ئاگامان لە یاساکانی خوابێو ئاگامان لە قانوونو سوننەتەکانی خوای پەروەردگار بێ، خوا دەفەرموێ: خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ ئێوە ڕاست بردە سەر ﴿إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ﴾، یاد بکەنەوە ئەوکاتەی کە بە مۆڵەتو بە ئیرادەی خوا، یان بە فەرمانو بڕیاری خوا، چونکە وشەی (بِإِذْنِهِ) هەموویان دەگرێتەوە، کاتێك ئێوە بە ئیزنی خوا ئەوانتان بێ هەست دەکرد، واتە: هەستەوەرەکانتان نەدەهێشتن، ئینسان هەتا ڕووحی لە بەدەندا هەیە، هەستەوەرەکانی ئیش دەکەن، دەبینی، دەبیستێ، دەچێژێ، بەڵام کاتێك کە ژیانی تێدا نەماو ڕووح لە جەستەیدا نەما، ئەوکاتە هەستەوەرەکانی لە ئیش دەکەون، ﴿تَحُسُّونَهُم﴾، واتە: بێ هەستتان دەکردن، دەتانکوشتن، ئەو بەڵێنەی خوا لەگەڵ ئێوەدا ڕاست دەرچوو هەتا کوێ؟ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ﴾، تا ئەو کاتەی کە ئێوە بێهێزبوونو ترسان، چونکە وشەی فەشەل کە ئێمەش لە کوردییدا بەکاری دێنین، بەمانای بێهێزییو ترسە، واتە: بەڵێنی خوا لەگەڵ ئێوەدا ڕاست دەرچوو، هەتاکو فەشەلتان بە مل داهات، جا فەشەلەکە، بێهێزییو ترسەکە لە ئەنجامی چی پەیدابوو؟ دەفەرموێ: ﴿وَتَنَٰزَعْتُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾، لە کاروباری خۆتاندا ناکۆك بوون، هەتاکو یەك ڕابوونو یەکدەنگ بوون، سەرکەوتوو بوون، کە لەنێوخۆتاندا ناکۆکییتان پەیدابوو، شکست ڕووی تێکردن، کە مەبەست پێی چییە؟ ناکۆکیی تیرهاوێژەکانە لەسەر مانەوەو نەمانەوە لەسەر ئەو شاخۆلکەیەی کە پێغەمبەر ﷺ پەنجا نەفەری لێ دانابوو، فەرماندەکەیان عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر بوو - خوا لێی ڕازی بێ-، کە لەنێو خۆیاندا ناکۆك بوون، چل کەس یان زیاتر گوتیان: دەچینە خوار بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت، عەبدوڵلاو هەشت نۆ نەفەریش گوتیان: با فەرمانی پێغەمبەر ﷺ نەشکێنین، واتە: کەوتنە

ناکۆکیی لەنێو خۆیاندا، وە سەرەنجام ﴿وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ﴾، وە سەرپێچییتان کرد، دیارە کە ناکۆکیی یەکە مایەی سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بوو، دوای چی؟ دوای ئەوەی کە خوا ئەوەی پێشاندان کە حەزتان لێ دەکرد، واتە: سەرکەوتنی پێشاندا بوون، یانی: دوای ئەوەی کە خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ ئێوە ڕاست بردبۆ سەر، وە سەرکەوتنی خستبۆ بەرچاوتان کە حەزتان لێ دەکرد، یان دەستکەوتی خستبۆوە بەرچاوتان کە حەزتان لێ دەکردو، دەبووایە ئەو نیعمەتە بە شوکر پێشوازیی لێ بکەن، نیعمەتی سەرکەوتن، دەبوو بە سوپاسگوزاریی پێشوازیی لێ بکەنو زیاتر پابەندبن، نەك لە بەرانبەر ئەو نیعمەتەدا، ئێوە سپڵەیی بکەنو فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بشکێنن، ئنجا خوا ﷻ ئەو ڕاستییەیان دەخاتە بەرچاو، کە هەبووە هەتا ئەو ئایەتە نەهاتۆتە خوار، نەیزانیوە هەندێك لە نێو هاوەڵاندا وابوون، خوا دەفەرموێ: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾، هەتانە دنیای دەوێو دنیای مەبەستە، وە هەشتانە دوارۆژی مەبەستە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: تا ئەو کاتە من نەمدەزانی لەنێو هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ کەسانێك هەن کە دنیایان مەبەستە واتە: دنیایان خۆشتر دەوێ لە دوارۆژ، کەواتە: ئەگەر تەماشا بکەین ئەو مەسەلانە وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك وان.

سەرەتا خۆشترویستنی دنیا، یاخود هەڵبژاردنی بەسەر دوارۆژدا، ئەویش بووە هۆی سەرپێچیی، ئەویش بووە هۆی ناکۆکیی، وە بە هۆی ناکۆکییەوەش فەشەلیان تووش بوو، ئنجا فەشەلیش بووە هۆی ئەوەی خوای پەروەردگار بەڵێنی خۆی وەربگرێتەوەو بوەستێنێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ﴾، دوایی خوا ئێوەی لەوان لادا، ئەگەر تا ئەو کاتە ئێوە بەسەر دوژمندا زاڵ بوون، ئێستا خوا ئێوەی لەوان لادا، ئەوەش بەپێی یاسایەکی خوایە، واتە: لەو حاڵەتەدا وەك یەکدیتان لێهاتەوە، ئەگەر ئەوان کافر بوون،

ئێوەش گوناهبار بوونو بە قسەی خواتان نەكردوە، وە بەپێی یاسای خوای دادگەر ئێوە لەو مەسەلەیەدا ئیمتیازتان بەسەر ئەوانەوە نەبووە، ئنجا ئەوانیش هۆكاری سەركەوتنیان دەستەبەر كردوە، ئەوە بوو خالیدی كوڕی وەلید - خوا لێی ڕازی بێ - بە خۆو بە پەنجا یاخود سەد سوارەوە، لە پشتەوەڕا چوو ئەو هەشت نۆ دە نەفەرەی لەسەر شاخۆلكەكە بوون، شەهیدی كردن، وە لە پشتەوەڕا لە مسوڵمانانی دا، پاشانیش ئەوانەی شكابوون گەڕانەوە، وە هەر بۆ خۆشیان چوار هێندەی مسوڵمانان زیاتر دەبوون، ئیدی سەرەنجام ئەو شكستەیان بەسەر داهات، ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾، ئنجا خوا ئێوەی لەوان لادا، تاكو تاقیتان بكاتەوە ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ﴾، بە تەئكید خوا ئێوەی عەفوو كرد، لێی بوردنو چاوپۆشیی لێكردن، بزانە چەند بە زوویی !! تەماشا بكەن! خوا چەند بە بەزەیی یە، چەند بە كەرەمە، دوایی دەفەرمووێ: ﴿وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾، وە خوا خاوەنی بەخششە بەسەر بڕواداړانەوە، ئنجا خوا ﷻ چۆنیەتی تێشكانی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەمان بۆ وێنان دەكات، (هەڵبەتە هەموویان نەبوو ون)، تاكو جارێكی دیكە ئەم دیمەنە دزێوو ناشیرینە دووبارە نەكەنەوە، دیارە خوای دادگەر خاتری كەس ناگرێ، بەڵێ ئیماندارانی خۆشدەوێو لەگەڵیان بەرەحمە، لێیان خۆشدەبی، وە لەگەڵیان خاوەن بەخششە، بەڵام كەموكوڕییەكانیشیان وەك خۆی دەخاتە بەرچاویان، وەك دەفەرموێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ﴾، بیهێننەوە بەرچاوتانو یادبكەنەوە كاتێك كە دوور دەڕۆیشتن[1].

جا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ﴾، ئاوڕتان لە كەس نەدەدایەوە، هەندێكتان زۆر دوور دەڕۆیشت، دەڵێ: هەبووە دوای سێ ڕۆژ هاتۆتەوە بۆ مەدینە، هێندە دوور ڕۆیبوو !! وە پێغەمبەر ﷺ بە هەندێكیانی فەرمووە:

---

١) (صَعِيد) واتە: ڕووی زەوی، (أَصْعَد) واتە: بە ڕووی زەویدا ڕۆیشت، (تُصْعِدون) واتە: زۆر دوور دەڕۆیشتن، مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٤٨٤).

بەڕاستی زۆر دوور ڕۆیی بوون! هەر ئەوەندەی فەرمووە، یانی: پێویستی نەدەکرد هێندە دوور ڕۆیشتبوون[1]، ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای دواوەتان بانگی دەکردن، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە لای دوژمنیان بەجێمابوو، ئەوانیش بۆخۆیان بەرەو چیای ئوحود یاخود بەرەو شوێنی دیکەی چۆڵ ڕایاندەکرد، پێغەمبەریش ﷺ بانگی دەکردن، ﴿فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ﴾، ئیدی خوا سزای دان لە ئەنجامی ئەم هەڵوێستەتاندا، خەم لەسەر خەم، خەمباریی لەسەر خەمباریی بەسەرداهێنان، ئنجا توێژەرەوانی قورئان پرسیویانە: ئایا لێرەدا مەبەست لەو دوو خەمە چییە؟ هەندێك دەڵێن: یەکیان: تێشکانەکەیە، دووەم: لە دەستچوونی دەستکەوتەکانە، یاخود یەکیان: بریندارەبوونی پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەویدیکە چییە...هتد، بەڵام نا، لەڕاستیدا ﴿غَمَّۢا بِغَمّٖ﴾، واتە: خەم لەسەر خەم، ئیدی مەرج نیە بەس دوو خەمیان بووبن.

بەڵکو ئەو ڕۆژە خەمیان زۆر بوون: سەرپێچییان لە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە، ئەوە خەمێك بووە، دوژمن زەفەری پێبردوون، ئەوە خەمێکی دیکە بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بریندارەبووە، خەمێکی دیکە بووە، خەڵکیان لێ شەهید بووە، ئەوە خەمێکی دیکە بووە، هاوەڵان بریندار بوون، خەمێکی دیکە بووە، دەستکەوتەکانیان لەدەستچوون، خەمێکی دیکە هەبووە، دوژمن دڵی پێ خۆشبوون خەمێکی دیکە بووە، زۆریان خەم بوو ون، جا دەفەرموێ: خوا خەم لەسەر خەمی بەسەرهێنان لە ئەنجامی ئەو کردەوەتاندا ﴿لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡ﴾، واتە: حیکمەتی ئەو ناخۆشیی و ناسۆرەی کە بە دڵی ئێوەی داکرد، چی بوو؟ دەفەرموێ: بۆ ئەوەی کە لەمەو دوا ئەگەر شتێکتان لەدەستچوو، خەمی بۆ نەخۆن، وە ئەگەر

---

١) هەرچەندە ئەوە لە هەندێك سەرچاوەی سیرەو تەفسیردا هاتوە، بەڵام مەگەر ئەو جۆرە کەسانە لە دڵنەخۆش و ئیمان کزەکان بووبن، ئەگەرنا بۆ هاوەڵان بە دووری نازانم!

شتێكـتان بەسەرهـات، زۆر پێـی دڵتـەنگ نـەبن، واتـە: خـوا مەشـقی پێـكردن، چونكە ئەگەر ئینسان خەمی بینین، لە خـەمو نارەحـەتیی دا بـوو، دوایـی پتـەوو قاییم دەبـێ، بـەڵام ئـەوەی ناسكە پیـاو بـێ، بە خەمێكی لەبـن دێ، بـەڵام ئەگـەر ئینسان خەمو ناسۆری زۆر بەسـەرهاتن، پتـەوو قـاییمو دامـەزراو دەبـێ ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾، وە خـوا شارەزایە بەوەی كە دەیكەنو بەوەی كە دەتانكـرد، ئنجا خـوا ﷻ نیعمەتێكی گەورەی دیكـەی خۆی دەخـاتە بەرچـاویان، دەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ مِّنكُمۡ﴾، خـوا دوای ئـەو خـەمو ناسـۆرو نارەحەتییـە خـەوێكـی هێمنكـەرەوەی نـاردە سـەرتان، كـە كۆمەڵێكتانی داپۆشی، واتـە: كۆمەڵـێك ئـەو خـەوەیان لێكـەوت، بـەڵام ﴿وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ﴾، كۆمەڵێكیشتان هەر خەمی خۆیـان بوو، جا ئەمە ئـەوەی لێوەردەگیـرێ، كـە ئینـسان ئەگـەر زۆر لـە خـەمی خۆیدابـێ، مانـای وایـە ئیمانەكەی چاك نیـە، نابـێ ئینسان هەر لە خەمی خۆیـدابـێ، خەمی لای خـوات بێ، خـەمی دینـت بـێ، خەمی خەڵكت بـێ، خـەمی غـەیری خۆتـت بـێ، ئینـسان نابـێ هـەر لە خـەمی خۆیدابـێو ئەنـانیی بـێ، دەفـەرموێ: كۆمەڵێكـتان هـەر لـە خەمی خۆیـاندابوون، هەڵبەتـە ڕای من وایـە كـە ئەوانەش هـەر مسـوڵمان بوو ون، بـەڵام هەندێكیان گوتوویـانە: ئەوانە مونافیقـەكان بوون، بـەڵام نـا، ئـەوانیش هـەر مسوڵمان بـوون، ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ﴾، گومـان بـە خـوا دەبـەن گومـانی ناهـەق، گومـانی نەفـامیی دەبـێ، چ گومانێكـیان بردبـێ؟ خـوا ﷻ گومانەكـەی بـەیان نـەكردوە، بـەڵام بەپێـی سـیاقی ئایەتەكـان دەزانـرێ، كـە لەوانەیـە گومـانی ئەوەیـان بردبـێ: تـازە ئیـسلام تێـچوو، تـازە پێغـەمبەر ﷺ شـەهید دەبێ، تـازە ئیـسلام دەكوژێتـەوە، تـازە كـافرەكان سـەردەكـەون، هەمیـشـە لـە كاتی تەنگانەو قەیراندا، خـەڵك چەندان جۆرە گومـانو تەصـەووڕی غەڵەتو پەڵەتی بەدڵدا دێ، كە شایستەی مسوڵمانان نیـن، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ

ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ﴾، گومانی ناهەق، گومانی نەفامانە ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَيْءٍ ﴾، ئەوەیان شەرحو تەفسیری گومانەکە نیە، چونکە ئەوە گوتوویانەو قسەیە، بەڵام گومان ئەوەیە کە لە دڵدایە، کەواتە: وێڕای گومانی خراپ بە خوا، قسەی خراپیشیان کردوە ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَيْءٍ ﴾، دەیانگوت: ئایا ئێمە هیچمان بە دەستە ؟! لێرەدا ئەوە ڕەخنەگرتنێکی شێرراوە (ضمني)یە لە پێغەمبەر ﷺ کە بە قسەی ئێمەی نەکرد ! ئێ باشە پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی کردو خستیە دەنگدانەوەو زۆربەیان گوتیان: بابچینەدەر، بەڵێ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییە گوتی: با لەنێو شار بین، پێغەمبەریش ﷺ بۆخۆی ڕای وابوو کە لەنێو شاربن، بەڵام کە زۆرینە گوتوویانە بابچینەدەر، وە ڕاوێژکردنیش یەکێکە لە بنەڕەتییەکانی کاروبار بەڕێوەبردنی کاروباری مسوڵمانان، وەك دەفەرموێ: ﴿ ... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى، واتە: کاروباریان بە ڕاوێژە، کەواتە: نابێ گلەیی لە پێغەمبەر ﷺ بکرێ، چونکە ئەو بە قسەی زۆرینەی کردوە، ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ﴾، پێیان بڵێ: کاروبار هەمووی هی خوایە، هەموو کاروبارەکان هی خوانو بڕیاری کۆتایی بەدەستی خوایە، ﴿ يُخْفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ﴾، لە دەروونی خۆیاندا شتێك پەنهان دەکەن، کە بۆ تۆی ئاشکرا ناکەن، ئەی پێغەمبەر! ﷺ، ﴿ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ﴾، ئەوە ڕەنگە ئەوەبێ کە پەنهانیان کردوە، دەیانگوت ئەگەر ئێمە هیچمان بە دەستبایە، لێرەدا نەدەکوژراین، واتە: ئەگەر بەقسەی ئێمە کرابایە، ئێمە بۆ ئەو جەنگە ناهاتباینە دەر، بەڵکو هەر لەنێو شاردا جەنگەکەمان کردبایە، دووچاری ئەم تێشکانە نەدەبووین، قسەکەش ڕاستەو پێغەمبەریش ﷺ ڕای وابووە، وەك لە جەنگی خەندەقیشدا دوایی مسوڵمانان پەندیان لە جەنگی ئوحود وەرگرتو نەچوونەدەر لە شار، وە سەرەنجام هەرچەندە کە لە جەنگی ئوحود دا کافرەکان سێ هەزار کەس

بوون، وە لە جەنگی خەندەقدا دوژمن دە هەزار کەس بوون، کەچی هیچیان پێنەکراو بە شکستییو بە سەرشۆڕیی گەڕانەوە، ئەوە ڕاستە، بەلاّم ئەو بڕیارە کە دراوە، پێغەمبەر ﷺ تاکڕەوانە بڕیارەکەی نەداوە، وە ئەگەر هەر خۆیشی بڕیاری دابایە، نەدەبوو نابێ گومانی وا خراپ، وە بێئەدەبیی وا خراپ بە پێغەمبەر ﷺ بکرێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوۡ كُنتُمۡ فِي بُيُوتِكُمۡ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡ﴾، پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە لە ژووری ماڵەکانی خۆشتاندابان، ئەوانەی کە کوژرانیان لەسەر نووسرابوو، واتە: ئەوانەی کە کوژران، دیارە کە لەسەریان نووسرابوو کە دەبێ بکوژرێن، ئەوە هەر دەهاتنە دەرێ بۆ شوێنی پاڵکەوتنیان، ئەو شوێنەی لێی کوژرابوون، هەر دەبوو لێی کوژرابان، یانی چی ؟ یانی: دوای ئەوەی شتێك ڕوودەدا، پێویست ناکات بڵێی: ئەگەر وابووایەو، ئەگەر وابووایە، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا دەیخەینەڕوو، تازە چۆن بووە دەبوو هەروابێ، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (لە دوای چووان مەچوو)، جا دەفەرموێ: ﴿وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ﴾، وە حیکمەتی ئەو ڕووداوەش ئەوەیە کە خوا ئەوەی لە سینەکانتاندا هەیە، تاقی بکاتەوە، داخۆ چی تێدایە؟ ئەگەر ئەو وەزعە نەهاتبایە پێش کێ دەیزانی داخۆ کێ ئەو خەیاڵو گومانە خراپو بیرو بۆچوونە هەڵەو پەلاّنەی لەنێو دڵیدا هەن؟! کەواتە: بەوە نەبووایە ئەوەی لە سینەکانتاندایە، ئاوا ئاشکرا نەدەبوو ﴿وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡ﴾، وە بۆ ئەوەی ئەوەش کە لە دڵەکانتاندا هەیە (لە بێهێزییو گومانی خراپو بۆچوونی خراپ) خوای بەرز لایبەرێو دڵتان پاکبکاتەوە، یانی: ئەوەی لە سینەتاندا هەیە، بیخاتە گۆڕێو خەڵك بیزانێو، ئەوەش کە لە دڵتاندا هەیە خوا دڵتانی لێ پاکبکاتەوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، وە خوا بە نهێنیی نێو سینەکان زانایە، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى

ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ ﴾، بێگـومان ئەوانـەی کـە ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکـە، پشتیان هەڵـکردو پشتیان کـردە دوژمـن، ئـەوە شـەیتان بـە هۆی هەنـدێك کـردەوەی خراپـی پێشتریانەوە، خلیسکاندنی، لێرەدا دەردەکەوێ کە ئینسان بە هۆی گوناحـەوە، تووشی شکستو دۆڕان دەبـێ، کـە تـۆ پێـشتـر گوناحـت کـردوە، ئێستا لـێت وەدەر دەداو لەکـاتی تەنگـانەو سەغڵەتیی نارەحەتییدا شوێنەواریی ئەو گوناهـانە دەردەکـەوێ کە دەیانکـەی، واتـە: شـەیتـان بۆیـە ئێـستا زەفـەری پێبـردوون، چـونکە پێـشتـر گوناهیـان کردبوو ﴿ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ﴾، لەگەڵ ئەوەشدا خـوا عـەفـووی کـردن ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾، بێگـومان خـوا لـێبوردەیـەو هێمـنو هێدییـەو زوو سـزای بەندەکانی نـادات.

## چەند مەسەلـەیەکی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکـەم**: خـوا ﷻ کە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێناوە ! ئەگەر گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی ئەوانەی بێبـڕوان بکەن، لەسەر پاژنە پـێیەکانتـان هەڵتان دەگـێڕنەوەو زەرەرمەنـد دەبـن، دیـارە مەبەست پـێی سەرجەم ئەوانەن کـە بێبـڕوان، چونکە بەگشتی فەرموویـەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، چونکە هـەندێ لـە توێـژەرەوان دەڵێن: مەبەست پـێی جوولەکەکانـە، وە هەنـدێکیش دەڵـێن: مەبەسـت پـێی نەصـڕانیی یەکانـە، هەندێکی دیکە دەڵـێن: مەبەست پـێی هـاوبەش دانەرەکانـە، واتـە: کافرەکانی قـورەیش کـاتی خـۆی، بـەڵام لەڕاستیـدا تەعبیـرە قورئـانییەکە گـشتی یـە، دەفەرمـوێ: ﴿ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەگـەر فەرمانبـەریی ئەوانـە بکـەن کـە بێبـڕوان، جـا چ بەنـسبەت کـاتی خۆیـەوە، کـە هاوبـەش بـۆ

خوادانەرەکانی قورەیش بووبن، چ مونافیقەکان بووبن، وە بەنسبەت ئێستاش هەموو جۆرەکانی ئەهلی کوفر دەگرێتەوە، بەلاّم لێرەدا ئەوەی پێویستە بزانرێ ئەوەیە، کە لێرەدا مەبەست قەدەغەکردنی هەبوونی پەیوەندیی‌و هەڵسوکەوتکردنی ئاسایی نیە لەگەڵ ئەهلی کوفردا، چونکە پێغەمبەر ﷺ پەیوەندیی هەبووە لەگەڵ جوولەکەکان، وە لەگەڵ نەصرانیی یەکان‌و نامەی بۆ ناردوون، وە ڕێککەوتنی لەگەڵدا کردوون، هەروەها لەگەڵ هاوبەش بۆ خوادانەرەکاندا، ئەوانەی کە شەڕیان پێ نەفرۆشتبێ‌و پەیمانیان لە بەرانبەردا نەشکاندبێ، پێغەمبەر ﷺ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردوون، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە نەکەوینە ژێر ڕکێفیان‌و شوێنیان نەکەوین لەو شتانەدا کە تایبەتمەندیی ئەوانن، بەلاّم بەهرە لێ وەرگرتنیان لەو شتانەدا کە ئەوان تێیدا لەپێش ئێمەوەن، بۆ وێنە: لە ڕووی تەکنۆلۆجیاوە، یاخود هەبوونی پەیوەندیی ئاسایی، یان مامەڵەو هەڵسوکەوت لەگەڵدا کردن، ئەوە هیچی ناچێتە نێو بازنەی بابەتی ئەم ئایەتەوە، کە لێرەدا خوای پەروەردگار نەهی لێ کردوە، واتە: فەرمانبەرییکردنی ئەهلی کوفر.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ﴾، پێشتریش مانای وشەی (مولى)مان شیکردەوە، کە بە مانای سەرپەرشتیکار دێ، وە بە مانای سەرپەرشتیکراویش دێ، وە (مولى)و (ولي) هەردووکیان بە یەك واتا دێن، واتە: سەرپەرشتیکار، یاخود سەرپەرشتیکراو، بۆ وێنە خوا دەفەرموێ: ﴿... وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾﴾ آل عمران، خوا وەلی ئیماندارانە، واتە: سەرپەرشتییان دەکات، وە ئیماندارانیش وەلی خوان، واتە: خوای پەروەردگار سەرپەرشتییان دەکات‌و دۆستایەتییان دەکات، وە سەریاندەخاو یارمەتییان دەدات، ئنجا لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ﴾، واتە: جگە لە خوا مەگرن بە دۆست‌و سەرپەرشتیارو

یارمەتیدەرو هاوكار، بەڵكو تەنیا خوای تاكو بێ هاوەڵ مشوورخۆری ئێوەیە، وەك لە ئایەتی: (١١)ی سووڕەتی (محمد)دا پێشێ باسی چەند ڕاستییەك دەكات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿١١﴾﴾، واتە: ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە خوا مەولای ئەوانەیە كە ئیمانیان هێناوە، (واتە: سەرپەرشتیارو دۆستو یارمەتیدەریانە)، بەڵام بێبڕوایەكان هیچ دۆستو سەرپەرشتیارو مشوورخۆریان نیە، هەروەها لە ئایەتی: (٢٥٧)ی سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ... ﴿٢٥٧﴾﴾، واتە: خوا دۆستو یارو یاوەرو سەرپەرشتیاری ئەوانەیە كە بڕوایان هێناوە، هەروەها لە ئایەتی (٦٨)ی سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿... وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾﴾، واتە: وە خوا دۆستو نیزیكو پشتیوانو سەرپەرشتیاری بڕوادارانە[1] كەواتە: (ولي) بریتیە لە كەسێك كە نیزیك بێ لە كەسێك یان شوێنكەوتووی بێ، یان دۆستی بێ، یان پشتیوانی بێ، كە دەڵێین: خوای بێوێنە وەلی ئیماندارانە، واتە: نیزیكیانە، سەرپەرشتیاریانە، دۆستیانە، هاوكاریانە، سەرخەریانە، كە دەگوترێ: ئیمانداران دۆستانی خوا پەروەردگارن، واتە: لە خوا نیزیكنو دۆستی خوانو سەرخەرو یارمەتیدەری دینی خوای پەروەردگارن.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: خوای پەروەردگار كە دەفەرموێ: ﴿سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا﴾، بە تەئكید ترسێكی زۆر دەخەینە دڵی ئەوانەوە كە بێبڕوان، بە هۆی ئەوەوە

---

١) وشەی: (ولي)، یان (مولى) لە ئەسڵدا لە (وَلِيَ، يَلي)یەوە هاتووە، (وَلِيَ) واتە: (قَرُبَ)، وە (يَلي)یش، واتە: (يَقْرُب)، (وَلِيَهُ يَلْيهِ)، واتە: (يقرب منهُ) لێی نزیكە، یاخود (يتبعهُ) شوێنی دەكەوێ، مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٨٨٥ - ٨٨٧).

كە شتێكیان كردوە بە هاوبەشی خوا، كە خوا بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار، توێژەرەوانی قورئان پرسیاریان كردوە كە: ئایا ئەو ترس خستنە دڵی بێبڕوایان، لە لایەن پەروەردگارەوە بە قازانجی مسوڵمانان، ئایا شتێكی تایبەتی بووە بۆ ئەو كاتە، یاخود شتێكی گشتی یە؟

وەڵام ئەوەیە: بەڵێ، ئەوە كە هەركاتێك ئەهلی ئیمان لەگەڵ ئەهلی كوفردا ڕووبەڕوو ببنەوە، خوا دڵی كافرەكان پڕ دەكات لە ترسو بیمو حەژمەت بەرانبەر ئیمانداران، یاسایەكی گشتی یە، بەلاَم بەمەرجێك بڕواداران ئەو بڕوادارانەبن كە شایستەی ئەوەبن خوای بە بەزەیی دوژمنەكانیان لە بەرانبەردا بترسێنێ، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟ بەڵگەمان ئەوەیە كە:

یەكەم: خوا ﷻ بەگشتی فەرموویەتی: ﴿ سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ ﴾، واتە: هەمووان دەگرێتەوە، بەلاَم خوا كەی ترس دەخاتە دڵی ئەوانەوە كە بێبڕوان، لە بەرانبەر ئیمانداراندا ؟ كاتێك كە ئیمانداران، شایستەی ئەوەبن خوای یارمەتیدەر ئاوا بەرگرییان لێبكات، وە ئەو كارەیان بۆ بكات، ئەگەرنا هەموو كەس شایستەی ئەوە نیە، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ٧ ﴾ محمد، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! خوا سەربخەن، خوا سەرتان دەخات، وە پێیەكانتان دەچەسپێنێ، كەواتە: ئێمە دەبێ سەرخەری دینی خوا بین، هاوكارو پشتیوانی دینی خوا بین، ئنجا خوا سەرمان دەخات، ئەوە یەك، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣٩ ﴾ آل عمران، واتە: ئەگەر ئێوە ئیمانداربن، ئەگەر ئیمانداری بەڕاستیی بن، ئێوە لەسەرەوە دەبن، كەواتە: هەر كاتێك بەو شێوەیە نەبوون، دیارە خەلەل لە ئیمانی ئیمانداراندا هەیە، پاشان پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا كە جابیری كوڕی عەبدوڵلا - خوا لێیان ڕازی بێ-

دەیگێڕێتەوە فەرموویەتی: (أُعْطِيتُ خَمْساً، لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنْ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِي الْمَغَانِمُ، وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً) رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١١٦٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٣٢)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (١١٧٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٣٩٨)، وَالدَّارَمِي برقم: (٢٣٧٥)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١١٥٤)، واتە: پێنج شتم پێدراوە، کە لە پێش مندا بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراون:

١– بە هۆی ترس خرانە دڵی دوژمنەوە مانگە ڕێیەك سەرکەوتووم، (کە دیارە ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ بووە لەکاتی خۆیدا، وە بۆ ئۆممەتەکەشیەتی لە دوای خۆی، بەمەرجێك ئۆممەتەکەش بەڕێی پێغەمبەر ﷺدا بڕۆن).

٢– وە زەوییم بۆ کراوە بە مزگەوتو بە پاککەرەوە، (هەر شوێنێك جگە لەو شوێنە تایبەتییانەی کە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دا قەدەغە کراون، وەك: حەمامو زبڵدانو تەویلەی وڵاخو ئەوانە، غەیری ئەو شوێنانە هەموو شوێنێك ئینسان بۆی هەیە بیکاتە مزگەوتو بیکاتە شوێنی نوێژ، وە زەوی پاککەرەوەشە لە کاتێك ئینسان ئاوی دەست نەکەوێ تەیمموم دەکات ئەوەش بەگشتی بۆ پێغەمبەر ﷺو بۆ ئۆممەتیشی).

٣– وە دەستکەوتەکانی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراون، کە بۆ ئۆممەتانی پێشێ حەڵاڵ نەکراون.

٤– وە شەفاعەتم پێدراوە (واتە: پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت دەکات بۆ ئۆممەتی، وە شەفاعەت دەکات بۆ تێکڕای بەشەر، پێشێ بۆ ئەوەی کە خوا لێپرسینەوەو، پاداشتی مرۆڤایەتی دەست پێبکات، وە پاشان بۆ ئۆممەتیشی شەفاعەت دەکات).

٥- وە پـێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر كامێكیان بۆ گەلێكی تایبەت ڕەوانە دەكران، بەڵام من بۆ تێكڕای خەڵكی ڕەوانە كراوم.

**مەسەلەی چوارەم:** خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا﴾، (ترس دەخەمە دڵی كافرانەوە) بە هۆی ئەوەوە كە شتێكیان كردوە بە هاوبەشی خوا، كە خوا بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، كە شیركو كوفر لە ڕووی بەڵگەو دەلیلەوە بێ تفاقو بێ پشتو پەنان، بەڵێ شیركو كوفر هیچ ڕەگو ڕیشەیەكی نیە بەڵگەیەكی نیە، نە بەڵگەیەكی عەقڵییو، نە لە واقیعی مێژووییدا بەڵگەی هەبووە، بۆیە شیركو كوفر دەسەڵاتێكی زاتییان نیە بەسەر عەقڵو دەروونی خەڵكدا، وە ئەوانەی كە بیانەوێ شیركو كوفر پەرە پێبدەن، دەبێ سوود ببینن لە دەرەوەی خۆیان، واتە: لە دەرەوەی بازنەی شیركو كوفرو، دەبێ یان زەختو زۆر، یان پارەو تەماع، یان چەواشەكردن، بەكاربێنن، ئەگەر نا ئەگەر ئینسان خودی خۆی لێی گەڕێی، هیچ كەسێك كافرو موشریك نابێ وەك لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: النَّبِيُّ ﷺ: مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، فَهَلْ تَرَوْنَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ} رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٣٥٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٦٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧١٤)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو منداڵێك لەسەر سروشتی خواپەرستییو خواناسیی لەدایك دەبێ، دوایی دایكو بابی دەیكەنە جوولەكە، یان دەیكەنە نەصرانیی، یان دەیكەنە ئاگرپەرست، (وێنە دێنێتەوەو دەفەرموێ:) وەك چۆن بەچكەی ئاژەڵ كە لەدایك دەبێ، بە سەلامەتیی لەدایك دەبێ، ئایا هیچ دەبینن گوێی بڕا بێ، یاخود داخ كرا بێ ؟ نەخێر، بەڵكو دوایی بەشەر دەستكاریی دەكات، واتە: بەشەر لە ئەصڵی خیلقەتو فیطرەتیدا خواناسە، بەڵام دوایی ژینگە دەیگۆڕی، كە لێرەدا

پێغەمبەر ﷺ باسی دایكو باب دەكات، لەبەر ئەوەیە كە بابو دایك نیزیكترین كەسن بۆ كارتێكردنی ئینسان، ئەگەرنا مەبەستی دەوروبەرە، دوایی دەوروبەر دەیگۆڕێ بە ئاڕاستەی خراپو لاردا دەیبا.

ئنجا خوا سبحانەو تعالی ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا﴾، چەند جارێك لە قورئاندا دووبارە دەكاتەوە، ناوی لە بەڵگەو دەلیل ناوە (سُلطان) بۆچی؟ چونكە بەڵگەو دەلیلی ڕاست دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵی ئینساندا، واتە: بەسەر دەروونی ئینساندا، وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە هەر بەڵگەیەك بۆ عەقڵی ئینسان ئیقناعكەر نەبێ، بە بەڵگە لەقەڵەم نادرێ، هەر شتێك ناوی لێنرا بەڵگە، بەڵام عەقڵی خەڵكی پێی ئیقناع نەبوو، عەقڵی سەلیم نەیسەلماند، كەواتە: دیارە خاوەنەكەی تێیدا بە هەڵەدا چووە، كە ناوی ناوە بەڵگە.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ﴾، توێژەرەوانی قورئان لەوە كۆڵیویانەتەوە كە ئایا ئەو بەڵێنەی خوای پەروەردگار كەی بە ئیمانداران دراوە ؟ كەی بووە كە خوای بەخشەر بەڵێنی بە ئیمانداران داوە، كە سەریان دەخات لە جەنگی ئوحوددا ؟ جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان زۆر خۆیان ماندوو كردوەو هەندێك ڕیوایەتیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ هێناون، كە بێهێزنو جێی پشت پێ بەستن نین، پاشان هەندێك تەكەللوفی بێجێیان كردوە، بەڵام من پێم وایە كە خوا ئاوای فەرمووە: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ ﴾، خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ ڕاست بردنە سەر، ئەو بەڵێنەش بریتییە لەو بەڵێنە گشتییەی كە خوا سبحانەو تعالی لە چەندان ئایەتدا بە ئەهلی ئیمانی داوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الروم)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: یارمەتیدانو سەرخستنی ئیمانداران لەسەر ئێمە پێویستە، واتە:

هەقە لەسەرمان کە ئیمانداران سەربخەین، ئەوە بەڵێنە، پاشان لە ئایەتی: (٥١)ی سووڕەتی (غافر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان (علیهم الصلاة والسلام) وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، لە ژیانی دنیاو لەو ڕۆژەدا کە شاهێدەکان ڕاست دەبنەوەو شایەدیی دەدەن، سەر دەخەین، کە ئەوەش بەڵێنێکی دیکەی خوای باڵادەستە، هەروەها خوا ﷻ لە ئایەتەکانی: (١٧١و ١٧٢و ٧٣) سووڕەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ ﴾، واتە: بڕیاری ئێمە پێشکەوتوەو تێپەڕیوە، بۆ بەندە ڕەوانە کراوەکانمان، (کە سەردەخرێن)، وە هەروەها بڕیاری ئێمە پێشکەوتوەو تێپەڕیوە، کە سەربازەکانی ئێمە زاڵ دەبن، بەڵێ ئەوانە ئەو بەڵێنو گفتانەن کە پەروەردگار بەگشتی بە ئەهلی ئیمانی داون، کەواتە: پێویست ناکات بڵێین: لە فلان ڕۆژەدا، یان لە فلان سەعاتەدا پێش جەنگی ئوحود پێغەمبەر ﷺ موژدەو بەڵێنێکی ئاوای بە ئیمانداران داوە، هەرچەندە پێغەمبەریش ﷺ لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتانەی خوای پەروەردگاردا، هەمیشە بەڵێنی سەرکەوتنی بە ئیمانداران داوە، بەمەرجێك کە ئەهلی ئیمان بن، وە مەرجەکانی ئیماندرێتیی لە خۆیاندا بێننەدی.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾، خوای کاربەجێ لێرەدا چۆنیەتیو هۆکارەکانی شکستو تێشکانی مسوڵمانان، وەك زنجیرەیەك باس دەکات، کە لە چەند ئاڵقەیەك پێکهاتوە:

١- ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ﴾، واتە: هەتا کاتێك کە بێهێز بوونو ترسان، چونکە فەشەل مانای بێهێزییش دەگەیەنێ.

٢- ﴿وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾، واتە: لە کاروباری خۆتاندا ناکۆك بوون، ئەوە بوو کە تیرهاوێژەکان هەندێکیان گوتیان: با بمێنینەوە، وە هەندێکیشیان دەیانگوت: بابچینە خوار، وە قسەی زۆربەشیان سەرکەوت، وە ناکۆکییان تێدا پەیدابوو.

٣- ﴿وَعَصَيۡتُم﴾، واتە: وە سەرپێچییتان کرد.

٤- ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ﴾، واتە: دوای ئەوەی کە خوا شتێکی خستبووە بەرچاوتان کە حەزتان لێ دەکرد، ئەویش بریتی بوو لە سەرکەوتن، یان دەستکەوتو غەنیمەت.

٥- ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾، واتە: هەتانبوو دنیای دەویست، هەشتانبوو دوارۆژی دەویست، کەواتە: هەڵبژاردنی دنیا لەلایەن هەندێکیانەوە، یان زیاد لە پێویست خۆشویستنی دنیا، بووە هۆی ئەوە کە سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بکەنو، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە لەنێو خۆدا ناکۆك بنو خاوەنی یەك ڕای نەبن، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە شکستو فەشەلیان بەسەردا بێ، کەواتە: وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك هۆکارەکان ڕیز دەبن: هەڵبژاردنی دنیا بووە هۆی ئەوە کە سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بکەن، وە سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەرو شکاندنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بووە هۆی ناکۆکییو دووبەرەکییو، ئەویش بووە هۆی ئەوە کە دوژمن زەفەریان پێ بەرێ، جا لەبارەی ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: (كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَا شَعَرْتُ

أَنَّ أَحَداً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُرِيدُ الدُّنيا وَعَرَضَهَا، حَتَّى كَانَ يَوْمَئِذٍ)[1]، واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: هەستم نەدەکرد کە هیچ یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەبێ دنیای بوێ، (واتە: دنیای بەلاوە گرنگ بێ و دەستکەوتی دنیای بوێ) هەتا ئەو ڕۆژەی ئەم ئایەتە هاتە خوار، ئنجا بۆم دەرکەوت، کەواتە: دیارە لەنێو هاوەڵاندا - خوا لێیان ڕازی بێ-، هەیانبووە ئیمانەکەی زۆر دامەزراوو مەحکەم نەبووە، بۆیە خۆشەویستی دنیا لە دڵیدا بەهێزتر بووە لە خۆشەویستیی دواڕۆژ، وە هاندەرەکەی بۆ بەشداریی لە جەنگی ئوحوددا، زیاتر هاندەرێکی دنیایی بووە، تاکو هاندەری دواڕۆژیی، هەر بۆیەش کە دەستکەوتو غەنیمەتیان بینیوە، چونکە خۆشەویستی لە دڵیاندا زۆر بووە دەستکەوتو، غەنیمەتەکە ڕایکێشاون و سەرپێچیی فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ کردوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾، دوایی خوا ئێوەی لە ئەوان لادا، تاکو تاقیتان بکاتەوە، ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە خوا ﷻ بەپێی چەند یاسایەك کە خۆی داینـاون، لەگەڵ ئیمانداران دا مامەڵە دەکات، ئەوەنیە کە هەر لەبەر ئەوەی پێمان دەگوترێ ئیماندار، یان مسوڵمان، بەبێ مەرج و بەبێ شایستەیی خوا هەموو شتێکمان هەر بۆ بکات! نەخێر وانیە، چونکە هیچ کەس لە بەرانبەر خوادا ﷻ وە لە بەرانبەر یاساکانی خوادا، مافی (ڤیتۆ)ی نیە، بڵێ: مادام من مسوڵمانم، دەبێ خوا یاساکان خۆی بۆ من تێکبدات ! بۆ وێنە: بڵێ: مەلەوانییش نەزانم، بچمە نێو ئاوێ، هەر دەبێ نەخنکێم، نەخێر مەلە نەزانی دەخنکێی، ئەگەر (وەلی)یش بی، بۆچی؟ چونکە یاسای خوایە،، هەر کەسێك مەلەوانیی نەزانێ و بچێتە نێو ئاوێ بخنکێ، بۆیە کافرێك مەلەوانیی بزانی ناخنکێ، بەلام مسوڵمانێك مەلەوانیی

---

[1] جامع البيان للطبري، ج: (٤)، ص: (٧٩٢٧).

نــەزانی دەخنكێ، هـەروەها كافرانێـك كـە یاسـاكانی خـوا ڕەچـاو دەكـەن، كـە پـێویسـتن بۆ سـەركەوتن، سـەردەكەون، بـەڵام مـسوڵمانانێك كـە یاسـاكانی خـوا پشـتگوێ دەخەن، ژێر دەكەون، وەك لە جەنگی ئوحوددا بینیمـان.

ئنجا دەربـارەی چۆنیـەتی ئـەو لادانـەی مـسوڵمانان لـە جەنگـی ئوحـوددا، كـە پـێـشتـر مــسوڵمانان كافرەكانیــان شــكاندو ڕاویــاننان، وە كــافرەكان بەتــەما نەبوون خۆ بگـرنەوە، لەوبـارەوە ئـەم فەرمایـشتە هــەیە: (عَـنْ الْبَـرَاءِ ﷺ قَـالَ: لَقِينَـا الْمُشْرِكِينَ يَوْمَئِـذٍ، وَأَجْلَسَ النَّبِـيُّ ﷺ جَيْشًـا مِـنْ الرُّمَـاةِ، وَأَمَّـرَ عَلَـيْهِمْ عَـبْدَ اللَّـهِ بـنَ جُبَيْــر، وَقَـالَ: {لا تَبْرَحُــوا، إِنْ رَأَيْتُمُونَــا ظَهَــرْنَا عَلَيْــهِمْ فَــلاَ تَبْرَحُـوا، وَإِنْ رَأَيْتُمُـوهُمْ ظَـهَرُوا عَلَيْـنَا فَلا تُعِيـنُونَا}، فَلَمَّـا لَقِينَـا هَرَبُـوا حَتَّـى رَأَيْـتُ النِّـسَاءَ يَـشْتَدِدْنَ فِـي الْجَبَـلِ، رَفَعْـنَ عَـنْ سُـوقِهِنَّ قَـدْ بَـدَتْ خَلاخِلُهُـنَّ، فَأَخَـذُوا يَقُولُـونَ: الْغَنِيمَـةَ الْغَنِيمَــةَ، فَقَــالَ: عَبْـدُ اللَّـهِ بـنَ جُبَيْـر عَهِـدَ إِلَــيَّ النَّبِــيُّ ﷺ: أَنْ لا تَبْرَحُــوا، فَــأَبَوْا، فَلَمَّــا أَبَــوْا صُــرِفَ وُجُوهُهُــمْ، فَأُصِــيبَ سَـبْعُونَ قَتِيـلاً) رَوَاهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٤٠٤٣)، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٤٧٣٨)، وَأبُـو داوُدَ بـرقم: (٢٦٦٢)، واتــە: بــەڕائی كــوڕی عــازیب - خــوا لــێی ڕازی بــێ- دەگــێڕێتەوە دەڵــێ: ئــەو ڕۆژە كـە گەیـشتینە هاوبـەش بـۆ خوادانەرەكــان، (واتـە: كافرەكانی مەككە)، پـێغـەمبەر ﷺ سـوپایەكی لـە تیـرهاوێژان لەسـەر شاخۆڵكەیەك دامەزرانـد، وە عەبدوڵـڵای كوڕی جوبـەیری كـردە بەرپرسـیان (لـە ڕیوایـەتی دیكـەدا دەڵـێ: تیـرهاوێژەكـان پەنجـا كـەس بـوون)، وە پـێــی فـەرموون: ئەگــەر ئێمـەتان بینـی سـەركەوتین هــەر مەجووڵــێن، لـە شـوێنی خۆتـان بـن، وە ئەگـەر ئـەوانتان بینـی بەسـەر ئێمـەدا سـەركەوتن، هـەر لـە شــوێنی خۆتــان بــنو مەجووڵــێن، (واتــە: لــە حــاڵی ســەركەوتنماندا یــان تێـشكانماندا، ئێـوە هـەر لـە شـوێنی خۆتــان بـن) دەڵــێ: كاتێـك كـە پێــیان گەیـشتینو بـەرەنگاریان بووینـەوە ئـەوان ڕایانكـرد، (دیـارە دوای ئـەوەی كـە لێیــان كـوژراوەو ئــاڵا هەڵگرەكـەیان كــوژرا، یەكێكــی دیكــە هەڵیگــرتەوەو ئەویـش كـوژرا، دەڵـێ: ئـاڵا هەڵگرەكـەیان نـاوی عوسـمانی كوڕی تەڵحــە بـوو، هـەتا دوایی ئاڵاكـەیان كەوتـبوو یـەك پیـاو نەیـدەوێرا بچێ هەڵیگـرێ، چونكە

ئەو کاتە ئەو کەسەی کە بەیداغی هەڵگرتوە، زیاتر بۆتە ئامانج کە تیری پێوەبنێنو ڕمی تێبگرنو بیکوژن، هەتا ئافرەتێك ئاڵاکەی هەڵگرتەوە، هەتا ئافرەتەکانم بینی بەسەر چیا هەڵدەگەڕان، لاقی خۆیان هەڵکردبوو تەشكو دامێنی خۆیان هەڵکردبوو خڕخاڵەکانی پێیان دیاربوو، لەو کاتەدا تیرهاوێژەکان دەستیان پێکرد گوتیان: دەستکەوت، دەستکەوت ! (واتە: با بۆ دەستکەوتەکە بچینە خوارێ) عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر پێی گوتن: پێغەمبەر ﷺ بە منی ڕاگەیاندوەو فەرمانی پێکردووم کە مەجووڵێن، بە قسەیان نەکردو سەرپێچییان کرد، کاتێك بەقسەیان نەکرد، خوا ئەوانی لادا، وە حەفتا کەسیان لێ کوژرا.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ﴾، کە پێشتریش باسمان کرد، لێرەدا خوای پەروەردگار بەبێ خاتر گرتن، دیارە کە خوای دادگەر خاتری کەس ناگرێ، بەو مانایەی کە پێویست بێ واقیعێك بخاتەڕوو بۆ مسوڵمانان، وەك خۆی دەیخاتەڕوو، نەك بفەرموێ: لەبەر ئەوەی مسوڵمانە با خاڵە لاوازەکەی یان خەلەلەکەی دەرنەخەمو، کەموکوورتییو عەیبەکانی دەرنەخەم! نەخێر، شتی وانیە، خوا ئەوەی کە پێویست بکات باسی دەکات، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّ ٥٣﴾الأحزاب، واتە: خوا لە گوتنی هەقو ڕاستیی شەرمێ ناکات، لێرەدا خوا ﷻ چۆنیەتی تێشکانو ڕاکردنی مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا، زۆر جوان بەرجەستە دەکات، دەفەرموێ: ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ﴾، بێننەوە بەرچاوی خۆتان کە ڕاتاندەکردو دوور دەکەوتنەوە، هەرچەندە بە (تَصْعَدُونَ)یش خوێنراوەتەوە واتە: سەردەکەوتن بۆ شاخ، بەڵام ئەم قیرائەتە بەهێزترە کە دەفەرموێ: ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ﴾، چونکە هەموویان بەرەو شاخ سەرنەکەوتوونو هەندێکی دیکەیان بە دەرو دەشتدا ڕۆیشتوون، هەتا هی

وایـان هــەبووە کـە زۆر دوورکـەوتۆتــەوە، وەك پـێـشـتـریش باسمـان کـرد، ﴿وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ﴾، وە ئاوڕتـان لـە کـەس نەدەدایـەوە، تەنـانەت لـە پـێغـەمبەری خـواش ﷺ ! پـێغـەمبەر ﷺ لە دواوەتـان بانگی دەکـردن، کە دیارە بـەو هۆیـەوە زانیویانـە پـێغـەمبەر ﷺ نـەکوژراوە، ئەگـەرنا دەنگـۆی ئـەوە بـڵاوبـۆوە کە پـێغـەمبەر ﷺ کـوژراوە، بـەڵام کە پـێغـەمبەر ﷺ بـانگی کـردنو فـەرمووی: (إلـيَّ عـبادَ اللّه) بەندەکانی خـوا من ئەوە لێرەم وەرنـەوە، کە لـە دواوە بەجێمـابوو، وە لــە دوژمــن لـە هــەمووان نیزیکتــربوو، وە کۆمەڵــێك لـە هــاوەڵانی بـەڕێز لـە پـشتیوانەکان - خـوا لێیـان ڕازی بـێ-، خۆیـان بـۆ کـردە قەڵـغانو سـوپەرو شـەهید بوون لە دەوروبـەری، وە طـەڵحـەی کوڕی عوبەیدوڵـڵا - خـوا لـێی ڕازی بـێ- دەسـتێکی شــەلەل بـوو، وە پەنجــەکانی بـڕان، ئــەوانی دیکــەی کـە لــە دەوروبـەری بـوون، وەك: ئـەبو بەکـر صـیددیقو عەلـی کـوڕی ئـەبو طـالیبو زوبیـری کوڕی عـەووامو ... هتـد، -خوا لە هـەموویان ڕازی بێ-، هـیچ کەسێکیان نەبـووە کــە بـە سـەلامەتیی دەرچـووبێ، یـان شـەهید بـوون، یـاخود زۆر بـە سـەختیی برینــدار بـوون، جـا خـوا لـێرەدا هــەموو وێنەکـانیان زۆر جـوان دەخاتە پـێش چاو، کـە ئێـوە ئـاوا بـەو شـێوەیە تێـشکاون، ئـەوە بۆچـی؟ بـۆ ئـەوەی کە پـەندی لـێوەربگـرنو، جارێکـی دیکە هەڵوێـستی ئاوا نـەنوێنن، وە عەیبــەی ئـاوا نەهێننــە سـەر خـۆیان، بـە تایبـەتی کـە پـێغــەمبەر ﷺ لـە دوایانـەوە بووبـێو بانگیـان بکـات بڵـێ: مـەڕۆن ! بـەڵام بـەجێ بهێڵـرێ! دیـارە لەلایەن هەندێکـیانەوە، ئەگـەرنا بـە تەئکیـد زۆربـەی هــاوەڵانی بەڕێــز - خــوا لـێیـان ڕازی بێ-، هەڵوێستیان وەك پـێویسـت بووە، بەڵام دیـارە:

**یەکـەم**: ژمارەیـان زۆر کەمتــر بـووە لـە کافرەکـان یـەك لەسـەر چـوار (٤/١)ی دوژمنەکانیانو بگـرە کەمتـریش بوون.

**دووەم**: بە هـۆی ڕەچاونـەکرانی ئـەو تەکتیکـە جەنگییـەش کە پـێغـەمبەر ﷺ داینـابوو، ئیـدی کافرەکان زەفـەریان پـێبـردوون.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡ﴾، واتە: خوا ﷻ لە سزای ئەوەدا کە ئێوە فەرمانی پێغەمبەرتان ﷺ شکاند، خەم لەسەر خەمی بەسەر هێنان، دڵتەنگیی لەسەر دڵتەنگیی، جا دوایی دەفەرموێ: ﴿لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡ﴾، بۆ ئەوەی دڵتەنگو خەمبار نەبن بەوەی کە لەدەستتان دەچێ، وە بەوەی کە بەسەرتاندێ، واتە: بەوەی کە قازانجێکتان لەدەست دەچێ، یاخود نارەحەتییەکتان بەسەردێ، بۆ ئەوەی دڵتەنگ نەبن، جا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ ؟ توێژەرەوانی قورئان زۆریان باسکردوە :

هەندێکیان گوتوویانە: واتە: خوای زاناو شارەزا هەواڵی شەهیدکرانی پێغەمبەری ﷺ بڵاوکردەوە، بۆ ئەوەی ئەم خەمە هێندە لە دڵتاندا گەورەبێ، ببێتە هۆی ئەوەی خەمەکانی دیکەتان هەر لەبیر نەمێنێ، عەرەبیش دەڵێ: (الْهُمُومُ يُنْسي بَعْضُهُ بَعْضاً)، واتە: خەمەکان هەندێکیان هەندێکیان لادەبەن، ئینسان دوو، سێ خەمی هەبن، ئەگەر خەمێکی زۆر گەورەی هات، خەمەکانی دیکەی هەر لەبیر دەچنەوە ! ئەوانیش کە ئەو خەمەیان بیستوە کە پێغەمبەر ﷺ شەهید بووەو کوژراوە، هەریەکجاریی شتەکانی دیکەیان لەبیر چۆتەوە، دوایی کە دەرکەوتووە پێغەمبەر ﷺ نەکوژراوە، وەك هیچیان بەسەر نەهاتبێ، هەندێکیان ئاوا تەفسیریان کردوە.

وە هەندێکیان گوتوویانە: خوای پەروەردگار بۆیە ئەو خەمو ناسۆرو نارەحەتییو ناخۆشییانەی لەو جەنگەدا بەسەرهێنان، تاکو دڵتان دامەزراو بە قوەت بێ، وە لەمەودوا واتان لێبێ بەرهەڵستیی خەمو نارەحەتیی یەکان بکەن، تا واتان لێبێ ئەگەر قازانجێکتان لە دەستچوو خەمی بۆ دانەگرنو ئەگەر نارەحەتیی یەکیشتان بەسەرهات، دیسان پێی خەمبارو نارەحەت

نەبن، بە شێوەیەکی وا کە لە پەلوپۆ بکەون، چونکە هەندێ لە هاوەڵان - خوا لێیان ڕازی بێ-، لەو ڕۆژەدا ئەو شکستەو ئەو خەمو نارەحەتییانە، ئەوەندە کاری تێکردوون، هەیانبووە ئەژنۆی شکاوە، هەیانبووە دانیشتوە وەك بڵێی کۆڵیداوە، بەڵام هەشیان بووە، گوتوویەتی: ئەگەر پێغەمبەریش ﷺ کوژرابێ، ئێوەش لەسەر هەمان ڕێباز جەنگ بکەن، وە بکوژرێن کە پێغەمبەری خوا لەسەری ڕۆیشتوە، کە یەکێك لەوانە ئەنەسی کوڕی نەضر بووە - خوا لێی ڕازی بێ-، مامی ئەنەسی کوڕی مالیك.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾، واتە: دوایی خوا ﷻ خەوێکی یا سووکە خەوێکی دڵنیاکەرو هێمنکەرەوەی بەسەرداهێنان، کە هەندێکتانی دادەپۆشی، دیارە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسان ئەگەر بەڕاستیی ئیمانداری باش بێ، لە نارەحەتترین کاتیشدا بایی ئەوەندە خۆڕاگریی و دڵ بەهێزیی دەبێ، کە خەوی لێ بکەوێ، بەڵام ئینسان ئەگەر زۆر لە مردن بترسێ، وای لێدێ، کە لە ترسان خەوی لێ ناکەوێو خەوی لێ دەزڕێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ کۆمەڵێکتان ئەو سەرخەوەتان شکاند، ئەو سووکە خەوە کە خوا بە ملی داهێنان، وە دەروونناسەکانیش دەڵێن: ئینسان لە کاتێکدا زۆر لە وەزعێکی دەروونیی نارەحەت دایە، ئەگەر بێتو سەر خەوێك بشکێنێ، با کەمیش بێ، ئەوە زۆر دەبێتە هۆی لاچوونی ئەو نارەحەتییو گرفتو حاڵەتە دەروونیی بارگرژییە کە بۆی دروست بووە لادەچێ[1]، وە دڵو دەروونی خاو دەبێتەوە، بۆیەش خوای کاربەجێ ئەوەی بۆ ئیمانداران کردوە، بەڵام هەندێکی دیکە کە ئیمانیان لاوازبووە، لەوەش بێ بەش بوونو لە ترسان خەویان لێ نەکەوتووە !!

١) من خۆم لە زیندانی ئەمریکاییەکان دا، پاش نارەحەتیی زۆر جاروبار ئەو جۆرە خەوەم بۆ دەهاتو بە زۆریش شتێکی پێکەنین پێکەنین هێنەرم دەبینی بەدەم پێکەنینەوە بێدار دەبوومەوەو، دەکەوتمە حاڵەتێکی دەروونیی زۆر جیاواز لە هی پێش خەوتن !

**مەسـەلەی پازدەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ يَقُولُونَ لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَا﴾، ئەمـە ئەوە دەگـەیەنێ کە ئینسان ئەگەر بێتو خـۆی کـرد بـە چـەقو هــەر لـە سـوورِگەو بازنـەی خۆیدا خولایـەوە، ئـەوە لـە نارِەحەتییانـدا خۆراگر نابێ، بەڵام کەسێك کە شـتێکی لـە خـۆی گـەورەتری هەبـێ، وەك بـڕوا بە خـواو، بـڕوا بــە دوارِۆژ، وا لـە ئینـسان دەکات کـە لـە سـەرووی خۆیـەوە بیـر بکاتەوە، بیـر لە ڕەزامەنـدیی خـوا بکاتـەوەو، بیـر لـە بەرژەوەنـدیی ئیـسلامو مـسوڵمانان بکاتــەوە، لـەو حاڵەتــەدا ئینـسان خـۆڕاگرتر دەبــێ، بـەڵام ئەگـەر ئینسـان خود میحـوەر بوو، هیچ شتێکی لە خۆی گەورەترو گرنگتـری نەبـوو، بـۆ خۆشـی کەوتــە مەترسـییەوە، ئـەوە یەکجــاریی لـە پـەلوپـۆ دەبــێ، جـا ئـەگـەر تەماشـا بکـەین ئـەو جۆرە کەسـانە کە ئێمـە ئـەو ڕایـەمان پەسـەند کــرد، کـە ئەوانـە هـەر مـسوڵمان بـوون، بـەڵام مـسوڵمانی ئیمـان لاواز بـوونو مسوڵمانی کـرچو کاڵ بوون، نەك مونافیقو دەغــەڵ بـووبن، خـوای کاربەجـێ، پێـنج هـەڵوێـستی لـەوانە بـاس کـردوون:

**یەکــەم:** ﴿أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ﴾، واتـە: خۆیـان بـەلاوە گرنگتــر بـوو لـە هەموو شـتێك، هـەر لە خەمی خۆیاندا بوون، کـەواتە: تـەنیا لـە خـەمی خـۆدا بـوون پـێـچەوانەی ئیمانداریێتــیو مــسوڵمانێتیی تــەواوە، وە نیــشانەی کــرچو کـاڵێتــییـە.

**دووەم:** ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ﴾، واتـە: گومـانی ناهــەقیان بــە خـوا دەبرد، گومانی نەفامیی، جا گومانی ناهەقو گومانی نـەفامیی، زۆر شت دەگرێتـەوە، بـەڵام بەپـێــی سـیاقی ئایەتەکـە ئـەوە دەگەیـەنێو واپـێدەچــێ گومــانی ئـــەوەیان بردبـــێ کـــە: تـــازە ئـــەوە ئیـــسلام کۆتـــایی پـێـهـــاتو

پێغەمبەریش ﷺ کوژرا، لەوانەیە هی وا هەبووبێ، گومانی وای بۆ دروست بووبێ کە ئیسلام هەر ڕاست نەبووبێو موحەممەد پێغەمبەری خوا نەبووبێ، بەڵکو هەر بەشەرێك بووەو ... هتد، وا پێدەچێ ئەو گومانەشیان بۆ دروست بووبێ، بەڵام دیارە گومان کە نەچەسپی، مانای وایە ئینسان پێی کافر نابێ، دەنا ئەگەر ئەو گومانە چەسپا لە دڵدا، ئینسان پێی کافر دەبێ، بەڵام ئەگەر وەك سێبەرێك هەر بە دڵ دابێ، بەڵام نەچەسپێ، با کوفریش بێ، ئینسانی پێ کافر نابێ.

**سێیەم**: ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ﴾، واتە: دەڵێن: ئایا ئێمە هیچمان بەدەستە؟! ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە زۆر بێ ئینصاف بووون، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەسەر بناغەی ڕاوێژ بە هاوەڵانی بڕیاریدا کە بچێتە دەری شارو بۆخۆیشی ڕای نەبوو کە بچێتە دەر، جا هەمیشە هەندێ کەس ئاوایە، لەکاتی نسکۆدا دەیەوێ دەستی خۆی بە خەڵکی بسڕێ، گلەیی لە ملی خەڵکی دیکە بکات، کە ئەوە شتێکی خراپە کۆمەڵێکن تووشی نسکۆیەكو بەڵایەكو گرفتێك بوون، شتێکی خراپە هەرکامێکیان بڵێ: خەتای تۆ بوو، خەتای تۆ بوو !! نا، خەتای هەمووان بووەو، ئنجا کێ زیاتری بەردەکەوێو کێ کەمتری بەردەکەوێ، ئەوە شتێکی دیکەیە.

**چوارەم**: ﴿يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ﴾، واتە: شتێك لە دەروونی خۆیاندا پەنهان دەکەن، کە بۆتۆی دەرناخەن، کەواتە: دیارە شتی لەوەش کە گوتوویانە خراپتر، لە دڵیاندا هەبووە، بەڵام هەر خوا پێی دەزانێ تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ پێی نەزانیوە، چونکە پێغەمبەریش ﷺ خۆ زانیاری نادیار (علم الغیب)ی نەبووەو، ئەوەی خوا پێی نەفەرموبێو لێی ئاگادار نەکردبێ، نەیزانیوە، جا ئایا ئەوە چی بووە کە لە دڵیاندا پەنهانیان کردوەو بۆ پێغەمبەریان ﷺ ئاشکرا نەکردوە؟ هەر خوا دەزانێ، گرنگ ئەوەیە شتی خراپ بووە.

**پێنجەم:** ﴿ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا ﴾، واتە: دەڵێن: ئەگەر هیچمان بەدەست بووایە، لێرەدا نەدەكوژراین ! ئەوە سەركۆنەكردنی قیادەیە، خەتای پێغەمبەر ﷺ دەگرن، دیارە ئەوەش سیفەتێكی زۆر سەلبیی و خراپە، كاتێك بەڵایەك و گرفتێك دێتە پێش، نابێ یەكسەر بچی سەركۆنەی قیادەو سەركردایەتیی بكەی ! مادام ئەو سەركردایەتیی و قیادەیە ڕاوێژی كردوەو بە ڕاوێژ بڕیاردراوە، ئیدی نابێ گلەیی لە كەسێك یان لە چەند كەسێكی دیاریكراو بكرێ، كەواتە: ئەو پێنج هەڵوێستە شتی خراپن و، دەبێ مسوڵمانان هەوڵبدەن شتی وا لە خۆیان نەوەشێننەوە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ﴾، واتە: پێیان بڵێ: ئەگەر لە ماڵەكانی خۆشتانبانایەو لە ژووری ماڵەكانیشتان دابان، ئەوانەی كە لەسەریان نووسرابوو بكوژرێن، دەكوژران، بە بەڵگەی ئەوە كە كوژران، دیارە پێشتر لە زانیاریی خوادا هەبووە كە دەبوو بكوژرێن، بۆیە ئەوانە هەر دەهاتن بۆ ئەو شوێنانەی كە لێی كوژراون، ئەو شوێنانەی لێی پاڵ خراون، هەر دەهاتنە شوێنەكانی خۆیان، جا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ واتە: لە دوای چوون مەچن، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (لە دوای چووان مەچوو)، ئەوەی كە كوژراوە، دەبوو هەر بكوژرێ، بۆچی؟ دیارە كاتی مەرگیان هاتوەو كاتی ئەجەلیان هاتوە، وە كوێش دیاری كراوە؟ لە كوێش جەنازەكانیان كەوتوون، هەر دەبوو لەوێش بكەون، ئەمە ئەو دەرسە فێری مسوڵمانان دەكات، كە مسوڵمانان دوای ئەوەی شتێك تێدەپەڕێ، نەیهێننەوە بۆ ئێرە، ڕابردوو مەهێننەوە ئێرە، تۆ دوای ئەوەی كە شتێك تێپەڕی، دەزانی دەبوو هەروابێ، تازە لە عیلمی ئەزەلیی خوادا بووە، ئەوە هەر دەبوو وابێ، پێشی هەوڵبدە وانەبێ، چونكە تۆ نازانی لە عیلمی ئەزەلیی خوادا چی هەیە ؟

بەڵام کە تازە قەوما، دەبوو هەروابێ، ئیدی پێویست ناکات بڵێی ئەگەر وابایە، وانەدەبوو، ئەگەر وانەبا، وادەبوو، ئەوە هەمووی قسەی بۆشن، وەك دوایی باسی دەکەین کە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە هێنانی وشەی ئەگەر (لو) واتە: ئەگەر وابووایەو ئەگەر واچووبایە.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾، واتە: بۆ ئەوەی ئەوەی لە سینەکانتاندا هەیە خوا تاقی بکاتەوە، یانی چی ؟ یانی: بەڕاستی وەك عەرەب دەڵێن: (الشّدائِدُ صَيْقَلُ الرّجال) واتە: سەختییەکان سپی کەرەوەی پیاوانن، لە مەحەك دەری پیاوانن، چۆن؟ ئینسان کەی خۆی دەناسێ، کەی خەڵکی دەناسێ؟ بێگومان لە سەختییدا، ئەگەرنا لە شێنەییدا هەموو کەس ئازایە، قسەی بەرئاگردانێ خۆشە، بەڵام تینی (یەکانە)[1] و قسەی بەرئاگردانی، لێك جیان، بەڵێ، وەك خوا فەرموویەتی ئەوەی لە سینەکانتان هەیە دەیەوێ تاقیتان بکاتەوە، داخۆ ئەوەی دەریدەبڕن چەندی ڕاستە؟ چەندی ڕاست نیە؟ ئەوە دەبێ ئەو نارەحەتییە بێتە پێش، ئەگەر نەهاتبایە پێش، کەی دەردەکەوت سێیەکی سوپایەکەی پێغەمبەر ﷺ مونافیق یان بەلای کەمەوە سادەو دڵنەخۆشە ؟! عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلول بە خۆیو بە سێیەکی سوپاوە نەکشایەوە ؟ جا ئەگەر هەمووش مونافیق نەبووبن، بە تەئکید مونافیقیان تێدا هەبوون کە عەبدوڵڵا خۆی سەرۆکیان بووە، بەڵام ڕەنگە هەندێکی ئیمان لاوازیشیان تێدا بوو بوون، واتە: مسوڵمانیش بوون، بەڵام دیارە وەلائیان زیاتر بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلول هەبووە تاکو بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئنجا خوای پەروەردگار باسی دوو کۆمەڵی دیکەی مسوڵمانانی کردووەو فەرموویەتی: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ... ﴿١٢٢﴾﴾

---

١) یەکانە، نێرەی بەرازەو (ماڵوس) مێیەکەیەتی، دیارە نێرەی بەرازیش شفرەیەکی تیژو بڕندەی هەیەو جێی مەترسییە، بۆیە گوتراوە "تینی یەکانەو قسەی بەر ئاگردان لە یەك جیان".

آل عمران، واتە: دوو کۆمەڵ لە ئێوە خەریك بوو فەشەل بێنن‌و پاشەکشە بکەن، ئنجا ئایا ئەگەر سەغڵەتیی نەیەتە پێش، ئەو خەڵکە چۆن دەردەکەوێ؟ وەك گوتم: هەموو کەس لە شێنەییدا ئازایە، بەڵکو ئینسان خۆیشی لە خۆی حاڵی نابێ، تا نەکەوێتە سەغڵەتیی یانەوە، نازانێ ئیمانی چەندە؟ تەقوای چەندە؟ چەند لەگەڵ خوا ڕاست دەکات ؟ چەند لە مردن دەترسێ، چەند لێی ناترسێ ؟ وە چەند شەهیدیی پێ خۆشە ؟ بەڕاستیی ئینسان تا نەکەوێتە سەغڵەتیی‌و نارەحەتییانەوە، خۆیشی ناناسێ‌و خەڵکیش ناناسێ.

**مەسەلەی چواردەیەم:** خوا تبارك وتعالى کە دەفەرموێ: ﴿وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ﴾، واتە: وە بۆ ئەوەی نێو دڵەکانتان بپاڵێوێ، ئایا جیاوازیی چییە لەگەڵ هی پێشێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾، واتە: بۆ ئەوەی ئەوەی لە سینەکانتاندایە خوا تاقی بکاتەوە، لە وەڵامدا دەڵێین: ئاشکرایە سینە دڵ دەگرێتە نێوخۆی، واتە: ئەوەی لەنێو دڵدایە پەنهانترە لەوەی لە سینەدا هەیە، ئەوەی لە سینەدا هەیە زۆرجار ئینسان بە قسە دەیڵێ، خواش قسەکان تاقی دەکاتەوە، بزانێ چەندی وایە چەندی وانیە ؟ بەڵام ئەوەی لە دڵدا هەیە جاری وایە لە ڕێی قسەشەوە دەرنابڕدرێ‌و ئینسان هەر لە دڵی خۆیدا پەنهانی دەکات، بۆیە ئەوە پێویستی بە پالاوتن هەیە، ئنجا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا ﷻ دەیەوێ دڵی ئیمانداران بپاڵێوێ‌و لە بێژینگی بداو خڵتەی پێوە نەهێڵێ، ئەوەش کاتێك دەبێ کە بکەوێتە نێو گرفتاریی‌و سەختیی‌و نارەحەتیی، تاکو لە خۆی حاڵی بێ، ئەوجار ئینسان چاو بە خۆیدا بگێڕێتەوە، کەواتە: خوای پەروەردگار چۆن دڵی ئێمە دەپاڵێوێ ؟ بەوە کە خوا ﷻ ئەوە لە میانەی ئەو ئایەتانەدا لێت حاڵی دەکات، کە تۆ چۆن بووی، هەڵوێستەکەت چۆن بووە، ئایەتەکان بۆت دەبنە ئاوێنەو، لە ئاوێنەی ئەو ئایەتانەدا تەماشای خۆت دەکەی، لە خۆت

حـالّی دەبـی، چ نەخۆشییەکـت هەیـە ؟ چ نوقتـە زوعفێکـت هەیـە ؟ چ کەموکووڕییەکت هەیە ؟ چاو بەخۆتدا دەگێڕیو خۆت پاكو چاك دەكەی.

**مەسـەلەی پـازدەیەم:** خـوای کـاربەجێ کـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، واتـە: خـوا بـە خـاوەن سـینەکان (نهێنیـیەکان) زانایـە، ﴿ذات﴾، یـانی: (صـاحب) خـاوەن، ئنجـا ئایـا بۆچـی خـوای پـەنهانزان نهێنییـەکانی نێـو دڵـی نـاو نـاوە (خـاوەنی سـینەکان)؟ لەبـەر ئـەوەی ئـەو نهێنییـانە لـەو سـینەو لـەو دڵـەدا چەسـپاون، وەك بڵـێی بوونەتـە خـاوەنی، ئەگـەرنا ڕواڵەتی تەعبیـرە کە دەخـوازێ کە بگوترێ: دڵو سینەکان خـاوەن نهێنییـەکانن! بـەڵام ئـەو تەعبیـرە لێـی دەفامرێتـەوە کـە نهێنییەکـان واچەسـپیون، بوونـەتە خـاوەن سـینەکان، وە لـێرەدا کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بـۆ ئـەوەی هـیچ کـەس گومـانی وانەبـێ کـە هەتا خوا عەبدەکانی تاقی نەکاتەوە نایانناسێ، بەڵـکو پـێش ئـەوەی تاقییان بکاتەوەش دەزانێ چییان لە دڵدا هەیە، دەزانێ چییـان لە سـینەو لە دڵیانـدا پەنهـان کـردوە، بـەڵام ئـەدی بۆچی تاقیـیان دەکاتـەوە ؟ تـاکو خۆیـان خۆیـان بناسـن، هـەتاکو لەسـەر ئـەرزی واقـیع بناسرێن، هەتـاکـو دوایـی کـەس نەڵـێ وەڵـڵا وادەبـوومو وادەچـووم، ئەگـەر تـاقی کرابامـەوە، ئـەوە تاقـی کرایـەوە، فەرموو ئـەوە خۆت ناسـیو تـۆ ئـاوای !!

**مەسـەلەی شـازدەیەم:** خـوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْ﴾، واتـــــــە، بێگومـان ئەوانـەی کە لـە ئێـوە پـشتیان هەڵـکرد، پـشتیان لـە دوژمـن کـرد، لـە ڕۆژی پـێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا، ئەوە بێگومان شـەیتان بە هـۆی هـەندێك کـردەوەوە کـە وەدەسـتیان هێنـابوون (کـە مەبەسـتی پـێ گوناهـە)، تـوانی زەفـەریان پـێبەرێو بیـانخلیـسکێنێ، واتـە: شـەیتان بـە هـۆی گونـاحو

سەرپێچیی پێشترەوە، ئێستا زەفەری پێبردوونو خلیسكاندوونی، كەواتە: ئەو طاعەتانەی كە ئینسان لە ڕابردوودا دەیانكات، ئێستا شوێنەواری باشیان دەردەكەوێ، وە ئەو گوناهانەی كە لە ڕابردوودا دەیانكات ئێستا شوێنەواری خراپیان دەردەكەوێ، بەڕاستی ژیانی ئینسان وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك پێكەوە پەیوەستە، ئەو گوناهەی كە ئەمڕۆ دەیكەی بۆ سبەینێ بەرهەمە تاڵەكەی دەبینیەوە، وە ئەو چاكەیەی كە ئێستا دەیكەی، كاتێكی دیكە لە داهاتوودا هەر لە دنیادا پێش قیامەت، بەرهەمە شیرینەكەی دەبینیەوە، ئەوەش خاڵێكی زۆر زۆر گرنگەو ئینسان كە گوناهێك كە دەكات، پێی وانەبێ بەس پەیوەندیی بەو كاتەوە هەیە، نا ئەو گوناهە دوایی شوێنەواری خۆی دەبێ بۆ داهاتووش، ئەوەتا لێرەدا كە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی كە لە ڕۆژی پێكگەیشتنی دوو كۆمەڵەكەدا لە ئێوە پشتیان لە دوژمن كرد، شەیتان بە هۆی ئەوەوە زەفەری پێبردوون كە پێشتر گوناهیان كردبوو، بە هۆی گوناهەكانی پێشوویانەوە شەیتان ئێستا زەفەری پێبردوون، هەروەك ئەوانەش كە دامەزراو بوون، بە هۆی چاكەو طاعەتی پێشترەوە، خوای بەرز وایكردوە بەرهەمی جێگیریی‌و خۆڕاگریی یان پێ ببەخشێ.

<u>**مەسەلەی حەڤدەیەم:**</u> خوای لێبوردە كە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ﴾، واتە: بێگومان خوا لێیانبورد، بەڕاستی خوا لێبوردەی هێدیی‌و مەندە، ﴿حَلِيمٞ﴾، واتە، هێدیی، مەند، ئارام، پەلە ناكات، هەروەها پێشتریش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، واتە: وە بێگومان خوا ئێوەی عەفوو كرد لە ئێوەی بورد، بێگومان خوا خاوەنی بەخششە بەسەر ئیماندارانەوە، كەواتە: ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەم ڕستە قورئانییە كە

دووجار دووبارە بۆتەوە، بە دوو تەعبیری جیا، کە خوا ئەوە عەفووی کردن، لە گەرمەی گێڕانەوەی بەسەرهاتی جەنگی ئوحودداو، لە گەرمەی باسکردنی کەموکووڕییەکانو تێشکانو هەڵاتنیاندا، هەر دەفەرموێ: ئەوە بە تەئکید خوا عەفووی کردن، ئەوە چی لێ وەردەگیرێ ؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو هەڵەو کەموکووڕیی‌و شکستە کە لە جەنگی ئوحود بە مل هاوەڵانی بەڕێزدا داهاتوە، لە خیانەتەوە نەبووە، چونکە بۆ زانیارییتان گوناهێك لە خیانەتەوە بێ، بە ئاسانیی نابوردرێ، بەڵام گوناهێك لە زوعفی بەشەرییەوە بێ، لەو کاتەدا کابرا ترساوە، یان لە بیری چووە، هەڵەی کردوە، ئەو گوناهانەی کە لە خیانەتەوە نەبن، ئاسانتر خوای لێبووردە دەیانبەخشێ لەو گوناهانەی کە لە خیانەتو لە نەخۆشیی دڵییەوەبن، دیارە ئەو هەڵەو کەموکووڕییەی کە لە هاوەڵانی بەڕێز روویدا، لە جەنگی ئوحوددا، لە خیانەتو ناپاکییەوە نەبووەو، شتێکی ڕیشەدارو ڕۆچوو نەبووە، بەڵکو شتێك بووە هەر لەو کاتەدا لێیان روویداوە، بەڵام ئەدی بۆچی لە مونافیقەکان خۆش نەبووە ؟ چونکە ئەوان هەر پێشتر گوناهەکەیان، نیفاقو دڵ نەخۆشییەکەیان، ڕیشەدارو ڕۆچوو بووە، یاخود جاری وایە خوای پەروەردگار هەندێك لەو قسانەی لە هەندێك هاوەڵان دەیگێڕێتەوە، دەشوبهێتە هەندێ قسەی کە لە مونافیقەکان دەگێڕرێتەوە، بەڵام هی ئەوان دەفەرموێ: عەفووم کردن، بەڵام هی مونافیقەکان عەفوویان ناکات، چونکە هی هاوەڵان شتێکی زووتێپەر بووەو، شتێك بووە شەیتان بەسەر زمانی داهێناون، وە شتێك بووە بەسەر دڵدیدا هێناون، کە کتو پڕو زوو تێپەڕ بووە، بەڵام هی مونافیقەکان شتێکی بەردەوامو ڕیشەدارو ڕۆچوو بووە.

خوای پەروەردگار ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە لەکاتی سەختیی‌و نارەحەتییەکاندا خۆڕاگرو دامەزراوو نەلەخشاو دەبن، وە خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ – خوا

لێیـــان ڕازی بـــێ- دەکەنــە سەرمەشـقی خۆیـان، ئــەو هاوەڵــە بەڕێزانــەی کــە بەڵــێ خــوای زانــاو شــارەزا لێــرە باســی کــەموکووڕییو کــرچو کــاڵیی هەنــدێکیان دەکــات، بــەڵام هەر ئەو هــاوەڵە بەڕێزانە بوون ئیسـلامیان بــە هــەموو دنیــادا بڵاوکــردەوە، گیانبــازییو فیــداکارییان کــرد، -خـــوا لێیـــان ڕازی بـــێ-و بـــە چاکتـــرین شـــێوە پاداشـــتیان بداتـــەوەو، یارمـــەتی ئێمـــەش بـــدات کـــە ئێمـــەش ئەوانـــە بکەینـــە سەرمەشـــقی خۆمـــان، لـــە ســـیفەتە پەســـندو باشـــەکانیانداو پەنـــدیش لـــە هەڵـــەو کەموکووڕییەکانیان وەربگریـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی: (١٥٦) تاکو (١٦٨) واتە: سێزدە ئایەت دەگرێتە خۆی، خوای پەروەردگار لەم ئایەتانەدا ئامۆژگاریی بڕواداران دەکات، کە وەك کافرەکان بیرنەکەنەوە، کە دەڵێن: ئەگەر وا نەبووایە بەو شێوەیە نەدەقەوما ! وە باسی ئەوە دەکات کە کوژران‌و مردن لە پێناوی خوادا، مایەی سەربەرزیی دنیاو دوارِۆژە، وە پاشان خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەری خۆی ﷺ دەکات، کە بە هۆی دڵنەرمیی‌و ڕەوشت جوانییەوە لەگەڵ دەوروبەریدا مەدار دەکات، وە پێویستە بەردەوام بێ لەسەر ئەو لێبوردەیی‌و ڕاوێژکردنەو، وە پاشان عەزیمەت‌و پشت بە خوا بەستن، وە ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو کە هەر خوا سەرخەرو ژێرخەرەو هەر ئەو خەڵك سەردەخاو، وە هەر ئەویش خەڵك ژێر دەخا، وە باسی ئەمینداریێتیی پێغەمبەر ﷺ دەکات کە دەست پاکە، وە دوایی باسی جیاوازیی نێوان ئەهلی ئیمان‌و ئەهلی کوفر دەکا، وە باسی چاکەی خوا بەسەر ئیماندارانەوە دەکات، کە پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردوون، کە چوار ئەرکی سەرەکییان لەنێودا ئەنجام دەدات، کە بریتین لە: خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا، وە تەزکیەکردنیان، وە کتێب فێرکردنیان‌و، حیکمەت فێرکردنیان، پاشان سەرکۆنەی ئیمانداران دەکات کە بۆچی لە کاتێکدا تێشکان سەریان سووڕما، لە حاڵێکدا کە تێشکانەکە بە هۆی خۆیانەوە بوو، وە پاشان حیکمەتی ئەو تێشکانە دەخاتەڕوو، کە بریتیە لە ناسرانی بڕواداران، وە ناسرانی کەسانی دەغەڵ‌و مونافیق‌و، ئەوانەی کە بانگی برایەکانیان دەکەن کە دابنیشن، وە نەچن بۆ جەنگ‌و جیهاد.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
أَوۡ كَانُواْ غُزّٗى لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ
يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ (١٥٦) وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوۡ مُتُّمۡ لَمَغۡفِرَةٞ
مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ (١٥٧) وَلَئِن مُّتُّمۡ أَوۡ قُتِلۡتُمۡ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحۡشَرُونَ (١٥٨)
فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ
وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ
(١٥٩) إِن يَنصُرۡكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمۡۖ وَإِن يَخۡذُلۡكُمۡ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعۡدِهِۦۗ
وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ (١٦٠) وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّۚ وَمَن يَغۡلُلۡ يَأۡتِ بِمَا غَلَّ يَوۡمَ
ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ (١٦١) أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِ
كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۚ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ (١٦٢) هُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ
بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ (١٦٣) لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ
يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن
قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ (١٦٤) أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ
قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ (١٦٥) وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى
ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١٦٦) وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ
مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ (١٦٧)
ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ
ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (١٦٨) ﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئــەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنــاوە ! وەك ئەوانــە مــەبن کــە بێبــڕوان، وە بــە برایـەکانیانیان گـوت: کاتێـك کـە بـە زەوییـدا ڕۆیـشتن (و بەســـەفەر چوون) یـان بوونــە جــەنگاوەر (وە مــردنو کــوژران) ئەگــەر ئەوانــە لای ئێمــە بوونــایە، نــە دەمـردنو نە دەشکوژران، تاکو خوا ئەوە بگێڕێ بە داخو خەفەت لـە دڵیانـدا، وە خوا دەژیەنێو دەمرێنێ، وە خـوا بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿١٥٦﴾ وە ئەگـەر لـە ڕێـی خوادا بکوژرێن یان بمـرن، ئەوە بێگـومان لێبـوردنو بـەزەیی یـەکی تایبــەت لە خـواوە (کە چاوەڕێتـان دەکات) لەوە باشتـرە کە کۆی دەکەنــەوە ﴿١٥٧﴾ وە ئەگــەر مردن یان کـوژران، ئەوە بێگومان هەر بۆ لای خوا کۆدەکرێنــەوە (کەواتــە: باکـتان چییە؟!) ﴿١٥٨﴾ تۆ (ئەی موحەممەد!) بە هـۆی بـەزەیی یـەك لـە خــواوە بۆیـان (بـۆ هاوەڵانتو شـوێنکەوتووانت) نـەرمو نیـان بـووی، وە ئەگـەر هاتبـاو قسەو ڕەفتار زبـرو دڵـڕەق بووایـەی ئـەوە بێگـومان لـە دەورت دەپـڕژان، دەجـا بۆیــە لێیــان خۆشــبەو داوای لێبوردنیـان بـۆ (لـە خـوا) بکـەو لـە کاروباریـشدا (وەك عـادەتی پـێـشووت) ڕاوێـژیان پـێبکــە، بــەڵام هــەرکات (پــاش ڕاوێژکــردن) دڵـت لەســەر بڕیارێك چەسپا، ئەوە پشـت بـە خـوا ببەسـتە (بـۆ جێبـەجـێ کردنـی) بەڕاستیی خــوا پـشت پــێ بەسـتووانی خۆشــدەوێن ﴿١٥٩﴾ ئەگـەر خــوا سـەرتان بخـات، هیــچ کــەس بەســەرتـانــدا زاڵ نـابــێو پـێتــان نـاوێرێ، وە ئەگــەر پشتیـشتان بەربــدا، ئـایا کـێ یە ئەو کەسەی کە دوای وی سـەرتانـدەخات؟ وە با بـڕواداران بـەس پـشت بــە خــوا ببەســتن ﴿١٦٠﴾ وە ناگونجــێ هــیچ پـێغەمبـــەرێك ناپاکــیی بکــات (لــە دەستکــەوتی جەنگــییو دزیــی بکــات)، وە هــەر کەسـێك ناپاکــیی بکــات، ڕۆژی قیــامەت ئـەو شـتەی بـە ناپاکـیی پەیـدای کـردوە دەیهێنــێ، پاشـان هـەرکەســە بەپـێی کردەوەی خۆی سزاو پاداشتی تەواوی خۆی دەدرێتەوە، وە ئەوان ستەمیان لێنـاکـرێ ﴿١٦١﴾ جـا ئایـا کەسـێك کـە شـوێن ڕەزامەنـدیی خــوا کـەوتوە، وەك ئــەو کەســە وایە تووڕەیی یەکی تایبـەتی لـە خــواوە پــێبڕاوەو شـوێنیـشی دۆزەخـە، کـە

خراپتـرین سەرەنجـامە؟ ﴿١٦٢﴾ ئەوانـە لـەلای خـوا پلـە پلـەن، وە خـوا بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿١٦٣﴾ بەڕاسـتی خـوا چاکـەی لەگـەڵ بڕوادارانـدا کـرد، کـە لەنێـو خۆیانـدا پـێغەمبەرێکی بـۆ نـاردن، ئایەتـەکانییان بەسـەردا دەخوێنێتـەوەو تەزکیـەیان دەکـاتو کتێـب (یاسـاکانی شـەریعەت)و حیکمـەت (ڕەوشـتو بەهـا بەرزەکان)یان فێر دەکات، وە بێگومـان ئـەوان پـێشتر لـە گومڕایی یـەکی ئاشکرادا بـوون ﴿١٦٤﴾ ئایـا کاتێـك بەڵایـەکتان بەسـەر هـات، کـە پـێشـتر دووقـاتی ئـەوەتان بەسەر بێبـڕواکان هێنـابوو، بـە سەرسـووڕمانەوە گوتتـان: ئەمـە لـە کوێـوەو چۆن بـوو ؟ بڵێ: ئەوە لەلایـەن خۆتـانەوە بـوو، بێگـومان خـوا لەسـەر هـەموو شـتێك بەتوانـایـە ﴿١٦٥﴾ وە ئەوەی کە ڕۆژی پـێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکە بەسـەرتان هـات، ئـەوە بـە ویـستو ڕێپـێـدانی خـوا بـوو، حیکمەتەکەیـشی ئـەوە بـوو کـە بـڕواداران بزانـێ ﴿١٦٦﴾ وە ئەوانـەش بزانـێ کـە دەغەڵـییان کـرد، وە پـێـیان گـوترا: وەرن لـە ڕێـی خـوادا بجـەنگن، یـان هەرنەبـێ بـەرگریی بکـەن، گوتیـان: ئەگـەر زانیبامـان جـەنگ لـە ئـارادا هـەیە شوێنتـان دەکـەوتین، ئـەوان ئـەو ڕۆژە لـە کوفـرەوە نیزیکتـر بوون وەك لە ئیمان، شتێك بەزاریـان دەڵێن کە لە دڵیـاندا نیـە، وە خـوا زانـاترە بـەوەی پەنهـانی دەکـەن ﴿١٦٧﴾ ئەوانـەی کـە دانیـشتنو بـە برایەکـانیانیان گوت: ئەگەر بەقسەمانیان کردبایە بەکوشـت نەدەچوون! بڵـێ: دە ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن مـەرگ لەخۆتـان دووربخـەنەوە ﴿١٦٨﴾))

## شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەکان

(﴿ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾): واتە: بە زەوییدا ڕۆیـشتن، (الـضَّرْبُ فِـي الأَرْضِ: الـذَّهَابُ فِـيهَا وَضَرْبُهَا بالأَرْجُل)، ئەو تەعبیـرە کە لـە عەرەبییـدا بـەکاردێ: (الـضَّرْبُ فِـي الأَرْضِ) واتە: لێـدان لە زەوی، بەزەوییدا ڕۆیشتن، چونکە ئینسـان کاتێـك کـە بە زەویـیدا دەڕوا، پـێی بەزەویـدا دەکـوتـێ.

(**غُزًّى**): وشـەی (غُـزّىً)، کـۆی (غَـازِي)یـە، (غَـازِي) واتـە: جەنگـاوەر، غەزاکـەر، (الغَـزْوُ: الْخُرُوجُ إِلَى مُحَارَبَةِ العَـدُوِّ، وَقَدْ غَـزَا يَغْزُو غَـزْوًا، فَـهُوَ غَـازٍ، وَجَمْعُهُ غُـزَاةٌ وَغُـزًّى)، وشـەی: (غُـزْوُ) واتـە: دەرچـوون لـە مـاڵ بـۆ جـەنگەو جیهادکردن لەگـەڵ دوژمـن، دەگـوترێ: (غَزَا يَغْزُو غَزْوًا) واتـە: جـەنگی کـرد، جەنگ دەکات، جـەنگ کـردن، (فَهُوَ غَـازٍ) ئـەو جـەنگاوەرە، وە وشـەی: (غَـازٍ) کە جەنگـاوەرە بە (غُـزاة) وَ(غُـزًّى) کۆ دەکرێتـەوە، واتە: جەنگـاوەرەکان.

(**حَسْرَةً**): بـە مانـای داخ و خەفـەت دێ، (الْحَسْرَةُ: الغَـمُّ عَلَى مَـا فَـاتَهُ وَالنَّـدَمُ عَلَيْـهِ، الْحَسْرُ: كَـشْفُ الْمَلْبَسِ عَمَّـا عَلَيْـهِ)، (حَسْرَةُ) واتـە: خـەمێك، پەشـێمانیی لەسـەر ئـەوەی کـە ئینـسان لەدەسـتی چـووە، وشـەی: (حَسْرَةُ) لـە (حَسْـر)ەوە هـاتوە، ئەوەیـە کـە کەسـێك قـۆڵی هەڵکـا، دەڵـێن: (حَسرَ عَنْ ذِرَاعَيْـهِ) وە (حَسْر) ئەوەیـە کـە پۆشـاکێـك لابـدەی لەسـەر ئـەوەی کـە دایپۆشـیوە وەك بڵێی: خەفەت وا لە ئینسان دەکات هێـزی نەمێنـێ، یاخـود عەیبی دەرکەوێ.

(**فَظًّا**): (الفَـظُّ: الكَرِيـهُ الْخُلُـقِ، مُـسْتَعَارٌ مِـن الفَـظِّ، أَي: مَـاءِ الكَرِشِ، وَذَلِـكَ مَكْرُوهٌ شُرْبُهُ لا يُتَنَـاوَلُ إِلا فِي أَشَدِّ ضَرُورَةٍ)، واتـە: ڕەوشـت نارێـك، یـاخود ڕەوشـت نـاجوان، وە وشـەی (فَظّ) لـە ڕیـشەدا بـە ئـاوی نێـو گـەدەی ئـاژەڵ دەگوتـرێ، بەتایبـەتی هـی حوشتـر، کـە دیـارە ئـەوەش خـواردنەوەی زۆر ناخۆشـە، مەگەر ئینسـان زۆر ناچاربـێ، ئەگەرنا کـەس بۆی ناخورێتـەوە، جـا وشەی (فَـظ)یش لە ئەسـڵدا بەو ئـاوە دەگـوترێ، بـەڵام دوایـی خـوازراوەتەوە بۆ ڕەوشتی نارێكو ناجوان.

(**غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ**): (الغِلْظَـةُ: ضِـدُّ الرِّقَّـةِ، وَأَصْـلُهُ أَنْ يُـسْتَعْمَلَ فِـي الأَجْـسَامِ وَيُـسْتَعَارُ لِلْمَعَـانِي)، وشـەی: (غِلْظَـةُ) پـێچەوانەی تەنکیی یە، لە ئەسـڵدا لـە جیسـمو لە شتی ماددییدا بەکاردێ، بـەڵام دوایـی خـوازراوەتەوە بـۆ شـتی مەعنـەویی، کەواتـە: (غَلِـيظَ القَلْـب) یـانی: دڵـڕەق، دڵپتـەو، پـێچـەوانەی (رَقيـق القَلْـب)ە،

یـانی: دڵناسـكو دڵنـەرم، واتـە: وا باشــە ئینـسان لەگــەڵ خەڵـكدا دڵی نـەرمو ناســك بـێ، نـەك دڵی زبـرو ڕەقو پتـەو بـێ، كـە هەسـتو نەسـتی بـە ئاسـانی نەجووڵـێ.

(لَانفَضُّواْ ): (الفَـضُّ كَـسْرُ الـشَّيءِ، وَالتَّفْرِيــقُ بَـيْنَ بَعْـضِهِ وَبَعْـضِهِ، وَاسْـتُعِيْرَ لانْفَـضاض القَـوْمُ)، وشــەی: (فَـضّ) بــە شـكاندنی شــتێك دەگــوترێ، كــە بەشـەكانی لێـك جیابكـەیەوە، بـەڵام دوایـی خــوازراوەتەوە بـۆ لێكـبڵاوبوونی خـەڵك كە بەشێوەیەكی خێرا لێك بپـرژێن.

(وَشَاوِرْهُمْ ): واتــە: ڕاوێــژیان پـێــبكە، جـا ڕاوێــژ یـانی چـی؟ دەڵــێ: (التَـشَاوُر وَالْمُـشَاوَرَة والـمشورَة: إستِخْرَاجُ الـرأي بِمرَاجَعَـةِ البَعْضِ إلى البَعْض) واتـە: هــەر ســێ وشــەی: (التَـشَاوُر وَالْمُـشَاوَرَة والـمشورَة)، واتــە: دەرهێنــانی ڕای پەسند لە ئەنجـامی ئەوەدا كە هەندێكیان قسە لەگـەڵ هەندێكـیانـدا بكـەنو پـێكەوە تاوتـوێی شـتێك بكـرێت.

(عَزَمْتَ): واتــە: بڕیـارتــدا، (العَــزْمُ والعَزِيْمَـةُ: عَـقْدُ القَلْـبِ عَلَـى إمْـضَـاءِ الأمْـرِ، يُقَـالُ: عَزَمْـتُ الأمْـرَ، وَعَزَمْـتُ عَلَيْـهِ)، واتـە: (عَـزمْ وعَزِيْمَـةُ): گرێـدانی دڵـە لەسـەر تێپـەڕاندنی كارێك، واتـە: دڵی خـۆت بـچەسپـێنی لەسـەر ئـەوەی ئـەو شــتە بكــەی، دەگــوترێ: (عَزَمْـتُ الأمْـرَ وَعَزَمْـتُ عَلَيْـهِ)، هــەردووكی واتــە: بڕیـاری یەكجارییم لەبارەی ئیشـەكەوە داوە.

(يَخْذُلْكُمْ ): واتــە: پــشتتان بەربـدا (الْخُـذْلآنُ: تَـرْكُ مَـنْ يُظَـنُّ بِـهِ أَنْ يَنْـصُـرَ نُصْرَتَهُ)، (خُذْلآنُ) ئەوەیە كە كەسێك گومـانو مەزەنـدەی ئـەوەی لـێ دەكـرێ سـەربخـات، ئەو كەسـەی كە ئەو تەوەقوعـەی لـێ هـەیـە، پشتی بەربـدا.

(يَغُلَّ ): واتــە: (يَخُـونَ) خیــانەت بكـا، (غَـلّ يَغُـلُّ إغْـلآلاً) دزیــی كـرد لـە مـاڵی جەنــگ، لــە دەســتكەوتی جــەنگ (الإِغْـلالُ: الْخِيـانَةُ) وشــەی: (إغْـلالُ و غُلول) بە مانای ناپاكییو دزی دێ، لە دەستكەوتی جەنگ.

(وَمَن ): (مَنَّ): چاکەی کردوە لەگەڵیان، یاخود نیعمەتی لەگەڵ کردوون (الْمِنَّـةُ: النِّعْمَـةُ الثَّقِيلَـةُ، وَيقَـالُ مَـنَّ فُـلانٌ عَلَـى فَـلان، إِذَا أَثْقَلَـهُ بِالنِّعْمَـةِ)، وشـەی: (مَنّ) لە ئەسڵدا واتە: چاکـەیەکی قـورس دەگـوترێ: (مَـنَّ فُـلانٌ عَـلَـى فُـلان، إِذَا أَثْقَلَهُ بِالنَّعْمَةِ) واتـە: فـلان کـەس بـاری فـلان کەسـی قـورس، کـردوە بـە چاکە، واتە: چاکەیەکی لەگـەڵ کـردوە بەزەحمـەت بـۆی هەڵبگیـرێ، کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ... ﴾، واتـە: بێگومـان خـوا چـاکەی لەگـەڵ ئیمانداراننـدا کـردوە، (وَإِذا كَانَ بـالقَوْلِ فَهُوَ مُسْتَقْبَحٌ)، وشـەی: (مَـنَّ عَلَـيْهِ) یـانی: منـەتی لەسـەر کـرد، ئەگـەر بـە کـردەوە ئینـسان چاکە لەگـەڵ کەسـێك بکات، ئـەوە مـەدح دەکرێ، بـەڵام ئەگـەر بەقسـە بـێ، ئـەوە خراپـە، واتـە: بەقسـە منـەت لەسـەر خـەڵك بکـرێ خراپـە، بۆیـە خـوا دەربـارەی عەرەبـە خێڵـەکییەکان کـە بـە منەتـەوە بـە پـێغـەمبەر ﷺ یـان گـوت: ئێمـە مـسوڵمان بـووین، خـوای پەنهـانزان رەخنـەی لێگـرتنو فـەرمووی: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواْ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ... ﴿١٧﴾ ﴾الحجرات، واتـە: منـەتت لەسـەر دەکەن کە مسوڵمان بوون بڵـێ: مسوڵمانەتییەکەتـانم لەسەر مەکەنە منـەت، (چونکە مسوڵمانەتییەکەتان شتێکی رووکەشەو هەر بەقسەیە).

(أَنَّىٰ هَٰذَا): (أَنَّ : لِلْبَحْـثِ عَـنِ الْحَـالِ وَالْمَكَـانِ)، وشـەی (أَنَّ ) ئامرازێکـە بەکـاردەهێنرێ بـۆ پرسـیارکردن دەربـارەی حـاڵو چـۆنیەتی، وە دەربـارەی شـوێن کە دەگوترێ: (أَنَّىٰ هَٰذَا) یـانی: لە کوێوە بـووە، یاخـود چۆن بووە؟

(فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ ): واتە: بە مۆڵەتی خـوا، یاخود بـە ویسـتی خـوا، یاخـود بـە فـەرمانی خـوا (الإِذْنُ فِـي الـشَّيءِ إِعْـلامُ بِإِجَـازَتِهِ وَالرُّخْصَـة فِـيهِ) کـە دەگوتـرێ: (أَذِنَ فِـي الـشَّيءِ) یاخـود (أَذِنَ فِيـهِ)، واتـە: ئاگـاداری دەکاتـەوە کـە رێگـەی داوە، یاخود مۆڵەتی داوە، (إذن) بەمانای ویسـت دێ، وە بەمانـای فەرمانیـش دێ.

(نَافَقُواْ): واتە: دەغەڵییان کردوە، مونافیقییان کردوە، جا وشەی: (منافق) لە چییەوە هاتوە؟ دەڵێ: (نَفَقَ الشَّيءُ: مَضَى وَنَفِدَ، نَفَقَ يَنْفِقُ) واتە: ئەو شتە تێپەڕیو ڕۆیی، یاخود خەرج بوو، یان بڕا، دەڵێ: (والنَّفَقُ: الطريقُ النَّافِذُ، وَالسِّرْبُ فِي الأَرْضِ النَّافِذُ فِيهِ)، واتە: وشەی: (نَفَق) بریتیە لە کونێك کە لەبن زەویدا لێ دەدرێو وە دوو دەرگای هەیە، بۆیە بە کونی جرجیش دەگوترێ (نَافِقَاء) کە لە بیابان کونێك لێدەدا دوو سەری هەن، لەوێ تینی بۆ هات، لەوی دیکەیان دەچێتە دەرێ، ئنجا ئایا بۆچی بە مونافیق دەگوترێ: مونافیق ؟ چونکە لەلایەکەوە خۆی بە بڕوادار دادەنێ، لەولاشەوە بە کافرەکان دەڵێ هەر لەگەڵ ئێوەم، بۆیە گوتراوە: (النِّفَاقُ: وَهُوَ الدُّخُولُ فِي الشَّرْعِ مِنْ بَابٍ وَالْخُرُوجُ عَنْهُ مِنْ بَابٍ)، (نِفَاقُ) بریتیە لە چوونە نێو ئیسلامەوە لە دەرگایەکەوە، وە لێ چوونە دەری لە دەرگایەکی دیکەوە، بۆیە خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٦٧)ی سووڕەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: بێگومان مونافیقەکان دەرچوون، واتە: هاتوونە نێو ئیسلامەوە بە ڕواڵەت، بەڵام لە لایەکی دیکەوە لێی دەرچوون.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّۚ وَمَن يَغۡلُلۡ يَأۡتِ بِمَا غَلَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٦١﴾ ﴾، {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي قَطِيفَةٍ حَمْرَاءَ فُقِدَتْ يَوْمَ بَدْرٍ، فَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لَعَلَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَذَهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ... ﴾، إِلَى آخِرِ الآيَةِ} أَخْرَجَهُ

أَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٣٩٧٣)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٠٠٩) وَحَسَّنَهُ، وَأبُـو يعلـى بـرقم: (٢٦٥١)[1]، وَصَـحَّحَهُ الألبـاني فِـي (صـحيح سُـنَن التِّرمِـذِيّ)، واتـــه: عـەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خـوا لـه خۆیو بـابی ڕازی بـێ دەڵـێ: ئـەم ئایەتـه دەربارەی قەطـەیفـەیەکی سوور ((قَطِيفَةٍ): جـۆرە پۆشـاکێکە) کـه لـه جەنگـی بـەدردا دیــار نــەما، کـە لـەنێو دەسـتکەوتو غەنیمـەتی جەنگیـدا هـەبوو، هـەندێك کـەس گوتیـان: لەوانەیـە پێغـەمبەری خـوا ﷺ هـەڵیگرتبـێ، ئیـدی خــوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی بـەو بۆنـەوە ناردۆتـە خــوارێ، کـە دەفـەرموێ: هـیچ پێغـەمبەرێك بـۆی نیـە ناپاکـیی‌و دزیـی بکـات، واتـە: نـەك هەرشـتی واناکـاو بگـرە هـەر لـێی ناوەشـێتەوە، بۆیـە جارێکـی دی گومـانی وا خراپ مەبـەن.

٢/ هـۆی هـاتنە خـوارەوەی ئەو ئایەتە کـە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٌ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٦٥﴾، {رَوَى ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ عَن عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ مِنَ الْعَـامِ الْمُقْبِـلِ، عُوقِبُوا بِمَـا صَـنَعُوا يَـوْمَ بَـدْرٍ مِـنْ أَخْذِهِم الْفِـدَاءَ، فَقُتِـلَ مِـنْهُمْ سَبْعُونَ، وَفَرَّ أَصْحَابُ الرسـول ﷺ عَنْـهُ، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُـهُ، وَهُشِّمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَـى رَأْسِهِ، وَسَالَ الـدَّمُ عَلَـى وَجْهِـهِ، وَأَنْزَلَ اللَّـهُ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٌ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٦٥﴾} أَخْرَجَـهُ ابْـنُ أَبِـي شـيبة بـرقم: (٣٧٨٣٩)، وَأَحْمَـد بـرقم: (٢٠٨) تعليق شعيب الأرنـاؤوط: إسنادُهُ حَسَنٌ رِجـالُهُ رجال الصَحِيح، وَكَنـز الْعمـال بـرقم: (٢٩٩٣٩)[2]، واتـە: ئیبنـو ئـەبی حاتیـم لـە عومـەری کـوڕی خەتتاب - خـوا لـێی ڕازی بـێ- دەگێڕێتـەوە کـە دەڵـێ: لـە ڕۆژی جـەنگی ئوحـود لـە سـاڵی داهـاتوودا (چـونکە جەنگـی بـەدر لـە سـاڵی دووەمـی کۆچـی بـوو، وە

١) أَخْرَجَهُ الطبري في (التفسير)، ج: (٤)، ص: (١٠٢)، وَابْنُ أبي حَاتِم، فتح القدير للشـوكاني، ج: (١)، ص: (٥٩٩).

٢) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابْنُ كثير، ص: (٢٥٨).

داهـاتوودا (چـونكە جەنگـی بـەدر لـە سـاڵی دووەمـی كۆچـی بـوو، وە جەنگـی ئوحـود لـە سـاڵی سێیەمی كۆچـیدا بـوو) مـسوڵمـانان سـزادران بـەوەی كـە لـە ڕۆژی بـــەدردا (لــە جــەنگی بــەدر) كردبوویــان، (كــە قــەرەبوویان وەرگــرت، فیدیەیـان وەرگرت لە دیلـەكانی كافرەكـان)، لـە تۆڵـەی ئـەوەدا حـەفتا كەسـیان لــێ كــوژرا لــە جــەنگی ئوحــوودا، وە هــاوەڵانی بەڕێــز هــەڵاتن پـێغــەمبەری خــوایان ﷺ بەجێهێــشت، وە پـێغــەمبەر ﷺ ددانــی موبــارەكی شـكا، (كــە خـودەكـەی چووبـووەوە نێو كوڵمـەی‌و ددانـی شـكاندبوو لەوێدا) وە ئـەو خـوودە كـە لەسـەری بـوو، شـكاو خـوێن بەسـەر دەموچـاوی موبارەكیـدا هاتـە خـوارێ (لـەوكاتـەدا مـسوڵمانان گوتیـان: ئـەوە بـۆ وامـان لـێهـات، ئـەوە چـۆن بـوو ئێمـە تێشكاین ؟) خـواش ئەم ئایەتـەی نـاردە خـوارێ، كـە وەك دوایـی باسـی دەكـەین دەفـەرموێ: ئـەوە خـەتـای خۆتـان بوو !

## مانـای گـشــتی ئایەتەكـــان

خـوای بـێ هـاوتـا دوای ئـەوەی كە باسی ڕووداوەكانی جەنگی ئوحـودی كـرد، وە نەخۆشــیی‌و لاوازییەكــانی خــستە بەرچاویــان، ئنجــا ئامۆژگــاریی ئیمانــداران دەكـــــــات‌و دەفـــــــەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ كَانُواْ غُزًّى لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێنـاوە ! وەك ئەوانە مەبن كە بێبـڕوان، لـە چیـیدا وەك وان نەبـن ؟ ﴿ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ ﴾، كە بە برایەكانی خۆیانیـان گـوت، واتـە: ئەوانــەی كـە بـرای نەسـەبیـی‌یـان بـوون‌و لـە جـەنگی ئوحـوددا كـوژرا بـوون، یـان برینـدار بووبـوون، یاخـود ئەوانـەی كـە ئـەو كافرانـە پـێـیان وابـووە، ئەوانـەی كـە كـوژراون هەنـدێك لەوانـەی لـە خزمــەت پـێغــەمبەردا ﷺ بــوون، پـێــیان وابـووە لەگـەڵ ئەوانـدا هاوبیـرو بـڕوان، یـان ئـەوان وایانـگومان بـردوە، یـاخود وەك لـە سـەرەتاوە گوتمان: مەبەست پـێی برایەتیی نەسـەبیی یە، چونكە خـوای پەروەردگـار وشـەی: (إخوة) لە قورئـاندا بەكـاردێنـێ بە دوو واتــا:

**یەکەم**: بە مانای برایەتیی ئیمانیی، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ...﴿١٠﴾ ﴾الحجرات، واتە: بێگومان بڕواداران خوشكو برای یەكدین.

**دووەم**: بە مانای برایەتیی ڕەچەڵەكیی‌و قەومیی، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ... ﴿٦٥﴾ ﴾الأعراف، ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ...﴿٧٣﴾ ﴾الأعراف، ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ... ﴿٨٥﴾ ﴾الأعراف، كە بە دڵنیاییی هیچ كام لە قەومی (عاد و، ثمود و، مدین) ئیمانیان بە (هودو، صالح‌و، شوعەیب) نەهێناوە، ئەدی برایەتییەكەیان لەچی دایە؟ برایەتیی نەسەبیی یە، برایەتیی ڕەچەڵەك‌و قەومایەتیی یە، نەك برایەتیی ئیمانیی‌و عەقیدەیی، جا ئەوانە چییان بە برایەكانی خۆیان گوت؟ ﴿إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى ﴾، كاتێك كە بە زەوییدا ڕۆیشتن، یاخود بەسەفەر چوون، یاخود چوون بۆ جەنگ‌و بوونە جەنگاوەرو جەنگیان كرد، وە دیارە لە ڕێیە مردوون یاخود كوژراون، ئەگەر بەسەفەر چووبن مردوون، وە ئەگەر لە جەنگدا بووبن، كوژراون ﴿لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ ﴾، گوتیان: ئەگەر ئەوانە لەلای ئێمە بوونایە نە دەمردن‌و نە دەشكوژران، واتە: ئەگەر لە ماڵێدا دانیشتبان‌و بە سەفەر نەچووبان، نەدەمردن، وە ئەگەر نەچووبان بۆ جەنگ‌و جیهاد نەدەكوژران، ئێوە وەك وان مەبن، ئەو جۆرە قسانە مەكەن، ﴿لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ ﴾، كە خوا ئەو جۆرە قسانەیان دەكاتە مایەی خەفەت پێ خواردن‌و دڵتەنگیی، واتە: بێجگە لە خەفەت پێ خواردن‌و دڵ‌و دەروون تەنگ بوون، ئەم قسانە هیچ سوودو بەرهەمێكیان نیە، واتە: ئێوە قسەیەك مەكەن كە هیچ سوودێكی نەبێ، ئەگەر یەكێكتان وەفاتی كردو مرد، بە مردنی ئاسایی، یاخود كوژرا، مەڵێن ئەگەر وانەبا وادەبوو، ئەگەر وانەبا وادەچوو ! تازە تێپەڕی، چونكە ئەو ئەگەر ئەگەرە، جگە لە خەفەت پێخواردن‌و دڵ پێتەنگ بوون، هیچ

بەرهەمێکی دیکەی نیە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾، وە خوا دەژیەنێو دەمرێنێ، ئەوەنیە کە کابرا بچێ بۆ جەنگ بکوژرێ، وە ئەگەر بەسەفەر بچێ بمرێ، بەڵکو ئەگەر کاتی مردنی هاتبێ، لەماڵیش بێ، بە ژانە سکێ دەمرێ، دڵی دەوەستێ، خانووی بەسەردا دەڕووخێ، چەندان جۆرە موصیبەتو بەڵا هەیە ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، کردەوەکانتان دەبینێ، نەك هەر دەیزانێ، دەشیبینێ، ﴿وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوۡ مُتُّمۡ﴾، ئەگەرهاتو ئێوە کوژران لە ڕێی خوادا یاخود مردن، چونکە خۆ هەموو کەس ناکوژرێ، جاری وایە کابرا دەمرێ لە وڵاخو سەییارە بەردەبێتەوە، بێ ئەوەی کە زەبری دوژمنی پێبکەوێ، واتە: لە جەنگکردن لە پێناوی خوادا هەر کوژران نیە، بەڵکو مردنیش هەیە، بۆ وێنە: کابرا لە ماڵ دەردەچێ بێ ئەوەی بگاتە دوژمن، بە هۆی دەردێکەوە، بە هۆی کارەساتێکەوە دەمرێ، جا دەفەرموێ: ئەگەر لەڕێی خوادا کوژران یاخود مردن ﴿لَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ﴾، لێبوردنێکی تایبەتو گەورە لە خواوە، وە بەزەیی یەکی تایبەت لە خواوە، چاکترە لەوەی کە کۆی دەکەنەوە لە ماڵو سامان، واتە: دەربەستی چیین ؟ ئێوە بێ باك بن لە مردنو لە کوژران، مادام لە ڕێی خوادا خەباتو فیداکاریی دەکەنو، دێنو دەچنو دەجووڵێن، لە مەرگو لە کوژران بێ باك بن، ﴿وَلَئِن مُّتُّمۡ أَوۡ قُتِلۡتُمۡ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحۡشَرُونَ﴾، وە ئەگەر هاتو ئێوە مردن یان کوژران، ئەوە بەرەو خوا کۆدەکرێنەوە، واتە: ئەگەر بە مردنی ئاسایی خۆتان بمرن، یاخود بکوژرێن، سەرەنجام هەر بۆ لای خوا دەچنەوەو کۆدەکرێنەوە، وە مادام دەچنەوە بۆ خزمەت خواو، ئیماندارنو بڕواتان بە خوا بووەو دۆستی خوا بوونو، پابەندی شەریعەتی خوا بوون، کەواتە: بێ منەت بنو بێ باك بن لە مردنو لێی مەترسێن، ئەگەر کەسێکتان لێ مرد، یان کەسێکتان لێ کوژرا، لە خۆی مەکەنە بەڵاو

موصیبەتێکی گەورە بڵێن: وانەبا وادەچوو، چونکە مردن هەر هەیە بە چوونە سەفەرو بە چوونە جەنگو جیهاد نیە، وە نەبێ ئەوانەی کە ناگەڕێن نەمرن، یاخود ئەوانەی کە جەنگ ناکەن نەکوژرێن ! ئنجا ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەکات دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴾، تۆ بە هۆی بەزەیی یەکی تایبەت لەلایەن خوای بە بەزەیی یەوە، بۆیان نەرم بووی، بۆ کێ ؟ بۆ هاوەڵانی بەڕێزی، بۆ شوێنکەوتووانی، بۆیان نەرم بوویو لەگەڵیان میهرەبانیو لێبوردەی، وشەی: (لـَيِّن) بەمانای نەرم دێ، لە ئەسڵدا بۆ شتی ماددیی بەکاردێ، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ حاڵەتێك کە ئینسان دڵی نەرم بێ، لێبوردنی هەبێ، هەستی ناسك بێو، بەزەیی هەبێ، ئەو حاڵەتە وشەی: (لَيِّن)ی بۆ بەکاردێ، وەك لە حەدیسدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {الْمُؤْمِنُونَ هَيِّنُونَ لَيِّنُونَ}، أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ في (شعب الإيْمَان) برقم: (٨١٢٩)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٩٣٦)، واتە: ئیمانداران ئارامو نەرمو نیانن، کەواتە: ئەی پێغەمبەر ! ﷺ تۆ بەهۆی ڕەحمەتی خواوە کە لەگەڵ تۆیدا کردووە، تۆی وا دروست کردوە فیطرەتەکەت وایەو سروشتەکەت وایە کە نەرم بی، میهرەبان بی لەگەڵ دەوروبەرت، لەگەڵ شوێنکەوتووانت ﴿ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴾، وە جا ئەگەر هاتباو ڕەوشتت ناجوان بووایە، هەڵسوکەوتت زبرو ناڕێك بووایە، دڵت ئەستوورو پتەوو زبر بووایە، لە جیاتی ئەوەی نەرمو نیان بی، ئەوە لەو حاڵەتەدا: ﴿ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴾، هاوەڵەکانت لە دەورت دەپرژان، هەڵبەتە لێرەدا بۆیە خوا وادەفەرموێ، چونکە دیارە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحوددا ئەو هەمووە نارەحەتییەی تووش بوو، مامی شەهید کرا، حەفتا لە هاوەڵە بەڕێزەکانی کوژران، زۆربەیان بریندار بوون بۆخۆشی بریندار بوو، بەڵام نەبیستراوە پێغەمبەر ﷺ گلەیی لە یەك کەس کردبێ، خوای کاربەجێ

لەجیاتی وی بابەتەکەی ڕوونکردۆتەوە، ئەگەرنا بێدەنگیی پێغەمبەری خوا، مانای وانیە کە نابێ قیادە هیچ شتێك بە سەربازەکان بڵێ، ئەگەر هەڵەش بکەن، بەڵام مادام خوا ﷻ لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ عەیبو عارو خاڵە لاوازەکانیانی خستۆتەڕووو پەنجەی خستۆتە سەر نەخۆشییەکانیان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هیچی لە ڕووی کەس نەداوە، جا خوای بەرز دەفەرموێ: تۆ بە هۆی ئەو دڵنەرمیی‌و ڕەوشت جوانییەتەوە، ئەو هاوەڵە بەڕێزانەت لە دەورت کۆبوونەتەوە، وە ئەگەر قسە ڕەق‌و دڵڕەق بووایەی‌و، ئەگەر ڕەوشتت نارێك بووایەو قسەت زبر بووایە، وە ڕووت ترش‌و تاڵ‌و دڵت ئەستوورو پتەو بووایە، ئەوە بە تەئکید لە دەورت دەپرژان، کەواتە: ئەمە دەرسێکی گەورەیە بۆ هەر کەسێك کە بەرپرسیارێتیی کۆمەڵێکی لەئەستۆیە، دەبێ ئەوە ڕەوشتی بێ، ئەگەرنا خەڵکەکە لە دەوری دەپرژێن‌و بە ملاولادا دەچن، ئەوجار چەند ئامۆژگارییەکی پێغەمبەر ﷺ دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ ﴾، واتە: تۆ مادام ئاوا ڕەوشت بەرزو جوان‌و دڵنەرم‌و میهرەبانی، کەواتە: یەکەم: لێیان ببوورە، لەو کەمتەرخەمییەی کە کردیان لە بەرانبەر تۆو، لە بەرانبەر ئیسلامدا، ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ ﴾، دووەم: داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، واتە: لە مافی خۆت بیانبوورەو بۆ مافی خواش داوای لێبوردنیان بۆ بکە، ﴿ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ ﴾، سێیەم: وە لە کاروباریشیدا ڕاوێژیان پێ بکە، یانی: بۆ کاروبار بەڕێوەبردن هەر ڕاوێژیان پێ بکە، جا ئایا حیکمەتی ئەو فەرمانپێکردنە بە ڕاوێژکردن لەم سیاقەدا چییە ؟ دەڵێین: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی پێ نەکردبانایەو خۆی بڕیاری دابایە، وا پێدەچێ تووشی ئەو شکستە نەبوونایە، ئەگەر لە مەدینەدا مابانەوە، بە بەڵگەی ئەوە کە لە غەزای خەندەقدا کافرەکان ئەگەر لە جەنگی ئوحوددا سێ هەزار کەس بوون، لە غەزای خەندەقدا دە هەزار کەس بوون، بەڵام چونکە مسوڵمانان لەنێو شاردا بوون، کافرەکان زەفەریان پێنەبردن، کەواتە بە

تەئكید لە جەنگی ئوحودیشدا، ئەگەر مسوڵمانان لە مەدینـە نەچووبانە دەر، كـە پـێغـەمبەر ﷺ بۆخـۆی ڕای وابـوو لەگـەڵ كۆمـەڵێك لـە هـاوەڵانی، ئـەو شكستەیان بەسەر نـەدەهات، بـەڵام زۆربـە ڕای چوونەدەریان هـەبوو، ئـەویش دوای ڕای زۆرینـەكەوت، هەڵبـەتە كە بـە دوای ڕای زۆرینـەش كـەوت، لـەوێش ئەگەر لە قسەی دەرنەچووبان، هـەر سـەركەوتوو دەبـوون، بـەڵام بـۆ ئـەوەی كـە هیــچ كـەس وا گومـان نـەبا، كـە بـە هـۆی ڕاوێژكردنـەوە ئـەم جەنگـەیان دۆڕاندوە، كەواتە با جارێكی دیكە ڕاوێـژیان پـێ نەكـاتەوە، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ ﴾، چـونكە ئەگـەر جـەنگێكیش بـدۆڕێنن بـە هـۆی ڕاوێــژەوە، هـەر باشتــرە لـە ڕاوێـژ نـەكردن، هـەر باشتــرە لـە تاكـڕەویی‌و لـە بڕیــاری یــەك لایەنــە، چـونكە ڕاوێژنــەكردن زەرەرو زیــانی زۆرتــرن لــە ڕاوێژكردنێـك، كـە جاری وایـە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی كارێـك بڕیـارێكی ڕاست‌و دروستـی لـەبارەوە نـەدرێ، چـونكە مـەرج نیـە هـەموو جارێـك ڕای زۆرینـە ببپـێـكـێ، وە پـێغـەمبەریش ﷺ بە ڕای زۆرینـەوە پابەند بووە، لـەو شـتانەدا كـە بەگشتی ڕاوێـژی بـە مـسوڵمانان كـردوە، ئەگـەر زۆرینـە ڕایـەكی بووبـێ پـێوەی پابەند بـووە، ئنجـا ئامۆژگـاریی چوارەمی دەكـات‌و دەفـەرموێ: ﴿ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ﴾، ئنجـا دوای ئــەوەی ڕاوێــژت پـێــكردن‌و بڕیارێكتانــداو دڵـتان سـاغ بـۆوە لەسـەر بڕیارێــك، وە تـۆ وەك كەسـی یەكـەم كە بڕیارتـداو دڵی خـۆت سـاغ كـردەوە لەسـەری، ئـەوە پـشت بـە خـوا ببەستەو بڕیارەكە جێبەجێ بكـە، بێگومـان خـوا پـشت پـێ بەسـتووانی خۆشـدەوێن، ئەوانەی خـوا دەكەن بە وەكیلـی خۆیان‌و كـاری خۆیـان حەواڵـەی خـوای كاربەجێ دەكـەن، دوای ئەوە هـۆكـارەكان ئامـادە دەكـەن، دڵـیان تەنیــا بـە خـواوە پەیوەسـتەو، دەزانـن سـەركەوتن تـەنیا لەلایـەن خـواوەیە، وە ئـەو كـارە ئەگەر سـەربگرێ، تـەنیا لەلایـەن خـواوە سـەردەگرێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ إِن يَنصُرۡكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمۡۖ وَإِن يَخۡذُلۡكُمۡ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ

بَعۡدِهِۦ ﴾، ئەگەر خوا سەرتان بخات، هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابیٚو هیچ کەس پێتان ناوێری، ئەگەر خوا پشتتان بگری، وە ئەگەر خوا پشتتان بەربدا (کە هەڵبەتە خوا لە خۆڕا پشتی ئیماندارا بەرناداو بە هۆی هەڵەو کەموکووڕیی خۆیانەوە پشتیان بەردەدا)، ئەگەر ئێوە کەموکووڕییەکتان هەبوو خوا پشتی بەردان لە دوای خوا کێ سەرتان دەخات، کەس هەیە ؟ نەخێر، ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، وە با بڕوداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، تەنیا دڵیان بە خواوە پەیوەست بێ، وە تەنیا بە هۆی خوای پەروەردگارەوە دڵیان بەهێز بێ، وە بزانن کە سەرکەوتنو سەرنەکەوتن تەنیا بڕیارەکەی لەلایەنی ئەوەوە دەدری، ئەویش دیارە بەپێی چەند یاسایەك، کەسانێك کە یاساکانی سەرکەوتن دەستەبەر دەکەنو کاری پێدەکەن، ئەوە بەپێی بڕیاری خوا سەردەکەون، وە ئەوانەش کە یاساکانی سەرکەوتن پشتگوێ دەخەن، دیارە تووشی شکستو تێشکان دەبن، وە لادان لە یاساکانی خوای کاربەجێ، ئەوە سەرەنجامەکەیەتی، وە هیچ کەسیش - وەك جاری دیکەش باسمان کردوە - لە بەرانبەر یاساکانی خوادا مافی (ڤیتۆ)ی نیە، بڵێ: من گوێ نادەمە یاساکانی خواو دەبێ هەر سەریش بکەوم ! یانی بۆ وێنە: کابرا ئەگەر مەلە نەزانێ، با ئیمانداری باشیش بێ مادام مەلە نەزانێ، ئەگەر بچێتە نێو ئاو دەخنکێ، یاسای خوا ئاوایە کە چوویە نێو ئاو دەبێ مەلە بزانی، کە مەلە نەزانی دەخنکێی، وە مرۆڤ ئەگەر مەلە بزانێ با کافریش بێ ناخنکێ، چونکە ئەوە یاسایەو خوا داینـاوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩ ﴾النجم، واتە: مرۆڤ مەگەر ئەوەی بۆخۆی کۆششی بۆ کردبێ، ئەگەرنا دەستگیری نابێ، بەڵام ئەدی جیاوازیی ئیماندارو بێ ئیمان چییە ؟ ئیماندار وێڕای ئەوەی کۆششی خۆی کردوە، خواش پشتی دەگرێو کارەکانی بۆ ئاسان دەکات، وە گرفتەکانی بۆ چارەسەر دەکات، ئەوەش هەر یاسای خوایە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ ﴾الطلاق،

واتــە: هــەر کەسـێك پـارێز لـە خــوا بکــات، خــوا دەرووی بــۆ دەکــاتەوە، وە دەفـــەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾ ﴾ الطـــــلاق، واتـــە: هەرکەسێك پارێز لـە خـوا بکات، خـوا کارەکانی بـۆ ئاسـان دەکـاتو دەرووی خێری لـێ دەکاتەوە، ئەوەش یاسای خـوایە، ئنجا دێتـە سـەر باسـی ئـەوە کـە ڕووداوێــك بــووە وەك لــە هــۆی هاتنــە خــوارەوەکەی دا، باســمان کــرد، کــە گومــانێك بـە پـێغـەمبەر ﷺ بـراوە کـە هەنـدێك دەڵێن: لـە جـەنگی بـەدردا جۆرە قوماشێك، کە قـەطیفـەیـەکی سـوور بـووە، دیارنـەماوە، وە هەنـدێك بـە دڵیــاندا هاتوەو گومانێکـیان بـۆ دروسـت بـووە، کـە لەوانەیـە پـێغـەمبــەر ﷺ ئەو قوماشەی بۆخـۆی هەڵگرتبـێ! بۆیـە خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، هـــیچ پـێغـــەمبەرێك (نـــەك موحەممەد ﷺ کە سەروەری پـێغەمبەرانەو کۆتـایـیو گەورەیانـە، هـەموویـان لــە لوتکــەی بــەرزی ڕەوشــت جوانییـــدا بــوون، بــەڵام موحەممــەد ﷺ لــە چـڵەپۆپەی لوتکـەکان دایــە، ئەگــەرنا هــەموویان لــە لوتکــە دابــوون) هــیچ پـێغـەمبەرێك بۆی نیــە ناپاکـیی بکـات، وشـەی: (غـل) یـاخود (إغلال) واتـە: دزیـی لـە غەنیمـەت، لـە دەسـتکەوتی جـەنگی، ﴿ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، هــەر کەســێکیش ناپــاکییو دزیــی بکــات لــە مــاڵی غەنیمــەتو دەسـتکەوتی جـەنگیی، ئـەوە لـە ڕۆژی قیامـەتیَ لەگـەڵ خـۆی دەیهێنـێ (بـۆ ئەوەی کە ئابـڕووی پــێ بچــێ، بـۆ ئـەوەی کـە پــێی شـەرمەزاربێ)، ﴿ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، پاشــان هــەموو کەســێك پـــڕ بـــە پێـستی کردەوەکانی خـۆی سـزا یـان پاداشـتی دەدرێتـەوە، چـی کـردوە پـڕ بـە پێستی ئەوە سـزا یان پاداشـتی خـۆی دەدرێتـەوە، وە سـتەمیان لــێ ناکــرێ، نە ئەگەر چاکەیان کردبـێ، چاکەکانیان بزر دەکرێن، وە نە ئەگـەر خراپەیـان کـردبـێ، لە خراپەکانیان زیـاتر سـزا دەدرێن، بەڵـکو ئەگـەر چاکەیان کردبـێ، بــە زیــادەوە پاداشـــت دەدرێنــەوەو، ئەگــەر خراپەشــیان کردبـــێ، تــەنیا بــە

ئەندازەی خراپەكانیان سزا وەردەگرن، جا لێرەدا یەكێك بۆ هەیە بپرسێ: ئایا ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتەكانی پێش‌و دوای خۆی چ پەیوەندییەكیان هەیە ؟! پەیوەندییەكەیان ئەوەیە كە لەوانەیە ئەوانەی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ یان شكاندو تەپۆلكەكەیان بەجێهێشت، ڕەنگە بەدڵیاندا هاتبێ، ئەگەر زوو نەچین بەشی خۆیان لەو دەستكەوتە جەنگییە كۆنەكەنەوە، ڕەنگە بەشیان نەدرێ، یاخود بەشیان ببرێ، یان پێغەمبەر ﷺ بەشی وان كەم بدات، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی جەنگی بەدریان دێنێتەوە بیر، یاخود ئەگەر ئەو ڕووداوە هەر نەشبووبێ، خوا پێیان دەفەرموێ: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە ناپاكیی بكاتو ئەگەر لەوێش نەبوونایە، بەقەدەر ئەوانەی كە لە پێشەوە بوون، بەشدار دەبوون لە دەستكەوتی جەنگییدا، مادام فەرمانی پێغەمبەر ﷺ تان جێبەجێ كردوە، وە دیارە ئێستاش ئەوە بنچینەیەكی شەرعیی یە: ئەوەی كە لەپێشەوەی جەنگو جەبهە دەبێ، لەگەڵ ئەوەی كە لە دواوەی جەنگو جەبهە دەبێ، هەموویان لە دەستكەوتدا وەك یەك بەشدارن، ئنجا دوایی خوای پەروەردگار بەراورد لە نێوان ئەوانەی كە لەپێناو خوادا دەژینو دەمرنو، ئەوانەی بەس بۆ دنیا دەژینو دەمرن، لە نێو ئیماندارانو بێبڕوایاندا، دەكات، هەندێكیش دەڵێن: ئەوە بەراوردە لە نێوان ئەوانە دایە كە دەستپاكنو دزیی ناكەن لە دەستكەوتو غەنیمەتی جەنگ، وە ئەوانەی كە ناپاكنو دزییو خیانەت دەكەن، بەڵام وا زیاتر دێتە بەرچاو كە بەراورد بێ لە نێوان جەنگاوەرانی ڕێی خواو شەڕكەرانی ڕێی شەیتان دا، ئەوانەی لەپێناوی خوادا دەجەنگن، وە ئەوانەی لە پێناوی غەیری خوادا شەڕ دەكەن، دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا ئەوەی بە دوای ڕەزامەندیی خوا كەوتوەو، مەبەستی ئەوەیە كە بگاتە ڕەزامەندیی خوا، وەك ئەو كەسەیە كە تووڕەیی خوای پێبڕاوە، وەك ئەوە وایە كە دەچێتەوە شوێنی خۆیو تووڕەیی خوای لەگەڵ خۆی دەباتەوە، چونكە (بآء) یانی: (رَجَعَ)، واتە: گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، ئەو شوێنەی كە لێی نیشتەجێیە، وەك لە

فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ دا هاتوە فەرموویەتی: {مَنْ كَذَبَ عَلَي مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٥٨٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٦١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٦٠)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ في (الكُبرى) برقم: (٥٩١٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣)، واتە: هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆ بە زمانی منەوە بکات، با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا دابنێ، کەواتە: ئەو کەسەی کە بە دوای ڕەزامەندیی خوا دەکەوێ کە پێی بگات، وەك ئەو کەسە نیە کە کارێك بکات، دوایی تووڕەیی خوا لەگەڵ خۆی بەرێتەوە ﴿ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُۚ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، وە سەرەنجام ژینگەی حەوانەوەی دۆزەخە، وە خراپترین شوێنیش کە ئینسان بۆی بچێو خراپترین سەرەنجامیش دۆزەخە، ﴿ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانە پلەپلەن لەلای خوا، واتە: ئەوەی کە کافرە پلەیەکی هەیە، ئەوەی بڕواداریشە پلەیەکی هەیە، وە لەنێو بڕوادارانیشدا دیسان پلەپلەن، کافرەکانیش لەنێو خۆیاندا پلەپلەن، وە وشەی: (درجات) بۆ چوونەخواریش بەکاردێو، بۆ چوونە سەریش بەکاردێ، بەڵام وشەی: (درکات) تەنیا بۆ چوونە خوار بەکاردێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ... ﴿١٤٥﴾ ﴾النساء، واتە: بێگومان مونافیقەکان لە پلەی خوارەوەی ئاگر دان، وشەی: (درکات) تەنیا بۆ دابەزینو چوونە خوارە، بەڵام وشەی: (درجات) بۆ چوونە سەریش بۆ چوونەخواریش بەکاردێ، بۆیە پەیژە پێی دەگوترێ: (درج) واتە: پەیژە، ئینسان پێشیدا دەچێتە سەرو پێشیدا دەچێتە خوار، خوا دەفەرموێ: ئەو خەڵکە بە ئیماندارو بێ ئیمانەوە، بە چاکەکارو بە خراپەکارەوە، هەر کەسە پلەی خۆی هەیە ﴿ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەوە کە هەبوونی پێغەمبەر ﷺ لەنێو ئیمانداراندا، چەند چاکەیەکی گەورەی خوایە، نیعمەتێکی چەند گەورەیە، دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾، بە ڕاستیی خوا چاکەی لەگەڵ بڕواداراندا کرد، کە لەخۆیاندا ڕەوانەکراوێکی بۆ ناردوون، واتە: ئەو ڕەوانەکراوەیان بەشەرە، وەك خۆیان مرۆڤەو، هەستو نەستی وەك خۆیانە، لێیان تێدەگاتو لێی تێدەگەنو دەتوانن هەڵسوکەوتەکانی ببینن، ئەدی ئەگەر فریشتە بووایە، ئەدی ئەگەر (جند) بووایە ؟ بە تەئکید ئەو حیکمەتەی کە خوای کاربەجێ ڕەچاوی کردوە، لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەراندا، ئەوکاتە ئەو حیکمەتە نەدەهاتە دی، چۆن دەبوو بە دوای پێغەمبەرێك بکەون کە فریشتە بووایە ؟ یان (جند) بووایە، یاخود جۆرە دروستکراوێکی دیکە بووایە، کەواتە: کە لەنێو خۆیان دا پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ کردوون، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، مەبەست پێی بڕوادارانی عەرەبە، واتە: خوا چاکەی لەگەڵ مسوڵمانانی عەرەب کردوە، کە پێغەمبەرێکی لە گەلی خۆیان بۆ ناردوون، بەڵام لەڕاستییدا ڕواڵەتی ئایەتەکەو سیاقی ئایەتەکە، چەمكو واتای ئایەتەکە فراوانتر دەخاتە بەرچاو وشەی: (المؤمنین) واتە: ئیمانداران، هەموویان دەگرێتەوە، وە بێگومان موحەممەد ﷺ وەك هەموو پێغەمبەرانی دیکە، کە لەنێو بەشەردا بووەو مرۆڤ بووە، وەك ئێمە، ئەوە چاکەو نیعمەتێکی گەورەی خوایە، ئنجا باسی ئەرکەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە چی دەکات لەنێو ئیمانداراندا ؟ دەفەرموێ: ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾، واتە: ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، تەزکییەیان دەکات (واتە: پاکسازیی‌و چاکسازیی‌یان دەکات)، وە کتێبو حیکمەتیان فێر دەکات، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە کە

مەبەست لە کتێبو حیکمەت چییە ؟ کە پێشتریش باسمان کردوە، هەرچەندە لە ڕابردووشدا لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابوون، بەلاَم ئاوا پێغەمبەر ﷺ دەیانهێنێتە نێو ڕۆشناییو هیدایەت، ئنجا خوا ﷻ ئیشکالو گرێ کوێرەیەك بۆ ئیمانداران دەکاتەوە، چونکە گرێ کوێرەیەكو پرسیارێکیان بۆ دروست بووە بە هۆی ئەو تێشکانەی جەنگی ئوحودەوە، دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَا﴾، ئایا کە بەلاَیەکتان تووش بوو، ئێوە پێشێ دوو قاتی ئەوەتان تووشی دوژمنتان کردبوو، گوتتان: ئەوە بە هۆی چییەوە بوو؟ یان چۆن بوو؟ یان لە کوێوە بوو؟ ﴿قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ﴾، سەرتان سووڕنەمێنێ، بلێ: ئەوە لە خۆتانەوەیە، ئەو شکستە بە هۆی کەموکووڕییو کەمتەرخەمیی خۆتانەوە تووشتان هات ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، دەیتوانی سەرتان بخات، بەلاَم یاسای خوا وای خواست کە بشکێن، بۆچی ؟ چونکە ئێوە کەمتەرخەمییو کەموکووڕییتان هەبووو، باجی ئەو کەمتەرخەمییو کەموکووڕییو سەرپێچییەتاندا، ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، ئنجا حیکمەتەکەشیان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: وە ئەوەی لە ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا تووشتان بوو، ئەوە بە ئیزنی خوا بوو، واتە: وە نەبێ خوا نەیویستبێو هەر بووبێ ! بەڵکو بە ویستی خوا وە مۆڵەتو ڕێ پێدانی خوا بوو، ئنجا بۆچیش بوو؟ ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، بۆ ئەوەی ئیمانداران بزانن، ئەدی خوا پێشتریش نەیدەزانی کێ ئیمانداری باشەو کێ کرچو کاڵە ؟ با، بەلاَم بۆ ئەوەی بە زمانی کردەوەو لە دنیای واقیعدا لە خۆیاندا بەرجەستەی بکەن، ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ﴾، وە ئەوانەش بزانێ کە نیفاقیان کرد، دەغەڵییان کرد، واتە: بۆ ئەوەی ئیمانداران دەرکەونو مونافیقانیش

دەرکەون، بە کردەوەی خۆیان، ئەگەرنا خوای پەنهانزان وەك عیلمی ئەزەلیی خۆی، هەموو شتێك دەزانێ، جا ئایا ئەو موونافیقانە کێن؟ ﴿ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُواْ ﴾، ئەوانەی کە پێیان گوترا: وەرن لە ڕێی خوادا بجەنگن، یاخود ئەگەر لە ڕێی خواشدا ناجەنگن بەرگریی بکەن، بەرگریی لە شارەکەتان بکەن، واتە: ئەگەر وەك عیبادەتو فەرمانبەریی بۆ خواش هەڵناستن، وەك بەرگریی لە ناموسو نیشتیمانتان، لە کەسوکاری خۆتان هەڵسن، بەلام ئەوان چییان گوت ؟ ﴿ قَالُواْ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ﴾، گوتیان: ئەگەر زانیبامان جەنگ دەبێ، شوێنتان دەکەوتین، جا ئەوە دوو واتای هەن، یەکەم: واتە: پێمان وانیە کە شەڕ ڕووبدات بۆیە نایەین، دووەم: یاخود ئەوەی کە ئێوە دەیکەن جەنگکردن نیەو خۆ فەوتاندنە، بۆیە ئێمە نایەین، دەفەرموێ: ﴿ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِ ﴾، ئەوان ئەو ڕۆژە (کە ئەو قسەو هەڵوێستەیان بوو) لە کوفرەوە نیزیکتر بوون وەك لە ئیمان ﴿ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ﴾، بە زار شتێك دەڵێن، کە لە دڵیاندا نیە، چییان دەیانگوت ؟ دەیانگوت: ﴿ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ﴾، ئەگەر زانیبامان جەنگ دەبێ، شوێنتان دەکەوتین، بە زار وادەڵێن، بەلام درۆ دەکەن، دەیانزانی جەنگ دەبێ، بەلام هەر نەهاتن ﴿ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴾، وە خوا زاناترە بەوەی کە دەیشارنەوە، لە خۆشیان باشتر دەیانناسێ.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْ ﴾، ئەوانەی کە دانیشتنو بە برایەکانی خۆیانیان گوت: ئەگەر بە قسەی ئێمەیان کردبایە نەدەکوژران، بە کوشت نەدەچوون، ئەو دڵنەخۆشو

دەغەڵو موونافیقانە وایاندەگوت، یاخود مسوڵمانانێکی ئیمان بێهێز، بەڵام واپێدەچێ ئەوە هەمووی یەك بێ، واتە: ئەو ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾ە، هەر (نافقوا)یە، یانی: موونافیقەکان هەم وایانگوتوەو هەم واشیانگوتوە، کە وەك گوتم: ئەوانەی کە لە نەسەبو ڕەچەڵەکدا برایان بوونو هەموویان خەڵکی شارێك بوون، هەموویان یەك تیرەو هۆز بوو، وە دەیانگوت: ئەگەر بە قسەی ئێمەیان کردبایە، بە کوشت نەدەچوون ﴿ قُلْ فَٱدْرَءُواْ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن مردن لە خۆتان دووربخەنەوەو مەهێڵن بمرن، ئایا سەلامەتیی بەوەیە ئینسان نەچێ بۆ جەنگو جیهادو دابنیشێ ؟ فەرموون ئێوە هەر لە ماڵی خۆتان دابنیشنو پیاوبن مەهێڵن بمرن !! ئایا هەر بە پیریی نامرن ؟ هەر لەبەر نەخۆشیی نامرن ؟ کەواتە: ڕاست نیە کە ئینسان ئەگەر نەچێتە شوێنی مەترسییەوە نەکوژرێ، نەمرێ، بەڵکو هەق ئەوەیە ئینسان دین چی لێ خواستو بەرژەوەندیی دنیاو دواڕۆژی لە چییدا بوو، وا بکات، وە لە مردن بێ باكو بێ منەت بێ، چونکە مردن کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە، وە مردن تەنیا لە مەیدانی جەنگدا نابێ، وە مردن تەنیا تووشی ئەو کەسانە نابێ کە هێرش دەبەن، بەڵکو جاری وایە ئینسان لە هەڵاتنێدا دەکوژرێ، هی واش هەیە لە ماڵی خۆی دانیشتوە، وەك گوتم هەر بە ژانەسکێ دەمرێ.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ ﴾، کە پێشتر تەفسیرمان کرد، ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە مسوڵمان دەبێ وریابێ، قسەو تەعبیری وەك هی خەڵکی کافرو بێبڕوا نەبێ، وە بیروبۆچوونو

تێڕوانینی وەك هی كەسانی بێبڕوا نەبێ، وە بەتەئكید ئینسان قسەو تەعبیری، هەروەها هەڵسوكەوتو ڕەفتاری، بەپێی ئەو عەقیدەو بیروبۆچوونەیە كە لە عەقڵو دڵیدا هەڵیگرتوە، وەك كوردەواریی دەڵێن: (دڵ مەنجەڵەو زمان كەوچكە) ئینسان چی لە هەناویدا هەڵگرتبێ، لە ڕێی تەعبیرو دەربڕینی زمانو هەڵسوكەوتی ئەندامەكانیشەوە، هەر ئەوە دەردەكەوێ، كەواتە: كە خوای پەروەردگار لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ ﴾، ئەی بڕوادارینە ! وەك ئەوانەی بێبڕوان مەبن، كە بە براكانیان گوت، واتە: بیروبۆچوونو تێڕوانینتان وەك هی ئەوان نەبێ، بۆ ئەوەی قسەو تەعبیریشتان هەروەها هەڵسوكەوتو هەڵوێستیشتان، وەك هی ئەوان نەبێ، چونكە ئەگەر بویستری، گۆڕان بەسەر قسەو تەعبیری كەسێكدا بهێنرێ، دەبێ گۆڕان بەسەر بیروبۆچوونیدا بهێنرێ، ئەگەر بمانەوێ ڕەفتاری كەسێك بگۆڕین، دەبێ عەقیدەی بگۆڕین، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ كَانُواْ غُزࣰّى لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ ﴾، بۆچی خوا ﷻ ڕێ لە مسوڵمانان دەگرێ كە بەو شێوەیە بیربكەنەوەو سەرەنجام قسەی وابكەن؟ چونكە لەڕاستیدا هەر شتێك كە ڕوویدا، تازە شتێكی بێجێیە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ دوایەو، بمانەوێ ئەوەی كە ڕوویداوە وای لێ بكەین كە ڕووی نەدابایە، واتە: هەر قسەیەك لەوبارەوە بكرێ، تەنیا كات بەفیڕۆدانە، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ بەكارهێنانی (ئەگەر) كە لە زمانی عەرەبیدا (لَـوْ)ی پێ دەڵێن، بە دەرگا كردنەوەی شەیتانی بەكارهێناوە، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینین: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ، وَلا تَعْجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلا تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَّرَ اللَّهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ

لَـوْ تَفْـتَحُ عَمَـلَ اَلـشَّيْطَانِ}) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٨٧٧٧)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (٢٦٦٤)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٤١٦٨)، وَالنَّـسَائِيُّ فِـي (الكُبرى) بـرقم: (١٠٤٥٧)، وَأَبُو يعلى برقم: (٦٢٥١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٧٢١)، واتـە: ئەبو هورەیرە - خـوا لێـی ڕازی بـێ-، دەڵـێ: پـێغـەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: بـڕواداری بـەهێز چاکتـرە، وە لـەلای خـوادا خۆشەویـستترە لـە بـڕوداری بێهـێز ﴿کـە لـێرەدا مەبەست پـێـی هـێزی جەستەیە، وە واشـپـێدەچـێو دەشگونجێ مەبەست پێـی هێـزی ئیمان بـێ، بـەڵام فەرمایشتەکە وشـەی: (قوي)و (ضَعيف)ی بـە گشتی هێنـاوە، کەواتـە: دەگونجـێ هـەم مەبەست پـێـی هێـزی جەسـتەیی بـێ، هـەم هێـزی عەقڵ، هەم هێزی ئیمان، هـەم هـێزی ئیـرادە، وە بـە تەئکـید ئـەوەی کە بەهێـزتربـێ لەلای خـوای پەروەردگار خۆشـەویستترە، بـەڵام ئەگـەر هـێزی جەستە مەبەسـت بـێ دەبـێ، بڵێین: ئـەو کەسـەی کـە جەسـتەی خـۆی بێهـێـز کـردوە، لـە ئەنجـامی کەمتەرخەمییـدا، ئەگـەرنا خـوا ﷻ ئەگـەر کەسێکی بـە جەستەو لـەشو لارێکـی بێهـێزەوە خولقـاندبێ، ناگونجـێ یـەکێکی دیکەی لـەو خۆشتـر بوێ، کـە ئـەوی بـە جەستەیەکی بەهێـزەوە خوڵـقاندوە، کەواتـە: ئـەو بێهێزیی (ضُعف)ە، مەبەست پـێـی لاوازیـی جەستەیی یـە، واتـە: جەستەیەکی لاواز کـە لـە ئـەنجامی کەمـتەرخەمییـدا لاواز بـووە، ئەگـەرنا مەبەسـت پـێـی هێـزی ئیمـان، یـان هێزی ئیـرادەیە، کـە ئینـسان بۆخـۆی وەدەسـتیان دێنـێ، جا دەفەرموێ: هـەمووشیان هـەر خێـریان تێدایە، واتـە: هـەر کەسـە کەلـێنی خـۆی هەردەگـرێ﴾. (احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ) سـووربە لەسـەر ئـەوەی کـە سـوودت پێ دەگەیـەنێ، (وَاسْتَعِنْ بِاَللَّهِ، وَلاَ تَعْجَـزْ)، واتە: پەنا بـە خـوا بگـرەو یارمـەتی لە خـوا بخـوازە، وە خـۆت تەنبـەڵو دەسـتەپاچە مەکـەوە، (وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَّرَ اَللَّـهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ) ئەگـەر شتێکـت تـووش بـوو مەڵـێ: ئەگـەر مـن وامـکردبا واو وادەبـوو، بەڵـکـو بڵـێ: ئەوە قـەدەری خـوا وابـوو، خـوا وای ئەنـدازە گیـریی کردبـوو، وە ئـەوەی خـوا بیـەوێ ئـەوە دەکـات، بۆچـی وا مەڵـێ ؟ (فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ اَلشَّيْطَانِ)

چونکە (لَوْ) واتە: ئەگەر، دەرگای شەیتان دەکاتەوە، فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆر زۆر جوانە، ئینسان دوای ئەوەی کە شتێك ڕوودەدات، ئەگەر بڵێ: ئەگەر وا بووایە، ئەگەر واچووبایە، ئەگەر وامنەکردبایە، ئەگەر فلان کەس وایگوتبایە، ئەو ئەگەرانە هەموو بێسوودن، چونکە تازە واکراو وا قەوما، بۆیە ئەوە تەنیا دەرگا کردنەوەیە بۆ خوتخوتەی شەیتان، بۆ ئەوەی ئینسان دڵی نارەحەت بێ، ئەگەرنا هیچ سوودێکی دیکەی تێدانیە، بەڵێ ئینسان دەبێ لە هەڵەو کەموکوڕییەکان دەرس و پەند وەربگرێ، بەڵام ڕابردوو نەهێنێتەوە بۆ ئێستا، وە بیکاتە مایەی داخ و حەسرەت بۆخۆیو پەکی خۆی پێ بخات، ئنجا پێشتریش باسمان کرد کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ﴾، وە بە براکانیان گوت: گوتمان یان مەبەستی پێ برایەتیی نەسەبیی یە، یاخود مەبەست ئەوەیە: ئەوان وایانزانیوە، کە ئەوانەی کە کوژراون هەرچەندە ئیماندار بوون، بەڵام وایانزانیوە کە هاوفیکریانن بە گومانی خۆیان، بە برای دینیی خۆیانیان زانیون، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەستیان پێی برایەتیی نەسەبیی بووە، واتە: لە ڕووی ئینتیمای هۆزو عەشیرەتەوە لەوان بوون، ئەگەرنا ئینسانی کافرو دڵنەخۆش لەگەڵ ئینسانی ئیماندار نابێتە برا، برای عەقیدەیی و فیکریی.

<u>مەسەلەی دووەم:</u> کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾، ﴿وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴾، واتە: وە ئەگەر لە ڕێی خوادا (واتە: لە جەنگو جیهاددا) کوژران، یاخود بە مردنی خۆتان مردن، ئەوە لێبوردنێکی تایبەتو بەزەیی یەکی تایبەت لە خواوە باشترە لەوەی کە کۆی دەکەنەوە، واتە: ئەگەر بمێنن چی دەکەن ؟ ماڵو سامان کۆدەکەنەوە، کەسابەتی زیاتر دەکەن، بەڵام ئەگەر لە ڕێی خوادا بڕۆن، جا چ بە کوژران بێ، چ بە مردن بێ، لەو ماڵ کۆکردنەوەیە باشترە،

﴿ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴾، وە ئەگەر مردن یاخود كوژران، واتە: با لە ڕێی جەنگو جیهادیشدا نەبێ، بەهەر هۆیەك لە هۆیەكان، ئەگەر ئینسان بمرێ یان بكوژرێ، چونكە مەرج نیە ئینسان لە مەیدانی جەنگو جیهاددا بكوژرێ، وە مەرج نیە ئینسان تەنیا لە مەیدانی جەنگو جیهاددا بمرێ، ئەگەر بەهەر شێوەیەك لە شێوەكان مردن، یاخود كوژران، ئەوە بەرەو خوا كۆدەكرێنەوە، كەواتە: لێبوردنو بەزەیی خوا ﷻ چاوەڕێتانە، بۆیە بێ باك بن لە مردن لە ڕێی خوادا، وە بێ باك بن لە كوژران، ئەوە ئەگەر لە ڕێی جەنگو جیهاددا ڕۆیشتن، خۆ ئەگەر لە ڕێی جەنگ جیهادیشدا نەبێ، دیسان دەگونجێ ئینسان بمرێ، بە مردنی خۆی یاخود بكوژرێ بە ڕووداوێك، بەڵام دیسان لەو كاتەشدا بێ باك بن، چونكە دەچنەوە بۆ لای خوا ﷻو بەرەو لای پەروەردگارتان كۆدەكرێنەوە، كەسێك بزانێ سەرەنجامەكەی بۆ لای خوای پەروەردگارەوە، بزانێ دوا مەنزڵی دەچێتەوە خزمەت پەروەردگاری، دەبێ بێ باك بێ، بەڵام جێی خۆیەتی كەسێك بترسێ كە پێی وایە مردن چاڵێكی ڕەشە ئینسان دەكەوێتە نێوی‌و، چاڵێكی بێ بنەو، جارێكی دیكە نایەتەوە دەر، ئەوە بەڕاستی ئەوانە جێی خۆیەتی كە لە كوژران‌و مردن بترسێن، وە زۆر دەست بە ژیانەوە بگرن، بەڵام ئینسانی ئیماندار كە دەزانێ مردن‌و كوژران دەروازەیەكە ئینسان لێیەوە دەرباز دەبێت بەرەو ژیانێكی هەتاهەتایی‌و هەمیشەیی، كە دیارە ئەگەر ئیمانداریش بێ دەزانێ كە (إن شاء الله) دەچێتە نێو ڕەزامەندیی‌و ڕەحمەتی خواوە، ئەوە بەڕاستیی مردن‌و كوژران نابێ بیترسێنێ‌و ئەژنۆی بلەرزێنێ.

__مەسەلەی سێیەم:__ كە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴾، واتە: تۆ بە هۆی بەزەیی لە خواوە، بۆیان نەرم بووی، ئەمە دوو شتی لێ وەردەگیرێن:

**یەکەم**: خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکان، (واتە: فضائِل) بە یارمەتی خوا ﷻ وەدەست دێن، کاتێك کە ئینسان ڕەوشتێکی جوان، یاخود چەند ڕەوشتێکی جوان لەخۆیدا دەبینێ، نابێ بەخۆی سەرسام بێ، بەڵکو دەبێ بزانێ ئەوە بە یارمەتیی و پشتیوانیی خوایەو، خوای پەروەردگار بۆی ئاسان کردوە، بەلاَم ئەگەر خراپەی لەخۆیدا دی، دەبێ گلەیی لەخۆی بکات، بۆچی ؟ چونکە خوای پاكو چاك خراپەی ڕق لێ هەڵدەستێو خراپەی پێ خۆش نیە، وە پێی خۆش نیە خراپە هەبێ، بەلاَم چاکەی حەز لێیە، وە پێی خۆشە پەیدابێ، بە بەڵگەی چی ؟ بە بەڵگەی ئەوە کە شەریعەتەکەی فەرمان دەکات بە هەموو شتێکی چاك، وە هەموو شتێکی خراپ قەدەغە دەکات، کەواتە: دیارە خوا چاکەی پێ خۆشەو خراپەی ڕق لێ هەڵدەستێ، وەك بۆخۆشی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾﴾ المائدة، واتە: بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾﴾التوبة، واتە: بێگومان خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن، ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾﴾آل عمران، واتە: وە خوا ئارامگرانی خۆشدەوێن، بەلاَم لەولاوە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾﴾آل عمران، واتە: بێگومان خوا کافرانی خۆشناوێن، ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾﴾آل عمران، واتە: وە خوا ستەمکارانی خۆشناوێن، مانای وایە کاتێك کە ئینسان ڕەوشتێکی چاكو سیفەتێکی چاكو کردەوەیەکی باش لەخۆیدا دەبینێ، دەبێ بزانێ کە ئەوە شتێکی تێدا پەیدابووە کە خوا خۆشی دەوێ، وە بە یارمەتی خوا پەیدابووە، وەك لێرەدا ئایەتەکە ئاماژەی پێ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴾، واتە: تۆ بە هۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرم بووی، وە لە

سوورەتی (النساء)دا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ...﴿٧٩﴾ ﴾، واتــە: هـەر چـاكەیەكت كردبــێ لــە خـواوەیە، وە هـەر خراپەیەكـت كردبـێ لەخۆتـەوەیـە، بۆیـە ئینسان دەبـێ هەمیـشە خراپەكـان بگەڕێنێتــەوە بۆخـۆی، وە چـاكەكانیش بـە نیعمـەتو فـەزڵو بەخشینی خـوای بەخشـەر بزانێ.

دووەم: شــتێكی دیكەشــی لــێ وەردەگیــرێ، ئـەویش ئەوەیــە كـە ئینــسانی بـەرپرسو فەرمانـدە، پێویـستە لەگـەڵ بەردەسـتو شوێنكەوتووەكـانیدا نەرمونیـانو بـە بـەزەیی بـێ، وە ڕووگـەشو ڕووخـۆشو زمـان شیـرین بـێ، پـێغـــەمبەر ﷺ لەگــەڵ ئەوەشــدا كــە پـێغەمبــەری خــوا بــووە، خــوا دەفـەرموێ: بە هۆی ئـەوەوە كە نەرمو نیـانو خۆشڕەفـتاری، هـاوەڵەكـانـت لـە دەورتـنو ئەگــەر وا نەبووایــەی، ئـەوە لـە دەورت دەپــرژان، وەك لــە مەسـەلـەی چوارەمدا دەیخـەینـە ڕوو.

<u>مەسـەلەی چـوارەم</u>: ﴿ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴾، ئەگـەر تـۆ ڕەفــتار نارێـك بووایــەیو، هەڵـسوكەوت زبـر بووایـەیو، دڵـت ڕەق بـووایــە، ﴿ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴾، ئەو هاوەڵە بەڕێزانەت لە دەورت دەپـرژان، پـێشتـریش باسمان كـرد وشــەی: (فَظّ) لە ئەسـڵدا بـە ئـاوی نێـو گــەدەی ئـاژەڵ دەگوترێ بەتایبــەتی حوشتــر، كـە دیــارە تـامو بـۆنێكی ناخۆشــی هەیــەو، ئینــســان زۆر ناچار نەبــێ بـۆی ناخورێتــەوە، مەگەر خـەریك بــێ لـە تێنـوان بخنكـێ، ئـەوە مانـای وشـەكەیە لـە ئەسـڵدا، بـەڵام دوایـی خــوازراوەتەوە بـۆ هـەر ڕەوشــتو ڕەفتارێكی ناشیـرینو نارێـك، جا خـوا بـە پـێغـەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگـەر تـۆ ڕەفـتارو ڕەوشــتت نــارێك بـووایەو، قـسەت زبـر بووایـە، وە ڕووت تـرشو تـاڵو هەڵسوكەوت نارێك بووایە، ﴿ غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ ﴾، دڵیـشت پتـەوو ئەسـتوورو ڕەق بووایــــە، ﴿ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴾، لــە دەورت دەپـــرژان، كەواتـــە: دیـــارە

پـــێغەمبەر ﷺ پێــچەوانەی ئـــەو دووانـــەیە، وەك ئایەتەكــەی پێـــشتـر دەفەرموێ: ﴿ لِنتَ لَهُمۡ ﴾، هەم قسەت نەرمە لەگەڵیان، هـەم دڵـت لەگەڵـیان بە ڕەحمو بەزەیـی یـە، هـەم ڕووت لەگەڵـیان گەشو جوانـە، وە هـەم لەگەڵیان میهرەبـانو لێبـوردەی، بۆیـە بـە دەورتـەوەن، وە ئەگەر وا نەبووایـەی لـە دەورت دەپـرژان، ئـەوەش بەراسـتیی پەنـدێکی گـەورەی لــێ وەردەگیــرێ، کـە ئەگـەر پێغـەمبەری خــوا ﷺ بـە هـۆی ئـەو ڕەوشـتە بـەرزو جوانـەیەوە وابـووە، بـە هۆی ئەو دڵنەرمـیی‌و میهرەبـانییەوە وابووە، کە هاوەڵەکانی بە دەوریـەوە بـن، ئـەدی غـەیری پێغـەمبەر ﷺ !! مانـای وایـە ئەگـەر وانەبــێ چاکتــر خەڵـکی بەدەوریـەوە نامێنـێ.

**مەسـەلەی پێنجـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ﴾، خـوا ﷻ سـێ فـەرمان بـە پێغـەمبەر ﷺ دەکـات: یەکـەم: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ ﴾، لێیـان ببــوورە، دووەم: ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ ﴾، داوای لێبوردنیـشیان بـۆ بکـە، سـێیەم: ﴿ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ﴾، لـە کاروباریـشدا ڕاوێژیـان پــێ بکــە، واتــە: لـە هــەقی خـۆت بیــانبوورە، بـە تایبــەتی لـە جـەنگی ئوحــوددا کـە بەڕاســتیی هەقــی پێغــەمبەریان ﷺ زۆر فەوتانــد، چ لــە کاتێکــدا کــە تیـرهاوێژەکـــان فــەرمانیان شــکاند، وە چ دوایـــی لـــە گەرمـــەی جـــەنگو ڕووبەڕووبوونـەوەکەدا کـە پێغـەمبەر ﷺ بـانگی دەکـردن لـە دواوەڕاو سـەری خۆیان هەڵگرتبوو، هەندێکیان نەدەگـەڕانەوە سـەری، وە هـەم هەندێکـیان کـە لـەوانـەیە جۆرێــك لـە گومـانی خراپیـان لـە دڵدا پەیدابووبــێ بەرانبــەر بــە پێغــەمبەر ﷺ وەك پێـشتـر باســمان کــرد، کەواتــە: تــۆ لــە هــەقی خــۆت بیـــانبوورە، دەمێنـــێتەوە هـــەقی خـــوا، ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ ﴾، واتـــە: داوای لێبوردنیـشان بـۆ لـە خــوا بکـە، تاکـو خـوای پەروەردگـاریش لە هەقی خۆی بیـانبووری، ﴿ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ﴾، وە لـە کاروباریـشدا ڕاوێـژیان پـێ بکـات،

واتە: بە هۆی ئەوەوە کە جەنگی ئوحودتان دۆڕاند، لەبەر ئەوە کە ڕای زۆرینە ئەوە بوو کە لە مەدینە بچنەدەر، لەبەر ئەوەی دەرئەنجامی ئەو ڕاوێژکردنە شکستێکی بەدوا داهات، نەچن لەبەر ئەوە واز لە ڕاوێژکردن بێنن، واز لە ڕاوێژپێکردنی هاوەڵانت مەهێنە، چونکە هەر چۆن بێ ڕاوێژکردنو پرس ڕا پێکردنیان دەرئەنجامی چاکترە، هەرچەندە جاری واش هەیە ڕای زۆرینە نایپێکێ، بەڵام هەر چۆن بێ، ڕاوێژ پێکردنەکە بەرەکەتو بەرهەمی زیاتری هەیە.

## باسێك لەبارەی ڕاوێژەوە

١- مانای وشەی (شوری)، (ڕاوێژ) بە کوردیی دەڵێین: ڕاوێژ، بە عەرەبی (شوری، مَشورة، مشاورة)ی پێ دەڵێن: ئەسلەکەی لە: (شُرْتُ العَسَلَ، وَأَشَرْتُهُ: أَخْرَجْتُهُ)، واتە: هەنگوینەکەم دەرهێنا، کەسێك هەنگوین دەردێنێ لەو شوێنەی کە تێیدایە، لەو صندوقەی کە تێیدایە، کە لە هەندێ شوێن خەڵێفی پێ دەڵێن، هەندێکیش دەڵێن: وشەی (شوری) لەوەوە هاتوە: (شِرتُ الدابّةِ: إستَخْرَجْتُ عَدْوَهَا) واتە: کەسێك بیەوێ بزانێ وڵاخێك چۆن دەڕواو ڕمبازێنو غاغارێنی چۆنە؟ بێنێ سواری بێو غاغارێنی پێ بکات، دەگوترێ: (شِرتُ الدابّة) واتە: ڕمبازێنم بە وڵاخەکە کرد...، کەواتە: ئەسڵی وشەی: (شوری) دەچێتەوە بۆ دەرهێنانی شتێك لە شتێك، جا بۆیە گوتوویانە: (التَشَاوُر وَالْمُشَاوَرَة والمشورَة: إستِخْرَاجُ الرأي بِمرَاجَعَةِ البَعْض إِلى البَعْض، وَالشوری: الأمرُ الَّذِي يتشاور فيهِ)، واتە: هەر سێ وشەی: (تَشَاوُر، مُشَاوَرَة، مشورَة)، واتە: دەرهێنانی ڕای پەسندو ڕاست لە ئەنجامی ئەوەدا کە هەندێکیان قسە لەگەڵ هەندێکیاندا بکەنو پێکەوە تاوتوێی شتێك بکەنو ڕا بگۆڕنەوە، (شوری)ش ئەو کارەیە کە ڕاوێژی تێدا دەکرێت، ئەوە بەنسبەت واتایەکەی.

٢- حوکمی ڕاوێژ (شوری) کردن: لای زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕاوێژکردن لەسەر حوکمڕان فەرزە، واتە: فەرزە بەرپرس ڕاوێژ بکات بە بەردەستەکانی خۆی، بەوانەی لەگەڵیدان، بە شوێنکەوتووانی، لەوبارەوە (ابن عطیة) کە یەکێکە لە زانایان دەڵێ: (وَالشورى: مِنْ قَوَاعِدِ الشَّرِيعَةِ وَعَزَائِمِ الأَحْكَامِ، مَنْ لا يَسْتَشِيرُ أَهْلَ العِلْمِ وَالدِّينِ، فَعَزْلُهُ وَاجِبٌ هَذَا مَا لا خِلافَ فِيهِ) ، واتە: ڕاوێژکردن لە بنچینەکانی شەریعەتەو لەو یاسایانەیە کە زۆر داکۆکییان لەسەر کراوە، وە هەر کەسێك ڕاوێژ نەکات بە ئەهلی زانستو خەڵکی خاوەن دین لە بەرپرسان، پێویستە بەرکەنار بکرێ، ئەوە هیچ ڕاجیایی تێدانیە، واتە: هەر بەرپرسێك ڕاوێژ بەو کەسانە نەکات کە لەگەڵیدان، ئەوە پێویستە لابدرێو هەقی بەرپرسیارێتی نامێنێ، هەڵبەتە ئایەتەکانیش هەر ئەوە دەگەیەنن، چونکە لە سێ شوێن دا بە وشەی: (شورى)و (مشاورة)و (تشاورة) هاتوە، کە ئەمانەن :

١- ﴿ ... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى.

٢- ﴿ ... وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ... ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران.

٣- ﴿ ... فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ... ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة

ئەگەرنا لە قورئاندا بە بێژە (لفظ)ی دیکە لە چەند شوێنان باسی ڕاوێژ کراوە [1]، ئینجا لە ئایەتی (٣٨)ی سوورەتی (الشورى)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ ... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، واتە: کاروباریان بە ڕاوێژە، واتە: مسوڵمانان نابێ هیچ کاروبارێکیان بەڕێوەبەرن بەبێ ڕاوێژ تێداکردن، دیارە ئەو کاروبارانەی کە پێویستییان بە ڕاوێژ تێداکردنو

١) بۆ وێنە: ١- ﴿ ... فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ... ﴿٦﴾ ﴾ الطلاق.
٢- ﴿ ... قَالَ يَا مُوسَىٰ إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ ... ﴿٢٠﴾ ﴾ القصص.
٣- ﴿ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ ﴾ النمل.

پرس‌و ڕا گۆڕینەوە هەیە، وە ئەم ڕستەیە ﴿ ... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴾، خوای پەروەردگار خستویەتە نێوان نوێژكردن‌و ماڵ بەخشینەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: (ئیمانداران) كەسانێكن كە بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە دەچن‌و، نوێژ بەرپادەكەن‌و، كاروباریان بە ڕاوێژە، وە لەوەی پێمانداون دەبەخشن، كەواتە: خوا ﷻ كاروبار بە ڕاوێژ بەڕێوەبردنی خستۆتە نێوان بەرپاكردنی نوێژو، ماڵ بەخشین كە زەكات جۆرێكیەتی، كەواتە: وەك چۆن نوێژ ڕوكنێكی مەعنەویی یەو، زەكاتیش ڕوكنێكی ئابوورییە، ڕاوێژكردنیش پایەیەكی كۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی كۆمەڵی مسوڵمان‌و كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی یە.

٣- ئایا دوای ئەوەی كارێك ڕاوێژی تێدا دەكرێ‌و زۆرینە دەكەونە لایەك‌و كەمینە دەكەونە لایەك، ڕای زۆرینە پابەندكەر (مُلزِم)ە بۆ كەمینە، یاخود هەر ئاگاداركەرەوەیە؟

زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: ئەنجامی ڕاوێژكردن پابەندكەر (مُلزِم)ە ، واتە: دوای ئەوەی كە زۆرینە لەسەر ڕایەكن پێویستە بچەسپێنرێ، با كەمینە ڕای بەرپرسەكەشیان لەگەڵدابێ، وە منیش ئەم ڕایەم پێ باشترو سەلامەتترە، وە پێغەمبەریش ﷺ هیچ شتێكی نەخستۆتە ڕاوێژ تێداكردن‌و پرس‌و ڕا وەرگرتنەوە، مادام زۆرینە لەلایەك بووبن، با بە پێچەوانەی ڕای ئەویش بووبێ، حەتمەن ڕای زۆرینەی تەبەننیی كردوە، وەك لە جەنگی ئوحوددا بە ئاشكرا دیارە، كە بۆخۆی ڕای وابووە لە مەدینەدا بمێنێتەوە، بەڵام چونكە زۆرینە ڕایان وابووە كە بچنەدەر، چووە دەر، هەروەها لە هەموو ئەو شتانەدا كە پێغەمبەر ﷺ پرس‌و ڕای بە خەڵك كردوەو ڕاوێژی پێكردوون، تەماشای كردوە زۆرینە چۆن بڕیار دەدەن وایكردوە، هەڵبەتە ڕاوێژیش لە شتێكدا دەكرێ كە دەقی

لەسەر نەبێ، چونکە لەوانەیە یەکێك بڵێ: ئەگەر ڕای زۆرینە پێچەوانەی وەحی بووایە ؟ دیارە پێغەمبەر ﷺ لە شتێکدا کە بڕیاری وەحی بووبێ، پرسو ڕاوێژی نەکردوە، بۆ وێنە: لە صولْحی حودەیبیەدا پێغەمبەر ﷺ هەرچەندە زۆرینەی هاوەڵان ڕایان لەگەڵ ئیمزاکردنی ئەو صولْحەدا نەبووو، پێیان خۆشنەبوو ئەو صولْحە بکرێ، بەڵام چونکە فەرمانی خوای لەسەر بوو، وەك لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ لَنْ أُخَالِفَ أَمْرَهُ وَلَنْ يُضَيِّعَنِي}[1]، واتە: من بەندەو نێرراوی خوام، سەرپێچیی فەرمانی ناکەم، وە ئەو من زایە ناکات، بەڵێ پێغەمبەری خوا، ئەگەر دنیا هەڵسابایە شتێك مادام فەرمانی خوای لەسەربووایە، هەر جێبەجێی دەکرد، بەڵام شتێك فەرمانی خوای لەسەر نەبێ، وە پەیوەندیشی بە هەمووانەوە هەبێ بەگشتی، ئەوە دەخرێتە ڕاوێژکردنەوەو پاشان ڕای زۆرینە تەبەنیی دەکرێو کاری پێدەکرێ.

٤– ئنجا ئایا ئەو ڕاوێژ پێکردنە چۆن دەکرێ ؟

لەڕاستییدا ئەوە بۆ ڕۆژگارو گۆڕانی کاتو شوێنەکان بەجێهێڵراوە، وە ئەگەر تەماشای ژیاننامە (سیرة)ی پێغەمبەر ﷺ بکەین بە سێ جۆر ڕاوێژی کردوە:

یەکەم: (إستفتاء) واتە: پرس بە خەڵك کردنو ڕاوەرگرتنیان بەگشتی.

دووەم: (نوێنەران) واتە: پرسو ڕاوێژی بە نوێنەرانی تیرەو هۆزەکان کردوە، نەك بە تاك تاکیان، بەڵکو بە بەرپرسەکانیانو بە نوێنەرەکانیان.

سێیەم: (پسپۆران) واتە: کاتێك ئیشێك هاتۆتە پێش تەماشای کردوە کێ پسپۆرە لەو ئیشەدا، ئەگەر کەسێك پێشنیارێکی بووبێ مادام پسپۆڕو شارەزا بووبێ، ڕای ئەوی وەرگرتوە، وە ئێمە درێژەی ئەم بابەتەمان لە

---

١) صحيح البُخَارِيُّ: (٣١٨٢)، وَصحيح مُسْلِمٌ: (١٧٨٥)، وأحمد: (١٨٩٣١) واللفظ لأحمد.

ئەڵقەكانی (ئیسلامو دەوڵەتداریی)دا باس كردوە، كە لە كەناڵی ئاسمانیی (پەیام) پێشكەش دەكرێن، وە خوا پشتیوان بێ دوایی دەكرێن بە كتێب[1]

**مەسەلەی شەشەم:** ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾، واتە: ئەگەر دڵت ساغ بۆوە لەسەر بڕیارێك، ئەوە پشت بە خوا ببەستەو جێبەجێی بكە، بێگومان خوا پشت پێ بەستووانی خۆشدەوێن، وشەی (عَـزم) یانی چی ؟ (العَـزْمُ والعَزِيْمَـةُ: عَـقْـدُ القَلْـبِ عَلَى إِمْضَـاءِ الأَمْـرِ)، واتە: (عَزْمْ وعَزِيْـمَةُ): گرێدانی دڵە لەسەر تێپەڕاندنی كارێك، واتە: دڵی خۆت بچەسپێنی لەسەر ئەوەی ئەو شتە بكەی، وە (طبري) لە تەفسیرەكەی خۆی دەڵێ: (وَأَمَّا قَولـه:﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾: فَإِنَّهُ يَعْنِي: فَإِذَا صَحَّ عَـزْمُكَ بتَثْبِيتنـا إِيّـاكَ، وَتَسديدنا لَـكَ فِيمَـا نابَـكَ وَحزبَـكَ مِـن أَمْـرِ دِينِـك وَدُنيـاكَ، فَامضِ لَما أَمرنـاكَ بـهِ عَلَى مَا أَمرنـاكَ بـهِ، وَافَقَ ذَلِكَ آرَاءَ أَصْـحَابِكَ وَمَـا أَشَـارُوا بـهِ عَلَيْـكَ، أَوْ خَالَفَهَـا)[2]، واتە: ئەوە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، واتە: هەر كاتێك دڵت ساغ بۆوە لەسەر بڕیارێك ئەوە پشت بە خوا ببەستەو جێبەجێی بكە، یانی: هەركات دڵت بە تەواویی بەهۆی چەسپاندنی ئێمە بۆ تۆ، وە بەهۆی ڕێنماییكردنی ئێمەوە بۆ تۆ، لەو ڕووداوەدا كە هاتۆتە پێشت، یاخود سەغڵەتی كردووی لە كاروباری دینو دنیاتدا، ئەوە بەو شتەی كە فەرمانمان پێكردووی‌و بەو شێوازەش كە فەرمانمان پێكردووی، كارەكە جێبەجێ بكە، جا ئەو شتە لەگەڵ بۆچوونی هاوەڵانتدا بێتەوە، یاخود پێچەوانەی بێ، (واتە: ئەوەی كە ئەوان ئاماژەیان بۆ تۆ پێكردوەو پێشانی تۆیان داوە لەگەڵ ئەو بڕیارەی تۆدا یەكی گرتەوە، یاخود تێكگیرا تۆ ئەوەی كە فەرمانت پێكراوە بەو شێوەیە جێبەجێی بكە)، لێرەدا مەبەستی

---

١) ئێستا ئەو كتێبە ئامادە دەكرێ بۆ چاپكردن.

٢) الجامع البیان، ج: (٤)، ص: (١٦٠).

(طبَـرِي) - ڕەحمــەتی خــوای لــێ بــێ- ئەوەیــە کــە: شــتێك کــە خــوا ﷻ بــە وەحــی بــە پـێغــەمبەر ﷺ ڕاگــەیاندوە، ئــەوە پـێـچەوانەی ڕای هــاوەڵان بــێ، یاخـود لەگەڵیــدا یەکبگــرێتەوە، پـێغــەمبەر ﷺ دەبــێ هــەر شـوێنکـەوتووی وەحی بــێ، خــوا چــی فــەرمووە دەبــێ وا بکــات، هاوەڵان ڕایـان لەگـەڵی دابـێ، یاخود لەگەڵی دانەبێ، وەك باسمان کرد لە صوڵحی حودەیبییــەدا، پـێغــەمبەر ﷺ هەرچەندە زۆرینەی هاوەڵان ڕایان لەگـەڵ ئیمزاکردنی ئەو صوڵحە نـەبوو، بـەڵام چونکە فەرمانی خوای لەسـەر بوو، هـەر ئەنجامیـدا، دوایی ئەوان هـاتنە سەر ڕای پـێغـەمبەر ﷺ، بەڵام بۆ شتێك کە وەحی لەسەر نـەبووبێ، ئـەوە بـە تەئکید پـێغـەمبەر ﷺ ڕاوێـژی کـردوەو، وەك گوتمـان ڕای زۆرینـەی تەبەنـنیــی کردوە، هەڵبـەتە دوای ئەوەش کە ڕای زۆرینەی تەبـەننیی کـردوە، ئەگـەر دوایـی ئەو زۆرینــەیە لـە ڕای خۆیـان پەشـێمان بووبنـەوە، پـێغـەمبەر ﷺ بڕیارەکەی هـەڵنەوەشـانـدۆتــەوە، کـە ئـەمـە ئـەوەشـی لـێوەردەگیــرێ، ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ ﴾، واتـە: دوای ڕاوێژکــردن کـە ڕاتــان ســاغ بـۆوە لەسـەر شـتێك بـە زۆرینــە، واتـە: زۆرینـەتان ڕاتان وابوو ئەم بڕیارە تەبەنـنـیی بکەن، ئەوە نابێ دوایی ئەو بڕیـارە کـە دوای ئـەو ڕاوێـژە دراوە، هەڵبوەشـێنرێتەوە، وەك لـە جەنگــی ئوحــوددا ئــەو هـاوەڵە بەڕێزانەی کە ڕایان وابـوو پـێغــەمبەر ﷺ لـە شــار بـچێتـە دەر، دوایـی لـــەڕای خۆیـــان پاشـــگەزبوونەوە، بـــەڵام پـــێغەمبەری خـــوا ﷺ ئـــەم پاشـگەزبوونەوەیەی قبـووڵ نــەکرد، وەك وە فــەرمووی: {مَـا يَنْبَغِـي لِنَـبِيٍّ إِذَا لَبِـسَ لأمَــةَ الحَـرْبِ أَن يَـضَـعَهَا حَتَّـى يَحْكُـمَ اللَّـهُ بَيْنَـهُ وَبَـيْنَ عَـدُوِّهُ } رَوَاهُ الْحَـاكِمُ بـرقم: (٢٥٨٨) وَقَـالَ: صَحِيح الإسـناد، وَالبَيْهَقِـي بـرقم: (١٣٠٦١) وغيرهما)، واتـە: هـیچ پـێغــەمبەرێك (علیهم الصلاة والسلام) بـۆی نیـە کـە زرێی پۆشـی (واتە: بەرگی جەنگی پۆشی) دایبـنـێ هـەتا خـوا حوکـم نەکـات لە نێوان ئەوو دوژمنەکـەیدا، واتـە: پـێـشـێ فێـری ڕاوێـژکردنی کـردن، دوایـیش فێـری ئـەوەی کـردن کـە بڕیارێکـیاندا دەبــێ جـێبەجـێی بکـەن، نــەك ئێـستا بڕیارێـك بـدەن دوای لــێی پاشــگەز ببنــەوە، چـونکە دەگونجـێ دیـسان لـەوەی دووەمیشیان پاشـگەزببنەوەو، سـەرەنجام دووچـاری ڕا ڕایـی دەبـن !

**مەسەلەی حەوتەم:** ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: وە با بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، پێویستە لێرەدا دوو شتان ڕوونبکەینەوە:

**یەكەم:** مانای پشت بە خوا بەستن چییە؟

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: (التوكيلُ أن تعتمِدَ عَلَى غَيْرِكَ وَتَجْعلهُ نَائباً عَنْكَ، وَالوَكيلُ فَعيلُ بِمَعْنى: الْمَفْعُول، قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ ﴾النساء، أَي: اكتفِ بِهِ أَن يتولَّى أَمرَكَ وَيَتَوَكَّل لَكَ، وَالتَوَكُّلُ يُقَالُ عَلَى وَجْهَيْنِ، تَوَكّلْتُ لِفُلانٍ بْمَعْنى: تَوَلّيْتُ لَهُ، وَيُقَالُ وَكَّلتهُ فتَوَكَّلَ لِي: وَتَوَكَّلتُ عَلَيهِ بِمَعْنى أعتَمُدتُ عَلَيْهِ)، (تَوَكيل) یانی: وەكیل گرتن، ئەوەیە كە تۆ كەسێك بكەی بە وەكیلی خۆت، یان نوێنەری خۆت بۆ ئەنجامدانی شتێك، (وكيل) لەسەر وەزنی (فَعِيل)ە، بەمانای (مَفْعُول)ە، واتە: (مُوكّل إليهِ) واتە: كەسێك كارەكەی خۆتت پێ سپاردوە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ ﴾ النساء، واتە: بەسە كە كاری خۆتانی پێ بسپێرن، یانی بەسە كە خوای كاربەجێ سەرپەرشتیی كاروباری تۆ بكاتو كاروبارت بەڕێوەبەرێ، وە لەجیاتی تۆ كارەكان هەڵسووڕێنێ، جا دەڵێ: وشەی: (تَوَكّل) بە دوو واتایان بەكاردێ، دەگوترێ: (تَوَكّلْتُ لِفُلانِ بْمَعْنى: تَوَلّيْتُ لَهُ) واتە: سەرپەرشتیی كارەكەییم كرد لە جیاتی ئەو (وَيُقَالُ وَكَّلتهُ فَتَوَكَّلَ لِي) واتە: ئەوم كرد بە وەكیل (وَتَوَكَّلتُ عَليهِ بِمَعْنى أعتَمُدتُ عَلَيهِ) واتە: پشتم پێ بەست (وَتَوَاكَل القَوْم: اتكل كلٌ عَلَى الآخر) واتە: هەركامێكیان پشتی بەویدیكە بەست، واتە: خۆیان بەیەك هەڵواسی (وَ وَاكَلَ فُلانٌ: إِذَا ضيّع أَمْرهُ متَّكِلاً عَلَى غَيْرِهِ) واتە: فلان كەس كارەكەی خۆی زایە كرد، بەهۆی ئەوەوە كە پشتی بەخۆی نەبەستوە، وە شتەكەی حەواڵەی كەسێكی دیكە كردوە.

**دووەم: ئایا ئینسانی ئیماندار دەبێ کاری خۆی بە کێ بسپێرێ؟**

تەنیا خوا ﷻ، وەك لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، کە (جارو مجرور) پێش خراوە دەلالەت لەسەر کورتهەڵهێنان (حصر) دەکات، واتە: ئیمانداران دەبێ تەنیا پشت بە خوا ببەستن، دەبێ تەنیا خوا بکەن بە وەکیل بۆ کاروباری دینو دنیا، ئەوە مانای (تَوَكّل)ە، جا ئایا پشت بە خوا بەستنو خوا کردنە وەکیلی خۆمان، مانای وایە ئێمە گوێ نەدەینە هۆکارەکان؟ نەخێر، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ: {عَنْ أنَسِ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: جَاء رَجُلٌ إلى النَّبِيِّ ﷺ وَأَرَادَ أَنْ يترك ناقَتَهُ وَقَالَ: أأَعْقِلُهَا وَأَتَوَكَّلُ أَوْ أُطْلِقُهَا وَأَتَوَكَّلُ؟ فَقَالَ النَّبِيّ ﷺ: إعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ} أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣١)، والتِّرمِذِي برقم: (٢٦١٧)، وَابْنُ مَاجَه برقم: (٤١٦٤)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَحَسَّنَهُ الألباني، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ویستی حوشترەکەی بەڕەڵڵا بکات لە دەرێ، وە بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئایا بیبەستمەوەو پشت بە خوا ببەستم، یاخود بەرهەڵدای بکەمو پشت بە خوا ببەستم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیبەستەوەو پشت بە خوا ببەستەوە، کەواتە: بەستنەوە پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە، بەڵکو ئەگەر پشتت بە خوا بەست، دەبێ دڵت بە خواوە پەیوەست بێ، بەڵام دەبێ دەستت بە هۆکارەکانەوە بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ وایکردوە، کەواتە: ئەوەی کە هەندێ لە ئەهلی تەریقەتو تەصەووف بە هەڵە تێیگەیشتوونو پێیان وایە کە پشت بە خوا بەستوو (متوكّل على الله) کەسێکە کە هۆکارەکان وێڵ بکات ! ئەوە لەڕاستیی دا هەر لە بنچینەدا لە مانای (تَوَكّل) حاڵی نەبوون، وە ئەوەی کە دەستی بە هۆکارەکانەوە نەبێ، ڕاست ناکات بڵێ: دڵی بە خواوە پەیوەستە، چونکە ئەو خوایەی کە دڵت پێوە پەیوەستە، ئەو پێت دەفەرموێ: هۆکارەکان ڕەچاو بکە، وەك پێشتر گوتمان خوای پەروەردگار دەربارەی (ذو القرنين)

دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الكهف، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (ذو القرنين) پێیان بڵێ: هەواڵی ئەوتان بۆ دەخوێنمەوە، ئێمە ئەومان دەستەڵاتدار کردبوو لە زەویدا، وە بۆ هەموو شتێك هۆکارێکمان پێدابوو، جا بە دوای هۆکارەکە دەکەوت.

کەواتە: پشت بە خوا بەستن لەگەڵ پەنا بۆ هۆکاربردندا، نەك هەر ناکۆك نیە، بەڵکو تەواوکەریی یەکدین، چونکە ئینسان تەنیا لایەنە مەعنەوییەکەی نیە، هەروەك تەنیا لایەنە جەستەییەکەش نیە، بە لایەنە جەستەییەکەی هۆکار پەیدا دەکاتو، بە لایەنە مەعنەوییەکەشی دڵ پەیوەست دەکا بە خواوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، پێشتریش لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا مانای ئەم ئایەتەمان ڕوونکردەوە، کە هەندێك لە هاوەڵان خەتەرەیەکیان بە دڵدا هاتوە، کە ئایا دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەستکەوتو غەنیمەتی جەنگی ئوحود، ئەوان بێبەش نەکات ؟ بەتایبەتی ئەو تیرهاوێژانەی کە لەسەر شاخۆلکەکە دانابوون، گوتیان: ڕەنگە ئێمە لە غەنیمەتو دەستکەوت بەشمان نەدرێ، بۆیە فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ شکاندو بۆ کۆکردنەوەی غەنیمەت هاتنە خوار، گومانێکی خراپیان برد، یاخود لە جەنگی بەدردا (بەپێی ڕیوایەتێکی دیکە) دیارە کە هەندێك لە هاوەڵانی بەڕێز گومانیان وابووە، قوماشێکی سوور کە لەنێو دەستکەوتی جەنگدا دیار نەماوە، پێیان وابووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆی هەڵیگرتوە، خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی نارده خوار، ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، هەر کەسێك دزیی لە غەنیمەت بکاتو ناپاکیی بکات، لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ خۆی دەیهێنێ،

پـێغـەمبەر ﷺ بـۆ ڕوونكردنـەوەی ئـەم ڕسـتە قورئانییـە فەرموودەیـەكی فـەرمووە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَذَكَرَ الْغُلُولَ فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ ثُمَّ قَالَ: لا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ، لا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ، لا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ، لا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ نَفْسٌ لَهَا صِيَاحٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ، لا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ، فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ، لا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٤٩٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٠٧٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٧١١)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٧٠٧٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٨٤٧)، واتـە: ئـەبو هـوڕەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: ڕۆژێـك پـێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو ئێمەدا هەڵسا قسەی بۆ كردین، باسی (غلول) ﴿واتـە: دزییكردنـی لـە غەنیمـەتو دەستكـەوتی جـەنگ﴾ی كـرد، وە باسـی ترسـناكیی‌و گـەورەیی سـزاكەی كـرد چـۆنە ! پاشـان فـەرمووی: یەكێكتـان نەبیـنم لـە ڕۆژی دواییـدا بـێ حوشـترێك لەسـەر ملـی بـێ كـە (رُغَـاءٌ)ی هـەبێ (رُغَاءٌ: بە دەنگی حوشتـر دەگوترێ، لەبـەر ئـەوەی لەنێو كوردەواریـی ئێمـە حوشتـرمان نـەبووە، بۆیـە ئەگـەر وشـەی بـۆڕەی بـۆ بەكـاربێنین نابێ، چونكە بۆ مانگایە، یان وشـەی باڕە كـە بـۆ مـەڕو بـزن بەكـاردێ بـە هەرحـاڵ) ئنجا بێ بڵـێ: ئەی پـێغـەمبەری خـوا ! لـە فریـام وەرە، منـیش بڵـێم: هیـچـم بـۆ تۆ پـێ ناكرێ، كاتی خۆی پـێـم ڕاگەیاندووی، وە یەكێكتان نـەبینم لـە ڕۆژی دواییـدا بێ، ئەسپێك لەسەر ملـی بێ، كە حیلكە حیلكی بێ (كە بە زمـانی

عەرەبی بە دەنگی ئەسپ دەڵێن: حەمحەمە) بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ لە فریام وەرە، منیش بڵێم: هیچم بۆتۆ پێ ناكرێ، كاتی خۆی پێم ڕاگەیاندووی، وە یەكێكتان نەبینم لە ڕۆژی دواییدا بێ، مەڕێك یاخود بزنێكی لەسەر مل بێ، بارەی بێ، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! لە فریام وەرە، منیش بڵێم: هیچم بۆ تۆ پێ ناكرێ، كاتی خۆی پێم ڕاگەیاندووی، وە یەكێكتان نەبینم لە ڕۆژی دواییدا بێ، ئینسانێك لەسەر ملی بێ، هاوار هاواری بێ، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ لە فریام وەرە، منیش بڵێم: هیچم بۆ تۆ پێ ناكرێ كاتی خۆی پێم ڕاگەیاندووی، وە یەكێكتان نەبینم لە ڕۆژی دواییدا بێ كاغەزو چەرمی لەسەر ملی بێ (واتە: ئەوە كە لێی نووسراوە، دیارە ئەوكاتە ماڵێكی بەقیمەت بووە) كە دەنگی بێ، وەك چۆن دەنگ لە گەڵای درەخت دێ، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ لە فریام وەرە، منیش بڵێم: هیچم بۆ تۆ پێ ناكرێ كاتی خۆی پێم ڕاگەیاندووی، وە یەكێكتان نەبینم لە ڕۆژی دواییدا بێ زێڕو زیوی لەسەر ملی بێ، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ لە فریام وەرە، منیش بڵێم: هیچم بۆ تۆ پێ ناكرێ، كاتی خۆی پێم ڕاگەیاندووی.

جا لەوبارەوە پرسیار لە ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ-، كراوە، (وەك لە تەفسیری قورتوبییدا هاتوە):

دەڵێ: گوتیان: ئەبو هورەیرە ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتێكی وای فەرمووە، باشە ئەدی ئەگەر كەسێك دە پازدە حوشتری دزیی بن، یان دە پازدە ڕەشە وڵاخ، یان مەڕو بزنی دزیی بن، ئەوە چۆن ئەو هەموەی دەچنە سەر شانو ملی ؟!

ئەبو هورەیرەش - خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویەتی: جا ئەگەر كافرێك ددانی بەقەد كێوی ئوحودی لێ بێ، دەشتوانێ ئەو هەموو حوشترانە لەسەر ملی خۆی هەڵبگرێ ! هەڵبەتە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا ئەوە تەعبیرێكی ڕەمزییە، واتە: مەرج نیە ئەو حوشترو مەڕو بزنو مانگایە بچنە سەر ملی، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە بە ملیدا دێنو ئەو

هەقەی لە گەردن دەبێ، هەندێکی دیکەش دەڵێن: نەخێر پێویست ناکات تەئویلی بکەین، بەڵکو لای خوای بالادەست ئاسانە کە بۆ ئەوەی ئەو کابرایە ببێتە پەند بۆ خەڵكو پێی ناشیرین بێ، بەوەی کە شتێکی دزیوە لە غەنیمەت، ئەگەر پارەی نەقدییە، ئەگەر ئاژەڵە، ئەگەر هەر شتێکی دیکەیە، بیخەنە سەر ملی، هەڵبەتە خوای پەروەردگار هیچ شتێکی بۆ زەحمەت نیە.

ئنجا ئەم ئایەتە موبارەکە، وە ئەم فەرمایشتو تەوجیهاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ وای لە هاوەڵانی بەرێز کرد بوو، کە بە هیچ شێوەیەك بیر لە دزیی لە غەنیمەتو لە دەستکەوتی جەنگیی نەکەنەوە، دەگێڕنەوە: کاتێك کە تاجو پشتێنو جلو بەرگی تایبەتی کیسرایان بۆ خەلیفەی دووەم عومەر - خوا لێی ڕازی بێ-، هێنا (کە لە مەداین هێنابوویان) تەماشای کردو زۆر پێی سەرسام بوو (کە دیارە تاجەکەی زۆر بە قیمەت بووەو دەڵێن: هەر گەوهەرێکی شارێکی دەهێنا !) دەڵێ: عومەر - خوا لێی ڕازی بێ- هەر تەماشای کردو، دوایی گوتی: بەڕاستیی کەسانێك ئەوانەیان گەیاندۆتە ئێرە، دەست پاكو ئەمین بوون ! یەکێك لە هاوەڵان گوتی: تۆ ئەمینی بۆیە ڕەعیەتەکەشت ئەمینو دەست پاکە، هەروەها لە (تأريخ الطبري)دا[1] هاتوە دەڵێ: پیاوێك زێڕو گەوهەرێکی زۆری هێنا (دیارە زێڕو زیوو گەوهەرو مرواریی‌یەکی زۆر بووە) گوتی: ئەوە دەستکەوتی جەنگی یە، دەڵێ: ئێمە کۆمەڵێك بووین هەر چەند تەماشامان کرد، گوتمان هیچ کەس ئەو هەمووە ماڵو سامانە ئاوا ناهێنێ ! بۆیە گوتمان: تۆ کێی ؟ گوتی: (لا وَاللهِ لا أُخبركُم لِتَحمدونِي، وَلا غيركُم ليُقرِّظوني، وَلَكنِّي أَحمد الله وأرضى بثوابه)، واتە: ناوەڵلاهی پێتان ناڵێم ! تاکو سوپاسم بکەن، یاخود خەڵك ستایشم بکات، بەڵکو پاداشتەکەم لە خوا دەوێ، دەڵێ: (فأتبعوهُ رَجُلاً حَتَّى أنتهى إلى أصحابه، فسأل عَنْهُ، فإذا هو عامر بن عبد قيس) واتە: پیاوێکیان

---

١) تأريخ الطبري، ج: (٤)، ص: (١٦).

بە دوا خستـ هەتا چووە نێو هاوەڵەکانی، لێی پرسین کە ئەو کەسە کێیە ؟ گوتیان: (عامر بن عبد قیس)ە، کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، خوا لە هەموویان ڕازی بێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَانَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: ئایا کەسێك کە کەوتۆتە شوێن ڕەزامەندیی خوا، وەك ئەو کەسە وایە کە تووڕەیی خوا لەگەڵ خۆی دەباتەوە ؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کەسێك ئامانجی ڕازیکردنی خوابێو عەودالّی ڕەزامەندیی خوابێ، ئەوە ئەو قەناعەتو عەقیدەیە وای لێدەکات کە دەست پاك بێ، بەلاّم کەسێك دەربەستی تووڕەکردنی خوا نەبێ، ئەوە ئەو قەناعەتە خراپەی وا لێدەکات کە دەربەستی دزیی‌و خیانەتیش نەبێ، چونکە هەموو هەڵسوکەوتێك ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ قەناعەتێك، وە هەر تەصەڕڕوفێك ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تەصەووڕێك، هەر کەسێك تەصەووڕو عەقیدەو بیروبۆچوونەکەی تەواوبێ، ئەوە بە تەئکید تەصەڕڕوفو هەڵسوکەوتەکانیشی وە تەعبیرو دەربڕینەکانیشی تەواو دەبن، ئەگەر واشنەبێ، بە پێچەوانەوە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، واتە: بەڕاستیی خوا چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ ئیمانداراندا کردوە، کە لەنێو خۆیاندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، وەك باسمان کرد هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: مەبەست پێی گەلی عەرەبە، واتە: خوا چاکەی لەگەڵ گەلی عەرەبی مسوڵمان کردوە کە پێغەمبەرێکی لە خۆیاندا بۆ ناردوون، هەندێکیش دەڵێن: ماناکەی گشتی یە، واتە: خوا چاکەی لەگەڵ ئیمانداراندا کردوە، عەرەب بن، کورد بن، فارس بن، تورك بن، ... هتد، هەرچی بن، کە لەڕاستییدا ئەو ڕایەی دووەمیان ڕاستترە، چونکە وشەی: ﴿ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەلیفو لامی تەعریفی لەسەرە، کە ماناکەی

(جنس)ی بڕواداران دەگەیەنێ، کەواتە: خوا چاکەیەکی گەورەی کردوە لەگەڵ هەموو ئیماندارانددا کە پێغەمبەرێکی لەنێو خۆیاندا بۆ ناردوون، یانی: وەك خۆیان بەشەرە، ئەوە نیعمەتێکە زۆر گەورەیە کە خوا لە نێو بەشەردا نوێنەرانی خۆی هەڵبژاردوە، هەرچەندە زۆر لە کافرەکان پێیان شتێکی سەیر بووە، کە چۆن دەبێ پێغەمبەری خواو ڕەوانەکراوی خوا، بەشەر بێ !! وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ... قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٤﴾ ﴾الإسراء، واتە: (کافرەکان) گوتیان: ئایا چۆن دەبێ پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوا بەشەر بێ ! بۆچی؟ چونکە لەڕاستیدا ئینسان ئەگەر ئیمانی نەبێ، خۆی لەلا بچووكو کەم بایەخە، خۆی بە مەیموون زادەو ... هتد، دەزانێ، بەڵام ئینسان وەختێك کە ئیمانی بە خوا هەبێ ڕێزو حورمەتی خۆی دەزانێ، بۆیە پێی عەجایب نیە ئەگەر خوا ئینسان بکات بە نوێنەری خۆی، وە بیکات بە پێغەمبەرو هەڵگری پەیامو بەرنامەی خۆی.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴾، ئەم تەعبیرە لەگەڵ تۆزێك گۆڕانکارییدا لە چوار ئایەتان لە قورئاندا هاتوە، کە دیارە خوا ﷻ چوار شت دەکاتە ئەرکی پێغەمبەر ﷺ کە بریتین لە: خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا، وە تەزکیەکردنی خەڵك، وە کتێبو حیکمەت فێرکردنیان.

ئەم ڕستە قورئانییە موبارەکە: لە ئایەتی: (١٢٩)و (١٥١)ی سووڕەتی (البقرة)داو لە ئایەتی ژمارە: (١٦٤)ی سووڕەتی (آل عمران)داو لە ئایەتی ژمارە: (٢)ی سووڕەتی (الجمعة)شدا هاتوە.

کەواتە: ئەم چوار ئەرکە کە ئەرکی سەرەکی پێغەمبەرن ﷺ دیارە شتی زۆر گەورەن، بۆیە لە چوار ئایەتدا دووبارە بوونەوە، جا ئایا مەبەست لەم چوار ئەرکە چییە؟

هەندێك گوتوویانە: ﴿يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾، واتە: ئایەتەكانی قورئانیان بەسەردا دەخوێنێتەوە ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾، وە تەزكیەیان دەكات، ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ﴾، وە قورئانیان فێر دەكات، ﴿وَالْحِكْمَةَ﴾، وە سوننەتیشیان فێر دەكات (چونكە حیكمەتیان بە سوننەت لێكداوەتەوە)!

بەڵام من پێم وایە ئەوە وانیە، چونكە ئەوە جۆرێك لە دووبارەبوونەوەی تێدایە، بۆیە من پێم وایە ماناكەی بەم شێوەیە: ﴿يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾، واتە: ئایەتەكانی قورئانیان بەسەردا دەخوێنێتەوە، ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾، واتە: دوای خوێندنەوەی ئایەتەكان تەزكیەیان دەكات، پاكسازیی و چاكسازیی یان دەكات، جا ئەوە ئەهلی تەصەووف پێی دەڵێن: (التخليّة والتحليّة)، واتە: بژاركردنو ڕازاندنەوە، بژاركردن لە سیفەتی خراپ، وە ڕازاندنەوە بە سیفەتی پەسندو چاك، لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ كە دەبێ ئایەتەكانی خوا بخوێنرێنەوە ئەوجار تەزكیەی ڕاستو دروست دەبێ، شایانی باسیشە لە هەر چوار ئایەتەكاندا كە ئەم تەعبیرانە هاتوون، ڕستەی: ﴿يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾، یەكەمە، كەواتە: پێشێ دەبێ خوێندنەوەی ئایەتەكان ببێ، ئنجا تەزكیە دەبێ، پاشان هی سێیەمیان، كە دەفەرموێ: ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ﴾، مەبەست لە كیتاب لێرەدا قورئان نیە، بەڵكو مەبەست پێی یاساكانی شەریعەتە، واتە: حەڵاڵو حەڕام، ئەمرو نەهی، چونكە كیتاب بەو مانایە هاتوە لە قورئاندا، ﴿وَالْحِكْمَةَ﴾یش مەبەست پێی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نیە، هەرچەندە شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئینسان فێری گەورەترین حیكمەت دەكات، بەڵام ناگونجێ وشەی: (حِكمة) مەبەست پێی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، چونكە خوای كاربەجێ دەربارەی لوقمان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ ...﴿١٢﴾﴾لقمان، واتە:

ئێمە حیکمەتمان بە لوقمان دابوو، دیارە لوقمان پێغەمبەر نەبووە تاکو سوننەتی هەبێ، هەروەها لە شوێنی دیکەشدا حیکمەت بە موتڵەقیی هاتوە، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿يُؤۡتِي ٱلۡحِكۡمَةَ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ...﴿٢٦٩﴾﴾، واتە: حیکمەت بەهەر کەسێك بیەوێ دەدات، وە هەر کەسێك حیکمەتی پێبدرێ، ئەوە خێرێکی زۆری پێ بەخشراوە، لێرەش دیارە بە موتڵەقیی وایفەرموە، ئنجا ئایا مەبەست لە وشەی: (حِكمة) چییە ؟ مەبەست پێی ئەو بەهاو ڕەوشتو ئاکارە بەرزو جوانانەن، کە لە ڕێی دەربڕینەوە، یاخود لە ڕێی ڕەفتارو کردارو ئاکارو هەڵسوکەوتەوە، دەردەکەون، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوا ﷻ لە سوورەتی (الإسراء)دا دوای ئەوەی باسی ژمارەیەك لە ڕەوشتی بەرزو پەسند دەکات کە دەبێ مسوڵمانان خۆیان پێ برازێننەوە، هەروەها ژمارەیەك ئاکارو ڕەفتاری دزێوو نالەبار دەکات کە دەبێ خۆیانیان لێ بژار بکەن، ئەوجار لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ﴿٣٩﴾﴾الإسراء، واتە: ئا ئەوە ئەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت بۆی ناردووی ئەمەش دەقی ئەو کۆمەڵە ئایەتەیە، دەفەرموێ: ﴿لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومٗا مَّخۡذُولٗا ﴿٢٢﴾ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا ﴿٢٣﴾ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمۡۚ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلۡأَوَّٰبِينَ غَفُورٗا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِۖ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورٗا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ

تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا (٢٨) وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا
كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا (٢٩) إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ
بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا (٣٠) وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ
كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا (٣١) وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا (٣٢)
وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ
سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا (٣٣) وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا
بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا (٣٤) وَأَوْفُوا۟
ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٣٥) وَلَا تَقْفُ مَا
لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا (٣٦) وَلَا
تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا (٣٧) كُلُّ ذَٰلِكَ
كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا (٣٨) ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ
مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا (٣٩) ﴾.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا﴾، پێشتر باسمان کرد، کە هاوەڵانی بەڕێز سەریان سوڕما کە لە جەنگی ئوحوددا تێشکانو گوتیان: ئەوە چۆن بوو واتێشکاین، یاخود لە کوێوە زەفەرمان پێبرا ؟! خوا فەرمووی: ئەوە لەلایەن خۆتانەوە بوو، واتە: خەتای خۆتان بوو، وە سەرتان سوڕنەمێنێ بۆچی ؟ چونکە هیچ کەس لە بەرانبەر یاساکانی خوادا مافی (ڤیتۆ)ی نیە بڵێ: مادام من مسوڵمانم، ئەگەر بە قسەی پێغەمبەریش ﷺ نەکەم هەر دەبێ سەربکەوم، وە چونکە مسوڵمانم ئەگەر مەلەش نەزانم، هەردەبێ سەر ئاو بکەومو نەخنکێم،

نەخێر یاسای خوا دەبێ موڕاعات بکرێ، وە خوا ﷻ مافی (ڤیتۆ)ی بە کەس نەداوە، لە بەرانبەر یاساو دەستورەکانی خۆیدا، کەواتە: ئەگەر بمانەوێ هەر بەرهەمێکمان دەستبکەوێ، دەبێ ئەو ڕێیە بگرینەبەر کە ئەو بەرهەمەی لێ وەدەست دێو، بمانەوێ هەر ئامانجێك وەدەست بهێنین دەبێ هۆکارەکانی وەدەستهێنانی ئەو ئامانجە دەستەبەر بکەین، وەك چۆن (ذو القرنین) خوای زانا دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ ... وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الکهف، واتە: بۆ هەموو شتێك هۆکارێکمان پێدابوو، ئەویش بە دوای هۆکارەکە دەکەوت، خوای زانا ئێمە فێر دەکات، کە ئێمەش دەبێ لە ڕێی هۆکارەکانەوە بگەینە ئەو ئامانجەی کە دەمانەوێ، نەك تەنیا لە خوا بپاڕێینەوەو پێمان وابێ کە خوا ﷻ لە جیاتی ئێمە ئیشەکان دەکات! نا، دەبێ بۆخۆمان خەمی کارەکان بخۆین، بەلاّم خوای بەخشەر هاوکارو دەستبارگرمان دەبێ.

**مەسەلەی <u>سێزدەیەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، وە ئەوەی کە لە ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا تووشتان بوو، بە مۆڵەتی خوا بوو، بە ویستی خوا بوو، یانی: خوا پێی خۆشنەبوو، بەلاّم بەپێی یاسای خوای کاربەجێ بوو، چونکە ئەو شتانەی کە دێنە ڕێی ئینسان، ئەگەر باشبن و شەرعیی بن، خوا پێی خۆشن، وە ئەگەر خراپ بن و ناشەرعیی بن خوا پێی ناخۆشن، بەلاّم هەر بە ویستی خوان ﷻ ، ویستی خوای بێ وێنە، وەك ئاسمان وایە، هەرچی بکەی هەر لە ژێر ئاسمانێ دای، بەلاّم ڕەزامەندیی خوا لەگەڵ ویستی لێك جیان، ڕەزامەندیی خوا لەگەڵ شتی باش دایە، لەگەڵ شەریعەتەکەی دایە، بەلاّم ویستو ئیرادەی خوای دادگەر لەگەڵ شتی باش و خراپ دایە، دیارە ئەوەش بۆ ئەوەیە کە ئیمانداران وا نەزانن خوای پەروەردگار نەشیویستوە مسوڵمانان تێبشکێن! کەچی هەر تێشکاون! بەڵکو ئەو تێشکانە بەپێی ویستو ئیرادەو مۆڵەتی خوا بووە، بەلاّم خوا پێی خۆش نەبووە.

**مەسـەلەی چـواردەیەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ﴾، ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا﴾، هەڵبەتە ئێمە پێشتریش باسمان کرد کە خوا ﷻ پێش ئەوەی جەنگی ئوحود بێتە پێشێ، زانیویەتی کێ ئیمانداره، کێ مونافیق و دڵنەخۆشە، بەڵام بۆ ئەوەی بە زمانی کردەوەو لە دنیای واقیعدا لە خۆیانیدا بەرجەستە بکەن و، خۆیان بۆ دەرکەوێ، وە خۆیان یەکدی بناسن، یاخود بە زمانی حاڵ خۆیان پێشان بدەن، چونکە لە مەیداندا پاک و پیس لێک جیادەبنەوە، بۆیە شاعیرێك دەڵێ:

لله دَرّ النـائبـات فأنّـها صَدأُ اللّئـامِ وَصَيْقَلُ الأحْـرارِ

واتـە: بەڵاو موصیبەتەکان زۆر نیعمەتن، چونکە بۆ خەڵکی لەبارانـدا نەبووو بوودەڵە دەبنە ژەنگ، وە بۆ خەڵکی ئازادو بە عیززەتیش دەبنە مایەی سپی کردنەوە.

هەڵبەتە زۆر ڕاستی گوتوە، چونکە لە کاتی گرفتاریی و نارەحەتییەکاندا، پاک و پیس لێک جیادەبنەوە، هەروەها عەرەب گوتوویانە: (عِنْدَ الإمْتحانِ يُكْرَمُ المرءُ أَوْ يُهَانُ)، واتە: لەکاتی تاقی کردنەوەدا ئینسان ڕێزی لێ دەگیرێ، یاخود سووك دەکرێ، بەپێی دەرەنجامەکەی کە وەدەستی دەهێنێ.

**مەسـەلەی پـازدەیەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَاتَّبَعْنَاكُمْ﴾، وە بە مونافیقەکان گوترا: وەرن لە ڕێی خوادا جەنگ بکەن، یاخود لانیکەم بەرگریی بکەن، واتە: بەرگریی لە شارەکەتان بکەن، لە ناموستان بکەن، کەواتە: خاڵی هاوبەش بریتیە لە وڵات پارێزیی، هەر کەسە بە نیەتی خۆی، ئەوەی ئیمانداره بە نیەتی جەنگ و جیهاد دەیکات، ئەوەی دیکەش بە نیەتی ئەوەی کە بەرگریی دەکات لە وڵات و نیشتیمانەکەی خۆی، لێرەدا خوای بەرز فێری ئەوەمان دەکات کە ئێمە لەگەڵ غەیری خۆماندا چاوبگێڕین بۆ خاڵی هاوبەش، مەرج نیە هەموو

کەس وەك تۆ بێ جەنگو جیهاد بکات لە ڕێی خوادا، هەموو کەس مەرج نیە مەبەستی پێ ڕازیکردنی خوابێ، بەڵام بۆ پڕۆژەی هاوبەشو کاری هاوبەش، با ئەو بە پاڵنەرو هاندەری خۆی بیکاتو ئامانجی خۆی هەبێو، تۆش هاندەرو ئامانجی خۆت، گرنگ ئەوەیە کارەکە بە هاوکارییو هەرەوەزیی بکرێ.

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ﴾، ئەو مونافیقانە لەو ڕۆژەدا کە بانگتان دەکردن بێن، یان وەك جەنگو جیهاد بەشداریی بکەن، ئەگەر عەقیدەیان پێی بێ، وە ئەگەر ئیمانیشیان پێی نیە وەك بەرگرییکردن لە وڵاتو نیشتیمان، جا دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە ئەوان لە کوفرەوە نزیکتر بوون هەتا لە ئیمان، بەڵام تەکفیری نەکردوون، بەو مانایە کە بفەرموێ: ئەوان کافرن، بەڵکو بە مونافیق ناوزەدی کردوون، کە مونافیق دیارە بە ڕواڵەت مسوڵمانە، بەڵام لە دڵی خۆیدا کافرە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە ئێمەش ئەگەر کەسێك شتی کافرانەمان لێ بینیو شتی مسوڵمانانەشمان لێ بینی، پەلە نەکەین لە حوکم بەسەردادانیدا، لە بە کافردانانیدا، بەڵکو دەبێ دووربینیی بکرێ.

**مەسەلەی حەڤدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾، ئەوانەی کە بە برایەکانی خۆیانیان گوت، وە خۆشیان دانیشتن: ئەگەر بە قسەی ئێمەیان کردبایە بە کوشت نەدەچوون، بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن مردن لەخۆتان دووربخەنەوە، واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن هۆکاری مانەوەو نەکوژرانو نەمردن لە ماڵ دانیشتنە، دەی فەرموون ئێوە لە ماڵەوە دانیشن، بزانن داخۆ هەر نامرن ! وەك پێشتریش گوتمان: بە نەخۆشیی، بە زگ ئێشە، بە دڵ ڕاوەستان... هتد، بەوانە دەمرن، کەواتە: هۆکاری مردن تەنیا جەنگو جیهادو ئازایەتیی نیە، بەڵکو وەك چۆن ئازایەکان دەمرن،

ترسنۆکەکانیش دەمرن، وەك چۆن جەنگاوەران دەمرن، دانیشتوانیش دەمرن، مردن شتێکی حەتمییە، کەواتە: ئینسان خۆی عەیبدار نەکات، لە کاتێکدا نازانێ هۆکاری مەرگو دنیا بەجێهێشتنەکەی کەنگێیەو چۆنەو چییە؟ بەڵکو بەپێی توانا هەوڵبدات چی جێگای ڕەزامەندیی خوایە، چی مایەی سەربەرزیی دنیاو دوارۆژیەتی، وا بکات، کاتی مردن، شوێنی مردن، چۆنیەتی مردنو دنیا بەجێهێشتن، ئەوانە لای خوای پەروەردگار دیاریکراونو گۆڕانیشیان بەسەردا نایەت، ئنجا مسۆگەر ئەم جۆرە عەقیدەو تێڕوانینە وا لە ئینسان دەکات کە ئازابێ، بە جەرگو نەترس بێ، بە قەرز نەترسێ !! وەك من زۆرجار بۆخۆشیی دەڵێم: زۆر کەس لە ترسی مردنێ مردوە، زۆرکەس لە ترسی هەژاریی هەژار بووە، زۆر کەس لە ترسی بەندیخانەو گیرانێ خۆی بەند کردوە، جووڵە ناکات، پێویستە ئینسان بە قەرز نەترسێو پشتی بە خوا قایم بێو، بزانێ لەلای خوای کاربەجێو دادگەر، هەموو بڕیارەکان دەدرێنو دیاریکراون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەڤدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (١٦٩) تاكو (١٨٠) دەگرێتە خۆی، واتە: دوازدە ئایەت، لەم دوازدە ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی شەهیدانی ڕێی خۆی دەكات، وە باسی پاداشتیان لە دوارۆژدا دەكات، كە چۆن لەوێ دڵخۆش دەبن بە هەواڵی ئیماندارانێك كە بە دوایان دا دەچن، وە لە ڕێی خوادا جەنگو جیهاد دەكەن وە ئەوانیش وەك وان بە پلەی شەهیدیی دەگەن، وە باسی هەڵوێستی مەردانەی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەكات، كە بە برینداریی دوای ئەوەی لە جەنگی ئوحوددا برینداربوون، بەدەم فەرمانی خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ چوونو لە هەڕەشەی كافران نەترسان، وە پاشان باسی ڕۆڵی شەیتان لە خوتخوتەكردنی بۆ ئیمانداراندا دەكات، كە دەیەوێ ترسیان بخاتە دڵ، لە بەرانبەر كەسانێكدا كە دۆستی شەیتانن، وە باسی دڵتەنگ نەبوون بە پیلانو هەوڵەكانی كافران دەكات، وە باسی سەرەنجامی شوومیان لە دوارۆژدا دەكات، وە دوایی خوا باسی یەكێك لە یاساكانی خۆی دەكات، ئەویش ئەوەیە كە پاكو پیس لە یەك جیابكرێنەوە لە دنیادا، وە مسوڵمانان لە حاڵەتی تێكەڵیی و پێكەڵیی دا نەمێننەوە، واتە: ئەوانەی كە ئیماندارن لەگەڵ دڵنەخۆشو دەغەڵەكان، لەیەك جیابكرێنەوە، وە پاشان باسی سەرەنجامی خراپی كەسانی چرووكو ڕژد دەكات لە دوارۆژدا، وە باسی سزادانیان دەكات.

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾
فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا
خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا
يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ
لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ
فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ
مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾
إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَا
يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ
حَظًّا فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّوا۟
ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ
لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ
ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى
ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟
فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا
لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾ ﴾.

## ماناى وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەوانـەی لـەڕێی خـوادا کـوژراون، پێـت وا نەبـێ مـردوون، بەڵـکو زینـدوون لەلایـەن پەروەردگاریانـەوە بـژیویان دەدرێتـێ ﴿١٦٩﴾ دڵخۆشـن بـەوەی کـە خـوا لـە بەخشـشـی خـۆی پێیـداون، وە دڵخۆش دەبـن بەوانـەی کـە لـە دوایانـەوەن، جارێ پێـیان نەگەیـشتوون (واتـە: کـە لـەڕێی جـەنگـو جیهاددا بـەردەوامن)، کـە هـیچ ترسـیان لەسـەر نیـەو دڵتەنگـیش نـابن ﴿١٧٠﴾ بـە چاکەو بەخششێکی تایبـەت لـە خـواوە دڵخـۆش دەبـن، وە بـەوە کـە خـوا پاداشـتی بـڕواداران زایـە ناکـات ﴿١٧١﴾ ئەوانەی کە وەڵامـی (فـەرمانی) خـواو پێغـەمبەریان دایـەوە، دوای ئـەوەی بـرینو ئازاریشیان تووش بوو، بۆ ئەوانـەیان کـە چاکە دەکـەنو پارێز دەکـەن، پاداشـتێکی مەزن هـەیە ﴿١٧٢﴾ ئەوانەی کە خـەڵـك (ی ناحـەز) پێـیان گوتن: بێگومـان خـەڵـك (ی دوژمـن) بۆتـان کۆبوونەتـەوە، دەجـا لێیـان بتـرسن ! کەچـی ئـەو (هەڕەشـەو ترسـاندن)ە، ئیمـانی زیـادکردنو گوتیـان: خـوامان بەسـەو چاکتـرین کـار پێسپێرراویـشە ﴿١٧٣﴾ ئیـدی سـەرەنجام بـە چـاکەو بەخشـشێکی تایبەتییـەوە لەلایـەن خـواوە، گەڕانـەوەو، هـیچ خراپـەو زیانێکـیان تـووش نـەبوو، وە کـەوتنە شـوێن ڕەزامەنـدیی خـوا، وە خـوا خـاوەن بەخشـشی مەزنـە ﴿١٧٤﴾ بێگومـان ئـەوە شـەیتانە کـە لـە دۆستەکانی دەتانتـرسێنێ، دەجا لێیـان مەترسنو بـەس لـە مـن بتـرسن، ئەگـەر بـڕوادارن ﴿١٧٥﴾ وە با ئەوانـەی لـە بێبڕواییـدا پێشبـڕکە دەکـەن، دڵتەنگـت نەکـەن، بێگومـان هـەرگیز هـیچ زیانێك لـە خـوا نـادەن، خـوا (کـە لـەم ژیانـەدا دەرفـەتی زیاتریـان پێـدەدا) دەیـەوێ لـە دواڕۆژدا هـیچ پـشكو بەشـیان نەداتـێ، وە (لـە دواڕۆژدا) ئازارێکـی مەزنیـان هەبـێ ﴿١٧٦﴾ بێگومـان ئەوانـەی بێبـڕوایی یـان بـە بـڕوا کڕیـوە، هـیچ زیـانێك لـە خـوا نـادەن، وە (لـە دواڕۆژدا) ئازارێکی بە ئێشیان هـەیە ﴿١٧٧﴾ وە با ئەوانەی بێبڕوان، پێیان وا نەبێ، کـە ئـەو

مۆڵەتــەی دەیاندەینــێ بۆیـان بـەخێر دەگـەڕێ ! بەڵـکو تەنیـا بۆیــە مۆڵەتیــان دەدەیــن (و ژیانیـان درێـژ دەکەینــەوە) تـاکو (لـە ئاکامی ژیـانی گوناهکارانەیانـدا) هـەر لـە خراپـەو تـاوان زیـاد بکـەن، وە (لـە دواڕۆژیـشدا) ئـازارێکی ڕیـسـواکەریان هــەیە ﴿١٧٨﴾ ناگونجـێ خـوا لـە بـڕواداران بگـەڕێ، لـە حـاڵێکی وەك ئـەوەی ئێـوەدا بمێننــەوە، بەڵـکو تاقیيتــان دەکاتــەوە، تاکــو پــیس لــە پــاك جیادەبێتــەوە، وە ناگونجــێ خــوا لــە پەنهــان ئاگــادارتان بکاتــەوە (تــاکو پــاكو پــیس لــە یــەك جیابکــەنەوە)، بــەڵام ئــەوەی بیــەوێ لــە پـێغــەمبەرانی هەڵیدەبــژێرێ (وە لــە ئەنجامی بڕواهێنـانو نـەهێنان بـە پـێغـەمبەرو شـوێنکـەوتنو شـوێننـەکەوتنیـدا، پـاكو پـیس لەیـەك جیـادەبنــەوە) دەجا بـڕوا بـە خـواو پـێغـەمبەرانی بێـنن، وە ئەگەر بڕوا بێننو پارێز بکـەن، ئـەوە مـسۆگەر پاداشـتێکی مەزنتـان هـەیــە ﴿١٧٩﴾ وە بـا ئەوانـەی کـە لـەو بەخشـشـەدا کـە خـوا پـێـیداون، ڕژدیـی دەکـەن، پێیـان وانـەبــێ کـە ئـەوە بۆیان باشــە، بەڵـکو ئـەوە بۆیــان خراپــە، چونکــە لــە ڕۆژی قیـامـەتـدا ئەوەی ڕژدییان تێـدا کـردوە (و نەیانـبەخشیوە) لـە گەردنیـان دەئالــێ، وە میــراتی ئاســمانەکــانو زەویــش هـــی خـــوایە، وە خـــوا بـــەوەی دەیکـــەن شـارەزایـە ﴿١٨٠﴾)).

## شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەکان

( وَلَا تَحْسَبَنَّ ): واتـە: وە پـێتان وانەبـێو گومـانی وانەبـەن، وشـەی (تَحْسَبَنَّ) لـە (حَسِبَ يَحْسَبُ: حِسْبَاناً)ەوە هاتوە، یانی: (ظَنَّ، يَظْنُ، ظَنَاً) واتـە: گومـانی برد، گومـان دەبـا، گومان بـردن، (وَالحِسْبَانُ أَنْ يَحْكُمَ لأَحَدِ النَقِيضَيْنِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَخْطُرَ الآخَرَ بِبالِهِ) واتە: (حِسْبَان) بریتیـە لـەوەی کە ئینسان حوکم بکات بۆ یەکێك لە دوو شـتە دژو پێچەوانەکان، بـێ ئـەوەی کە ئەویدیکـەی بە خەیـاڵ دابێـت، یانی: پـێـیوابـێ کە ئـەو کـارە بـەو شـێوەیەو پێـچەوانەی ئەوەی دەیلێ بە خەیاڵیدا نەیـەت.

(وَيَسْتَبْشِرُونَ ): واتە: دڵخۆش دەبن، چونکە وشەی (يَستَبشِرُون) لە ئەسڵدا لە (بَشْرَة)ەوە هاتوە، (البَشْرةُ: ظَاهِرِ الجِلْدِ، واسْتَبشَرَ: وَجَدَ مايُبَشِّرُهُ مِنَ الفَرَحِ..)، (بَشْرةُ) واتە: پێست، یاخود دەمو چاو (واسْتَبشَرَ) واتە: شتێکی وەچەنگ کەوت کە دڵخۆشی بکاتو دەموچاوی پێی گەشبێ لە دڵخۆشییان.

(حَسْبُنَا ٱللَّهُ): واتە: خوامان بەسە، کە لە (حَسْبَ)ەوە هاتوە، (الحَسْبُ: الكِفَايَةُ) واتە: ئەو شتەی کە بەسو (کافی) بێ.

( حَظًّا ): (النَّصِيبُ المُقَدَّرُ)، واتە: بەشێکی دیاریکراو، دەگوترێ: (حَظِظْتُ وَحُظِظْتُ فَأَنّا مَحْظُوظٌ) واتە: ئەو شتەم پێبڕاوەو من خاوەن بەشم، یاخود بەختەوەرم، وە وشەی (حَظ) بەمانای شانسو بەختیش بەکارهاتوە، واتە: ئەو کەسە بەختەوەرە بەوەی کە بەشێکی باشی پێبڕاوە.

(نُمْلِي ): واتە: بۆیان درێژدەکەینەوە، یاخود مۆڵەتیان دەدەین، (الإِملاَءُ: الإمْدَادُ، وأُمْلي لَهُمْ: أُمْهِلُهُمْ)، (إملاء) واتە: درێژکردنو ڕستە لە دوادران، (وأُمْلي لَهُمْ) بەمانای مۆڵەتیان دەدەمو بواریان پێدەدەم.

(يَمِيزَ): (الْمَيْزُ وَالتَّمْيِيزُ: الفَصْلُ بَيْنَ الْمُتَشَابِهَاتِ، مَازَهُ يَمِيزُهُ مَيْزاً، وَمَيَّزَهُ، تَمْيِيزاً)، وشەی (مَيْزُ)و (تَمْيِيزُ) واتە: جیاکردنەوەی ئەو شتانەی کە لێکدەچن (مَازَهُ يَمِيزُهُ مَيْزاً) واتە: لێکی جیاکردەوە، لێکی جیادەکاتەوە، لێك جیاکردنەوە، (وَمَيَّزَهُ، تَمييزاً) دیسان ئەوەش بەهەمان شێوە واتە: لێکی جیاکردەوە.

(يَجْتَبِي ): واتە: هەڵدەبژێرێ، دەگوترێ: (جَبَيْتُ الماءَ: جَمَعْتُهُ) واتە: ئاوەکەم کۆکردەوە، (جَابية) کۆیەکەی (جَوَاب)ە، (جَابيَة) بە حەوزی ئاو دەگوترێ: وەك لە قورئاندا هاتوە، ئنجا (إجتِبَاء) بریتیە لە کۆکردنەوە بە شێوەی

هەڵبژاردنو گوڵبژێرکردن، (وَاجتِبَاءُ اللَّهِ لِلْعَبْدِ: تَخْصِيصُهُ إِيَّاهُ بِفَيْضٍ يَتَحَصَّلُ مِنْهُ أَنْوَاعٌ مِنَ النِّعَمِ بِلاَ سَعيٍ مِنَ العَبْدِ)، واتە: هەڵبژاردنی خوا بۆ بەندە: ئەوەیە کە خوا ئەو بەزەییەی خۆی تایبەت بکات بە بەخششێکی خواییەوە، کە بەهۆی ئەو بەخششەوە چەندان چاکەو خێری باشی وەدەست بکەوێ، بێ ئەوەی کە ئەو بەندەیە بۆخۆی هەوڵی بۆ دابێ، وەك: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە خوا پلەی پێغەمبەرایەتی بەنسیب کردوون، بێ ئەوەی بۆ خۆیان هەوڵیان بۆ دابێ، بەڵام دیارە لەبەر ئەوە بووە کە شایستە بوون.

(سَيُطَوَّقُونَ): واتە: لە گەردنیان دەئاڵێ، (أصْلُ الطَوْقِ: مَا يَجْعَلُ فِي العُنُقِ خِلْقَةً كَطَوْقِ الحَمَامَةِ، أو صُنْعَةً، كَطَوْقِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وطَوَقَتُهُ: مَدَّدتُهُ)، (طَوْق) بریتیە لە هەرشتێك کە لە گەردن دەکرێ، هەر بە دروستکردنی خوا، وەك کۆتر (یان کەو کە خەتو نەخشیان لە ملدا هەن) یاخود دروستکراوبێ وەك: ملوانەکەو گەردنبەندی زێڕو زیوی ئافرەت، وە (طَوَّقْتُهُ) واتە: شتێکم لە گەردن کرد، کە دوایی زیاتر باسی ئەم تەعبیرە دەکەین، مەبەستی چییە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾.

أ) {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: لَمَّا أُصِيبَ إخوانُكُمْ بِأُحُدٍ جَعَلَ اللَّهُ أَرْوَاحَهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، تَرِدُ أَنْهَارَ الْجَنَّةِ، تَأْكُلُ مِنْ ثِمَارِهَا وَتَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مِنْ ذَهَبٍ مُعَلَّقَةٍ، فِي ظِلِّ الْعَرْشِ فَلَمَّا وَجَدُوا طِيبَ مَأْكَلِهِمْ وَمَشْرَبِهِمْ وَمَقِيلِهِمْ، قَالُوا: مَنْ يُبَلِّغُ إخوانَنَا عَنَّا: أَنَّا أَحْيَاءٌ فِي الْجَنَّةِ، نُرْزَقُ لِئَلاّ يَزْهَدُوا فِي الْجِهَادِ وَلا يَنْكُلُوا عِنْدَ

الْحَـرْبِ؟! فَقَـالَ اللَّـهُ سُبْحَانَهُ: أَنَـا أُبَلِّغُهُـمْ عَنْكُمْ، قَـالَ: فَـأَنْزَلَ اللَّـهُ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ ... ﴾، إِلَى آخِـرِ الآيَـةِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ بـرقم: (٢٣٨٨)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢٥٢٠)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٢٤٤٤)، وَصَحَّحَهُ الألبـاني فـي (صحيح الجامع) بـرقم: (٥٢٠٥)، واتـە: عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس (خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پـێغـەمبەری خـوا ﷺ فـەرمووی: دوای ئـەوەی برایەکانتـان لە جەنگـی ئوحـوددا پـێـکران (واتـە: شـەهید بوونو کـوژران) خـوا ﷻ ڕووحەکانیانی خستە نێو باڵندەی سەوز (واتـە: ڕووحـەکانیان کرانـە نێـو جەسـتەی باڵـندەی سـەوز، یـاخود جەسـتەیەك کـە لـە شـێوەی جەسـتەی باڵـندەی سـەوز دایـە) ئـەو باڵنـدانە کـە ڕووحـی شـەهیدەکانیان تێدایـە، دەچنـە سـەر ڕووبـارەکانی بەهەشـت، وە لـە بەروبـوومی بەهەشـت دەخـۆن، دوایـی دەچـنە نێـو چـەند چرایـەك کـە لـە زێـڕ دروسـتکراونو بـە سـێبەری عەرشـەوە هـەڵواسـراون[1]، ئنجا دوای ئەوەی ئەو ڕزقو ڕۆزییە خۆشـەو ئـەو خـواردنو جێگـەو ڕێگـە خۆشـەیان بینـی گوتیـان: کـێ بـە برایەکانمـان ڕادەگەیـەنێ لـە ئێمـەوە (واتـە: ئـەو برایانـەمان کـە لـە دنیـادا مـاونو لـە جـەنگو جیهـاد دان) کـە ئێمـە لـە بەهەشـت دایـن، وە خـوا ڕزقو ڕۆزیـی بەو شێوەیەی پـێداویـن، بۆ ئـەوەی لـە جـەنگو جیهـاد دڵیان سـارد نـەبێو پاشـەکشـە نەکـەن لە جەنگ، خـوا سبحانە وتعالی فـەرمووی: مـن لـە جیـاتی ئێـوە پێـیان ڕادەگـەیەنم، ئنجـا ئـەم ئایەتـانەی نـاردە خـوار، کەواتـە: ئـەم ئایەتـە پەیامێکـە خـوا لـە شـەهیدانێك کـە لـە بەهەشتـدا نیـشتەجێ بوون، گەیاندوویـەتی بـە موجاهیدانێـك کـە جـارێ هـەر لـە دنیـان، تاکـو بـزانن کاتێـك کە شـەهید دەبـن، ئەو جێگـەو ڕێگـە خۆشـانە پاداشتیانە.

ب) هـەر لەوبـارەوە ئەم فەرموودەیـەش هـەیە: {عَنْ جَـابِرَ بْنَ عَبْـدِ اللهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَـا) يَقُولُ: لَقِيَـنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقَـالَ لِي: يَـا جَـابِرُ، مَـا لِي أَرَاكَ

---

[1] ﴿(قَنادیل) کـۆی (قَندیل)ە، واتـە: چراکـان، کـە کـاتی خـۆی جـۆرە چرایـەك بـووە هەڵواسـراوە، ئـەو ڕووحانەی دەچنـە نێویان، وەك هـێلانە وایە بۆیـان﴾.

مُنْكَسِرًا!، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ اسْتُشْهِدَ أَبِي، قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَتَرَكَ عِيَالاً وَدَيْنًا، فَقَالَ: أَفَلا أُبَشِّرُكَ بِمَا لَقِيَ اللهُ بِهِ أَبَاكَ؟! قَالَ: قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: مَا كَلَّمَ اللهُ أَحَدًا قَطُّ إلا مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ، وَأَحْيَا أَبَاكَ، فَكَلَّمَهُ كِفَاحًا، فَقَالَ: يَا عَبْدِي تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ، قَالَ: يَا رَبِّ تُحْيِينِي (وفي رواية، تَرُدُّنِي إلى الدُّنيا) فَأُقْتَلَ فِيكَ ثَانِيَةً، فَقَالَ الرَّبُّ ﷻ: إنَّهُ قَدْ سَبَقَ مِنِّي أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لا يُرْجَعُونَ، قَالَ: يَا رَبِّ فَأبلِغْ مَنْ وَرَائِي فَأَنْزَلَ اللَّه: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ﴾، الآيَةَ} رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠١٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٠٠،١٩٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٠٢٢)، وَالحَاكِمُ (٤٣٢) وَحَسَّنَهُ الألباني في (سُنن ابنُ مَاجَه)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا - خوا لێیان ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، پێمگەیشت، گوتی: ئەی جابیر! ئەوە بۆچی (کە پێتدەگەم وەك بڵێی) داماوی‌و خەمباری ؟ (چونکە ئینسان کە داما سەری خوار دەکاتەوە) دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا !ﷺ، بابم شەهید بووە لە ڕۆژی ئوحود کوژراوە، وە خێزان‌و قەرزیشی بەسەردا جێهێشتووم (لە ڕیوایەتی بوخارییدا هاتووە کە (جابر) چەند خوشکێکی هەبوون، واتە تەنیا خۆی کوڕ بووەو ئەوانی دیکە کچ بوون)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا موژدەت پێبدەم بەوەی کە خوا چۆن پێشوازیی لە بابت کردوە ؟ دەڵێ، گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خوا !ﷺ فەرمووی: خوا هەرگیز قسەی لەگەڵ کەس نەکردوە تەنیا لە پشت پەردە نەبێ، وە بابتی زیندوو کردەوەو ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵدا کرد، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان دوای ئەوەی شەهید دەبێ، ڕووحەکەی خوا ڕووبەڕوو دەیدوێنێ، بەڵام دیارە ڕووح تا لە جەستەدا بێت تەحەمولی ئەوە ناکات خوای بێ وێنە ببینێ، بەڵام دوای ئەوەی لەو قەفەزی جەستەیە دەرباز دەبێ، توانای زۆرەو دەتوانێ خوای بێ‌هاوتا ببینێ)، وە خوا سبحانە وتعالی پێی فەرموو: ئەی بەندەکەم تۆ بخوازەو من پێت بدەم (چیت دەوێ ؟!) گوتی: پەروەردگارم داوام وایە زیندووم بکەیەوە (لە ڕیوایەتێك دا:

بمـــگێڕەوە بـــۆ دنیـــا) لەپێنـــاوی تـــۆدا بكـــوژرێم (شـەهیدبـــم) خـــوا ﷻ فـــەرمووی: ئـــەم بـــڕیارە لەمنـــــەوە تێپـــەڕیوە (پێـــشێ بڕیـــارم داوە) كـــە ئینـــسانەكان دوای ئـــەوەی دەكـــوژرێن ناگێڕرێنـــــەوە بـــۆ دنیـــا (ئـــەو داوایـــە جێبـــەجێ نـــابێ)، ئنجا (عەبدوڵڵا) گوتی: ئـەی پەروەردگـارم ! ئەوانـەی لـە دوای منـەوەن پـێیان ڕابگـەیەنە (كە من حـاڵو وەزعـم چۆنـە)، ئنجـا خـوا ئەم ئایەتـەی نـاردە خـوار.

دیارە ئەمـە لەگـەڵ ئـەوەی پـێشێ هـەر یـەك شــتە، كە خـوای زانــاو توانــا ئـایەتی ناردۆتە خـوارەوە وەك گـەیاندنی پەیـامی شـەهیدان لـە بەهەشــتەوە، بۆ ئـەوەی مسـوڵمانان لە جەنگـو جیهاد بەردەوام بن‌و ســاردنەبنەوە.

٢/ دەربـــارەی هـــۆی هاتنـــە خـــوارەوەی ئـــەو ئایـــەتە كـــە دەفـــەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ﴾، لەگـەڵ چەند ئایەتێكـی دیكـەدا، ئـەم بەسەرهـاتە گێڕراوەتــەوە: {أَخْرَجَ ابْنُ إِسْحَاق وابْنُ جَرِير والبَيْهَقِيُّ فِي (الدلائل) عَنْ عَبدِاللّه بْنِ أَبي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرو بْنِ حَزْمٍ، قَالَ: خَرَجَ رَسولُ الله ﷺ بِحَمْرَاءِ الأَسَدِ وَقَدْ أَجْمَعَ أَبُو سُفيَان بِالرَّجْعَةِ إِلى رَسولِ اللّهِ ﷺ وَأَصْحَابِهِ وَقَالُوا: رَجَعْنَا قَبْلَ أَنْ نَستَأْصِلَهُمْ لَنكرَّنَّ عَلى بَقيَّتِهم، فَبَلَغَهُ أَنَّ النَّبيَّ ﷺ خَرَجَ في أَصْحَابِهِ يَطلُبُهُمْ فَثَنَى ذَلِكَ أَبا سُفيان وَأَصْحَابهُ، وَمَرَّ رَكب مِنْ عَبْدِ القَيْس، فَقَالَ لَهُمْ أَبو سُفيان: بَلِّغُوا مُحَمَّداً أَنَّا قَدْ أَجْمَعْنَا الرَّجْعَةَ عَلَى أَصْحَابِهِ، لِنَستأصِلَهُمْ فَلَمَّا مَرَّ الرَكبُ بِرَسولِ اللّهِ ﷺ بِحَمْرَاءِ الأَسَد أَخبَرُوهُ بالَّذِي قَالَ أَبُو سُفيان، فَقَالَ رَسولُ الله ﷺ وَالمُسْلِمُونَ مَعَهُ: حَسْبُنَا اللهَ وَنِعْمَ الوَكِيل، فَأَنْزَلَ اللهُ فِي ذَلِكَ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ... ﴾}، واتــە: ئیبنـو ئیـسحاقو ئیبنـو جـەریر، وە بەیهـــەقیی لـە (دلائـل)دا، لـە عەبدوڵــلای كـوڕی ئـەبو بەكـری كوڕی موحەممـــەدی كـوڕی عەمـــڕی كـوڕی حـەزم دەگێـڕنەوە، كـە گوتوویـــەتی: پـێغـەمبەری خـوا ﷺ

چـووە (حَمْرَاء الأَسَـد) (کـە شوێنێکـە مـاوەی چـەند میلـێك لـە مەدینـە دوورە)، بـە ڕۆژ چـووەو شـەوەکەی ماونـەوە، ڕۆژی یـەك شـەممە لەگـەڵ ئـەو هاوەڵـە بەرێزانـەی کـە لـە جـەنگی ئوحـود بەشـدارییان کردبـوو دەرچـوو، وە فـەرمووی: نـابێ هیچ کـەس کـە نەهـاتوە بـۆ جـەنگی دوێنـێ ئـەمڕۆ بێـت، واتـە: مونافیـقو دەغـەڵو دڵنـەخۆشـەکانی لەگـەڵ خۆی نـەبردن، ئـەوانی دیکـە چ بە ساغیی، چ بە بریندارییی بردنی، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ چـوو بۆ ئەو شوێنە، کە ئەبو سوفیان بڕیاری دابوو بگەڕێتەوە بۆ سەر پێغـەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی، وە گوتیان: ئێمە گـەڕاینەوەو وازمـان لـە موحەممەدو هاوەڵەکانی هێنـا، پـێش ئـەوەی ڕیشـەکێشیان بکـەین، دەبـێ ئـەمجارە هێرشیان بکەینـەوە سـەرو تاقیـان لـێ نەهێڵـین!! (مـادام حـەفتایان لـێ کـوژراوەو ئەوانیدیکەش بریندارو شەکەتن، ئێستا دەرفەتە بابچین تاقیان لێ ببڕین) ئـەم هەواڵـە بـە پێغـەمبەر ﷺ گەیـشت، ئـەویش یەکسەر لەگـەڵ هاوەڵـە بەرێزەکانی دەرچوو بەدوایان کەوت، کاتێك ئەبو سوفیان ئـەوەی پێگەیـشت، کـە پێغـەمبەری خـوا ﷺ و هـاوەڵانی بەرێـزی بۆیـان دەرچـوونو بـەرەو ڕوویـان دێـن، ئـەوە پەشـێمانی کـردەوە، وە خـۆیو هـاوەڵانی گـەڕانەوە، بـەڵام کاروانێك لـە هـۆزی (عبدالقیس) بەلایانـدا تێپـەڕ بـوو، ئـەبو سـوفیان پێـی گوتن: بـە موحەممـەد ڕابگەیـەنن، کـە ئـەوە ئێمـە بڕیارمـان داوە بگەڕێینـەوەو هێـرش بکـەینە سەر هاوەڵەکـانی، تـاکو بنبـڕیان بکـەینو کەسیان نەهێڵـین، کـاتێك ئەو کاروانـە هاتنـە لای پـێغـەمبەری خـوا ﷺ لـە (حَمْرَاء الأَسَد) کـە پێغەمبەری خوا ﷺ لـەوێ چاوەڕێی ئەبو سوفیانو کۆمەڵـەکەی دەکـرد، کـە بە حیساب ئەوە دێـن بۆ مەدینـە، پێغـەمبەر ﷺ بۆیـان چووە دەری مەدینـە، ئـەو کـاروانە هەواڵەکـەیان پێـداو گوتیـان: ئـەبو سـوفیان ئـاوای گـوتوە، پێغـەمبـەر ﷺ و مـسوڵمانانێك کـە لـە خزمەتیـدابوون گوتیـان: خـوامان بەسـە، وە باشتـرین کـار پـێ سپێـردراویش خـوایە، خـوای بـەرزو مـەزنیـش ئـەم ئایەتـانەی ناردنـە خـوار:﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ... ﴾، کـە دوایـی

واتای ئایەتەکانتان زیاتر بۆ دەردەکەوێ‌و، دەزانن کە ئەو هەڵوێستە چ هەڵوێستێکی مەردانەو جوامێرانە بووە !!

٣/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾﴾، (عَنِ السُّدِّي أَنَّ أَبَا سُفيان وَأَصْحَابهُ لَقوا أَعْرَابِيّاً فَجَعَلُوا لَهُ جَعْلاً عَلَى أَنْ يُخْبِرَ النَّبِيّ ﷺ وَأَصْحَابهُ أَنَّهُمْ قَدْ جَمَعُوا لَهُمْ فَأَخْبَرَ النَّبِيّ ﷺ بِذَلِكَ، فَقَالَ هُوَ وَالصَحَابة: حَسْبُنَا الله وَنِعْمَ الوَكِيل، ثُمَّ رَجَعُوا مِنْ حَمْرَاءِ الأَسَد، فَأَنْزَلَ اللَّه فِيهِم وَفِي الأعْرَابي: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ ...﴾[1]، واتە: سودیی (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك ئەبو سوفیان‌و هاوەڵەکانی (واتە: سوپاکەی) گەیشتنە ئەو کابرا عەرەبە دەشتەکییە (ئەوەی کە لە کاروانەکەی هۆزی (عبدالقیس)دا بوو) دیارییەکیان بۆ دیاری کرد (لە ڕیوایەتی دیدا هاتوە، کە بارێکیان زەخیرەو خۆراك داوەتێ، لە بەرانبەر ئەوەدا کە جەنگێکی دەروونیی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکات)، کە هەواڵبدات بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی کە ئەبو سوفیان‌و سوپایەکەی بۆیان کۆبوونەتەوەو گەڕاونەوە سەریان، (هێرشیان دەکەنە سەر) جا کە هەواڵیدا بە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەرو هاوەڵە بەرێزەکانی گوتیان: (حَسْبُنَا الله وَنِعْمَ الوَكِيل)، وە دوایی هەر چاوەڕێیان کرد، سێ چوار ڕۆژ لە (حَمْرَاءِ الأَسَد) مانەوە، بەلام ئەبوسوفیان‌و سوپایەکەی جورئەتیان نەکرد بۆیان بێن، خوای بالادەست دەربارەی وان‌و دەربارەی ئەو عەرەبە خێلەکییەی کە هەواڵەکەی بۆ هێنابوون، لە بەرانبەر ئەو دیارییەدا کە پێی درابوو، بۆ ئەوەی ئەو جەنگە دەروونییەیان لەگەڵ بکات، ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

---

١) فتح القدير، ج(١)، ص(٥١٥:٦٠٦).

## مانـای گشـتی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی ئەوەی کرد کە تێشکانی مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا یەکەم: هۆکاری چی بوو، بۆچی تێکشکان ؟ دووەم: وە حیکمەتی چی بوو کە تێکشکان ؟ وە دوایی باسی هەڵوێستی ئیمانداران باش و هەڵوێستی دڵنەخۆش و دەغەڵەکانی کرد، ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێست لە بەرانبەر ئەوانەدا کە لە ڕێی خوا شەهید دەبن و دەکوژرێن، کە ئەوانە ئایا دەرەنجامیان، حاڵ و وەزعیان چۆنە؟ وە ئایا پێویستە تێڕوانینمان چۆن بێت لەبارەیانەوە؟ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴾، وامەزانە ئەوانەی کە لەڕێی خوادا کوژراون مردوون، بە مردوویان تێمەگەو بە مردوویان مەزانە، بەڵکو زیندوون لەلایەن پەروەردگاریانەوە بژیویان دەدرێتێ، ئنجا دەگونجێ لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەر ﷺ بێ، واتە: خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێت وانەبێ ئەوانە مردوون، یاخود ڕووی دواندن (خِطاب) لەگەڵ هەرکەسێك بێ کە قورئان دەخوێنێ و بەدوای پێغەمبەر ﷺ دەکەوێ، کە کوژراوانی ڕێی خوا بە مردوو دامەنێن، وا مەزانن کە وەك خەڵکی دیکە دەمرن و وەزعیان وەك مردووانە! بەڵکو ئەوانە لە ژیانێکی تایبەت دان کە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ڕزق و ڕۆزییان دەدرێتێ، ئنجا خوای بەخشەر زیاتر ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو شێوە ژیانەی ئەوان چۆنە ؟ دەفەرموێ: ﴿ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، واتە: دڵخۆش دەبن بەوەی کە خوا لە بەخششی خۆی پێیداون، دڵخۆشن بەو پاداشت و بەهەشتە ﴿ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ ﴾، وە دڵخۆشیش دەبن بەوانەی کە جارێ لەدوایانەوەن و پێیان نەگەیشتوون، واتە: دڵخۆشن بەوەی کە دوایی براکانیشیان کە دێن بۆ لایان و لە ڕێی خوادا دەکوژرێن، ئەوانیش بەهەمان شێوە دێنە نێو ئەو

مەنزڵگاو جێگاو ڕێگا خۆشو پاداشتە چاکە.. ﴿أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، دڵخۆشن بەوەی کە نە ترسیان لەسەرە، وە نە خەمباریش دەبن، نە ترسیان لەسەرە بۆ داهاتوو، نە خەمبارو دڵتەنگیش دەبن بۆ ڕابردوو، چونکە کەسێك لە ڕێی خوادا گیان فیدایی کردبێ، خەم لە ڕابردوو ناخوا، پەشێمان نیە تا خەمی لێ بخوات، وە ترسی داهاتووشی نیە، چونکە تازە بەرچاوی ڕوونەو دەزانێ کە خوا لێی ڕازی یە، ﴿يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ ﴾، دڵخۆش دەبن بە چاکەی خواو بە بەخششی خوا ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، وە دڵخۆشیش دەبن بەوە کە خوا پاداشتی بڕواداران زایە ناکات (دیارە ئێمە لە کاتی خستنەڕووی مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەوە کە شەهیدان چۆنن لە بەهەشتدا)، بەڵێ لێرەدا خوای زانا باسی ئەوانە دەکات کە لە ڕێی خوادا دەکوژرێن، کە ئەوە پاداشتیانەو ئەوە حاڵو مەقامیانە، وە ئەوەش دڵخۆشییانە بە برایانێکیان کە جارێ لە دنیادا ماونو لە دوایانەوەن، وە چاوەڕێ دەکەن ئەوانیش بەدوای واندا بێن، جا چ بە مردن بمرن لە ڕێی خوادا، چ بە کوژران بکوژرێن، چونکە هەموو کەسیش بەنسیبی نابێ بکوژرێ، بەڵام هەرکەسێك بشمرێ، مادام لە ڕێی خوا دابێو لەسەر ڕێبازی جەنگو جیهاد بێ، بەپێی ئەو نیەتەی کە لە دڵی دایە، خوای پەروەردگار پاداشتی دەداتەوە، وەك: لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٩٠٧)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٥٢٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٥٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣١٦٢) وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٩٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٤١٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣١٩٢)، عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ رضي الله عنه)، واتە: هەر کەسێك بەڕاستی لە خوا بخوازێ پلەی شەهیدیی بەنسیب بکات، خوا دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدان، ئەگەر لەسەر جێگای خۆشی بمرێ (بە مردنی ئاسایی)، چونکە خوا هەڵسوکەوتو مامەڵە لەگەڵ نیەتدا دەکات،

کەســی وا هەیـە لـە گەرمـەی جـەنگو جیهادیـشدا دەکـوژرێ، بـەڵام بـە شـەهید لەقەڵــەم نــادرێ، کەچــی هەیــە لەســەر جێــی خــۆی دەمــرێ، بــەڵام بەپــێی نیـەتەکـەی خـۆی کـە ویـستوویەتیو ئـاواتی خواسـتوە شـەهید بێـت، خـوا بـەو پلـەیەی دەگەیـەنێ، جا ئەوانـەی کـە چوونە بەهەشـت لـە کوژراوانی ڕێـی خـوا، چـاوەڕوانیی دەکــەن برایەکانیـشیان بێنـە ئـەو حـاڵو مـەقامو ئـەو پاداشـتەو نیعمەتـە، ئنجا باسـی هـەڵوێستی هـاوەڵانی بەڕێز دەکات - خـوا لێیـان ڕازی بـێ-، کـە بەڕاسـتی ئینسان ئەگـەر ئـەزموونی لـە ژیـانـدا هـەبـێ لـە شــەڕو جـەنگو جیهـادو ئەو حاڵەتانـەدا.

ئنجـا زیاتر تەقدیری ئەو هاوەڵە بەڕێزانـە دەکات، نـەك هـەروا بـە حیکـایەت بیبیـستێ، بەڵـکو بۆخـۆی تـۆزێ جـەنگو جیهـادی کردبـێ، وە ئـەو حاڵەتانـەی بەسەرهاتبــێ، خەڵــکی لــێ بریـنـدار بووبــێ، شــەهید بووبــێ، تووشــی شکــست بووبـێ، جـا ئەوجـار زیـاتر دەزانـێ ئـەو هەڵوێستەی ئـەو هاوەڵە بەڕێزانـە چـەند مەردانـە بـووە، وە چەند فیداکارانە بـووە، پاشان دەفـەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ﴾، واتــە: ئەوانــەی کــە وەڵامــی خــواو پـێغـەمبەری خـوایان دایـەوە، دوای ئـەوەی کـە برینـیـان تێـبوو بـوون، شکـستو بـرینو نارەحـەتیی یـان بەسـەرهاتبوو، بـەڵام بـەدەم فـەرمانی خـواو پـێغـەمبەری خـواوە چوون ﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾، بۆ ئەوانەیان کە چاکـەیان کـردوەو پارێــزیان کـردوە، پاداشـتێکی مـەزن هەیـە، ئەوانـە کـێ بـوون ؟ هـاوەڵانی بەڕێز بـوون، کـە ڕۆژی شـەممە جەنگـی (ئوحـود)یـان دۆڕانـدبوو، حەفتـایان لـێ شـەهید بوو بوو، یاخـود زیاتر، یان شتێك کەمتـر، وە حەفتـایـان لـێ بریـنـدار بـوو بوو، یان زیاتر یان کەمتـر، دڵ پڕ خەمو خەفـەت بوون، هـەر سـبەینـێ پـێغـەمبەر ﷺ فــەرمووی: خۆتــان سازبکــەنەوە!! جــا یــەکێك دەڵــێ: دوو بــرا بــووین هەردووکمــان بریـنـدار بووین، دەڵـێ: بـەڵام مـن برینەکـەم سووکتــر بـوو لـە هـی برایەکـەم، لـە هەنـدێ شـوێنان بـە بریـنـداریی برایەکـەم هەڵدەگرت، لـە هەنـدێك شـوێنان بەپـێـی خـۆی دەڕۆی، گوتمـان فەرمـانی پێغـەمبەرە ﷺ دەبـێ هـەر بـە

برینداریش بێ هەر بەرەو دوژمن بچین ! ئەوە وەك گوتم ئینسان تا بۆخۆی نەکەوێتە نێو ئەو حاڵەتە، نازانێ ئەوە چ هەڵوێستێك بووە، بۆیە خوای پەروەردگار ئاوا بە مەدحەوە باسی دەکات، دیارە هەرکەسێکی دیکەش وەك ئەو هاوەڵە بەڕێزانە بکات، هەر وەبەر ئەو مەدحە دەکەوێ، ئنجا بەس ئەوە نیە کە برینی جەستەییان تووش بووبێ، بەڵکو جەنگی دەروونییشیان لەگەڵدا کراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دوێنێ تووشی بریندار بوونو کوژرانو شکستو نارەحەتییو خەمو خەفەتو دڵتەنگیی بوون، ئنجا جەنگی دەروونییشیان لەگەڵدا کراوە، ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ﴾، ئەوانەی خەڵك پێیان گوتن: خەڵك بۆتان کۆبوونەتەوە، لێیان بترسێن، جا لێرەدا دیارە مەبەست لە ئەوانە ﴿ٱلَّذِينَ﴾، هاوەڵە بەڕێزەکانن (خوا لێیان ڕازی بێ) ﴿قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ﴾، خەڵك پێیان گوتن، ئەو خەڵکانە کێن ؟ کاروانێك بوون ئەبو سوفیانو سوپایەکەی ڕایان سپاردن ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ﴾، گوتیان: بێگومان خەڵك بۆتان کۆبوونەتەوە، ئەو خەڵکە کێن ؟ واتە: ئەبو سوفیانو سوپایەکەی، کە کاروانەکەی (عبدالقیس) بە پێغەمبەرو هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەریان ﷺ ڕاگەیاندو، گوتیان: ئەبو سوفیانو سوپایەکەی بۆتان کۆبوونەتەوە، لێیان بترسێن، وریابن، خەتەرە ! بەڵام ئایا بەوە ترسان؟ ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا﴾، ئەو هەواڵە کە پێیان گەیشت، ئەو ترساندنە لەجیاتی ئەوەی پێی بترسێن، ئیمانی زیاد کردن، جا ئەوە ڕەنگە یەکێك بڵێ: جا چۆن ! ئایا لەکاتێکدا ئینسان هەڕەشەی لێ دەکرێ، ئیمانی زیاد دەبێ ؟ دەڵێین: بەڵێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا بۆتان باس دەکەم، ﴿وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾،وە لە بەرانبەر ئەو هەڕەشەو هەواڵە ناخۆشەدا کە پێیان گەیشت، گوتیان: خوامان بەسە، وە باشترین کارپێسپێردراو خوایە، واتە: ئێمە سەرەنجامی خۆمان بە خوا سپاردوە،

سەرەنجام چۆن بوو ؟ ﴿ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ ﴾، ئیدی گەڕانەوە بە چاکەی خواوەو بە بەخششی خواوە، جا توێژەرەوان باسیان کردوە کە نیعمەتەکە چییەو فەزڵەکە چییە ؟ دەڵێن: نیعمەتەکە ئەوە بوو کە سەلامەت بوون، فەزڵەکەش ئەوە بوو کە لەوێ بازرگانییان کرد، کە سێ چوار ڕۆژو شەو لەوێ ماونەوە، دیارە شوێنێکی سەرەڕێ بووە، بازرگانییان کرد، وە قازانجیشیان لێکرد، ئەوانەی کە بازرگانیی‌و مامەڵەیان کرد، بەلاَم هەندێکیش دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ بازرگانیی کرد، هەندێك شتی کڕی‌و فرۆشتو، دوایی قازانجەکەی بەسەر هاوەڵاندا دابەش کرد ﴿ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ ﴾، هیچ خراپەو ناڕەحەتییەکیان تووش نەبوو ﴿ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ ﴾، بە دوای ڕەزامەندیی کەوتن ﴿ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴾، وە خواوەنی بەخششی گەورەیە، بەخششی ماددیی‌و بەخششی مەعنەویی، کە بەخششە ماددییەکە، بریتییە لەوەی کە لە ئەنجامی کڕین‌و فرۆشتندا، شتێکیان دەستکەوتبێ، وە بەخششە مەعنەوییەکە، بریتییە لە سەلامەت بوونیان، وە ئەوەیە کە دوای ئەوەی دوێنێ شکست بوو، ئەمڕۆ سەرکەوتنە، کە دوژمن نەوێرێ بەرەو ڕووت بێتەوە ! تەماشا بکەن ! پێغەمبەری خوا ﷺ چەند لێزان بووە، ئەو شکستەی دوێنێ تووشیان بوو، یەکسەر بۆ سبەینێ بۆی قەرەبوو کردوونەوەو مەعنەوییاتی بەرزکردوونەوە، کە ئەوە ئێمە چووین بەرەو دوژمن، بەلاَم دوژمن نەوێرا بەرەو ڕوومان بێت، وە ئەبو سوفیان‌و کۆمەڵەکەی کە بەحیساب براوە بوون، نەوێران بێن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دیکە، لەگەڵ ئەو سوپایەی پێغەمبەردا ﷺ، کە دیارە ئەویش هۆکاری خۆی هەبووە، کە نەوێراون بێن ؟! ئەویش ئەوە بوو کە خوا ترسی خستوونە دڵ، بەلاَم هۆکارێکی بەرهەستیشی هەبووە، جا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ ﴾، ئا ئەوەتان کە ئەو هەواڵە ناخۆشەتان بۆ دێنێ، یان ئەو هۆکارانە دەڕەخسێنێ کە ترستان بچێتە دڵ، ئەوە شەیتانە کە لە دۆستەکانی

خـۆی دەتانترسـێنێ، دۆستەکانی شەیتان کێن ؟ کافرەکانن، کافرەکانی قورەیش و غەیری قورەییش، شەیتان دەیەوێ ئێوە لە بەرانبەر دۆستەکانی ئەودا ترس و لەرزتان هەبێ، کەواتە: ئەوە هەمووی پیلان و فێڵ و خوتخوتەو وەسوەسەی شەیتانە، وە ئەگەر مەبەستیش پێی ئەو کاروانچییە خێڵەکییەبێ کە دیاریی (هدیة) درابۆیە، بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە ناخۆشەیان پێبدا، ئەوە دیسان شەیتان لە زاراوی قورئاندا دەگونجێ ئینسان بێ، یان جند بێ، گرنگ ئەوەیە هەموو خراپەکارێك بە ئەندازەی خراپیی، بە شەیتان لەقەڵەم دەدرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ...شَيَـٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ ... ﴿١١٢﴾ ﴾ الأنعام، واتە: شەیتانی ئادەمیزادو جند، ﴿ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، جا ئێوە لێیان مەترسن، وە لە من بترسن، ئەگەر ئیماندارن، واتە: ئەو ترسەی کە لە بەرانبەر خوا هەتانە، ئەگەر ئیمانداربن، نابێ بەرانبەر بە غەیری خوادا هەتانبێ، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستو دروست لە ئایەتەکان تێبگەین، ئەگەرنا مەرج نیە ئینسانی ئیماندار لەبەر ئەوەی کە لە خوا دەترسێ، لە هیچ کەسێك و لە هیچ شتێکی دیکە نەترسێ !! جاری وایە ئینسان لە مارێك دەترسێ، خوا باسی مووسا (علیە السلام) دەکات کە پێغەمبەر بووە، دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ ﴾ طە، واتە: مووسا لەو (مارانەی کە جادووگەرەکان دروستیان کردبوو، یان لە گۆچانەکەی خۆی، لەوێشدا خوای پەروەردگار باسی دەکات) ترسی ڕێنیشت، کەواتە: دەگونجێ ئینسان لە غەیری خواش بترسێ، بەڵام ئەو ترسەی کە بەرانبەر بە خوا هەیەتی، نابێ هیچ ترسێکی دیکەی بگاتێ، ئەوپەڕی ترس دەبێ لە خوابێ، ئەگەرنا ترسی سروشتیی و جیبیللییش هەیە، پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکری صدیق - خوای لێ ڕازی بێ-، کە لە ئەشکەوتی (ثور)دا خۆیان شاردبۆوە، جۆرێك لە ترسیان هەبووە لە دوژمنان، بەتایبەتی ئەبو بەکر - خوا لێی ڕازی بێ- کە بە پێغەمبەر دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ((لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ تَحْتَ قَدَمَيْهِ لأَبْصَرَنَا))، واتە: ئەگەر یەکێکیان تەماشای بن پێی خۆی بکات (لەو

کونەوە کە لە زاری ئەشکەوتەکەیە) دەمانبینێ !! دیارە کە پێغەمبەر ﷺ دڵی ئارام بووە، بۆیە پێی دەفەرموێ: {مَا ظَنُّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ بِاثْنَيْنِ اللهُ ثَالِثُهُمَا} رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (١١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٦٥٣)، وَمُسْلِم برقم: (٦١١٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٩٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبَا بَكْرٍ ﷺ، واتە: ئەی ئەبو بەکر ! گومانت بەرانبەر دوو کەسان چییە، کە سێیەمیان خوایە ؟! ئەویش دیارە خوای پەروەردگار دڵی پێغەمبەری ﷺ ئارام کردوەو سەکینەتی ڕژاندۆتە سەر دڵی، ئەگەرنا مەقامەکەو حاڵەتەکە هی ئەوە بووە کە بترسێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾، واتە: وە با ئەوانەی خێرایی دەکەن لە کوفرو بێبڕواییدا دڵتەنگت نەکەن، واتە: بە هەوڵو پیلانی وان دڵتەنگ مەبە، ﴿إِنَّهُمۡ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾، بێگومان ئەوانە هیچ زیانێك لە خوا نادەن، مرۆڤە سنووردارو بێهێزەکان چ زیانێك لە خوا بدەن!! زیانی لێ نادەن، ئەوە وەڵامی پرسیارێکە کە ڕەنگە لێرەدا دروست بێ، باشە خوا تبارك‌و تعالی بۆچی مۆڵەتیان دەداو دەیانژیێنێ، بۆچی لە بەینیان نابات؟! دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾، واتە: خوا دەیەوێ لە دوارۆژدا هیچ پشك‌و بەشیان نەبێ، وە ئازارێکی گەورەو مەزنیشیان هەبێ، کەواتە: بۆیە خوا دەیانژیێنێ، تاکو کوفر زیاد بکەن، وە شایستەی سزاو جەزرەبەی زیاتربن، ئنجا خوا دووبارەی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾، بێگومان ئەوانەی کوفر بە ئیمان دەکڕن، واتە: ئیمان دەدەن لە بەرانبەردا کوفر وەردەگرن، یانی: وەك بڵێی ئیمانیان کردوە بە نرخێك‌و کوفریان کردوە بە کالایەك، وەك نرخ کوفرەکەی پێ دەکڕن، ئا ئەوانە ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾، هیچ ئەندازەیەك زیان لە خوا نادەن ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، وە ئازارێکی بە ئێشیان هەیە،

﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ﴾، وە ئەوانەی کە بێبڕوان با وانەزانن کە ئەو مۆڵەتدانەی ئێمە، کە مۆڵەتیان دەدەینو تەمەنیان درێژ دەکەینەوەو، هۆکارەکانی ئاسوودەییو بەختەوەریی مادییان بۆ دەڕەخسێنین، با پێیان وانەبێ، ئەوە بۆ وان چاکە، ﴿إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًاۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾، بەڵکو بۆیە مۆڵەتیان دەدەینو ڕستیان بۆ درێژ دەکەین، تاکو لە گوناح زیاد بکەن، وە ئازارێکی ڕیسواکەریشیان بۆ هەیە، جا ئایا خوای پاكو چاك پێی خۆشە خەڵك گوناح بکات ؟! بە دڵنیایی نەخێر، ئەدی لێرەدا بۆچی وادە فەرموێ ؟ لەبەر ئەوەیە کە خوا ئینسانی بۆیە دروستکردوە بەندایەتیی بۆ بکات، بەڵام کە بۆخۆیان ڕێی بەندایەتی ناگرن، ئەوانەی کە کافرو بێبڕوان، ژیانەکەیان بەپێی ئەو یاسایانەی خوا کە دایناون، ژیانەکەیان درێژ دەبێتەوە، بەڵام سەرەنجام لە گوناحو تاوان زیاد دەکەن، وە لە دواڕۆژیشدا شایستەی سزاو تۆڵەی زیاتر دەبن.

جا خوای کاربەجێ دێتە سەر باسی خستنە ڕووی یەکێ لە یاساکانی لە ژیانی بەشەردا، دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ ﴾، ناگونجێ خوا لە بڕواداران بگەڕێ لەو حاڵەتەدا کە ئێوەی لەسەرن، جا ئایا ئەو حاڵەتەی ئەوانی لەسەر بوون، چۆن بوو، کە پێش جەنگی ئوحود بوو؟ دیارە کە تێکەڵ بوون، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە سەرۆکی مونافیقەکان بە خۆو بە سێ سەد کەسەوە لە جەنگی ئوحوددا پاشەکشەیان کرد، کە مونافیقو دڵنەخۆش بوون، ئەوە خوای پەنهانزان ناسیونی، پێغەمبەریش ﷺ بەدڵنیایی هەستی پێکردوون، بەلای کەمەوە بە هەندێکیان، بەڵام غەیب هەر خوا دەیزانێ، وە ڕەنگە مسوڵمانانی دیکە نەیانزانیبێو زۆر متمانەیان پێ بووبنو گوتبیان: ئەوانیش مسوڵمانن‌و ئیماندارن، لەگەڵ ئێمە نوێژ دەکەنو...هتد، بەڵام ئایا دەگونجێ کۆمەڵگای ئیسلامیی ئاوا بە تێکەڵو پێکەڵیی بمێنێتەوە ؟ نەخێر، یاسای خوا وایە، دەبێ لێك جیابکرێنەوە ﴿ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ

ٱلطَّيِّبِ ﴾، واتـە: تاقییتـان دەکاتـەوە تـاکو پـیس لـە پـاك جیابکـاتەوە، وەك چـۆن عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەییـەو ئەوانـەی کـە لەگەڵـی بـوون، جیـای کردنـەوە لـە کاتێکدا کە پاشەکشەیان کرد، وەك چۆن کەسێك بێـژینگ دێنـێ، گەنـم، جـۆ، یـان شـتێکی دیکـەی پـێ لـە بێـژینگ دەدات، ئـەوەی دەبێتـە سـەرکوێزرو سەرکۆتـەڵ فرێـی دەدا، مونـافیقو دەغەڵـەکان لەکـاتی نارەحەتیـیو گرفتـاریی یەکـاندا، ئـاوا دەبنـە سەرکوێزرو سەرکۆتـەڵو بنـژیـلو فـڕێ دەدرێـنو جیـادەبنـەوە، لەوانـەی کـە پـاكو چاکـن، جـا ئایـا خـوای کـاربەجێ چـۆن ئـاوا پـاكو پـیس لێـك جیـادەکـاتەوە ؟ دەفـەموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ ﴾، وە یاسـای خـواو عادەتی خـوا وانیـە کـە ئێوە ئاگـادار بکـاتەوە لـە پەنهـانو پەنهـان بـزانن، باشـە، ئـەدی چـۆن بـزانین کـێ پاکـەو کـێ پیسـە؟ خـوای پەروەردگـار ڕێیەکـەی دیـاری دەکـاتو دەفـەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، بـەڵام خـوا لـە پـێغـەمبەرانی خـۆی هەرکەسـێ بیـەوێ هەڵیـدەبژێـرێ، واتـە: پـێغـەمبەران هـەڵدەبژێرێ لـەنێو بەشـەردا، پـێغـەمبـەران (علـیهم الـصلاة والـسلام) خـەڵك بـانگ دەکـەن بـۆ لای خـوا، وە ئەوانـەی کـە شـوێنیان دەکـەون، ئەوانـە پاکـەکانن، ئەوانەش کە لێیـان لادەدەنو سـەرپێـچیی یـان دەکـەن، پیسـەکانن، واتـە: لـە ڕێـی شـوێنکەوتنی پـێـغـەمبەرانو ئیمـان پـێهێنـانیـانەوە، پاکـان جیادەبنـەوە لـە پیسانێك، کـە ئیمـان بـە پـێـغـەمبەر ﷺ ناهێنـن، وە شـوێنی ناکـەون، یـاخود بـە ڕواڵـەت ئیمـان دێنـن، بـەڵام لەکـاتی نارەحەتییـاندا شـوێن پـێـغـەمبەر ﷺ نـاکـەون، وەك: ئـەو دەغـەڵو مونافیقـانەی کـە لەگـەڵ عـەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەییـەدا بـوون، وایـانکرد، ﴿ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾، کەوابـێ ئیمان بە خـواو پـێـغـەمبەرانی بێنـن، وە ئەگـەر ئیمـان بێنـنو پـارێز بکـەن، ئـەوە پاداشـتێکی مەزنتـان هەیـە، لـە کۆتـاییـدا خـوای پـەروەردگار لەبـەر ئـەوە کـە جـەنگو جیهـاد پـێویـستی بـە بەخـشینە، پـێش ئـەوەی کـە گیانفیدایـی بکـەی، دەبـێ مـاڵ بەخـشیی بکـەی، بۆیـە هەمیـشە لـە قورئانـدا

بەخشینی ماڵ خراوەتە پێش بەخشینی گیان، لە یەك شوێن نەبێ لە سوورەتی (التوبة)دا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ ... ﴿١١١﴾﴾، واتە: بێگومان خوا گیانو سامانیانی لە بڕواداران کڕیوە، کە بەهەشتیان هەبێ، تەنیا لێرەدا خوا گیانی پێش ماڵو سامان خستوە، لەبەر ئەوەی لەوێدا مەقامەکە وایە کە ئەوەی بە قیمەتترە پێش ئەوە بخرێ کەم قیمەتترە، دیارە (گیان)یش بە قیمەتترە لە ماڵو سامان، ئەگەرنا لە هەموو شوێنەکانی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ... ﴿٧٢﴾﴾الأنفال ، یان دەفەرموێ: ﴿لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾﴾التوبة، وە دەفەرموێ: ﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡخَيۡرَٰتُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٨٨﴾﴾ التوبة، وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾ الحجرات، واتە: چونکە ئەوەی ماڵ نەبەخشێ گیان نابەخشێ، بەدڵنیاییی ئەوەی دڵی لەبەر ماڵەکەی نەبێتەوە، دڵی لەبەر گیانەکەی نابێتەوە، ئەوجار خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرًا لَّهُم﴾، وە با ئەوانەی کە ڕژدیی دەکەن لەو بەخششەی کە خوا پێی داون، با پێیان وانەبێ ئەوە بۆ وان چاکە، ﴿بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡ﴾، بەڵکو ئەوە بۆ وان زۆر خراپە، بۆچی؟ ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، لە ڕۆژی دواییدا ئەوەی کە ڕژدییو دەست نووقاوییان پێکردوە، لە گەردنیان دەئاڵێ، وەك دوایی باسی دەکەین پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتی خۆیدا دەفەرموێ: بۆیان دەبێتە

ماڕێکی کەچەڵو، لە گەردنیان دەئاڵێ لە دۆزەخدا، ﴿ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، وە میراتی ئاسمانەکانو زەوی هی خوایە، وە خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە، ئایا موناسەبەتی ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتەکانی پێشێ چییە ؟ تیرهاوێژەکان کە فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ شکاند، بەهۆی تەماعیی ماڵییەوە بوو، تەماعیان لە کۆکردنەوەی غەنیمەتو دەستکەوتدا هەبوو، وە بەدڵنیاییەوە، مسوڵمانان بەبێ ماڵ بەخشین، جەنگو جیهادیان بۆ ناکرێ، ئەوەش چۆنیەتی پەیوەست بوونی ئەم ئایەتەیە لەگەڵ ئایەتەکانی دیکەدا کە دوو شتە:

١- جەنگو جیهاد بەبێ سەرفکردنی ماڵو سامان ناکرێ، کەواتە: مسوڵمانان دەبێ لە بەخشینی ماڵو سامانیان دا بۆ بەرگریی لە دینو ژینییان سەخیی بنو چرووکو چەنگ نووقاو نەبن.

٢- دەبێ مسوڵمانان وریا بنو خۆشەویستی یان بۆ ماڵو سامان تووشی هەڵەو ناشەرعییان نەکات، وەك ئەوانەی بە هاندەری کۆکردنەوەی دەستکەوت (غنیمة) فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ شکاندو شوێنی خۆیانیان جێهێشتو سەرەنجام شکستیان هێنا !

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوای تاك دەفەموێ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾، واتە: وە ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن یان کوژراون، بە مردوویان مەزانن، بەڵکو زیندوون لە لای پەروەردگاریان، ڕۆزییان پێدەدرێ، ئەم ئایەتە وەك ئایەتی (١٥٤)ی سووڕەتی (البقرة)یە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾، واتە: وە بەوانەی کە لە ڕێی خوادا

دەکوژرێن مەڵێن: مردوون، بەڵکو زیندوون بەڵام ئێوە هەست ناکەن، وە لە ئایەتەکەی سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ﴾، واتە: وە پێیان وانەبێ، بەڵام لە ئایەتەکەی سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ﴾، پێیان مەڵێن: مردوون، کە دیارە: بە مردوویان مەزانن، ماناکەی جیایە لە: پێیان مەڵێن: مردوون، واتە: نەك هەر بە مردوویان ناوزەد مەکەن، بەڵکو هەر بە دڵو دەروونیشتان دانەیەتو بە خەیاڵیشتان دانەیەت، کە ئەوانە مردوون، دیارە لەم دوو ئایەتە وەردەگیرێ کە ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن، زیندوونو خاوەن ژیانن و ڕزق‌و ڕۆزییان دەدرێتێ‌و، خواردن‌و خواردنەوەیان هەیە، جا ئایا ئەوە چۆنە؟ ئەوە خوای پەنهانزان لە ئایەتی (١٥٤)ی سوورەتی (البقرة)دا ئەوە ڕووندەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾، واتە: بەڵکو زیندوون بەڵام ئێوە هەست ناکەن! کەواتە: ئەو شێوە ژیانەی کە شەهیدان هەیانە، شێوەیەکە ئێمە هەستی پێناکەین، ئێمە دەرکی پێناکەین، واتە: لە مەودای هەستپێکردنی ئێمەدا نیە، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە ئەو شێوە ژیانە شێوە ژیانێکی جیایە لەوەی کە ئێمە دەیزانین، چونکە ئەگەر وەك ئەوەی دنیا بووایە، ئەوە ئێمە هەستمان پێدەکرد، دیارە شێوە ژیانێکی تایبەتە، کە بەس خوا دەزانێ چییەو چۆنە؟ ئنجا ئەوەی کە پێویستە لێرەدا بگوترێ، ئەوەیە کە ژیانی بەرزەخ، تەنیا تایبەت نیە بە شەهیدانی ڕێی خواوە، بەڵکو هەرچی ئیمانداربێ، ئەو شێوە ژیانەی هەیە، هەڵبەتە هەرکەس لەقەدەر ئیمانی خۆی، بەڵگەش زۆرن لەوبارەوە، کە یەکێك لەو بەڵگانە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: {إِنَّمَا نَسَمَةُ الْمُؤْمِنِ طَائِرٌ يَعْلُقُ فِي شَجَرِ الْجَنَّةِ، حَتَّى يُرْجِعَهُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى جَسَدِهِ يَوْمَ يَبْعَثُهُ} أَخْرَجَهُ مَالِكٌ برقم: (١٥٨٢٥) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إِسنادُهُ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٠٧٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٧١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٦٥٧) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ وَصَحَّحَهُ الألباني،

واتە: ڕووحی ئیماندار باڵندەیەکە خۆی بە درەختەکانی بەهەشت هەڵدەواسێ (یاخود لە درەختەکانی بەهەشت دەخوات)، هەتاکو خوا تبارك‌و تعالی دەیگێڕێتەوە بۆ نێو جەستەکەی، لە ڕۆژێکدا کە زیندووی دەکاتەوە، ئەم فەرموودەیە ئیمام ئەحمەد لە ئیمام شافیعیی، ئەویش لە ئیمام مالیك، ئەویش لە ئیمام زوهریی، ئەویش لە عەبدوڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك، ئەویش لە بابی دەگێڕێتەوە، واتە: کەعبی کوڕی مالیك کە هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە ﷺ وە یەکێکە لەوانەی کە بەشداریی کردوە لە جەنگی (بەدر)دا، کەواتە: بەپێی ئەم فەموودەیەی پێغەمبەر ﷺ تەنیا ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن، ژیانێکی بەرزەخییان نیە، بەڵکو هەموو ئیماندارێك ئەو ژیانە بەرزەخییەی هەیە، بەڵام دیارە کوژراوان‌و شەهیدانی ڕێی خوا، ئەو ژیانەیان تیرو تەواوترە.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، وە ئەو شەهیدانەی کە لە ڕێی خوادا کوژراون، لە بەهەشتدا دڵخۆش دەبن بەوانەی کە جارێ پێیان نەگەیشتوون‌و لە دوایانەوەن، دڵخۆش دەبن بەوەی کە نە ترسیان لەسەرەو نە خەمباریش دەبن، واتە: ئەو شەهیدانە دوای ئەوەی کە لە بەهەشتدا نیشتەجێ دەبن، وە ئەو ڕزق‌و ڕۆزییەی کە خوای بەخشەر بۆی دیاریکردوون، پێیان دەدرێ، لەو مەقام‌و شوێنە خۆشانە نیشتەجێ دەبن، دڵخۆش دەبن بەو مسوڵمانانەی کە لە دوایانەوە دێن، واتە: دڵخۆشن بەوەی کە ئەوانیش هەمان سەرەنجامیان دەبێ، ئەگەر لەڕێی وانەوە بێن، جا چ بکوژرێن، چ بە مردنی خۆیان بمرن، مادام لەسەر ڕێی ئیسلام بن، وە لەسەر ڕێی خەبات‌و فیداکاریی‌و لە پێناوی خوا دابن، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئینسانی ئیماندار، هەمیشە خێرو چاکە بۆ خوشك‌و برای مسوڵمانی بە ئاوات دەخوازێ، وە ئەم ئایەتە وەك ئایەتەکانی: (٢٥و ٢٦و ٢٧)ی سووڕەتی (یس) وایە، کە خوای پەروەردگار بۆمان باسی پیاوە

ئیماندارەکەی ئالی یاسین دەکاتو، لە درێژەی ئایەتەکاندا دەفەرموێ: ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾یـــس، واتــە: ﴿جـا دیـارە ئـەو پیـاوە ئیمانــدارە دوای ئــەوەی دەیکاتـــە مــشتومڕو دەبێتــە موناقەشــەی لەگــەڵ کافرەکانـی قەومەکەیدا، بـە ڕای زۆربـەی توێـژەرەوانـی قوڕئـان دوایـی شـەهید دەکرێ، ئیدی دوای ئەوەی کە شەهید دەکرێ، سەرەتا لە دنیـادا دەڵێ: ﴿ ئەوە مـن بـڕوام بـە پەروەردگـارتان هێنـا، گوێتـان لـێ بـێ، ﴿خـوای بـەرز یەکسـەر ئەوەی پـەڕاندوەو کە ئەوان کوشتیانو دوایی ڕووحەکەی چووە بەهەشـتێو ... هتـد، یەکـسـەر دەفـەرموێ:﴾ پـێی گـوترا: بـچۆ بەهەشـتێ (دوای ئــەوەی ئــەم قسـەیەی گوت، پـێی گوترا بچۆ بەهەشتێ، واتە: کوشـتیانو شـەهیدیان کـردو ڕووحـەکەی لـە جەسـتەکەی جیابۆوەو چووە بەهەشـتێو خـوای بەرزیش پـێی فـەرموو: یــاخود فریــشتەکان پێــیان فــەرموو بــچۆ بەهەشــتێ) تەماشـــای ! قەومەکەی کوشـتوویانە لەسـەر ئیمانو ئیـسلام کەچـی هـەر چـاکەیان بەئـاوات بۆ دەخـوازێ، دەڵێ: ﴿ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، گوتی: خۆزگـە گەلەکـەم زانیبــایان بـەوەی کـە پەروەردگــارم لێمبوردوەو، منـی لە ڕێزلـێگیـراون گێڕاوە، واتـە: ئەگـەر زانیبایـان سـەرەنجامی من چۆنە بەهـۆی ئـەو ئیمـانەوە کە منیـان لەسـەر کوشـت، ئەوانیـش بەڵـکو خـوای پـەروەردگار هیدایـەتی دەدانو دڵیان نـەرم دەبوو، کەواتــە: لەوێـوە (لــە بەهەشـتەوە) بـە ئـاواتی خـواستوە کـە قـەومە کافرەکـەی ئیمـان بێنـن، ئەمـە ئەوەی لـێ وەردەگیـرێ، کە ئینسانی ئیمـاندار هەمیشـە خێـرو چـاکە بـۆ خـەڵك بە ئـاوات دەخـوازێ، تەنانەت بۆ دوژمنانیشی، چییان بـۆ بـە ئـاوات دەخـوازێ ؟ کــە خـــوا بیانخـــاتە بەهەشـــتەوە، بـــەهۆی ئیمانـــەوە، وەك لــە فەرمایــشتی پـێغـەمبەردا ﷺ، هاتوە کە چـووە بـۆ (طـائف)و ئـەوانیش بـە شـێوەیەکی زۆر ناشیـــرین پـێـشوازییان کـردوەو، دوایـی بەردبــارانیان کـردوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا

پـێغـەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: {اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي إِنَّهُمْ لا يَعْلَمُونَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ بـرقم: (٤٢٠٣)، عَـنْ عَبْـدِاللَّهِ، وَقَـالَ شُـعيب الأَرنـاؤوط: إِسـنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَيْخَين، واته: ئـەی خوایه ! له گەلەکەم ببووره، چونکـه ئەوان نـازانن، واتـه: عەفوویـان بکەو چاوپۆشییان لێبکەو هیدایەتیـان بـده.

**مەسـەلـەی سـێیەم:** کـه دەفـەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْاْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾، که پـێشـتـر مانامـان کـرد، ئەوەی لـێ وەردەگیـرێ کە لە تەنگانەو سـەغـڵەتییـدا، ئینسانەکان لـه مەحـەك دەدرێـنو لێـك هەڵـداوێردرێن، پـاكو پیـسیان لێـك جیادەکرێنـەوە، واتـه: ناڕەحەتییـەکان سـەنگی مەحـەکن، تـەرازووو پـێوەرن، ئەگـەرنا لـە شـێنەییـدا هـەموو کـەس ئازایـە !! وەك کـوردەواریی خۆمـان دەڵـێن: (ئـەوەی لـە شـەڕێ نـەبێ شـێرە) بەڕاسـتی ئـەم هـاوەڵە بەڕێزانـەی پـێغەمبەر ﷺ کـە وەك پـێـشـتـریش باسـمان کـرد، دوێنـێ لـه جەنگـی ئوحـود برینـدار بـوو ون، پـێغـەمبەر ﷺ ئەمرۆ بانگیـکردن، وه پـێی فـەرموون: جگـه لەوانـەی دوێنـێ (کـه زۆربەیـان برینـدار بـوون) کەسـی دیکـه نەیـەت، ئیـدی بـه برینـداریـی بـەدەم بـانگی پـێغـەمبـەرەوه ﷺ چـوون، نەشـیانـزانیوه کـه ئـەبو سـوفیانو سـوپایەکەی جورئـەت ناکـەن ڕووبەڕوویـان ببنـەوە، کەواتـه: پـێـیان وابـووه ئـەوه جەنگێکـی دیکـەیان بـەرەو ڕوو دێو، بەرەنگـاری جەنگێکـی دیکـه دەبنـەوه بـه برینـداریی، بـه ناڕەحـەتیی، بـه سـەغڵەتیی، بەڕاسـتیی ئـەوه ئیمـانێکی زۆر تـەواو نەبـێ، ئـەم هەڵوێـسته لـه ئینـساندا نایەنێتـه دی، جـا مەبەسـتم ئەوەیـه کـه ئێمـه دەبـێ ئـەو پەنـدەی لـێ وەربگـرین، کـه ئێمـەش لەکـاتی سەغـڵـەتیی‌و ناڕەحـەتییاندا ئامـادەبین، ئەگـەرنا لەکـاتی خۆشییـدا هـەموو کـەس ئازایـه ! لەکـاتی شێنەییـدا هەموو کـەس ئازایـه ! بـەڵام گـرنگ ئەوەیـه لـەکاتی تـرس‌و ناڕەحـەتیی‌و سەغڵەتییـدا هیممەتـدارو ئـازابی، بـه هـەورازدا سـەرکەوتن قورسـه، ئەگـەرنا لـه سـەرەو ژێـرو پـێدەشـت، هـەموو کەس دەڕواو دەتـوانێ ڕێ بکات.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ﴾، ئەوانەی کە خەڵك پێیان گوتن: (کە وەك پێشتر باسمان کرد یانی: واتە: کاروانەکە، یاخود ئەو ئەعرابیەی کە ئەبو سوفیان دیارییەکی دابوویە، کە ئەم هەواڵە بۆ موحەممەدو هاوەڵانی ببە) ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ﴾، خەڵك (ئەبو سوفیانو سوپایەکەی) بۆتان کۆبوونەوەو لێیان بترسێن، ئنجا ئایا ئەوان هەڵوێستیان چی بوو؟ ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا﴾، گەیاندنی ئەم هەواڵە ناخۆشە کە بە حیساب بۆ ترساندنو چۆك پێدادانو ترسو لەرز خستنە دڵیان بوو، کەچی: ئیمانیان پێی زیادی کرد، ﴿وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾، وە گوتیان: خوامان بەسەو باشترین کارپێسپێردراویش ئەوە، لەمەدا ئەوە دەردەکەوێ کە ئیمانی ڕاستو ساغ، وەك تیغی باش وایە، تیغی باش: خەنجەرە، کێردە، چەقۆیە، هەرچییە مادام تیغی باشبێ، هەتا شتی پێببڕی سپیو سافتر دەبێ، وەك چۆن تیغی خراپ، ئەگەر هەندێ شتی پێببڕی، کول دەبێو دەپاچێتەوە، بەلام تیغی باش کە مەعدەنەکەی باشبێ، هەتا شتی پێببڕی، سپیو سافتر دەبێ، بۆیە عەرەب دەڵێن: (الشّدائدُ صَيقَلُ الرِّجال) واتە: سەغڵەتییەکان سپییکەرەوەو سافکەرەوەی پیاوانن، پیاوی ئیماندار لە سەغڵەتییاندا زیاتر هەڵدەبڕێتەوە، زیاتر مشتو ماڵ دەبێ، وە زیاتر سپیو ساف دەبێتەوە، وەك چۆن تیغێك ئەگەر ژەنگێکیشی پێوە بێ، وەختێك شتێکی پێببڕدرێ چی لێدێ ؟ ساف دەبێتەوە.

ئنجا لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بپرسێو بڵێ: باشە کاتێ ئەم هەواڵە ناخۆشەیان پێگەیشت، چۆن بووە هۆی زیادبوونی ئیمانیان ؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئیمان زیاد دەکاو کەم دەکا، ئیمان بە طاعەت زیاد دەکات، وە بە گوناهان کەم دەکات، زانایانی پێشین گوتوویانە: (الإِيْمَان يَزِيدُ

وَيَنْقُصُ: يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ، وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ)، ئەوە شتێکە یەك دەنگیی زانایانی لەسەرە، وە شتێکی بەرهەستیشەو هەموو کەس هەستی پێدەکات[1]، ئنجا لە حاڵەتێکدا کە بابای ئیماندار ترسێکی پێدەگاتو لەگەڵ ترسێکدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، هەموو هێزو وزەی خۆی ئاڕاستەی ئەو ترسە دەکاتو ئەوەش دەبێتە مایەی زیادبوونی ئیمانی، وە بە پێچەوانەوە ئینسانی ترسنۆك، ئیمانی کز دەبێ لە کاتی ترساندا، بەڵام ئیمانداری باش ئیمانی زیاد دەبێ، بۆچی ؟ چونکە هەموو وزەو توانای خۆی ئاڕاستەی ئەو خەتەرو ترسە دەکاتو، خۆی هەڵدەبڕێتەوەو خۆی ئامادە دەکاتو دێتە سەرپێ، ئەوە لەو حاڵەتەدا دیارە ئیمانەکەی هەڵدەکشێو زیاد دەکات، بەڵام ئەوە بۆ هەموو کەس نیە، هەیە دەترسێو ئیمانی کەم دەکات، وە هەیە لە کاتی تەماعێدا ئیمانی کەم دەکات، تەماعێکی بکەوێتە بەرچاوی ئیمانی لاواز دەبێ، هەیە لەکاتی جووڵاندنی غەریزەکەیدا، ئیمانەکەی کەم دەکات، کەچی هەیە ئیمانەکەی زیاد دەکات، ئایا کێ ئیمانی زیاد دەکات ؟ ئەو کەسەی کە ناهێڵێ ترسو تەماعو غەریزەو ئەوانە هیچیان لە خوای پەروەردگاری دووربخەنەوە، مانای وایە ئیمانی زیادی کردوە، بەو شتەی کە خەڵکی دیکە ئیمانی پێی لاواز دەکات، ئیماندارانی باش، ئیمانیان زیاد دەکات.

**<u>مەسەلەی پێنجەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾، واتە: گوتیان: خوامان بەسە، وە باشترین وەکیلیش خوایە، وەکیل کێیە؟ ئەو کەسەیە کە ئینسان کاری پێدەسپێرێ، واتە: باشترین سەرپەرشتیکار کە ئێمە کاری خۆمانی پێ بسپێرین، خوای کاربەجێیە، دیارە ئەوەش یەکێکە لە زیکرە گەورەکان، یانی زیکرێکی گەورەیە کە ئینسان لە کاتی سەغڵەتییو ناخۆشییدا ئەم زیکرە بخوێنێ ﴿ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾، کە بەڕاستی

---

١) لە کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت دا) لە بەرگی یەکەم دا، بە درێژی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

وەك هەتووانو چارەسەر وایە، بەلام بەمەرجێك ئینسان بە عەقیدەوە بیخوێنێ، جا لەوبارەوە ئەم حەدیسە گێڕدراوەتەوە: {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا قَالَ: حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ، قَالَهَا إِبرَاهِيمُ ﷺ حِينَ أُلقِيَ فِي النَّارِ، وَقَالَهَا مُحَمَّدٌ ﷺ حِينَ قَالُوا: إنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعوا لَكُمْ فَاخْشَوهُمْ فَزَادَهُمْ إِيْماناً وَقَالُوا: حَسْبُنَا اللّٰه ونعْمَ الوَكيلُ} رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٥٦٣) و(٤٥٦٤)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، (دەربارەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: خەڵك بۆتان کۆبۆتەوە لێیان بترسن، ئەوانیش ئیمانیان زیادی کردو گوتیان:) خوامان بەسەو ئەو باشترین کارپێسپێرراوە، ئەوە ئیبراهیمی خەلیل ﷺ (واتە: ئیبراهیمی دۆستو خۆشەویستی خوا) فەرمووی: کاتێك کە فڕێدرا نێو ئاگر، گوتی: (حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ) خوامان بەسەو ئەو باشترین کارپێسپێردراوە، وە موحەممەدیش ﷺ فەرمووی: کاتێك کە خەڵکێك پێیان گوت: خەڵك (ی دوژمن) بۆتان کۆبۆتەوە لێیان بترسن، بەلام ئیمانیانی زیاد کردو گوتیان: خوامان بەسەو باشترین کارپێسپێردراویشە، ئیدی نە ئاگرەکە ئیبراهیمی ﷺ سووتاندو نە دوژمنەکانیش توانیان زیانێك لە موحەممەد ﷺو هاوەڵە بەڕێزەکانی بدەن، - خوا لێیان ڕازی بێ-، کەواتە: ئەم زیکرە زۆر بە بەرەکەتە بە مەرجێك ئینسان بە عەقیدەیەکی ساغو بە دڵێکی سافەوە بیخوێنێ، کە دیارە ئیبراهیمی خەلیل ﷺو موحەممەدی خاتەم ﷺ بە ئەوپەڕی یەقینەوە گوتوویانە، بۆیە هەر کەسێك چەندە لە خوا ڕاببینێ، خوای پەروەردگاریش ئەوەندە بە هانایەوە دێ، وەك لە حەدیسی قودسییدا هاتوە کە خوا دەفەرموێ: ((أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي)) رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٧٤١٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٩٧٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٧٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٠٣) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨١١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، واتە: من بەپێی گومانی بەندەکەمم بەرانبەر بە من، یانی: بەندەی من چەندەم تێڕاببینێ، منیش ئەوەندە بە دەمیەوە دەچم،

کەمم تێڕابـبینێ، کەمو، زۆرم تێڕا ببینێ زۆر، دیارە ئینسان لەقەدەر ئیمانی خۆیشی لە خوا ڕادەبینێو لەقەدەر ئیمانی، ئومێدی بە خوا دەبێو پشتی پێدەبەستێ، لەقەدەر ئیمانی چاوی لێیەتی... هتد، وە لەڕاستییدا نەك هەر ئەوە بەڵکو هەموو سیفەتە باشەکان لەقەدەر ئیمانی ئینسانن، ئینسان تا ئیمانی کامڵتربێ، سیفەتە باشەکانی تێدا چاکتر دەبن، وە هەتا ئیمانەکەی کزتربێ، سیفەتە باشو پەسندەکانی تێدا کەمتر دەبن: ڕاستیی ئینسان، پشت پێ بەستنی، ئەمینییو دەستپاکیی، بەزەیی، خۆ کۆنترۆڵکردنی لە بەرانبەر ئارەزووەکانیدا، دادگەریی، ئازایەتییو، ئارامگرتن، سوپاسگوزارییو ... هتد، هەموو سیفەتە چاکەکان لەقەدەر ئیمانەکەینی، بۆیە ئینسان تا ئیمانی کامڵتربێ، بە تەئکید سیفەتە پەسندەکانی چاکترن، وە کە ئیمانەکەی کزدەبێ، سیفەتە چاکەکانی تێدا کەم ڕەنگو کەم سەنگ دەبن.

<u>**مەسەلەی شەشەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، خوا دەفەرموێ: بێگومان ئا ئەوەتان کە ئەو هەواڵەی بۆ هێنان، یان ئەو جۆرە کەسانەی کە ئەو جۆرە هەواڵانە بڵاودەکەنەوە، شەیتانن، دۆستەکانی خۆی دەترسێنێ، واتە: ئەوەی دۆستی شەیتان بێ بەو خوتخوتەو دنەدانانەی شەیتان، دەترسێ، ئەوە واتایەکی، یاخود ﴿ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ ﴾، یانی: (يُخَوِّفُكُمْ أَوْلِياءَهُ) ئەوە شەیتانەو دەیەوێ لە دۆستەکانی خۆی (کە کافرەکانن) بتانترسێنێ، ﴿ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، جا ئێوە لە شەیتانو دۆستەکانی شەیتان مەترسێنو لە من بترسێن، ئەگەر ئیماندارن، کەواتە: ئەو ترسەی کە ئینسان بەرانبەر بە خوا هەیەتی، ئەگەر ئیمانداری باشبێ، ئەو ترسەی بەرانبەر بە غەیری خوا نابێ، ناڵێین بە هیچ شێوەیەك ناترسێ، بەڵام ترس لە غەیری خوا، ناگاتە ئاستی ئەو ترسەی کە بەرانبەر بە خوا هەیەتی.

ئنجا (طَبَرِي) لەوبارەوە، ئاوا ئەم ئایەتە تەفسیر دەکات: (إِنَّمَا الَّذِي قَالَ لَكُمْ، أَيُّهَا الْمُؤْمِنُون: ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ﴾، فَخَوفوكُم بِجمُوعَ عَدُوِّكُمْ وَمَسيرهُمْ إِلَيكُمْ، مِنْ فِعْلِ الشَّيْطَانِ أَلْقَاهُ عَلَى أفوَاهِ مَنْ قَالَ ذَلِكَ لَكُمْ، يُخَوفُكُمْ بِأَوْلِيَائِهِ مِنَ الْمُشْرِكِين)[1]، واتە: بێگومان ئەوەی کە پێی گوتن: ئەی ئیمانداریانە! ئەوە خەڵك بۆتان کۆبوونەتەوەو لێیان بترسێن (لە کۆبوونەوەو هاتنیان بۆ لاتان بترسێن) ئەوە لە کردەوەی شەیتانە، کە خستیە سەر زاری ئەو کەسەی کە ئەو شتەی پێگوتن (چونکە ئەوەی ئەو هەواڵەی هێنا ئەعرابییەك بوو، یاخود کاروانەکەی عەبدولقەیس بوو) ئەوە وەسوەسەی شەیتان بوو خستیە نێو زاری ئەوانە، بۆئەوەی بە دۆستەکانی بتانترسێنێ، کە هاوبەش دانەرانن، بەڵام دەشگونجێ بڵێین: خوا هەر ئەو کەسەی ئەو هەواڵەی هێناوە بە شەیتانی داناوە، چونکە مەرج نیە شەیتان تەنیا (جند)بێ، بەڵکو دەگونجێ ئینسان بێ بە دەقی ئایەت خوا دەفەرموێ: ﴿... شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ ... ﴿١١٢﴾﴾ الأنعام، واتە: شەیتانەکانی ئادەمیزادو جند هەندێکیان قسەی بریقدارو فریودەر دەهاوێنە دڵی هەندێکیان، کە دیارە مەبەست پێی ئەوەیە شەیتانە جنییەکان شت فێری شەیتانە ئینسییەکان دەکەن، شەیتان کێیە ؟ هەر کەسێکە لە خوا دووربێ‌و خەڵکیش لە خوا دووربخاتەوە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی سووڕەتی (البقرة)، کە خوای پەروەردگار دەربارەی مونافیقەکان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٤﴾﴾، واتە: وە کاتێك بەوانەی ئیمانیان هێناوە دەگەن، دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، بەڵام کە بە تەنیا لەگەڵ (سەرکردە) شەیتانەکانیان کۆدەبنەوە، دەڵێن: ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەین،

---

١) جامع البيان، ج: (٢)، ص: (١٩١).

ئێمە بەس گاڵتەكەرین (بە بڕواداران)، چونكە لە تەفسیرەكاندا دەڵێن: (شَيَاطِينِهِمْ أَي: رُؤَسَائهم)[1] شەیتانەكان یانی: سەرۆكەكانیان.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا ۗ يُرِيدُ اللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الْآخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الْكُفْرَ بِالْإِيمَانِ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾﴾، پێشتر ئایەتەكانمان تەفسیر كردوە، كە دەفەرموێ: با خێراییكردنی ئەوانەی لە كوفردا خێرایی دەكەنو پێشبڕكە دەكەن، تۆ خەفەتبار نەكات، ئەوانە هیچ زیانێك لە خوا نادەن، خوا دەیەوێ هیچ پشكو بەشێكیان لە دوارۆژدا نەبێو ئازارێكی مەزنیان هەبێ، بێگومان ئەوانەی كە كوفر بە ئیمان دەكڕن، (واتە: ئیمان دەدەنو كوفری لە بەرانبەردا وەردەگرن) ئەوانە هیچ زیانێك لە خوا نادەن وە ئازارێكی بەئێشیان هەیە، لێرەدا پێویستە دوو مەسەلان ڕوون بكەینەوە:

أ- لێرەدا یەكێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە خۆ هەموو كەس دەزانێ كە ئینسان ناتوانێ زیان لە خوا بدات، بۆچی دووجاران لێرەدا تەئكیدی كردۆتەوە، لە شوێنێكیاندا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا﴾، وە لە شوێنی دووەم دا دەفەرموێ: ﴿لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا﴾؟! وەڵامەكەی ئەوەیە: خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ وەك خۆی دادەنێ، ئیمانداران وەك خۆی دادەنێ، وە دینەكەی وەك خۆی دادەنێ، واتە: زیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نادەن، زیان لە ئیسلام نادەن، وە زیان لە ئیماندارانی ڕاستەقینەش نادەن، دوژمنان نە زیان لە ئیسلام، وە نە زیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، وە نە زیان لە ئیماندارانو مسوڵمانانی

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص: (٣٨)، كە گوتوویەتی: (وشياطينهم)، سادتهم و كبراؤهم من أحبار اليهود و رؤوس المشركين والمنافقين).

ڕاستەقینە دەدەن، بەڵێ: ئازاریان پێدەگەیەنن، بەڵام زیانیان لێنادەن بە شێوەیەك كە پەكیان بخەن، ئەگەرنا هەموو كەس دەزانێ، كە ئینسان ناتوانێ زیان لە خوای پەروەردگار بدات، كەواتە: لێرەدا مەبەست لە: ﴿إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا﴾، یانی: زیان لە ئیسلامو پێغەمبەرو مسوڵمانان نادەن.

ب– كە خوا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْأَخِرَةِ﴾، واتە: بۆیە دەرفەتیان دەدات زیاتر بێبەش‌و ڕوو ڕەش بن ! چونكە ئینسانی كافر هەتا تەمەنی زیاتربێ، لە كوفر زیاد دەكاتو لە كردەوەی خراپ زیاد دەكات، سەرەنجام سزای خوا زیاتر بۆخۆی دەستەبەر دەكا، وە خۆی بێبەشترو ڕوو ڕەشترو ڕەنج بەخەسارتر دەكات لە دوارۆژدا.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان با پێیان وانەبێ كە ئەو مۆڵەتدانەی ئێمە (بۆیان كە تەمەنیان درێژ دەكەین، یاخود هاوكاریی یان دەكەین، لەشیان ساغ دەكەین، دەوڵەمەندیان، دەستەڵاتیان پێدەدەین ...هتد) شتێكی باشەو خێرو قازانجە، بەڵكو ئێمە بۆیە مۆڵەتیان دەدەین، تاكو لە گوناح زیاد بكەن، وە ئازارێكی ڕیسواكەریشیان هەبێ لە دوارۆژدا.

جا لێرەدا پرسیارێك دەكرێ: ئایا خوا حەز دەكات مرۆڤەكان گوناحی زیاتر بكەن؟! لە وەڵامدا دەڵێین: خوا ﷻ حەز ناكاتو پێی خۆش نیە خەڵكی گوناحی زیاتر بكەنو ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًا﴾، مەبەست پێی یەكێك لەم دوو مانەیەیە:

أ/ كەسانێك كە كافرو خراپو بێبڕوان، خوا حەز دەكات سزای زیاتریان بدات، سزای زیاتریش كاتێك دەبێ، كە گوناهی زیاتر بكەن.

ب/ یاخود ئەم (ل)ی سەر ﴿لِيَزْدَادُوٓاْ﴾، (لام العاقبة)یەو لامی تەعلیلی نیە، واتە: مەبەست ئەوە نیە کە خوا تەمەنیان درێژ دەکاتو توانایان پێدەدات، تاکو گوناحی زیاتر بکەن، چونکە لە زمانی عەرەبیدا (لام العاقبة) هەیە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (القصص) لە ئایەتی ژمارە (٨)دا، دەربارەی ئەوە کە ماڵی فیرعەون مووسا (علیه السلام) هەڵدەگرنەوە، دوای ئەوەی کە دایکی مووسا بە گچکەیی مووسای خسۆتە نێو تابووت (صندوق)ێکی تەختەو بە مەلۆتکەییو بە رووباری نیلیدا داوە، ماڵی فیرعەون کاتێك ئەو تابووتە هەڵدەگرنەوە، خێزانەکەی دەڵێ: ﴿... لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ... ۝٩﴾القصص، واتە: مەیکوژن، بەڵکو سوودمان پێبگەیەنێ، یاخود بیکەین بە کوڕی خۆمان، جا خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ...۝٨﴾ القصص، واتە: بنەماڵەی فیرعەون هەڵیان گرتەوە، تاکو بۆیان ببێتە دوژمن و مایەی خەفەتباریی، جا ئایا بنەماڵەی فیرعەون مووسایان (علیه السلام) بۆیە هەڵگرتەوە، تاکو ببێتە دوژمنیانو ببێتە مایەی خەفەتبارییان ؟!! بێگومان نەخێر، ئەدی مەبەست پێی چییە لێرەدا؟ ئەم (ل)ی سەر ﴿لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾، واتە: تاکو سەرەنجامی وای لێبێ، نەك ئەوان ئامانجیان ئەوە بووبێ، ئەوان بە هاندەرو پاڵنەری ئەوە مووسایان هەڵنەگرتۆتەوە ببێتە دوژمنیان، وە دوایی فیرعەون لەسەر دەستی ئەو لە بەین بچێ ! وە بۆیەشیان هەڵنەگرتۆتەوە، ببێتە مایەی خەفەتو گرفتاریی، بەڵام سەرەنجام وای لێهاتوە، جا لە زمانی عەرەبیدا ئەوە (لام العاقبة)ی پێ دەگوترێو لێرەش دا: ﴿إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًا﴾ یانی: تەنیا کە دەیانهێڵینەوە هەر گوناهو خراپە زیاد دەکەنو سەرەنجامیان زیاتر ڕۆچوونە بە زەلکاوی خراپەو تاوان دا.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە لە ئایەتی: (١٧٦)دا دەفەرمویْ: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، وە لە ئایەتی (١٧٧)دا دەفەرمویْ: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، وە لە ئایەتی (١٧٨)شدا دەفەرمویْ: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾، سبحان الله! کەم وا هەیە قورئان لە سیْ ئایەتاندا سزاو جەزرەبەی خۆی وەك وەسف، بە سیْ وەسفی جیاجیا وەسف بکات، وا دیارە ئەوانەی کە دژایەتیی ئیسلامو مسوڵمانان دەکەن، شایستەی سزاو جەزرەبەیەکی زۆر بیْ ڕەزای خوای دادگەرن، جا لێرەدا لە ئایەتی یەکەمدا دەفەرمویْ: ﴿ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، سزایەکی گەورە، مەزن، وە لە ئایەتی دووەمدا دەفەرمویْ: ﴿ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، سزایەکی زۆر بە ئێش، وە لە ئایەتی سێیەمیشدا دەفەرمویْ: ﴿ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾، سزایەکی ڕیسواکەر، چونکە ئازار هەیە ئازاری جەستەیی یە، بەڵام وێڕای ئازاری جەستەیی ئازاری ڕووحییش هەیە، بۆ وێنە: یەکێك کە فەلاقە دەکریْ، ئەوە ئازاری جەستەیەتی، ئنجا ئەگەر پێنج شەش جنێویشی پیْ بڵێن، ئەوە هەم جەستەی ئەزیەت دراوە هەم ڕووحیشی، جا دیارە ئازارو سزایەك مەزن بیْو، بە ئێش بیْو، زەبوونکەر بیْ، بەڕاستی سزایەکی زۆر بێڕەزایە، خوا لەو سزایە پەنامان بدا، ئنجا دیارە خوا ﷻ حەکیمەو کاربەجێیەو هەر کەسێك لەقەدەر تاوانەکەی سزا دەدات، وا دیارە خێراییو پێشبڕکەکردنو خۆماندووکردنو هەوڵدانو تەقەلالادان، بۆ دژایەتییکردنی دینی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ و بەندەکانی خوا، هێندە تاوانێکی گەورەیە، کە سزایەکی ئاوا پڕ بە پێستیەتی.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرمویْ: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، واتە: عادەتو یاسایی خوا وانیە کە لە ئیمانداران بگەڕیْ لە حاڵەتێکی وەك ئێستای ئێوەدا، کە حاڵەتی وەك ئەوسای ئەوان چۆن

بوو ؟ ئەوە بووە کە پێش جەنگی ئوحود مسوڵمانانو مونافیقان تێکەڵ بوون، دیار نەبووە کێ مونافیقە ؟ بەڵام کە جەنگی ئوحود هاتە پێش، مونافیقەکان تا ڕاددەیەکی زۆر دەرکەوتن، وە کاتێك جەنگەکانی دیکە هاتنە پێش، وەك دەرکردنی جوولەکەکانو جەنگی خەندەقو ... هتد، دیسان ئیمانداراانی پتەوو ئیمان کامڵ، لەوانەی لەرزۆك بوون، یاخود لەوانەی مونافیق بوون، زیاتر لێکدەرکەوتن، با لێرەدا وێنەیەك بێنینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە کە چۆن لە گەرمەی قەیرانو مەینەتییەکاندا پاكو پیس لە یەك جیادەبنەوە: (سلمان الفارسي) - خوا لێی ڕازی بێ- ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە: ﴿ دەڵێ: من لە لایەکی خەندەکەوە خەریکی هەڵکەندن بووم، بەردێکی گەورەم لێ عاسێ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیزیك مەوە بوو، کاتێك بینی هەڵدەکەنمو شوێنەکەم سەختە، دابەزیو پاچ (معول)ەکەی لەدەست وەرگرتم، پاچێکی لێداو بریسکەیەکیدا، پاشان پاچێکی دیکەی لێداو بریسکەیەکی لێدا، دەڵێ: وە پاچی سێیەمی لێداو بریسکەیەکی دیکەی لێدا دەڵێ: گوتم: بابو دایکم فیدات بن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ئەو بریسکەیەی کە لە شوێنی پاچەکەوە بینینم چی بوو لە کاتی پاچ لێدانتدا؟ فەرمووی: {أَوْ قَدْ رَأَيْتَ ذَلِكَ يَا سَلْمَان) ! ئایا ئەوەت بینی ئەی سەلمان ؟ دەڵێ: گوتم بەڵێ، فەرمووی: أما الأولى فإن الله فتح عليَّ بها اليَمَنَ، وأما الثانية فإن الله فتح عليَّ بها الشام والمغرب، وأما الثالثة فإن الله فتح عليَّ بها المشرق}[1]، واتە: بە هی یەکەمیان خوا یەمەنی پێشاندام کە ئازاد دەکرێ، وە بە هی دووەمیان شامو مەغریبی پێشاندام کە ئازاد دەکرێن، وە بە هی سێیەمیان ڕۆژهەڵاتی پێشاندام کە ئازاد دەکرێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو موژدە خۆشانەی بە مسوڵمانان دەدا لەو کاتە سەغڵەتییەدا، کە هەمووشیان ڕاست دەرچوون، کەچی مونافیقو

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج: (٣)، ص: (١٠٦).

دڵنەخۆشەکان دەیانگوت: ئەوە یەکێك لە ئێمە ناوێرێ دەست بە ئاو بگەیەنێ (موحەممەد)یش دەڵێ: سەلطەنەتو دەستەڵاتی فارسو ڕۆمو میسر دەگرن!! بەڵام هەر ئەوە دەرچوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبووی، جا خوا ﷻ یاسایەکی خۆی بۆ ئێمە ڕوون دەکاتەوە، کە عادەتی خوا، یاسای خوا وایە، ئیمانداران لەبێژینگ دەدات، داخۆ کامەیان ئیمانداری چاکە، کامەشیان هەر خۆی ڕەگەڵ مسوڵمانان خستوە، ئەگەرنا ئیمانی نیە، یاخود کامەیان ئیمانێکی تیرو تەواوی هەیە، وە کامەشیان ئیمانێکی لەرزۆك و لاوازی هەیە ؟ بۆ ئەوەی چاو بەخۆدا بگێڕێتەوە ئەوە یاسای خوایە، ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ﴾، عادەتی خوا وانیە کە لە ئیمانداران بگەڕێ بەو شێوەیەی ئێوەی لەسەرن، واتە: ئەو کاتەی کە مسوڵمانان لە مەدینە تێکەڵ بوون لەگەڵ مونافیقان پێش جەنگی ئوحود، بەڵکو بە سەختییو گرفتارییەکان تاقیتان دەکاتەوە، تاکو پیس لە پاك جیادەبێتەوەو (کا)و (دان) لە یەك هەڵداوێرریێن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ﴾، هەتاکو پیس لە پاك جیادەکاتەوە، بە تەئکید مەبەستی لە پیس مونافیقو دەغەڵەکانن، وە مەبەستیشی لە پاك، ئیمانداره ئیمان کامڵو دامەزراوەکانن، ئنجا ئایا بۆچی ئیماندار (طَیِّب)و بێبڕوا (خَبیث)ە ؟ جارێ سەرەتا (طَیِّب) یانی: چی ؟ واتە: پاك، چاك، بەتام، بۆنخۆش، بەخێر، بەکەڵك و بە سوود[1]، ئەدی (خَبیث) یانی چی؟ واتە: پیس، خراپ، بێ تام، بۆنناخۆش، بێ خێر، بێ سوودو بێ پێز[2]، وەك خوا ﷻ لە زۆر ئایەتی قورئاندا، کە باسی (طَیِّب)و (خَبیث) دەکات، پێکەوە بەراوردیان دەکات،

---

١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٥٢٧، ٥٢٨)، لفظ (طیب).
٢) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص: (٢٧٢، ٢٧٣)، لفظ (خبْث).

لـە ئینسانانـدا، لە زەوییانـدا، لە خـواردنانـدا، لە كەلـوپەلانـدا ... هتـد، بـۆ وێنـە: لە سـوورەتی (الأعـراف) لـە ئایـەتی (٥٨)دا دەفـەرموێ: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴿٥٨﴾﴾، واتـە: وە سـەرزەمینی پـاكو چـاكو بـەپیتو پـێـز، ڕووەكـی خۆی دەڕوێنێ بە مۆڵەتی پەروەردگاری (بەرهەمی بەپێزو باشـی دەبێ) بـەڵام سـەرزەمینـی خـراپو بـێ پێـز، شـتی بـێ خێـر نەبـێ سـەوز ناكـات (دڕكو داڵـی لـێ دەڕوێ، یاخـود بەرهـەمێكی كـەمو نالایـقـی لـێ دێتـە دەرێ) ...، وە خـوا ﷻ خـواردنو خـواردنەوە، بـەرگو پۆشـاك هـەموو ئـەو شـتانەی ئینـسـان بـەكاریان دێنـێ، ئەوانیـش دابـەش دەكـات بـۆ (طَیِّـب)و (خَبیث)، وەك هـەر لـە سـوورەتی (الأعـراف) لـە ئایـەتی (١٥٧)دا دەفـەرموێ: ﴿... وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ... ﴿١٥٧﴾﴾، واتـە: هـەموو ئـەو شـتانەی كـە چاكو بە سوودو بەتامو چێژو باشن، حەڵاڵیان دەكات، وە هـەموو ئـەوانـەی پیسـو خـراپو بـێ سـوودو بێتـامو چێژو خـراپن، قەدەغـەیـان دەكـات، جـا تـوێـژەرەوانی قورئـان دەربـارەی (طَیِّـب) دەڵـێن: (مِـنَ الـمأكُولاتِ وَالْمَشْرُوبَاتِ وَالْمَلْبُوسَاتِ وَالْمَنْكُوحَاتِ والـمركُوبَاتِ) واتـە: لـە خـواردنو خواردنـەوەو بەرگو پۆشاكو هـاوسەرو وڵاخـی سـواریی، كـە پـاكو بەكەڵكن، شـەریعەت حـەڵاڵی كـردوون، وە ئەوانـەی كـە پـیسو زیانبەخـشن، شـەریعەت قەدەغەی كردوون، هـەروەها پاكو پیس لـە بەشـەرانیـشدا هـەیـە، وەك خـوای پەنهـانزان لـە سـوورەتی (النـور)دا لـە باسـی ئـەو بوختانـەی كـە بـۆ دایكمـان عائیـشە - خـوا لێـی ڕازی بـێ-، كـرا، فەرموویـەتی: ﴿ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٢٦﴾﴾، واتـە: ئافرەتـانی پـیس بـۆ پیـاوانی پیسـن، پیاوانی پیس شایستەی ئافرەتـانی پیسـن، (یاخـود مـەیلی لای

یەکدی دەکەن، پیاوی پیس دڵی بۆ ئافرەتی پیس دەچێ، ئافرەتی پیس دڵی بۆ پیاوی پیس دەچێ)، ئافرەتانی پاكو چاك تەنیا پیاوانی پاكو چاك بە شایستەی خۆیان دەزانن، هەروەها پیاوانی پاكو چاكیش هەر مەیلیان بە لای ئافرەتانی پاكو چاكدا هەیە...، لێرەدا خوای پەروەردگار دەیەوێ وەڵامی ئەوانە بداتەوە كە بوختانیان بۆ دایكمان عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- كردوە، وەڵامیان دەداتەوە كە پێغەمبەر ﷺ لە لوتكەی پاكیی و چاكیی دایە، كەواتە: خوا ﷻ ئافرەتی پاكو چاك نەبێ بە نسیبی ناكات، مانای وایە ئەوە درۆو دەلەسەیە، ئنجا خوای كاربەجێ لەبەر چی ئیماندار بە پاكو چاكو، كافریش بە پیسو خراپ ناو دەبات ؟! چونكە ئیماندار خاوەنی ئیمانە، خاوەنی خوا بەیەكگرتنە، خاوەنی ئیخلاصە، خاوەنی طاعەتە، خاوەنی ڕەوشتی بەرزو جوانە، دیاریشە كە ئیمانو خوا بەیەكگرتنو ئیخلاصو طاعەتو ڕەوشتی بەرزو جوان، هەموویان پاكو چاكن، ئینسانی كافریش هەڵگری كوفرە، هەڵگری نیفاقە، هەڵگری شیركە، هەڵگری سەرپێچیی و گوناحە، هەڵگری ڕەوشتە دزێوو خراپەكانە، دیارە هەموو ئەوانەش پیسو زیانبەخشن.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، دوای ئەوەی خوا دەفەرموێ: خوا تاقیتان دەكاتەوەو لێتان ناگەڕێ وا بە تێكەڵو پێكەڵیی بمێننەوە، تاكو پیس لە پاك جیابێتەوە، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: باشە، چۆن ئەو پیسانەی كە ڕەگەڵ پاكان دەكەون، لێكیان جیابكەینەوە، ئەو كاو دانە چۆن لێك جیابكەینەوە ؟! دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ ﴾، وە خوا عادەتی وا نیە كە ئێوە لەسەر پەنهان (غیب) ئاگادار بكاتەوە، بەس خۆی پەنهانزانە، ئەدی چۆن لێك جیا دەكرێنەوە ؟ ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، شێوازو ڕێبازو چۆنیەتی لێك جیاكردنەوەی پاكو پیس، ئەوەیە كە خوا لەنێو

بەشــەردا پـێـغـەمبەرانی خـۆی هەڵدەبـژێریو گوڵبـژێریان دەکات، وەحییـان بـۆ دەنـــێرێ، پەیـــامو بەرنامــەی خۆییــان بــۆ دەنێــرێ، ئەوانیـــش هــەر کەســێك شـوێنـیان بکەوێ، ئەوە پاکەکانن، ئەوەش کە ئیمانیان پـێنەهێنــێ، یاخـود بـە ڕواڵــەت ئیمــان بێنــێ بــەڵام ڕاســت نــەکات، وە ڕەگەڵــیان نەکــەوێ، ئــەوە پیسەکانن، کەواتـە: پـێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) تـەرازووو سـەنگی مەحـەکی پـاكو پیـسانن، ئـەوەی لـە خزمـەت پـێغەمبەرانـدا بـێ بـە ئیمانو عەقیـدەوە، بـە شـوێنکەوتنو چاو لێکـردنو پـشتگرتنەوە، ئـەوە پاکەکانن، وە ئـەوەی دژو پـێچەوانەی پـێغـەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەڵسوکەوت بکـات، ئـەوە پیـسەکانن، مانـای وایـە پــێغەمبەران (علـیهم الـصلاة والـسلام) جیاکــەرەوەی پـــاكو پیـــسانن، هـــەروەك لـــە جەنگـــی ئوحـــودو هـــەموو هـەڵوێستەکانی دیکەدا دەرکـەوتوە، لـە سـەردەمی پـێـغەمبەر ﷺ وە لـە دوای ویـــش، ئــەوەی لەگــەڵ میــراتگرانو جێگرانـــی پـێغــەمبەران (علـیهم الـصلاة والـسلام) دایـە، ئەوانـە پاکـەکانن، وە ئـەوەی کـە دژی میـــراتگرانو جێگرانـــی پـێــغەمبەری خــوا ﷺ بـێ، ئەوانــە پیـسەکانو وەك ئـەو کەسـانەی کـە دژی پـێغەمبەران بوون لە ڕۆژگاری پـێغەمبەراندا (علـیهم الـصلاة والـسلام)، ئنجـا خــوا لـە کۆتـایی ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێ: ﴿ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾، ئیمـان بێـنن بـە خــواو بـە پــێغەمبەرانی خــواو شـوێنیان بکـەونو لەگەڵـیان بـن بـۆ ئـەوەی لـە پاکـان بـن، وە خۆتـان بپارێزن لـەوەی کـە بـەهۆی شـوێننەکەوتنیانەوە، بـچنە بازنـەی پیـسانو خراپـەکارانو زیانبەخشـەکانەوە.

**مەسـەلەی سێزدەیـەمو کۆتـایـی:** کـە دەفـەرمـوێ: ﴿ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾، خـــــوا ﷻ دوای ئـەوەی باســی گیـانبــازیو فیداکــاریی کـرد، ئنجـا باسـی مـاڵ بەخـشین

دەکات، وە مسوڵمانان ئاگادار دەکاتەوە کە ڕژدو چرووك نەبن، لە بەخشینی ماڵو سامانیاندا، چونکە ئەوەی کە ماڵی خۆی پێ نەبەخشرێ لە پێناوی خوادا، بە تەئکید ڕووحو گیانەکەشی پێ نابەخشرێ، جا خوای زاناو شارەزا بە چەند شێوەیەك ڕایدەگەیەنێ کە ئەو کەسانەی چرووکیو ڕژدیی دەکەن لە بەخشینی، ماڵەکەیان لەپێناو خوادا، بە چەند بەڵگەیەك خەڵکێکی زۆر خراپن:

**یەکەم**: دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ﴾، ئەوەی خوا لە بەخششی خۆی پێیداون، مرۆڤ خوا شتێکی پێدەبەخشێ، دوایی پێی دەفەرموێ: دەی لەوەی پێمداویو پێمبەخشیوی، هەندێکی لەڕێی مندا ببەخشە، ئەویش ڕژدیی بکاتو بڵێ: نەخێر ! ئاخر کە خوا پێیداوی مانای وایە هەر هی خۆیەتیو خۆشت هەر هی خوای، بۆچی هەندێك لەوەی کە خوا پێی داوی نایبەخشی ؟ کەواتە: بابای ڕژدو چرووك لە بەخششی خوا نابەخشێ! بێگومان ئەوەش ڕەفتارێکی زۆر نابەجێو بێ مانایە.

**دووەم**: دەفەرموێ: ﴿ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، ئەوەی کە ڕژدییان پێکردوەو تێیدا چرووك بوونو نەیانبەخشیوە، لە ملیان دەئاڵێ، لە گەردنیان دەئاڵێ، (کە دوایی ڕوونی دەکەینەوە ئەو لە مل ئاڵانە چۆنە ؟).

**سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، میراتی ئاسمانەکانو زەوی هەمووی هی خوایە، واتە: ئەگەر نەشیبەخشن هەر دەبێتە میراتتان، هەرچی زێڕو زیوی دنیا هەیە، هەرچی ئیمکانیەتی دنیا هەیە، سەرەنجام هەمووی بۆ خوا دەمێنێتەوە، هەرچەندە ئێستاش هەر هی خوایە، بەڵام هەر بە ڕواڵەت مرۆڤ پارەکە لە گیرفانیی دایە، یان لە قاسەدا دایناوە، لە بانك دایناوە، یان خانووەکەی، زەوییەکەی ...

هتد، دەڵێ: هی منە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا هەمووی هی خوایەو، لە ماوەیەکی کورتدا لەژێر موڵکیەتی وی دایە، بەلاّم بەزوویی لەژێر موڵکیەتی دا نامێنێو، دەچێتە ژێردەستی یەکێکی دیکە، بەلاّم خاوەنی حەقیقیو بەردەوام، تەنیا خوای پەروەردگارە، کەواتە: ئەو شتەی کە تۆ نایبەخشی، لە کۆتاییدا هەر دەچێتەوە بۆ لای خوا، بۆیە واباشە پێش ئەوەی بە ناچاریی بچێتەوە بۆ لای خواو، خوا ببێتە میراتگری، خۆت خۆبەخشانە (تطوعاً) بیبەخشی، بۆ ئەوەی پاداشتت هەبێ.

**چوارەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾، خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن، واتە: چاك دەزانێ چی دەکەنو چۆنی دەکەن.

**ئنجا لەبارەی ئەو لە گەردن ئالاّنی ماڵو سامانەی کە ئینسانەکان رژدییو چرووکیی پێدەکەنو نایبەخشن لەرێی خوادا، پێغەمبەری خوا ﷺ چەند فەرمایشتێکی هەن:**

فەرمایشتی یەکەم: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً، فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ، مُثِّلَ لَهُ مَالُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ يُطَوِّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ، (يَعْنِي: شِدْقَيْهِ)، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلا: ﴿ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ ... ﴾} رَوَاهُ أَحْمَد بـرقم: (٨٦٤٦)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (١٤٠٣)، وَالنَّسَائِي فـي (الكُبرى) بـرقم: (٢٢٦١))، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی رازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خوا ماڵو سامانێکی پێبدات، زەکاتەکەی لێنەدات، لە رۆژی دواییدا ئەو ماڵو سامانەی کە زەکاتی لێنەداوە، بۆی دەبێتە نێرە مارێکی کەچەڵ[1]، (ئەو مارانەی کەچەڵنو

---

١) شُجَاع: الحيَّة الذَّكَر، المعجم الوسيط، ص: (٤٧٣)، جا هەرچەندە ئەم فەرهەنگە (شجاع)ی بە (حَيَّة) تەفسیر کردوە، بەلاّم پێناسەکردنی ئە مارە بە: (لَهُ زَبِيبتان يطَوِّقهُ يَوم القيامة) دەری دەخات کە نێرە مارە، چونکە راناوی نێر (مذکر)ی بۆ بەکارهێناوە.

تووکی سەریان نیە، ژەهرەکەیان زۆر پیسە)، دوو خاڵی ڕەشی لە پشت چاویەتی (هەروەها ئەو مارانەی کە خاڵی ڕەش لە پشت چاویانە ژەهریان زۆر پیسە)، ئەو مارە لە گەردنی دەئاڵێ لە ڕۆژی دواییدا، پاشان شەویلاگەکانی دەگرێ (یانی کە لە ملی ئاڵا، ئنجا پارووی لە هەردوو شەویلاگەکانی دەدات) دوایی پێی دەڵێ: من ماڵەکەتم، من خەزنەکەتم (واتە: ئەو ماڵەم کە خەزنت دەکردمو کۆتدەکردمەوە) دواییش ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ... ﴾.

فەرمایشتی دووەم: {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ، فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ يَسْفِكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ}رَوَاهُ البُخَارِيّ فِي (الأدب الْمُفرَد) برقم: (٤٨٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٥١٩)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەم، چونکە ستەم تاریکایی یەکانی ڕۆژی دوایی یە، وە خۆتان بپارێزن لە ڕژدییو چرووکیی، چونکە ڕژدییو چرووکیی ئەوانەی پێش ئێوەی لەبەین برد، وە ڕژدییو چرووکیی وایلێکردن خوێنی یەکدی بڕێژنو یەکدی بکوژن، وە (تەماعو دەوڵەمەند بوون) وای لێکردن کە حەڕامی یەکدی بۆخۆیان حەڵاڵ بکەن.

فەرمایشتی سێیەم: {عَن أَبِي قَزَعَةَ حجير بن بَيان ﷺ قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْ ذِي رَحِمٍ يَأْتِي ذَا رَحِمَهُ، فَيَسْأَلُهُ مِنْ فَضْلِ مَا عِنْدَهُ، فَيَبْخَلُ بِهِ عَلَيْهِ، إلاّ أُخْرِجَ لَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ شُجَاعٌ مِن النَّار، يَتَلَمَّظُ حَتَّى يُطَوِّقَهُ} رَوَاهُ الطَّبَرَانِي فِي (المُعجم الكَبير) برقم: (٢٣٤٣)، وَفِي (الأوسط) برقم: (٥٥٩٣)، وَقَالَ الْهَيْثَمِي: إِسنَادُهُ جيد)، واتە: (أَبِي قَزَعَةَ حجير بنِ بيان) - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ خاوەن خزمایەتییەك نیە کە دەچێتە لای

خزمەکەی (کەسێك خزمی هەیە دەچێتە لای خزمەکەی) داوای هاوکاریی‌و یارمەتیی لێبکات لە زیادەی ئەوماڵ‌و سامانەی کە لە لایەتی (نەك بژێوی ماڵ‌و منداڵی) ئەویش چرووکیی بکات‌و پێی نەبەخشێ، حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا ئەو ماڵ‌و سامانە، بۆی دەبێتە نێرە مارێك‌و زمانی دەردێنێ، هەتاکو لە گەردنی دەئاڵێ، دیارە ئەم فەرمایشتە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان ئەگەر ڕژدیی‌و چرووکیی بکات بەرانبەر خزمی هەژارو نەداری، گوناهەکەی زیاترە، وەك ئەوەی لە بەرانبەر خەڵکی دیکەدا بیکات، بۆچی ؟ چونکە خزم هەقی زیاترە، وە چاوەڕوانیشی زیاترە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەژدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆ ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی ژمارە: (١٨١ تاکو ١٨٩) لەم نۆ ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی هەندێك لە قسەو دەربڕینە بێ ئەدەبەکانی جوولەکەکانو هەندێك لە کردەوە خراپەکانیان دەکات، وە پاشان باسی ئەو ڕاستییە دەکات، کە مردن شتێکی حەتمییەو هەموو کەس دەبێ تامی مردن بچێژێ، پاشان باسی تاقیکرانەوەی حەتمیی مسوڵمانان دەکات، بە بیستنی قسەی ناخۆشو پڕوپاگەندەی ناحەزانە، لەلایەن ئەهلی کیتابو هاوبەش بۆ خوادانەرەکانەوە، وە دوایی باسی پەیمان لێ وەرگرتنی خاوەن کتێبەکان دەکات کە پەیامی خوا بگەیەنن، وە باسی ئەوانە دەکات کە حەز دەکەن بە شتێك مەدح بکرێن کە نەیانکردوە، وە باسی خاوەنداریێتی خوا بۆ گشت بوونەوەرو کائینات، دەکات.

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا
قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا
قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ
أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى
بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ
فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ

ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ
وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ
أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ
وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ
ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ
فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ
ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ
ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ ﴾

## مانای وشـه به وشـەی ئایەتەکـان

((بێگومان خوا قسەی ئەوانەی بیست کە گوتیان: دیارە خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین (بۆیە داوای قەرزمان لێ دەکات) مسۆگەر ئەوەی گوتوویانە دەینووسین، هەروەها پێغەمبەران کوشتنیشیان بە ناهەق (دەنووسین)، وە پێیان دەڵێین: بیچێژن ئازاری سووتێنەر ! ﴿١٨١﴾ ئەوەش بە هۆی ئەو کردەوانەوەیە کە دەستەکانتان پێشکەشیان کردوە، وە بێگومان خوا ستەمکاری بەندەکانی نیە ﴿١٨٢﴾ ئەوانەی گوتیان: خوا ڕای سپاردووین کە بڕوا بە هیچ پێغەمبەرێك نەهێنین و متمانەی پێنەکەین، هەتا قوربانییەکمان بۆ نەهێنێ کە ئاگر بیخوات (واتە: ئاگرێك لە ئاسمانەوەبێ بیسووتێنێ) بڵێ: دەجا بێگومان پێش من پێغەمبەرانێکتان بۆ هاتن، بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوەو بەوەش کە گوتتان (واتە: ئەو جۆرە قوربانیی سووتێنرانە)، ئەدی ئەگەر ڕاست دەکەن

بۆچی کوشتتانن ؟ ﴿١٨٣﴾ ئنجا ئەگەر بە درۆیان دانایو بڕوایان پێنەهێنای، ئەوە بێگومان پێغەمبەرانی دیکەش پێش تۆ کە بە بەڵگە ئاشکرایەکانو ڕێنماییو ئامۆژگارییو کتێبی ڕۆشنکەرەوەوە هاتبوون، بە درۆ زانراونو بڕوایان پێ نەهێنراوە﴿١٨٤﴾ هەموو کەس چێژەری مردنە (هەموو کەس دەبێ بمرێ) وە بێگومان ڕۆژی قیامەت سزاو پاداشتەکانتان بە تەواویی دەدرێتەوە، جا هەر کەسێك لە ئاگر(ی دۆزەخ) دوورخرابێتەوەو خرابێتەوە بەهەشتەوە، ئەوە بردوویەتەوە، وە ژیانی دنیا جگە لە ڕابوادنێکی کاتی فریودەر هیچی دیکە نیە﴿١٨٥﴾ مسۆگەربن لە ماڵو سامانتانو لە خودی خۆشتاندا تاقی دەکرێنەوە، وە لەوانەی پێش ئێوە کتێبیان پێدراوەو، لەوانەش کە هاوبەشیان (بۆ خوا) پەیداکردوە، ئازاری زۆر دەبیستن، وە ئەگەر خۆڕاگربنو پارێزکاربن، ئەوە ئەو خۆڕاگرییو پارێزکارنییە لەو کارانەیە کە (لەلایەن خواوە) جەختیان لەسەر کراوە، (یان پێویستی یان بە بڕیاری بەهێزو ئیرادەی پتەو دەکات)﴿١٨٦﴾ وە یادبکەوە کاتێك خوا پەیمانی پتەوی لەوانە وەرگرت کە کتێبیان پێدراوە: کە حەتمەن دەبێ بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوەو نابێ بیشارنەوە، کەچی فڕێیاندایە دوای پشتیانەوەو، نرخێکی کەمیان پێکڕی، دیارە ئەوەی کڕییان (و دەستیان خست بە نرخی شاردنەوەی کتێبی خوا) خراپترین شت بوو﴿١٨٧﴾ پێت وانەبێ ئەوانەی دڵخۆش دەبن بەوەی کە دەیکەن (لە کردەوەو ڕەفتاری خراپ) وە حەز دەکەن لەسەر شتێك ستایش بکرێن کە نەیانکردوە، ئەوە پێت وانەبێ لە ئازار(ی دۆزەخ) دەرباز دەبن، وە ئازارێکی بە ئێشیان هەیە﴿١٨٨﴾ وە موڵکی ئاسمانەکانو زەوی بەس هی خوایە، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە ﴿١٨٩﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(عَهِدَ إِلَيۡنَآ): واتە: ئێمەی ڕاسپاردوە، یاخود ئێمە ئامۆژگاریی كردوە، (عَهِدَ فُلاَنٌ إِلى فُلاَنٍ : أَلقى إِلَيْهِ العَهْدَ وَأَوْصَاهُ بحِفْظِهِ)، لە زمانی عەرەبیدا كە بگوترێ: (عَهِدَ فُلاَنٌ إِلى فُلاَنٍ) فلان كەس عەهدی بۆ فلان كرد، واتە: بەڵێنو پەیمانێكی لادانا، وە ئامۆژگاریی كردوەو ڕایسپاردوە كە بیپارێزێ.

(بِقُرۡبَانٍ): لە كوردەواریی خۆشماندا هەر دەڵێین: قوربانیی، (القُرْبانُ: مَا يُتَقَرَّبُ بِهِ إِلى اللهِ؛ جَمْعُهُ قَرَابِيْنَ، وَصَارَ فِي التَّعَارفِ اسما للنَسِيكَةَ الَّتي هِيَ الذَّبيحَة)، واتە: (قُربان) هەر شتێكە كە ئینسان پێی لە خوا نیزیك بكەوێتەوە، وە كۆیەكەی (قَرَابِيْنَ)ە، وە لە زاراوی شەرعدا ناوە بۆ (نَسِيكَة) واتە: ئەو شتەی كە بۆ خوا سەردەبڕدرێ، لە ئاژەڵ، چ ئاژەڵی ورد وەك: مەڕو بزن، چ هی درشت وەك: ڕەشە وڵاخو حوشتر.

(وَٱلزُّبُرِ): كۆی (زَبور)ە، وە (كُتُب) كۆی (كِتاب)ە، واتە: كتێبەكان، لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (زَبَرْتُ كِتَابَةً: كَتَبْتُ كِتَابَةَ غَلِيظَةً): واتە: نووسیم بە نووسینێكی درشت، (وَقَالَ بَعْضُهُمْ: الزَّبُورُ: اسْمٌ للكِتَابِ الْمَقْصُور عَلَى الحِكْمِ العَقْلِيَّةِ دُونَ الأحْكَامِ الشَّرْعِيَّةِ)، واتە: هەندێكیان گوتوویانە: (الزَّبُورُ) ناوە بۆ ئەو كتێبەی كە تەنیا حیكمەتو پەندە عەقڵییەكانی تێدان، نەك یاسا شەرعییەكان، دیارە ئەو كتێبەی ئێستا كە بە زەبوور ناسراوە، وە لە پەیمانی كۆن (عهد القديم)دا هەیەو پاڵدەدرێتە لای داوود (عليه السلام) هەمووی پەندو ئامۆژگاریی عەقڵییە، جا چەندی وەحییەو خوا بۆ داوودی ناردوەو، چەندی گۆڕراوە ؟ ئەوە بەس خوا دەزانێ[1] !.

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)، ص: (١٣٠ تاكو ١٢٧٨)، كە لە (المزامير)ی (داودی)ی هێناوە. هەروەها بڕوانە، ص: (١٢٨٠ تاكو ١٣٤٠)، كە (الأمثال)ی (سليمان)ی هێناوە، سەلامی خوا لە داوودو سولەیمان بێ، ط: (٢٠٠٢)، القاهرة، مصر.

(زُحْزِحَ): (أُزِيْلَ عَنْ مَقَرِّهِ فِيهَا)، واتە: لە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی دوورخراوەتەوە، خزێنراوە.

(عَزْمِ ٱلْأُمُورِ): واتە: ئەو کارانەی کە پێویستییان بە عەزیمەتی پتەو دەکات، یاخود ئەو کارانەی کە جەختیان لەسەر کراوەتەوە، (العَزْمُ وَالعَزِيْمَةُ: عَقْدُ القَلْبِ عَلَى إِمْضَاءِ الأَمْرِ)، وشەی: (عَزْمُ)و (عَزِيْمَةُ) بریتیە لە گرێدانی دڵ لەسەر جێبەجێکردنی کارێك و بڕیارێك.

(مِيثَٰقَ): واتە: پەیمانی پتەو، (الْمِيثَاقُ: عَقْدُ مُؤَكَّدٌ بيَمِينٍ وَعَهْدٍ، وَالْمَوْثِقُ الإِسْمُ مِنْهُ)، واتە: (مِيثَاقُ) بریتیە لە گرێبەستێك کە جەختی لەسەر کرابێتەوە بە پەیمان لێ وەرگیراو بە سوێند لەسەر خواردن، (مَوْثِقُ)یش ناوە.

(فَنَبَذُوهُ): واتە: بەبێ ئەهمیەتیی فڕێیاندا، (النَبْذُ: إِلقَاءُ الشَّيءِ وَطَرْحُهُ لِقِلَّةِ الإِعتدَادِ بِهِ)، (نَبْذُ) بریتیە لەوەی کە شتێك فڕێبدەی لەبەر ئەوەی کە بایەخی پێنادەی.

(بِمَفَازَةٍ): (مَفَازَة) چاوگە، (فَازَ، يَفُوزُ، فَوْزاً ومفَازَة)، (الفَوْزُ: الظَّفَرُ بالْخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلاَمَةِ)، (فَوْز) ئەوەیە کە ئینسان بە ئامانجێکی باش بگات و لەگەڵ ئەوەشدا سەلامەتیش بێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە موبارەکە کە دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ﴾، لەوبارەوە دوو گێڕانەوە هەن:

أ/ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ بَيْتَ الْمِدْارَسِ فَوَجَدَ يَهُودَ، قَد اجْتَمَعُوا إلى رَجُلٍ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ فَنْحَاص، وَكَانَ مِن عُلَمَائِهِمْ وَأَحْبَارِهِم، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَيْحَكَ يَا فَنْحاصُ! اِتَّقِ الله وَأَسلِمْ، فَوَاللهِ إنَّكَ لَتَعْلَمُ أنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله، تَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنْدَكُمْ فِي التَّوراةِ، فَقَالَ فَنْحَاصُ: وَاللَّهِ يَا أَبَا بَكْرٍ مَا بِنَا إلى الله مِنْ فَقْرٍ، وإنَّهُ إلَيْنَا لَفَقِير، وَمَا نَتَضَرَّعُ إلَيْهِ كَمَا يَتَضَرَّعُ إلَيْنَا، وَإنَّا عَنْهُ لأغْنِيَاء، وَلَوْ كَانَ غَنِياً عَنَّا مَا اسْتَقْرَضَ مِنَّا كَمَا يَزْعُمُ صَاحِبُكُمْ، يَنْهَاكُمْ عَنِ الرِّبَا وَيُعْطِينا، وَلَوْ كَانَ غَنِياً عَنَّا مَا أعْطَانَا الرِّبَا! فَغَضِبَ أَبُو بَكْرٍ فَضَرَبَ وَجَهَ فَنْحَاص ضَرْبَةً شَدِيدَة، وَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلا العَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ لَضَرَبْتُ عُنُقَكَ يَا عَدُوَّ اللَّهِ، فَذَهَبَ (فَنْحَاصُ) إلى رَسولِ الله، فَقَالَ: يَا مُحَمَّد! أُنْظُر مَا صَنَعَ بِي صَاحِبُكَ، فَقَالَ رَسول الله لأبِي بَكْرٍ: {مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ} ؟ فَقَالَ: يَا رَسولَ اللهِ، قَالَ قَوْلاً عَظِيماً، يَزْعمُ أَنَّ اللهَ فَقِيرٌ، وَأَنَّهُم عَنْهُ أَغْنِيَاءُ! فَلَما قَالَ ذَلِكَ غَضِبتُ للهِ مِمَّا قَالَ، فَضَرَبْتُ وَجْهَهُ، فَجَحَدَ (فَنْحَاصُ)، فَقَالَ: مَا قُلْتُ ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى فِيمَا قَالَ فَنْحَاصُ تَصْدِيقاً لأبِي بَكْرٍ: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ... ﴾، وَنَزَلَ فِي أَبِي بَكْرٍ وَمَا بَلَغَهُ فِي ذَلِكَ مِنَ الغَضَب: ﴿ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا ﴾، (أَخْرَجَهُ ابْنُ إِسْحَاق، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ الْمُنذِر[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەبوبەکری صیددیق ڕۆژێك چووە میدراس (میدراس، وەك چۆن ئێمە مزگەوتمان هەیە، یان قوتابخانەمان هەیە، ئەویش شوێنی دەرس تێدا خوێندنو پەرستگای جوولەکەکانە) جوولەکەکانی بینی، لە دەوری پیاوێکیان کۆبووبوونەوە کە پێی دەگوترا: فەنحاص، کە یەکێك بوو لە

١) فتح القدير، للشوكاني، ج(١)، ص(٦١٤).

زانایانو شارەزایانیان، ئەبوبەکر پێی گوت: ئەی فەنحاص! پارێز لە خوا بکە، مسولْمان بە، سوێند بە خوا تۆ دەزانی کە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، لە تەوراتی لای خۆتاندا دەیبینن کە نووسراوە، فەنحاص گوتی: بە خوا ئەبوبەکر ئێمە هەژارنین بۆ لای خوا، وە خوا هەژارە بۆ لای ئێمە، واتە: (واتە: خوا پێویستیی بە ئێمە هەیە) وە ئێمە لە خوا ناپاڕێینەوە کە پێمان بدات، وەك ئەو لە ئێمە دەپاڕێتەوە، وە ئێمە لە خوا بێ نیازینو دەوڵەمەندین، وە ئەگەر خوا لە ئێمە بێ نیازو دەوڵەمەند بووایە، وەك هاوەڵەکەتان (واتە: پێغەمبەر ﷺ) گومان دەبا، داوای قەرزی لێ نەدەکردین، خوا سوودتان لێ قەدەغە دەکات، کەچی خۆی سوودتان دەداتێ (واتە: وەك خوا دەفەرموێ: هەر کەسێك شتێك ببەخشێ خوا زیاتری دەداتەوە) وە ئەگەر خوا دەوڵەمەند بووایە سوودو ڕیبای بە ئێمە نەدەدا، ئەبوبەکر - خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەم قسانەی بیست تووڕە بوو مستێك یان زللەیەکی توندی لەلا چاوی فەنحاص دا، وە پێی گوت: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ئەو پەیمانەی کە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا هەیە نەبووایە، هەی دوژمنی خوا لە گەردنم دەدای، لەسەر ئەو قسانە، فەنحاص چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی موحەممەد! تەماشا بکە هاوەڵەکەت چی پێکردووم! (دیارە کە مستەکەی یان زللەکەی لێداوە نیشانەی پێوە بووە) پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوبەکری فەرموو: چ شتێك وای لێکردی کە وا بکەی؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ قسەیەکی زۆر گەورەی کرد، پێی وایە کە خوا هەژارەو ئەوان دەوڵەمەندن بەرانبەر بە خوا، کاتێك ئەوەی گوت منیش لەبەر خوا تووڕە بووم لە ئەنجامی قسەکەی دا، بۆیە بەم شێوەیە لە دەمو چاویم دا، فەنحاص گوتی: نەخێر قسەی وام نەگوتوە، نکووڵیی لێکرد، ئیدی خوای بەرز بۆ بەڕاستدانانی ئەبوبەکر، ئەم ئایەتە موبارەکەی ناردە خوار کە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ...﴾، ﴿واتە: ئەگەر (فەنحاص)یش نکووڵیی لێ دەکات، بەڵام خوا

بیستی لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە﴾، وە دەربارەی ئەبوبەکرو ئەو تووڕەییەشی کە وای لێکرد لە سنوور دەربچێ (چونکە ئەبو بەکر - خوا لێی ڕازی بێ- نەدەبوو وایکردبایە هەرچەندە کابرا بێئەدەبیەکی گەورەی کردوە) لەوبارەوەش ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا﴾، واتە: بێگومان لەوانەی کتێبیان پێدراوە لەپێش ئێوەداو لەوانەی هاوبەشیان پەیداکردوە، ئازارێکی زۆر دەبیستن (قسەو قاڵی زۆر خراپ دەبیستن دەرهەق بە خواو، دەرهەق بە پێغەمبەری خوا ﷺ،و دەرهەق بە ئیسلام) بەڵام ئەگەر پارێز بکەنو خۆ ڕابگرن، ئەوە ئەو کارە لەو کارانەیە کە پێویستیی بە خۆڕاگریی و عەزیمەتو ئیرادەی پتەو دەکات، ئێوەش وابن.

ب- {عَنْ سَعِيد بْنُ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَتَتِ الْيَهُود مُحَمَّداً ﷺ حِيْنَ أَنْزَلَ اللهُ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ... ﴿٢٤٥﴾﴾ البقرة، فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ! أَفَقِيرٌ رَبُّكَ يَسأَلُ عِبَادَهُ القَرْضَ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ الآيَة: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ...﴾} (أَخْرَجَهُ ابْنُ أبِي حَاتِم، وَابْنُ مردويه، والضياء في المختارة[1])، واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر - خوا لێی ڕازی بێ (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس - خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ-) دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: جوولەکەکان هاتنە لای موحەممەد ﷺ کاتێك خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾﴾البقرة، واتە: کێ قەرزێکی باش لەگەڵ خوادا دەکات، تاکو چەند قات پاداشتی بداتەوە، وە خوا ڕزقتان

١) فتح القدير، للشوكاني، ج(١)، ص: (٥٢٢).

کـەم دەکـاتو فراوانـی دەکـات، وە بـۆ لای وی (خـوای پەروەردگـار)یـش دەگـەڕێنەوە، جوولەکـەکان گوتیـان: ئـەی موحەممـەد ! ئایـا پـەروەردگارت هـەژارە، داوا لـە بەندەکـانی دەکـات کـە قـەرزی پـێبدەن ؟ خـواش ﷻ ئـەو ئایەتــەی نــاردە خــوار: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ...﴾، (جـا ئـەوە دوایـی بۆتـان بـاس دەکـەم کـە ئـەوەی کـە فەنحـاص گومانی بردوەو، ئەوەی خوای بە سوودو ڕیبـا لەقەڵەمداوە، وانیـە).

٢/ هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـەی، کـە دەفـەرموێ: ﴿... وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾، {عَنْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْهُمَـا، أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ رَكِـبَ عَلَـى حِمَـارٍ عَلَـى قَطِيفَـةٍ فَدَكِيَّـةٍ، وَأَرْدَفَ أُسَـامَةَ بْـنَ زَيْـدٍ وَرَاءَهُ، يَعُـودُ سَـعْدَ بْـنَ عُبَـادَةَ فِـي بَنِـي الْحَـارِثِ بْـنِ الْخَـزْرَجِ قَـبْلَ وَقْعَـةِ بَـدْرٍ، قَـالَ: حَتَّـى مَـرَّ بِمَجْلِـسٍ فِيـهِ عَبْـدُ اللَّـهِ بْـنُ أُبَـيٍّ ابْـنُ سَلُولَ، وَذَلِـكَ قَبْـلَ أَنْ يُـسْلِمَ عَبْدُاللَّـهِ بْـنُ أُبَـيٍّ، فَـإِذَا فِـي الْمَجْلِـسِ أَخْـلاَطٌ مِـنْ الْمُـسْلِمِينَ وَالْمُـشْرِكِينَ، عَبَـدَةِ الأَوْثَـانِ وَالْيَهُـودِ وَالْمُـسْلِمِينَ، وَفِـي الْمَجْلِـسِ عَبْدُاللَّـهِ بْـنُ رَوَاحَـةَ، فَلَـمَّا غَشِـيَتْ الْمَجْلِـسَ عَجَاجَـةُ الدَّابَّـةِ خَمَّـرَ عَبْدُاللَّـهِ بْـنُ أُبَـيٍّ أَنْفَـهُ بِرِدَائِـهِ. ثُـمَّ قَـالَ: لا تُغَـبِّرُوا عَلَيْنَـا، فَسَلَّمَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ عَلَـيْهِمْ ثُـمَّ وَقَـفَ فَنَـزَلَ فَدَعَاهُـمْ إِلَـى اللَّـهِ وَقَـرَأَ عَلَـيْهِمْ الْقُـرْآنَ، فَقَـالَ عَبْدُاللَّـهِ بْـنُ أُبَـيٍّ ابْـنُ سَلُولَ: أَيُّهَـا الـمرءُ إِنَّـهُ لا أَحْـسَنَ مِمَّـا تَقُـولُ إِنْ كَـانَ حَقًّـا، فَـلاَ تُؤْذِنَـا بِـهِ فِـي مَجْلِسِـنَا، ارْجِـعْ إِلَـى رَحْلِـكَ فَمَـنْ جَـاءَكَ فَاقْـصُصْ عَلَيْـهِ. فَقَـالَ عَبْدُاللَّـهِ بْـنُ رَوَاحَـةَ: بَلَـى يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ فَاغْـشَنَا بِـهِ فِـي مَجَالِـسِنَا فَإِنَّـا نُحِـبُّ ذَلِـكَ، فَاسْـتَبَّ الْمُـسْلِمُونَ وَالْمُـشْرِكُونَ وَالْيَهُـودُ حَتَّـى كَـادُوا يَتَـثَاوَرُونَ فَلَـمْ يَـزَلْ النَّبِـيُّ ﷺ يُخَفِّـضُهُمْ حَتَّـى سَكَنُوا، ثُـمَّ رَكِـبَ النَّبِـيُّ ﷺ دَابَّتَـهُ فَـسَارَ حَتَّـى دَخَـلَ عَلَـى سَعْدِ بْنِ عُبَـادَةَ، فَقَـالَ لَـهُ النَّبِـيُّ ﷺ: يَـا سَـعْدُ أَلَـمْ تَـسْمَعْ مَـا قَـالَ

أَبُو حُبَابٍ (يُرِيدُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ) قَالَ: كَذَا وَكَذَا ؟! قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ! اعْفُ عَنْهُ، وَاصْفَحْ عَنْهُ، فَوَالَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ لَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِالْحَقِّ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ وَلَقَدْ اصْطَلَحَ أَهْلُ هَذِهِ الْبُحَيْرَةِ عَلَى أَنْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُوهُ بِالْعِصَابَةِ، فَلَمَّا أَبَى اللَّهُ ذَلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَ اللَّهُ، شَرِقَ بِذَلِكَ، فَذَلِكَ فَعَلَ بِهِ مَا رَأَيْتَ، فَعَفَا عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ يَعْفُونَ عَنْ الْمُشْرِكِينَ، وَأَهْلِ الْكِتَابِ كَمَا أَمَرَهُمْ اللَّهُ وَيَصْبِرُونَ عَلَى الاذَى، قَالَ اللَّهُ عَزَّوَ جَلَّ: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا﴾} رَوَاهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٥٦٦)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٤٦٣٥)، واتە: (وێڕای ئەم بەسەرهاتانەی پێشی ئەم بەسەرهاتەش گێڕدراوەتەوە) ئوسامەی کوڕی زەید - خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ- (کە هەردووکیان پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری خۆشویستوون، بۆیە بە ئوسامەی کوڕی زەید گوتراوە (الحِبّ بن الحِبّ)، واتە: خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست،) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سواری کەرێك بوو قەتیفەیەکی فەدەکیی لەسەر بوو (قەتیفە: جۆرە قوماشێکە، واتە: کورتانێك، جلێکی فەدەکیی لەسەر پشتی کەرەکە بوو) وە ئوسامەی کوڕی زەیدیشی لە پشت خۆی سوار کرد، چوو بۆ سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە لە بەنی حاریسی خەزرەجی، (کە دیارە نەخۆش بووەو سەردانی کردوە) پێش ڕووداني بەدر، دەڵێ: هەتا بەلای کۆڕێکدا تێپەڕی کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلوولی تێدابوو (سەرۆکی مونافیقو دەغەڵەکان) بەر لەوەی کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییە مسوڵمان ببێ، (واتە: بە ڕواڵەت مسوڵمان ببێ)، وە لەنێو ئەو کۆڕەدا خەڵکێکی تێکەڵ هەبوو لە مسوڵمانانو، هاوبەش بۆ خوادانەرانو، جوولەکەکان، وە لە کۆڕەکەدا عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش هەبوو (جا دەڵێ:) کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لایاندا تێپەڕی، تۆزو خۆڵی ولاخەکە بەسەر کۆڕەکەدا ڕۆیشت، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییە بە کراسەکەی سەرچاوی خۆی داپۆشی بۆ ئەوەی

تۆزی بۆ نەچێ، دوایی گوتی: تۆزو خۆڵمان بۆ مەکە ! پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوی لێکردن دوایی وەستاو دابەزی، وە بانگیکردن بۆ لای خوا، قورئانی لەسەر خوێندنەوە (دیارە ئەو کاتە مسوڵمان نەبوو ون)، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلوول گوتی: ئەی مرۆڤ ! هیچ قسەیەك لەوەی کە تۆ دەیڵێی باشترنیە، ئەگەر هەق بێ، (تەماشای ئەو بێئەدەبییە !! واتە: ئەگەر ڕاستبکەی لەلایەن خواوە ڕەوانەکراویو وەحی بێ، قسەیەکی زۆر چاکە)، بەڵام لە کۆڕو مەجلیسی خۆماندا ئێمەی پێ ئازار مەدە، بگەڕێوە بۆ شوێنی خۆت، هەرکەسێك هاتە لات، بۆی باس بکە، بۆی بگێڕەوە (چونکە تەعبیرە کەی (فَاقْصُصْ عَلَيْهِ)، واتە: حیکایەتی بۆ بکە، ئەمەش هەر تەعبیرێکی بێ ئەدەبانەیە!) عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش - خوا لێی ڕازی بێ-، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ بەڵکو وەرە بۆ کۆڕو مەجلیسەکانمانو ئێمە ئەوەمان پێخۆشە (واتە: بەرپەرچی قسەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلوولی دایەوە) ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا مسوڵمانانو هاوبەش بۆ خوا دانەرانو جوولەکەکان، بوو بە شەڕە قسەو مشتومڕو دەنگ لێك هەڵبڕینیانو شەڕە جنێویان، هەتا خەریك بوو لێك هەڵسن، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر خەریك بوو ئارامی دەکردنەوە، هەتاکو بێ دەنگ بوون، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وڵاخەکەی بوو، وە ڕۆیشت هەتا چووە لای سەعدی کوڕی عوبادە پێی فەرموو: ئەی سەعد ! نەتبیستوە ئەبو حوباب (واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئوبەییە) چی گوت ؟ (تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بە ئەدەب بووە، عەرەب عادەتیان وایە کە کونیە بۆ کەسێك بەکاربێنن، ڕێزی دەگرن یەکسەر ناوە شەخصییەکەی خۆی نەهێناو فەرمووی: ئەبو حوباب) ئاواو ئاوی گوتوە، سەعدی کوڕی عوبادەش (کە سەرۆکی هۆزی خەزرەج بوو) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لێی ببوورەو چاوپۆشیی لێ بکە، سوێند بەو کەسەی کە کتێبی بۆ سەر تۆ ناردوە، خوا ئەو هەقەی کە دایبەزاندوە بۆ سەر تۆو بۆ تۆی هێنا، لە کاتێکدا بوو کە خەڵکی ئەم دەڤەرە

پێکهاتبوون کە تاجی لەسەر بنێن (لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە)، وە مێزەری برا گەورەییو سەرۆکایەتی لەسەر بپێچن، بەڵام کاتێك خوا بەو هەقەی کە بە تۆی بەخشی، ڕێی لەوە گرت، ئەوەیە کە لە قورگی گیرا (واتە: بۆی قوت ناچێ) ئەوە ئەوەی پێکردوە کە لێت بینیوە، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بورد، وە پێغەمبەرو هاوەڵان چاوپۆشییان لە هاوبەش دانەرەکانو لە جوولەکەکان دەکرد، وەك خوا فەرمانی پێکردبوون، وە ئازارمیان دەگرت لەسەر ئازار، واتە: فەرمانی خوایان جێبەجێ کرد، ئیدی بەو بۆنەوە خوای بەرزو مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوار کە دەفەرموێ: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا﴾.

٣/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾﴾، لەوبارەشەوە دوو گێڕانەوە هەن:

أ- {عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ رِجَالاً مِنَ الْمُنَافِقِينَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ، وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللَّهِ، فَإِذَا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اعْتَذَرُوا إِلَيْهِ، وَحَلَفُوا، وَأَحَبُّوا أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَنَزَلَتْ فِيهِم: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ﴾} رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٦٧) وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٦٩٦٤)، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پیاوانێك لە مونافیقو دەغەڵەکان لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ، کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو بۆ جەنگ، خۆیان بەجێ دەهێشت، وە دڵخۆش دەبوون بەوەی

كە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێماون (واتە: بەو دانیشتنەیان دڵخۆش دەبوون) وە كاتێك كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتەوە، دەچوون عوزریان بۆ دەهێنایەوەو سوێندیان بۆ دەخوارد، وە حەزیان دەكرد بەشتێك ستایش بكرێن كە نەیانكردوە، واتە: دەیانویست پێغەمبەرو مسوڵمانان ئیقناع بكەن بەوەی كە ئەوانیش وەك چووبن بۆ ئەو جەنگو غەزایە وایە، چونكە عوزریان هەیە! ئیدی ستایش بكرێن بە شتێك كە نەیانكردوە، دیارە بە ئەنقەستیش نەیانكردوە نەك بە عوزر.

ب- هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش گێڕدراوەتەوە: {عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ ﷺ: أَنَّ مَرْوَانَ قَالَ لِبَوَّابِهِ: اذْهَبْ يَا رَافِعُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقُلْ: لَئِنْ كَانَ كُلُّ امْرِيءٍ فَرِحَ بِمَا أُوتِيَ، وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ مُعَذَّبًا، لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَمَا لَكُمْ وَلِهَذِهِ إِنَّمَا دَعَا النَّبِيُّ ﷺ يَهُودَ، فَسَأَلَهُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَكَتَمُوهُ إِيَّاهُ، وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ فَأَرَوْهُ أَنْ قَدِ اسْتَحْمَدُوا إِلَيْهِ بِمَا أَخْبَرُوهُ عَنْهُ فِيمَا سَأَلَهُمْ وَفَرِحُوا بِمَا أُوتُوا مِنْ كِتْمَانِهِمْ، ثُمَّ قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ...﴾، حَتَّى قَوْلِهِ: ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ ...﴾} رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٦٨) وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٦٩٦٥)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٠١٤)، واتە: عەلقەمەی كوڕی وەققاص دەڵێ: مەڕوان (مەڕوانی كوڕی حەكەم، كە ئەوكاتە سەرۆكی مسوڵمانان بووە) بە دەرگاوانەكەی خۆی گوت: ئەی ڕافیع بچۆ بۆ لای عەبدوڵلای كوڕی عەبباس، بڵێ: ئەگەر بێتو هەر ئینسانێك كە دڵخۆشببێ بەوەی كە پێیدراوە، وە حەز بكات كە ستایش بكرێ بە شتێك كە نەیكردوە (واتە: بە شتی چاك) لەسەر ئەوە سزا بدرێو ئازار بدرێ، ئەوە هەموومان ئازار دەدرێین، (جا من دەڵێم: دیارە مەڕوانی كوڕی حەكەم لە هەمبانەی خۆیدا گوێزی ژماردوە، ئەگەرنا مەرج نیە هەموو كەس پێی خۆشبێ بە شتێكی چاك كە نەیكردوە ستایش بكرێ) دەڵێ: عەبدوڵلای كوڕی عەبباسیش گوتی: جا ئێوە چ پەیوەندییتان بەوەوە

هەیە ؟! ئەوە پێغەمبەر ﷺ جوولەکەکانی بانگ کردو دەربارەی شتێك پرسیاری لێکردن، ئەوانیش ئەو ڕاستییەی کە پێیان بوو، لە پێغەمبەریان شاردەوەو، هەواڵیان بە شتێك پێدا جیا لەوەی کە ئەو لێی پرسی بوون، وە پاشان وایان پێشاندا کە شتێکی چاکیان کردوە، تاکو ستایش بکرێن بەوەی کە ئەو هەواڵەیان پێداوە لەوبارەوە کە ئەو پرسیاری لێکردوون، وە دڵخۆشبوون بەوەی کە کردوویانە، لەوەی کەشتیان لە پێغەمبەری خوا شاردۆتەوە، ئنجا ئیبنو عەبباس ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ...﴾ هەتاکو دەگاتە: ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ ...﴾، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ئەو دوو ئایەتەی تێك بەستن، گوتی: هەمووی پێکەوە هاتۆتە خوارو هەمووی پێکەوە پەیوەستە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە لە دەرسی ڕابردووەوە قسەکردن دەربارەی ڕووداوەکانی جەنگی ئوحود کۆتاییی‌یان هات، واتە: لە ئایەتی ژمارە: (١٨٠) ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی هەڵوێستی هەندێ قسەی بێجێی جوولەکەکان، وە پاشان هەندێ قسەو هەڵوێستی هاوبەش دانەرەکان، کە هەڵوێستی مسوڵمانان دەبێ چۆنبێ لەوبارەوە ؟

سەرەتا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾، خوا بیستی قسەی ئەوانەی کە دەڵێن: خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین، ئەوەی کە گوتوویانە دەینووسین، (واتە: لەسەریان دەکەینەماڵ)، هەروەها جگە لەو قسەیەش کوشتنی پێغەمبەرانیشیان لەسەر دەنووسین، کە بە ناهەق پێغەمبەرانیان کوشتوە، وە پێیان دەڵێین: بیچێژن ئازاری سووتێنەر، جا

ئەوانە کێن؟ وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەدا باسمان کرد، جوولەکەکانن، وە بەڕاستی ئەگەر هۆی هاتنە خوارەوەکانیشی نەبن، ئەو جۆرە قسانە دیارە کە هەر جوولەکەکان دەیکەن، بۆ زانیارییتان جوولەکە بەرانبەر خوا زۆر بێئەدەبن، هەمیشە خوای بێ وێنە وەك ئینسان تەماشا دەکەن، تەورات بخوێننەوە، ئەو تەوراتەی کە گۆڕدراوە (تحريف) کراوە، وەك شەخصێك باسی خوای پەروەردگار دەکات، بۆ وێنە: لە تەوراتدا هاتوە، کە خوا لە ئاسمانێ هاتۆتە خوارێ، وە ملانە (زۆران)ی لەگەڵ یەعقووبدا گرتووەو هەتا دەمەو بەیانی خەریك بوون، هیچیان هیچیان بۆ نەخراوە، (واتە: خوا یەعقووبی بۆ لە عەرزێ نەدراوە، وە یەعقووبیش خوای بۆ لە عەرزێ نەدراوە !!)، دەمەو ئێوارە خوا بە یەعقووبی فەرمووە: بەرمدە بچمەوە ئاسمانێ، یەعقووب گوتوویەتی: بەرتنادەم ئیللا دەبێ بەرەکەتێکم بدەیە، وە هەتا بەرەکەتەکەی لێوەرنەگرتوە بەری نەداوە[1] !!

جا ئەگەر خوا ﷻ ئاوا پێناسە بکرێ، نازانی ئەو ڕۆژئاواییانە هەموو کافر دەبن، ئەوانە بەڕاستی بۆچوونو تێڕوانینیان بەرانبەر بە خوا زۆر دوورە لەو مەقامو پایەی کە بۆ خوا پێویستە، جا یەکێ لە قسەکانیان ئەوەیە کە گوتوویانە: خوا هەژارە، بەڵگەیان چیە ؟ دەڵێن: ئەوەنیە داوای قەرزمان لێدەکات ! جا جوولەکە زۆر پوولەکیی‌و پارە پەرستیشن، هەر لەو کاتەوە کە گۆلکە زێڕینەیان دروست کردو پەرستیان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ﴾البقرة، واتە: خۆشەویستی گۆلکیان پێ

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)، سفر التكوين، الإصحاح: (٣٢)، يعقوب يُصارع في فنيئيل، ص: (٨٧، ٨٨)، کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿... وبَقِيَ يَعْقُوبُ وَحْدَهُ. وَصَارَعَهُ إِنْسَانٌ حَتَّى طُلُوعِ الْفَجْرِ، وَعِنْدَمَا رَأَى أَنَّهُ لَم يَتَغَلَّبْ عَلَى يَعْقُوبَ ضَرَبَه عَلَى حُقِّ فَخْذِهِ فَانْخَلَعَ حُقُّ مفصل فَخْذِ يَعْقُوبَ فِي مُصَارَعَتِهِ مَعَهُ، وَقَالَ لَهُ: أَطْلِقْنِي، فَقَدْ طَلَعَ الْفَجْرُ، فَأَجَابَهُ يَعْقُوبُ: لا أُطْلِقُكَ حَتَّى تُبَارِكَنِي، فَسَأَلَهُ: مَا اسْمُكَ؟ فَأَجَابَ: يَعْقُوبُ. فَقَالَ: لاَ يُدْعَى اسْمُكَ فِي مَا بَعْدُ يَعْقُوبَ، بَلْ إِسْرَائِيلَ (وَمَعْنَاهُ: يُجَاهِدُ مَعَ اللَّهِ) لأَنَّكَ جَاهَدْتَ مَعَ اللَّهِ وَالنَّاسِ وَقَدَرْتَ ... وَدَعَا يَعْقُوبُ اسْمَ الْمَكَانِ: فَنِيئِيلَ (وَمَعْنَاهُ: وَجْه اللَّهِ) إِذْ قَالَ: لأَنِّي شَاهَدْتُ اللهَ وَجْهاً لِوَجْهٍ وَبَقِيتُ حَيّاً ...﴾.

خوراوەتەوە، بە هۆی کوفرەکەیانەوە، ئیدی جوولەکە عاشقی زێڕو زیوو پارەن، بۆیە هەمیشە دەیانەوێ هەرچی زیاتر پارەو سەروەت سامان پەیدا بکەن، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: قسەکەی وانمان بیست ﴿ سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ ﴾، وە قسەکەیان دەنووسینو نەك هەر ئەوەش بەڵکو کە پێغەمبەرانیشیان بە ناهەق کوشتوە، ئەویش دەنووسین، جا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: جا ئەو جوولەکانەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خۆ پێغەمبەرانیان نەکوشتوون ؟! دەڵێین: ڕاستە، بەلام هی ئەو کاتیو ئێستاش بە کردەوەکانی پێشینانی خۆیان ڕازینو تەبەننیی دەکەنو، لەسەر ئەو ڕێچکەو ڕێبازەش دەڕۆن، کەواتە: بەشدارن لەو کەتنو تاوانانەی ئەوان دەیانکردن، وەك ئەوەی دەستیان تێدا بووبێ، ﴿ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، وە پێیان دەڵێین: بچێژن سزای سووتێنەر، جا بەڵگەکەشیان شتێکی زۆر بێمانایە، دەڵێن: ئەوەنیە خوا دەفەرموێ: چاکەیەك بکەی بە چەند قات پاداشتت دەدەمەوە، ئەگەر دینارێك ببەخشن خوا بە دە قات پاداشتتان دەداتەوە، کەواتە: خوا لەلایەك داوا لە ئێمە دەکات مامەڵە بە سوود نەکەین، کەچی خۆی ڕیبامان دەداتێ ! وەلامی ئەو قسە قرپۆکەش ئەوەیە: خوا ﷻ بۆیە داوا لە ئێمە دەکات مامەڵە بە ڕیباوە نەکەین، لەبەر ئەوەی کە ئێمە زەرەر لە یەکدی نەدەین، بەلام خوای بێوێنە پاداشتمان دەداتەوە بە چەند قاتو بە دە قات، بەڵکو بە حەوت سەد قاتو زیاتریش، بۆ ئەوەی هانمان بدات لەسەر چاکە کردن، بۆ ئەوەی بەندەکانی خوا سوود ببینن، وە خوای پەروەردگاریش هەرچەندە ببەخشێ، بەخششی خواو پاداشتی خوا سنووری نیە، وەك هی ئێمە نیە، بۆ وێنە: تۆ لەگەڵ کەسێك مامەڵە دەکەی سوودی لە (١٠٪) یان لە (٥٪)ی لێوەردەگری، ئەو دەکەوێتە ژێر قەرزەوە! بەلام خوای بێ وێنە زەرەر ناکات، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾، پێیان دەڵێین: ئەوە بەهۆی ئەوەی کە دەستتان پێشیخستوە، وە خوا ستەمکار

نیه بۆ بەندەکانی، واتە: ئەو سزاو جەزرەبەو، ئەو سووتاندنە، بەرهەمی کردەوەی خۆتانە، جا لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾، چونکە زۆربەی کردەوەکان بە دەستەکان ئەنجام دەدرێن، ئەگەرنا کردەوەش هەیە کە بە دڵ ئەنجام دەدرێ، بە زمان ئەنجام دەدرێ، بە لاقان ئەنجام دەدرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی کردەوەو جموجۆڵەکانی ئینسان بە دەستەکانە، بۆیە وا دەفەرموێ.

ئنجا هەر لەسەر قسەی جوولەکەکان بەردەوام دەبیٚو دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٍ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ﴾، ئەوانەی کە گوتیان: (کەواتە: هەر ئەوەندەیان نەگوتوە، شتی دیکەشیان گوتوە) بێگومان خوا بە ئێمەی ڕاگەیاندوەو ئێمەی ڕاسپاردوە، کە متمانە بە هیچ ڕەوانەکراوێك نەکەین، وە بڕوای پیٚنەهێنین، هەتاکو قوربانییەکمان بۆ دێنیٚ کە ئاگر بیسووتێنیٚ، (یانی: قوربانییەك سەربڕیٚو ئاگر لە ئاسمانیٚ بێتە خواریٚ بیسووتێنیٚ لەپێش چاوی ئێمە) دیارە ئەوانەی کە ئەوەشیان گوتوە، ئەوانیش هەر جوولەکە بوون ﴿قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾، پێیان بڵیٚ: لە پێش مندا پێغەمبەرانێك (علیهم الصلاة والسلام) بە بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەکانەوە بۆ لاتان ڕەوانەکران، وە ئەوەش کە گوتتان (واتە: قوربانییەك کە ئاگر بێتە خواریٚ لە ئاسمانەوە بیسووتێنیٚ، کە ئەوە موعجیزەیە) بۆی هێنان، ئەدی بۆچی هەر کوشتتانن ؟! یانی: بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان بۆ هێنابوونو، قوربانییەکیشیان بۆ هێنان کە سەریان دەبڕیٚو ئاگر لە ئاسمانیٚ دەهاتە خواریٚو دەیسووتاند لە پێش چاوی ئێوە، ئەدی بۆچی هەر کوشتیشتانن، ئەگەر ڕاست دەکەن، واتە: ئێوە هەر ناتانەوێ ئیمان بێنن، هەر ڕێزی پێغەمبەران ناگرن، هەر ئیمانتان تەواو بە خوای پەروەردگار نیه، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر باسی ئەو قوربانییە دەکەین، کە ئاگر لە ئاسمان هاتۆتە خواریٚو سووتاندوویەتی، کە ئەوە لەنێو بەنی ئیسرائیلدا بووە، لە سەردەمی مووساو لە سەردەمی پێغەمبەرانی دیکەش

لە بەنی ئیسرائیلدا بووە، كە قوربانییان سەربڕیوە، وە ئاگر لە پێش چاوی ئەوان لە ئاسمانێ هاتۆتە خوارێو سووتاندوویەتی، كە ئەوە نیشانەی ئەوە بووە، ئەو قوربانییە خوای پەروەردگار قبوولی كردوە، جا ئەوان داوایان كردوە پێغەمبەریش ﷺ ئاوایان بۆ بكات، تاكو بزانن پێغەمبەری خوایە، خوای بەرزیش وەڵامیان دەداتەوە كە لەوە پێش پێغەمبەرانی وا هەبوون، هەم موعجیزەو بەڵگەیان بۆ هێنان، وە هەم ئەم جۆرە قوربانییەشیان بۆ هێنان، كە ئەویش یەكێك بوو لە بەڵگەكان، ئەدی بۆچی كوشتیشتانن ؟! كەواتە: ئێوە پەكتان لەسەر ئەوە نەكەوتوە، وە ڕۆژگاری ئەو جۆرە موعجیزانەش بەسەرچووەو، بەشەر گەیشتۆتە قۆناغێكی دیكەو پێویستە موعجیزەیەكی عەقڵیی‌و فیكریی بۆ بهێنرێ تاكو بمێنێتەوە، نەك موعجیزەیەك بێ بەس لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پێشانی خەڵكی بدرێو، دوای خۆی ئەو موعجیزەیە نەمێنێ، وەك موعجیزەی هەموو پێغەمبەران كە وابووەو بەستراوەتەوە بە ڕۆژگاری خۆیانەوە، بۆ وێنە: گۆچانی مووسا بۆ كاتی خۆی بوو، وە هەتا خۆی لە ژیان دابوو موعجیزە بوو، ئێمەش بڕوامان پێیەتی، بەڵام ئێستا وەك بەسەرهات دەیزانین، وە موعجیزەی عیسا كە لە قوڕ باڵندەی دروست كردوەو، بەڵەكو كوێری زگماكی چاككردۆتەوە، وە مردووی زیندوو كردۆتەوە، ئەوە بۆ ڕۆژگاری خۆی بووە، بەڵام ئێستا بۆ ئێمە نابێتە موعجیزەیەك كە ئیمانی لەسەر بێنین، بەڵام قورئان موعجیزەیە هەتا دنیا دنیایە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَذَّبُوكَ ﴾، واتە: (ئەی موحەممەد) ئەگەر تۆیان بە درۆ دانا، بڕوایان پێنەهێنای، دڵت لەخۆت دانەمێنێو خەفەتی پێمەخۆ، ﴿ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴾، پێغەمبەرانێكی زۆر لە پێش تۆدا بە درۆ زانران، بڕوایان پێنەهێنرا، لە حاڵێكدا كە هیچ پەكیشیان لەسەر بەڵگان نەكەوتبوو، ﴿ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴾، بەڵگەی ڕوونو ئاشكرایان هێنابوو،

موعجیزەی وایان هێنابوو کە بەرانبەرەکانیان دەستەوسان بکات، هەر کامێکیان زەبوور[1] و کتێبی ڕۆشنیشیان هێنابوو، کە زەبوور لێرەدا دەگونجێ ئەو پەندو ئامۆژگاریانەبن کە دەچنە نێو عەقڵەوە ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ﴾، واتە: کتێبی ڕۆشنکەرەوە، ئەو یاسا شەرعییانەی کە لەڕێی شەرعەوە نەبێ نازانرێن، واتە: ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) هەرچەندە ئەوانەیان هەموو پێبوو، بەڵام دیسان زۆر لە خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان بڕوایان پێنەهێنان، کەواتە: تۆش بەوە خەفەت مەخۆ کە هەندێك لەوانە یاخیین و بڕوات پێناهێنن، هەرچەندە بەڵگەت هێناوەو وەحییشت لەلایەن خواوە پێدراوە.

ئنجا خوا ﷻ باسی ژیانی دنیا دەکات، چونکە زۆربەی خەڵك کە لەڕێ لادەدەن و لە خوا دوور دەکەونەوەو تووشی دنیاپەرستیی و طاغووتپەرستیی و ئارەزووپەرستیی دەبن، بە هۆی خۆشویستنی دنیاوەیە، کە دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ﴾، هەموو نەفسێك دەبێ چێژەری مردن بێ، دەبێ مردن بچێژێ، (نفس) واتە: ڕووح، کە لەنێو بەدەن دایە، ڕووح هەتا لەنێو بەدەن دایەو پێش ئەوەی لە جەستە بێتە دەرێ پێی دەگوترێ: نەفس، بەڵام کە لە بەدەن دەرچوو پێی دەگوترێ: ڕووح، هەر بۆیە ڕووح وەکو حەقیقەتی خۆی نە زەم دەکرێ، نە مەدح دەکرێ، بەڵام دوای ئەوەی کە دەچێتە نێو جەستەوە، زەمیش دەکرێ و مەدحیش دەکرێ، وەك: خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧﴾ الفجر، لەولاشەوە کە دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ... ٥٣﴾ یوسف، زەمیش دەکرێ و مەدحیش دەکرێ، چونکە ڕووح تا نەچێتە جەستەوە، نەخێری لەدەست دێ، تا مەدح بکرێ، وە نە خراپەشی لەدەست دێ، تاکو زەم بکرێ، کەواتە: هەموو نەفسێك دەبێ مردن بچێژێ، ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ

---

١) الزُّبُر: جمع زَبور، وهو الكتاب.

أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، بەڵام کرێیەکانتان، پاداشتەکانتان لە ڕۆژی دواییدا وەردەگرنەوە، (أجور) کۆی (أجر)ە، یانی: پاداشت، جا چ سزابێ بۆ خراپەکاران، چ پاداشت بێ بۆ چاکەکاران، بە تەواویی وەریدەگرن، ﴿ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ﴾، جا هەر کەسێك لە ئاگر دووربخرێتەوە، وشەی: (زحزح) واتە: وردە وردە بخلیسکێنرێ، واتە: ئەگەر وردە وردەش بخلیسکێنرێن و بخرێنە نێو بەهەشتەوە، ئەوە بردوویانەتەوەو بە مراز گەیشتوون، ﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾، وە ژیانی دنیاش جگە لە ڕابواردنێکی کەمی فریودەر هیچی دیکە نیە، (متاع) هەرشتێکە ئینسان بۆ ماوەیەکی کەم لێی بەهرەمەندبێ، (غُرور) واتە: فریودان، (غَرور)یش واتە: فریودەرە، واتە: ڕابواردنێکی کەمی فریودەرە بۆ کەسانێك کە دیارە لە خواو لە ڕۆژی دوایی بێئاگان، ئەگەرنا ئەوەی کە ئیمانی بە خواو بە دوارۆژ هەبێ، فریوی دنیا ناخواو پێی هەڵناخەڵەتێ، بە شێوەیەك کە بیکاتە ئامانج و لە باوەشی بگرێ و، خواو خەڵکی لەبیر بەرێتەوە، ئنجا خوای پەروەردگار ڕوو لە ئیمانداران دەکات و دەفەرموێ: ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ﴾، ئەو (لام)ە، بۆ تەئکیدە، (نون)ەکەش بۆ تەئکیدە، واتە: بە تەئکیدو بە مسۆگەریی لە ماڵ و سامانتانداو لە نەفسی خۆشتاندا تاقی دەکرێنەوە، (مادام بتەوێ بەڕێی خوادا بڕۆی، هەم لە ماڵ و سامانتدا تووشی خەسارەت و زەرەرو زیان دێی، هەم لە نەفسی خۆشتدا تووشی نارەحەتیی دێی) وە دڵنیاو مسۆگەربن، کە لەوانەی پێش ئێوە کتێبیان پێدراوەو، لەوانەش کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، واتە: لە کافرەکانی خاوەن کتێب و بێ کتێب، جا خۆی کافر دوو جۆرە، یان خاوەن کتێبن، یان بێ کتێبن، واتە: یان کتێبێکی ئاسمانییان لەبەردەستەو گۆڕیویانە، یان بێ کتێبن و بڕوایان بە هیچ کتێبێکی ئاسمانیی

نیـە، کـە بەرنامـەی ژیـانو گوزەرانیـان بـێ، وەك: عەلـمانییەکان[1]، واتـە: لـە کافرەکـانو ناحـەزەکانتان چ خـاوەن کتێـب بـن، چ بـێ کتێـب، ئـازارێکی زۆر دەبیستن، ئازاری زۆر دەبیستن یانی چی ؟! یانی قسـە بە خـوا ﷻ دەڵـێن، قسـە بە پـێغەمبەر ﷺ دەڵێن، قسە بە قورئـان دەڵێن، قسە بە ئیسلام دەڵـێن، قسـە بـە خۆتـان دەڵـێن، درۆتـان بـۆ هەڵدەبەسـتن، بوختانتـان بـۆ دەکـەن، بانگەشـەی خراپتان لەسەر دەکەن، ئەوە هەمووی دەگرێتـەوە، ئنجا ئایا چارەسـەرو تەگبیـر چییـــە ؟ ﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾، وە ئەگـــەر خۆڕاگـربنو پارێزکـاربن، ئـەوە ئـەو خـۆڕاگرییو پارێزکـارییە، لـەو کارانەیـە کـە پـێویستی بە عەزیمـەتو ئیـرادەی پتـەو دەکـات، یاخـود لـەو کـارانەیــە کـە خـوا ﷻ زۆر جەختـی لەسەر کردۆتـەوە، کە دەبـێ زۆر خۆڕاگـرو پارێزکـاربن.

ئنجا خـوای زانـاو شارەزا ڕاسـتییەکی مێژوویی دەخاتەڕووو دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ﴾، وە یـــــاد بکـەوە کـاتێك خـوا پەیمانێکـی پتـەوی لەوانـەی کـە کتێبیـان پـێـدراوە، وەرگـرت، پەیمانی لێوەرگرتن لەسەر ئەوە کە ئـەوەی خـوا پـێـی داون، دەبـێ ڕایبگـەیەننو نەیـشارنەوە ﴿فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ﴾، بـەڵام ئـەو پـەیامو دینـەی خـوایان فڕێدایـە پاش پشتیان، ئینسـان کـە شتێکی پـێ زۆر بـێ ئەمیـەت بـێ، ئـاوا فڕێـی ناداتە پـێش خۆی، بەڵکو فڕێی دەداتە پاش پـشتی، ﴿وَٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗا﴾، وە نرخێکـی کـەمیان پـێ کـڕی، واتـە: ئـەو ڕاسـتییانەی دینـی خـوایان شـاردەوە لـە

---

١) دیارە عەلمانیی ئەگەر بە مانای وشە عەلمانیی بێ، ناگونجێ بڕوای بە هیچ کتێبو بەرنامەیەکی خـواییو ئاسـمانیی هەبـێ بـۆ ڕێکخـستنو بـەڕێوەبردنی ژیـانو گـوزەرانی کۆمەڵـگا، بابـای واش بێگومـان بـە مـسوڵمان دانـانرێ، چونکـە مـسوڵمان کەسـێکە کـە لـە هـەموو بوارەکـانی ژیانیـدا ملکەچی شەریعەت بێ، بۆ بەرچاوڕوونیی زیاتریش لەبارەی سیکۆلاریزمەوە، دەتوانی سەرنجی کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) و کتێبی: (تەوژمی ئیسلامییو عەلمانیی...) بدەی.

بەرانبەر نرخێکی کەمدا، ئەو دەستکەوتە کەمە، ئەگەر هەموو دنیاش بێ هەر کەمە، ئینسان دینی خوا بشارێتەوەو شتێکی دەستکەوێ، فەتوایەك بە غەڵەت بداتو مل بە ئایەتێك بسووڕێنێ، بۆ ئەوەی شتێکی دەستکەوێ، ئەو شتە هەرچەند زۆریش بێ، هەر کەمە، بۆ زانیارییتان ئەگەر بابای دینفرۆش هەموو دنیاشی لەسەر تاپۆ بکەن، هەر بە نرخێکی کەمو بەهایەکی کەم دادەنرێ، ئەو دنیایەی کە تۆ دەستت دەکەوێ لە بەرانبەر شاردنەوەی هەقدا، ئەگەر زۆریش بێ هەر کەمە، هەر هیچە، ﴿ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾، خراپترین شت بوو کە کڕییان، کە مەبەست پێی ئەو تۆزە دەستکەوتە دنیاییەیە، جا دوایی ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، کە ئەوە تایبەت نیە بە خاوەن کتێبەکانەوە، بەڵکو ئەوە مسوڵمانانیش دەگرێتەوە.

وە لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا ﴾، پێتان وانەبێ ئەوانەی کە دڵخۆش دەبن بەوەی کە دەیکەن، واتە: بە کردەوەی خراپ کە دەیکەنو پێی دڵخۆشن ﴿ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا ﴾، وە حەزیش دەکەن ستایش بکرێن، بە شتێك کە نەیانکردوە، واتە: کردەوەی چاك، بە کردەوە خراپەکانیان دڵخۆشنو شانازیی پێوە دەکەنو خۆی پێ هەڵدەکێشن، وە بەنسبەت چاکەشەوە پێیان خۆشە باس بکرێن لە کاتێکدا کە نەیانکردوە، ئا ئەوانە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، پێتان وانەبێ سەرفراز دەبنو دەرباز دەبن، هەرگیز ئەوانە دەرباز نابن، ئنجا بە حەقیقەت ئەوانە کەسانێکی زۆر خراپن کە شانازیی بە خراپەکەنیانەوە دەکەن، چاکەیەکیش کە نەیانکردوە، حەزبکەن بیاندەنەپاڵ، بڵێن: تۆ شاخت واو باڵت وا، ماشاء الله جەنابت حاڵو حیسابت واو وایە !! لە حاڵێکدا کە هیچیشی نەکردبێ !! بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوانە پێتان وانەبێ سەرفرازو دەرباز دەبن لە سزای خواو لە ئازاری خوا، وە ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، ڕەنگە لێرەدا

پرسیارێك بێتە پێشێ: ئایا خوا دەتوانێ ئەوانە سزا بدات ؟ بۆیە دەفەرموێ: موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هی خوایە، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، کەواتە: کە خاوەنی ئاسمانەکانو زەوی بێ، خاوەنی مەخلووقات بێ، لە سەری بۆ خواریێ، هەڵبەتە لە قورئاندا هەمیشە ئاسمانو زەوی پێکەوە دێن، واتە: بوو (وجود) هەمووی (علوّیە وسُفلیە) سەرو خواری، موڵکی وی بێو لەسەر هەموو شتێك بە توانابێ، ئەوانە چۆن لەدەستی دەرباز دەبن ؟! بە تەئکید دەرباز نابنو سزای پڕ بە پێستی خۆیان وەردەگرن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾، پێشتریش باسمان کرد کە ئەوە قسەی جوولەکەکانە، کە خوای پەروەردگاریان بە هەژارو بە نەدار ناوزەد دەکردو، خۆشیان بە دەوڵەمەند ! جا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟

أ- ئەوەی لێ وەردەگرین وە لە گەڵێ ئایەتی دیکەش، کە جوولەکەکان بەتایبەت وە خاوەن کتێبەکان بەگشتی، بەرانبەر بە خواو بەرانبەر بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)، وە بەرانبەر بە کتێبەکانو، پەیامەکانی خوا، بێئەدەبیی زۆریان نواندوە، وە لەڕاستییدا تەنیا لە ئیسلامدا تێڕوانینی ڕاستو دروست بەرانبەر بە خوا ﷻ، وە کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانی (علیهم الصلاة والسلام) هەیە، ئەویش لە ئەنجامی ئەوەدا کە کتێبەکانی دیکەی خوای بێوێنەو بەرنامەکانی دیکەی، کە بۆ پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوون، هەموویان گۆڕدراونو دەستکاریی کراون، دیارە هەر شتێکیش کە دەستکارییکراو گۆڕدرا، کەموکووڕییو ناتەواویی تێدا پەیدادەبێ، بۆیە بەشەر ئەگەر بیەوێ بە شێوەیەکی ڕاستو دروست تەماشای خوای پەروەردگار بکات، وەك زاتی،

سیفەتەکانی، ناوه هەره بەرزەکانی، کردەوەکانی، دەبێ لە ڕوانگەی قورئانەوە تەماشای بکات، ئێمە ئەگەر تەماشای تەورات بە تایبەت، وە کتێبەکانی دیکەی کە بەناوی پەیمانی کۆن (العهد القديم)ەوە کۆکراونەتەوە، هەروەها تەماشای چوار ئینجیلەکانو ئەو کتێبانەش کە لەگەڵ چوار ئینجیلەکان کۆکراونەتەوە، بکەین[1]، شتی گەلێك بێسەروبەریان تێدا دەبینین، کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ مەقامو پایەی بەرزی خوای بێ وێنە، وە لەگەڵ پایەی پێغەمبەراندا (عليهم الصلاة والسلام) ناگونجێ، کە دیارە دەرفەت نیە ئێمە ئێستا ئاماژەی پێبدەین، بەڵام هەروا وەك ئاماژەیەکی کورت دەڵێین: بۆ وێنە: لە تەوراتدا هاتوە کە خوا ﷻ دوای ئەوەی کە ئادەم لە درەختە قەدەغەکراوەکە دەخوا، ئادەم لەنێو درەختەکانی بەهەشتدا خۆی دەشارێتەوە، خواش بانگی دەکات: ئادەم لە کوێی ؟! دەڵێ: خۆم شاردۆتەوە، دەفەرموێ: بۆچی خۆت شاردۆتەوە، ناکا لە درەختە قەدەغەکراوەکەت خواردبێ ؟ دەڵێ: بەڵێ لەویم خواردوە، وە ڕووت بوومەتەوە لەبەر ئەوە پێم عەیبە[2].

کە دیارە ئەوە شایستەی خوای پەروەردگار نیە کە نەزانێو بپرسێ: ئادەم لە کوێ خۆت شاردۆتەوە؟ وە نەزانێ ئادەم لەبەرچی بەرگو پۆشاکیی لێ داڕنراوە ! ئنجا ئەوە لە کوێو ئەوە لە کوێ کە خوا ﷻ لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ ...إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾النساء، واتە:

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)، ط: (٢٠٠٢)، القاهرة، مصر، کە هەردووك (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نوێ)ی تێدانو هەمووی (٣٠٣٨) لاپەڕەیەو پەیمانی کۆن (٣٩) کتێبو پەیمانی نوێ (٣٧) کتێبە.

٢) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)، سفر التكوين، الإصحاح: (٣)، سقوط الإنسان، ص: (١٤). کە ئەوەی من هێناومە پوختەکەیەتی ئەگەرنا زیاترەو ئەمەش دەقەکەیەتی:

(فنادى الربُّ الإله آدمَ: أينَ أنت ؟ فأجاب: سمعت صوتك في الجنَّة فاختبأتُ خشية منك لأني عُريان، هل أكلت من ثمر الشجرة التي نَهَيْتكَ عنها ؟ فأجاب آدم، إنَّها المرأة التي جَعَلْتها رفيقةً لي، هي التي أطعَمَتْني من ثمر الشجرة فأكلتُ...).

بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە، وە دەفەرمویٚ: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾﴾غافر، واتە: بێگومان خوا بینەری هەموو بەندەکانییەتی، یانی هەمیشە بەندەکانی دەبینیٚ، بگرە هەموو شتێك دەبینیٚو چاودێرە بەسەریانەوە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾النساء، واتە: بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە، بەڕاستی پێناسەی خوای بیٚ وێنە، وە تیٚڕوانین بەرانبەر خوای تاكو پاك، وەك بۆ خوا شایستەیە، هەر ئەوەیە کە لە قورئاندا هەیە، قورئانێك کە خوا پاراستوویەتی لە دەستکارییکران، ئەگەرنا بە تەئکید هەموو کتێبەکانی خواو لە نێویان دا تەوراتو ئینجیلیش، لە ئەسڵدا هیچ شتێکیان تێدانەبووە کە شایستەی خوا نەبیٚ، بەڵام دوای ئەوەی کە بەشەر دەستکاریی کردوونو قسەی خۆی تێئاخنیون، سەرەنجام خوا ﷻ لەو کتێبانەدا، وەك مرۆڤێك وێنا دەکریٚ، لە حاڵێکدا کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿... لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشوری، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە (نە لە ناوی، نە لە سیفەتی، نە لە کردەوەکانیدا)، وە ئەو (واتە: خوا) بیسەری بینەرە، یانی: قسەی بەندەکانی دەبیستیٚ، وە کردەوەی بەندەکانی دەبینیٚ.

ب- واش پێدەچیٚ کە گوتوویانە: خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین، بە توانجەوە وایانگوتبیٚ، واتە: مەبەستیان توانجگرتن بووبیٚ لە ئیسلامو لە پێغەمبەری ئیسلامو لە مسوڵمانان، کە خوا لە قورئاندا دەفەرمویٚ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا ...﴿٢٤٥﴾﴾البقرة، واتە: کیٚ هەیە قەرزێکی باش لەگەڵ خوادا بکات ؟ پوختەی مەبەست ئەوەیە کە: ئەوان بەو قسەیان توانجیان لە ئیسلام گرتبیٚ، کە ئیسلام هانی مسوڵمانان دەدات بەوەی کە ماڵی خۆیان ببەخشن بە خوا، یانی: بیبەخشن بە هەژارانو

نەداران‌و پاداشتەکەی لە خوا وەربگرنەوە، بەڵام هەرچۆنبێ ئەم جۆرە تەعبیرو قسەیە، هەر بێئەدەبییە جا چ بە جیددیی یان بووبێ، خوایان بە هەژارو نەدار دانابێ‌و، خۆشیان بە دەوڵەمەند، وە چ بە توانجەوە وایانگوتبێ، چونکە ئینسان بە گاڵتوز بە سوعبەتیش، نابێ بێئەدەبیی بەرانبەر بە خوا ﷻ‌و بەرانبەر پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و کتێبەکانی خوا، بکات.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ﴾، واتە: (ئەوەی کە گوتوویانە) لەسەریان تۆمار دەکەین، هەروەها کوشتنی پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) کە بە ناهەق کوشتوویانن، وەك پێشتریش باسمان کرد، دیارە لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەدا تەنیا یەك پێغەمبەر هەبووە، پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، وە ئەویشیان بە کردەوە بۆ نەکوژراوە، ئەدی مەبەست پێی چیە کە کوشتنی پێغەمبەران پاڵدەداتە لای ئەو جوولەکەو خاوەن کتێبانەی کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دا ژیاون ؟ توێژەرەوانی قورئان ئەم ئایەتەیان بە دوو واتا تەفسیر کردوە:

**یەکەم**: خوای پەروەردگار جوولەکەو نەصرانییەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ بە تایبەتی جوولەکەکان، بە بەشدار لە کوشتنی پێغەمبەراندا لەقەڵەم داوە، لەبەر ئەوەی ئەو جوولەکانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕێبازی باب‌و باپیرانیان ڕۆیشتوون، وە ئەوانیان بەڕاست زانیوەو لە ڕچەو ڕێبازی ئەوان لایان نەداوە، کەواتە: بەشداریش بوون لە کوشتنی پێغەمبەراندا لەگەڵیان.

**دووەم**: لەبەر ئەوەی چەند هەوڵێکیان داوە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بکوژن، بۆیە خوا ﷻ بەپێی نیەتەکەی خۆیان هەرچەندە بە کردەوە بۆیان جێبەجێ نەبووە، بەڵام بەپێی ئەو عەزمو نیەتەی کە دڵی

خۆیانیان لەسەر ساغ كردۆتەوە، ئەو گوناهەی لەسەر تۆمار كردوون، ئنجا ئەو مەسەلەیە ڕاستییەكی كۆمەڵناسیی لێ وەردەگیرێ، ئەویش ئەوەیە كە كۆمەڵگای بەشەریی جیلەكانی كە بە دوای یەكدا دێن، وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك هەموویان تەواوكەری یەكدین، تەماشا دەكەی خوا ﷻ ئەو گوناحو كەتنو خراپانەی كە پێشینانی جوولەكەكان كردوویانن، چەند هەزار ساڵ لەوەو پێش، لەسەر جوولەكەكانی سەردەمی پێغەمبەری ﷺ حیسابی كردوون، چونكە كۆمەڵگاو میللەتانو ئۆممەتان جیلو وەچەكانیان، وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك پێكەوە پەیوەستن، وە بە تەئكید كردەوەی پێشینەكانی جوولەكەكان كاریگەریی هەبووە لەسەر پاشینەكانیان، وە هەموو كۆمەڵگایەكی بەشەرییش هەر بەو شێوەیەیە، دیارە جیلە پێشووەكان لەسەر جیلە پاشینەكان هەم كاریگەریی چاكو، وە هەم كاریگەریی خراپیشیان هەیە، مەگەر ئەوانەی كە بەرائەت بكەن لە خراپەی پێشینەكانی خۆیان، وە لە ڕچەو ڕێبازی خراپی ئەوان لابدەن، ئەوكاتە دیارە باجی خراپەكانی ئەوان نادەن، وە خراپەكانی ئەوانیان لەسەر حیساب ناكرێ، بەنسبەت چاكەشەوە هەروایەو، چاكەش كاریگەریی هەیە با پێشتر بابو باپیرانیش كردبیان، لەسەر وەچەو ڕۆڵەكانیان كاریگەریی هەیە، ئایەتی (٨٢)ی سووڕەتی (الكهف)یش بەڵگەیە لەسەر ئەوە، كە خوا ﷻ كاتێك كە باسی ئەو دوو منداڵە هەتیوە دەكات، كە بەندە صاڵحەكە دیوارەكیان بۆ چاك دەكاتەوەو، دەفەرموێ: ﴿ ... وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ...﴿٨٢﴾ ﴾، واتە: وە بابیان پیاوێكی باش بوو، جا بابیان چ بابی خۆیان، چ باپیریان بووبێ چ پێشتر بووبێ، وەك هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن، گرنگ ئەوەیە چاكیی بابو باپیران، كاریگەریی هەیە بۆ سەر چاكیی ڕۆڵە، هەروەك خراپەشیان كاریگەریی هەیە، بەڵام ئینسان دەتوانێ خۆی لە خراپەی پێشینانی بپارێزێ، بەوەی كە دەستبەرداری بێو بەرائەتی لێ بكات.

**مەسەلەی سێیەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾، واتە: ئەوە بەرهەمی كردەوەی دەستی خۆتانە، وە بێگومان خوا ستەمكار نیە لە بەندەكانی، لێرەدا لە نێوان دوو دەستە لە مسولْمانان، كە موعتەزیلەكانو ئەشعەریی یەكانن، مشتومڕ هەیە لەوبارەوە كە: ئایا ئەگەر خوا ﷻ سزای بەندەكانی خۆی بدات، بێ ئەوەی كە خراپەیان كردبێ بە ستەمكار لەقەڵەم دەدریٚ ؟!

**ئەشعەریی یەكان:** شوێنكەوتووانی ئەبو حەسەنی ئەشعەریی گوتوویانە: نەخێر، واتە: ئەگەر خوا بەندەی خۆی سزا بدات، بێ ئەوەی كە گوناهی كردبێو بیخاتە دۆزەخەوە، بە ستەمكار دانانریٚ، بۆچی؟ دەڵێن: چونكە خوای پەروەردگار تەصەڕڕوف لە موڵكی خۆیدا دەكات، خاوەنێكیش بە هەر شێوەیەك تەصەڕڕوف لە موڵكی خۆیدا بكات، بە ستەمكار لەقەڵەم نادریٚ.

**بەلاّم موعتەزیلەكان:** دەڵێن: بەڵێ، ئەگەر خوا بەندەی خۆی سزا بدات، بێ ئەوەی كە گوناهی كردبێو بیخاتە دۆزەخەوە، بە ستەمكار دادەنریٚ.

ئنجا ئایا لەم دوو ڕایە كامیان ڕاستترە؟ لە وەلاّمدا دەڵێین: ئینسان هەر تەماشای ئایەتەكە بكات وەلاّمەكەی دەستدەكەویٚ، چونكە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، وە كە پێیان دەڵێین: سزای سووتێنەر بچێژن ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾، واتە: ئەوە بە هۆی ئەوەوەیە كە دەستتتان پێشی خستووەو خوا ستەمكار نیە لە بەندەكانی، كەواتە: هەر لە ڕواڵەتی ئایەتەكە وەردەگیریٚ، كە ئەگەر خوا ﷻ بەبێ خراپەو تاوانكردن، بەندەكانی سزا بدات، بە ستەمكار لەقەڵەم دەدریٚ، كەواتە: قسەی موعتەزیلە ڕاستە.

بەلاّم ئێمە دەڵێین: ئەو جۆرە پرسیاركردنە هەر لە خودی خۆیدا هەڵەیە، واتە: پرسیاركردنێكی بەم شێوەیە: ئایا ئەگەر خوا بەندەكانی

خۆی بەبێ گوناحو خراپە سزا بدات، بە ستەمکار لەقەڵەم دەدرێ ؟! هەڵەیە چونکە خوای دادگەر هیچ سیفەتو کردەوەیەکی خراپی لێ ناوەشێتەوە، ئێمە دەڵێین: (سُبْحَانَ اللَّهَ) واتە: خوا پاكو بێگەردە، وە دەڵێین: (سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ) واتە: خوا پاكو خاوێنە، وە دەڵێین: (الحَمْدُ للَّهَ) واتە: خوا شایستەی هەموو مەدحو ستایشێکە، کەواتە: خراپەو کەموکووڕیی لە خوای بێ وێنە ناوەشێتەوە، بۆیە ئەگەر پرسیارێکی بەو شێوە بکرێ دەربارەی خوای دادگەر، ئەوە هەر لە خودی خۆیدا هەڵەیە، چونکە خوای پەروەردگار زوڵمو خراپەی لایق نیەو لێی ناوەشێتەوە، وە هەموو سیفەتێکی خوا بەرزو پەسندەو هەموو ناوێکی بەرزو چاکە، وە هیچ هەڵەو کەموکووڕییەك لە خوای پەروەردگاردا نیە، نە لە زاتی، نە لە سیفەتی، نە لە ناوەکانی، نە لە کردەوەکانی، وە نە لە هەر شتێکدا کە پەیوەندیی بە خوای دادگەرەوە هەیە.

ئنجا ڕاستیش نیە کە هەر خاوەنێك چۆن هەڵسوکەوت لە موڵکی خۆیدا بکات هەر ڕەوابێ، ئایا کەسێك ماڵو سامانی خۆی بەهەدەر بدات، یان بێهوودە خەرج بکات ڕەوایە ؟ بێگومان نەخێر، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا ﴿٢٧﴾﴾ الإسراء.

(إبن کثیر) لەبارەی (تبذیر)ەوە گوتوویەتی: (قال إبن مسعود: التبذیر: الإنفاق في غیر حق... وقال قتادة: التبذیر: النفقة في معصیة الله تعالی...)[1]. وەك دەبینین خوای کاربەجێ (تبذیر)ی قەدەغە کردووەو (مبذرین) یشی بە برایەکانی شەیتانان داناونو (تبذیر)یش بە ماڵ خەرج کردنی بە ناهەقو ماڵ خەرجکردن لە گوناهو خراپەدا تەفسیر کراوە، کەواتە:

---

١) المصباح المنیر، ص: (٧٦٥).

ڕاست نیە کە هەر خاوەنێك بۆی هەبێ بە ڕەهایی لە موڵکی خۆی دا هەڵس‌وکەوت (تصرُّف) بکات !

ئنجا بۆچی بە (صِیغَةُ المُبَالَغَة) هێناویەتی‌و دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾ ؟! چونکە (ظلام) واتە: زۆر ستەمکار، کە (صِیغَةُ المُبَالَغَة)ی (ظَالِم)ە، زانایان دوو وەڵامیان هەن:

**یەك**: لەبەر ئەوەی ئەگەر گریمان ستەم‌و زوڵم سیفەتی خوا بووایە، دەبووایە بگاتە ئەوپەڕی، وەك چۆن خوای پەنهانزان هەموو شتێك دەزانێ‌و ئەوپەڕی زانیاریی هەیە، وە ئەوپەڕی بەزەیی هەیە، وە ئەوپەڕی حیکمەتی هەیە، بە هەمان شێوە، ئەگەر ستەمیش یەکێك بووایە لە سیفەتەکانی خوا، کە دیارە لە خوا ناوەشێتەوە، دەبوو ئەوپەڕی ستەمی هەبووایە.

**دوو**: لەبەر ئەوە بە (صِیغَةُ المُبَالَغَة) هێناویەتی، چونکە بەبێ گوناح‌و تاوان سزادانی ئینسانەکان گەورەترین ستەمە، کە دیارە خوای دادگەر تۆزقاڵێك زوڵم‌و ستەمیشی لێ ناوەشێتەوە، چ جای زوڵم‌و ستەمێکی زۆر[1] !!

**مەسەلەی چوارەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ ﴾، واتە: ئەوانەی کە گوتیان: خوا ئێمەی ڕاسپاردوە کە متمانە بە هیچ ڕەوانەکراوێك نەکەین، باوەڕ بە هیچ پێغەمبەرێك نەکەین، تاکو قوربانییەکمان بۆ دێنێ‌و ئاگرێك بیسووتێنێ، لێرەدا دەپرسین ئایا ئەو جۆرە قوربانییە چۆن بووە؟

١) دیارە بەم دوو وەڵامەش ئەو ئیشکالە نامێنێ کە دەڵێ: بە لابردنی ستەمی زۆر ستەمی کەم لاناچێ، واتە: ئەوە کە خوا عزّ وجل زۆر ستەمکار (ظَلاّم) نیە، مانای وانیە کەم ستەمکار (ظَالِم) نیە، چونکە حیکمەتی ئەو صیغەیە ئەو دوو شتەیە کە باسمان کرد.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس - خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ-، بۆمان ڕوون دەکاتەوە: (كَانَ الرَّجُلُ إِذَا تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَتُقُبِّلَتْ مِنْهُ، بَعَثَ اللهُ نَاراً مِنَ السماءِ فَنَزَلَتْ عَلَى القُرْبَانِ فَأَكَلَتْهُ)[1]، واتە: لە سەردەمی پێشوودا (واتە: لەنێو بەنی ئیسرائیلدا) پیاوێك کە خێرو چاکەیەکی دەکرد (ماڵ و سامانێکی دەبەخشی) ئەگەر لێی قبووڵ بکرابایە، خوا ئاگرێکی لە ئاسمان ڕا دەنارده خوارێ، دەکەوتە سەر ئەو قوربانییەو دەیسووتاندو دەیخوارد (ئەوە نیشانەی ئەوە بوو کە ئەو قوربانییە قبووڵ بووە).

جا ئایا ئەو جۆرە قوربانییە هەبووە ؟ بەڵێ هەبووە، چونکە خوای زاناو شارەزا بۆ خۆی دەفەرمووێ: ﴿قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ ﴾، واتە: بڵێ: لە پێش مندا پێغەمبەرانێك هاتن بە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانەوە، وە بەوەش کە گوتتان، ئنجا ئایا ئەوە کە گوتیان چی بووە؟ ﴿يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ ﴾، قوربانییەکمان بۆ بێنێ کە ئاگر بیخوات، کەواتە: مادام خوا فەرموویەتی، تەواو، مەجالی قسە تێداکردنی نییە، بۆیە (تأويل)ی شێخ موحەممەد عەبدە تەئویلێکی هەڵەیە، کە دەڵێ: (وَيَجوزَ وَهُوَ الأظْهَرُ: أَنْ يَكُونَ مَعنى: ﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ ﴾، أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْنا تَقْرِيبُ قُربَانٍ يُحْرقُ بالنَّار)[2] وەك موحەممەد ڕەشید ڕەزا هێناویەتی ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێ، واتە: دەگونجێ مەبەست لەم ڕستە قورئانییە ئەوەبێ کە ئەویش ئاشکراترەو دیارترە، واتە: دەبێ قوربانییەکمان لەسەر فەرز بکرێ، کە دوایی خۆمان بە ئاگر بیسووتێنین، بەڵام لەڕاستییدا ئەو تەئویلە هەڵەیە، چونکە لە ڕواڵەتی ئایەتەکە وەردەگیرێ، کە خوا ﷻ ئاگرێك لە ئاسمانەوە بنێرێ و ئەو قوربانییە بسووتێنێ.

---

١) جامع البيان للطبري، ج: (٤)، برقم: (٨٢٠٤).
٢) تفسير القرآن الحكيم، ج: (٤)، ص: (٢٦٨).

ئنجا ئایا ئەوە لە سەردەمی مووسا یان داوودو سولەیمان (علیهم الصلاة والسلام)دا بووە، ئایا لە ڕۆژگاری کام پێغەمبەردا ئەم موعجیزەیە ڕوویداوە ؟! چونکە ئەوە موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە، بۆ وێنە: ئاژەڵێك سەرببڕن جا (مەڕە، بزنە، مانگایە، حوشترە...هتد) لە شوێنێکی تایبەت دایبنێن، ئنجا چاوەڕێ بکەن تاکو لە ئاسمانێ ئاگرێك بێ و بیسووتێنێ، دیارە ئەوە موعجیزە بووە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ! لە وەڵامدا دەڵێین: دەگونجێ لە ڕۆژگاری هەموو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلدا بووبێ، چونکە پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِي ﴾، بڵێ: پێغەمبەرانێك پێش من هاتوونە لاتان بە کۆ (جمع) دەیفەرموێ، واتە: هەر یەك پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو ژمارەیەك لە پێغەمبەران بەو شێوەیە ئەو موعجیزەیان هەبووە، وە لە پەیمانی کۆن (العهد القديم)دا هاتوە، دەڵێ[1]: (ودخل موسى و هارون إلى خيمة الإجتماع، ومالبِثا أَنْ خرجا وباركا الشعب، فتجلَّى مَجْدُ للشعب كلِّه، وخرجت نارٌ عند الربِّ أَحْرَقَتْ ذبيحة الْمَحْرَقَة وَالشَّحْمِ الَّذِي عَلَى الْمَذْبَحِ وعندما شهد الشعبُ هذا، هَتفوا سَاجدين بوجوهٍ منْحنيةٍ، نحو الأرض)، واتە: وە مووساو هاروون چوونە چادری کۆبوونەوەوەو، هێندەی نەبرد کە هاتنەدەرو بۆ خەڵکەکە پاڕانەوە، وە شکۆی پەروەردگار بۆ تێکڕای گەل دەرەوشایەوە، وە ئاگرێك لەلایەن پەروەردگارەوە دەرچوو، کە سەربڕاوی سەر شوێنی لێ سووتێنرانی قوربانییەکەو، ئەو بەز (پیو)ەی لەسەری بوو سووتاندی، وە کاتێك گەل ئەوەیان بینی بە کڕنووش بردنەوە بەرەو زەوی هاواریان کرد.

هەروەها لە (پەیمانی کۆن)دا لەبارەی قوربانییکردنی سولەیمان ﷺو سووتێنرانی قوربانییەکەی بە ئاگرێکی خوایی، هاتوە دەڵێ[2]: (وما إِنْ أَتَمَّ

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، سفر اللاويين، الإصحاح: (٩)، ص: (٢٣١)، بركة هارون و نار الرّب.

٢) سەرچاوەی پێشوو، سفر أخبار اليوم الثاني، الإصحاح: (٧)، ص: (٩٢٤)، نارٌ من السماء.

سُلَيْمَانَ صلاتَهُ نَزَلَت نارٌ مِنَ السماءِ التهمت الْمَحْرَقَة وَالْذَبَائِحُ وملأ مجد الربِّ الهَيْكَل، ولَم يتمكن الكَهْنة من الدخول إلى البيت الرَّب لأن مجد الربِّ مَلأه، وَشَهِدَ جَمِيعُ بني إسرائيل نزول النار على الهَيْكَل فَخرُّوا على وجوههم ساجدين)، واتە: وە هەر لەگەڵ سولەیمان پاڕانەوەکەی تەواوکرد، ئاگرێك لە ئاسمان هاتە خوارو، شوێنی قوربانیی لێ سووتێنرانەکەو سەربڕاوەکانی سووتاندو، شکۆی پەروەردگار پەرستگای (هەیکەل)ی پڕ کردو لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە شکۆی پەروەردگار پەرستگای هەیکەلی پڕ کردبوو کاهینەکان نەیاندەتوانی بچنە نێوی، وە تێکڕای بەنی ئیسرائیل دابەزینی ئاگرەکەیان بینیو، شکۆی پەروەردگاریان لەسەر هەیکەل بینیو، هەموویان لەپەوڕوو کڕنووشیان برد.

کەواتە: بە تەئکید لە ژیانی پێغەمبەر مووسا ﷵو لە سەردەمی پێغەمبەر سولەیمانیش ﷵدا ئەوە بووە، ڕەنگە لە سەردەمی پێغەمبەرانی دیکەشدا بووبێ، یانی: ئەوە وەك عادەتێك بووە، کە خوای پەروەردگار ئەو موعجیزەیەی بە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل داوە، واتە: ئەوە کە خوا ئاگرێك لە ئاسمانەوە بنێرێو ئەو قوربانییە بسووتێنێ، کە لەو شوێنە دانراوە، نەك بۆخۆیان بیخۆن، یاخود بیدەن بە خەڵك.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴾، پێشتریش ئاماژەمان پێدا، کە ئەوە دڵدانەوەی پێغەمبەرە ﷺ، خوا دەفەرموێ: ئنجا ئەگەر تۆیان بە درۆ دانا، بڕوایان بە تۆ نەهێنا، ئەوە لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانی دیکە بە درۆ دانراون، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان پێبووە، زەبووریان پێبووە، کتێبی ڕۆشنیشیان پێبووە، ئەمە وەك ئایەتی: (٣٤)ی سووڕەتی (الأنعام) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِى۟ ٱلْمُرْسَلِينَ

(٣٤) ﴾، واتە: وە بێگومان لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانی دیکە بە درۆ دانران، بەڵام خۆڕاگر بوون لەسەر ئەو بە درۆ دانران (لەسەر ئەو بڕوا پێنەهێنران)ەو، وە لەسەر ئازاردانیان هەتاکو یارمەتی ئێمەیان بۆ هات، وە بڕیارەکانی ئێمە ناگۆڕرێن‌و هەواڵی ڕەوانەکراوانت بۆ هاتوە، کە ئەوانیش وەك تۆ تووشی گرفتاریی‌و نارەحەتیی بوون، واتە: تۆش وەك ئەوان خاوەنی خۆڕاگریی بە، لێرەدا ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە خوای بەرز سێ شتی باسکردوون، کە ئەو پێغەمبەرانە هێناویانن: ﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ﴾:

**یەکەم**: (بیِّنات) کە کۆی (بیِّنة)یە، بەمانای بەڵگەیەکی ڕوون‌و ئاشکرایە، کە مەبەست پێی موعجیزەی پێغەمبەرانە، کە ئیسپاتی دەعوای پێغەمبەرایەتیی خۆیانیان پێکردوە، وەك لە فەرمایشتێکدا کە (بوخاریی موسلیم) دەیگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: {مَا مِنْ نَبِيٍّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ إِلا وَقَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا آمَنَ عَلَى مِثْلِهِ الْبَشَرُ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٤٧٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلِم برقم: (٣٨٣)، واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، مەگەر خوا بەڵگەو موعجیزەیەکی بۆ ناردوە کە خەڵك ئیمانی پێ بێنن، واتە: ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەوە پێغەمبەری خوایەو لەلایەن خواوە هاتوەو ڕاست دەکات.

**دووەم**: ئنجا (زُبُر) کە کۆی (زَبور)ە، واتە: کتێبەکان، دیارە کە (زبور) ناوی ئەو کتێبەیە کە بە پێغەمبەر داوود ﷺ داوە، ئەوەی کە ئێستا بە ناوی زەبوور هەیە لە پەیمانی کۆن (العهد القديم)دا کە زیاتر پەندو قسەی نەستەق پاڕانەوەیەو، کەمتر یاسای شەرعیی تێدا هەن‌و دەگونجێ ژمارەیەك لە پێغەمبەران لەم شێوە کتێبەیان پێ درابێ، واتە: ئامۆژگاریی‌و قسەی نەستەق‌و پەند، کە زیاتر پەیوەندیی بە لایەنی عەقڵ‌و هۆشی ئینسانەوە هەیە، نەك پەیوەندیی بە نادیارەوە هەبێ، یان پەیوەندیی بە حەڵاڵ‌و حەرامەوە هەبێ، بە تایبەت کە پێغەمبەرانی

بەنی ئیسرائیل (علیهم الصلاة والسلام) تەوراتیان لەبن دەستدا بووەو تەوراتیش یاساکانی شەریعەتی تێدابوونو، هەر بۆخۆی تەورات یانی: شەریعەت، لەبەر ئەوە چ داوود، چ سولەیمان، چ پێغەمبەرانی دیکەی بەنی ئیسرائیل (علیهم الصلاة والسلام) بۆ یاسا شەرعییەکان پشتیان بە تەورات بەستوە، بەڵام خوای بێ‌هاوتا هەندێك ئاراستەو تەعلیماتو پەندو ئامۆژگاریی دیکەی بۆ ناردوون، کەواتە: دەگونجێ مەبەست لە (زُبُر) ئەو کتێبانەبن کە پەندو ئامۆژگاریی یان تێدایەو، یاسا شەرعییەکانیان تێدانیە.

**سێیەم**: وە (الكِتابُ الْمُنير)، واتە: کتێبی ڕۆشن یاخود ڕۆشنکەرەوە، ئەگەر لە (أنار)ی (لازِم)ەوە بێ‌و، دەشگونجێ لە (أنار)ی (متَعَدِّي)یەوە بێ، واتە: کتێبێکی ڕۆشن لە زاتی خۆیدا، کە هەموو کەس تێیدەگات، یاخود کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە[1]، کە بەتەئکید کتێبەکانی خوا هەم ڕۆشن بوونو خەڵك بە ئاسانی تێیان دەگات، وە هەم ڕۆشنکەرەوەش بوون، جا ئایا خوای کاربەجێ، بۆچی دەفەرموێ: ئەو پێغەمبەرانە ئەو سێ شتەیان هێناون؟

وا پێدەچێ مەبەست ئەوەبێ کە: ئەی موحەممەد ! ﷺ پێغەمبەرانی پێش تۆش هەرچەندە موعجیزەو زەبوورو کتێبی ڕۆشنو ڕۆشنکەرەوەیان پێ بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلەکانیان ئیمانیان پێیان نەهێنا، کەواتە: تۆش کە کۆتایی پێغەمبەرانی، وە قورئانت بۆ هاتۆتە خوارێو هەم موعجیزەیەو هەم بەرنامەیەو هەم پەندو ئامۆژگارییەو هەموو شتێکە، تۆش غەم مەخۆ، وە چاو لە پێغەمبەرانی دیکەی پێش خۆت بکە لە خۆڕاگرییو دانبەخۆداگرتندا.

---

١) واتە: ئەگەر (منیر) لە ( أنارَ یُنیرُ فهو مُنیر) (لازم)ەوە بێ، مانایەکەی، دەبێتە: ڕۆشن، بەڵام ئەگەر لە : (أنار ینیرُ فهو مُنیر)ی (متعدِّي)یەوە بێ، مانایەکەی دەبێتە: ڕۆشنکەرەوە.
چونکە: (أَنارَ) ئەگەر (لازم) بێ یانی: ڕۆشن بوو، بەڵام ئەگەر (متعدِّي) بوو، یانی ڕۆشنی کردەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾، واتە: هەموو کەسێك چێژەری مردنە، هەموو نەفسێك دەبێ مردن بچێژێ، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ڕووح بە هۆی جیابوونەوەی لە جەستە، لەبەین ناچێ، وەك هەندێك لە فەیلەسووفەکان وایانگوتوە، کە: ڕووح وەك هەناسەیە کە ئینسان مرد ڕووحەکەش کۆتایی پێدێ ! وە هەندێکیان گوتوویانە: ڕووح خوێنە، کە خوێن وەستا ئینسان کۆتایی پێدێ، بەڵام لەڕاستییدا هیچیان وانین، بەڵکو ڕووحە کە وادەکات کۆ ئەندامی هەناسە کاربکاتو، کۆئەندامی سووڕی خوێن کاربکات، وە کۆئەندامەکانی دیکە کار بکەن، بەڵام ڕووح هیچ کام لەمانە نیە، بەڵکو ڕووح وەگەڕخەری ئەو کۆئەندامانەیە، وە لێرەدا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: هەموو نەفسێك چێژەری مردنە، کەواتە: ئەوە کە ئینسان هەست بە ئازارێك دەکات، بەهۆی ڕووحەوەیەو جەستەیەك کە ڕووحی تێدا نەماوە، وەك گوتراوە: (وما لجرح بميت إيلامُ) واتە: برینێك کە لە مردوویە ئازاری نیە، چونکە جەستە کە گیانی تێدانەما هەست بە ئازارو ئێشو ناخۆشیی ناکات، کەواتە: لە کاتی مردندا ڕووحەکە دەمێنێ بۆیە هەست بە ئازاری مەرگ دەکات.

ئنجا ئایا جیاوازیی لە نێوان نەفسو ڕووحدا چییە ؟ کە پێشتریش هەندێکمان لەوبارەوە باسکرد :

ڕووح پێش ئەوەی بچێتە نێو جەستەوەو، دوای ئەوەی لە جەستە دێتەدەر پێی دەگوترێ ڕووح، ئەوەی کە بۆ من دەرکەوتوە ئاوایە، بەڵام ڕووح هەتا لەنێو جەستە دایە پێی دەگوترێ: نەفس، بەڵگەشم بۆ ئەو قسەیەم ئەوەیە کە وشەی ڕووح لە خودی خۆیدا خوای پەروەردگار نە مەدحی کردوە، نە زەمی کردوە، بەڵام وشەی (نەفس)ی لە هەندێك حاڵدا زەم کردوە، وە لە هەندێ حاڵدا مەدحی کردوە، خوا ﷻ دەربارەی ڕووح بە پێغەمبەری خۆی ﷺ فەرمووە: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ

رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾﴾الإسراء، واتە: وە پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ڕووح (کە ئێمە پێی دەڵێین: گیان) بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە، وە بە ئەندازەیەکی کەم نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە، (بەو ئەندازە زانیارییە کەمەش حەقیقەتی ڕووحی پێ نازانن)، وە لە قورئاندا نەهاتوە زەممی ڕووح کرابێ، یاخود مەدحی کرابێ، لەبەرچی ؟ لەبەر ئەوەی ڕووح هەتا نەچێتە نێو جەستەوە، نە کاری چاکی لەدەست دێ تاکو مەدح بکرێ، وە نە کاری خراپی لەدەست دێ، تاکو زەم بکرێ ! بەڵام نەفس زەمکراوەو مەدحیش کراوە، زەمکراوە وەك خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿...إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ ... ﴿٥٣﴾﴾ یوسف، واتە: بێگومان نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات، مانای وایە لێرەدا زەمکراوە، هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾﴾القیامة، واتە: وانییە وە سوێند دەخۆم بەو نەفسەی کە زۆر لۆمەو سەرکۆنە دەکات، لۆمەو سەرکۆنەی خاوەنەکەی دەکات، کە لێرەدا ئەوە مەدحە، یان کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾﴾الفجر، واتە: ئەی نەفسی ئارامگرتوو ! بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگاری خۆت، تۆش ڕازیو ئەویش لە تۆ ڕازی، لێرەشدا ئەوە مەدحە، وەك گوتمان نهێنییەکەش ئەوەیە کە ڕووح ئەگەر لەنێو جەستەدابێ خاوەنەکەی خێری پێ ئەنجام بدا، دیارە پێی مەدح دەکرێ، وە ئەگەر خراپەی پێ ئەنجام بدا، ئەوە زەم دەکرێ.

<u>مەسەلەی حەوتەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، واتە: بێگومان کرێیەکانی خۆتان بە تەواویی لە قیامەتێ وەردەگرنەوە، وشەی: (تُوَفَّوْنَ ) واتە: بە تەواویی، وە (أجر) واتە: کرێ، یانی: سزاو پاداشتی کردەوەکانی خۆتان بە تەواویی وەردەگرنەوە، ئەگەر

چاکە بووبێ پاداشتو، ئەگەر خراپیش بووبێ، سزا، ئەم وشەیە ئاماژەیە بەوەی کە لە قۆناغی بەرزەخیشدا سزاو پاداشت هەیە، بەڵام بەتەواویی نا ! بەڵکو بە نیوەچڵیی، یاخود هەندێك لە سزاو پاداشت، بەڵام سزاو پاداشتی تەواوو پڕ بە پێست، ئەوە تەنیا لە قیامەت دایە، وەك دەقی ئایەتەکە بە ڕاشکاویی دەیگەیەنێ: ﴿ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، ئنجا (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنّان) لە لاپەڕە (١٦٠)دا دەڵێ: (وَفِي هَذِهِ الآيَـةِ إِشَارَةٌ لَطِيفَةٌ إِلَى نَعِيمِ البَرْزَخِ وَعَذَابِهِ، وَأَنَّ العَامِلِينَ يُجْزَونَ فِيهِ بَعْضَ الْجَزَاءِ مِمَّا عَمِلُوهُ، وَيُقَدَّمُ لَهُمْ أُنْمُوذجُ مِمَّا أَسْلَفُوهُ) واتە: لەم ئایەتەدا ئاماژەیەکی پەنهان هەیە بۆ خۆشییو سزاو جەزرەبەی بەرزەخ، وە کە ئەوانەی کردەوەکانیان ئەنجامداون هەندێك لە سزاو پاداشتەکەیان دەدرێتەوەو، وێنەیەك لەوەی کە پێشیان خستوە پاداشتەکەی یان سزایەکەی وەردەگرنەوە، بەڵام بە تەواویی سزاو پاداشت لە کوێ وەردەگیرێتەوە ؟ لە ڕۆژی قیامەت.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾، واتە: ژیانی دنیا جگە لە ڕابواردنێکی فریودەر هیچی دیکە نییە، ڕابواردنێك کە ئینسان پێ فریوی پێ دەخوات، (غُرُور) واتە: فریو خواردن، وشەی: (متاع)یش دەڵێ: (كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ عَلَى وَجِهِ مَا فَهُوَ مَتَاعٌ وَمُتْعَةٌ) هەر شتێك کە بە شێوەیەك لە شێوەکان سوودو کەڵکی لێ وەربگیرێ، ئەوە پێی دەگوترێ (متاع)، وە پێشی دەگوترێ: (مُتْعَةٌ)، وەك لە قورئاندا خوا کە باسی براکانی یوسف دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَـٰعَهُمْ وَجَدُواْ بِضَـٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ ...﴿٦٥﴾ ﴾یوسف، واتە: کاتێك مەتاعەکەیان کردەوە، تەماشایان کرد کەلوپەلەکەیان بۆ گێڕدراوەتەوە، کە پارەکانیان بردنەوە ئەو پارەی کە لەگەڵ خۆیان بردبوو، تاکو ئازووقەی پێ بکڕن، یوسف عليه السلام بە غوڵامەکانی خۆی گوت پارەکەیان بۆ بخەنەوە نێو

بارەکانیان بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بێنەوە، ﴿ وَقَالَ لِفِتْيَـٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَـٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾یوسف، دیارە لەبەر ئەوەی زانیویەتی هەژارو نەدارن، بۆ ئەوەی پارەیان هەبێ جارێکی دیکە ئازووقە بۆ کەسوکاریان ببەنەوە، یان لەبەر ئەوەی هەر نەبێ بۆ هێنانەوەی ئەو پارەیە کە پێیان وابووە، بە هەڵە خراوەتە بارەکانیانەوە، بگەڕێنەوە، لێرەدا هەندێکیان وشەی: (متاع)یان بە ئازووقە مانا کردوەو، هەندێکیش بە (وعاء)، واتە: ئەو جەواڵە یان ئەو شتەی کە ئازووقەکەیان تێهاوێشتوە، مانایان کردوەو، دیارە هەم ئەو جەواڵە یاخود ئەو گونیەیەی کە ئازووقەکەیان تێکردوەو، هەم خودی ئازووقەکەش هەردووکیان مەتاعن، چونکە لە ماوەیەکی کەمی ژیانی دنیادا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ، وە وشەی (غُرُور) واتە: هەڵخەڵەتاندنو فریودان دەڵێ: (غَـرَّ يُغُـرُّ غُـرُوراً)، واتە: هەڵیخەڵەتاند، هەڵیدەخەڵەتێنێ، هەڵخەڵەتاندن، بۆچی خوا ﷻ ژیانی دنیای ناوناوە: ڕابواردنێکی فریودەرانە، ڕابواردنێکی هەڵخەڵەتێنەرانە ؟ چونکە ئەوەی کە باوەش بە دنیا بکاتو دنیا بە گەورەترین ئاواتو ئامانجی خۆی لەقەڵەم بدات، لەڕاستیدا هەڵخەڵەتاوە، چونکە ئینسان زۆر لەوە گەورەترە کە تەنیا پەنجا شەست ساڵێکی ژیانی دنیای بۆ دانرابێ، هەرکەسێك پێی وابێ، هەر ئەو پەنجا شەست ساڵە یان ئەو حەفتا هەشتا ساڵە دەژی لە دنیادا، ئەوە بەڕاستی هەڵخەڵەتاوەو فێڵی لێکراوەو کڵاوی لەسەرنراوە، لە لایەنی شەیتانەوە، چونکە ئینسان زۆر لەوە گەورەترە تەنیا بۆ ئەو ژیانە کەموکورتەی دنیا دروستکرابێ !! بەڵکو لەڕاستیی دا ئەم ژیانە کورتەی دنیا، بەس جێی تێدا تاقیکرانەوەیە، بەس جێی ئەوەیە دەرکەوێ کە ئەو ئایا ئینسانە بەندەی خوا دەبێ، یاخود بەندەی نەفسو شەیتان دەبێ ؟ بۆیە هەرکەسێك دنیا بکات بە ئامانجی خۆی، وە قەناعەتی پێبکات، وە دوارۆژ لەبیر بکات، ئەوە لەڕاستییدا بەو ڕابواردنە کەمەی ژیانی دنیا هەڵخەڵەتاوەو فریوی خواردوە، بۆیە خوای

پەروەردگار ناوی لە ژیانی دنیا ناوە (متاع الغرور)، جا لێرەدا مەبەست ئەوەنیە کە ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە:

با مسوڵمانان واز لە ژیانی دنیا بێنن !! نا، بەس با نەیکەنە ئامانج، بەڵکو وەك وەسیلەیەك تەماشای بکەن، ژیانی دنیا چۆنە ئاوای ببینن، ژیانی دنیا ژیانێکی کەموکورتە، بۆ ئەوەیە کە ئینسان تێیدا تاقی بکرێتەوە، نەك وەك مەنزڵگای کۆتایی تەماشای بکات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ چەند جوان فەرموویەتی: {اللَّهُمَّ وَلا تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا وَلا مَبْلَغَ عِلْمِنَا} رَوَاهُ التِّرمِذِي برقم: (٣٥٠٢) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (١٩٣٤) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي، وَالنَّسَائِي في (الكُبرى) برقم: (١٠٢٣٤) عَن ابْنَ عُمَرَ ﷺ، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صَحِيح سُنَن التِّرمِذِي) برقم: (٢٧٨٣)، واتە: وە ئەی خوایە ! دنیا مەکە بە گەورەترین مەبەستمان، وە ئەوپەڕی زانیارییمان کە لە دنیا بەولاتر نەچێ‌و، بیکەینە جێی هەموو ئامانج‌و مەبەستێکمان، با ئاوا تەماشای ژیانی دنیا نەکەین، بەڵکو وا تەماشای بکەین کە خوای پەروەردگار داینــاوە بۆ تاقیکردنەوە، وەك بۆخۆشی خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۝٧ ﴾ الكهف، واتە: ئێمە ژیانی دنیاو هەرچی لەسەر زەوی دامانناوە، کردوومانە بە مایەی ڕازاندنەوەو جوانیی بۆ دنیا، تاکو تاقیتان بکەینەوە، کامتان کردەوەی باشتر ئەنجام دەدات، کەواتە: هەموو ئەوەی کە لە دنیادا هەیە، ڕازاوەیی جوانیی‌و خۆشییەکە کە ئینسانی پێ تاقی بکرێتەوەو، ئەو خۆشیی‌و ڕازاوەییە یان ئینسان فریودەدا، تاکو خواو قیامەت‌و ڕۆژی دوایی‌و خۆی لەبیر بەرێتەوە، یان وەك خۆی دەیبینێ‌و تەماشای دەکات‌و پێی هەڵناخەڵەتێ‌و نایکات بە ئامانج، جا لەوبارەوە کە ژیانی دنیا شتێکی کەم بایەخە لە ڕووە ماددیەکەیەوە لەچاو دوارۆژدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمایشتی زۆرن لەوبارەوە، کە ئێمە هەندێکیان بە نموونە دێنینەوە:

**فەرمایشتی یەکەم:** {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَ ﷺ يَقُولُ: مَوْضِعُ سوطٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٥٦٠٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٧٩٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٤٨) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٣٣٠) وَالْحُمَيدِي برقم: (٩٣٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٤١٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣١٧٠) وَقَالَ: صَحِيحُ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٌ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، واتە: سەهلی کوڕی سەعد - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: شوێنی یەك قامچی لە بەهەشت (قامچی، یان گۆچانێك، کە دیارە شوێنێکی زۆر کەم دەگرێ تەنیا ئەوەندە شوێنە) چاکترە لە دنیاو لەوەی کە لە دنیادا هەیە، دنیای هەمووان نەك هەر دنیای ئێستا ! واتە: لەوکاتەوە کە خوا دنیای داناوە، تا کۆتایی پێدێ، مانای وایە دنیا زۆر کەم بایەخە لەچاو بەهەشت.

**فەرمایشتی دووەم:** {عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: وَاللَّهِ مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلا كَمَا يَغْمِسُ أَحَدُكُمْ أُصْبُعَهُ فِي الْيَمِّ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا فَيَنْظُرُ بِمَا تَخْرُجُ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٨٠٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧١٢٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٠٨)، وَالْحُمَيدِي برقم: (٨٥٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٥٩) وَالبزَار برقم: (٣٤٦٠) وَاللَّفْظُ لَهُ، واتە: موستەورید - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە خوا دنیا لە بەرانبەر دوارۆژدا، تەنیا وەك ئەوە وایە، یەکێك لە ئێوە پەنجەی خۆی بخاتە نێو دەریایەکەوە، دوایی بەرزی بکاتەوەو تەماشای بکات، بە چ دەگەڕێتەوە بۆ لای، (واتە: ئەو تەڕیی و ئاوەی بە پەنجەتەوە دێتەوە، کە دەیخەیە نێو دەریا، چەندە دنیاش لەچاو دوارۆژدا ئەوەندەیە، کە دیارە ئەوە تەڕاییەی کە بە پەنجەتەوە دەمێنێتەوە، زۆر زۆر کەمە لەچاو ئاوی ئەو دەریایەو، زۆر شتێکی بچووکە، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ژیانی دنیا لەچاو دوارۆژ ئاوایە، کەواتە: پێی هەڵمەخەڵەتێن).

**فەرمایشتی سێیەم:** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُزَحْزَحَ عَنِ النَّارِ، وَيُدْخَلَ الْجَنَّةَ فَلْتَأْتِهِ مَنِيَّتُهُ وَهُوَ يَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَلْيَأْتِ إِلَى النَّاسِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى إِلَيْهِ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٦٨٠٧)، وَالطَّبَرَانِي في (الأوسط) برقم: (٤٧٤١) وَالْهَيْثَمِي في (المجمع)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صَحِيح الجَامع) برقم: (٢٤٠٣)، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە کۆتایی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: هەرکەسێك لە ئاگر دوور خرابێتەوە (زحزح، واتە: خلیسکێنرابێ) وە خرابێتە بەهەشتەوە، ئەوە بردوویەتەوە، مانای فەرموودەکە ئاوایە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر خوا لێیان ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات لە ئاگر دووربخرێتەوەو بخرێتە بەهەشتەوە، با لە کاتێکدا دەمرێ شایەدیی بدات، کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە نین، وە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە با ئەوە لەگەڵ خەڵکی بکات، کە پێی خۆشە خەڵك لەگەڵی بکەن، (واتە: بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکات، کە پێی خۆشە خەڵك مامەڵەی لەگەڵ بکەن).

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا أَذًى كَثِيرًا﴾، ئەو (ل) لامەی سەر (لَتبلَوُنَ) لامی قەسەمە بۆ جەخت لەسەر کردنەوەیەو (ن) نوونەکەش بۆ تەئکیدە لە زمانی عەرەبیدا، واتە: زۆر بە مسۆگەرییو بە دڵنیاییەوە بزانن کە تاقیتان دەکەینەوە لەماڵو سامانتانداو لە نەفسی خۆشتاندا، وە لەوانەی کە کتێبیان پێدراوە لە پێش ئێوەداو، لەوانەش کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، ئازارێکی زۆر دەبیستن، واتە: لە کافرانی خاوەن کتێبو کافرانی بێ کتێب، یانی: بێ کتێبی ئاسمانیی ئەگەرنا هیچ کەسێك نیە کە کتێبو نووسراوێکی لەبەردەست دا

نەبێ بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەدا، جا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە ئێمە خۆمان قاییم بکەین، وە زۆر بە باخەڵ فەڕاحییو سینگ فراوانییەوە لەگەڵ ئازارو مەینەتییەکاندا ڕووبەڕوو ببینەوە، وە خۆمان ئامادە بکەین بۆ هەموو ئەو ئازارو نارەحەتییەی کە لەلایەن کافرانەوەو لە دەستو زمانی کافران دەیبینینو دەیبیستین، چونکە خوا ﷻ لەم ئایەتەدا، وە لە چەندان ئایەتی دیکەشدا، زۆر بە تەئکیدیی ڕایگەیاندوە کە تاقی دەکرێنەوە، ناگونجێ ئیمانداربینو تاقی نەکرێینەوە، ئنجا ئایا تاقیکرانەوەی ئینسان چۆنە؟ لەوبارەوە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەیە بۆمان ڕوونەدەکاتەوە، کە تاقیکردنەوەی ئینسان لەقەدەر ئیمانیەتیو، هەتا ئیمانی باشتربێ تاقیکردنەوەو سەختییو نارەحەتییەکانیو ئەو گرفتو مەینەتییانەی کە لەسەر خواو لەسەر دینی خوا، تووشی دەبن توندتر دەبن: {عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أيُّ النَّاسُ أشَدُّ بَلاَءً؟ قَالَ: الأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأمْثَلُ، يُبْتَلَى الرَّجُل عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صَلْبَاً اشْتَدَّ بَلاَءهُ، وَإنَ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةً ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلاَءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ مَا عَلَيهِ خَطِيئَةٌ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٤٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٩٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٩٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٢٠)، وَقَالَ: الشيخ الألباني حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٤٣)، واتە: ئەو هاوەڵە بەڕێزە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! کێ لە هەموو کەس تاقیکردنەوەی قورسترە، یاخود نارەحەتییەکانی کە دێنە ڕێی بە مەبەستی تاقیکردنەوە زەحمەتترن ؟ گوتی: پێغەمبەران، دوایی پێ بە پێ (واتە: مرۆڤ هەتا زیاتر وەك پێغەمبەران بچێت، لە ئیمانو عەقیدەو دینداریيو مسوڵمانەتییدا، تاقیکردنەوەکەشی قورستر دەبێت) پیاو (مرۆڤ) بەپێی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە، هەتا دینەکەی بەقوەتتربێ، تاقیکردنەوەکەیشی قورستر دەبێ، ئەگەر لە دینەکەیدا پتەویی هەبێ،

تاقیکردنەوەکەیشی قورستر دەبێ، بەلاَم ئەگەر لە دینەکەیدا بێهێزیی هەبێ، تاقیکردنەوەکەیشی لەقەدەر دینەکەی دەبێ، وە تاقیکردنەوە (و بەلاَو گرفتاریی) بەردەوام دەبێت لەسەر بەندە، هەتا وایلێدێت کاتێ کە بەزەویدا دەڕوا، یەك گوناهی پێوە نەماوە، (بەهۆی بەلاَو گرفتارییو نارەحەتییەکانی کە دێنە ڕێی) وەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

کاکە خوا کاری نابەجێ ناکا

تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا !

خوا هەر کەسە لەقەدەر خۆی تاقی دەکاتەوە، ناچێ کەسێك کە ئیمانێکی لاوازی هەیە، تاقی کردنەوەیەکی قورسی بکاتو لە بنیدا بکەوێ ! کەواتە: هەر کەسێك کە لە تاقیکردنەوەی خوا دەرناچێ، لە ڕاستییدا ئەوە خەتای خۆیەتی کە لێی دەرناچێ، چونکە خوا ﷻ زیاد لە خۆی ئەرکی نەخستۆتە سەرشان، ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة، خوا کاربەجێیەو لەقەدەر خۆی تاقیکردوونەوە، بەلاَم لەقەدەر خۆشیان دەرنەچوونە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار تاقیکردنەوەی قورسی بۆ ئەوانە داناوە کە ئیمانیان بەهێزترە، ئنجا ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ، کە ئەگەر تاقیکردنەوەی قورس کراینو، ئازاری زۆرمان بینیو نارەحەتیی زۆرمان بینی، دلّمان بە خۆمان خۆشبێ، چونکە وادیارە ئیمانی باشمان هەیە، نەك ئەگەر تووشی گرفتارییو نارەحەتیی نەبووین، دلّمان بە خۆمان خۆشبێ، چونکە ئەگەر هیچمان تووش نەبوو، دەبێ بلّێین: ئەوە دیارە ئیمانەکەمان هەر ئەوەندەیە[1] !

---

١) لە نامیلکەی: (تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە ؟!)دا بەدرێیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە، بڕوانە: زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان، ئاڵقەی (١٧)، چاپی دووەم: ٢٠١٢ز.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾، هەرچەندە پێشتریش باسمان کرد، بەڵام بۆ زیاتر ڕوونبوونەوە دەڵێین: خوا دەفەرموێ: ئەگەر لە بەرانبەر تاقیکردنەوەیەك دا کە لە نەفستان یاخود لە ماڵتاندایە، وە لە بەرانبەر بە ئازارێك دا کە لە زاری کافران دەیبیستن‌و دەیبینن، خۆڕاگربن‌و پارێزکاربن، ئەو خۆڕاگریی‌و پارێزکاریی‌یە، ﴿مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾، واتە: لەو ئیشانەیە کە پێویستی بە عەزیمەت دەکات، عەزیمەت، واتە: ئیرادەی پتەو، ئەگەر ئیرادەی پتەوتان نەبێ، ناتوانن خۆتان ڕابگرن لە بەرانبەر تاقیکردنەوەکاندا، چونکە هەتا تاقیکردنەوە قورستربێ، پێویستی بە ئیرادەی پتەوتر دەکات، یاخود ﴿مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾، واتە: ئەو خۆڕاگریی‌و پارێزکارییی یە (أَي مِنَ الأُمورِ الَّتِي عُزِمَ عَلَيْكُمْ فيهِ: أَي أُلْزِمْتُمْ الأَخْذَ بِهِ) واتە: لەو کارانەیە کە خوا ﷻ زۆر جەختی لەسەر کردۆتەوەو فەرمانی پێکردوە، کە خۆڕاگربن نەلەخشاوبن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ﴾، کە پێشتر هۆی هاتنە خوارەوەکەیمان باسکرد، دەفەرموێ: وە یاد بکەوە کاتێك خوا پەیمانی پتەوی لەوانەی کتێبیان پێدراوە وەرگرت، کە بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوەو نەیشارنەوە، جا ئەگەر پەیمانی پتەو لەو کەسانە وەرگیرابێ، کە لە پێش موحەممەددا ﷺ کتێبیان پێدرابێ، واتە: لە زانایانی پێش ئوممەتی موحەممەد ﷺ وەرگیراوە، ئایا زانایانی ئوممەتی موحەممەدیش ﷺ ئەو پەیمانەیان لێ وەرگیراوە؟ دەڵێین: بەڵێ، بێگومان وەك خوا ﷻ لە هەردوو ئایەتی (١٥٠و ١٦٠)ی سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ

ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: دڵنیابن ئەوانەی کە ئەو بەڵگە ڕوونو ڕێنماییانە کە ناردوومانن خوار، دەشارنەوە، دوای ئەوەی لە کتێبدا بۆ خەڵکیمان خستوونەڕوو، ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەکاتو، سەرجەم نەفرینکەرانیش نەفرینیان لێ دەکەن. جگە لەوانەی دەگەڕێنەوەو چاکسازیی دەکەنو ئەوەی شاردوویانەتەوە ڕایدەگەیەنن، ئا ئەوانە لێیان خۆش دەبم، وە من زۆر تۆبە وەرگرێکی بەخشندەم، کەواتە: سێ شتان دەکەن: وازی[1] لێ دێننو، دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، وە چاکەکاریی دەکەن، کە تا ئێستا خراپەکارییان کردوە، وە ئەوەی تا ئێستا شاردوویانەتەوە، ڕوونی دەکەنەوە.

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش ﷺ هەیە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أَلْجَمَهُ اللَّهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٨٥١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٥٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٤٩) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٤٥)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان) برقم: (١٧٤٣)، وَقَالَ الشيخ الألباني: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك دەربارەی زانیارییەك پرسیاری لێ بکرێو بیشارێتەوە، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا خوا بە جڵەوی ئاگرین جڵەوی دەکات (واتە: جڵەوێکی ئاگرینی لە زار دەکرێ).

وە بوخارییش لە ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- هێناویەتی: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ النَّاسَ يَقُولُونَ أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ وَاللَّهِ لَوْلا آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا حَدَّثْتُ حَدِيثًا، ثُمَّ يَتْلُو هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ

١) واتە: واز لە شاردنەوەی ئایەتەکانی خوا دێنن.

مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ ... ﴾، إلـــى قولـــه: ﴿ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾} رَوَاهُ أَحْمَـد بـرقم: (٧٢٧٤)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٣٥٠٥)، وَالنَّـسَائِيُّ فـي (الكُبـرى) برقـم: (٥٨٦٧) وَقَالَ شعيب الأرناؤوط: إسنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ)، واتـە: ئـەبو هـورەیرە - خـوا لێـی ڕازی بـێ- گوتوویـەتی: خەڵکـی دەڵـێن: ئەبـو هـورەیرە زۆر فەرمایـشت دەگێڕێتـەوە، بـە خـوا ئەگـەر دوو ئایـەت لـە کتێبـی خـوادا نەبوونـایە، هیـچ فەرموودەیـەکی پێغەمبـەرم ﷺ بـۆ کـەس نەدەگـێڕایەوە، پاشـان ئـەو دوو ئایـەتەی خوێنـدنەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ ... ﴾، تـاکو دەگاتـە: ﴿ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، کـە کـاتی خـۆی تەفـسیرمان کـردوون، وە کـە دەڵـێ: (مَـا حَـدَّثْتُ حَدِيـثًا) مەبەسـتی ئەوە نیـە کە هیچ قسەیەکم لەگەڵ کەس نەدەکرد، واتـە: هیچ فەرموودەیـەکی پێغـەمبـەرم ﷺ بۆ کـەس نەدەگێڕایـەوە.

<u>**مەسـەلەی دوازدەیـەم:**</u> کـە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، واتـە: پێـتوانەبـێ ئەوانـەی دڵخـۆش دەبـن بـەوەی کـە دەیکـەن (لـە کـردەوەو ڕەفـتاری خـراپ)، وە حەزدەکـەن لەسـەر شـتێك سـتایش بکـرێن کـە نەیانکـردوە، ئەوە پێـتوانەبێ لە ئـازار(ی دۆزەخ) دەربـاز دەبـن، وە سـزایەکی بەئێشیان هەیە، لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد کە:

وە هەندێك گوتوویانە: دەربـارەی مونافیـقەکانە.

جا هەندێك گوتوویانە: دەربـارەی خاوەن کتێـبەکانە.

ئەوانـەی کـە گوتوویانـە: دەربـارەی مونافیقەکانـە، واتـە: دەربـارەی ئـەو مونافیقانەی کە لە خزمـەت پێـغەمبەردا ﷺ نەدەچوون بۆ جـەنگو دوایـی بـە درۆ عـوزریان دەهێنـایەوە، تاکـو دوایـی بـە پیاوچـاكو صـاڵح لەقەڵـەم

بدرێـــن‌و مـــەدح بکـــرێن، کـــە گـــوایە بـــە عـــوزرو بـــە بەڵـــگەی شـــەرعیی بەدواکەوتوون.

وە جوولەکـەکانیش ئـەوە بـوو کـە پـێـغەمبەر ﷺ پرسـیاری لێدەکـردن، ئەوانیش وەڵامێکیان دەدایەوە غەیری ئەوەی کە ڕاسـتە، وە واشیـان پـێشـان دەدا کـە ئـەوان چاکـەیان لەگـەڵ پـێـغەمبەری خـوادا ﷺ کـردوە، بـۆ ئـەوەی ستاییش بکرێن لەسەر شـتێکی چاك کە نەیانکـردوە، ئنجا هـەرچەنـدە هـۆی هاتنـە خـوارەوەکە باسـی جوولەکـەو مونافیقـەکان دەکـات، بـەڵام زانایـانی (أصـول الفقـة) بنـچینەیەکیان دانـاوە دەڵـێ: (إنَّ خُـصُوصَ الـسَّبَبِ لايَمنَـعُ شُمُولِ الْمَعْـنَى)، واتە: تـایبـەتمـەندێتـیی هـۆی هاتنـە خـوارەوە، ڕێگـا ناگـرێ لـە گشـتگیـرێتـیی واتـا، یـانی: ئەگـەر ئـەم ئایەتـە لـە ئەسڵیـشـدا دەربارەی ئـەو مونافیقـانە، یـان دەربـارەی ئـەو جوولەکـانە، یـان دەربـارەی هەرکـامێکیان هاتبێـتە خـوار، بـەڵام واتاکـەی گـشـتیی یـەو، هـەر کەسـێك وابـێ‌و بـەو خراپـەیـەی کـە دەیکـات دڵخۆشـبـێ، وە حـەزیش بکـات لەسـەر چـاکەیەك کـە نەیکـردوە ستایش بکـرێ، ئـەوە بەڕاسـتیی سـزایەکی سـەختی هەیـە، کەواتـە: ئینـسان دەبـێ خـۆی لـێ بپـارێزێ، بۆیـە مـن پـێشـتریش گوتـم کـە مـەڕوانی کـوڕی حەکـەم کـە دەرگـاوانەکەی خـۆی نـاردوە بـۆ لای عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس‌و گوتوویـەتی: ئەگەر بەپـێی ئەم ئایەتـە بـێ هیـچمـان دەربـاز نـابین، لـە ڕاسـتیی دا مـەڕوانی کـوڕی حەکـەم هێنـدە پیاوێکـی بـاش نەبـووەو لـە هەمبـانەی خـۆی گـوێزی ژمـاردوون، وە مـن پـێمـوایە هەرکەسێك ئیمـانێکی باشـی هـەبێ، حـەز ناکات چاکەیەکی نـەکردبێ‌و بـاس بکـرێ‌و مـەدح بکـرێ، بەڵـکو ئەگـەر نەیکردبـێ دەڵـێ: نەمکـردوە، بـۆ وێنـە: بـە ڕۆژوونیـە پـێی دەڵـێن: وا دیـارە بەڕۆژووی، کـاتی بەربانـگ دووعـامان بـۆ بکـە؟ دەبـێ بڵـێ: نـەخێر بـەڕۆژوو نـیم، نـەك بـەڕۆژوو نەبـێ‌و خەڵـکیش وا تێبگـەیەنێ بـەڕۆژووە، یان کەسێك شـەونوێژ ناکات پـێی دەڵـێن: ئـەرێ لـە شـەو نوێژێـدا دووعـامان بـۆ بکـە ! دەبـێ بڵـێ: مـن شـەونوێژان ناکـەم، ئەگـەر ئیمـانێکی

باشی هەبێ دەبێ وا بڵێ، نەك بڵێ: باشە باشە دووعاتان بۆ دەکەم !! واتە: شەونوێژیش نەکاو خەڵکیش واتێبگەیەنێ شەونوێژان دەکا، ئەوە دیارە کە ئینسانی ئیماندار شتی وا ناکات، کەواتە: کاك مەڕوانی کوڕی حەکەم لە هەمبانەی خۆی دا گوێزی ژماردوون، ئەگەرنا لەڕاستییدا بەو شێوەیە نیە کە هەمووومان حەزمان لەوەبێ لەسەر چاکەیەك مەدح بکرێین کە نەمانکردوە، چونکە ئەو گوتوویەتی: ئەگەر وابێ ئەوە (لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ) واتە: هەموومان سزا دەدرێین، واتە: هەموومان پێمانخۆشە چاکەیەکمان نەکردبێ، مەدحمان بکرێ بەو چاکەیەوە، نەخێر لەڕاستییدا هەموو کەس وا نیە.

خوای پەروەردگار بمانپارێزێ لەو سیفەتە خراپانەی لەو کەسانەدا خستوونیە ڕوو، کە شایستەی سزاو جەزرەبەی خوان، وە خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی بەو سیفەتە بەرزو پەسندو چاکانە بمانڕازێنێتەوە، کە خۆشەویستەکانی خۆی، وە بەندە چاکەکانی خۆی، پێ مەدح کردوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆزدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دەرسی کۆتاییی‌یە لە زنجیرە دەرسی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) لە سوورەتی ئالی عیمران، کە ئایەتەکانی: (١٩٠ تاکو ٢٠٠) واتە: یازدە ئایەت دەگرێتە خۆی، لەم یازدە ئایەتەدا خوا ﷻ باسی ئەوەمان بۆ دەکات، کە خاوەن عەقڵانی زۆر خوا لە یاد، لە دروستکرانی ئاسمانەکانو زەوی‌و جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژاندا، بەڵگەو نیشانەی زۆر دەبینن، لەسەر پەروەردگارێتیی خوا، پاشان باسی پاڕانەوەو یادی خوا کردنی ئەوانمان بۆ دەکات، وە باسی ڕازو نیازی بەکوڵیان لەگەڵ خوای پەروەردگار، وە پاڕانەوەیان کە لە ئاگری دۆزەخ چەپاڵەیان بداتو، لێیان خۆشبێ‌و بیانخاتە بەهەشتەوە، وە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە دوای ئەوەی بانگکەرێکیان بیست، داوای دەکرد خەڵك ئیمان بێنن، ئەوانیش بە دەمیەوە چوونو ئیمانیان هێنا، وە پاشان باسی وەڵامدانەوەی پەروەردگار دەکات، بۆ پاڕانەوەو داوای ئەوان لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەوەدا کە خوا ﷻ پاڕانەوەو داوای کێ قبووڵ دەکات ؟ ئنجا ئامۆژگاریی مسوڵمانان دەکات کە چاویان لە دوژمن نەترسێ، وە بە هۆی هاتنو چوونو گەڕانو سووڕانیانەوە لە وڵاتدا، فریو نەخۆنو پێیان وابێ کە ئەوان زۆر دەستەڵاتدارن، لە بەرانبەریاندا هەست بە بێهێزیی نەکەن، وە پاشان باسی سەرەنجامی پارێزکاران دەکات، وە باسی چاکەکارانی نێو خاوەن کتێبەکان دەکات واتە: لە جوولەکەو نەصرانیی‌و ئەوانەی دیکە، وە پاشان خوا فەرمان دەکات بە ئیمانداران کە خۆبڕازێننەوە بە خۆڕاگریی لە خودی خۆیاندا، وە خۆڕاگریی لە بەرانبەر گرفتو کێشەکانیاندا، وە نەلەخشاو دامەزراوو پارێزکاریی تاکو سەرفرازیی وەدەست بێنن.

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ
﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾
رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا
سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا
وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ
وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ
عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن
دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ
جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾
لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ
ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن
يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ
﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ
﴿٢٠٠﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

(بێگومـان لـە دروسـتکرانی ئاسـمانەکانو زەویو جیاوازیـیو جێگۆڕکـەی شـەوو ڕۆژدا، نیشانەی زۆر هەن، لەسەر پەروەردگارێتی خوا، بۆ خـاوەن عەقـڵان ﴿١٩٠﴾ ئەوانەی کە بە پـێوەو بە دانیشتەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خـوا دەکـەنو، بیـر لـە دروسـتکرانی ئاسـمانەکانو زەوی دەکەنـەوە (دەڵێـن:) پـەروەردگارمان! ئەمـەت بە پووچیی (و بێ حیکمەت) دروست نەکردوە، پاکیی بۆ تۆ (لە کـاری بێ ئامانجو حیکمەت) دەجا لە ئازاری ئاگر چەپاڵەمان بدە ﴿١٩١﴾ پەروەردگـارمان ! بێگومـان تـۆ هەرکەسـێك بخـەیە ئاگـر(ی دۆزەخ)ەوە، ئـەوە بەڕاسـتیی ڕیسـوات کردوە، وە ستەمکاران هیچ یارمەتیدەریان نین ﴿١٩٢﴾ پەروەردگارمان! بێگومـان ئێمـە بانگـکەرێکمان بیسـت، کـە بـۆ لای ئیمـان بـانگی (خەڵکـی) دەکـرد: کـە ئیمـان بـە پەروەردگـارتـان بێنن، ئێمەش یەکسـەر ئیمانمـان هێنـا، پـەروەردگارمان ! دەجـا لـە گوناهــەکانمان بمانبــوورەو خراپەکانمــان لــێ بـسڕەوە، وە لەگــەڵ چاکــەکاراندا بمـانمرێنـە ﴿١٩٣﴾ پـەروەردگارمان ! وە ئـەوەی کـە لەسـەر زمـانی پـێـغەمبەرەکانت بەڵێنـت پـێـداوین پـێمانبدەو، لـە ڕۆژی قیـامەتـدا ڕیسـوامان مەکـە، بێگومـان تـۆ بەڵێن ناشـکێنی ﴿١٩٤﴾ پەروەردگاریان وەڵامیدانەوە کە: من کردەوەی هـیچ خـاوەن کردەوەیەك لە ئێوە زایـە ناکـەم، لـە نێـرو مـێ، هەندێکـتان لـە هەندێکـتانن، جا ئەوانـەی کۆچیان کـردوەو، لـە مـاڵو حاڵیـان وەدەرنـراونو، لەپـێـناوی منـدا ئـازار دراونو، جەنگیان کردوەو، کوژراون، ئەوە مـسۆگەر خراپەکانیـان لـێ دەسـڕمەوەو دەیانخـەمە چـەند باغێکـەوە، کـە ڕووباریـان بـەژێردا دەڕۆن، (ئـەوەش) پاداشـتە لەلایـەن خـواوە، وە خـوا باشتـرین پاداشـتی لەلایـە ﴿١٩٥﴾ بـا لـە وڵاتـدا گـەڕانو سووڕانی ئەوانەی بێبـڕوان فریـوت نـەدات (پـێت وانـەبێ زۆر بـەهێزو پـێـزن، یـان بەختـەوەرن) ﴿١٩٦﴾ ئەوە ڕابواردنو گوزەرانێکی کەمـە، پاشـان جێگـای حەوانـەوەیان

دۆزەخـە، ئـەویش خراپتـرین نـشینگەیە ! ﴿١٩٧﴾ بـەڵام ئەوانـەی پارێزیـان لـە پـەروەردگاریان کـردوە، ئـەوە (لـە دواڕۆژدا) چـەندان باغیـان هـەن، کـە ڕووباریـان بەژێـردا دەڕۆن و تێیـاندا هەمیشـەیین، ئەوەش میوانداریيەکـە لەلایـەن خـواوە، وە ئەوەی لەلای خـوایە بۆ چاکەکاران چاکتـرە ﴿١٩٨﴾ وە بێگومان کەسـانێك لـە خـاوەن کتێبـەکان (جوولەکـەو نەصـرانیی و خەڵـکی دیکـەی وەك وان) هـەن کـە بـڕوا بـە خـواو بەو (کتێبو پەیام)ە دێنـن، کە بۆ ئێـوەو بـۆ خۆشیان نێرراوەتـە خـوار، بـۆ خوا ملکەچـن، نرخێکـی کـەم بە ئایەتـەکانی خـوا ناکـڕن (سـەوداو بازرگـانیی بـە ئاییـنـەوە ناکـەن)، ئـا ئـەوانـە پاداشـتی تایبـەتی خۆیـان لـەلای پەروەردگـاریان هـەیـە، بێگومان خـوا لـێپرسـینەوەی خێرایە ﴿١٩٩﴾).

## شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەکان

(﴿وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾): واتــە: جێگــۆڕکەی شــەوو ڕۆژ، یــاخود جیــاوازیی، (اختلاف) هەم بەمانـای ئەوە دێ، کە شتێك شوێنی شتێك دەگرێتـەوەو هـەم بە مانـای جیـاوازییـش دێ.

(﴿أَخۡزَيۡتَهُۥ﴾): واتـە: ڕیـسوات کـردوە، شــەرمەزارت کـردوە، (خَـزِيَ الرَّجُـلُ لَحِـقَهُ انْكِسَارٌ، إمَّا مِنْ نَفْسِهِ، وَإمَّا مِنْ غَيْرِهِ، فَمِنْ نَفْسِهِ الْحَيَاءُ الْمُفْرِطُ، وَمَصْدَرُهُ الْخِزَايَـة، وَمـن غَيْـرِهِ الإسْـتِخْفَافُ، مَـصْدَرُهُ الْخـزِيُ)، دەگــوترێ: (خَـزِيَ الرَّجُـلُ)، واتــە: پیاوەکـە بەخۆداشکـایەوە، جـا یــان لـە زاتـی خۆیـدا، واتـە: بەهـۆی خۆیەوە، یاخود بەهـۆی غـەیری خۆیـەوە، ئەگـەر بەهـۆی خۆیـەوەبێ، ئــەوە بەخۆداشــکانەوە شــەرمکردنێکە کــە تێبپــەڕێنێ، وە چــاوگی ئــەوە (خِزَايَـة)یـە، بۆیـە دەگوتـرێ: (خِـزِي يَخـزِي خِزَايَـةً)، بـەڵام ئەگـەر ئینـسان بەهـۆی غەیری خۆیـەوە بـشکێنرێتـەوە، ئـەوە (إسْتِخَفَاف)ی پـێ دەگوترێو چاوگەکەشی (خِزْي)ە، واتـە: بە کـەم تەماشاکردن.

(ٱلْأَبْرَارِ): واتە: چاكەكاران، (الأبرار) كۆی (بَارٍّ)، (بَارٍّ) یانی: چاكەكار، (وبَـرَرَة) كـۆی (بَـرّ)ە، واتـە: چـاكەكار، وە (وَبَـرٌّ أَبْلَـغُ مِـن بـارّ؛ كَمَـا أَنَّ عَـدْلاً أَبْلَـغُ مِـن عَـادل) كـە دەگـوترێ: (بَـرٌّ) ئـەوە ماناكـەی بەهێـزترە لـەوەی كـە بگـوترێ: (بَـارّ) وەك چـۆن كـە دەگـوترێ: (عَـدْل) فـلان كـەس پیـاوێكی (عَـدْل)ە، ئـەوە ماناكـەی بـەهێزترە لـەوەی كـە بلـێی (عَـادل)، چـونكە (عَـدْل) چـاوگە، واتـە: خودی عـەدالـەت خۆیەتیو عـەدالەتی تێدا بەرجەستەیە.

(وَرَابِطُواْ): هـەم بـەمانای نەجـووڵانو لـە شـوێنی خـۆ چەسـپین دێ، وە هـەم بـەمانای پـێكەوە پەیوەسـتبوونیـش دێ، دەگـوترێ: (رَبَـطَ الفَـرَسَ: شَـدَّهُ بِالْمَكَـانِ لِلْحِفْـظِ) واتـە: ئەسـپەكەی بەسـتەوە بـەو شـوێنەوە كـە پـێوەی دەبەسترێتەوە، بۆ ئـەوەی كـە پارێزكاریی لـێ بكات (وَالرِّبَـاطُ: اسْمٌ لِلْمَكَان الَّـذِي يُـرَابِطُ فيـهِ) وە (رِبَـاط) بـەو شـوێنـە دەگـوترێ كـە كەسـێك لـەوێدا خۆیـدا دەنووسـێنێ، یـان خـۆی دەپێـچێو دەچـێتە سـەنگەرەوە (وَالرِّبَـاطُ مَـصْدَرُ: رَبَطْـتُ وَرَابَطْـتُ، وَالمرابَطَـةُ كَالْمُحَافَظَـةِ)، دەگـوترێ: (رَبَطْـتُ وَرَابَطْـتُ) كـە (مُرَابَطَـةُ) وەك (مُحَافَظَـةِ) وایـە، واتـە: پارێزكـاریی لـێكردنو مانـەوە لە شوێنی خۆ .

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئـایەتەكـان

١/ هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئەو ئایەتە، كە دەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ... ﴿١٩٥﴾﴾، {عَـنْ أُمِّ سَـلَمَةَ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهَا، أَنَّهَـا قَالَـتْ: يَـا رَسُـولَ اللهِ! لا أَسْـمَعُ اللَّـهَ ذَكَـرَ النِّـسَاءَ فِـي الْهِجْـرَةِ بِـشَيءٍ، فَـأَنْزَلَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ ...﴾} رواهُ سَـعِيد بْـنُ مَنْـصور، وَعَبْـدُ الـرَّزَاق، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٠٢٣)، وابْـنُ جَريـر، وَابْـنُ الْمُنْـذِر، وَابْنُ أَبِي حَاتِمْ، وَالطَّبَرَانِي، وَالحَاكِمُ برقم: (٣١٧٤) قَالَ: هَـذَا حَـدِيثٌ صَحِيح

عَلَى شَرْطِ البُخَارِيّ وَلَمْ يخرجاهُ[1]، وَالحُمَيْدِي برقم: (٢٣٨٩)، قَالَ الشَيخ الألباني: صَحِيح لِغَيْرِهِ في (سُنَن الترمذي) واتە: ئوممو سەلەمە (دایکی ئیمانداران، کە یەکێکە لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ) - خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! نابینم خوا باسی ئافرەتان بکات لە بواری کۆچکردندا (لەگەڵ ئەوەی کە ئافرەتانیش کۆچیان کردوە) ئیدی خوای بەرزو پایەدار ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ ... ﴾، کە دوایی ئایەتەکە تەفسیر دەکەین، کە لێرەدا خوا باسی نێرو مێ وەك یەك دەکات لە بواری کۆچکردن دەرکران و ئازاردان و کوژران لە ڕێی خوادا.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ ... ﴿١٩٩﴾ ﴾، {لَمَّا مَاتَ النَّجَّاشِيُّ، قَالَ رَسول الله ﷺ: صَلُّوا عَلَيْهِ، قَالُوا: يَا رَسولَ الله ! نُصَلِّي عَلَى عَبْدٍ حَبَشِيٍّ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ... ﴾} أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ فِي (الكُبرى) برقم: (١١٠٨٨)، وَالبَزَّار في (مُسْنَدِهِ) برقم: (٦٥٥٦)، وَالوَاحِدِي في (أسباب النزول)، وابْنُ الْمُنذِر، وَابْنُ أبي حَاتِمْ، وَابْنُ مردوية[2]، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣٠٤٤)، واتە: ئەنەس - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: کاتێك نەجاشیی (واتە: پادشای حەبەشە، کە دیارە مسوڵمان بووە بە پەنهانیی ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، (جا بۆ زانیارییتان هەموو پادشاکانی حەبەشە پێیان گوتراوە نەجاشیی، بەڵام ئا ئەوەیان کە ئیمانی هێناوە ناوی (أَصْحَمَة) بووە، هەروەك هەموو پادشاکانی فارس پێیان گوتراوە: کیسرا، وە هەموو پاشاکانی ڕۆم پێیان گوتراوە: هیرەقل، ئەوە نازناوی پادشایەتییان بووە،

١) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص:(٦٢٤).

٢) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص:(٦٢٥).

وەك چۆن ئێستا دەگوترێ: سەرۆك كۆماری ئەمریكا، یان سەرۆك وەزیرانی فلان شوێن)، كاتێك كە نەجاشی مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نوێژی لەسەر بكەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ نوێژ لەسەر بەندەیەكی حەبەشەیی بكەین؟ (واتە: كەسێك كە حەبەشەییە ! وایانزانیوە كە مسوڵمان نەبووە) ئیدی خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی ناردە خوار كە دەفەرمویێ: ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ... ﴾.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ لە كۆتایی سوورەتی ئالی عیمران دا كە ئێمە لە دەرسەكانی ڕابردوودا ئایەتەكانیمان تەفسیر كردن، كە وەك پێشتر گوتمان لە ئایەتەكانی ژمارە (١٢١ تاكو ١٨٠) واتە: شەست ئایەت دەربارەی ڕووداوەكانی جەنگی ئوحود دواون، وە ئایەتەكانی پێشتریش بە زۆری دەربارەی نەصرانیی یەكان بەتایبەتی و جوولەكەو خاوەن كتێبەكانی دی بەگشتی دواون، وە گەلێك مەسەلەو بابەت كە لە دەرسەكاندا تیشكمان خستە سەریان لە سوورەتی (آل عمران)دا باسكراون، لە كۆتایی هەموو ئەو باس و خواسانەدا كە ڕابردن خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴾، بێگومان لە دروستكران و جێگۆڕكەی شەوو ڕۆژاندا نیشانەی زۆر هەن بۆ خاوەن عەقڵان[1].

خوا وشەی (لُب)ی كە لە كوردیدا بەمانای (كاكڵ)ە، بەكارهێناوە بۆ عەقڵ بۆچی ؟ چونكە عەقڵ كاكڵەی ئینسانە، ئایا گوێز بەبێ كاكڵەكەی كەس توێكڵەكەی دەوێ ؟ نەخێر، ئینسانیش عەقڵەكەی لێ بێنە دەرێ، لەگەڵ ئاژەڵ جیاوازیی نیە، ئینسان بە عەقڵ لە ماڵاتو ئاژەڵ و ژیاندارانی دیكە

---

١) ألباب: كۆی (لُب)ە، ئەویش بەمانای كاكڵ دێ، (أولي)ش یانی: (أصحاب) یانی: خاوەنان، كەواتە: (أولي الألباب) یانی: خاوەنانی عەقڵەكان.

جیادەبێتەوە، وە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: لە دروستکرانی ئاسمانەکانو زەوی واتە: لە دروستکراوەکانی خوا بەسەرێو خوارێوە (عُلْوِّیها و سُفْلِیِّها) سەرێ ئاسمانەکانن، خوارێش زەوی، بەنسبەت ئێمەوە کە لە زەوین، ئێرە (واتە: ژێر خۆمان) بە خوارێ دادەنێینو، ئەوەی کە لە سەرووومانەوەیە بە سەرێ دادەنێین، دیارە خوای پەروەردگار بەپێی عەقڵی ئێمە قسە دەکاتو دەفەرموێ: لە دروستکرانی دروستکراوەکان بە سەرو خواریانەوە، هەروەها لە جێگۆڕکەو جیاوازیی شەوو ڕۆژاندا، نیشانەو بەڵگەی زۆر هەن، لەسەر چی ؟ لەسەر پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایێتیی خواو، لەسەر خاوەنداریێتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی خوا، وە لەسەر ناوە هەرچاکەکانو سیفەتە هەرە پەسندەکانی خوا، بۆ کێ ؟ بۆ خاوەن عەقڵان، بەلام ئەوەی عەقڵی نەبێ، وەك: خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تُغْنِي ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ یونس، واتە: نیشانەو ئاگادارکەرەوەکان چ سوودێکیان هەیە بۆ کەسانێك کە نایانەوێ ئیمان بێنن ؟ کەسانێك کە عەقڵی خۆیان بەکارنەهێنن، دیارە سوود لە بەڵگەو لە نیشانەکان نابینن.

ئەوجار خوا ﷻ پێناسەی ئەو خاوەن عەقڵانەمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ ﴾، ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بە پێوەو بەدانیشتنەوە، وە لەسەر تەنیشتیان ﴿ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، وە بیردەکەنەوە لە دروستکرانی ئاسمانەکانو زەوی، تێوەی ڕادەمێننو لێی ورد دەبنەوەو سەرنجی دەدەن، واتە: یادی خوا دەکەن لە هەموو حاڵاندا، چونکە ئینسان سێ حاڵەتی هەن: یان بەپێوەیە، یان بە دانیشتنەوەیە، یاخود بە ڕاکشانەوەیە، خوا دەفەرموێ: لە هەرسێ حاڵاندا خوایان لەیادە، وەك دایکمان عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- دەربارەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٤١٩)، وَالبُخَارِيُّ مُعَلَّقاً برقم: (١٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧٣) وَوَصَلَهُ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم:

(١٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٨٤)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٢٠٧) وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٠١)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتاندا یادی خوای دەکرد، ئەوانەی ئاوا بەو شێوەیە یادی خوا دەکەن، واتە: دڵیان بێدارە، وە بەو شێوەیەش بیردەکەنەوە، واتە: عەقڵیشیان هۆشیارە، دەگەنە چ ئەنجامێك ؟ دەگەنە ئەو ئەنجامە ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا﴾، پەروەردگارمان ! ئەمەت واتە: ئەم دروستکراوەت بە ئاسمانەکانو زەوییەوە، بە سەروو خوارێوە، بە پووچیی‌و بێ حیکمەتو ئامانج دروست نەکردوە، کەواتە: ئەم کەونو کائیناتە بۆ ئامانجو حیکمەتێك دروستکراوە کە بریتیە لە چی ؟ بریتیە لە تاقیکرانەوەی ئینسانەکان، بۆیە دەڵێن: ﴿سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾، پاکیی بۆ تۆ کە کاری بێ ئامانجو حیکمەت ئەنجام بدەی، لە تۆ ناوەشێتەوە، کەواتە: لە سزاو ئازاری ئاگر بمانپارێزە، ئەو سزایەی کە داتناوە بۆ کەسانێك کە نازانن بۆ دروست بوون ؟ نازانن ئەو کەونو کائیناتە بۆ دروستکراوە، لە حیکمەتو ئامانجەکەی حالّی نین، وە سەرەنجام لە تاقیکردنەوەی خوا دەرناچن، چونکە هەر کاتێك ئینسان خوای نەناسی خۆیشی ناناسێ، کە نەیزانی کێ خاوەنیەتی، ئەوە بە دڵنیایی نازانی بۆخۆشی چییەو بۆچی دروست بووە ؟ لە کوێوە هاتوە ؟ وە بۆچی هاتوە ؟ وە بۆ کوێ دەچێ ؟ بۆیە سەرەنجام کەسێك ئاوابێت شایستەی ئەوە دەبێ کە سزا بدرێ، بەڵام کەسێك کە خوا بناسێ، خۆیشی دەناسێو شوێنی (محل)ی خۆی لە ئیعراب (إعراب)ی بووندا دەزانێو، دەشزانێ کە بە گاڵتەو هەوەنتە نەخوڵقێنراوە، بۆیە یادی خوا دەکاتو بیر لە دروستکراوەکانی خوا دەکاتەوە، وە ئەو ڕاستە شەقامە دەگرێتە بەر کە شایستەی ئینسانە، وە بە شێوەیەك ژیان دەباتە سەر کە بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دوارۆژی پێ مسۆگەر دەکات.

ئەوجـار خـوای پـەروەردگار لـە خـستنەڕووی نـزاو پاڕانـەوەی ئـەو خـاوەن عەقلانە بـەردەوام دەبێ، هەڵبەتە پێنج جاران وشەی: ﴿ رَبَّنَا ﴾، دووبـارە بۆتـەوە ئــەوە جــاری یەکــەمیان بــوو کــە گوتیــان: ﴿ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا ﴾، پـەروەردگارمان ! ئەمـەت واتـە: (ئـەم بوونـەت) بـێ حیکمـەت دروسـت نـەکردوە، ئنجــا دەڵــێن: ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ﴾، پەروەردگــارمان ! بێگومـان هەرکەسـێك تـۆ بیخـەیە نێـو ئاگـر، تـۆ شـەرمەزارت کـردوە، ڕیـسواو زەبوونـت کردوە واتە: خـوایە ئێمـە مەخـە ئاگـری دۆزەخـەوە، بـۆ ئـەوەی ڕیـسواو شـەرمەزارو زەبـوون نەبیـن ﴿ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾، وە ستەمکارانیش هیـچ پـشتیوانو یارمەتیـدەریـان نیـن، کەواتـە: خــوایە ! تـۆ کەسـانێك دەخــەیە نێـو ئاگــرەوەو ڕیـسواو زەبوونیــان دەکــەی کــە ســتەمکاربن، کـە دیـارە گـەورەترین ســتەمیش ئەوەیــە ئینـسان وەفـای بـۆ پەروەردگــاری خــۆیو بـۆ خـاوەنی خـۆی نەبــێو نەیپـەرستــێو بەندایەتیــی بـۆ نەکـات، ئـەوە گـەورەترین زوڵـمە وەك لوقمـان لـە ئامۆژگارییـکردنی کوڕەکەیـدا گوتــوویەتی: ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ لقمــان، واتە: ڕۆڵە گـیان ! هاوبـەش بـۆ خـوا دامـەنێ، چونکـە هـاوبەش بۆ خـوادانان ستەمێکی مەزنـە.

ئنجـا لێـرەدا باسـی ئیمـان هێنــانی خۆیــان دەخەنــەڕوو، خــوا دەزانــێ بــەڵام ئینـسان لـە خزمـەت خــوادا ئەگــەر زۆر ڕازونیــاز بکــات، وە زۆر عــەرزی حــاڵی خــۆی بکـات، وە بەندایەتییو ئاتـاجییو خۆی زیـاتر بخاتەڕوو، قەیدێنـاکا، ئنجـا بۆ جاری سێیەم دەڵێن: ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ﴾، پەروەردگــارمان ! ئێمـە بانگـکەرێکمان بیـست بـانگی دەکـرد بـۆ ئیمـان هێنــان، دەیگـوت: ئیمـان بێـنن بـە پەروەردگــارتان، ئێمـەش ئیمانمـان هێنـا، واتـە: لێـرەدا دان بەوەدادێنـن کە بە دەم بانگی ئەو بانگکەرەوە چوون، کـە بـانگی کـردن بــۆ ئیمــان هێنــان، جـا ئایـا ئــەو بانگکــەرە کــێیە ؟ دیـارە موحەممــەدە ﷺ

پێغەمبەری کۆتایی، وەك هەموو پێغەمبەرانی دیکەی خوا خەڵکی بانگ کردوە بۆ لای خوا، هەندێکیش گوتوویانە: قورئانە، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە (محمد المصطفی)یە ﷺ وە دیارە ئەویش بە هۆی قورئانەوە خەڵکی بۆ لای خوای پەروەردگاریان بانگ کردوە، ئنجا بۆ جاری چوارەم ئەو بەندە ژیرانە خوا بە ناوونیشانی (پەروەردگارمان) دەدوێنن و دەڵێن: ﴿رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ﴾، پەروەردگارمان ! مادام وایە ئیمانمان هێناوەو بەدەم بانگی بانگکەری تۆوە چووین، لە گوناهەکانمان بمانبوورەو خراپەکانمان لێ بسڕەوە، وە لەگەڵ چاکەکاراندا بمانمرێنە، واتە: بە شێوەیەك بژین کە لەسەر ڕێبازی چاکەکاران بین، تاکو وەك ئەوانیش بمرین.

ئنجا بۆ جاری پێنجەم و کۆتایی دووبارە بە ناوونیشانی (پەروەردگارمان) لە خوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾، پەروەردگارمان ! وە ئەوەی کە بەڵێنت پێداوین لەسەر زمانی ڕەوانەکراوەکانت، لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێیان ببەخشە، وە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕیسواو شەرمەزارمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن بە زایە نادەی، ئنجا ئایا ئەو بەڵێنەی کە خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە ئیماندارانی داوە، چییە ؟ ئەوەیە کە ئەگەر بەندایەتیی بۆ خوا بکەن دەیانخاتە بەهەشتەوە لە دواڕۆژدا، وە لە دنیاشدا ئەوەیە کە خوای پەروەردگار سەریان دەخات و بەختەوەریان دەکات و سەرفرازیان دەکات و لەشیان ساغ دەکات ...هتد، هەموو ئەوانەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە خەڵکی گوتراوە، هەمووی دەگرێتەوە.

دوای ئەوەی کە ئەوان بەو شێوەیە ڕازونیازیان کردو بە کوڵ پاڕانەوە، ئنجا ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ﴾، پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە، فەرمووی: ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم﴾، بە تەئکید من هیچ کردەوەیەك لە هی خاوەن

كردەوەكانی ئێوە زایە ناكەم ﴿مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾، لە نێرو مێتـان واتـە: جیـاوازیی نیـە پیـاو بـێ یـان ئـافرەت، نێـرو مـێ وەك یـەكن ﴿بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٍ﴾، چونكە ئـەو نێـرو مێیـە هەنـدێكیان لـە هەندێكیـانن، نێریـش بەهـۆی مێیـەوە پەیـدادەبێو، مـێش بـەهۆی نێـرەوە پەیـدادەبێ، كەواتـە: لـە بەرانبـەر خـواو لـە بـواری كردەوەكـاندا، وە لـە بـواری پاداشـت وەرگرتنـەوەدا، وە لـە بـواری بەندایەتیـی كـردن بـۆ خـوادا، وەك یەكـن، بەڵـێ نێرینـە (پیـاو) كۆمەڵێـك سـیفەتی هـەیە جیـای دەكەنـەوە لـە مێینـە (ئافـرەت)، وە بـەهۆی ئـەو كۆمەڵـە تایبەتمەندییو سیفەتەوە، پیاو لە شەریعەتدا چەند ئەركێكی پـێ دەسپێـردرێن، كە لەگـەڵ پێـكهاتەی جەستەییو سروشتیدا بگونجێن، ئافرەتیش چەند ئـەركێكی پـێ دەسپێـردرێن، كـە لەگـەڵ پێـكهاتەی جەسـتەییو سـروشـتییو نەفسـییدا بگونجـێن، بەڵام سـەرەنجام هەردووكیان لە مرۆڤ بـوونو، لـە بەنـدەی خـوا بـوونو لە چاكەكارییو خراپەكارییو، لـە شایـستە بـوونی سزاو پاداشـتـدا، وەك یەكـنو یەكسانن، بەڵام لە ئیشوكارێكدا كە پێیان دەسپێردرێ، جیـاوازن لەبـەر ئـەوەی سروشـتیان جیـاوازە، دیـارە كۆمـەڵێكی زۆر ئـەركی هاوبەشیـشیان هـەن، بـەڵام هەندێك ئـەركیش تایبـەتن بـە پیـاوانو هەندێكـیش تایبەتـن بـە ئافرەتـان، ئنجـا ئەوان ڕازونیـازو پاڕانەوەیان كـردوە، بەڵام خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾، من كردەوەی هیـچ خاوەن كـردەوەیەك لە ئێـوە زایە ناكـەم، واتـە: ئـەوەی لای خـوا سەنگی مەحەكـە، كردەوەیـە، بەڵـێ پاڕانـەوەش هـەر كردەوەیـەو ئیمان هێنـانیش هـەر كردەوەیـەو ڕازونیـاز لەگـەڵ خـواشـدا هـەر كردەوەیـە، بـەڵام بـە دڵنیـایی كردەوە تەنیا لەوانەدا كورت هەڵنـەهاتوە، بۆیە دەفـەرموێ: ﴿فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾، ئەوانـەی كە كۆچیـان كـردوە، ﴿وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾، وە ئەوانەی كـە لـە مـاڵو حـاڵی خۆیـان وەدەرنـراون، چونكـە جـاری وایـە مرۆڤـ بۆخـۆی كـۆچ ناكـات،

﴿ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي ﴾، وە ئەوانەی كە ئازاردراون لە پێناوی مندا، چونكە جاری وایە، مرۆڤ كۆچیش ناكاو دەریش ناكرێ، بەڵكو ئازار دەدرێ، جا ئەو ئازاردرانە، زۆر جۆرە: قسەیان پێ گوتراوە، فەسڵیان كردوون لە ئیشوكاریان، لێیان دراوە، پڕوپاگەندەیان بۆ كراوە، جەنگی دەروونییان لەگەڵ كراوە، لە رووی رزقو رۆزییەوە مافیان خوراوەو پێشێل كراوە ... هتد، ﴿ وَقَٰتَلُواْ ﴾، وە ئەوانەی كە جەنگیان كردوە لە پێناوی خوادا، ئەمە لێی وەردەگیرێ كە ئافرەتانیش بەشداریی جەنگ دەكەن، ﴿ وَقُتِلُواْ ﴾، وە ئەوانەی كە كوژراون لە پێناوی خوادا.

ئا ئەوانەی خاوەنی ئەو پێنج جۆرە كردەوەن، وێڕای ئەو ئیمانو عەقیدەو ڕازونیازو زیكرو بیركردنەوەیەی كە ڕابرد، كە لە ڕاستییدا دەبێ ئیمانو عەقیدەو زیكرو فیكر، ئەو كردەوانە لە ئینساندا پەیدا بكات، ئنجا ئیعتیباری پێدەكرێ، بەڵێ دەبێ ئیمانو عەقیدە، خواپەرستیی، زیكرو فیكر، وا لە خاوەنەكەی بكات كە ئامادەبێ لە پێناوی دینەكەیدا كۆچ بكاتماڵو حاڵی بەجێ بهێڵێو ئازار بدرێو جەنگ بكات بكوژرێو فیداكاریی بكات، ئنجا شایستەی ئەوە دەبێ كە خوا وەڵامی بداتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ئا ئەوانە ﴿ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾، بێگومان خراپەكانیان لێ دەسڕمەوە ﴿ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، وە بە دڵنیاییی دەشیانخەمە نێو چەندان باغێكەوە كە چەند ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، ئەوە پاداشتە لەلایەن خواوە ﴿ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴾، وە بێگومان خوا باشترین پاداشتی لەلایە، خوا ﷻ پاداشتی هەرە چاكی لایە.

ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ یان بە هەر كەسێك كە قورئان دەخوێنێ، دەفەرموێ: ﴿ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلْبِلَٰدِ ﴾، واتە: هاتنو چوونو گەڕانو سووڕانو خۆ بادانی ئەوانەی بێبڕوان لە وڵاتدا، با تۆ فریو نەدا،

واتە: هەڵمەخەڵەتێ بەو هێزو توانا ڕواڵەتییەی کە هەیانەو، بەوە چاوت نەترسێو، لە تەقدیرو حیسابی خۆتدا بەهەڵەدا نەچی ﴿ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۚ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴾، هەرچی هەیانبێت لە دنیادا ڕابواردنو گوزەرانێکی کەمە، پاشان جێگایان دۆزەخە، وە خراپترین شوێنی تێدا حەسانەوەو ئیسراحەت کردنیش دۆزەخە، ئەوە بەنسبەت ئەوانەوە ئەوە سەرەنجامیانە، ئەدی ئەهلی تەقوا ؟ بەنسبەت ئەهلی پارێزکارانەوە دەفەرموێ: ﴿ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، بەلاّم ئەوانەی پارێزیان لە پەروەردگاریان کردوە، چەند باغێکیان هەن کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن ! کە ئەگەر سەرنجتان دابێ هەمیشە خوا ﷻ کە باسی جێگاو ڕێگاو مەنزڵگای ئیمانداران دەکات دەفەرموێ: باغو باغچەو بێستانەو ڕووباری بەژێردا دەڕۆن، چونکە لەڕاستییدا خۆشترین کۆشك ئەگەر ئاوو باغو بێستانو سەوزایی لێ نەبێ، باغو باغاتی لێ نەبێ، ئینسان دڵی پێناکرێتەوە ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، واتە: وەك ژیانی دنیا ژیانێکی زوو تێپەڕو کاتییو کەم خایەن نیە، بەڵکو بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە ﴿ نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴾، ئەوە میوانداریەکە لەلایەن خواوە، لە لایەن خواوە میوانداریی دەکرێن، وە ئەوەی لەلای خواشە باشترە بۆ چاکەکاران، ئنجا لەبەر ئەوەی لەم سوورەتی ئالی عیمرانەدا زۆر باسی خاوەن کتێبەکان کراوە، چ ئەوانەی کە خراپنو کینە لە دڵنو ناحەزن بەرانبەر ئیسلامو مسوڵمانان، وە ئیمانیان بە پێغەمبەری کۆتایی نیە، وە چ ئەوانەیان کە ئەهلی ئینصافنو بڕوایان بە پێغەمبەری کۆتایی هێناوە، بۆیە خوا ﷻ لێرەدا دووبارە باسی خاوەن کتێبەکان دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ ﴾، واتە: بێگومان لە

خاوەن كتێبەكان كەسانێك هەن، واتە: هەموویان نا ! خراپیان هەیە، بەڵام چاكیشیان لەنێودا هەن، ﴿لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ﴾، ئیمان بە خوا دێنێ ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ﴾، وە ئیمان بەوە دێنێ كە بۆ ئێوە دابەزیوە كە قورئانە ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ﴾، وە ئیمان بەوەش دێنێ كە بۆخۆیان دابەزیوە كە تەوراتو ئینجیلو زەبوورو هەموو ئەو كتێبانەی دیكەن، ئنجا ﴿خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾، خۆ بە زلگرنین، بەڵكو بۆ خوا ملكەچن، ﴿لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾، وە بە ئایەتەكانی خوا نرخێكی كەم ناكڕن، واتە: بازرگانیی بە دینی خواوە ناكەن، وە بە ئایەتەكانی خوا نرخێكی كەم ناكڕن، وە ئایەتەكانی خوا ناشارنەوە لە بەرانبەر دەستكەوتێكی ماددیی كەمداو، سیفەتەكانی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ ناشارنەوە، كە لە كتێبەكانیاندا هاتوە، لە بەرانبەر ئەو بەرژەوەندییە ناشەرعییەدا كە لە دینەكەی خۆیاندا بۆیان پەیدادەبن، چونكە بۆ زانیارییتان زانایانی جوولەكەو نەصرانیی بە زۆریی كە ئیمانیان بە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ نەدەهێنا، بەڵام لەبەر ئەوە بوو، كە ئەو بەزمو بازاڕە ناشەرعییەی كە پێكیان هێنابوو، لێیان تێكدەچوو، ئنجا بۆ ئەوەی ئەو بەزمو بازاڕەیان لێ تێكنەچێ، ئیمانیان بە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ نەدەهێنا، بەڵام ئەوانە وانین، ئەوانە لە بەرانبەر ئەو نرخە كەمەدا ئایەتەكانی خوا ناشارنەوەو، ئایەتەكانی خوا ناكەنە كاڵایەكی دنیایی، كە بەرژەوەندییەكی كەمی دنیایی پێ وەدەست بێنن، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، ئا ئەوانە پاداشتی تایبەتی خۆیانیان لەلای پەروەردگاریان هەیە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾، بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە، لە كۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ ﴾، ئـــەی ئـــەوانەی بڕواتـــان هێنـــاوە ! خۆڕاگربن، واتـە: لـە خـودی خۆتانـدا خۆڕاگـربن، لەسـەر طاعـەت خۆڕاگـربنو ئەنجـامی بـدەن، وە لـە بەرانبـەر گوناحـدا خۆڕاگـربنو توخنـی مەکـەون، وە لەسـەر بـەڵاو موصیبـەت خۆڕاگـربنو سـکاڵا مەکـەنو ناشـوکریی دەرمـەبـڕن، وە لە هـەموو حـاڵەتەکاندا لە زاتـی خۆتـاندا خۆڕاگربن.

٢- ﴿ وَصَابِرُواْ ﴾، وە لە بەرانبـەر دوژمنـانو ناحەزانتانـداو لـە بەرانبـەر گرفتو کێشـەو تەنگو چەڵەمەکانـدا کە دێنـە ڕێتـان، خۆڕاگـربن.

٣- ﴿ وَرَابِطُواْ ﴾، وە لە شـوێنی خۆتان مەجووڵـێنو چەسپاوبنو نەلەخشاوبن، چ لـە مەیـدانی جەنگدا، چ لەکـاتی عیبـادەتو طاعەتـدا، چ لەسـەر بانگـەواز، چ لەسەر فەرمـان بـە چاکەو ڕێگریـی لـە خراپـە، چ لـە خێـرو خۆشیی فێرکردنـی خەڵکدا، لە هەموو مەوقیعـەکاندا کە پـێویست دەکات بۆ خزمـەت دینـی خــوا، نەلەخشـاوبنو دامـەزراوبنو مەجووڵـێن، ئـەوە مانایـەکی (وَرَابِطُواْ )، مانایـەکی دیکـەی: واتـە: پـێکـەوە پەیوەسـت بـنو یەکدی مەحکـەم بکـەن، هـەر کامێکـتان پەیوەسـت (ربـط)بـێ لەگـەڵ ئەوی دیکـەدا.

٤- ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، وە پارێـز لە خـوا بکـەن، کـە دیارە پارێز لـە خــوا کـردن (صـبرو مـصـابرة و مرابطـة)ش دەگرێتــە نێــوخۆی، چونکــە ئەگـەر ئینـسان خـۆی پاراسـت لـەو شـتەی کـە خـوا پـێـی ناخۆشـە، خـوا بـێ صـەبریی پـێناخۆشـە، وە لە بەرانبەر دوژمناندا ترسو لـەرزی پـێناخۆشــە، وە جووڵــە جــووڵی پـێناخۆشــە، لـەو مەوقیعــەدا کــە پـێویــستە مرۆڤــ تێیــدا دامەزراوبێ، کەواتـە: هـەر کەسێك ئـەو ســێ سـیفەتەی پـێشـێی نـەبوون، واتـە: تەقــوای نـەبــووە، بـەڵام دیـارە تەقـوا جگـە لـەو ســێ سـیفەتە، شـتی دیکـەش دەگرێتـەوە، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، وە پـارێز لـە خـوا بکـەن بەڵـکو سـەرفرازبـن، واتـە: ئەگـەر خـاوەنی ئـەو چـوار سـیفەتـەبن،

ئێوە سەرفراز دەبن، سەرفرازییش واتە: لە دنیادا بەختەوەر دەبن، وە لە دواڕۆژیشدا ڕووسوورو سەربەرزو سەرفراز دەبن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار، لە ئایەتی ژمارە: (١٩٠ تاکو ٢٠٠) ئەم یازدە ئایەتە گرنگییەکی تایبەتیان هەیە، دیارە هەموو ئایەتەکانی خوا گرنگییان هەیە، بەڵام ئەم یازدە ئایەتە گرنگیی تایبەتییان هەیە، وەك لەم دوو فەرموودەیەی پێغەمبەردا ﷺ بۆمان دەردەکەوێ، وە هەر کەسێکیش تەماشای ئایەتەکان بکات بۆی دەردەکەوێ، بەڵام دیارە کە ئێمە دەرفەتمان نیە کە وەك پێویست لە بەرانبەر هەموو ئایەتەکاندا هەڵوەستەی باش بکەین، بەڵام زۆرجار دەمانەوێ ئەوەی کە نەگونجاوە لە مانای گشتی ئایەتەکاندا بیخەینە ڕوو، لە مەسەلە گرنگەکاندا ڕوونی بکەینەوە، جا با تەماشای ئەم دوو فەرمایشتە بکەین، کە دەربارەی گرنگیی‌و پلەو پایەی ئەم یازدە ئایەتە دەدوێن:

**فەرمایشتی یەکەم:** {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ بَاتَ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ وَهِيَ خَالَتُهُ، فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا؛ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ؛ ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ} رَوَاهُ مَالِكٌ فِي (الموطأ)

بـرقم: (٢٦٥) وَأَحْمَـد بـرقم: (٢١٦٤)، وَالبَخَـارِيُّ بـرقم: (١٨٣) وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (١٧٨٧) وَأَبُـودَاوُدَ بـرقم: (١٣٦٩)، وَالنَّـسَائِيُّ بـرقم: (١٦٢٠)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (١٣٦٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٥٩٢)، وَالبَزَّار برقم: (٥٢٠٦)، وَابْنُ خُزَيْمَـةَ بـرقم: (١٦٧٥))، واتـه: عەبدوڵـڵای کـوڕی عـەبباس - خـوا لێیـان ڕازی بـێ-، دەڵـێ: شـەوێك لـە لای مەیموونـە هاوسـەری پـێـغەمبەر ﷺ کە خوشکی دایکـیـەتی (واتە: پـلکیـەتی) لـە ماڵـی پـێغەمبـەر ﷺ مامـەوە، ئـەو دۆشـەك، یاخـود ئـەو بەڕەیـەی ڕایانخـستبوو، مـن لـە بـاری پانییەکـەی نووسـتبووم (دیـارە عەبدوڵڵای کوڕی عەببـاس منـداڵ بـووە هێـشتا باڵـغ نـەبووە)، پـێـغەمبەری خوا ﷺو خێزانی لـە بـاری درێژییەکەی دا خـەوتن، پـێـغەمبەری خـوا ﷺ خـەوت، هـەتا کاتێك کە شـەو بـە نیـوە بـوو، یـان تۆزێـك پـێش ئـەوە، یـان بـە کـەمێك دوای شــەو بــە نیــوە بــوون (هــەڵبەتە ئـەوە بـە مەزەنـدەی خـۆی وایگوتـوە، چونکە ئەو کاتـە سـەعات نـەبووە تـاکو بـزانن)، پـێـغەمبەری خـوا ﷺ لە خەو هـەڵسا، وە بە دەستی خـەوی لـە چـاوی سـڕی، تـاکـو خــەوی لـێ بـڕوا، پاشــان پـێغەمبــەری خـوا ﷺ دە ئـایـەتی کـۆتـایـی سـووڕەتـی ئـالـی عیمـرانی خوێنـدن (کـە خـۆی یـازدە ئایەتـە بـەڵام هـەر گوتوویانـە: دە ئایـەت، کـە ڕەنگـە لـە ژماردنەکـەدا دوو ئایـەتیان پـێکـەوە حیـساب کردبـێ، یاخـود جاری وایـە ئەوان یازدەشـیان بـە دە دانـاوە، دوازدەشـیان جاری وایـە بــە دە دانـــاوە) دوایــی هەڵــسا بــۆ کوندەیــەك یــاخود مەشــکەیەك کــە هـەڵواســرابوو (کـە ئــاوی تێـدا بـووە) دەســتنوێژی لێگــرت دەســتنوێژێکی پوخــتو چـاکی گـرت، دوایـی هەڵـسا نوێـژی کـرد، دەڵـێ منـیش هەڵـسام پــێغەمبەری خــوا ﷺ چــی کــردبوو، منــیش وامکــرد (واتــە: وەك وی دەستنوێژم گرت) دوایـی هـەڵسام لـە تەنیـشتی ڕاوەستام پـێـغەمبەری خـوا ﷺ دەستی ڕاستی بە سەرم داهێنـا، وە بە دەستی ڕاسـتی گوێی گـرتم، ﴿وەك لاواندنــەوە (ملاطفـة) چـونکە گـچکە بـووە﴾ دوایـی پـێـغەمبەر ﷺ دوو ڕکــاتی کـردن، پاشـان دوو ڕکـاتی دیکـەی کـردن، پاشـان دوو ڕکـاتی دیکـەی

كردن، پاشان دوو ڕكاتی دیكەی كردن، پاشان دوو ڕكاتی دیكە، پاشان دوو ڕكاتی دیكە، (ئەوە دوازدە) دوایی یەك ڕكاتی كرد (ئەوە سێزدە ڕكات).
﴿دیارە جاری واش هەبووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ یازدە ڕكاتی كردوون، هەشت ڕكاتی شەونوێژو سێی وەتر، بەڵام لێرەدا هەشتی شەونوێژی كردوون، پێنجی وەتری كردوون، چونكە وەتر دەگونجێ یەك ڕكات بێ، سێ ڕكات بێ، پێنج ڕكات بێ، حەوت ڕكات بێ، وە دەگونجێ زیاتریش بێ﴾، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاكشا لەسەر جێگاكەی تاكو بانگدەر هات ئاگاداری كردەوە، كە ئەوە بەرەبەیانە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ هەڵسا دوو ڕكاتی سووكی كردن، واتە: دوو ڕكاتی پێش نوێژی بەیانی، پاشان لە ماڵ چووە دەر نوێژی بەیانی كرد، ئەوە یەكێ لەو فەرموودانەی، كە وەك گوتمان گرنگیی ئەم یازدە ئایەتە دەخاتەڕوو.

**فەرمایشتی دووەم:** {رَوَى ابْنُ مُرْدَوَيَةَ عَنْ عَطَاءِ قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَابْنُ عَمْرٍ وَعُبَيْدُ بْنُ عُمَيْرٍ إِلَى عَائِشَةَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا حِجَابٌ، فَقَالَتْ: يَا عُبَيْدُ، مَا يَمْنَعُكَ مِنْ زِيَارَتِنَا؟ قَالَ: قَوْلُ الشَّاعِرِ: زُرْ غِبًّا تَزْدَدْ حُبًّا ... فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: ذَرِينَا أَخْبِرِينَا بِأَعْجَبِ شَيْءٍ رَأَيْتِهِ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَبَكَتْ وَقَالَتْ: كُلُّ أَمْرِهِ كَانَ عَجَبًا، أَتَانِي فِي لَيْلَتِي حَتَّى مَسَّ جِلْدُهُ جِلْدِي، ثُمَّ قَالَ: ذَرِينِي أَتَعَبَّدُ لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّ قُرْبَكَ، وَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ تَعَبَّدَ لِرَبِّكَ، فَقَامَ إِلَى القِرْبَةِ فَتَوَضَّأَ وَلَمْ يُكْثِرِ صَبَّ الماءِ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَبَكَى حَتَّى بَلَّ لِحْيَتَهُ، ثُمَّ سَجَدَ فَبَكَى حَتَّى بَلَّ الأَرْضَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَى جَنْبِهِ فَبَكَى، حَتَّى إِذَا أَتَى بِلاَلٌ يُؤْذِنُهُ بِصَلاَةِ الصُّبْحِ قَالَتْ: فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللهِ، مَا يُبْكِيكَ؟ وَقَدْ غَفَرَ اللهُ لَكَ ذَنْبَكَ مَا تَقَدَّمَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَقَالَ: وَيْحَكَ يَا بِلاَلُ، وَمَا يَمْنَعُنِي أَنْ أَبْكِيَ، وَقَدْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِي هَذِهِ اللَّيلَةِ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾،

ثُمَّ قَالَ: وَيْلٌ لِمَنْ قَرَأَهَا وَلَمْ يَتَفَكَّرُ فِيهَا} (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّان فِي (صحيحه) برقم: (٦٢٠) وَالْمُنذِرِي وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح الترغيب) برقم: (١٤٦٨)، (السلسلة الصحيحة) برقم: (٦٨)[1]، واتە: عەطاء (كە یەكێكە لە زانایانی تابعین) دەڵێ: منو ئیبنو عەمر (واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص) وە عوبەیدی كوڕی عومەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) چووین بۆ لای عائیشە (دایكی ئیمانداران وە هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ) لێی وەژوور كەوتین لە نێوانی ئێمەو ئەودا پەردە هەبوو (وەك خوا فەرمانی بە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ كردوە، ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ...﴿٥٣﴾﴾الأحزاب، كە دیارە ئەو پەردە گرتنەوەیە تایبەتە بە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ، وەك ئەوە كە لەسەریان پێویست بێ) دایكمان عائیشە بە عوبەیدی كوڕی عومەیری گوت: چ شتێك ڕێت لێ دەگرێ كە زیاتر سەردانمان بكەی؟ ئەویش گوتی: قسەی شاعیر كە دەڵێ: (زُرْ غِبًّاً تَزْدَدْ حُبًّاً)، واتە: كەم كەم سەردان بكە، بۆ ئەوەی كە زیاتر خۆشەویستیت زیاد بكات، ئنجا ئیبنو عەمر گوتی: لێمانگەڕێ ئەی دایكی ئیمانداران، هەواڵمان پێبدە بە سەرسووڕهێنەرترین شت كە لە پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە ؟ ئەویش گریاو گوتی: حاڵو وەزعو ئیشوكاری پێغەمبەر ﷺ هەمووی جێی سەرسووڕمان بوو، شەوێكیان (واتە: لەو شەوانەی كە نۆرەی دایكمان عائیشە بووە) هاتە لام هەتاكو دەستم بە دەستی كەوتو پێستی بە پێستم كەوت، دوایی گوتی: لێمگەڕێ با بچم پەروەردگاری پایەبەرزو مەزنم بپەرستم، دەڵێ: منیش گوتم: بە خوا حەز دەكەم لێم نیزیك بی (نیزیكیی تۆم پێ خۆشە)، بەلام پێشم خۆشە پەروەردگاریشت بپەرستی، ئیدی هەڵسا مەشكەیەك (كوندەیەك) ئاو لەوێ بوو دەستنوێژی لێگرت،

---

١) الْمِصْبَاحُ الْمُنِير فِي تَهذِيب تفسير ابْنُ كَثِير، ص : (٢٦٧).

بەڵام زۆری لێ بەكارنەهێنا (وا باشە ئینسان لە دەستنوێژو لە غوسڵو ئەوانەدا ئاو زۆر بەكارنەهێنێو زێدەڕۆیی نەكات)، پاشان هەڵسا شەونوێژی كرد، بە پێوە گریا تا ڕیشی موبارەكی بە فرمێسكان تەڕ بوو، دوایی سەجدەی برد لە سەجدەشدا گریا، هەتاكو زەوییەكەی تەڕ كرد، دوایی ڕاكشا لەسەر تەنیشت دیسان گریا (واتە: دوای ئەوەی كە شەونوێژەكەی تەواو كردوە)، هەتا دوایی بیلال هات بۆ نوێژی بەیانی، دەڵێ: بیلال گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ چ شتێك تۆ دەگریەنێ، خۆ خوا لە هەموو گوناهەكانی ڕابردووو داهاتووت خۆشبووە ؟ فەرمووی: بێ قەزابی بیلال، چ شتێك ڕێم لێدەگرێ كە بگریەم، وە ئەمشەو ئەمەم بۆ هاتۆتە خوار ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾، (كە لە ڕیوایەتەكانی دی دەڵێ: یازدە ئایەتەكە هەمووی هاتنە خوار) پاشان فەرمووی: سزای سەخت بۆ كەسێك كە ئەمە دەخوێنێتەوەو بیری لێناكاتەوە. واتە: ئەم ئایەتانە تایبەتمەندییەكی خۆیانیان هەیە پێویستە هەر كەسێك خوێندنی بیریان لێ بكاتەوە، ئنجا مادام پێغەمبەریش ﷺ ئەوەندە بەم ئایەتانە كارتێكراو بووبێ لە شەوی دابەزێنرانیاندا، دیارە كە ئەو شەونوێژانەی كردوە ئەوەندە گریاوە بە پێوەو بە دانیشتنەوەو بە كڕنووشەوەو بە ڕاكشانەوە، وا دیارە زۆر كاریان لە دڵو دەروونی موبارەكی پێغەمبەر ﷺ كردوە، وە بەڕاستییش هەر كەسێك ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوەو تەفاعولیان لەگەڵدا بكات، لەقەدەر ئیمانیو بە گوێرەی تێگەیشتنی لە ئایەتەكان، كاریگەرییان لەسەری دەبێ.

<u>**مەسەلەی دووەم:**</u> كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، خوا ﷻ لە زۆر ئایەتاندا باسی ئاسمانەكانو زەوی، یاخود ئاسمانو زەوی دەكات، كە دیارە مەبەست لە

ئاسمانەكانو زەوی، یاخود ئاسمانو زەوی واتە: سەریو خواریی دروستكراوەكان، بۆیە ئەگەر كەسێك بیەوێ باسی شتێك بكات دەڵێ: سەرتاپای یاخود سەرلەبەری، لەسەریی تا خواریی، وشەی: (سماء) دەڵێ: (كُل مَا عَلاكَ، كُل مَا فَوْقَكَ) واتە: هەرچی كە لە سەرووی تۆوەیە، ئەوە پێی دەگوترێ (سماء)، زەوییش ئەوەیە كە لە خوار تۆوەیە، كەواتە: كە خوا دەفەرموێ: ئاسمانو زەوی، یاخود ئاسمانەكانو زەوی، واتە: هەموو بوونەوەر، یاخود هەموو ئەوەی كە خوا دروستی كردوە، چونكە بوونەوەر بە زاراوی ئێستا كە دوایی باسی دەكەم، بوونەوەر (كَوْن) گۆشەیەكە لە دروستكراوەكانی خوای پەروەردگار، ئنجا خوای زاناو شارەزا، هەواڵی بە ئێمە داوە كە ئاسمانەكان حەوتن، هەروەها زەوییەكانیش حەوتن، وەك لە ئایەتی: (٢٩)ی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو كەسەیە كە هەرچی لە زەوییدا بۆ ئێوە پێویستە هەمووی بۆ دروستكردوون، پاشان ویستی ئاسمانەكان دروست بكات لە حەوت ئاسماندا رێكی خستن، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە، هەڵبەتە لە چەند ئایەتێكدا ئاماژە بەوە كراوە كە ئاسمانەكان حەوتن، وەك لە ئایەتی ژمارە: (٢٩)ی سوورەتی (الْملك)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ... ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئەو كەسەی حەوت ئاسمانی لەسەر یەك دروستكردوون، هەندێك دەڵێن: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە ئاسمانی یەكەم لە نێو ئاسمانی دووەم دایە، ئاسمانی دووەم لە نێو ئاسمانی سێیەم دایەو، ئاسمانی سێیەم لە نێو ئاسمانی چوارەم دایە، وە ئاسمانی چوارەم لە نێو ئاسمانی پێنجەم دایەو، ئاسمانی شەشەم لە نێو ئاسمانی حەوتەم دایە، واتە: وەك چۆن توێكڵەكانی پیوازێك دەچنە نێو یەك بەو شێوەیە، واتە: ئاسمانی نیزیك

لە ئێمە كە ئاسمانی دنیایە، بچووكترین ئاسمانە، وە ئاسمانی حەوتەم فراوانترینیەتی، ئنجا عەرشی خوای بێ وێنەش لەسەر حەوت ئاسمانەكانەوەیە، بەڵام تەنیا لە یەك ئایەتدا ئاماژە بەوە كراوە كە زەوییەكانیش حەوتن، ئەویش لە ئایەتی كۆتایی سوورەتی (الطلاق)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو كەسەیە كە حەوت ئاسمانی دروست كردوون، وە لە زەوییش حەوت، فەرمانی خوا بە نێویاندا دێتە خوار، ئەو ڕاستییەی بۆ بەیان كردن تاكو بزانن، خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، وە زانیاریی خوا دەوری هەموو شتێكی داوە.

دیارە ئێمە ئێستا دەرفەتمان نیە، بە دوای شەرح و تەفسیری حەوت زەوییەكان بكەوین، بەڵام بۆ ئەوەی كە فراوانیی دروستكراوەكانی خوا بزانین، دەڵێین: بە دەقی قورئان هەرچی ئێمە دەیبینین، نەك هەر بە چاوی ڕووت، بەڵكو ئەوەی كە بە تەلسكۆبەكانیش دەبینرێ، كە تەلسكۆبی وا هەیە ملیۆنان ساڵی تیشكی دوور لە ئێمە دەبینێ، واتە: ئەو كەهكەشانانەی كە ملیۆن ساڵی تیشكی دوورن، (ساڵی تیشكی) واتە: ئەو ماوە زەمەنییەی كە تیشك لە ماوەی ساڵێكدا دەیبڕێ، تیشك لە یەك چركەدا سێ سەد هەزار (٣٠٠٠٠٠) كیلۆمەتر یاخود سەدو هەشتاو شەست هەزار (١٨٦٠٠٠) میل دەبڕێ، جا چركەیەك جاران (ضرب)ی (٦٠) بكە بۆ ئەوەی بۆت دەركەوێ كە تیشك لە دەقیقەیەك چەند دەبڕێ ؟ ئەنجامەكەی دووبارە جارانی (٦٠) بكە تاكو ئەو ماوەیەت بۆ دەركەوێ، كە تیشك لە سەعاتێكدا دەیبڕێ، ئنجا ئەنجامەكەی جاران (ضرب)ی (٢٤) بكە، بۆ ئەوەی بزانی داخۆ لە شەوو ڕۆژێكدا چەند دەبڕێ ؟ ئنجا دوایی ئەویش جاران (ضرب)ی (٣٦٥) بكە، بۆ ئەوەی بزانی داخۆ لە ساڵێكدا تیشك چەند

دەبڕێ ؟ هەر زۆر زۆرە، جا کەهکەشانی وا هەیە نەك ساڵێك و دوو ساڵ، بەڵکو بە ملیۆن ساڵی تیشکی لە ئێمەوە دوورە، بەڵام بە دووربینەکانیش دەبینرێ، بۆ وێنە: تیشکی ڕۆژ (خۆر) بە هەشت دەقیقەو دوو چرکە دەگاتە ئێمە، بەڵام کەهکەشان و ئەستێرەی وا هەیە ملیۆنان ساڵی پێدەچێ، تا ئێمە تیشکەکەی دەبینین، کە ڕەنگە کەهکەشان و ئەستیرەی وا هەبێ کاتێك ئێمە تیشکەکەی دەبینین، بۆخۆی لەمێژبێ نەمابێ، چونکە وەك زانایانی گەردووناس دەڵێن: ئەستێرەکانیش پیردەبن و کەهکەشانەکانیش گۆڕانیان بەسەردا دێ، هەندێکیان نامێنن و ئیدیکە دروست دەبن، جا ئەوەی کە ئێمە دەیبینین هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەمدایە[1].

جا بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە کە ئەم بوونەوەرەی دەیبینین هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دایەو گۆشەیەکی گچکەی بوون (وجود)ە ؟! ئەم ئایەتەیە کە خوا ﷻ باسی خۆی دەکات و دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ۝٣ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ۝٤ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ۝٥ ﴾ الملك، واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە حەوت ئاسمانی لەسەر یەکی دروستکردوون، لە دروستکراوی خوای خاوەن بەزەییدا نارێکی نابینی، چاوبگێڕە بزانە هیچ نارێکیی دەبینی ! دوایی دوو جاری دیکە (یاخود جار لە دوای جار) چاوبگێڕە، وردبەوە بزانە نارێکیی دەبینی ! سەرەنجام چاوت دەگەڕێتەوە بۆ لات بە دەرکراویی و بە ماندوویی، (واتە: بە ئامانج ناگاو هیچ کەموکووڕییەك نابینێ، وە ماندووش دەبێ، پاشان

---

١) بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی فراوانیی بوونەوەرو ڕێك و پێکییەی کە تێیدایە، دەتوانی سەرنجی کتێبی (خواناسیی، ئایین، ئیمان)، لاپەڕە (١٦٢ - ١٧٢) بدەی، بابەتی: (بوونەوەر بە گشتی)، چاپی دووەم ٢٠٠٨.

دەفەرمویٚ:) وە بێگومان ئاسمانی نیزیكمان بە چراخان ڕازاندۆتەوە، وە ئەو ئەستیرانەمان كردوون بە مایەی بەردبارانكردنی شەیتانەكان، وە سزای كڵپەداری دۆزەخیشمان بۆیان ئامادە كردوە.

كەواتە: هەرچی ئێمە دەیبینین، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەكەم دایە، ئنجا ناشزانین ئەو ئاسمانی یەكەمە لە كوێ كۆتایی پێ دێ، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە ؟ بەڵگەمان ئەوەیە كە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ...﴿٥﴾ ﴾الملك، كە مەرج نیە ئاسمانەكانی دیكە بە ئەستیرەكان ڕازابنەوە، كە خوا لێرەدا بە چراخان ناوی دەبا، (مصابیح) كۆی (مصباح)ە، واتە: چرا، چونكە خوا دەفەرمویٚ: ئاسمانی نیزیك لە ئێوەمان (كە ئاسمانی یەكەم دەكات بەنسبەت ئێمەوە) بە ئەستێرەكان ڕازاندۆتەوە، كەواتە: هەرچی ئەستێرەو كەهكەشان هەیە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەكەمدایە، وە ناشزانین ئەویش سنوورەكەی تا كوێیە، كەواتە: ئەوەی كە بە زاراوی گەردووناسیی ئێستا، پێی دەگوترێ بوونەوەر (كون) گۆشەیەكە لە دروستكراوەكانی خوا، جا حیسابی خۆتانی بۆ بكەن، موڵكی خوا چەند فراوانە ؟! ئنجا خوا دەفەرمویٚ: لە دروستكرانی ئاسمانەكانو زەویو جێگۆڕكەو جیاوازیی شەوو ڕۆژاندا بەڵگەو نیشانە هەن، بەڵگەو نیشانەی چی ؟ خوا ناسیی، پەروەردگاریێتیی خوا، بەدیهێنەرایەتیی خوا، خاوەنداریێتیی خوا، پەرستراویێتیی خوا، بەلاٚم بۆ كێ ؟ بۆ خاوەن عەقلاٚن، ئەگەرنا ئەوەی كە خاوەن عەقڵ نەبێو، ئەوەی بێهۆشو گۆش بێ، دیارە هیچ سوود نابینی، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ ... وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ یونس، واتە: نیشانەو ئاگاداركەرەوەكان، چ سوودێكیان هەیە بۆ كەسانێك كە نەیانەوێ ئیمان بێنن، هیچ !!

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: كە خوا ﷻ بە چەند سیفەتێك مەدحی خاوەن عەقلاٚن دەكات، ئەو خاوەن عەقلاٚنەی كە لە دروستكرانی ئاسمانەكانو زەوییو

لە جیاوازیی شەوو ڕۆژاندا، نیشانەكانی گەورەیی‌و دەسەڵاتو بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتیی خوا دەبینن :

سیفەتی یەكەم: دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ ﴾، ئەوانەی كە یادی خوا دەكەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان، ئینسان سێ حاڵەتی هەن: یان بە پێوەیە، یان بە دانیشتنەوەیە، یان ڕاكشاوە، لەوە بەولاوە نییە، یانی لە هەموو حاڵەكانیاندا یادی خوا دەكەن، تەماشا بكەن لە ڕوانگەی قورئانەوە كێ بە خاوەن عەقڵ دادەنرێ ؟ كەسێك كە هەمیشە پەروەردگاری لە یادبێ، ئەوە عاقڵە، وە كەسێك كە لە دروستكرانی ئاسمانەكان‌و زەوییدا گەورەیی‌و بەدیهێنەرایەتی‌و ناوو سیفەتە بەرزو پەسندەكانی خوا دەخوێنێتەوە، وەك یەكێ لە شاعیرەكان دەڵێ:

وَفِي كُلِّ شَيءٍ لَهُ آيَةٌ تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدٌ

لە هەموو شتێك نیشانەیەكی هەیە

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە تاكەوتەنیایە

وە دایكمان عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- كە نیزیكترین كەسە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هەمیشە هاوسەر لە هەموو كەس باشتر هاوسەری خۆی دەناسێ، هەم ژن مێردی خۆی دەناسێ، وە هەم مێرد ژنی خۆی دەناسێ، دەربارەی هەمیشە خوا یادكردنی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٤١٩)، وَالبُخَارِيُّ مُعَلَّقاً برقم: (١٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧٣) وَوَصَلَهُ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٨٤)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٢٠٧) وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٠١)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو كاتاندا یادی خوای دەكرد، هەڵبەتە لە هەموو حاڵەتاندا یادی خوا كردن، ئەوەنییە كە تەسبیحێكی بە دەستەوەبێ‌و هەمیشە (أستغفر اللّه)ی كردبێ، یان (لا إِلَهَ إلا اللَّه)ی

کردبێ، یان (سُبْحَانَ اللَّه)ی کردبێ ! بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بێئاگا نەبووە لە خوا، لە گەرمەی کارو کەسابەتدا، لە گەرمەی جەنگو جیهاددا، لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە کاتی نان خواردنو لە کاتی هەڵسانو دانیشتندا، لە شەوو ڕۆژدا، هەمیشە دیار بووە کە خوای پەروەردگاری لە یاد بووەو، هەمیشە لەگەڵیدا بووەو لە خوا بێئاگا نەبووە، دەبێ ئێمە مەفهوومی ڕاستو دروستی یادی خوا بزانین، تاکو تێیدا بەهەڵە نەچین، پێمان وابێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەك هەندێ سۆفیو دەروێش کە بە ڕواڵەتی یادی خوا دەکەن، تەسبیحێکی بەدەستەوەیە هەمیشە زیکرێك بکا ! خۆ ئەگەر وابێ ئیشوکاری دیکەی بۆ ناکرێ، نەء، یادی خوا لە دڵدا بوون، دەگونجێ لە گەرمەی کاروکەسابەتو حوکمڕانیی سیاسەتو جەنگو جیهادو چالاکی کۆمەڵایەتییو ئەوانەدا بکرێ کە یادی خوا بە پلەی یەکەم بە دڵە، پاشان جاری وایە پێویست دەکات بە زمانیش بێ، ئەو یادی خوایەو ڕێگریی هیچ چالاکییەکەت لێ ناکات، بەڵام ئەویدیکە تەسبیحێکت بە دەستەوەبێ، لە کاتێکدا کە تۆ خەریکی تەسبیحاتی بە زارو بە تەسبیح مەجالی ئیشی دیکەت نابێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو جۆرەی دیکەیان یادی خوای پەروەردگاری کردوە، هەرچەندە ئەگەر کەسێکیش بەرد بەکاربێنێ، پەنجە بەکاربێنێ، تەسبیح بەکاربێنێ، بۆ یادی خوا، ئەوەش هیچ ناشەرعیی تێدانیە، بە تایبەتی پەنجەکان کە پێغەمبەری خوا ﷺ یادی خوای بێوێنەی بە پەنجەکانی کردوە، وە هەندێك لە خێزانەکانی یادی خوای پەروەردگاریان کردوە بەردیان لە تەنیشت خۆیان داناوە، هەروەها تەسبیحیش بەکاربێنی، هیچی ناشەرعیی نیە[1].

---

١) ئەم فەرموودەیەش لەوبارەوە بەڵگەیە: (عن سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه أنه دخل مع رسول الله ﷺ على امرأةٍ وَبيْن يَدَيْها نوىً - أو حَصىً - تسبح به) رواه الترمذي: (٣٥٦٨)، وقال: حديث حسن.
زانایان ئەم دەقەیان بە بەڵگەی ڕەوایی بەکارهێنانی تەسبیحو بەردو...هتد بۆ زیکرکردنو ژماردن، هێناوەتەوە، بڕوانە (ریاض الصالحین)، ص: (٤٦٩) پەراوێزی ژمارە (٣).

**سیفەتی دووەم**: دەفەرموێ: ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، بە زۆری وابووە مسوڵمانان ئەوەی ئەهلی زیکر بووبێ، ئەهلی فیکر نەبووە، بەڵام ئەو مسوڵمانانەی کە قورئان پەروەردەیان دەکات دەبێ هەم ئەهلی زیکربنو هەم ئەهلی فیکربن، ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، بە دڵ لە هەموو حاڵەکانیاندا خوایان لە یادە، بەڵام بە هەمیشەش بیر لە دروستکراوەکانی خوا دەکەنەوە، واتە: هەم دڵێکی بێداریان هەیەو هەم عەقڵێکی هۆشیار، بەڵام وەك گوتم: بە زۆریی وابووە مسوڵمانان، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە پەروەردەی قورئان دوورکەوتوونەتەوە، یان ئەهلی دڵ بوون، هەر خەریکی زیکرو دوعا بوون، بەڵام لە ڕووی فیکرییەوە دواکەوتوو بوون، یان ئەهلی فیکر بوونو فەیلەسووف ئاسا دڵێکی مردوویان هەبووە، کە دیارە مسوڵمانی هاوسەنگو مسوڵمانی پەروەردەی قورئان، ئەوەیە کە هەم ئەهلی دڵ بێ، وە هەم ئەهلی عەقڵ بێ.

وە دەربارەی گرنگی بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا، ئەم فەرمایشتە هەیە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بينَمَا رَجُلٌ مُسْتَلقٍ عَلَى فِرَاشِهِ فَنَظَرَ إِلى السماءِ وَالنُجوم، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ لَكِ رَبّاً وَخَالِقاً، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، فَنَظَرَ اللّهُ إلَيْهِ فَغَفرَ لَهْ} (أخرجه السيوطي في الدر المنثور، وعَزَاهُ لأبي الشيخ في (العَظَمَةَ) والديلمي مِن حَديث أَبِي هُرَيْرَةَ)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوێك لەسەر پشت ڕاکشا بوو لەسەر جێی خۆی (دیارە شەو بووە) تەماشای ئاسمانو ئەستێرەکانی دەکرد، گوتی: شایەدیی دەدەم کە تۆ پەروەردگارێكو بەدیهێنەرێکت هەیە (ئەی ئاسمان ! ئەی ئەستێرەکان !)، ئەی خوایە ! لێم خۆشبە، لێم بوورە، خوای پەروەردگاریش تەماشای کردو چاوپۆشیی لێکرد، واتە: خوای پەروەردگار بە ڕەحمەت تەماشای کرد.

هەروەها (الدیلمي) لە ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- هێناویەتی: {تَفَكُّرُ سَاعَةٍ خَيْرٌ مِنْ عِبَادَةِ سَنَةٍ} كنز العمال برقم: (٥٧١١)، واتە: بیرکردنەوەی سەعاتێك لە خواپەرستیی ساڵێك چاكترە، واتە: بیرکردنەوەیەك كە خواپەرستیی لەگەڵدابێ، ئەگەرنا بیرکردنەوەیەك كە خواپەرستیی لەگەڵدا نەبێ، هیچ نیە.

ئنجا (مەحوی) شاعیر زۆر جوانی گوتوە:

سەر كە هۆشێكی نەبێ     زرکە تالّم بۆچییە
دڵ كە جۆشێكی نەبێ     شیشەی بەتالّم بۆچییە ؟

ڕاستە، سەر ئەگەر هۆشو گۆشی تێدانەبێ، وەك زرکە تاڵە وایە، واتە: كاڵەكی پێنەگەیشتوو، كە ناخورێو تاڵە، وە دڵ كە (جۆشێكی نەبێ) واتە: جۆشو سۆزو بێداریی بەرانبەر خوای پەروەردگاری تێدانەبێ، ئەویش وەك شوشەی بەتاڵ وایەو هیچ سوودی نیە.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾، پەروەردگارمان ! ئا ئەمەت بە هەوەنتە (باطل) واتە: پووچ، بێ ئامانج، بێ سوود، بێ حیكمەت دروست نەكردوە، ئەمە بەرهەمی خوا یادكردنو بیركردنەوە لە دروستكراوەكانی خوایە، بە شێوەیەكی ڕاستو دروست، هەر كەسێك ئەهلی زیكرو فیكربێ، زیكرو فیكر دەیگەیەنێ بەو ئەنجامە كە بڵێ: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا﴾، پەروەردگارمان ! ئا ئەمەت بە گاڵتەو بێ حیكمەت نەخوڵقاندوە، واتە: هەر كەسێك عەقڵی خۆی بەكاربێنێ بۆ دۆزینەوەی نهێنییەكانی دروستكراوەكانی خواو یاساكانیان، وە دڵیشی بەكاربهێنێ بۆ بەسەر دڵی خۆداهێنانی ناوی خواو سیفەتەكانی خوا، وە ناسینو خۆشویستنی خوای پەروەردگاری لە دڵدابێ، دەگاتە ئەو سەرەنجامە كە بوونی ئەو كائیناتە بێ

حیكمەت نیە، جا خوا ﷻ لە زۆر شوێندا ئەم حەقیقەتەی بەیانكردوە، كە ئەم كائیناتو بوونو (وجود)ەی بە گاڵتەو بێ حیكمەتو بێ ئامانج دروست نەكردوە، بۆ وێنە: لە ئایەتی: (٢٢)ی سوورەتی (الجاثیة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: وە خوا ئاسمانەكانو زەوی بە هەق دروستكردوون (بە هەق واتە: بۆ هێنانەدی هەق، یاخود بەهەق واتە: حیكمەتو ئامانجێكیان لە پشتەوەیە كە خوا لە ڕستەی دواییدا ئاماژەی پێدەكات) ئەو هەقە یاخود ئەو حیكمەتو ئامانجەش كە ئاسمانەكانو زەوی بۆ دروستكراون بریتیە لەوەی هەموو كەس بەپێی كردەوەكەی خۆی سزاو پاداشت بدرێتەوە، وە ستەمیان لێ ناكرێت، هەروەها لە ئایەتی: (١١٥و ١١٦)ی سوورەتی (المؤمنون)دا خوا ﷻ بە شێوەی پرسیاركردنی ئینكاریی كە لە زمانی عەرەبییدا شێوازێك هەیە پێی دەگوترێ (الإستفهام الإنكاري) واتە: پرسیاركردنێكی نكوولیی كەرانە، واتە: كابرا كە ئەو پرسیارە دەكات مەبەستی ئەوەنیە گوێبیستی وەڵام بێ، بەڵكو مەبەستی ئەوەیە كە بە بەرانبەرەكەی بڵێ: ئەوە ڕاستە، یاخود مەبەستی ئەوەیە كە وەڵامەكەی لە نێوان خۆیدا شێرراوەتەوە، خوا ڕوو لە بەشەر دەكات دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنون، واتە: ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە پووچ دروستكردووەو ناگێڕدرێنەوە بۆ لای ئێمە (واتە: ناگونجێ شتی وا)، بەرزە خوای پادشای هەق (واتە: خوا زۆر لەوە بەرزترە كە دروستكراوەكانی بەبێ حیكمەت بخوڵقێنێ) جگە لەو هیچ پەرستراونین، خاوەنی بارەگای پڕ ڕێزو حورمەتە.

ئنجا نەك هەر ئەوەندە بەڵكو خوای پەروەردگار لە ئایەتی: (٧)ی سوورەتی (هود)دا ڕوونی دەكاتەوە كە بوون، واتە: ئاسمانەكانو زەویو ئەوەی

لـە نێوانیاندایـە، هـەمووی پەیوەسـتە بـە ژیـانی ئینـسانەوە، وە ئێـستا کـە گەردووناسـان تەماشـای گـەردوون دەکـەنو تەماشـای زەوی دەکـەنو تەماشـای ژیـانی ئینـسان دەکـەن، ئینـسانیان زۆر لـە پـێش چـاو بـچووك دەبێتـەوەو، زەوییـان لـە پـێش چـاو زۆر نابووتـە ! دەڵـێن: وەك دەنکـە لـمێك وایـە لـە کەنـاری دەریایـەکی فراوانـدا، ڕاستە لـە ڕووی قەبـارەوە وایـە، بـەڵام لـە ڕووی شـوێنی زەوی، وە ئەهلـی سـەر زەوی‌و، ئـەو پێـگەو کـارەی کـە پێـیان سپێـردراوە، زەوی چـەق (مرکـز)ی هـەموو بـوون(وجـود)ە، خـوای کـاربەجێ دەفـەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ هـود، واتە: خـوا ئەو کەسەیە کە ئاسـمانەکانو زەوی لە شـەش ڕۆژان (واتە: بە شـەش قۆناغ) دروستکردوون، وە لەو کاتە بارەگا (عرش)ی خوا لەسەر ئاو بوو، (بۆچی ئـەوەی کـردوە) تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتـان کـردەوەی باشتـر دەکات[1].

کەواتـە: ئـەم ئاسـمانو زەوییـە، حـەوت ئاسـمانەکانو حـەوت زەوییـەکان، وە ئـەوەی کـە لـە نێوانیـان دایـە، هـەمووی بۆچـی دروسـت بـوون؟ بـۆ ئـەوەی ئینـسان تـاقی بکرێتـەوە، کەواتـە: ئـەو کائینـاتو دروسـتکراوانە هـەموویان پەیوەسـتن بـە ژیـانی ئینـسانەوە، جـا چ ئێمـە گرنگییەکەیـان بزانیـن، چ نەیزانیـن، ئـەوەی بـۆ ئێمـە ئاشکرا (کـشف) بـووە ئەوەیە کە: زەوی یەکێکە لەو نـۆ خرۆکـەیەی کە بـە دەوری (خـۆر)دا دەخـولێنـەوەو پێـیان دەگوتـرێ: کۆمەڵـەی خـۆر، وە خـۆر لەگـەڵ کۆمەڵەکەیـدا بـە دەوری ئەستێـرەیەکی گـەورەتردا دەخولـێنەوە، کـە ئـەویش (خـۆر) بۆخـۆی ئەستێرەیەکـە لـە

1) بـۆ شـەرح و تەفسیری ئـەم ئایـەتەو چۆنیـەتی هەڵهێنجـرانی: بووناسـی ئیـسلامیی، ئـەنطۆلۆجیای ئیسلامیی، لێـی، بڕوانە: (تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیـان) ئاڵقـەی یەکـەم: لە بواری بووناسیی دا، لاپـەڕە: (٣٠ تا ٤٠) چاپی یەکـەم: (٢٠٠٨)ز.

ئەستێرەکانی مەجەڕڕەی کا کێشان (مجرة درب التبّان) کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن: (milk way) واتە: ڕێی شیریی، بە فارسیش پێی دەڵێن: (ڕاهی شیری)، بەڵام ئەو خۆرەی ئێمە کە یەکێکە لە سەدان ملیۆن ئەستێرە کە لە نێو کەهکەشانی کا کێشان دان، ئەو کا کێشانەش یەکێکە لەو سەدان ملیۆنەی کە تا ئێستا بە تەلیسکۆبەکان بینراون، خوا زاناو شارەزا دەفەرموێ: ئەو ژیانەی سەر زەوییەو ئەو خەڵکەی سەر زەویبە هەمووی پەیوەستە بە هەموو ئاسمانەکانو زەوییەوە، چۆن؟ ڕۆژ بەڕۆژ زانیاریی زیاتر نهێنی ئەم پرسیارە دەردەخا، ئێمە ئەوەی کە لێی دەزانین ئەوەیە کە ئێمە لەنێو کۆمەڵەی خۆر داین وە کۆمەڵەی خۆریشو خۆر بۆخۆی یەکێکە لە ئەستێرەکانی ئەو کا کێشانەی خۆمان، وە من لە کتێبی (تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان)دا باسی ئەوەم کردوە کە چۆن بووناسیی ئیسلامیی (واتە: دنیابینیی ئیسلامیی) لەم ئایەتەی سووڕەتی (هود) هەڵدەهێنجرێ.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئەو خاوەن عەقڵ‌و بیرمەندو هەمیشە خوا لەیادانە، دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥ﴾، پەروەردگارمان ! بێگومان هەر کەسێك تۆ بیخەیە نێو ئاگرەوە، ئەوە تۆ شەرمەزارو ڕیسواو زەبوونت کردوە، لێرەدا توێژەرەوانی قورئان پرسیارێکیان بۆ دروست بووە، پرسیارەکەش ئەوەیە: کە بەپێی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیماندارانی گوناهبار، ئەوانەی کە تۆبەیەکی ڕاست‌و دروست (نصوح)یان نەکردوە لە گوناهەکانیان، وە خوا پەروەردگاریش بە بەزەیی بێ سنووری خۆیشی نەیبەخشیون، وە گوناهی گەورە گەورەشیان کردوە، لە قیامەتێ بە ئەندازەی گوناح‌و تاوانەکانیان دەسووتێنرێن، دوایی لە دۆزەخ دێنەدەر دەچنە بەهەشت، توێژەرەوان دەڵێن: بەپێی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ

أَخْزَيْتَهُۥ ﴾، پەروەردگـارمان ! بێگومـان هـەر كەسـێك تـۆ بیخـەیە نێـو ئاگـرەوە ئەوە شـەرمەزارو ڕیسـواو زەبوونـت كردوە.

وە لە ئایـەتی: (٨)ی سـوورەتی (التحريم)دا كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ...(٨) ﴾ واتــە: ئــەی ئەوانــەی بڕواتــان هــێناوە ! بگــەڕێنەوە بــۆ لای خــوا، بــە گــەڕانەوەیەكی ســاغو ڕاســت نیزیكــە پــەروەردگارتان خراپــەكانتان لــێ بـسڕێتەوە، وە بتانخاتـە چـەند باغێكـەوە كـە ڕووبـاری بەژێـردا دەڕۆن، لـە ڕۆژێكدا كـە (خـوا) پـێغەمبـەر ﷺ وە ئەو بڕوادارانەی لەگـەڵ پـێـغەمبەردان، شـەرمەزار ناكـات، كەواتـە: بۆیـە خـەواریجو موعتەزیلـەو هەنـدێ لـە زانایـانی هاوچەرخــیش گوتوویــانە: خــەڵك یــان بەهەشــتییە، یــاخود دۆزەخییــە، وە ئــەوەی بــچێتە دۆزەخــێ، ناچێــتە بەهەشــتێ ! بــەڵام لەڕاســتییــدا وانیــەو وەڵامەكــەی ئەوەیــە: كــە ئیمانــدارانی كامــڵ تووشــی شــەرمەزاریی‌و ڕیـسواییو خەجاڵەتیـی نـابن، ئەگەرنا كەسێك كە زینـا دەكـات، یـان قـەتڵ دەكات، یـان شەڕاب دەخوا، یان قومار دەكـات، یـان ڕیبـا دەخـوا، یـان زوڵـم‌و سـتەم دەكـات، یان لەگـەڵ دایـك‌و بـابی خراپـە، لەگـەڵ دراوسـێ خراپـە، ئـەوە بەدڵنیـایی لـە دنیـا خـۆی شـەرمەزار كـردوە، هـەم خـۆی شـەرمەزاری خـەڵك كـردوەو، هـەم خـۆی شــەرمەزاری لای خــوا كــردوە، كەواتــە: هــیچ عــەجایب نیــە ئەگــەر لــە قیـامەتێـش بـە ئەنــدازەی ئـەو شـەرمەزارییەی كـە هێنـاوەیەتە سـەرخۆی لـە دنیـادا، لـەوێش شـەرمـەزاربـێ، ئنجـا ئەگـەر بگـوترێ ئـایـا ئـەوە تێكناگیـرێ لەگـەڵ ئـەو ئایـەتـەی كـە لێـرەدا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ...(٨) ﴾؟ دەڵێیــن: نەخێــر، واتــە: ئـەو ئیماندارانـەی كـە بەڕاستیی ئیمـانداری كامڵ بوون‌و لە خزمەت پـێـغەمبەری خـوا ﷺ دابـوون، ئـەوانە خۆیـان لە گونـاهە گـەورەكان دەپـارێزن، یاخـود كە گوناهێكـیان كـرد

تۆبەیەکی ڕاستی لەسەر دەکەن، مانای وایە ئەوانە شەرمەزار نابن، بەڵام ئەوەی ئیمانی کامڵ نەبێ، وە ئیمانەکەی کرچو کاڵ بێو کەموکووڕیی زۆری تێدابێ، دیارە مادام ئیمانەکەی لە کەموکووڕیی نایگێڕێتەوە، شەرمەزاریش دەبێ، وە لە نێوان ئەم دوو ئایەتەشدا هیچ جۆرە تێکگیرانو ناکۆکییەك نیە، چونکە کە خوا دەفەرموێ: ئیمانداران شەرمەزار ناکەم، واتە: ئیماندارانی ئیمان کامڵو تەواو، جا ئەوە توێژەرەوانی قورئان زۆریان شت لەسەر گوتووەو هێناویانەو بردوویانەو، ئەوەی من بۆم هێنان پوختەو کورتکراوە (خلاصة)یە، وە مەرجیش نیە هیچ کامێکیان بەو تەعبیرەیان گوتبێ.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَـٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ﴾، ئەو دڵ بێدارو عاقڵ هۆشیارانە، لە خوا دەپاڕێنەوەو لە گەرمەی پاڕانەوەو ڕازونیازیاندا دەڵێن: ئێمە گوێمان لە لە بانگکەرێك بوو بانگی دەکرد بۆ ئیمان، کە ئیمان بە پەروەردگارمان بێنین، ئێمەش ئیمانمان هێنا، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئایا ئەو بانگکەر (منادي)یە کێیە ؟ مەبەست پێی پێغەمبەرە ﷺ ؟ ئەگەر مەبەست پێی پێغەمبەربێ ﷺ باشە ئەوە ئەوانەی کە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، دابوون، گوێیان لە قسەی بووە، کە بانگی کردوون، ئنجا ئەوانەی کە لە خزمەتیدا نەبوون ئەوانەی کە لە شوێنی دوورتر بوون، هەر گوێیان لێ نەبووە، بەڵام بۆ ئێمە وە ئەوانەی دوای ئێمەش، دیارە کە گوێمان لە قسەی پێغەمبەر ﷺ نەبووە ؟ بۆیە هەندێك لە توێژەرەوانی دەڵێن: نا، مەبەست پێی قورئانە، وە هەندێکی دیکە دەڵێن: نا، مەبەست پێی پێغەمبەرە ﷺ.

بەس من دەڵێم: مەبەست پێی هەردووکیانەو هیچ ئیشکالیش نیە، چۆن؟ ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دابووە، ئەوە گوێی لە دەنگ (صوت)ی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ئەوەی لە نیزیکییەوە بووە، وە ئەوەی کە لێشی دوور بووە، بەنسبەت ئێمەو مانو دوای ئێمەش فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆمان نووسراونەوە، وە قورئانیش هەر ئەو

فەرمایشتەیە كە خەڵكی پێ بانگ كردوە بۆ لای خوا، قورئانیش لەبەردەستی ئێمەدا هەیە، كەواتە: هەم قورئان، وە هەم سوننەت بریتیە لەو پەیامەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵكی پێ بانگكردوە بۆ لای خوا، كەواتە: ئەو بانگكەرە هەم دەكرێ بڵێین: پێغەمبەری خوایە ﷺو هەم دەگونجێ بڵێین: قورئانە، وە هەم دەگونجێ بڵێین: هەموو ئەو كەسانەن كە خەڵك بە قورئانو سوننەت بۆ لای خوا بانگ دەكەن.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە دەڵێن: ﴿رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ﴾، پەروەردگارمان ! لە گوناهەكانمان بمانبوورەو خراپەكانمان لێ بسڕەوەو، لەگەڵ چاكەكاراندا بمانمرێنە، واتە: سێ داواكاریی لە پەروەردگار دەكەن: گوناهەكانیان ببوورێ، خراپەكانیان لێبسڕێتەوە، دیارە (ذنوب)و (سیئات) فەرقیان هەیە، وە لەگەڵ چاكەكارانیشدا بیانمرێنێ، جا لێرەدا زانایان گوتوویانە: ئایا جیاوازیی نێوان (ذنوب)و (سیئات) چییە ؟ چونكە بۆ (ذنوب) (غفران)ی بەكارهێناوە، بۆ (سیئات)یش (تكفیر)ی بەكارهێناوە، ﴿رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا﴾، بەڵام ئەگەر ئێمە تەماشای قورئان بكەین، وەڵامی ئەم پرسیارەمان زۆر ئاسان دەستدەكەوێو، قورئان هەندێكی هەندێكی تەفسیر دەكات (القرآن يفسِّر بعضهُ بعضاً)، ئەوە با لێتان وەسیەت بێ، هەر ئایەتێك یان وشەیەك لە قورئان ماناكەیتان بۆ ڕۆش نەبوو، تەماشای ئایەتی دیكە بكەن، بۆتان ڕووندەبێتەوە، وە ئەگەر لە قورئانیشدا دەستتان نەكەوت تەماشای سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بكەن، مەرج نیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەقی ئەو ئایەتەی هێنابێو تەفسیری كردبێ، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر ﷺ كە فەرمایشتەكانیو كردارەكانیو دانپێداهێنانەكانی (قول و فعل و إقرار)ەكانی دەگرێتەوە، ئەوە واتاو چەمكی ئایەتەكەمان بۆ ڕووندەكاتەوە، لێرەدا با تەماشا بكەین: لە ئایەتی: (٣١)ی سوورەتی

(النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خۆتان لە گوناهە گەورەکانی کە لێتان قەدەغەکراوە بپارێزن، ئەوە خراپەکانتان لێ دەسڕینەوەو دەتانخەینە شوێنێکی پڕ ڕێزو حورمەتەوە، کەواتە: وەك چۆن گوناهە گەورەکان (کبائر) هەن، دەبێ خراپەکان (سیئات)یش گوناهی گچکەبن‌و ئەو سەرپێچییانە کە بە گوناهی گەورە لەقەڵەم نادرێن، چونکە خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ئەگەر خۆتان لە گوناهە گەورەکان بپارێزن، ئەوە خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە، واتە: گوناهە گچکەکان، هەر پێویست بە تۆبەکردن ناکەن، بەڵکو ئەگەر خۆت لە گوناهە گەورەکان بپارێزی، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی خراپەکان دەسڕێنەوە، بە ئاوی دەستنوێژ، وە بە نوێژەکان، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَ رَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ} رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٩١٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣)، وَأبي عوانة برقم: (٢٦٩٥)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: پێنج نوێژە فەرزەکان، وە جومعە بۆ جومعە، وە ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، گوناهەکانی نێوانیان دەسڕنەوە، مادام (مرۆڤ) دووریی گرتبێ لە گوناهە گەورەکان، هەروەها خوای پەروەردگار لە ئایەتی: (١١٤) سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾، واتە: نوێژ بەرپا بکە، ئەملاولای ڕۆژێ (واتە: بەیانیان‌و ئێواران) وە چەند کاتێك لە شەوێ، وە بێگومان چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە، جا ئایا چاکەکان چین ؟ نوێژ چاکەیە، ڕۆژوو چاکەیە، صەدەقە چاکەیە، ئیمان چاکەیە، طاعەتی خوا بەگشتی چاکەیە، ئەوانە خراپەکان دەسڕنەوە، کەواتە: مەبەستی لە (سیئات) ئەو

گوناهانەن کە بێئەوەی بەتایبەتییش تۆبەیان لێ بکەی، مادام لەسەر چاکەکان بەردەوامبی، وە خۆ لە گوناهە گەورەکان بپارێزی، گوناهە بچوکەکانت لێ دەسڕێنەوە، کەواتە: ئەوە جیاوازیی نێوان (ذنوب)و (سیئات)ە، (ذنوب) پێویستی بە تۆبە هەیە، بەڵام (سیئات) بەبێ تۆبەش دەسڕێنەوە، بەڵام دیارە ئەو بەندە صالّحانە ئەوەندە هەستیارو بێدارن، وێرای (ذنوب) واتە: ئەو گوناهانەی کە پێویستییان بە تۆبە هەیە، داوا دەکەن خراپەکانیشیان لێ بسڕێنەوەو، یەکجاریی خوا پاکیان بکاتەوە، وە ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە (ذنوب) گوناهی گەورەن‌و بەبێ تۆبە لاناچن، بۆ وێنە: لە ئایەتی: (١١)ی سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: خوا بە گوناهەکانیان گرتنی، هەروەها لە ئایەتی: (٤٠)ی سووڕەتی (العنكبوت)دا دوای ئەوەی باسی فیرعەون‌و هامان‌و قاروون‌و قەومی عادو سەمود دەکات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: هەر کامێکیانمان بە گوناهەکەی گرت، هەروەها لە ئایەتی: (١١)ی سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾، واتە: بێجگە لە خوا کێ لە گوناهان دەبوورێ، ئنجا وشەی: (غفران) واتە: پۆشین، بەڵام (تكفير) واتە: سڕینەوە، بۆیەش بە کەفارەت گوتراوە: (كَفَّارَة)، چونکە ئەو گوناهە دەسڕێتەوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە بۆ ئاخر جار لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴾، پەروەردگارمان ! وە ئەوەی کە لەسەر زمانی ڕەوانەکراوەکانت وەعدت پێداوین، پێمان ببەخشە، وە لە ڕۆژی قیامەتدا شەرمەزارو ڕیسوامان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێنی خۆت بەزایە نادەی، توێژەرەوانی قورئان لێرەشدا

ئیشكالێكیان بۆ دروست بووە، دەڵێن: مادام خوا بەڵێنی دابێ لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێویست ناكات بڵێن: خوایە بیهێنەدی ! مادام بەڵێنی دابێ، هەر دەیهێنێتە دی، ئەدی ئەو داواكردنە بۆچی ؟

هەندێكیان گوتوویانە: ئەو داواكردنە هەر بۆ پەرستش (تعبُّد)ە، یانی: ئینسان هەر بۆخۆی كە دەپاڕێتەوە، شتێكی باشە.

وە هەندێكیان گوتوویانە: نا ! خوا ﷻ بەڵێنی داوە، بەڵام نازانین یەكسەر دەچینە بەهەشتێ، یان دەسووتێنرێین ؟ ئەوان داوایان كردوە یەكسەر بچنە بەهەشتێ.

وە هەندێكیان گوتوویانە: مەبەست پێی سەرخستنو سەركەوتن بووە بەسەر كۆمەڵی كافران دا.

بەڵام من دەڵێم: ئەم داواكردنە بۆ حاڵەتێكی تایبەتییەو بەڵێنەكەش بۆ گشتییە، واتە: خوا بەگشتی بەڵێنی بە ئیمانداران داوە، بەڵام ئەوان داوا دەكەن خوا بە شێوەیەكی تایبەتی بۆیان بێنێتەدی، جا ئەو داواكردنە تایبەتییە، لەگەڵ ئەو بەڵێنە گشتی یە، تێكناگیرێن تا بڵێین: خوا بەگشتی بەڵێنی داوە، بۆچی بەشێوەی تایبەتیی داوای لێ دەكرێ ؟

پاشان ئەگەر تەماشا بكەین ئەو عەبدانەی كە خوا مەدحیان دەكات، پێنج جار وشەی پەروەردگارمان (ربَّنا) دووبارە دەكەنەوە، لەكاتی پاڕانەوەیاندا لە خوا :

**جاری یەكەمیان:** دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا ﴾، واتە: پەروەردگارمان ! ئەم دروستكراوانەت بێ حیكمەت نەخوڵقاندوە.

**جاری دووەمیان:** دەڵێن: ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ﴾، دوای ئەوەی بۆیان دەركەوتوە كە بوونەوەرو كائینات بێ حیكمەت دروست نەكراوە، ئنجا ترسی خوایان كەوتۆتە دڵ كە سزایان بدات، ئەگەر لە

تاقیکردنەوەی خوا دەرنەچن، بۆیە دەڵێن: پەروەردگارمان ! بێگومان هەر کەسێك تۆ بیخەیە نێو ئاگرەوە، ئەوە تۆ شەرمەزارو ڕیسواو زەبوونت کردوە.

**جاری سێیەمیان:** دەڵێن: ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ ﴾، ئنجا ئیعلانی ئیمانو مسوڵمانەتیی خۆیان دەکەنو دەڵێن: پەروەردگارمان ! ئێمە گوێمان لە بانگکەرێك بوو بانگی دەکرد بۆ ئیمان، کە ئیمان بە پەروەردگارمان بێنین، ئێمەش ئیمانمان هێنا.

**جاری چوارەمیان:** دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴾، دوایی داوا لێبوردنو لێخۆشبوون دەکەن، دەڵێن: پەروەردگارمان ! لە گوناهەکانمان بمانبوورەو خراپەکانمان لێ بسڕەوەو لەگەڵ چاکەکاراندا بمانمرێنە.

**جاری پێنجەمیان:** دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ﴾، لە کۆتایی داوا لە خوا دەکەن ئەو بەڵێنە گشتییەی کە بە ئیماندارانی داوە، بەتایبەتیی بۆ ئەوانی بێنێتەدی، کەواتە: ڕیزبەندییەکی زۆر مەنتیقییە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ ﴾، پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە، من کردەوەی هیچ خاوەن کردەوەیەك لە ئێوە، نێرو مێ، هەندێکتان لە هەندێکتانن، بەزایە نادەم، کەواتە: ئەوەی بەلای خواوە گرنگەو سەنگی مەحەکە کردەوەیە، چونکە دەفەرموێ: پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە فەرمووی: من کردەوەی هیچ خاوەن کردەوەیەك لە ئێوە بەزایە نادەم، کەواتە: قسەیەك کردەوەی لەگەڵدا نەبێ، بایی فلسێکە، دەبێ کردەوە

هەبێ، ئنجا نێرو مێش جیاوازییان نیە لە تەرازووی خوای دادگەردا، وەك: بەندایەتیی بۆ خواو، مرۆڤ بوونو، ئەركی گشتی شەرعیی، بەڵام ئەركە سروشتییەكانیان كە لە جیاوازیی سروشتیانەوە هەڵدەقوڵێن، لەوەدا جیاوازیی پەیدادەبێ، كە ئەوەش نیشانەی بەرزیی و نزمیی نیە، پاشان كە دەفەرموێ: ﴿ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴾، هەندێكتان لە هەندێكتانن، توێژەرەوانی قورئان زۆر لەوبارەوە قسەیان كردوە، بەڵام من پێموایە ئایەتەكە ماناكەی زۆر ڕۆشنە، كە دەفەرموێ: هەندێكتان لە هەندێكتانن، واتە: پیاو لە ئافرەتو ئافرەتیش لە پیاو پەیدادەبێو بە هەردووكیان نەبێ ئینسان دروست نابێ.

**مەسەلەی دەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴾، تەماشا بكەن ! خوای پەروەردگار وەڵامی دانەوەو فەرمووی: من كردەوەی هیچ خاوەن كردەوەیەك لە ئێوە، نێربێ یان مێ، بەزایە نادەم، ئنجا بۆی باسی هەندێ لەو كردەوانە كردن كە پێیان دەچنە بەهەشت ﴿ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ ﴾، ئەوانەی كە كۆچیان كردوە لەپێناوی خوادا ﴿ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ ﴾، وە لە ماڵو حاڵو نیشتیمانی خۆیان وەدەرنراون، چونكە جاری وایە ئینسان بۆخۆی كۆچ دەكات، جاری وایە دەریدەكەن، ﴿ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي ﴾، وە ئازاردراون لەپێناوی مندا، جا لە قسە پێ گوترانو پڕوپاگەندە بۆ كرانەوە دەیگرێتەوە، تاكو برینداركرانو شەهیدكرانو ... هتد، ﴿ وَقَٰتَلُواْ ﴾، وە لەڕێی خوادا جەنگیان كردوە، ﴿ وَقُتِلُواْ ﴾، وە كوژراویشن، چونكە هەندێكیان دەشكوژرێن، ئا ئەوانەی خاوەنی ئەم جۆر كردەوانەن ﴿ لَأُكَفِّرَنَّ

عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾، بە دڵنیایی خراپەکانیان لێ دەسڕینەوە، بۆ لێرەدا باسی (ذنوب)ی تێدانیە ؟ چونکە کەسانێك ئاوا ڕازو نیاز لەگەڵ خوا بکەن، کەسانێك ئاوا خاوەن هیجرەتو دەرکرانبن لەپێناوی خواداو، ئاوا ئەزیەت بدرێن لەپێناوی خواداو، جەنگو جیهاد بکەنو شەهید بکرێن، بە تەئکید لە گوناهان دوورن، ئەوپەڕی ئەوەی بیکەن، هەندێ خراپەی گچکەیە، ئەویش خوای پەروەردگار لێیان دەسڕێتەوە.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ، وە بە هەرکەسێك لەدوای پێغەمبەر ﷺ هەنگاو دەنێ، یان قورئان دەخوێنێتەوە، دەفەرموێ: ﴿ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِى ٱلْبِلَـٰدِ ﴾، هاتنو چوونو خۆبادانی کافرەکان لە وڵاتدا با تۆ هەڵنەخەڵەتێنێ، یانی: چی تۆ هەڵنەخەڵەتێنێ ؟ واتە: لە حیساباتی خۆتدا بەهەڵە نەچی، جا ئەم ئایەتە زۆرجێی سەرنجو وردبوونەوەیە ! ئینسان زۆرجار ئەگەر لەخۆی وریا نەبێ، کە کافران دەبینێ بەتایبەتی لەو سەدەی پازدەی کۆچیی ئێمەدا، یان لەو سەدەی بیستو یەکەمەی ئێستای ئێمەدا، کە کافران دەبینێ دەچنە سەر مانگو بن زەوی دەکۆڵنو، دەچنە بن دەریاو، قومبەلەی زەڕییان هەیە، چییان هەیەو ... هتد ! لەولایەش تەماشا دەکات مسوڵمانان بێ دەستو کەم دەستەڵاتن، ماف خوراو ماف پێشێلکراون، زوڵمیان لێ دەکرێ ... هتد ! ئەگەر ئیمانێکی مەحکەمو باشی نەبێ، لەوانەیە لە حیساباتی خۆیدا بەهەڵەدا بچێو بڵێ: ڕەنگە ئەوان (واتە: کافرەکان) لەسەر هەق بن، یان تۆ بڵێی دینەکەی ئێمە هەڵە نەبێ؟ باشە ئەوان بۆ ئاوا پێشکەوتوونو ئێمە بۆ ئاوا دواکەوتووین ؟! نازانێ کە پێشکەوتنەکەی ئەوان هی دینە هەڵەکەیان نیەو دواکەوتنی ئێمەش هی دینە ڕاستەکەمان نیە، بەڵکو ئێمە لە یاساکانی خوا لاماندەوەو، لە دینی خواش بەجێماوین، بۆیە دواکەوتووین، ئەوانیش لەڕاستییدا هەندێ یاسای خوای پەروەردگاریان کەشف کردوەو

بەهۆی ئەو یاسایانەوە بەرەو پێش چوون، جا بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، هاتنو چوونو خۆبادانی کافرەکان لە وڵاتدا، با تۆ هەڵنەخەڵەتێنێ، تۆ فریو نەدا، واتە: لە حیساباتی خۆتدا بەهەڵە نەچی، پێت وانەبێ ئەوان لەسەر هەقنو تۆ لەسەر ناهەقی، هەڵبەتە ئەگەر بڵێین: دوێندراو (مخاطب)ەکە، لێرەدا پێغەمبەرە ﷺ واتە: وەك دەڵێ: (دیوار لەگەڵ تۆمە گوێسوانە گوێت لێبێ) ئەوە لەگەڵ پێغەمبەریەتی ﷺ بەڵام مەبەست پێی ئۆممەتەکەیەتی، چونکە پێغەمبەر ﷺ هیچ کاتێك بە زرقو برقی کافرەکانو بە ڕواڵەتی ژیانی ئەوان هەڵنەخەڵەتاوە، جا لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: {عَنْ عُمَرَ ابْنِ الخطاب رضي الله عنه فَدَخَلْتُ عَلَى رَسولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى حَصِيرٍ، فَجَلَسْتُ، فَأَدْنَى عَلَيْهِ إِزَارَهُ وَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهُ، وَإِذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، فَنَظَرْتُ بِبَصَرِي فِي خِزَانَةِ رَسولِ اللَّهِ ﷺ، فَإِذَا أَنَا بِقَبْضَةٍ مِنْ شَعِيرٍ نَحْوِ الصَّاعِ وَمِثْلِهَا قَرَظًا فِي نَاحِيَةِ الْغُرْفَةِ، وَإِذَا أَفِيقٌ مُعَلَّقٌ – قَالَ – فَابْتَدَرَتْ عَيْنَايَ قَالَ: مَا يُبْكِيكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ ؟ قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ ! وَمَا لِي لا أَبْكِي وَهَذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِكَ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ لا أَرَى فِيهَا إِلا مَا أَرَى، وَذَاكَ قَيْصَرُ وَكِسْرَى فِي الثِّمَارِ وَالأَنْهَارِ وَأَنْتَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ وَصَفْوَتُهُ وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ، فَقَالَ: يَا ابْنَ الْخَطَّابِ أَلا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَنَا الآخِرَةُ وَلَهُمُ الدُّنْيَا} رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٩١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٦٧٦) واللَّفْظُ لَهُ، وَأَبُو يعلى برقم: (١٦٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٨٨)، وَأَبُو عوانة برقم: (٤٥٧٢)، واتە: عومەری کوڕی خەتتاب - خوا لێی ڕازی بێ- (لە گێڕانەوەیەك دا کە درێژترە لەمەو بەسەرهاتێکی هەیە) دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەصیرێك ڕاکشابوو، منیش دانیشتم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کراسەی کە تەنیا ئەوی لەبەربوو هێنایەوە سەر قاچی (دیارە کراسەکەی تۆزێك لەسەر قاچی لاچووە، هێناویەتەوە سەریو

خۆی جوانتر داپۆشیوە) تەماشام كرد حەصیرەكە شوێنی لە تەنیشتی كردوە (دیارە تەنیشتی موبارەكی سوور كردۆتەوە)، وە تەماشا عەمباری پێغەمبەری خوام ﷺ كرد، تەنیا مستە جۆیەك كە بە ئەندازەی صاعێك دەبوو (صاع: چوار مستە، نیزیكەی دوو كیلۆ) هەروەها ئەندازەی ئەوەش مازوو (قَرَظ: كە پێستو شتی پێ دەباغ دەكرێو خۆش دەكرێ) لە لایەكی ژوورەكە دانرابوو، وە هەڵواسرابوو، دەڵێ: یەكسەر گریانم هاتو چاوم فرمێسكی پێداهات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كوڕی خەتتاب بۆ دەگری ؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ چۆن نەگرییم (هیچ شتێكی نەرمت نیەو) لەسەر ئەو حەصیرە ڕەقە ڕاكشاوی كە شوێنی لە تەنیشتت كردوە، وە ئەوەش عەمبارەكەتە (واتە: شوێنی شت تێداهەڵگرتنەكەت) كە هەر ئەوەی تێدا دەبینەمو هیچی دیكە تێدا نابینم، كەچی قەیصەرو كیسرا (قەیصەر نازناوی پادشای ڕۆم بووە، كیسراش نازناوی پادشای فارسەكان بووە) لەنێو میوەو ڕووبارو كانی دان، تۆش پێغەمبەری خوای ﷺ وە نێرراوی خوای، ئا ئەوەش حاڵوماڵتە، ئەوەش عەمبارەكەتە كە شتی لێ هەڵدەگری، دەڵێ: فەرمووی: ئەی كوڕی خەتتاب ! ئایا ڕازی نی كە ئێمە دواڕۆژمان هەبێ ئەوانیش دنیا ؟ واتە: مانای وایە با بەوە قەناعەت بكەین، دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیتوانی وانەبێ، بەڵام دەبێ سەرمەشق بێ بۆ ئۆممەت.

**مەسەلەی دوازدەیەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ لَكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴾، بەڵام ئەوانەی كە پارێزكارییان لە پەروەردگاریان كردوە، ئەوانە چەند باغو باغاتێكیان هەیە، ڕووبارییان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، ئەوە میوانداریيەكە لەلایەن خواوە ﷻ، ئەوەیش كە لەلای خوایە باشترە بۆ چاكەكاران، لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە كە خوای بەرز

نیعمەتەكانی بە زۆریی بە (نُزُلًا ) ناودەبا (نُزُل) ئەوەیە كە بۆ میوان ساز دەكرێ، كەواتە: ئێمەی ئیماندار، ئەگەر خوا بە نسیبمان بكات، لە قیامەتێ میوانی خواین، خانەخوێ (مضیف)ی ئێمەو ئەوەی كە دەعوەتمان دەكات كێیە ؟ خوای بێ وێنەیە، جا خوای بەخشەر بەو هەموو گەورەییەی خۆی ئێمە دەعوەت بكات، دەبێ چۆنمان دەعوەت بكات؟! وە دەبێ چ نازو نیعمەتێكی لەو بەهەشتە بۆ ئەو بەندانەی خۆی دانابێ، كە لێیان ڕازییە، وە دەیكاتە مەنزڵگاو ئەو شوێنەی كە پاداشتی ئیماندارانی تێدا دەداتەوە ؟!

**<u>مەسەلەی سێزدەیەم</u>:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَـٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، خوای دادگەر لێرەدا مەدحی كەسانێك لە خاوەن كتێبەكان دەكات كە چاكن، واتە: هەموویان خراپ نین، مسوڵمانینە ! وامەزانن هەموو جوولەكەو نەصرانیی یەكان وەك یەكن، وە بەیەك چاو تەماشایان مەكەن، تەماشا بكەن ئیسلام چەند بە ئینصافە ! دەفەرموێ: لە خاوەن كتێبەكان كەسانێك هەن ئیمان بە خوا دێنن، وە ئیمان بەوە دێنن كە بۆ ئێوە دابەزیوە، وە بەوەش كە بۆخۆیان دابەزیوە، واتە: تەوراتو ئینجیل زەبوورو ئەوانی دی، وە بۆ خوا ملكەچن، یانی: خۆبەزلگر نین ﴿لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾، نرخێكی كەم بە ئایەتەكانی خوا ناكڕن، واتە: لەبەر بەرژەوەندییەكی كەمی دنیا، دەستبەرداری ئایەتەكانی خوا نابن كە بە پێغەمبەری كۆتاییدا ناردوونیە خوار، بەڵكو ئیمانیان پێ دێننو دەستبەرداریی ئەو بەرژەوەندییە ناشەرعییانە دەبن، كە بە هۆی ئەو تەحریفو گۆڕانكارییكرانەی خۆیانەوە بۆیان دەستەبەر بوون، دیارە لە چەندان شوێنی دیكەشدا خوا مەدحی ئەم جۆرە خاوەن كتێبانە دەكات.

**مەسەلەی چواردەیەم:** خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتەداو لە ئایەتی ژمارە: (٢٠٠)دا کە ئایەتی کۆتایی یە ڕوو لە ئیمانداران دەکاتو دەفەرمویٚ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾

ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! خۆڕاگربن لە زاتی خۆتاندا، وە خۆڕاگربن لە بەرانبەر دوژمنانتاندا، وە چەسپاو نەلەخشاوبن، وە پارێزکاربن، بۆ ئەوەی سەرفرازبن، جا خوا ﷻ فەرمان بە چوار شت دەکات کە بریتین لە: (صبر)و (مصابرة)و (مرابطة)و (تقوی):

**یەکەم:** ئارامگریی (صبر) لە خودی خۆتاندا:

ئەمیش بە سێ شتان دێتە دی :

١- جێبەجێکردنی فەرمانبەریی (طاعة): فەرمانبەریی ئەگەر صەبری لەسەر نەگری بۆت ئەنجام نادریٚ، بۆ وێنە: نوێژە، ڕۆژووە، ماڵ بەخشینە، جیهادە، دەبێ صەبرت لەسەری هەبێ، ئنجا بۆت ئەنجام دەدریٚ.

٢- خۆ دوورگرتن لە سەرپێچیی (معصیة): گوناحو تاوان، دەبێ صەبری لە بەرانبەردا بگری، ئەوجار دەتوانی خۆتی لێ دووربگری، وەك: درۆکردن، غەیبەتکردن، دزییکردن، نەزەرکردن، زیناکردن، دەستدرێژییکردن، خیانەتکردن، دەبێ صەبریان لە بەرانبەردا بگریی.

٣- خۆڕاگریی لە بەرانبەر تاقیکردنەوەدا (ابتلاء): ئینسان ئەگەر صەبری نەبێ خۆڕاناگریٚ لە بەرانبەر نەخۆشییو ناخۆشییو گرفتارییو ناڕەحەتییەکان دا کە تووشی دەبن.

**دووەم:** (مصابرة) واتە: ئارامگریی ئێوە لە بەرانبەر دوژمنەکانتان دا: کە دەبێ زیاتربێ لە ئارامگریی ئەوان، وەك: لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٠٤)، وَصَحَّحَهُ الشيخ شعيب الأرنؤوط)، واتە: بێگومان سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگریی دایە، وە لە (أثر)دا هاتوە: {النَّصْرُ صَبْرُ سَاعَةٍ}، واتە: سەرکەوتن

خۆڕاگـرتنی سەعاتێکـە، یـانی: سـەعاتێك لـە بەرانبـەرەکەت خۆڕاگـرتربی، سـەردەکەوی.

**سـێیەم:** (مرابطة) واتـە: لە شوێنی خۆتـان مەجوولـێن: لـە ئەسڵـدا (ربـاط) ئەو شتەیە کە ولاخی پـێ دەبەسـتنەوە، یاخود ئـەو سـەنگەرەیە کە ئینسان تێیـدا ئێـشـك دەگـرێ، کەواتـە: (ورابطـوا) یـانی: مەجوولـێن، زۆر کـەس لـە ئەنجـامی جوولـەجوولـدا دەپێـکرێ، هـەروەها زۆر کـەس لـە ئەنجـامی جوولـەجوولـدا لەسـەر کەسـابەت بـە ئەنجـام ناگـات، هـەر ڕۆژەی لەسـەر ئیـشـێکە، سـەرەنجام هـەمووی نیوەچـڵ دەدەچـن، زۆر کـەس لـە ئەنجـامی جوولـەجوولـکردنـدا لەسەر طاعەتێك بـەردەوامی نـابـێ، طـاعەتێـك دەکـا، دوایـی یەکێکـی دەکـا...هتـد، وای لێـدێ هـەموو لـێ تێکدەچـێ، وا باشـە ئینـسـان کـە کارێکـی کـرد نەجوولـێ تـا تـەواوی دەکـاو بـە ئـەنجامی دەگەیـەنی، بۆیـە پـێغەمبەر ﷺ وشـەی: (ربـاط)ی هەم بـۆ سـەنگەرنـشـینیی لە بەرانبـەر دوژمندا بەکـارهێنـاوە، وە هـەم بـۆ بەردەوامیـی لەسـەر پێـنج نوێـژە فەرزەکـان بەکارهێنـاوە:

أ– دەربـارەی سـەنگەرنـشـینیی لەپـێـناوی خـوادا، ئـەم فەرمووەدیـە هەیـە: {عَـنْ سَـهْلِ بْـنِ سَـعْدٍ الـسَّاعِدِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ قَـالَ: رِبَـاطُ يَـوْمٍ فِـي سَبِيلِ اللَّـهِ خَيْـرٌ مِـنَ الدُّنْيَـا وَمَـا عَلَيْهَـا} رَوَاهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٢٩٢٣)، وَالْبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٨٩٥)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (١٦٦٤)، سەهلـی کـوڕی سـەعدی ساعـیدیی - خـوا لـێی ڕازی بـێ- دەڵـێ: پـێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: سەنگەرنـشینیی ڕۆژێك لەپێنـاوی خـوادا، چاکتـرە لـەلای خوا لە دنیـاو لـەوەی لە دنیـادا هەیـە.

ب– وە دەربـارەی بەردەوامیـی لەسـەر پێـنج نوێـژە فـەرزەکانیش، ئـەم فەرمووەدیـە هـەیە: {عَـنْ أَبِـي هُـرَيْـرَةَ ﷺ عَـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ أَنَّـهُ، قَـالَ: أَلا أُخْبِـرُكُمْ بِمَـا يَمْحُـو اللَّـهُ بِـهِ الْخَطَايَـا وَيَرْفَـعُ بِـهِ الـدَّرَجَاتِ؟ إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَـى الْمَكَـارِهِ، وَكَـثْرَةُ الْخُطَـا إِلَـى الْمَسَـاجِدِ، وَانْتِظَـارُ الصَّلاةِ

بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ} رَوَاهُ مالك في (الموطأ) برقم: (٣٨٤)، وَأَحْمَد برقم: (٨٠٠٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٨٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٥١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٤٣)، وَأَبُو عوانة برقم: (٦٢٣)، واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەواڵتان پێبدەم بە شتێك كە گوناهەكانی پێ دەسڕێنەوە، وە پلەكانی پێ بەرز دەبنەوە ؟ لە كاتێكدا كە سەرمایەو نارەحەتییە دەستنوێژ بەتەواویی بگری، وە زۆر بەرەو مزگەوت هەنگاو بنێی، وە لە دوای نوێژ چاوەڕێی نوێژی دیكە بكەی، ئا ئەوە (رباط)ە، ئا ئەوە (رباط)ە، ئا ئەوە (رباط)ە، واتە: ئەوە ئەو نەجوولانەیە كە خوا فەرمانی پێكردوە، هەڵبەتە (مرابطة) مانایەكی دیكەشی هەیە، واتە پێكەوە پەیوەست بن، پەرتەوازە مەبن، شان لێكبدەن، نەك هەر كەسە ڕووی لەلایەكی بێ».

**چوارەم:** (واتقوا الله) پارێز لە خوا بكەن، كە ئەوە (صَبْر)و (مصَابَرةَ)و (مرابطة)ش دەگرێتەوە، سەرەنجام ئەگەر ئێوە خاوەنی ئەم چوار سیفەتەبن ﴿ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، ئەوە سەرفراز دەبن، خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ كە خاوەنی هەر چوار سیفەتی: (صَبْر)و (مصَابَرَةَ)و (مرَابَطَة) (تَقْوَى)ن، بۆ ئەوەی سەرفرازی دنیاو دوارۆژبین، ئامین.

لێرەش دا كۆتایی بە تەفسیركردنی سوورەتی ئالی عیمران دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

